# ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ

## لە قورئان و فەرموودەکاندا



نووسینی
محمد ملا فائق شارەزووری

بەرگی یەکەم



# پێناسی کتێب


ناوی کتێب: ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قورئان و فەرموودەکاندا

نوسەر: موحەممەد مەلا فایەق شارەزووی

تایپ و دیزاین: ئومێد موحەممەد

ساڵی چاپ: ٢٠٢٣ز- ١٤٤٥ك

تیراژ: ٢٠٠٠

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١١٣٨) ی ساڵی (٢٠١٧) پێدراوە.





بۆ گەیاندنی هەر سەرنج وتێبینییەك دەتوانن

پەیوەندی ئەم ژمارە مۆبایلەوە بکەن

(٠٧٧٠١٥٥٤٠٨٥)





www.muhammadmalafayaq.com

# ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ

## لە قورئان و فەرموودەکاندا

نووسینی

محمد مەلا فائق شارەزووری

بەرگی یەکەم

## ئازادکردنی شاری مەککە

قورەیشیەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دڵنیاتر دەبوون کە مەرجەکانی پەیماننامەی حودەیبییە لەبەرژەوەندی ئەواندا نییە، گەر ئەوان بەو جۆرە پابەندی برگەکانی ببن کار دەگاتە ئەو ڕۆژەی کە تەنها هەرخۆیان دەمێننەوە، وەك دوورگەیەك لەناو دەریایەکی ئیسلامی فراواندا کە شەپۆلەکانی دەگاتە ئیمپراتۆرییەکانی جیهانی کۆن و پێگەی بتپەرستان یەك لەدوای یەك لەبن دێنێت، بەوجۆرە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کات تێدەپەڕی و قورەیش زیاتر کەنارگیر دەکراو بازرگانییەکەی زیاتر مایەپوچتر دەبوو، لەبەرامبەردا موسوڵمانان زیاتر چالاکترو ورە بەرزتر دەبوون، لەبەر ئەمانە سەرکردەکانی قورەیش چاوەڕوانی هەلێکیان دەکرد بۆ شکست پێهێنانی ئەو پەیماننامەیە و پوچەڵ کردنەوەی تێکڕای مەرجەکانی، چونکە دەیانزانی ماوەی هەشت ساڵی تری ڕێکەوتننامەکە بەتەواوەتی فشاریان دەخاتە سەر و ئەوەندەی تر قەتیسیان دەکات و بەرەو شکستی زیاتریان دەبات[1].

## هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەکە

لەدوای هەژدە مانگ لەڕێکەوتننامەی حودەیبییە، قورەیش و بەنی بەکر ڕێکەوتننامەکەیان شکاند و هێرشیان کردە سەر خوزاعەی هاوپەیمانی پێغەمبەر ﷺ و چەندەها کەسیان لێ کوشتن، تا ناچاریان کردن پەنایان هێنایە ناو حەرەمی مەککە. ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (لەکاتی ئاگربەستنەکەی نێوانیان، بەنو دەیلی تیرەیی بەنو بەکر قۆستیانەوە و ویستیان تۆڵە لە خوزاعە بکەنەوە، نەوفەلی کوڕی موعاویەی دەیلی لەتیرەیی بەنی دەیل بوو ئەو ڕۆژە بەتەنها سەرکردەیان بوو، ئەوان بەتەنها لە تاریکی شەودا پەلاماری خوزاعەیاندا لەسەر ئاوی (وەتیر)ی نزیك شاری مەککە)[2].

موسای کوڕی عوقبەش ﷺ دەفەرموێت: (پاشان ئەوە بوو بەنو نەفاسەی کوڕانی بەنی دەیل هێرشیان بردە سەر بەنی کەعب، ئەمەش لەو ماوەیەدا بوو کە ئاگربەست

---

(١) انظر: (دراسة في السيرة) (ص:٢٤٠).

(٢) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٦/٤)، والطبري (التأريخ) (٣٤/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٧/٥).

ڕاگەیەنرابوو لەنێوان پێغەمبەر ﷺ و قورەیشدا، لەوکاتەدا بەنو بەکر لەڕێکەوتندا بوون لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و بەنو نەفاسەش لەگەڵ قورەیش بوون، ئەوە بوو بەنو بەکر یارمەتی بەنو نەفاسەیانداو قورەیش بەچەك و (خواردن و هەواڵگری)[٣] و کۆیلەکانیان یارمەتییان دان، لەناو خۆیاندا وتیان: نە موحەممەد و نەهیچ کەسێك لەم تاریکاییەی شەودا پێمان نازانن.... کەوتنە تانەدان لەپێغەمبەرﷺ [٤]، بەڵام تیرەی بەنو مودلیجیان لێ جیابووەوە و ئەوان پەیمانی خۆیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نەشکاندو بردیانە سەر، بەنو دەیل لەو ڕۆژەدا دوو سەرکردەی ناوداریان هەبوو ناویان؛ سەلیمی کوڕی ئەسوەد و کلسومی کوڕی ئەسەد بوو (لەوێدا هەندێك لەقورەیشییەکانیش بە پەنامەکی و لەتاریکایی شەودا لەگەڵیان هاتبوون بۆ شەڕ دژ بە بەنی خوزاعە)[5] (ئەوانەشی کە بەشدارییان کردبوو: صەفوانی کوڕی ئومەییەو شەیبەی کوڕی عوسمان و سوهەیلی کوڕی عەمرو، لەوێدا بەنو دەیل هێرشیان کردە سەر کۆمەڵێکی خوزاعە کە زۆربەیان وەك باسیان دەکرد ئافرەت ومنداڵ و پیاوە بێ تواناکانیان بوون، بەشەڕ هاتن لەگەڵیاندا و ڕاویاننان تا ناچاریان کردن بچنە ناو حەرەمەوە)[٦] (لەوێدا ژمارەی بیست تا بیست و سێیان لێ کوشتن)[٧] (خوزاعەیان ڕاونا تا چوونە ناو حەرەمەوە لەوێدا بەنو بەکر وتیان: نەوفەل ئەوە چوونە ناو سنوری حەرەمەوە لەخواکەت بترسە لەخواکەت بترسە! بەڵام نەوفەل وتەیەکی زۆر نەشیاوی وت. وتی: هیچ خوایەك نییە ئەمڕۆ ئەی بەنو بەکر تۆڵەی خۆتان بکەنەوە، سوێند بێت ئێوە دزیش لەحەرەمدا دەکەن ئێستا تۆڵەی خۆتان لەوان ناکەنەوە..... خوزاعەش کەچووبوونە ناو شاری مەککەوە پەنایان بردە بەر ماڵی بودەیلی کوڕی وەرقاو ماڵی لایەنگرێکی تریان کە ناوی ڕافیع بوو)[٨].

---

(٣) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٧) عن عكرمة وقال محققه: مرسل ورجاله ثقات.

(٤) أخرجه: الطبري (التأريخ) (٤٣١٣)، والبيهقي (الدلائل) (٦/٥) و(الكبرى) (٢٣٣/٩)، وقال البرزيخي في (صحيح الطبري) (٢٣٦): اسناده حسن، وقال العمري (السيره الصحيحة) (٤٧٤/٢): اسناده صحيح.

(٥) أخرجه: ابن اسحاق (السيرة) (ص:٥١٤)، وابن هشام (السيرة) (٦/٤).

(٦) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٩/٥) عن موسى بن عقبة.

(٧) أخرجه: الواقدي (المغازي) (٧٨١/٢).

(٨) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٦/٤)، والطبري (التأريخ) (٤٣/٣)، وقال البرزنجي في (صحيح الطبري) (٢٣٦): سنده حسن.

لەگێڕانەوەیەکی لاوازدا هاتووە: (لەوکاتەدا خوای گەورە پێغەمبەرەکەی ﷺ لەو بەسەرهاتە ئاگادار کردۆتەوە، هەروەها لەهاتنی نوێنەرانی خوزاعەش لەپێش هاتنی ئەوان بەسێ ڕۆژ، دایکی بڕواداران مەیمونەی کچی حاریس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لای من بوو پاشان چوو دەستنوێژ بگرێت، لەو کاتەدا گوێم لێ بوو سێ جار فەرمووی: ((«لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ» ، ثَلَاثًا ، «وَنُصِرْتُ وَنُصِرْتُ» ، ثَلَاثًا)) واتە: ئەوا هاتم. سەر دەخرێیت ئەوەی سێ جار دووبارە کردەوە. کاتێك لە دەست نوێژەکەی گەڕایەوە پێم وت: ئەی پێغەمبەری خودا باوکم فیدات بێت گوێم لێ بوو لەکاتی دەستنوێژەکەدا سێ جار دەتفەرموو: ئەوا هاتم و سێ جاریش دەتفەرموو: سەر دەخرێیت وەکو قسە لەگەڵ کەسێکدا بکەیت، ئایا هیچ کەسێکت لەگەڵدا بوو؟ فەرمووی: ((هَذَا رَاجِزُ بَنِي كَعْبٍ يَسْتَصْرِخُنِي ، وَيَزْعُمُ أَنَّ قُرَيْشًا أَعَانَتْ عَلَيْهِمْ بَنِي بَكْرٍ)) بیستم شاعیرەکەی بەنی کەعب هاوار دەگەیەنێتە من و دەڵێت قوڕەیش یارمەتی بەنی بەکریان داوە دژ بەوان)[٩].

## هاتنی عەمری کوڕی سالیم و بەدیلی کوڕی وەرقا بۆلای پێغەمبەر ﷺ

(قوڕەیش لەڕاستیدا هەڵەیەکی کوشندەی ئەنجامدا کاتێك بەچەك و ئەسپ و جەنگاوەر یارمەتی بەنو بەکری هاوپەیمانیدا دژ بەخوزاعەی هاوپەیمانی پێغەمبەر ﷺ...... ئەم هەڵوێستەی قوڕەیش پێشێلکارییەکی ئاشکرای ڕێکەوتننامەی حودەیبییە بوو، هەروەك دەست درێژییەکی ناڕەوا بوو دژ بەهاوپەیمانی موسوڵمانان.... خوزاعەش ئەمەی بە هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکەی قوڕەیش زانی لەگەڵ موسوڵماناندا کاتێك ئەوان لەگەڵی بەجەنگ هاتن، لەبەرئەوە عەمری کوڕی سالمی خوزاعیان وەك نوێنەر نارد لەگەڵ چل سواردا تا بچن و پێغەمبەر ﷺ ئاگادار بکەنەوە لە وردەکاری دەست درێژیکردنەکەی قوڕەیش و هاوپەیمانەکانی وە داوای یارمەتیش لە پێغەمبەر ﷺ بکەن دژ بەو هێرشبەرانە، دواتریش بودەیلی کوڕی وەرقایان نارد لەگەڵ هەندێك کەسانی خوزاعە تا جەخت لە هەواڵەکەی عەمری کوڕی سالم لای پێغەمبەر ﷺ بکەنەوە)[١٠].

(٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٣) رقم (١٠٥٢) وفي (الصغير) (٧٣/٢) (٩٦٨)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٦٤/٦) فيه ضعيف، وقال الارناؤوط في (زاد المعاد) (٣٩٦/٣): اسناده ضعيف.

(١٠) انظر: (دراسة في السيرة) (ص:٤٧٣،٢٤١).

هەواڵ و وردەکارییەکانی هاتنی عەمری کوڕی سالم بۆلای پێغەمبەر ﷺ لەچەندەها ڕێگەی جیاوازەوە هاتووە، لەدوای کۆکردنەوە و ڕێکخستنیان بەم جۆرە دەبێت: میسوەری کوڕی مەخرەمە و مەڕوانی کوڕی حەکەم ﷺ دەفەرموون: (لەدوای ڕوودانی بەسەرهاتەکەی سەر ئاوی وەتیری نێوان خوزاعەو بەنی بەکر، عەمروی کوڕی سالم بەیاوەری (چل کەس لەخزمانی)[11] بەڕێکەوتن تا گەیشتنە شاری مەدینەو چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەیان پێ ڕاگەیاند)[12].

مەیمونەی کچی حاریس ﷺ دەفەرموێت: (سێ ڕۆژ بەسەر وتەکەی پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕی بەیانییەکیان پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەیانی بۆ دەکردن)[13] (کاتێك ئەو لە نێو هاوەڵانی لەمزگەوت دانیشتبوو عەمری کوڕی سالم هات و لەچەند شیعرێکیدا دەی وت:

خـودایـــە مـــن لـــە مـوحـەممـەد داوا دەکـــەم
هـــاوپـەیمانیەتییـــەکـەی بـــاو و بـــاپیرانمـــان بباتە سەر
بـــزانە قـــوڕەیش بـــەڵێنـــی خـــۆیـــان نـــەبردە سەر
وپـــەیمـانـــە جێگیـــرەکـــەیـــان لـەگەڵت هەڵوەشاندەوە
ئـەوان بـەشەو لەسەر ئاوی وەتیـــر دایـــان بەسەرماندا
لەکـــاتی ڕکـوع و سجـوددا بەکوشتن برد لێ یان کوشتن
خوا هیدایەتت بدات بە سەرکەوتنێکی بێ وێنە سەرمان بخە
وداوا بکە تا هەموو بەندەکانی خوا بەهانامانەوە بێن

ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((نُصِرْتَ يَا عَمْرَو بْنُ سَالِمٍ)) ((پشتیوانت کرا ئەی عەمروی کوڕی سالم) پاشان بەئاسمانی ئەوێدا هەورێك تێپەڕی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إنَّ هذهِ السَّحابة لتستهِلُّ بنصر بني كعب...))[14] ((ئەو هەورەی لەپێش هەمووان ئامادەیە بۆ سەرخستنی بەنی کەعبە).

---

(١١) أخرجه: الواقدي (المغازي) (٧٨١/٢).

(١٢) أخرجه: ابن اسحاق (المغازي) (ص:٥١٤)، وابن هشام (السيرة) (٢٦٥/٣) برقم (٨١٤)، والطبري (التأريخ) (٦٢٣/٢)، والبزار (١٨١٢)، وابن حجر(الفتح) (٦٦٢/٧)، وصححه كل من العمري في (السيرة الصحيحة) (٤٧٣/٢) و ابراهيم العلي في (صحيح السيرة) رقم (٦٣٤)، والبرزنجي في (صحيح الطبري) رقم (٢٣٦).

(١٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٠٥٢/٢٣)، وفي (الصغير) (٩٦٨)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٦٤/٦) فيه ضعيف.

(١٤) أخرجه: ابن اسحاق (المغازي) (ص:٥١٦) وابن هشام (السيرة) (١٠/٤) رقم (٩١٠)، والطبري (التأريخ) (٤٤/٣)، والطحاوي (شرح معاني الاثار) (٣١٦/٣).

پێغەمبەری خوا ﷺ بەم ڕووداوە زۆر تووڕەبوو، دایکی بڕواداران عائیشە رضي الله عنها دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودام ﷺ بینی بۆ ئەم ڕووداوە تووڕەبوونێك تووڕە بوو بوو ماوەیەکی زۆر بوو بەم جۆرە ئەم بینیبوو تووڕە ببێت هەتا فەرمووی: ((لا نصرني اللهُ إنْ لَمْ أنصُرْ بني كعب))[١٥] واتە: (خودا سەرم نەخات گەر من بەنی کەعب سەرنەخەم))، موسای کوڕی عوقبە دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بەنوێنەرانی خوزاعەی فەرموو: ((ارجِعُوا وَتَفَرَّقُوا فِي البُلْدان)) ((بگەڕێنەوەو بەهەموو لایەکدا بڵاوببنەوە))[١٦] ئیبنو ئیسحاق دەفەرموێت: (پاشانیش بودەیلی کوڕی وەرقا بەیاوەری شاندێکی تری خوزاعە لەدوای عەمروی کوڕی سالم هاتن تا گەیشتنە لای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵی کوژراوەکانیان وە پشتگیری کردنی قورەیشیان لەبەنی بەکر دژ بەوان لای پێغەمبەر ﷺ دووپات کردەوە، پاشان ئەوانیش بەرەو شاری مەککە گەڕانەوە)[١٧].

## هاتنی ئەبوسوفیان بۆ تازەکردنەوەی ڕێکەوتننامەکەی حودەیبییە

لەدوای ئەم ڕووداوە قورەیش بۆی ڕوون بووەوە هەڵەیەکی چەند گەورەی ئەنجام داوە، چەندە بێ توانایە لەڕووبەڕوو بوونەوەی موسوڵمانان لەدوای زۆربوونی ژمارەیان و زیادبوونی هێزیان و فراوانی دەسەڵاتیان، دەرکیان بە تووڕەبوونی موسوڵمانانیش کرد بوو سەبارەت بەپێشێلکاریی ڕێکەوتننامەکە، لەبەرئەوە بەباشیان زانی ئەبوسوفیان بەپەلە بنێرنە شاری مەدینە بۆ تازەکردنەوەی پەیماننامەکە لەگەڵ موسوڵماناندا بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکانیان.

پێغەمبەر ﷺ لەپێش هاتنی ئەبوسوفیان هاوەڵانی ئاگادارکردەوە و فەرمووی: ((كَأَنَّكُمْ بِأَبِي سُفْيَانَ قَدْ جَاءَكُمْ لِيَشُدَّ الْعَقْدَ، وَيَزِيدَ فِي الْمُدَّةِ)) واتە: نزیکە ئەبوسوفیان بێتە لاتان بۆ توندوتۆڵکردنی ڕێکەوتننامەکەو درێژکردنەوەی وادەکەی.

میسوەر و مەخرەمە رضي الله عنهما دەفەرموون: (بودەیل و هاوەڵانی گەڕانەوە بەرەو مەککە، لەناوچەی عوسفان بە ئەبوسوفیان گەیشتن لەو کاتەدا قورەیش ناردبوویان بۆ

(١٥) أخرجه: ابو يعلى (المسند) (٤٣٨٠) وقال محققه: اسناده حسن.

(١٦) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٩/٥).

(١٧) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١١/٤)، والبيهقي (الدلائل) (٧/٥)، والطبري (التأريخ) (٦٢٣/٢)، وقال البرزنجي (صحيح الطبري) (٢٣٦): اسناده حسن.

توندوتۆڵکردنەوەی ڕێکەوتننامەکەو درێژکردنەوەی وادەکەی، چونکە ئەو کارەی پێی هەستابوون لایان مەترسیدار بوو، لەوێدا ئەبوسوفیان بە بودەیلی وت: لەکوێوە گەڕایتەوە بودەیل؟ ئەبوسوفیان وای دەزانی لە مەدینە بووە لای پێغەمبەر ﷺ، بودەیل وتی: لەگەڵ خوزاعە بەم شیو و دۆڵانەداو بەکەناری دەریادا دەڕۆیشتین، ئەبوسوفیانیش وتی: ئەی نەچوویت بۆلای موحەممەد؟ وتی: نەخێر، ئینجا یەکتریان بەجێهێشت و بودەیل گەڕایەوە بەرەو مەککە، ئەبوسوفیانیش وتی: گەر بودەیل چووبێتە مەدینە ئەوا ناوکە خورمای مەدینەی لەگەڵ ئالیکدا داوەتە وشترەکانی، پاشان چووە جێ لادانی وشترەکان و تەرسێکی هەڵگرت و کردیە دووکەرتەوە و ناوکە خورمای تیا بینی وتی: سوێند بەخوا بودەیل خۆی گەیاندۆتە لای موحوممەد.

پاشان ئەبوسوفیان بەرێکەوت تا گەیشتە مەدینەو چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و سەرەتا ڕۆیشت بۆلای کچەکەی خۆی ئوموحەبیبە ﵂ کە خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو، کاتێك چووە ماڵ ویستی دابنیشێت لەسەر ڕاخەرەکەی پێغەمبەر ﷺ ئوم حەبیبە پێچایەوە و نەیهێشت لەسەری دابنیشێت، ئەبوسوفیانیش وتی: کچی خۆم نازانم منت لا بەنرختر بوو یان ڕاخەرەکەت؟ وتی: ئەوە ڕاخەری پێغەمبەرە ﷺ تۆش پیاوێکی هاوتا بۆخوا دانەرو چەپەڵیت و منیش پێم خۆش نەبوو لەسەر ڕاخەرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دابنیشیت، ئەبوسوفیان وتی: سوێند بەخوا کچی خۆم تۆ لەوەتەی منت بەجێهێشتووە زیانت لێکەوتووە و ئەقڵت لەدەست داوە. پاشان ئەبوسوفیان چوو بۆلای پێغەمبەر ﷺ و قسەی لەگەڵ کرد وتی: (ئەی موحەممەد با ڕێکەوتنەکە توندوتۆڵتر بکەینەوەو ماوەکەی زیاتر بکەین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لەبەرئەمە تۆ هاتوویت؟ ئایا هیچ کارێك لای ئێوە ڕووی داوە؟)) وتی: پەنا ئەگرم بەخوا ئێمە لەسەر پەیمان و ڕێکەوتننامەکەی حودەیبییەین نەدەیگۆڕین و نەپوچی دەکەینەوە، پێغەمبەریش ﷺ هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، ئەویش لای پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوەو چووە لای ئەبوبەکرو پێی وت: تۆ پەیماننامەکەمان بۆ توندوتۆڵتر بکەرەوەو ماوەکەمان بۆ درێژ بکەرەوە، ئەبوبەکر ﵁ وتی: پەنای من و پەنای پێغەمبەر ﷺ هەریەکە، سوێند بەخوا گەر مێرووله لەگەڵتان بەشەڕ بێت من پشتیوانیان دەکەم.

ئەبوسوفیان داوای لە ئەبوبەکر ﷺ کرد بچێت و تکایان بۆ بکات لای پێغەمبەر ﷺ بەڵام ئەو قایل نەبوو، پاشان چوو بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب ﷺ و هەمان داواکاری لێداواکرد، عومەریش وتی: ئایا من تکا بۆ ئێوە بکەم لای پێغەمبەر ﷺ؟ سوێند بەخوا گەر هیچ شتێکم بەدەستەوە نەمێنێت تەنها خۆڵ نەبێت بەوەش لەگەڵتان بەجەنگ دێم، ئەو پەیماننامەکەی نێوانمان ئەوەی تازەبوو خوا کۆنی کرد و ئەوەی جێگیربوو خوا پچڕاندی وە ئەوەی پچڕاوە خوا هەرگیز پێکەوەی گرێ ناداتەوە، ئەبوسوفیانیش پێی وت: پاداشتت بەخراپە وەرگریتەوە، تۆ چ خزمێکیت، پاشان چوو بۆلای عوسمان لەگەڵ ئەویش قسەی کرد، عوسمانیش ﷺ وتی: پەنای من لەگەڵ پەنادانی پێغەمبەرە ﷺ.

پاشان ئەبوسوفیان چووە لای ناودارانی قورەیش و ئەنصارییەکان یەکە یەکەیان و لەگەڵیاندا قسەی کرد، هەموویان لەوەڵامیدا وتیان: گرێ بەستمان لەگەڵ گرێ بەستی پێغەمبەردایە ﷺ، ئەبوسوفیان لەهەموویان بێ ئومێد بوو، پاشان چوو بۆ ماڵی عەلی کوڕی ئەبو تالیب و بینی فاتیمەش لەوێیەو حەسەنیش منداڵە و لەوێ گاگۆڵکێ دەکات لەبەر دەستی فاتیمە، وتی: عەلی تۆ لەهەموویان خزمایەتیت لەگەڵم نزیکترە، من ئەمڕۆ بۆ پێویستییەك هاتوومەتە ئێرەو حەز ناکەم بەدەست بەتاڵی بگەڕێمەوە، تۆ بڕۆ لای پێغەمبەر ﷺ تکام بۆ بکە، عەلیش وتی: هاوار بۆ تۆ ئەبوسوفیان پێغەمبەر ﷺ بڕیاریداوە ئێمە هەرگیز ناتوانین لەسەر ئەو کارە قسەی لەگەڵ بکەین. ئەبوسوفیان ئاوڕی دایەوە بۆلای فاتیمەو داوای لەویش کرد هەمان کاری بۆ بکات، ئەویش وتی: من ژنێکم پەیوەندیم بەو کارەوە نییە ئەوە تەنها پەیوەندی بە پێغەمبەرەوە ﷺ هەیە. ئەویش وتی: کچەکەی موحەممەد، ئەی دەتوانیت داوا لەوکوڕەت بکەیت پەنای خەڵك بدات و بۆ هەتا هەتایی ببێتە سەروەری عەرەب؟ فاتیمەش وتی: وەڵاهی کوڕەکەم هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی پەنای خەڵك بدات و هیچ کەسێکیش بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ ناتوانێت پەنای کەس بدات.

ئەبوسوفیانیش وتی: ئەی باوکی حەسەن دەبینم کارەکان زۆر لەسەرم گران بووە تۆش ئامۆژگارییەکم بکە. وتی: سوێند بەخوا هیچ شتێك نازانم کە سودێکی هەبێت

بۆت، بەڵام تۆ سەرکردەی مەککەی هەستەو داوا بکە پەنای خەڵکەکەت بدرێت و پاشان بگەڕێرەوە وڵاتی خۆت. وتی: تۆ بڵێیت ئەو کارە هیچ سودێکی هەبێت بۆ من؟ عەلیش ﷺ فەرمووی: نا سوێند بەخوا گومانم وایە هیچ سودێکی نەبێت بۆت بەڵام تەنها هەر ئەو پێشنیارەم لایە بۆت. وتی: ڕاست دەکەیت منیش هەروا گومان دەبەم.

پاشان ئەبوسوفیان چووە مزگەوت و هاواری کرد وتی: ئەی خەڵکینە من پەنای هەموو قورەیشییەکان دەدەم (سوێند بەخوا من گومانم وایە کەس پەنام نەشکێنێت، پاشان چووە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی موحەممەد من خەڵکی هەندێکیان پەنا دەدەم لەهەندێکیان، سوێند بەخوا گومان وایە کەس پەنادانەکەم نەشکێنێت و ڕەتی نەکاتەوە. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((أَنْتَ تَقُولُ ذلكَ يا أبا حَنْضَلَة)) واتە: ئەوە تۆی کەوا دەڵێیت ئەی باوکی حەنزەڵە؟).

(عائیزی کوڕی عەمر دەڵێت: ئینجا ئەبوسوفیان بەلای کەسانێکدا تێپەڕبوو کە سەلمان و صوهەیب و بیلالیان لەنێودا بوو، ئەوان وتیان وەڵاهی هێشتا شمشێرەکانی خودا شوێنی خۆیان نەگرتووە لەگەردنی ئەو دوژمنەی خوادا. ئەبوبەکریش ﷺ پێی وتن: ئایا ئێوە ئاوا دەڵێن بەگەورەو سەرومری قورەیش؟ ئەوانیش چوونە لای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەیان پێ ڕاگەیاندو ڕۆیشتن پێغەمبەریش ﷺ بە ئەبوبەکری فەرموو: ((يا أَبَا بَكْرٍ، لَعَلَّكَ أَغْضَبْتَهُمْ، لَئِنْ كُنتَ أَغْضَبْتَهُمْ، لقَدْ أَغْضَبْتَ رَبَّكَ)) واتە: ئەی ئەبوبەکر پێ دەچێت تۆ ئەوانت توڕەکردبێت، گەر وات کردبێت تۆ خودات لەخۆت توڕە کردووە. دەستبەجێ ئەبوبەکریش گەڕایەوە ناویان و پێی وتن: براکانم من ئێوەم توڕە کردووە؟ وتیان: نا براکەم خودا لە گوناهت خۆش بێت)[١٨].

پاشان ئەبوسوفیان سواری پشتی وشترەکەی بوو گەڕایەوە بەرەو مەککە، کاتێك گەیشتەوە ناو شار قورەیشییەکان پێیان وت: چ هەواڵێکت پێیە (ئایا هیچ بەڵێننامەو نوسراوێکی تایبەتت لەلایەن موحەممەد لەگەڵ خۆت هێناوە؟ ئەویش وتی: چوومە لای موحەممەدو قسەم لەگەڵ کرد بەڵام ئەو وەڵامی نەدامەوە، ئینجا چوومە لای ئەبوبەکر ئەویش هیچ سودێکی پێ نەگەیاندم، پاشان چوومە لای عومەر تەماشام کرد ئەو لەهەمووان زیاتر دوژمنترە بەئێمە، ئینجا بەهەڵەداوان یەك بەدوای یەك

(١٨) أخرجه: أحمد (٢٠٦٦٥)، ومسلم (٢٥٠٤)، والنسائي (الفضائل) (١٧٢).

چوومە لایان، بەڵام هیچ پاشایەکم نەدیوە شوێنکەوتوانی بەتەواوی گوێڕایەڵی بن وەك موحەممەد، پاشان چوومە لای عەلی ئەو بەرامبەرمان لە هەمووان نەرمتر بوو، پێشنیارێکی خستە بەردەستم و منیش جێ بەجێم کرد سوێند بەخوا نازانم ئەوە سوودی دەبێت یان نا. وتیان: چی پێ وتیت؟

وتی: ئەو فەرمانی بەمن کرد من پەنای خەڵکی بدەم هەندێکیان لەهەندێکیان (وەپێی وتم: بۆچی داوای پەنادانی پێغەمبەر ﷺ دەکەیت لەکاتێکدا خۆت سەروەرو سەرکردەیانیت؟ تۆ شایستەترین کەسیت کە پەنات نەشکێندرێت. ئیتر منیش ئەو کارەم ئەنجام داو پاشان چوومە لای موحەممەد ئەوەم بۆ گێڕایەوە و وتم بڕوا ناکەم تۆش پەنادانەکەم بشکێنیت؟ ئەویش وتی: ئایا تۆ وا دەڵێیت باوکی حەنزەڵە؟)[19] قورەیشییەکان وتیان: ئایا موحەممەد ڕێگەی ئەوەی دایت؟ وتم: نا. وتیان: هاوار بۆ تۆ عەلی تەنها گاڵتەی پێکردویت و هیچ کەڵکێکی نەبووە بۆت. ئەبوسوفیانیش وتی: سوێند بەخوا هەر ئەوە دەستکەوتی من بوو (ئەوانیش وەڵامیان دایەوەو پێیان وت: بەشتێك ڕازی بوویت جێی ڕەزامەندی ئێمە نییە، هیچ شتێکت لەگەڵ خۆت نەهێناوەتەوە تا سودی بۆخۆت و ئێمە هەبێت، پەنادانەکەت لای ئەوان نرخی نییەو شکاندنیشی لای ئەوان زۆر ئاسانە) (وەڵاهی ئێمە تا ئێستا نوێنەری وەهامان نەدیوە نە ئەوەتا هەواڵی جەنگت بۆمان هێناوە تا ئێمە خۆمان بەئاگا بهێنین و وریا بین، نە ئەوەتا هەواڵی ئاشتیت بۆمان هێناوە تا ئێمە بەهۆیەوە بێ ترس بین)[20].

پاشان پێغەمبەر ﷺ نوێنەری خۆی ناردە لای قورەیش و داوای لێکردن بێبەری بوونی خۆیان لەهاوپەیمانییەتی بەنی بەکر ڕابگەیەنن، یان ئەوەتا پارەی خوێنی کوژراوەکان و زیانەکان بدەن، یان ئەوەتا ئامادەبن بۆ جەنگی موسوڵمانان. ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە پێغەمبەر ﷺ غافڵگیرانە پەلاماری قورەیشی نەداوە، بەڵکو ئەوانی سەرپشك کردووە لەنێوان جەنگ و ئاشتیدا. ئەمەش لەگێڕانەوەکەی موحەممەدی کوڕی عەبادی کوڕی جەعفەر هاتووە و دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ نوێنەری ناردە لای قورەیش و پێی ڕاگەیاندن ((أَمَّا بَعدُ: فَإِنَّكُمْ لَنْ تَبرحوا مِنْ حِلْفِ بَنِي بَكرَ أوتدوا خزاعة وإلاّ

---

(١٩) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٧) وقال محققه: مرسل رجاله ثقات.

(٢٠) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٢/٤)، والطبري (التأريخ) (٤٦/٣)، والبيهقي (الدلائل) (١٠،١١/٥) عن موسى بن عقبة واللفظ له ولا بن اسحاق بعد الجمع بين روايتيهما.

اوْذِنُكُمْ بِحَربٍ)) واتە یان ئەوەتا بەری بوونی خۆتان لەو هاوپەیمانیەتتان لەگەڵ بەنو بەکر ڕابگەیەنن یان ئەوەتا زیانەکانی خوزاعە بژمێرن، یان ئەوەتا خۆتان ئامادە بکەن بۆ جەنگ)) قورزەی کوڕی عەبد عەمری زاوای معاویە وتی: بەنی بەکر کەسانێکی شومن، بەڵام ئەوان گەر لەناوچن ئێمە هیچ پشت و پەنایەکمان نامێنێت لەبەر ئەوە، ئێمە بێ بەری بوونی خۆمان ڕاناگەیەنین لەبەنو بەکر...... بەڵام ئامادەین بۆ جەنگی موحەممەد)[٢١].

## خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ و شاردنەوەی هەواڵەکە

ئیبنو ئیسحاق دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بە خۆئامادەکردن بۆ ئەو جەنگەو لای کەس باسی نەکرد کە بەنیازە بەرەو کوێ بڕوات، داواشی لەخوای گەورە کرد کە ئەم هەواڵانەش ون بکات لەقورەیش تا غافڵگیرانە هێرش بەرێتە سەریان لەوڵاتی خۆیان)[٢٢] موسا کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (وا دەگێڕنەوە کە لەدوای گەڕانەوەی ئەبوسوفیان، پێغەمبەر ﷺ نزای کردووەو فەرموویەتی: ((اللهُمَّ خُذْ عَلى أَسْماعِهِم وَأَبْصارِهِم فلا يَرونا إلاَّ بَغْتَةً وَ لايَسْمعونَ بِنا إلاَّ فُجاءَةً))[٢٣] واتە: خوایە کەڕ و کوێریان بکە تا نەمان بینن و هەواڵمان نەبیستن تا کتوپڕ هەڵدەکوتینە سەریان)). پێغەمبەر ﷺ داوای لەعائیشەی دایکی بڕواداران کرد ئامادەکاری بکات بۆ ئەم جەنگە، عەکریمەو ئەبو سەلەمەو یەحیای کوڕی عەبدولرەحمان دەڵێن: (پاشان پێغەمبەر ﷺ بە عائیشەی فەرموو: ((جَهزيني وَلا تَعْلَمِنَّ بِذلِكَ أحداً)) واتە: کەلوپەل و پێداویستییەکانم بۆ ئامادە بکەو کەسیش لەم باسە ئاگادار مەکەرەوە.

ئەبوبەکر ﷺ چووە سەردانی و کەوتە گومانەوە لەم ئامادەکارییانەی عائیشە)[٢٤] (بینی گەنم لە بێژن دەکات و پێی وت: ئەوە چییە ئایا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووی ئەم پێداویستییانەی بۆ ئامادە بکەیت؟ ئەویش وتی: بەڵێ. فەرمووی:

---

(٢١) أخرجه: الحافظ في (الفتح) (٧/٨) وفي (المطالب العالية) (٢٤٣/٤ رقم (٤٣٦١) وقال: مرسل اسناده صحيح، وكذا قال العمري في (السيرة الصحيحة) (٤٧٣/٢).

(٢٢) أخرجه: ابن اسحاق (المغازي) (ص:٥١٤)، والطبري (التأريخ) (٤٣/٣) وقال البرزنجي في (صحيح الطبري) (٢٣٦): اسناده حسن، وقال العمري (السيرة الصحيحة) (٤٧٤/٢): اسناده صحيح.

(٢٣) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١١/٥) عن موسى بن عقبة.

(٢٤) أخرجه: ابن ابي شيبه (المصنف) (٣٨٠٥٥) وقال محققه: مرسل اسناده حسن، و أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣٢/٥).

ئەی بەرەو کوێ؟ عائیشە وتی: هیچی لا باس نەکردووین، تەنها ئەوە نەبێت داوای لێکردووین کەلوپەل و پێداویستییەکانی بۆ ئامادە بکەین)[٢٥] (هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا ئەبوبەکرو عومەریش خۆیان ئامادە بکەن. دایکی بڕواداران عائیشە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ بەمنی فەرموو: ((قُوْلِي لِإِبِي بَكر وعمر فَلْيَتَجَهزا لِهذا الغَزو)) واتە: بە ئەبوبەکرو عومەریش بڵێ خۆیان ئامادە بکەن بۆ ئەم غەزاو جەنگە. پاشان هەردووکیان هاتنە لای عائیشەو وتیان: پێغەمبەر ﷺ دەیەوێت بەرەو کوێ بڕوات؟ عائیشەش فەرمووی: سەبارەت بەهەواڵەکەی بەنی کەعب پێغەمبەرم بینیوە تورە بووە تورەبوونێك تا ئێستا نەم بینیوە بەو جۆرە تورە ببێت)[٢٦] (ئەبوبەکر پێی فەرموو: کچی خۆم ئەم خۆئامادەکارییە چییە؟ وتی: بەخوا نازانم. ئەبوبەکر وتی: ئێستا کاتی جەنگی ڕۆمەکانیش نییە دەبێت پێغەمبەر ﷺ بەنیازی کوێ بێت؟ وتی: سوێند بەخوا منیش هیچ زانیارییەکم لەلا نییە)[٢٧].

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (ئەبوسوفیان گەڕایەوەو پێغەمبەریش ﷺ ماوەیەك لەدوای ئەو مایەوە، پاشان پەلەی کرد لەخۆئامادەکردنداو فەرمانیدا بە عائیشە کەلوپەل و پێداویستییەکانی بۆ ئامادە بکات و کەسیش پێی نەزانێت، پاشان پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ مزگەوت یاخود بۆ جێبەجێکردنی هەندێك پێویستی، لەدوای ئەو ئەبوبەکر چووە سەردانی عائیشەو بینی وا گەنم بەدەستاڕ دەکات و پاشان بەبای دەکات، پێی وت: کچی خۆم ئەم خواردنە بۆچی ئامادە دەکەیت؟ عائیشەش بێ دەنگ بوو، پاشان ئەبوبەکر وتی: پێغەمبەر ﷺ دەیەوێت خۆی بۆ جەنگ ئامادە بکات؟ ئەو هەر بێ دەنگ بوو، پاشان وتی: لەوەدەچێت بیەوێت هێرش بکاتە سەر ڕۆمەکان؟ چونکە ئەوکاتە ڕۆمەکان هەندێك کاری شەڕەنگێزییان دژ بەموسوڵمانان ئەنجام دابوو. بەڵام عائیشە هەر بێ دەنگ بوو، پاشان وتی: پێ دەچێت هێرش بباتە سەر ناوچەی نەجد چونکە ئەوانیش هەندێك هەرایان ناوەتەوە؟ عائیشە هەر بێ دەنگ بوو، پاشان وتی: پێ دەچێت بیەوێت هێرش بباتە سەر قوڕەیش بەڵام (هێشتا

---

(٢٥) أخرجه: ابن هشام (١٢/٤) رقم (٩١٢) وقال محققه: سنده حسن، والبيهقي (الدلائل) (١٢/٥) وقال صاحب (صحيح السيرة) (٦٣٨): اسناده صحيح.

(٢٦) أخرجه: ابي يعلى (المسند) (٤٣٨٠) وقال محققه: اسناده حسن.

(٢٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٠٥٢/٢٣)، وفي (المعجم الصغير) (٩٦٨) وقال الهيثمي (المجمع) (١٦٤/٦) فيه ضعيف.

ماوەی ئاگربەستیان لەگەڵمان تەواو نەبووە)[٢٨]، لەو قسانەدا بوون پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە ماڵەوەو ئەبوبەکر پرسیاری لێکردو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا دەتەوێت بەرەو جێگەیەك بڕۆیت؟ فەرمووی: بەڵێ. وتی: دەتەوێت بەرەو ڕۆمەکان بڕۆیت؟ فەرمووی نەخێر. وتی: ئەی دەتەوێت بەرەو خەڵکی نەجد بڕۆیت؟ فەرمووی: نەخێر. وتی: لەوە دەچێت بتەوێت بەرەو قوڕەیش بڕۆیت؟ فەرمووی: بەڵێ. وتی: باشە ئەی پێغەمبەری خودا خۆ هێشتا ئاگربەستەکەتان لەنێواندا ماوە، فەرمووی: ((أَلَمْ يَبْلُغْكَ مَا صَنَعُوا بِبَنِي كَعْب))[٢٩] ((إِنَّهُمْ أَوَّلُ مَنْ غَدَرَ))[٣٠] واتە: ئەی هەواڵت پێ نەگەیشتووە کە چییان بەسەر بەنی کەعب هێناوە؟ ئەوان یەکەم کەس بوون غەدریان لێکردین و پەیمان شکێنییان لەگەڵ کردین.

پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی بە ئەبوبەکرو عومەر کرد، موحەممەدی کوڕی ئەلحەنیفە ﷺ دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك لەیەکێك لەماڵەکانی هاتە دەرو لای دەرگای دەرەوە دانیشت، هەرکات ئاوها بەتەنها دابنیشتایە کەس نەدەچووە لای تاخۆی بانگی نەکات، پاشان فەرمووی: ئەبوبەکرم بۆ بانگ بکەن. ئەوەبوو ئەبوبەکر هاتە خزمەتی و ڕووبەڕووی دانیشت ماوەیەکی زۆر چپەیان لەگەڵ یەکتر کرد، پاشان داوای لێکرد لەلای ڕاستی یان چەپی دابنیشێت، پاشان فەرمووی: عومەرم بۆ بانگ بکەن، ئەوەبوو عومەریش هات و لەجێی یەکەمی ئەبوبەکر دانیشت و دەنگی بەرزکردەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا قوڕەیش سەری هەموو بێ باوەڕییەکن، هەر ئەوان بوون کە وتیان تۆ ساحیریت، تۆ فاڵچیت، تۆ درۆزنیت، تۆ بوختانچیت، لەوێدا عومەر هەموو وتەکانیانی بەبیر هێنایەوەو باسی کرد. پێغەمبەریش ﷺ داوای لێکرد ئەویش لەولاکەی تریەوە دابنیشێت.

بەو جۆرە یەکێکیان لەلای ڕاستی و ئەوی تریشیان لەلای چەپییەوە دانیشتن، پاشان بانگی خەڵکی کردو فەرمووی: ((أَلَا أُحَدِّثُكُمْ بِمِثْلِ صَاحِبَيْكُمْ هَذَيْنِ))؟ واتە: ئایا هاوشێوەی ئەم دوو هاوەڵەی خۆتان بۆباس بکەم؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. پێغەمبەریش ڕووی کردە ئەبوبەکرو فەرمووی: ((إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أَلْيَنَ فِي

(٢٨) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٥) وقال محققه: مرسل اسناده حسن.

(٢٩) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١٢١١/٥) عن موسى بن عقبة.

(٣٠) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٥). وقال محققه: مرسل اسناده حسن.

اللَّهِ مِنَ الدُّهْنِ فِي اللَّبَنِ)) واتە: ئیبراهیمی پێغەمبەر لەپێناوی خوادا زۆر نەرمتر بوو لەڕۆنەکەرەی ناو دۆ. پاشان ڕووی کردە عومەرو فەرمووی: ((إِنَّ نُوحًا كَانَ أَشَدَّ فِي اللَّهِ مِنَ الْحَجَرِ ، وَإِنَّ الْأَمْرَ أَمْرُ عُمَرَ)) واتە: نوحی پێغەمبەریش لەپێناوی خوادا لەبەرد ڕەقتر بوو، بەڕاستی ڕای منیش لەگەڵ ڕای عومەردایە و ئێوەش ئامادەکاریی خۆتان ئەنجام بدەن. پاشان بڵاومیان کردو هەندێك شوێنی ئەبوبەکر کەوتن و پێیان وت: ئەی ئەبوبەکر ئێمە پێمان خۆش نەبوو پرسیار لەعومەر بکەین ئایا پێغەمبەر ﷺ بەنهێنی چی لاباس کردیت؟ ئەبوبەکر فەرمووی: پێی وتم: چیم پێ دەڵێیت سەبارەت بەهێرش بردنە سەر مەککە؟ منیش وتم: ئەوان هەموو خزمانی خۆتن و بەم جۆرە بۆم باس کرد تا وامزانی بەقسەکانم قایل بووەو جێبەجێیان دەکات. پاشان بانگی عومەری کردو عومەر وتی: ئەوان سەری هەموو بێ بڕواییەکن، تا هەموو وتە خراپەکانیانی دووبارەکردەوە و وتی: سوێند بەخوا عەرەبەکانت ناکەوێتە ژێر دەسەڵات تا خەڵکی مەککەت نەخەیتە ژێر دەسەڵاتت. ئینجا ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدان بۆ تێکۆشان و هێرش بردنە سەر مەککە)[٣١].

پێغەمبەری خوا ﷺ ((إذا أرادَ غَزوةً ورَّى بغيرِها))[٣٢] واتە: هەرکات بیویستایە بەرەو شوێنێك هێرش بەرێت ﷺ وای دەگەیاند کە دەیەوێت بەرەو ناوچەیەکی دیکە بچێت. مەبەستیشی خۆدوورگرتن بوو لەخوێن ڕشتن لەحەرەمی مەککەی پیرۆزدا، ئەوە بوو مەفرەزەیەکی بەرەو شام نارد تا خەڵکی وا بزانن دەیەوێت بەرەو ئەو ناوچەیە بڕوات. لەپاشان فەرمانیدا ڕێگە سەرەکییەکانی دەرەوەی مەدینە بگیرێت و چاودێری بەهەموو لایەکدا بڵاوکردەوە. واقیدی دەڵێت: (عومەر چاودێر بوو بەسەر ئەو هێزانەی ڕێگە سەرەکییەکانی دەرەوەی شاری مەدینەیان گرتبوو وە بەوانی دەوت: هەرکەسێکتان بەلادا تێپەڕی و گومانتان لێی هەبوو بیگێڕنەوە تەنها ڕێگەی مەککە نەبێت نابێت کەس بەرەو ئەوێ بڕوات و پێویستە لێپێچینەوەی وردی لەگەڵ بکرێت)[٣٣].

---

(٣١) أخرجه: ابن ابي شيبة (المنصف) (٣٨١٠٦) وقال محققه: اسناده صحيح لكنه من مراسيل محمد بن الحنفية.

(٣٢) أخرجه: البخاري (٢٩٤٧)، ومسلم (٢٧٩٩).

(٣٣) أخرجه: الواقدي (المغازي) (٧٩٦/٢).

# نامەکەی حاتەبی کوڕی ئەبو بەلتەعە

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ خەڵکی ئاگادارکردەوە کە دەیەوێت بەرەو مەککە بڕوات، داوای لێکردن خۆیان سازو ئامادە بکەن وە داوای لەخوا کردو فەرمووی: ((اللَّهُمَّ خذِ العُيُون والأخبار عن قُرَيْشٍ، حتَّى نبغَتَها في بلادِها))[٣٤] واتە: خودایە چاوی هەموو هەواڵ بەرەو و چاودێرەکان بگرە و نەهێڵێت ئەم هەواڵانەمان بگاتەوە بە قورەیش تا لەناکاو هەموو لایەکی شارەکەیانیان لێ بگرین.

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ داوای کرد موسوڵمانان ئامادەکاریی بکەن بۆ جەنگ. لەو کاتەدا حاتەبی کوڕی ئەبو بەلتەعە نامەیەکی بۆ قورەیش نووسی بوو وە خوای گەورەش پێغەمبەرەکەی لەوە ئاگادارکردەوە)[٣٥]. ئەنەس دەڵێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ ویستی هێرش بکاتە سەر قورەیش، حاتەبی کوڕی ئەبو بەلتەعە نامەیەکی بۆ ناردن و ئاگاداری کردنەوە)[٣٦]. هەڵگری نامەکەش کەنیزەکێکی قورەیش بوو ناوی سارە بوو.

ئەنەس ﷺ دەڵێت: (سارە کەنیزەکێکی قورەیش بوو هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ باسی نەداری خۆی بۆ کردو پێغەمبەریش ﷺ یارمەتیدا، پاشان پیاوێك هات و نامەیەکی پێدا بۆ دانیشتووانی مەککە تا خۆی لێیان نزیك بکاتەوە بۆ پاراستنی خێزانەکەی لەوێ، جبریلیش ئەو هەواڵەی بە پێغەمبەر ﷺ گەیاندو پێغەمبەریش ﷺ کەسانێکی بەدوایدا نارد)[٣٧].

ئەو بەسەرهاتەش بە چەندین شێوە گێڕدراوەتەوە لەدوای کۆکردنەوەو ڕیزکردنیان بەم جۆرەی خوارەوە دەبێت:

عەلی ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ (من و زوبێرو میقداد)[٣٨] و ئەبو مورسیدی

---

(٣٤) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٢/٤)، والطبري (التاريخ) (٤٨/٣)، وابن اسحاق (المغازي) (ص:٥١٩). وقال البرزنجي في (ضعيف الطبري) (٣٠٣): ضعيف.

(٣٥) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١٢/٥) عن موسى بن عقبة.

(٣٦) أخرجه: ابن مردوية كما في (فتح الباري) (٨٢٠/٨).

(٣٧) أخرجه: الطبراني (الاوسط) (٦٥٧٧) وقال محققه: اسناده ضعيف وكذا ضعفه الهيثمي في (المجمع) (١٧١/٦).

(٣٨) أخرجه: البخاري (٤٢٧٤)، ومسلم (٢٤٩٤)، والترمزي (٣٣٠٥).

سولەمی ناردو پێی وتین: ( انْطَلِقُوا حتَّى تَأْتُوا رَوْضَةَ خَاخٍ[٣٩] فإِنَّ بَها إِمَرأَةً مِن المُشرِكِين مَعَها كتاب مِنْ حاطب بن أبي بلتعة إلى المشركين (فَخُذُوها مِنها)[٤٠] ((و) أتوني بِها) واتە: بەرێکەوون تا دەگەنە ناوچەی باخەکەی خاخ لەوێ ئافرەتێکی موشریکەکانی لێیە، نامەیەکی حاتەبی کوڕی ئەبو بەلتەعەی بۆ ئەوان پێیە (ئێوە نامەکەی لێوەرگرن) و (بۆ منی بهێنن)[٤١]. ئێمەش بە ئەسپەکانمانەوە تیژڕەوانە بەڕێکەوتین تا گەیشتینە ئەو باخەو ئافرەتەکەمان دییەوە)[٤٢] بەسواری وشترێك بەڕێ کەوتبوو وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ بۆی باس کردبووین. پێی گەیشتین و پێمان وت[٤٣]: (کوا ئەو نوسراوەی لەگەڵ خۆتدا هێناوتە)[٤٤] (دەی نوسراوەکەمان بدەرێ)[٤٥]. ئەویش وتی: من هیچ نوسراوێکم پێ نییە. ئێمەش وشترەکەیمان یخ لێداو دامان نیشاندو کەل و پەلەکەیمان پشکنی و هیچمان نەدۆزییەوە (هاوەڵەکانم وتیان: هیچ نوسراوێکمان لەگەڵدا نەبینی)[٤٦].

پاشان وتمان: هەرگیز پێغەمبەر ﷺ درۆی نەکردووە یان ئەوەتا خۆت نوسراوەکەمان دەدەیتێ یان ئەوەتا جلەکانت پێ دادەکەنین و (دەیان پشکنین)[٤٧] عەلی وتی: (سوێند بەوەی سوێندی پێ دەخورێت یان دەتکوژم یان نوسراوەکەم پێ دەدەیت)[٤٨]. ئافرەتەکە سووربوونی ئێمەی بۆ دەرکەوت ئەو کات دەستی دایە کەلەکەی و پاشتەماڵێکی خوری لەبەردابوو[٤٩] ئەو پشتێنەی لەقەدی کردەوە کە پرچی پێ دەبەستێت[٥٠]، کردیەوەو نوسراوەکەی پێدایین. ئێمەش بەجێمان هێشت و سواری ئەسپەکانمان بووین و گەڕاینەوە لای پێغەمبەر ﷺ و نوسراوەکەمان پێدا،

(٣٩) وهي موضع قريبٌ من ذي الحليفة على بعد (١٢) ميلًا عن المدينة.
(٤٠) أخرجه: البخاري (٤٢٧٤).
(٤١) أخرجه: البخاري (٦٩٣٩)، وابو يعلى (٣٩٦) وقال محققه: اسناده صحيح.
(٤٢) أخرجه: البخاري (٤٢٧٤).
(٤٣) أخرجه: البخاري (٣٩٨٣).
(٤٤) أخرجه: البخاري (٦٢٥٩).
(٤٥) أخرجه: البخاري (٤٢٧٤).
(٤٦) أخرجه: البخاري (٦٢٥٩).
(٤٧) أخرجه: ابو يعلى (٣٩٤) وقال محققه: اسناده صحيح.
(٤٨) أخرجه: ابو داود (٢٦٥١)
(٤٩) أخرجه: البخاري (الادب المفرد) (٤٣٨) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الادب المفرد) (٣٣٩).
(٥٠) أخرجه: ابو يعلى (٣٩٨) وقال محققه: اسناده صحيح وفي رواية [فاستخرجاه من قرونها] أخرجه: البزار (٣٠٨/١) واسناده صحيح كما قال الحافظ (المطالب) (٣٧٦٥).

(تەماشا دەکەین لەلایەن حاتەبی کوڕی ئەبو بەلتەعەوە نوسراوە بۆلای چەند کەسێکی دانیشتووی مەککە، هەواڵی)[٥١] (ئەومیان پێ ئەدا کە پێغەمبەر ﷺ دەیەوێت هێرشیان بکاتە سەر)[٥٢]. پێغەمبەریش ﷺ حاتەبی بانگ کرد و پێی فەرموو: ((أَنْتَ كَتَبْتَ هذا الكِتابَ؟)) قَالَ: نَعْم)) واتە: ئایا تۆ ئەو نوسراوەت نووسیوە؟ وتی: بەڵێ[٥٣]. پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: ((یا) حاطب (ما هذا) ما حَمَلَكَ على ما صنعتَ؟)) (ئەی حاتەب) (ئەمە چییە) چی وای لێکردیت ئەم کارە بکەیت؟ حاتەب وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا پەلەم لێ مەکە)[٥٤] (سوێند بەخوا من بەگومان نەبووم لەخوا لەو کاتەوەی کە موسوڵمان بووم)[٥٥] (وەڵاهی ئێستاش هەر بڕوام بەخواو پێغەمبەرەکەی هەیە (نەگۆڕاوم و نەدەگۆڕێم)[٥٦] (بەڵام من لەڕاستیدا کەسێکی نامۆی بێ خزم و کەسوکاربووم لەناو قوڕەیشدا)[٥٧] (لەمەککەش ماڵ و منداڵم هەیە (دایکیشم لەگەڵیاندایە)[٥٨] بەم نامە نووسینە ویستم ئەوان بپارێزم)[٥٩] ویستم چاکەیەکم هەبێت لایان تا پارێزگاریی ماڵ و منداڵەکەم بکەم، چونکە هەموو یەکێك لە هاوەڵانت خزم و هۆزو کەسوکارێکی وایان هەیە کەخوا بە هۆیانەوە پارێزگارییان بکات بۆ پاراستنی ماڵ و منداڵەکانی (منیش کاتێك هیچ خزمێکم لەوێ نەبوو ویستم چاکەیەکیان لەگەڵ بکەم تا خزمانم بپارێزن، من ئەم کارەم ئەنجام نەداوە وەك پاشگەزبوونەوەم لەئاینەکەم و ڕازی بوون بەبێ بڕوایی لەدوای ئیسلامەتی، یاخود وەك ناپاکییەك لە پێغەمبەر ﷺ یاخود وەك دووڕوویەك) (لەگەڵ ئەوەشدا باش دەمزانی خوای گەورە پێغەمبەرەکەی سەردەخات و ئاینەکەشی باڵادەست دەکات)[٦٠]

---

(٥١) أخرجه: البخاري (٤٢٧٤).

(٥٢) أخرجه: البخاري (٦٩٣٩) وجاء في رواية يحي بن سلام: (اما بعد يا معشر قريش فان رسول الله a جاءكم بجيش كالليل يسير كالسيل فوالله لو جاءكم وحده لنصرهُ الله وانجز له وعده فانظروا لانفسكم والسلام) انظر: (فتح الباري) (٦٦٣/٧).

(٥٣) أخرجه: الطبري: (التفسير) (٥٥٩/٢٥) واسناده صحيح كما قال الحافظ (الفتح الباري) (٣٨١/١٢).

(٥٤) أخرجه: البخاري (٤٢٧٤).

(٥٥) أخرجه: الطبري (التفسير) (٥٥٩/٢٥) باسناد صحيح.

(٥٦) أخرجه: البخاري (٦٢٥٩).

(٥٧) خرجه: البخاري (٤٢٧٤).

(٥٨) أخرجه: أحمد (٣٥٠/٣) واسناده صحيح على شرط مسلم كما قال ابن كثير (البداية) (٥٣٤/٤).

(٥٩) أخرجه: الطبري (التفسير) (٥٥٩/٢٥) واسناده صحيح كما قال الحافظ (الفتح) (٣٨١/١٢).

(٦٠) أخرجه: أحمد (٣٥٠/٣) واسناده صحيح على شرط مسلم كما قال ابن كثير (البداية) (٥٣٤/٤).

(ئەو نوسراوەش هیچ زیانێکی نابێت بۆ خواو پێغەمبەرەکەی وتم بەڵکو سودێك بێت بۆ ماڵ و خێزانم) (ئێستاش سوێند بەخوا من هەر دڵسۆزو لایەنگری خوداو پێغەمبەرەکەیم)[٦١]. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((أما أَنَّهُ صَدَقَكُمْ (وَلا تَقُولُوا لَه إِلَّا خَيْراً)) واتە: ئەو ڕاستی لەگەڵ وتن و ئێوەش تەنها قسەی چاکی لەگەڵدا بکەن.

عومەریش ﷺ دەفەرموێت: (من لەوێدا شمشێرەکەم ڕاکێشاو پاشان وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگەم بدە دەست لەحاتەب بکەمەوە چونکە ئەو بەڕاستی بێ باوەڕبووە)[٦٢] (ئەو ناپاکی لەخواو پێغەمبەرو بڕواداران کردووە، لێم گەڕێ و (ڕێگەم بدە تا لەگەردنی ئەو دووڕووە بدەم)[٦٣] پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((یابن الخطاب)[٦٤] أَلَيْسَ مِنْ أَهل بدر؟ ( أَلَيْسَ قَدْ شَهِدَ بدرًا؟) لعلَّ اللهَ اطَّلَع على أهلِ بدرٍ فقال: اعمَلوا ما شِئْتُم فقد وَجَبتْ لَكُم الجَنّة أو غفَرْتُ لكم)) ((ئای کوڕەکەی خەتاب) ئایا حاتەب لەبەدر بەشدار نەبووە) (ئەو یەکێکە لەوان) بەڵکو خودا ئاگاداربووە لەکارەکانیان و فەرموویەتی: ئەوەی دەتانەوێت ئەنجامی بدەن و دڵنیابن من بەهەشتم بۆ ئێوە مسۆگەر کردووەو لەهەموو گوناهەکانتان خۆش بووم).

(لەوێدا فرمێسك لەچاوەکانی عومەر ڕژاو وتی: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن. خوای گەورەش ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ تُلۡقُونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلۡحَقِّ ...... ﴿١﴾ ﴾ (الممتحنة) [٦٥])[٦٦] واتە: (ئەی بڕواداران دوژمنی من و ئێوە مەکەنە دۆستی خۆتان و خۆشەویستی خۆتانیان بۆ مەنوێنن لەدوای ئەوەی کە ئەوان بێ بڕوان بەو پەیامە ڕاستەی لەلایەن خواوە بۆتان هاتووە....).

---

(٦١) أخرجه: البزار (٣٠٨/١) واسناده صحيح كما قال الحافظ (المطالب العالية) (٣٧٦٥).
(٦٢) نفس المصدر.
(٦٣) أخرجه: البخاري (٤٢٧٤).
(٦٤) أخرجه: البخاري (٤٢٧٤).
(٦٥) أخرجه: البخاري (٤٢٧٤).
(٦٦) أخرجه: البخاري (٣٩٨٣).

## دەرچوون بەرەو شاری مەککە

پێغەمبەرﷺ بڕیاریدا شاری مەککە ئازاد بکات (ئەوەی یارمەتیدا بۆ ئەو کارەی لەدوای یارمەتی خوای گەورە چەند هۆکارێك بووە لەوانە: هێزو یەکڕیزیی بەرەی موسوڵمانان لەناو خۆی مەدینە لەدوای ڕزگاربوونیان لەناپاکی جولەکەکان، هەروەها لاوازی بەرەی بێ باوەڕان لەدوای لەدەستدانی پشتیوانی کردنی جولەکەو دووڕووەکانی مەدینە، هەروەها زۆری ژمارەو کەلوپەلی سەربازی و بەهێزکردنی گیانی بەرهەڵستی و ورە بەرزییان لەڕێگەی ناردنی مەفرەزەکان یەك لەدوای یەك، لەگەڵ لاوازی هێزی سەربازی موشریکەکان، هەروەها موسوڵمانان ئابورییان زۆر بەهێزبوو بەڵام قوڕەیش ئابورییەکەی زۆر لاوازبوو بەهۆی موسوڵمان بوونی زۆربەی هۆزەکانی چواردەوری مەدینە، هەروەها کێشەی موسوڵمانان کێشەیەکی ڕەوا بوو لەدوای شکاندن و پێشێل کردنی قوڕەیش بۆ ڕێکەوتننامەکەیان لەگەڵ موسوڵمانەکان و دەستدرێژییان بۆ سەر خوزاعەی هاوپەیمانی موسوڵمانەکان)[٦٧].

پێغەمبەرﷺ بۆ ئەوەی مەبەستەکەی بەنادیاری بمێنێتەوە سەرەتا مەفرەزەیەکی نارد بۆ ڕێگای شام بۆ ناوچەی شیوی (اضم) کە سی و پێنج میل دووربوو لەشاری مەدینە: ئیبنو سەعد دەڵێت: (لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ ویستی هێرش بەرێتە سەر شاری مەککە، ئەبوقەتادەی کوڕی ڕەبعی لەگەڵ هەشت کەس نارده ناوچەی شیوی (اضم) (لەیەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزاندا) بۆئەوەی گومان وابێت کە پێغەمبەر ﷺ دەیەوێت ڕووبکاتە ئەو ناوچەیە....)[٦٨].

ئەبو سەلەمەو عەبدول ڕەحمانی کوڕی حاتەب ﷺ دەفەرموێت: (پاشان پێغەمبەر ﷺ وای کرد کە..... دانیشتوانی مەککەش هیچ هەواڵێکیان پێ نەگەیشت)[٦٩] واقیدیش دەڵێت: (عومەریش سەرپەرشتیاری ئەو قۆڵە بوو، نەیدەهێشت کەس بەرەو شاری مەککە بڕوات)[٧٠] پێغەمبەریش ﷺ هەموو هۆزەکانی چواردەوری مەدینەی ئاگادار

(٦٧) انظر: السيرة النبوية (٤٨٤/٢) للصلابي.

(٦٨) أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (١٣٢/٢)، وابن ابي شيبة (المصنف) (٥٤٧/١٤)، البيهقي (الدلائل) (٣٠٦/٤)، وقال: الارناؤوط في تخريجه ابن حبان (١١/١١) في سنده مجهول.

(٦٩) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٥) وقال محققه: مرسل واسناده حسن.

(٧٠) أخرجه: الواقدي (المغازي) (٧٩٦/٢).

کردەوە کە خۆیان و چەکدارەکانیان لەشاری مەدینە کۆ بکەنەوە، هەزار چەکدار لەهۆزی بەنی سولەیم[٧١] ئامادەبوو لەگەڵ چوارسەد چەکداری موزینەو بەنی غەفار، چوارسەد چەکداریش لەهۆزی ئەسلەم و هۆزەکانی تەمیم و قەیس و ئەسەد[٧٢] و ئەوانی تریش کە لەڕێگادا هاتنە ناو ڕیزی موسوڵمانانەوە تا ژمارەی هەموو سوپا گەیشتە دە هەزار جەنگاوەر، مەفرەزەکەی ئەبوقەتادەش گەڕایەوەو لەڕێگا گەیشتەوە بەسوپای موسوڵمانان دوای ئەوەی زانیان بەرەو مەککە ڕۆیشتن لەناوچەی (سەقیا)[٧٣] بەموسوڵمانان گەیشتنەوە.

سەبارەت بەدیاریکردنی ڕۆژی دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ موسوڵمانان بەرەو شاری مەککە چەندەها گێڕانەوە هەن لەوبارەیەوە لەوانەش:

ئەبوسەعیدی خودری دەڵێت: (دوو شەو لەمانگی ڕەمەزان لایدابوو ئەو کات ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەڕێکەوتین بۆ ئازادکردنی شاری مەککە)[٧٤]. ئیبنو عەباس دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ بەرەو شاری مەککە ڕۆیشت لە دەی مانگی ڕەمەزاندا)[٧٥]. قەتادەش دەڵێت: (ڕۆژی شازدەی ڕەمەزان بوو) لە گێڕانەوەیەکی تردا (حەڤدە بوو یان هەژدە بوو یان نۆزدەی مانگی ڕەمەزان)[٧٦]. وە لەگێڕانەوەیەکی تردا (ڕۆژی سیازدەی مانگی ڕەمەزان بوو)[٧٧].

ئیبنو حەجەر ﷬ دەڵێت: (زۆربەی ژیاننامەنووسان کۆکن لەسەر ئەوەی لە دەی ڕەمەزاندا ڕۆیشتووەو بۆ نۆزدەی ڕەمەزان گەیشتووەتە مەککە..... کۆکردنەوەی گێڕانەوەکان بەوە دەبێت بڵێین: لە دووی مانگی ڕەمەزاندا ڕۆیشتووەو لە چواردەی

---

(٧١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٠٣٩)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٧٧/٦): رجاله رجال الصحيح.

(٧٢) أخرجه: ابن هشام (الطبقات) (٣٦/٤)، و الطبراني (التأريخ) (٦٤/٣).

(٧٣) أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (١٣٢/٢)، والبيهقي (الدلائل) (٣٠٦/٤).

(٧٤) أخرجه: أحمد (٨٧/٣) (١١٨٢٦) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وقال الحافظ (الفتح) (٤/٨): اسناده صحيح.

(٧٥) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٩٧)، وابن هشام (السيرة) (١٥/٤) وقال محققه: اسناده حسن، والحاكم (٤٣/٣) وصححهُ على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والطبري (التاريخ) (١١٤/٣)، والطبراني (الكبير) (١٠،١٥/٨)، وابو داود (٣٠٢١)، والبيهقي (الدلائل) (٣١/٥) وصححة الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٣٣٤١).

(٧٦) أخرجه: مسلم (١١١٦)، وأحمد (١١٨٧٠).

(٧٧) أخرجه: أحمد (٢٥٠٠) وقال محققه: اسناده حسن، وفي رواية مسلم (١١١٣) قال الزهري: (فصبح رسول الله ﷺ مكة لثلاث عشرة ليلة خلت من رمضان).

ڕەمەزاندا گەیشتووەتە مەککەو دوازدە ڕۆژی پێچووە لەڕێ ڕۆشتنەکەیدا)[٧٨].

ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی لەدوای خۆی دانا بۆ بەڕێوەچوونی کاروبارەکانی ناو شاری مەدینە ناوی ئەبورِهمی کلسومی کوڕی حوصەین بوو)[٧٩]. لەگێڕانەوەیەکی لاوازدا هاتووە: (کاتێك خۆی و سوپاکەی گەیشتوونەتە ناوچەی (الروحاء) تەماشای پەڵە هەورێکی قنج و قووتی کردووە و فەرموویەتی: (ئەو پەڵە هەورە قنج و قوتەش ئامادەیە بۆ سەرخستنی بەنی کەعب....وپاشان فەرموویەتی: ((اللهمَّ عمِّ عليهم خَبَرَنا حتى نأْخُذَهم بغتةً))[٨٠] واتە: خودایە هەواڵی ئێمەیان لێون بکە تا لەناکاو بیانگرین و هێرشیان ببەینە سەر).

## ئەو پێشهاتانەی لەڕێگەی مەککە ڕوویاندا

### ١.پەیدابوونی شاعیرەکە:

سوپای موسوڵمانان کاتێك گەیشتنە ناوچەی (العرج) و بەوێدا تێ دەپەڕین، شاعیرێکیان لێ پەیدابوو شیعری جوێندان و زەم و ناشرینی دەوت. ئەبوسەعیدی خودری ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەناوچەی (العرج) دا تێدەپەڕین، شاعیرێکمان لێ پەیدابوو شیعری دەوت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (خذوا الشيطان (أو) أمسكوا الشيطان، لأن يمتلئ جوف أحدكم (من عانته إلى لهاته قيحًا يَتَخَضْخضُ)[٨١] (حتى يريه) خيرٌ له مِن أن يمتلئ شعرًا))[٨٢] واتە: ئەو شەیتانە بگرن و قۆڵ بەستی بکەن، گەر یەکێك لەئێوە لەدامێنییەوە تا ناودەمی پڕ بێت لەکێم و جەراعەت و خۆی بیبینێت باشترە لەوەی پڕ بێت لەشیعر.

### ٢.عەبدوڵڵا ئەبوسوفیان دەگەن بەسوپای موسوڵمانان:

کاتێك سوپا گەیشتە ناوچەی بەرزایی (العقاب) کە دەکەوێتە نێوان ناوچەی (السقيا

---

(٧٨) انظر: فتح الباري (٤/٨).

(٧٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٥/٤)، وابوداود (٣٠٢١)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٣٣٤١).

(٨٠) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٠٥٢/٢٣)، وفي (الصغير) (٩٦٨)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٦٤/٦): فيه ضعيف.

(٨١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٤٤/١٨) واسناده حسن كما قال الحافظان الهيثمي (المجمع) (١٢١/٨)، وابن حجر (فتح الباري) (٦٧١/١٠).

(٨٢) أخرجه: البخاري (٦١٥٤)، ومسلم (٢٢٥٩)، وأحمد (١١٠٥٧) وقال محققوه اسناده صحيح على شرط مسلم، وهذا الحديث وعيدٌ لمن كان الغالب عليه الشعر وكان يصده عن ذكر الله والعلم والقرآن وكان اشعاره هجواً أو مجوناً.

والعرج)[٨٣] لەوێدا عەبدوڵڵای کوڕی ئومەیەیی پورزای پێغەمبەر ﷺ کە لەمەککەوە کۆچیکردبوو گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ وە لەناوچەی (الإبواء)[٨٤]یش پورزای خۆی ئەبوسوفیانی کوڕی حارسیش کە موسوڵمانیش بووبوو وە کۆچی کرد بوو لەوێدا بە پێغەمبەر ﷺ گەیشت.

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (ئەبوسوفیانی کوڕی حاریسی کوڕی عەبدول موتەلیب عەبدوڵڵای کوڕی ئومەیەیی کوڕی موغیرە بەسوپای موسوڵمانان گەیشتن لای بەرزایی (العقاب) لەنێوان مەککەو مەدینەداو ویستیان چاویان بەپێغەمبەر ﷺ بکەوێت، ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ تکای بۆکردن وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان ئامۆزاو پورزاو زاوای خۆتن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لا حاجة لي بهما، أما ابن عمي فهتك عرضي بمكة، وأما ابن عمتي وصهري فهو الذي قال لي بمكة ما قال)) واتە: (پێویستم پێیان نییە ئامۆزاکەم کەسایەتی شکاندم لەمەککەو پورزاو زاواکەشم ئەو هەموو وتە ناشرینانەیان پێ وتم لەمەککە).

ئەوان کاتێك ئەم هەواڵەیان بۆچوو. ئەبوسوفیان کوڕێکی خۆی لەگەڵ بوو وتی: سوێند بەخوا یان ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ ڕێگەم دەدا بچمە لای، یان ئەوەتا دەستی ئەم کوڕەم دەگرم و بەزەویدا دەڕۆین تاکو هەردووکمان لەبرسییەتی و تونیەتیدا دەمرین. کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەم قسەیەی بیست دڵی بۆی نەرم بوو پاشان ڕێگەی دان، هەردووکیان چوون بۆلای و موسوڵمان بوون لەوێدا ئەبوسوفیان چەندەها دێڕ شیعری جوانی وت سەبارەت بەموسوڵمان بوونی و داوای لێبووردنی کرد لەسەر هەموو ئەو هەڵانەی کە پێشتر ئەنجامیدا بوون..... تا گەیشتە ئەو دێڕەی وتی: ئەوەی هات بۆلای خواو بەڵام تۆ لەخۆتت دوورخستەوە بەهەموو لایەکدا. پێغەمبەر ﷺ دەستی کێشا بەسنگی ئەبوسوفیانداو فەرمووی: ((أنتَ طَرَّدتني كُلَّ مُطرَّدٍ))[٨٥] واتە: لەڕاستیدا تۆ بوویت منت بەهەموو لایەکدا لەخۆت دووردەخستەوە.

---

(٨٣) انظر: (السيرة الصحيحة) (٤٧٦/٢) للعمري.

(٨٤) نفس المصدر السابق.

(٨٥) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٩٧)، وابوداود (٣٠٢١)، وابن هشام (السيرة) (١٥/٤) و(٩١٦) وقال محققه: اسناده حسن، والحاكم (٤٣/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والطبري (التاريخ) (١١٤/٣) والطبراني (الكبير) (٧٢٦٤)، والبيهقي (الدلائل) (٣٧/٥)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٣٣٤١)، والعمري (السيرة الصحيحة) (٤٧٦/٢) والبرزنجي (صحيح الطبري) (٢٣٩).

## ٣.پێغەمبەر ﷺ سەردانی گۆڕی دایکی دەکات:

کاتێك سوپای موسوڵمانان گەیشتە (ودان)ی نزیك ناوچەی (الإبواء) لەوێدا پێغەمبەر ﷺ سەردانی گۆڕی دایکی خۆی کرد، بورەیدە لەباوکیەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەغەزای ئازادکردنی شاری مەککەدا)[٨٦] بوو لەگەڵی ڕۆیشتم تا گەیشتینە ناوچەی (ودان) کە هەشت کیلۆمەتر لە (الإبواء) وە دوورە[٨٧]، لەوێدا لەگەڵ (هەزار سوار)[٨٨]مان لەگەڵ بوو و ئێمە لامانداو پێغەمبەر ﷺ سەردانی گۆڕی دایکی خۆی کردو بە ئێمەیی فەرموو: ((مَكَانَكُمْ حَتَّى آتِيَكُمْ)) واتە: ((لەجێی خۆتان بوەستن تا دەگەڕێمەوە لاتان)) پاشان بەرەو گۆڕستانێکی ئەوێ (ڕۆیشت)[٨٩] تا گەیشتە لای یەکەم گۆڕیان لەوێ لای دانیشت[٩٠]، وەك (قسەی لەگەڵ بکات)[٩١] (دەتوت قسە لەگەڵ مرۆڤێکدا دەکات)[٩٢] پاشان (گەڕایەوە لامان و زۆر دڵی توند بوو)[٩٣] و خەفەتباربوو، هاوەڵانی هاتن و لەچواردەوری دانیشتن و لەوێ (دوو ڕکات نوێژی بۆ کردین، پاشان ڕووی تێکردین و هەردوو چاوی فرمێسکیان لێدەڕژا و گریا تا هەموو ئەوانەی لەوێ لەچواردەوری بوون گریان)[٩٤] عومەر هەستاو بەرەولای چوو (دایك و باوکی خۆی کردە فیدایی)[٩٥] و پێی وت باوك و دایکم فیدات بێت ئەوە چیتە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟ چی وای لێکردیت تا بگریت؟ فەرمووی: ((اسْتَأْذَنْتُ رَبِّي فِي الأَسْتِغْفارِ لِأُمِّي فَلَمْ

---

(٨٦) أخرجه: أحمد (٢٣٠٣٨) وقال محققه: حديث صحيح.

(٨٧) أخرجه: أحمد (٢٣٠١٧) وقال محققه: حديث صحيح.

(٨٨) أخرجه: الحاكم (٣٧٥/١) و (٦٠٥/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، و أحمد (٢٣٠٣٨) وقال محققوه: صحيح على شرطهما.

(٨٩) أخرجه: أحمد (٢٣٠١٧) وقال محققوه: حديث صحيح.

(٩٠) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (١١٩٣٠)، وقال الشيخ الالباني في (الارواء) (٢٢٥/٣) اسناده صحيح على شرط مسلم.

(٩١) نفس المصدر السابق.

(٩٢) أخرجه: أحمد (٢٣٠٣٨) وقال محققوه: حديث صحيح.

(٩٣) أخرجه: أحمد (٢٣٠١٧) وقال محققوه: حديث صحيح.

(٩٤) أخرجه: أحمد (٩٦٨٨) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، ومسلم (٩٧٦)، وابي داود (٣٢٣٤)، وابن ماجة (١٥٧٢)، والنسائي (٩٠/٤)، وابي يعلى (٦١٩٣)، وابن حبان (٣١٦٩) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والحاكم (٣٧٥/١) وصححه على شرط مسلم.

(٩٥) أخرجه: ابوداود (٣٢٣٥)، والنسائي (٨٩/٤)، والترمذي (١٠٥٤)، وأحمد (٢٣٠٠٣) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابن حبان (٥٣٩٠) وقال محققه: حديث صحيح، والحاكم (٣٧٦/١) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وصححه على شرطهما ايضاً الشيخ الالباني في (احكام الجنائز) (٦٨٨).

يَأْذَنْ لِي فَذَكَرْتُها (فَرَقَتُ نَفْسي) فَدَمَعْتُ عَيْناي رَحْمَةَ لَها (مِن النَّار) واستَأْذَنْتُ رَبِّي في زيارَتِها فَأَذَنَ لِي وَإِنِّي كُنْتُ نُهِيْتُكُم عَنْ زِيارَةِ القُبُورِ فزُورُوها فإنَّها تُذَكِّرُكم الموتَ))[٩٦] (ولْتَزِدْكم زيارتُها خيًرا) واتە: (ئەوە گۆڕی دایکمە) (من) (داوام کرد لەخوای گەورە تا ڕێگەم بدات داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەم بەڵام ڕێگەی نەدام منیش یادیم کردو (دڵم بۆی نەرم) بوو فرمێسك ڕژا لەچاوانم لەبەزەییدا و داوام لەخوا کرد ڕێگەم بدات تا سەردانی بکەم و ڕێگەی دام، من پێشتر سەردانی گۆڕستانم لێ قەدەغە کردبوون بەڵام لێرە بەدواوە سەردانیان بکەن چونکە مردنتان بەبیر دەهێنێتەوە) (با سەردانیان سودی هەبێت بۆتان). باوکی بورەیدە دەڵێت: لەژیانمدا ژمارەی زۆرم نەدیوە هەموو پێکەوە بگرین وەك ئەو ڕۆژە)[٩٧].

## ٤.نەخۆشکەوتنی سەهلی کوڕی حەنیف:

کاتێك سوپای موسوڵمانان گەیشتنە شیویی (خەزار) لای (جوحفە) لەوێدا سەهلی کوڕی حەنیف چوو خۆی بشوات لەو چەمەدا، بەڵام عامیری کوڕی ڕەبیعە بەچاویەوە کرد، دواتر هێنایانە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و فەرمانیدا عامیر دەستنوێژ بشوات لە تەشتێکداو پاشان ئەو ئاوی دەست نوێژەی پرژاند بەسەهلداو لەجێی خۆی چاك بووەوە. ئەم بەسەرهاتە بەچەندین شێوە گێڕدراوەتەوە لەدوای کۆکردنەوەیان و ڕێکخستنیان بەم جۆرەی لای خوارەوە دەبێت:

١- ئەبو ئومامە سەهلی کوڕی حەنیف دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەڕێکەوتبووین تا گەیشتینە شیوی (خەزار) لە ناوچەی (جوحفە) من پیاوێکی سپی پێست بووم چووم تا لە چەمەکەدا خۆم بشۆم (کاتێك جبەکەم دانا)[٩٨] عامیری کوڕی ڕەبیعەی بەنی عەدیی کوڕی بەنی کەعب تەماشای کردم وتی: تا ئێستا پێستی سپی و جوانی وەهام نەدیوە، هەر لەوێدا (من کەوتم)[٩٩] (چاو لێی دام زۆر بەتوندی

---

(٩٦) أخرجه: ابوداود (٣٢٣٥)، والنسائي (٨٩/٤)، والترمذي (١٠٥٤)، وأحمد (٢٣٠٠٣) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابن حبان (٥٣٩٠) وقال محققه: حديث صحيح، والحاكم (٣٧٦/١) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وصححه على شرطهما ايضاً الشيخ الالباني في (احكام الجنائز) (٦٨٨).

(٩٧) أخرجه: الحاكم (٣٧٥/١) و (٦٠٥/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي والارناؤوط في تحقيقه لـ(مسند احمد) (٢٣٠٣٨).

(٩٨) أخرجه: ابن حبان (٦١٠٥) وقال محققه: رجاله ثقات.

(٩٩) أخرجه: الحاكم (٢١٥/٤) وصححه و وافقه الذهبي.

نەخۆش کەوتم)[١٠٠] (تا لەبەر توندی ئازارەکەم هۆشم لای خۆم نەما)[١٠١]. یەکێك چوو بۆلای پێغەمبەر ﷺ و پێی وت: ئاگات لەسەهلی کوڕی حەنیفە ((بڕۆ فریای سەهل بکەوە)[١٠٢] (سوێند بەخوا ناتوانێت سەر بەرزبکاتەوەو هۆشی لای خۆی نییە و ناتوانێت نوێژەکانی بکات لەگرانی ئازارەکەیدا)[١٠٣] (هەرگیزیش ناتوانێت لەم سەفەرەتدا لەگەڵت بێت)[١٠٤]. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هَلْ تَتَهِمُونَ فِيهِ مِنْ أَحد؟)) واتە: گومانتان لەکەس هەیە وای بەسەر هێنابێت؟ وتیان: بەڵێ (عامیر بەلایدا ڕۆیشت و بینی خۆی دەشوات)[١٠٥] تەماشای کردو وتی: (سوێند بەخوا تا ئێستا پێستی وا جوانی شاراوەم نەدیوە)[١٠٦].

پێغەمبەریش ﷺ بانگی عامیری کردو زۆر بەتوڕەییەوە لەگەڵی قسەی کردو فەرمووی: (((سُبْحانَ الله)) عَلى مَا يَقْتُل أَحَدُكُمْ أَخاهُ هلَّا إذا رأَيْتَ ما يُعجِبُك برَّكْتَ (إنَّ العين حقٌ)[١٠٧]....). واتە: پاکی و بێگەردی بۆ خوا باشە یەکێك لەئێوە بە چ مافێك براکەی خۆی دەکوژێت؟ ئەگەر شتێکی تیادا بینی با داوای بەرەکەتی لەخوا بۆ بکردایە (چونکە چاوپیسی ڕاستە). (پاشان سەهلیان هێنا بۆلای پێغەمبەر ﷺ و ئەو هەواڵەی پشتڕاست کردەوەو ڕوداوەکەی بۆ گێڕایەوە کەچۆن بوو)[١٠٨]دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ بەعامیری فەرموو: لەتەشتێکدا دەستنوێژ بگرە، عامیریش دەستنوێژی گرت و سنگی و لەئەژنۆوە بۆ خواری بۆ شۆرد لەگەڵ ناوەوەی پەشتەماڵەکەی، پاشان جامێك لەو ئاوە (درا بەسەهل و خواردیەوە)[١٠٩] پاشان کەسێکیش هەموو ئاوی تەشتەکەی بەیەك جار بەسەرو ملیدا کرد لەدواوە، ئینجا تەشتەکەش لەدوای سەهلەوە سەروژێر

---

(١٠٠) أخرجه: ابن حبان (٦١٠٥) وقال محققه: رجاله ثقات.

(١٠١) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٢٤٠٦).

(١٠٢) أخرجه: النسائي (عمل اليوم والليلة) (٢٠٨) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٠٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٥٧٨).

(١٠٤) أخرجه: ابن حبان (٦١٠٥) وقال محققه: رجاله ثقات.

(١٠٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٥٧٣،٥٥٧٥).

(١٠٦) أخرجه: ابن حبان (٦١٠٦) وقال محققه: حديث صحيح.

(١٠٧) أخرجه: ابن حبان (٦١٠٥).

(١٠٨) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٥٨١).

(١٠٩) أخرجه: نفس المصدر.

دانرا..... ئیتر لەوێدا یەکسەر سەهل چاك بووەوە و توانی لەگەڵ سوپاکەدا بڕوات)[١١٠].

٢- عامری کوڕی ڕەبیعە ﷺ دەفەرموێت: (بەلای چەمێکدا ڕۆیشتین)[١١١] (من و سەهلی کوڕی حەنیف بەدوای درەختێك یان تاوێرە بەردێکدا دەگەڕاین تا چەمۆلکەیەکمان دییەوە، هەریەکەمان شەرمی دەکرد جلەکانی دابنێ و کەسێکی تر تەماشای بکات، سەهل لەدوای شتێکەوە خۆی پەناداو کاتێك دڵنیابوو کەس نایبینێت جبەیەکی خوری لەبەردا بوو دایناو منیش پشتیم بینی و سەرسام بووم پێی و بەچاومەوە کرد (ئەو دابەزییە ناو ئاوەکە تا خۆی بشوات من گوێم لەقوڵپە قوڵپی ئاوبوو)[١١٢] (هەر لەئاوەکەدا توشی لەرز هات) (منیش سێ جار بانگم لێکرد بەڵام وەڵامی نەدامەوە)[١١٣] (ئینجا من چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەم پێ ڕاگەیاندو فەرمووی: ((با بڕۆین)) ڕۆیشتین تا گەیشتنە لای سەهل، لەوێ پێغەمبەر ﷺ هەردوو قاچی هەڵکردو چووە ناو ئاوەکەوە، ئێستاش سپییەتی هەردوو قاچیم لەبەرچاوە (کاتێك بەناو ئاوەکەدا دەڕۆیشت)[١١٤] تا گەیشتە لای و کێشای بەسەر سنگیداو فەرمووی: ((بِسْمِ اللهِ اللهُمَّ أَذْهِبْ حَرَّهَا وَبَرْدَهَا وَوَصَبَهَا)) واتە: (بەناوی خوا، خوایە گەرمی و ساردی و نەخۆشییەکەی لەسەر لابەریت)، پاشان فەرمووی: هەستە بەناوی خوا، دواتر فەرمووی: ((إذا رأى أحدُكم من نَفسِهِ ، أو مالِهِ أو أَخيهِ ما يُعْجِبُهُ فَلْيَدْعُ بِالبَرَكَةِ فإنَّ العَينَ حقٌّ))[١١٥] واتە: هەرکات یەکێك لەئێوە سەرسام بوو بەنیعمەتێك لەخۆیدا یان لەسامانەکەیدا یاخود لەبراکەیدا با داوای بەرەکەتی لەخوا بۆ بکات چونکە چاوپیسی ڕاستە.

---

(١١٠) أخرجه: مالك (٩٣٩/٢)، وابن ماجة (٣٥٠٩)، والنسائي (الكبرى) (٧٦١٨)، وأحمد (١٥٩٨٠) وقال محققه: حديث صحيح، والبيهقي (الدلائل) (٦٣/٦)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٥٧٢)، و المشكاة (٤٥٦٢) واللفظ لأحمد وقد ورد كيفية الغسل في الطبراني (الكبير) (٥٥٧٧)، وابن أبي شيبة (المصنف) (٢٤٠٦١)، والحاكم (٤١٠/٣)، و (زاد المعاد) (١٥٧/٤).

(١١١) أخرجه: ابو داود (٣٨١٨)، والنسائي (عمل اليوم والليلة) (١٠٣٤)، والحاكم (٤١٣/٤) وصححه و وافقه الذهبي.

(١١٢) أخرجه: أحمد (١٥٧٠٠) وقال محققوه: اسناده ضعيف.

(١١٣) أخرجه: نفس المصدر السابق.

(١١٤) أخرجه: ابو يعلى (٧١٩٥) وقال محققوه: اسناده جيّد.

(١١٥) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٢٤٠٦٠)، والنسائي (الكبرى) (١٠٠٣٩) و(عمل اليوم والليلة) (٢١١) وقال محققه: حديث صحيح، والحاكم (٢١٦/٤) و (٢٤٠/٤) وصححه ووافقه الذهبي، وعبدالرزاق (المصنف) (١٩٧٦٦)، وابن السني (عمل اليوم والليلة) (٢٠٥) وقال محققه: صحيح.

## ٥.هاتنی عەبباسی مامی پێغەمبەر ﷺ:

کاتێك سوپا گەیشتە ناوچەی (جوحفە)ی نزیك ناوچەی (رابغ) عەبباسی مامی پێغەمبەر ﷺ کۆچی کردبوو بۆلای پێغەمبەر ﷺ لەوێدا بەخۆی و خێزانەکەیەوە بە سوپای موسوڵمانان گەیشتن. عەبدوڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەفەرموێت: (عەبباسی کوڕی عەبدولمتەلیب لەڕێگادا گەیشت بەپێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان)(١١٦). زوهری ﷺ دەفەرموێت: (عەبباس خۆی و خانەوادەکەی کۆچیان کرد بوو، لەناوچەی (جوحفە) گەیشتن بە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان، پێشتریش لەمەککە مابووەوە تەنها بەمەبەستی ئاودان بەحاجیان و زیارەتکارانی ماڵی خواو پێغەمبەریش ﷺ لێی ڕازی بوو)(١١٧).

## ٦. شکاندنی ڕۆژوو:

سوپای موسوڵمانان لەمانگی ڕەمەزاندا ئەم لەشکرکێشییەیان ئەنجامداو هەموو جەنگاوەرەکان بەڕۆژوو بوون، تا گەیشتنە ناوچەی (کەدید) لەوێدا پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا هەمووان ڕۆژووەکەیان بشکێنن، ئەبوسەعیدی خودری ﷺ دەفەرموێت: (لەو سەفەرەماندا هەموو بەڕۆژوو بووین من پێغەمبەرم ﷺ، بینی ئاوی بەسەریدا دەکرد لەناوچەی (سوقیا) یان لەبەر گەرما بوو یان لەبەر تونییەتی ڕۆژووەکەی بوو)(١١٨) وترا: ئەی پێغەمبەری خوا هەندێك لەخەڵکی (کاتێك تۆیان بینی بەڕۆژوو بوویت)(١١٩) ئەوانیش بەڕۆژوو بوون، پێغەمبەر ﷺ بەردەوام هەر بەڕۆژوو بوو (تا گەیشتە چەمی کەدید لەنێوان ناوچەی قەدیدو عوسفان)(١٢٠).

لەگێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ گەیشتە چەمێکی ئاوی باراناو

---

(١١٦) أخرجه: ابن شيبة (المصنف) (٣٨٠٩٧)، وابوداود (٣٠٢١)، و(الحاكم) (٤٣/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه (الذهبي) وصححه الشيخ (الالباني) في (الصحيحة) (٣٣٤١).

(١١٧) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٥/٤).

(١١٨) أخرجه: أحمد (١٦٦٠٢،١٦٦٠١) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(١١٩) أخرجه: ابوداود (٢٣٦٥)، وأحمد (١٥٩٠٣) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والنسائي (الكبرى) (٣٠٢٩)، والحاكم (٤٣٢/١) وصححه.

(١٢٠) أخرجه: البخاري (٤٢٧٥).

لە رۆژێکی گەرمی هاویندا پیادەڕەوان لەگەڵیدا زۆر بوون هەمووشیان بەرۆژووبوون (ئەو کاتە پێغەمبەر ﷺ سواری هێسترەکەی بووبوو) لای ئەو چەمە وەستاو لەناو ئەو خەڵکەدا فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە ئاو بخۆنەوە)) بەڵام ئەوان ئاویان نەخواردەوە و تەماشای پێغەمبەریان دەکرد، دووبارە پێی فەرموون: ((اشرَبوا إنِّي لَستُ مثلَكُم، إنِّي راكبٌ وأنتُمْ مشاةٌ، وإنِّي أيسَرُكُمُ اشرَبوا اشربوا)) واتە: (ئاو بخۆنەوە)) من وەك ئێوە نیم من سواری وڵاخم و ئێوە پیادەڕون، من ماندوو نیم لەبەرئەوە ئێوە ئاو بخۆنەوە). بەڵام خەڵکەکە تەماشایان کرد و ئاویان نەخواردەوە (پێغەمبەر ﷺ لەوێدا خۆی نەوی کرد)[١٣١] ودابەزی و ئاوی خواردەوە، پاشان خەڵکی هەموو ئاویان خواردەوە هەتا ئەوانەیان کەپێشتر نەیان دەویست ئاو بخۆنەوە لەوێدا پێی فەرموون: ((لِيصُمِ النَّاسُ ويُفطِروا فمَن صَامَ أَجزَأَ عَنْهُ صَومُهُ وَمَنْ أَفْطَرَ وَجَبَ عَلَيهِ القَضاءُ ))[١٣٢] واتە: (ئەوەی دەیەوێت رۆژووەکەی بشکێنێت با وا بکات، ئەوەیشی دەیەوێت بەرۆژوو بێت با وا بکات و رۆژووەکەی بۆ دەنوسرێت، ئەوەیشی شکاندی پێویستە رۆژووەکەی بگێڕێتەوە).

لەگێڕانەوەیەکی تردا جابر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردین تا رۆژووەکەمان بشکێنین و فەرمووی: ((ئێوە نزیك بوونەتەوە لەدوژمنەکەتان و رۆژوو شکاندن بۆ ئێوە بەهێزترە)) بەم جۆرە شکاندنی رۆژووەکە روخسەتێك بوو بۆ ئێمە، لە ئەنجامدا هەندێك لەئێمە بەرۆژوو بوو وە هەندێکیش بەرۆژوو نەبوو)[١٣٣].

لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: (لەرەمەزانێکدا لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین لەغەزادا، پیاوێك بەرۆژووبوو (وەزۆر لەسەری گران بوو) و بەتەواوی لاوازبوو، نزیکبوو لەتونیەتیدا بمرێت و ئاگای لە وشترەکەی نەمابوو، وە جارجار بەژێر داردا دەرۆیشت، هەواڵەکەیان گەیاندە پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی: (بۆم بێنن) چوون بۆیان هێناو پێی فەرموو: ((أَلَسْتَ فِي سَبِيْلِ الله وَمَعَ رَسُولِ الله ﷺ حَتى تَصُومَ))[١٣٤]

---

(١٢١) أخرجه: أحمد (١١٤٢٣) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابي يعلى (١٢١٤).

(١٢٢) أخرجه: ابن خزيمة (١٩٦٦) وقال محققه الشيخ الالباني: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابن حبان (٣٥٥٠،٣٥٥٦) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط الشيخين، واللفظ لابن خزيمة.

(١٢٣) أخرجه: ابن خزيمة (١٩٦٦) وقال محققه الشيخ الالباني: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابن حبان (٣٥٥٠،٣٥٥٦) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط الشيخين، واللفظ لابن خزيمة.

(١٢٤) أخرجه: أحمد (١٤٥٢٩) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابو يعلى (٢٢٥٢)، وابن حبان (٣٥٦٥) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والزيادة عند ابن حبان (٥٩٩٦) وقال محققه: اسناده حسن.

واتە: باشە تۆ لەغەزادا نیت لەپێناوی خوادا وە لەگەڵ پێغەمبەرەکەی خوادایت ئیتر بۆ بەرۆژوویت؟). لەگێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلای پیاوێکدا لەبەر ئازار خۆی لوول کردبوو وە لەسەر سك و پشت خۆی دەدا بەسەر زەویدا پرسیاری لەبارەوە کرد، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بەرۆژووە. ئینجا بانگی کردو فەرمانی پێکرد کە ڕۆژووەکەی بشکێنێت و پێی فەرموو: ((أما يَكْفِيْكَ فِي سَبِيْلِ الله، وَمَعَ رَسُوْلِ اللهِ ﷺ حَتَى تَصُومَ))[١٢٥] واتە: (ئایا بەس نییە بۆ تۆ کە لەجەنگیت لەپێناوی خواداو لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدایت، ئیتر بۆچی بەرۆژوو دەبیت).

کاتێك سوپای موسوڵمانان گەیشتنە ناوچەی (مر الظهران) پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد ئەبوبەکرو عومەریش ﵄ ڕۆژووەکەیان بشکێنن: ئەبو هورەیرە ﵁ دەفەرموێت: ((لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین لەناوچەی (مر الظهران) خواردنێکی بۆ هێنراو بەئەبوبەکرو عومەری فەرموو: ((نزیك ببنەوەو بخۆن)) ئەوان وتیان: هەردووکمان بەرۆژووین، فەرمووی: دواجار دەوترێت: ((ارْحَلُوا لِصاحِبيكما، اعْمَلُوا لِصاحِبيكما (ادنوا فكلا) وَكَانَ يُكْرهُ احتياجهما إِلى النَّاسِ))[١٣٦] واتە: ((وشترەکانیان بۆ ئامادە بکەن و یارمەتییان بدەن (لەبەرئەوە نزیك ببنەوە و نانەکەتان بخۆن). پێغەمبەر ﷺ پێیناخۆش بوو پێویستییان بەیارمەتی خەڵك بێت و ئەرکیان بخەنە سەر).

## ٧. خواردنی کوباس:

(سوپای موسوڵمانان لای بەرزایی شیوەکە لایاندا پاشان پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی نارد بۆئەوەی (کوباسی) بەری درەختی ئاراکی بۆ لێبکەنەوە)[١٣٧] پێی فەرموون: ((علَيْكُم بالأسْوَدِ منه؛ فإنَّه أَطْيَبُ)) ( وإنِّي كُنْتُ آكُلُه زمنَ كُنْتُ أرعى)[١٢٨] واتە: ڕەشەکانی لێ بکەنەوە چونکە شیرینترە، منیش هەر ئەوانەم دەخوارد کاتێك لێرە مەڕم دەلەوەڕاند، وترا:

(١٢٥) أخرجه: أحمد (١٤٥٠٩) وقال محققوه: حديث صحيح واسناده قويّ.

(١٣٦) أخرجه: أحمد (٣٣٦/٢) والنسائي (١٧٧/٤)، وابن خزيمة (٢٠٣١) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن حبان (٣٥٥٧)، وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٣٧) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٩/٥)، والحاكم (المستدرك) (٢١٧/٣) وصححه ووافقه الذهبي.

(١٢٨) أخرجه: البخاري (٥٤٥٣)، وأحمد (١٤٤٩٧) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما، والنسائي (الكبرى) (٦٧٣٤)، وابن حبان (٥١٤٣) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابو يعلى (٢٠٦٢) وقال محققه: اسناده صحيح.

**(ئەی پێغەمبەری خوا)[١٢٩] ئایا مەڕت لەوەڕاندووەو شوانیت کردووە؟ فەرمووی: (نَعم وَهَل مِنْ نبيّ إلاّ (وَقَدْ) رَعاها)[١٣٠] واتە: بەڵێ هەموو پێغەمبەرێك شوانی مەڕی کردووە، لەوێدا ئیبنو مەسعود ﷺ چوو لەگەڵیان، ئەوان هەر دانەیەکی باشیان دەستکەوتایە دەیان خوارد. دواتر (تەماشای عەبدوڵڵایان کرد چووە سەر درەختێکی ئەو ناوە)[١٣١] بۆئەوەی سیواکێك ببڕێت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، لەوکاتەدا (با هەڵیکرد و هەردوو قاچەکانی دەرخست)[١٣٢] (لە کاتی سەرکەوتنی بەدرەختەکەدا)[١٣٣].**

**چونکە ئیبنو مەسعود ﷺ قاچەکانی باریك و لاوازبوو و باکەش بەهەردوو لادا دەیبرد (وهاوەڵانی بەو هۆیەوە پێ دەکەنین چونکە نزیك بوو بایەکە فڕێی داتە خوارەوە)[١٣٤] (بەهۆی لاوازی و باریکی هەردوو قاچیەوە)[١٣٥]. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەوە بەچی پێکەنینتان دێت))؟ وتیان: بەقاچە باریکەکانی، فەرمووی: ((ما يُضحِكُكم مِنْ دِقَّة ساقَيه؟ وَالذي نَفْسي بِيَدهِ لَهُما أَثْقَلُ (عِنْدَ اللهِ) [١٣٦] فِي المِيْزانِ (يَوْمَ القِيامَةِ) مِنْ أُحد))[١٣٧] واتە: ئێوە پێکەنینتان بەقاچە باریکەکانی دێت سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هەردوو قاچی لای خوا لەقیامەتدا لەتەرازووی کارەکانیدا قورسترە لەشاخی ئوحود).**

**(ئیبنو مەسعودیش هەر دەنکێکی کوباسی ڕەشی چاکی لێ بکردایەتەوە نەی دەخواردو دەیهێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ و دەیوت: ئەمەیان زۆر چاکە، بەڵام ئەوانی تر**

---

(١٢٩) أخرجه: مسلم (٢٠٥٠).

(١٣٠) أخرجه: البجاري (٥٤٥٣).

(١٣١) أخرجه: الحاكم (٢١٧/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (٢٩/٥).

(١٣٢) أخرجه: أحمد (٣٩٩١) وقال محققوه: اسناده حسن، وفي (الفضائل) (١٥٥٢) وقال محققه: اسناده حسن، والطيالسي (٣٥٥)، والبزار (٢٦٧٨)، وابو يعلى (٥٣١٠)، والطبراني (الكبير) (٨٤٥٢)، والحاكم (٣١٧/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وحسنّ اسناده كل من ابن حجر في (الاصابة) (٤٩٥٤) وابن كثير (نهاية البداية) (٢٩/٢)، وحسنّه ايضا الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٣١٩٢،٢٧٥٠)، و (الارواء) (٦٥) و(غاية المرام) (٤١٦) والطحاوية (٢٦٧) و(صحيح الادب المفرد) (١٧٦).

(١٣٣) أخرجه: أحمد (٩٢٠) وقال محققوه:اسناده حسن، والبخاري (الادب) المفرد (٢٣٧)، وابي يعلى (٥٩٥)، و الطبراني (٨٥١٦)، والحاكم (٣١٧/٣).

(١٣٤) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (١١٣/١٢).

(١٣٥) أخرجه: أحمد (٩٢٠) وقال محققوه:اسناده حسن، والبخاري (الادب المفرد) (٢٣٧)، وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح الادب المفرد) (١٧٦).

(١٣٦) أخرجه ابن ابي شيبة (المصنف) (١١٣/١٢).

(١٣٧) أخرجه: أحمد (٣٩٩١) وقال محققوه: اسنادهُ حسن و وفي (الفضائل) (١٥٥٢) وقال محققه: اسناده حسن.

ئەوەی دەستیان بکەوتایە بۆخۆیان دەیان خواردو بەشی کەسیان لێ نەدەدا)[١٣٨].

## ٨.ئەنەس ﷺ کەرویشکێك راودەکات:

هەر لەهەمان شیودا ئەنەس ﷺ کەرویشکێکی ڕاوکردو برژاندی و دوو ڕانەکەی نارد بۆ پێغەمبەرﷺ: ئەنەس دەفەرموێت: (لەناوچەی مەروزەهران بووین، کەروێشکێك هەستاو دوای کەوتین و هاوڕێیانم ماندووبوون (بەڵام من کەسێکی چالاك و زیتەڵ بووم)[١٣٩] (بەدوای کەوتم تا پێی گەیشتم) وگرتم و هێنام بۆلای ئەبوتەلحەی باوکم، سەری بڕی و (منیش برژاندم) و هەندێك لە نەرماییەکەی لەگەڵ دووڕانەکەی پێدا منیش بردم بۆ پێغەمبەر ﷺ ولێی وەرگرتم)[١٤٠].

## ٩.بینیی کۆمەلێك قەلەرەشی زۆر:

هەر لەو شیوەدا کە بیست و دووکیلۆمەتر دووربوو لەشاری مەککە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵێك قەلەڕەشی زۆریان بینی لەناویاندا تەنها یەك قەلەڕەش هەبوو کە دەنووك و هەردوو قاچی سووربوو.

عەمری کوڕی عاص ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك ئێمە لەشیوی (مر الظهران)[١٤١] بووین لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((انْظُروا هَل تَرَونَ شيئاً))؟ واتە: تەماشا بکەن ئایا هیچ دەبینن؟ وتمان: قەلەڕەشێکی زۆر دەبینین بەڵام لەنێوانیاندا تەنها یەکێکیان هەردوو قاچ و دەنووکی سوورە فەرمووی: ((لايَدْخُلُ الجَّنَة مِن النَساءِ إلاً مَنْ كانَ مِنْهُنَّ مِثل هذا الغراب في الغربان))[١٤٢] ((إلَّا كَقَدرِ هذا الغراب في هذهِ الغربان))[١٤٣] واتە: (ناچێتە بەهەشتەوە لەئافرەتان مەگەر تەنها ئەوانە نەبێت دەگمەن و کەم وێنەن

---

(١٣٨) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣٩/٥)، والحاكم (٣٧١/٣) وصححه وافقه الذهبي.

(١٣٩) أخرجه: ابوداود (٣٧٩١)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٣٢٢٠).

(١٤٠) أخرجه: البخاري (٢٥٧٢، ٥٥٣٥)، ومسلم (١٩٥٣)، والترمذي (١٧٨٩) والنسائي (٤٣٢٢).

(١٤١) أخرجه: النسائي (الكبرى) (٩٢٦٨)، والحاكم (٦٠١/٤) وصححه شرط مسلم ووافقه الذهبي.

(١٤٢) أخرجه: أحمد (١٧٧٧٠) وقال محققوه: اسناده صحيح، وصححه ايضاً الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٨٥٠).

(١٤٣) أخرجه: النسائي (الكبرى) (٩٢٦٨)، وأحمد (١٧٨٢٦) وقال محققوه: رجاله ثقات، والحاكم (٦٠١/٤) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وصحح اسناده كلٌ من الحافظ العراقي (الاحياء) (٤٦/٢) رقم (١٣٦٩)، والعجلوني (كشف الخفاء) (٣٠٦/٢)، والشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (١٠١٣).

وەك دەگمەنی ئەو قەلەڕەشە لەناو قەلەڕەشەکاندا). ئەم هەڕەشەیە ئافرەتە سفورە ناپۆشتەکان دەگرێتەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((....وَشرَّ نِسائِكُمُ المُتَبَرِجاتِ المُتَخَيلاتِ وَهُنَّ المُنافِقاتِ لايَدخلُ الجَّنِةِ مِنْهُنَّ إلاَّ مِثل هذا الغراب الأَعْصَم))[144] واتە: خراپترینی ئافرەتەکان ئەوانەیانن کە ناپۆشتەو سفورو خۆبەزلزانن، ئەوانە لەڕاستیدا دووڕوون، لەوان ناچێتە بەهەشت مەگەر تەنها ئەوانەیان کە دەگمەنن وەك دەگمەنی ئەو قەلەڕەشە دنووك و قاچ سوورە لەناو قەلەڕەشەکاندا.

## موسوڵمانبوونی ئەبوسوفیان

هێشتا سوپای موسوڵمانان لەناوچەی (مر الظهران)ی بیست و دووکیلۆمەتر دوور لەشاری مەککە بوون، سێ لەسەرکردە ناودارەکانی مەککە کەناویان: ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب، وحەکیمی کوڕی حوزام و بودەیلی کوڕی وەرقا ئەوان هاتبوون تا هەواڵی ئەو چواردەورە بزانن، وەلەڕاستیدا نەیان دەزانی وا دە هەزار سەربازی سوپای موسوڵمانان زۆر لێیان نزیکن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانیدا ئاگرێکی یەکجار زۆر بکرێتەوە بۆ دەرخستنی هێزو قەبارەی سوپای موسوڵمانان و تۆقاندنی ناحەزانیان. دواجار ئەو سەرکردانە دەست بەسەردەکرێن و هێزی ڕاستەقینەی موسوڵمانان لەنمایشێکی سەربازیدا دەبینن و موسوڵمان دەبن و دەگەڕێنەوە شاری مەککە وە ئاگاداریان دەکەنەوە کە هیچ بەرهەڵستییەك نەکەن بەرامبەر موسوڵمانان و لە بەرامبەر ئەو هێزە گەورەیەدا خۆیان بدەن بەدەستەوە چونکە ڕووبەڕووبوونەوەیان ئەستەمەو زۆر مەحاڵە.

ئەم بەسەرهاتەش لەسەرچاوەکانی فەرموودە و ژیاننامەنووساندا بەشێوەی (صحیح) و (ضعیف) هاتوون، زۆریان نارێك و پچڕ پچڕن. لەدوای پوختەکردنیان و ڕێکخستنی ڕاستەکانیان ڕووداوەکە بەم جۆرە دەبێت:

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ سوپاکەی بەڕێکەوتبوون بەرەو شاری مەککە..... ئەم لەشکرکێشیەش خودا بێ باوەڕانی شاری مەککەی لێ بێ ئاگاکردبوون تا موسوڵمانان لەناوچەی مەڕوزەهران لایانداو قوڕەیشییەکان

(١٤٤) أخرجه: البيهقي (الكبرى) (٨٢/٧)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٨٤٩).

ئەبوسوفیان و حەکیمی کوڕی حوزام یان ناردو دواتریش بودەیلی کوڕی وەرقاش لەگەڵیاندا چوو)[١٤٥].

پێش دەرچوونەکە (ئەبوسوفیان بە حەکیمی وت: حەکیم سوێند بەخوا غەم و پەژارە بەتەواوی دایگرتووم، دەبا هەردووکمان بچین تا ناوچەی مەڕوزەهران بەڵکو لەوێ هەواڵێك بزانین. بودەیلیش لەوێ بوو وتی: منیش لەگەڵتان دێم؟ وتیان: ئەگەر پێت خۆشە فەرموو) هەموو پێکەوە چوون تا گەیشتنە (لای بەرزاییەکەی ناوچەی مەڕوزەهران و ئێوارە داهات و دونیا تاریك بوو)[١٤٦] کاتێك نزیکی دارە ئاراکەکان بوونەوە لەو بەرزاییەوە تەماشای ئەو ناوچەیەیان کرد (تەماشا دەکەن لەهەموو جێگەی ئەو شیوە هەموو ئەو ناوچە فراوانە ئاگر کراوەتەوە) و ئەو هەموو دەوارو سەربازانەیان بینی لەگەڵ ئەو هەموو حیلەی ئەسپ و ڕۆغانەی وشترانەدا. بەبینینی ئەوانە بەتەواوی تۆقین و ترس کەوتە ناو دڵیانەوە (بودەیل وتی: پێ دەچێت ئەوانە دەوارەکانی خوزاعە بن چونکە ئەوان دەترسن و وریایی دەدەنە دوژمنەکانیان. ئەبوسوفیان وتی نا هەرگیز وانییە خوزاعە زۆر لەوە بێ دەسەڵاتترن و ژمارەشیان زۆر لەوە کەمترە) پاشان لەناوخۆیاندا وتیان: بەڕاستی ئەوانە ژمارەیان زیاتریشە لەبەنی کەعب، پێ دەچێت ئەوانە هەوازن بن و بەدوای لەوەڕدا خۆیان گەیاندوەتە ئەم ناوچەیە، سوێند بەخوا تا ئێستاش شتی وەها ڕووی نەداوە لەوان.

(لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ چەندەها سواری بەهەموو لایەکدا بڵاو کردبووەوە تا هەواڵنێران قۆڵبەست بکەن و بیانگرن، خوزاعەش لەو چواردەورەی خۆیاندا نەیان دەهێشت هیچ کەسێکی نەناس لەو ناوچەیەدا تێپەڕ ببێت، کاتێك ئەبوسوفیان و هاوەڵانی (نزیك بوونەوە) لەسەربازگەی موسوڵمانان) و لە (ناودارە ئاراکەکان هاتنە دەرەوە) ئاگایان لەخۆیان نەبوو [مەفرەزەیەکی ئەنصارییەکان بۆ هەواڵگریی هاتبوونە ئەو ناوچەیە بەدەنگی وشترەکانیان ئەبوسوفیان و هاوەڵانیان ناسییەوەو چواردەوریان دان، پێیان وتن: ئێوە کێن؟ مەفرەزەکەش وتیان: ئێمە لە سوپای موسوڵمانانین لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ. ئەبوسوفیان وتی: تا ئێستا شتی وا بووە سوپایەکی

---

(١٤٥) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣٩/٥).

(١٤٦) أخرجه: ابن ابي شيبه (المصنف) (٣٨٠٥٥) وقال محققه: مرسل اسناده حسن.

گەورەی وەها دابەزنە ناو جەرگەی نەیارەکانیان و ئەوان پێیان نەزانن)[١٤٧] لەوێدا) ئەو سوارانە لەتاریکایی شەودا قۆڵبەستیان کردن)[١٤٨] و لەنزیك سەربازگەکە ڕایان وەستاندن.

(عەباسی کوڕی عەبدولموتلیبیش لەخەمی قوڕەیشدا بوو وە دەیوت: ئەوان ئێستا ئاگادارنین و پێغەمبەر ﷺ و سوپاکەشی بدات بەسەریاندا ئەوان فریاناکەون خۆیان بدەن بەدەستەوەو ئەوکات قوڕەیش بۆ هەتا هەتایی لەناودەچێت. عباس ﷺ دەڵێت: سواری هێسترە سپییەکەی پێغەمبەر ﷺ بووم و لەسەربازگەکە ویستم دەرچم بۆئەوەی تا ناوچەی (دار ئاراکەکان) بڕۆم تا داربڕێك یان شوانێك یان کەسێك لەو ناوە بدۆزمەوە تا بچێت هەواڵی پێغەمبەر ﷺ و سوپاکەی بدات بەقوڕەیش تا ئەوان پێشتر بێن لەگەڵی ڕێك بکەون پێش ئەوەی سوپاکە بەزەبری هێز بچێتە ناو شاری مەککەوە، ئەوەبوو من ڕۆیشتم لەوناوە بەدوای یەکێکدا دەگەڕام، گوێم لەقسەی نێوان ئەبوسوفیان و بودەیل بوو (کاتێك ئەوان بۆ هەواڵزانین گەیشتبوونە ئەو ناوچەیە) ئەبوسوفیان دەیوت: سوێند بەخوا لەژیانمدا ئاگری زۆری وەك ئەم شەوە و سەربازی زۆری وەهام هەرگیز نەدیوە) (ئەوانە کێن؟ دەڵێیت ئاگری حاجیانی عەرەفەیە[١٤٩]).

(لەوێدا ئەبوسوفیان دەترسا ئەو مەفرەزەیە بیکوژن، وە عەباسیش هاوەڵی دێرین و نزیکی خۆی بوو بەوانی دەوت: بۆ نامبەن بۆلای عەباس) لەوکاتەدا عەباس لەو نزیکانە بوو گوێی لەدەنگی ئەبوسوفیان بوو وە هاواری لێکرد: باوکی حەنزەلە لەکوێی؟ ئەبوسوفیانیش دەنگی ئەوی ناسییەوە وتی: ئەبولفەزڵ ئەوە تۆیت؟ وتم: بەڵێ وتی: دایك و باوکم فیدات بێت هەواڵ چییە؟ (زۆر ترساو داوای فریاکەوتنی لەعەباس کردو وتی: فریام کەوە من دەکوژرێم) عەبباسیش بەفریای کەوت و لەدەستی مەفرەزەکەی وەرگرت پێش ئەوەی هیچ یەکێك زیانی پێ بگەیەنێت، لەوێدا پەنای ئەو دوو هاوەڵەکەشی داو لەگەڵ خۆی بردنیە ناو سەربازگەکەو

---

(١٤٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٧٢٦٤)، وقال الحافظ في (المطالب العالية) اسناده صحيح واورده القاضي عياض في (الشفا) (٢/٣) وقال محققه: اسناده حسن. من رواية موسى بن عقبة.

(١٤٨) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٧٢٦٣)، وقال الهيثمي (المجمع رقم (١٠٢٤١) مرسل فيه ابن لهيعة وحديثه حسن. وهو من رواية عروة بن الزبير.

(١٤٩) أخرجه: البخاري (٤٢٨٠).

بە ئەبوسوفیانی وت: هاوار بۆ تۆ ئەبوحەنزەڵە دایك و هۆزەکەت ڕۆڵەڕۆت بۆ بکەن) ئەوە پێغەمبەری خودایە لەگەڵ سوپاکەی (ئەو لەگەڵ دە هەزار جەنگاوەری موسوڵمان هاتونەتە ئێرەو ئێوە هیچتان بەرامبەریان پێ ناکرێت) بەخوا هاوار بۆ قورەیش بەڕاستی، ئەبوسوفیان وتی: ئەی چارە چییە باوك و دایکم فیدات بن؟ وتی: سوێند بەخوا بەردەستی بکەویت لەگەردنت دەدات لەبەرئەوە سواربە لەگەڵم لەسەر ئەم هێسترە تا بتگەیەنمە لای پێغەمبەر ﷺ تا پەنات بدات.

عەباس دەڵێت: پاشان ئەبوسوفیان لەگەڵم سواربوو (منیش هێسترەکەم تاودا تا دەربازی بکەم و بیگەیەنمە پێغەمبەر ﷺ (بەلای هەر ئاگرو سەربازانێکدا تێپەڕ دەبووم (تەماشایان دەکردم) وە دەیان وت: ئەوە کێیە؟ کاتێك هێسترەکەیان دەبینی دەیان وت: ئەوە مامی پێغەمبەری خودایە ﷺ بەسواری هێسترەکەی. تا گەیشتمە ئاگرەکەی عومەری کوڕی خەتتاب وتی: ئەوە کێیە؟ هاتە پێشەوە لێم و کاتێك ئەبوسوفیانی بینی لەدوامەوە سواربووە وتی: ئەبوسوفیان ئەی دوژمنی خوا سوپاس بۆ خوا کەتوانیم دەستم پێت بگات بەبێ هیچ پەیمان و ڕێکەوتنێك. پاشان ئەو بەخێرایی ڕایکرد بەدوامداو منیش هێسترەکەم تاودا و توانیم (پێش ئەو خۆم و ئەبوسوفیان بگەیەنمە بەردەمی دەوارەکەی پێغەمبەر ﷺ)[١٥٠] لەوێدا من پێش کەوتم وەك چۆن وڵاخێکی خاو پێش پیاوێکی خاو دەداتەوە. یەکسەر لەوێ دابەزیم و چوومە ژوورەوەو عومەریش بەدوامدا هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوە (دوژمنەکەی خوایە) ئەوە ئەبوسوفیانە، لەکۆتاییدا دەستمان پێی گەیشت بەبێ هیچ پەیمان و ڕێکەوتنێك دەلێمگەڕێ با لەگەردنی بدەم؟ ئینجا منیش وتم: من پەنام داوە ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەتا ئەبوسوفیان: شایەتی دەدات کە هیچ خوایەك نییە تەنها هەر (الله) خوایە؟

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((يشهد أَنَّ لا إله إلاَّ الله وإنِّي رَسول الله)) قلتُ: نَعم)[١٥١]

---

(١٥٠) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٥/٤) وقال محققه: اسناده صحيح، والطبري (التاريخ) (٥٢/٣)، والطبراني (الكبير) (٧٢٦٤)، والحاكم (٤٣/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وابوداود (٣٠٢٢)، والبيهقي (الدلائل) (٣٢/٥)، والطحاوي (شرح معاني الاثار) (٣٢٢/٣) وقال: اسناده صحيح، وقال الحافظ في (المطالب العالية) (٤٣٦٢): حديث صحح، وقال البوصيري (الاتحاف) (٦٢٩٥): حديث صحيح، وقال الهيثمي (المجمع) (١٦٤/٦): رجاله رجال الصحيح، وصححه الشيخ الالباني في (فقة السيرة) (٤٠٩)، و (الصحيحة) (٣٣٤١)، و (صحيح ابي داود) (٢٦١١). من رواية ابن عباس رضي الله عنهما.

(١٥١) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣٢/٥) من رواية موسى بن عقبة رحمه الله.

واتە: ئایا ئەو شایەتی دەدات کەهیچ خودایەك نییە جگە لە (الله) ومنیش پێغەمبەری خودام؟ وتم: بەڵێ. پاشان لای پێغەمبەر ﷺ دانیشتم وتم ئەمشەو لای بەرنادەم و ناهێڵم هیچ کەسێك جگە لەمن بەنهێنی قسەی لەگەڵ بکات. عومەریش زۆر پێداگری کرد لەدژایەتی کردنی بۆ ئەبوسوفیان و منیش پێم وت: لەسەرخۆبە عومەر سوێند بەخوا ئەگەر لەپیاوانی بەنی عەدی کوڕی کەعبی خزمانت بووایە ئەوەت نەدەوت (وئاوەهات نەدەکرد) تۆ بۆیە وادەکەیت چونکە ئەو لەپیاوانی بەنو عەبدولمەنافە؟

عومەریش وتی: لەسەرخۆبە عەبباس سوێند بەخوا موسوڵمان بوونت لەو ڕۆژەدا کەموسوڵمان بوویت لەلام خۆشەویستتر بوو لەموسوڵمان بوونی خەتتاب گەر موسوڵمان بووایە، ئەوەش تەنها لەبەرئەوەی کەدەمزانی پێغەمبەر ﷺ بەموسوڵمان بوونت شادمانترە لەموسوڵمان بوونی خەتاب گەر موسوڵمان بوایە، (پاشان حەکیم و بودەیل و ئەبوسوفیان ویستیان موسوڵمان بوونی خۆیان ڕابگەیەنن چونکە لەوشەوەدا ئەوان لای پێغەمبەر ﷺمانەوەو قسەیان لەگەڵ کردو ئەویش پرسیاری لێ دەکردن و پاشان بانگی کردن بۆ ئیسلام و پێی وتن: ((بڵێن: شایەتی دەدەین کەهیچ خودایەك نییە جگە لە (الله). ئەوانیش ئەو شایەتییەیان دا. پاشان پێی وتن: ((بڵێن: شایەتی ئەدەین کە تۆ پێغەمبەری خودایت. لەوێدا حەکیم و بودەیل شایەتییان دا بەڵام ئەبوسوفیان وتی: من ئەوەیان نازانم..... پاشان پێغەمبەر ﷺ بەعەبباسی فەرموو: ((یا أبا الفضل انْصَرف بِضَیْفِكَ اللیلة))[١٥٢] (فَقَد أمنّاه)[١٥٣] (فاذا أصبَحتُ فائتني بِهِ) واتە: ((باوکی فەزڵ میوانەکەت ئەمشەو ببەرەوە لای خۆت) (وئێمە پەنامان داوە) (کاتێك ڕۆژ بووەوە بیهێنەرەوە لام) (منیش بردمەوە لای خۆم) (وپاشان دەنگ وباسەکە بڵاو بووەوە کەلای عەبباسەو سواری وڵاخەکەم کرد لەپشتمەوەو بەلای دەواری سەربازەکاندا ڕۆیشتین و هەموویان بینییان..... کاتێك ئەبوسوفیان زۆری ژمارەی موسوڵمانان و گوێڕایەڵییانی بینی وتی: تا ئێستا سوپای وەها ژمارە زۆرم نەبینیوە، عەبباسیش وتی: تۆ دەکوژرێیت گەر موسوڵمان نەبیت و شایەتی نەدەیت کە موحەممەد پێغەمبەری خودایە، ئەبوسوفیانیش دەیویست ئەوە بڵێت بەڵام زمانی نەیدەهێناو نەیدەتوانی).

---

(١٥٢) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤٠/٥) من رواية موسى بن عقبة ﷺ.

(١٥٣) أخرجه: الطبري (٥٤/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٣٤/٥)، واورده البرزنجي في (صحيح تاريخ الطبري) (٢٤١).

کاتێك بانگی بەیانی داو هەمووان بەئاگا هاتن و کەوتنە جوڵە بۆ دەستنوێژ، ئەبوسوفیان ترسا وتی: عەبباس ئەوانە چییان دەوێت (ئەوانە فەرمانی چییان پێکراوە؟)[١٥٤] عەبباس فەرمووی: نا (ئەوانە موسوڵمانن) گوێیان لەبانگ بووەو هەستاون بۆ دەستنوێژگرتن بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژیان بۆ بکات، پاشان فەرمانی بەئەبوسوفیان کرد دەستنوێژ بگرێت و لەگەڵ خۆی بردی، ئەبوسوفیان ئەو هەموو خەڵکەی دی کە لەهەموو لایەکەوە بەرەو نوێژ دەچوون (بەچاوی خۆی بینی چۆن خەڵکی هەرایانە لەسەر ئاوی دەستنوێژەکەی پێغەمبەر ﷺ) (کاتێکیش دەستی بەنوێژ کردو وتی (الله أكبر) هەموو خەڵك لەدوایەوە وتیانەوەو نوێژیان کردو پاشان چووە ڕکوع هەموویان بەدوایدا چوون پاشان بەرزبووەوە هەمووان لەگەڵی بەرزبوونەوە) (لەوێدا بەچاوی خۆی بینی چۆن خەڵکی تێکڕا بەدوایدا دەچنە ڕکوعو سجود دواتر بەعەبباسی وت: ئەو هەر فەرمانێکیان پێ بکات ئەوان جێبەجێی دەکەن؟

عەبباس وتی: گەر داوایان لێ بکات نان و ئاو نەخۆن ئەوان سەرپێچی ناکەن. ئەبوسوفیان وتی: (تا ئێستا هیچ پادشایەکی وەهام نەدیوە هەرگیز) تائێستا هیچ کەسانێکم نەدیوە لەهەموو لایەکەوە پێکەوە کۆببنەوەو ئاوهاش گوێڕایەڵ بن (پاشان وتی: فارسە ڕێز لێگیراوەکان و ڕۆمە خاوەن قەڵاو هێزەکان ئاوها گوێڕایەڵ نین. کاتێك ئەوانەی هەموو بینی ئینجا ویستی موسوڵمان بێت) وداوای لەعەبباس کرد تا بیبات بۆلای پێغەمبەر ﷺ وتی: (عەبباس قسەی لەگەڵ بکە سەبارەت بەقوڕەیشی خزمانت ئایا لێبووردنی هەیە بۆیان؟ کاتێك بە تەواوی ڕۆژ بووەوە عەبباس لەگەڵ خۆی بردی تا گەیاندییە لای پێغەمبەرو ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوە ئەبوسوفیانە).

کاتێك پێغەمبەر ﷺ بینی فەرمووی: ((ويحك يا أبا سفيانَ ألم يأنِ لك أن تشهدَ أن لا إلهَ إلا اللهُ)) واتە: هاوار بۆ تۆ ئەبوسوفیان ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کەبزانێت کە هیچ پەرستراوێك نییە جگە لەخودا؟ وتی: باوك و دایکم بەقوربانت بن چەندە لەسەرخۆو بەڕێزو چاکەکاریت، سوێند بەخوا من دڵنیا بووم گەر خودایەکی تر هەبوایە جگە لە (الله) سوودی دەبوو بۆمان بەڵام هەرگیز نییە، پاشان پێی فەرموو:

---

(١٥٤) أخرجه: ابن ابي شيبه (المصنف) (٣٨٠٥٧) وقال محققه: مرسل رجاله ثقات: من رواية عكرمة رحمه الله.

((وَيحَكَ يا أَبا سُفيانَ أَلَمْ يَأْنِ لَكَ أَنْ تَعَلمَ أَنِّي رَسُولُ اللّهِ)) واتە: هاوار بۆ تۆ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بزانیت کە من بەڕاستی پێغەمبەری خودام؟ وتی: باوك و دایکم فیدات بن چەندە لەسەرخۆو بەڕێزو چاکەکاریت، بەڵام ئەمەیان سوێند بەخوا هێشتا هەر لەدڵمدا گومان ماوە. عەبباس پێی وت: ئەی هاوار بۆ تۆ موسوڵمان بەو شایەتی بەتەنهایی خوداو پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ بدە پێش ئەوەی لەگەردنت بدرێت.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((وَيحَك أبا سُفيانَ قَدْ جِئْتُكُمْ بِالدُنيا وَالآخِرَةِ فأسلموا تسلموا))[١٥٥] واتە: هاوار بۆ تۆ ئەی ئەبوسوفیان من دونیاو قیامەتم بۆ هێناون، موسوڵمان بن تا سەلامەت ببن. ئەبوسوفیان وتی: من داوام لەخواکەم کردو تۆش داوات لەخواکەت کرد، بەڵام وەڵاهی هەرکات ڕووبەڕووت بوومەتەوە تۆ بەسەرمدا زاڵ بوویت، گەر خواکەی من ڕاست بووایەو خواکەی تۆ درۆ بوایە من بەسەرتدا سەردەکەوتم، لەبەرئەوە: شایەتی دەدەم کەتەنها (الله) خودایەو (محمد)یش پێغەمبەری خودایە] ئەوە بوو ئەبوسوفیان موسوڵمان بوو وە شایەتی ڕاستی دا [پاشان ئەبوسوفیان و حەکیم وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا تۆ خەڵکێکی هەرچی و پەرچی و نەناسراوت هێناوەتە سەر بنەچەو هۆزەکەت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هُمْ أَظْلَمُ وَأَفْجَرُ، قَدْ غَدَرْتُمْ بِعَقْدَ الْحُدَيْبِيَةِ، وَظَاهَرْتُمْ عَلَى بَنِي كَعْبٍ بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ فِي حَرَمِ اللهِ وَأَمْنِهِ)) واتە: ئەوان ستەمکارترو تاوانبارتر بوون، ئێوەش ڕێکەوتننامەی حودەیبییەتان شکاندو پشتیوانی بەنی بەکری کوڕی کەعبتان کرد لەتاوان و دەست درێژییەکەیاندا لەحەرەمی ئارامی خودا.

بودەیل وتی: ڕاستت کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان غەدریان لێ کردین سوێند بەخوا گەر قوڕەیش پشتیوانی بەنوبەکریان نەکردایە ئەوان نەیان دەتوانی زیانمان پێ بگەیەنن. ئەبوسوفیان و حەکیم وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا جێی خۆی بوو تواناو هێزەکەت بۆ هەوازن ئامادە کردایە چونکە دوورن لەخزمایەتیداو توندترن لەدوژمنایەتییان لەگەڵماندا. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: (( إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ يَجْمَعَهُمَا لِي رَبِّي: فَتْحَ مَكَّةَ، وَإِعْزَازَ الْمُسْلِمِينَ بِهَا وَهَزِيمَةَ هَوَازِنَ، وَغَنِيمَةَ أَمْوَالِهِمْ وَذَرَارِيِّهِمْ)) واتە: ((من هیوام وایە خوای گەورە هەردووکیانم بداتێ، ئازادکردنی شاری مەککەو

(١٥٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٦٤١٩)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٢٤٠): فيه الحرب بن حسن ضعيف وقد وثق.

سەرخستنی ئیسلام و موسوڵمانان و تێکشکاندنی هەوازن و دەست کەوتنی ماڵ و سامانیان)).

ئەبوسوفیان و حەکیم وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ خەڵکی هێور بکەرەوە، ئایا گەر قورەیشیەکان گۆشەگیر بوون وە دەستییان لێتان نەکردەوە ئایا ئەوان پەنادراو دەبن و بێ ترس دەبن؟ فەرمووی ((بەڵێ))[١٥٦]. عەبباس وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (باوك و دایکم فیدات بێت) ئەبوسوفیان پیاوێکە پێیخۆشە ناودار بێت (و بەگەورە ناو ببرێت) شتێکی بۆ بڕیار بدە (تا لەناو خزمانیدا سەروەر بێت) فەرمووی: ((نعَم مَن دخلَ دارَ أبي سفيانَ فَهوَ آمنٌ)) واتە: ((بەڵێ هەرکەسێك بچێتە خانووەکەی ئەبوسوفیان پەنا دەدرێت و پارێزراو دەبێت)) ئەبوسوفیان وتی: هەموویان لەخانووەکەمدا جێیان نابێتەوە، فەرمووی ((وَمَنْ دَخَلَ الكَعبة فَهو آمن)) واتە: هەرکەسێك بچێتە ناو کەعبەوە پەنادەدرێت و پارێزراو بێ ترس دەبێت. وترا: کەعبەش ژمارەیەکی زۆر ناگرێت. فەرمووی: ((وَمَنْ دَخَلَ المسجدَ فَهو آمن)) واتە: هەرکەسێك بچێتە ناو مزگەوتەکەوە پارێزراو دەبێت. وترا: مزگەوتەکەش هەمووان ناگرێت. فەرمووی: (( مَنْ كَفَّ يَدهُ وَأَغْلَقَ دَارهُ فَهُوَ آمِنٌ)) واتە: هەرکەسێك دەستمان لێ نەکاتەوەو دەرگای خانووەکەی دابخات پارێزراو دەبێت. وتیان: دە ئێمە بنێرە تا بچین لە وتەکانی تۆ ئاگاداریان بکەینەوە، فەرمووی: ((انْطَلِقُوا فَمَنْ دَخَلَ دَارَكَ يَا أَبَا سُفْيَانَ وَدَارَكَ يَا حَكِيمُ وَكَفَّ يَدهُ فَهُوَ آمِنٌ)) واتە: برۆن پێیان ڕابگەیەنن هەر کەسێك بچێتە خانووەکەی تۆوە ئەی ئەبوسوفیان پارێزراو دەبێت وە هەرکەسێك بچێتە خانوەکەی تۆش ئەی حەکیم وە دەستمان لێ نەکاتەوە پارێزراو دەبێت.

خانووەکەی ئەبوسوفیان لەسەرو شاری مەککەوە بوو، وە خانووەکەی حەکیمیش لەخوارووی شاری مەککە بوو، [عەبباس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من پێم خۆشە ڕێگەم بدەی منیش بچمە لای خزمانت و ئاگاداریان بکەمەوە لەم پێش هاتەو بانگیان بکەم بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی، پێغەمبەر ﷺ ڕێگەیداو عەبباس وتی: چۆنیان پێ بڵێم بۆم روون بکەرەوە تا شتێکیان پێ بڵێم ئارام بن و بەتەواوی بێ ترس بن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((تقول لهم: مَنْ شَهِدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَشَهِدَ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، وَكَفَّ يَدهُ فَهُوَ آمِنٌ، وَمَنْ جَلَسَ عِنْدَ الْكَعْبَةِ فَوَضَعَ سِلَاحَهُ فَهُوَ

(١٥٦) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٥/٤٠) من رواية موسى بن عقبة ﷺ.

آمِنٌ، وَمَنْ أَغْلَقَ عَلَيْهِ بَابَهُ فَهُوَ آمِنٌ))[١٥٧] ((إِلَّا ابْنَ خَطَلٍ ، وَمِقْيَسَ بْنَ صُبَابَةَ اللَّيْثِيَّ ، وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَعْدِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ ، وَالْقَيْنَتَيْنِ ، فَإِنْ وَجَدْتُمُوهُمْ مُتَعَلِّقِينَ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ فَاقْتُلُوهُمْ))[١٥٨]. واته: بڵێ. هەرکەسێك گەر شایەتی بدات جگە لە (الله) هیچ خوایەکی تر نییەو تاك و تەنهاو بێ هاوتایە، وە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خوایە بێ ترس بێت، هەرکەسێك لای کەعبە دابنیشێت وچەکەکەی دابنێت ئەوە پارێزراو دەبێت وە هەرکەسێك دەرگای خانووەکەی لەخۆی دابخات پارێزراو دەبێت، تەنها کوڕەکەی خەتل و مەقیەسی کوڕی لەیسی و عەبدولای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح و دوو کچە گۆرانیبێژەکە. ئەوانە گەر دەستتان کەوتن خۆیان بەپەردەی کەعبەشەوە هەڵواسیبوو بیان کوژن.

پاشان پێغەمبەر ﷺ عەبباسی سوار هێسترەکەی خۆی کردو ئەبوسوفیانیش لەدوایەوە سواربوو، کاتێك عەبباس کەمێك دوورکەوتەوە، یەکێکی بەدوایدا نارد فەرمووی: ((بگەنەوە بە عەباس و بیگێڕنەوە لام)) پاشان بۆ ئەوانەی ئەوێی باسکرد کە ئەو دەترسێت عەبباس شتێکی بەسەر بهێنن. پاشان عەبباسیان بۆلا گێڕایەوەو ئەو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا من دڵنیانیم و دەترسم ئەبوسوفیان پاشگەز ببێتەوە لەبڕیارەکانی و بگەڕێتەوە بۆ بێ باوەڕی با جارێ نەڕوات تا ڕای دەوەستێنین بەچاوی خۆی هەموو سەربازەکانت ببینێت. عەبباس ئەبوسوفیانی ڕاگرت و ئەویش وتی: بەنی هاشمیەکان ئێوە غەدرمان لێ دەکەن؟ عەبباس وتی: دەزانیت کە ئێمە هەرگیز غەدرو ناپاکی ناکەین بەڵام من کارێکم پێت هەیە لەگەڵمان بمێنەرەوە تا لەم بەیانییەدا هەموو سەربازەکانی خودا ببینیت کە ئامادە کراوە بۆ موشریکەکان).

(پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: عەبباس (بڕۆ) بیبە بەردەمی شیوەکەی لای دامێنی شاخەکە تا هەموو سەربازانی خودا بەلایدا تێپەڕ ببێت و بیان بینێت) (عەبباس دەفەرموێت: منیش بردم تا لەو جێگەیەوە وەستاندم کەپێغەمبەر ﷺ داوای لێ کردبووم) وبە ئەبوسوفیانم وت: لێرە دابنیشە تا هەموویان ببینیت. وتی: باشە. ئەمەش بۆ ئەوەبوو بێ توانایی خۆی قوڕەیشی بۆ دەرکەوێت) (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا کەسێك جاڕ بدات: با هەموو کەسێك لەگەڵ هۆزەکەی خۆی بێت و لای

(١٥٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٧٢٦٣)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٢٤١): فيه ابن لهيعة وحديثه حسن وفيه ضعف. وهو من رواية عروة بن الزبير ﷺ.

(١٥٨) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٥) وقال محققه: مرسل اسناده حسن.

ئاڵاکەی خۆیان بێت و هەموو کەل وپەلە سەربازییەکانیان بانمایش بکەن، هەموو ئامادەبوون و پێغەمبەر ﷺ یەکە سەربازییەکانی یەك بەدوای یەکدا نارد (هەموو هۆزەکان بە ئاڵاکانیانەوە) یەك یەکیان تێ دەپەڕین بەلای ئەبوسوفیاندا، ئەویش وتی: عەبباس ئەمانە کێن؟ وتم: ئەوانە غیفارن. وتی: من ئیشم بەوان نییە.

پاشان هۆزی جوهەینە تێپەڕبوو) (وتی: عەبباس ئەوانە کێن؟ وتم: جوهەینەن وتی: ئیشم بە جوهەینە نییە، وەڵاهی تا ئێستا هیچ جەنگێك لەنیوانمان ڕووی نەداوە، پاشان هۆزی موزەینە تێپەڕبوو، وتی: عەبباس ئەی ئەوانە کێن؟ وتی: هۆزی موزەینەن. وتی: من ئیشم بەموزەینە نییە وەڵاهی تا ئێستا هیچ جەنگێك لەنێوانماندا ڕووی نەداوە. پاشان هۆزی سولەیم تێپەڕبوو، وتی: عەباس ئەوانە کێن؟ وتی: ئەوانە هۆزی سولەیمن) (وتی: من ئیشم بە سولەیم نییە).

(پاشان یەکەیەکی تر تێپەڕبوو وتی: عەباس ئایا ئەوانە پێغەمبەریان لەناودایە؟ وتی: نەخێر. وتی: ئەی ئەوانە کێن؟ وتی: ئەوانە هۆزی خوزاعەن، پاشان هەموو هۆزەکان بە ئاڵاکانیانەوە تێپەڕبوون و ئەبوسوفیان زۆری ئەوانەی بەلاوە گەورە بوو، خوای گەورەش ترس ولەرزی خستبووە دڵیەوە) (تا هەموویان بەتەواوی بەلاماندا تێپەڕبوون و لەهەموو هۆزێك پرسیاری لێ دەکردم) (خۆی وحەکیم وبودەیل بەڕاستی سەرسام بوون و شتی وەهایان هەرگیز نەبینی بوو، تا یەکەیەکی تری سەربازی بەلایاندا تێپەڕبوو) (لەهەموویان جیاوازتر بوو، ئەبوسوفیان وتی: ئەوانە کێن؟ عەبباس وتی: (ئەوانە یەکەی پشتیوانەکانی مەدینەن و ئاڵاکەیان بەدەستی سەعدی کوڕی عوبادەوە بوو، لەدوورەوە هاواری کرد: ئەی ئەبوسوفیان ئەمڕۆ ڕۆژی کوشتارو خوێن ڕشتنە، ئەمڕۆ هیچ شتێك قەدەغەکراو نابێت. ئەبوسوفیان وتی: خۆزگە لەڕۆژی زیماردا دەمردم وئەم ڕۆژەم نەبینییایە، پاشان یەکەیەکی تر هات ژمارەیان لەهەمووان کەمتر بوو، ئاڵاکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەست زوبەیرەوە بوو)[١٥٩].

(ئەو یەکەیەش هی پێغەمبەر ﷺ وموهاجیرەکان بوو کاتێك بەلای ئەبوسوفیاندا تێپەڕبوون ئەبوسوفیان بانگی لێکردو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئایا فەرمانت بەلەناوبردنی خزمەکانت کردووە (ئەی نازانیت سەعدی کوڕی عوبادە چی وت؟

---

(١٥٩) أخرجه: البخاري (٤٢٨٠).

فەرمووی ((چی وت))؟ وتی: سەعدی کوڕی عوبادەو ئەو یەکەیەی کە لەگەڵیدا بوون کاتێك بەلامدا تێپەڕبوون سەعد بانگی لێکردم و وتی: ئەمڕۆ ڕۆژی کوشتارو خوێن ڕشتنە، ئەمڕۆ هیچ قەدەغەیەك لەبەرامبەرتان نامێنێت. من ئەی پێغەمبەری خوا لێت ئەپاڕێمەوە ئاگات لەخزمەکانت بێت) (چونکە تۆ لەهەموو خەڵکی چاکتریت وخزم دۆستتریت. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((يَا أَبَا سُفْيَانَ، (كَذَبَ سَعْدٌ) الْيَوْمَ يَوْمُ الْمَرْحَمَةِ! (هَذَا يَوْمٌ يُعَظِّمُ اللَّهُ فِيهِ الكَعْبَةَ، وَيَوْمٌ تُكْسَى فِيهِ الكَعْبَةُ) الْيَوْمَ أَعَزَّ اللهُ فِيهِ قُرَيْشًا!))[١٦٠]واتە: ئەی ئەبوسوفیان (سەعد ڕاست ناکات) ئەمڕۆ ڕۆژی بەزەییە (ئەمڕۆ خوای گەورە کەعبەی تیا پیرۆزتر دەکات، ئەمڕۆ کەعبە بەرگی تازەی بە بەردا دەکرێت ئەمڕۆ خودا قوڕەیش سەربەرز دەکات).

(پاشان پێغەمبەر ﷺ کەسێکی نارد بۆلای سەعدو ئاڵاکەی لێ سەندەوەو دایە دەستی قەیسی کوڕی کە لەپێشی یەکەکەدا بوو) (دواتر سەعد داوای کرد لەپێغەمبەر ﷺ تائاڵاکە لەقەیسیش وەربگرێتەوە نەوەك ئەویش کارێکی نەخوازراو ئەنجام بدات. پێغەمبەریش ﷺ داواکارییەکەی قبوڵ کرد و ئاڵاکەی لەدەست وەرگرتەوە)[١٦١] و(دایە دەست زوبەیرو کردیە ئاڵاهەڵگری ئەنصارو موهاجیرەکان و هەردوولای کردە یەك یەکەی تایبەت) (پاشان لەنمایشەکەدا پێغەمبەرﷺ لەناو یەکەکەدا بوو، کاتێك ئەبوسوفیان خەڵکێکی نەناسراوی زۆری لەگەڵ بینی وتی: ئەی پێغەمبەری خودا لەجیاتی خزمانت ئەوانت هەڵبژاردووەو لەگەڵیانیت؟ پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی دایەوەو فەرمووی: (( أَنْتَ فَعَلْتَ ذَلِكَ وَقَوْمُكَ، إِنَّ هَؤُلَاءِ صَدَّقُونِي إِذْ كَذَّبْتُمُونِي، وَنَصَرُونِي إِذْ أَخْرَجْتُمُونِي......)) واتە: خۆت و خزمەکانت هۆکاری ئەوەبوون، ئەوان منیان بەڕاست زانی لەوکاتەدا کە ئێوە منتان بەدرۆ زانی و ئەوان سەریان خستم لەکاتێکدا ئێوە منتان دەرکرد.

کاتێك ئەبوسوفیان تەماشای (یەکەی سەوزی کرد کە لەئەنصارو موهاجیرەکان پێکهاتبوون (و تەنها هەر چاویان دیاربوو لە زرێپۆشەکانیاندا) و زوبەیر سەرپەرشتیاری دەکردن. ئەوکات ئەبوسوفیانە و بەعەبباسی وت: ئەوانە کێن؟

---

(١٦٠) أخرجه: الاموي في (مغازية) كما في (فتح الباري) (١١/٨،١٠).

(١٦١) أخرجه: البزار (١٨١٩) وقال الحافظ (فتح الباري) (٩/٨) وفي (مختصر زوائد البزار) (٢٤٨): اسناده صحيح على شرط البخاري.

وتی: ئەوە پێغەمبەری خوایە لەگەڵ ئەنصارو موهاجیرەکان (ئەم یەکەیە خوێنی سوری لەگەڵە). ئەبوسوفیان وتی: هیچ کەسانێك توانای بەرەنگاربوونەوەی ئەمانەی نییە). (با بڕۆین عەبباس تا ئێستا سوپاو سەربازانێکی وەهام نەدیوە) سوێند بەخوا ئەبولفەزل برازاکەت ئەمڕۆ بووەتە پاشایەکی مەزن و خاوەن دەسەڵاتێکی گەورە. عەبباسیش وتی: هاوار بۆ تۆ ئەی ئەبوسوفیان ئەوە پێغەمبەرایەتییە، خێراکە (بگەڕێوە ناو خزمەکانت ئاگاداریان بکەرەوە. ئەویش بەخێرایی دەرچوو تا نزیکی شاری مەککە بووەوە) و لەبەرزاییەکەوە لێیان دەرکەوت، دانیشتوانی شار لێی کۆبوونەوە و پێیان وت: چ هەواڵێکت هێناوە لەدوات؟

ئەویش وتی: وا دایان بەسەرماندا، سوپایەکە توانای بەرەنگاربوونەوەتان نییە، لەژیانمدا شتی وەهام نەدیوە، هەرکەسێك بێتە خانووەکەمەوە بێ ترس و زیان دەبێت. وە دواتر چووە (مزگەوتەکەوە) و بەهەموو دەنگی هاواری کرد: ئەی کۆمەڵانی قوڕەیش ئەوە موحەممەد هاتووەتە سەرتان بەسوپایەکەوە هەرگیز ئێوە توانای بەرەنگاربوونەوەیتان نییە (موسوڵمان بن سەلامەت دەبن) (وتیان: بەسە. وتی: هەرکەسێك بچێتە ماڵی ئەبوسوفیان بێ ترس وزیان دەبێت، لەوێدا هیندی هاوسەری بۆی هەستاو ڕیش و سمێڵی گرت وتی: (خوا ڕووی خۆت و هۆزەکەت ڕەش بکات بۆ خۆت و چاودێری و نوێنەرایەتیت) (بنەماڵەی غالیب ئەم بەتەمەنە بێ ئەقڵە بکوژن) (بۆ وەستاون بڕۆن بجەنگن و پارێزگاری لەخۆتان و نیشتیمانەکەتان بکەن) ئەو ڕەشە قەڵەوە بێ نرخە بکوژن.... ئەبوسوفیان وتی: ڕیشم بەردە، سوێند بێت بەخوا گەر تۆ موسوڵمان نەبیت لەگەردنت دەدرێت، هاوار بۆ تۆ پەیامێکی ڕاست و ڕەوانی بۆ هێناون، بڕۆ ژوورەوە لەسەر قەرەوێڵەکەت دانیشەو بێدەنگ بە (هاوار بۆ تۆ ئەو هەموو خەڵکی لێ کۆکردووینەتەوە (پاشان وتی:) ئەی هاوار ئەو ژنە فریوتان نەدات، سوپایەکی لەگەڵە هەرگیز ناتوانن بەرەنگاری ببنەوە، هەرکەسێك بچێتە ماڵی ئەبوسوفیان پارێزراو بێ ترس وزیان دەبێت ئینجا ئەوان وتیان: خوا لەناوت بەرێت جا ماڵەکەت هەموومان دەگرێت؟ وتی: هەرکەسێکیش دەرگای ماڵی خۆی دابخات و (دەست نەکاتەوە) پارێزراو بێ ترس و زیان دەبێت، هەرکەسێکیش بڕواتە ناو مزگەوتەکەوە پارێزرا و بێ ترس و زیان دەبێت....)[١٦٢].

---

(١٦٢) سياق هذا الحديث مأخوذ من رواية عروة بن الزبير ﷺ عند الطبراني (الكبير) (٧٢٦٣)، و رواية ابن عباس c: عن

سوپای موسوڵمانان پێشڕەوییان کرد تا گەیشتنە ناوچەی (کوراعول غەمیم) کە زۆر نزیکە لەشاری مەککە، لەوێدا پێغەمبەر ﷺ بۆ دواجار پێداگری کرد لەو موسوڵمانانەی کە هێشتا بەڕۆژوون پێویستە ڕۆژووەکانیان بشکێنن چونکە بەو جۆرە بەهێزتر دەبن بۆ کاتی ڕووبەڕوو بوونەوە، جابر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ لەساڵی ئازادکردنی شاری مەککە لەڕەمەزاندا بەڕێ کەوتبوو تا گەیشتە ناوچەی کوراعول غەمیم، خەڵکی بەڕۆژووبوون (وهەندێکیان سوارو هەندێکیان پیادەبوون)[١٦٣] وترا: ئەی پێغەمبەری خوا خەڵکی ڕۆژوویان لەسەرگران بووە و هەموویان چاوەڕێن تابزانن تۆ چی دەکەیت، پاشان پێغەمبەر ﷺ (لەدوای عەسردا بوو) داوای قاپێك ئاوی کرد (بەسەر وشترەکەیەوە بوو)[١٦٤] قاپە ئاوەکەیان پێداو بردی بۆلای دەمی (وتەماشای خەڵکی کرد)[١٦٥] و ئەوانیش هەموو تەماشایان دەکرد، پاشان خواردیەوەو ڕۆژووەکەی شکاند (لەوێدا هەندێك لەخەڵکی ڕۆژووەکەیان شکاندو هەندێکی تریان نەیان شکاند)[١٦٦] دواتر پێی وترا: هەندێك لەخەڵکی هەر بەڕۆژوون. ئەویش فەرمووی: ((أُولَئِكَ الْعُصَاةُ)) واتە: ((ئەوانە سەرپێچی کارن)) (ئینجا ڕۆیشتن تا نزیك بوونەوەو گەیشتینە نزیکترین جێگەی ڕووبەڕووی دوژمن)[١٦٧] پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إِنَّكُمْ مُصَبِّحِي عَدُوِّكُمْ وَالْفِطْرُ أَقْوَى لَكُمْ فَأَفْطِرُوا))[١٦٨] واتە: ئێوە بەیانی ڕووبەڕووی دوژمنەکەتان دەبنەوە، بەڕۆژوو نەبوون بۆ ئێوە بەهێزترەو ڕۆژووەکانتان بشکێنن)). (ئینجا ئێمەش تێکڕا هەموو ڕۆژووەکانمان شکاند)[١٦٩].

---

ابن هشام (السيرة) (٥/٤) وقال محققه: اسناده صحيح، والطبراني (الكبير) (٧٢٦٤) والحاكم (٤٣/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وابوداود (٣٠٢٢) وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٣٣٤٠) (فقه السيرة) (٤٠٩)، ورواية موسى بن عقبة: عن البيهقي (الدلائل) (٣٢/٥، ٤٠)، مع رواية البخاري (٤٢٠٨)، مع رواية عكرمة: عن ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٧، ٣٨٠٥٥).

(١٦٣) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٤،٢٥/٥).

(١٦٤) أخرجه: أحمد (٢٠٣٦٣) وقال محققه: اسناده حسن.

(١٦٥) أخرجه: البخاري (٤٢٧٧).

(١٦٦) أخرجه: النسائي (١٧٧/٤)، ابن خزيمة (٢٥٣٦)، والحاكم (٤٤٣/١) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٢٧٠٦) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٦٧) أخرجه: أحمد (١١٢٥) وقال محققوه: حديث صحيح.

(١٦٨) أخرجه: البخاري (٤٢٧٧)، ومسلم (١١٢٠)، وابوداود (٢٤٠٦)، والترمذي (١٦٨٤).

(١٦٩) أخرجه: مسلم (١١١٤) (١١٢٠)، وأحمد (١١٣٠٧) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابوداود (٢٤٠٦)، وابن خزيمة (٢٠٢٣).

قارەمانانی سوپاکە ماندووبوون و شەکەتی خۆیان گەیاندە پێغەمبەر ﷺ کەئەوان بەتایبەت پیادە ڕەوەکانیان هێزیان تیانەماوە. جابر ﷺ دەفەرموێت: (کە گەیشتینە ناوچەی (کوراعول غەمیم) پیادەڕەوەکان کۆبوونەوەو وتیان: با داوا لەپێغەمبەر ﷺ بکەین تا دوعامان بۆ بکات چونکە بەڕاستی ئەم گەشتەمان زۆر ماندووی کردین و زۆر قورس بوو لەسەرمان پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموون: ((عَلَيْكُمْ بِالنَّسْلَانُ))[١٧٠] واتە: خێرا بڕۆن وەفەرمووی: ((اسْتَعِينُوا بِالنَّسْلِ، فَإِنَّهُ يَقْطَعُ عَلَمَ الْأَرْضِ، وَتَخِفُّونَ لَهُ)) واتە: خێرا ڕۆیشتنتان دەبێتە یارمەتی بۆتان و سوکەڵەتر دەبن وخێراتر ماوەکەش دەبڕن، ئێمە ئەوەمان جێبەجێ کرد بەڕاستی یارمەتی بوو بۆمان و هەندێك گرانی و ماندووبوونمان لێ ڕەوییەوە)[١٧١].

## نزیکبوونەوە لە شاری مەککە

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێك گەیشتە ناوچەی (ذو الطوا) بەسەر وشترەکەیەوە وەستاو پارچە جلێکی ڕەشی بەسەرەوە پێچابوو)[١٧٢].

جابریش ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککە کاتێك چووە ناو شاری مەککەوە جەمەدانەیەکی ڕەشی بەسەرەوە بوو)[١٧٣]. (وە لفکی جامانەکەی لەنێوان هەردوو شانیدا شۆڕ کردبووەوە)[١٧٤]. ئاڵای سەرەکی سوپاکەش سپی بوو، عائیشە ﷺ دەفەرموێت: بەیداخی سەرەکی سوپا لەڕۆژی ڕزگارکردنی شاری مەککەدا ڕەنگی سپی بوو ئاڵاکەشی پارچەیەك قوماشی ڕەشی نەخشداربوو)

---

(١٧٠) أخرجه: الحاكم (١٠١/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبزار (١٦٦٣)، وصححه الشيخ الالباني رحمه الله في (الصحيحة) (٤٦٥).

(١٧١) أخرجه: ابويعلى (١٨٨٠) وقال محققه: اسناده صحيح، والنسائي (١٧٧/٤)، والحاكم (٤٤٣/١) وصححه ووافقه الذهبي، وابن خزيمة (٢٥٣٦)، والبيهقي (الكبرى) (٢٥٦/٥)، وابن حبان (٢٧٠٦) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم وكذا قال الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٥٧٤).

(١٧٢) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٩١٩/٤)، والحاكم (٤٧/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي.

(١٧٣) أخرجه: مسلم (١٣٥٨، ١٣٥٩)، والترمذي (١٦٧٩)، وابوداود (٤٠٧)، وابن ماجة (٢٨٢٢)، وابن حبان (٣٧٢٢) وقال محققه (صحيح).

(١٧٤) أخرجه: ابن ماجة (٢٢٧٦)، والبيهقي (الدلائل) (٦٨/٥).

ناوی (العقاب) بوو)[١٧٥].

لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کەعەبباس ﷺ لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ نێردراوە بۆ شاری مەککە تا ئاگاداریان بکاتەوە لەقەبارەی سوپای موسوڵمانان و نەتوانینی ڕووبەڕووبونەوەیان: عیکرمە ﷺ دەفەرموێت: (...... عەبباس وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ گەر ڕێگەم بدەیت تا بچم بۆلایان و بانگیان بکەم و دڵنیایان بکەمەوە...... پاشان ڕێگەی داو عەبباس بەسواری هێسترە سپییەکەی پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت تا گەیشتە ناو شاری مەککەو پێی وتن: ئەی دانیشتوانی شاری مەککە موسوڵمان بن سەلامەت دەبن چونکە ئەوەتا سوپایەکی زۆر گەورەو بەهێز لەودۆڵەوە بەڕوتاندا دێت...... ئەوەتا هێزەکەی زوبەیر لەسەرو مەککەوە دێت، وە ئەوەتا خالیدیش لەخواروی مەککەوە دێت خۆتان دەزانن خالید چ خالیدێکە، خوزاعەی دڵ پڕ برین و ڕق و قینیشیان لەگەڵە) هەرکەسێك چەکەکەی دابنێت دڵنیابن کە بێ زیان دەبێت)[١٧٦].

## ڕێکخستنی سوپا

ئیبنو هیشام دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ.... هەر لەناوچەی (ذو الطوا) سوپاکەی بەش بەش کرد و بڵاوەی پێکردن)[١٧٧]. موسای کوڕی عوقبە دەفەرموێت: (زوبەیری کوڕی عەوامی کردە فەرماندەی موهاجرین و ئەسپ سوارەکانیان و فەرمانی پێدا لەناوچەی (کەدا)ی سەرو شاری مەککەوە هێرش بەرێت و ئاڵاکەشی پێداو داوای لێکرد لەبەرزایی (ئەلحجون) دا بیچەقێنێت و لەوێدا بمێنێنتەوە تا پێغەمبەر ﷺ دەگاتە لای)[١٧٨] (زوبەیریش هێزەکەی لای قۆڵی دەستە چەپی سوپاکەوە بوو) هەروەها پێغەمبەر ﷺ خالیدی کوڕی وەلیدی کردە فەرماندەی گشتی هۆزەکانی ئەسلم و قوزاعەو بەنی سولەیم و (غیفارو موزەینە و جوهەینە) و ئەوانەشی کەپێشتر موسوڵمان بوون، و فەرمانی پێدا لەخوارووی شاری مەککەوە هێرش

---

(١٧٥) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٦٨/٥) ويؤيده رواية: ابن ماجه (٢٢٧٣)، وابي داود (٢٥٩٢)، وابن حبان (٤٧٤٣) وقال محققه: حسن، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٢٥٩) و (صحيح الترمذي) (١٣٧٢).

(١٧٦) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٧) وقال محققه: مرسل رجاله ثقات.

(١٧٧) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢١/٤) رقم (٩٢١) وسنده مرسل.

(١٧٨) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤٤/٥).

ببات و ئاڵاکەی لەنزیکترین جێگەی ماڵەکانی شاری مەککەدا بچەقێنێت (خالیدیش لەقۆڵی دەستە ڕاستی سوپاکەدا بوو) (ئەبوعوبەیدەشی کردە فەرمانەدەی پیادەڕوانی پێشی سوپاکە، و پێغەمبەریش ﷺ لەناوچەی ئەزاخیری (کوداوە)[١٧٩] چووە ناو شاری مەککە.. ئەوە بوو زوبەیر بەخۆی و هێزەکەیەوە چوون تا گەیشتنە ئەلحجون و لەوێدا ئاڵاکەی پێغەمبەریان ﷺ چەقاند[١٨٠] (و پاشان عەبباسیش گەڕایەوە لای هێزەکەی زوبەیرو پێی وت: باوکی عەبدوڵڵا ئا لێرەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدایت کە ئاڵاکە بچەقێنیت؟)[١٨١].

لەو ماوەیەدا ئەبو قوحافەی باوکی ئەبوبەکری صدیق لەگەڵ کچێکیدا بوو داوای لێکرد بیباتە سەر کێوی ئەبو قوبەیس تا بزانێت چی ڕوودەدات لەمەککەو چواردەوریدا، ئەسمائی کچی ئەبوبەکر ﵁ دەفەرموێت: (کاتێك سوپاکەی پێغەمبەر ﷺ وەستابوو لەناوچەی (ذو الطوا) ئەبوقوحافە بەبچوکترین کچی خۆی وت: کچەکەم بمبەو سەرم بخە تا دەمگەیەنیتە سەر کێوی (ئەبولقوبەیس) ئەبوقوحافە ئەوکات هەردوو چاوەکانی لەدەستدابوو ئەوەبوو کچەکەی بردیە سەر ئەو کێوەو پێی وت: کچەکەم چی دەبینیت؟ وتی: لەدوورەوە ڕەشاییەکی تێکەڵ بەیەك دەبینم، وتی: ئەوە ئەسپ سوارەکانە. کچەکەی وتی: پیاوێکیش دەبینم لەناویاندا دێت و دەچێت. وتی: ئەوەش ڕێکخەریانە. پاشان کچەکەی وتی: ئەوەتا ڕەشاییەکە بڵاوبووەوە. وتی: کەواتە وەڵاهی هێرشی ئەسپسوارەکان دەستی پێکرد، دەی پەلەبکەو زوو بمگەیەنەرەوە ماڵەوە. کچەکەی لەشاخەکە هێنایە خوارەوەو ئەسپسوارەکان پێیان گەیشتن پێش ئەوەی بگەنە ماڵەوە)[١٨٢].

خالیدیش هێرشی برد ناوچەی (لیطی) خوارووی شاری مەککەو چووە ناوەوە لەگەڵ هێزەکەی...و دروشمی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەڕۆژی ئازادکردنی شاری

---

(١٧٩) أخرجه: البخاري (٤٢٨٠).

(١٨٠) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢١/٤) رقم (٩٢٣).

(١٨١) أخرجه: البخاري (٤٢٨٠).

(١٨٢) أخرجه: أحمد (٢٦٩٥٦) وقال محققوه: اسناده حسن، وابو يعلى (٢٨٣١)، والطبراني (الكبير) (٢٤/(٢٣٦، ٢٣٨)، والحاكم (٤٦/٣، ٢٤٤) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٧٢٠٨) وقال محققه: اسناده حسن، وابن هشام (السيرة) (٢٠/٤) رقم (٩٢٠) وقال محققوه: اسناده حسن وصحيح اسناده الحافظ (الاصابة) (٥٤٤٢)، واورده صاحب (صحيح سيرة ابن هشام) (١٦٦٩).

مەککەدا بەو جۆرەبوو..... دروشمی موهاجیرەکان: (ئەی کوڕانی عەبدولڕەحمان) ودروشمی خەزرەجیش (ئەی کوڕانی عەبدوڵلا) ودروشمی ئەوسیش (ئەی کوڕانی عوبەیدوڵلا )(١٨٣).

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (لەخوارووی شاری مەککە کۆمەڵێك لە هۆزی بەنوبەکرو بەنولحارس و هوزمیل و ئەوانەی کە لەگەڵیاندا بوون لەئەحابیشەکان کە قوڕەیشییەکان کۆیان کردبوومنەوەو فەرمانیان پێدابوون کەلەخوارووی شاری مەککە لە ئامادەباشیدابن)(١٨٤).

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بەرێکەوت تا گەیشتە نزیکی شاری مەککە لەوێدا زوبەیری لەیەکێك لەقۆڵەکانەوە ناردو خالیدیشی لەقۆڵێکی ترەوە نارد، ئەبوعوبەیدەی کردە فەرماندەی پیادەڕەوە بێ چەکەکان ڕێگەی ناو دۆڵەکەی گرت و پێغەمبەریش ﷺ لەناو یەکەکەی خۆیدا بوو تەماشای کرد (ومنی بینی و (بانگی لێکردم) وتی: (ئەی ئەبوهوڕەیرە) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((اهْتِفْ لِي بِالْأَنْصَارِ ، وَلَا يَأْتِنِي إِلَّا أَنْصَارِيٌّ)) واتە: بانگی ئەنساریەکانم بۆ بکە، تەنها هەر ئەوان بابێن بۆلام. منیش بانگم کردن (لەهەموو لایەکەوە هاتن تا چواردەورەی پێغەمبەریاندا ﷺ لەوکاتەدا قوڕەیشییەکان کەسانێکیان کۆکردبووەوە بۆ بەرەنگاربوونەوە (صەفوان و عەکریمەو سوهەیل و هەندێك کەسی تریان لەگەڵ بوو وتبوویان: ئەم هێزە پێش دەخەین گەر شتێکیان بەدەست هێنا ئەوا ئێمە لەگەڵیاندان ، گەر بەرکەوتن ئەوکات ئێمە خۆمان دەدەین بەدەستەوە) لەوێدا پێغەمبەر ﷺ بەئەنصاریەکانی فەرموو: ((أَتَرَوْنَ إِلَى أَوْبَاشِ قُرَيْشٍ وَأَتْبَاعِهِمْ ، ثُمَّ قَالَ بِيَدَيْهِ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى )) (احْصُدُوهُمْ) حَصْدًا حَتَّى تُوَافُوا بِالصَّفَا)) واتە: ((تەماشاکەن ئەو کۆمەڵانەی قوڕەیش و شوێنکەوتوانی دەبینن؟ ئەوانە دروێنە بکەن (واتە: بەتوندی ڕووبەڕوویان ببنەوە) و هەردوو دەستی بەسەریەکدا داو فەرمووی: پاشان بگەنەوە لام بۆ ناوچەی سەفا).

ئەبوهوڕەیرە ﷺ دەفەرموێت: هێرشمان بۆ بردن و هەرکەسێکمان لەوان ببینیایە

(١٨٣) أخرجه: ابن هشام (٢٢/٤)، والطبري (١٦/٣) واورده البرزنجي في (ضعيف تاريخ الطبري) (٣٠٨)، وفتحي السيد في (صحيح سيرة ابن هشام) رقم (١٦٧٥).

(١٨٤) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤٤/٥).

دەمان کوشت و کەسیان نەیان دەتوانی لەڕووماندا بوەستێت. تا ئەبوسوفیان چووە لای پێغەمبەرﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا گەنجەکانی قورەیش وا لەناودەچن و قورەیش لێرە بەدواوە نامێنێت؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مَن أغلَقَ بابَه فهو آمِنٌ مَن دَخَلَ دارَ أبي سُفيانَ فهو آمِنٌ)) فَغَلَّقَ النَّاسُ أَبْوَابَهُمْ) واتە: ((هەرکەسێك دەرگای ماڵەکەی دابخات پارێزراو دەبێت و هەرکەسێکیش بچێتە ماڵی ئەبوسوفیانەوە بێ ترس دەبێت)) دواجار خەڵکی هەموو لەماڵەوە مانەوەو دەرگای ماڵەکانیان لەسەرخۆیان داخست)[١٨٥].

لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: (خەڵکی شاری مەککە هەموو بڵاوەیان لێکرد بەرەو مزگەوتەکەو بەرەو ماڵەکانی خۆیان)[١٨٦] وە (هەندێك لەناودارانی قورەیش چوونە ناو کەعبە، کەعبە پڕبوو)[١٨٧] (هەندێکی تریان لەهەموو لایەکەوە خۆیان دەگەیاندە ماڵی ئەبوسوفیان)[١٨٨].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دابوو بەسەرکردەی هێزەکانی کە بەشەڕ نەیەن مەگەر تەنها لەگەڵ ئەوانەدا کە لەگەڵیاندا بەشەڕ دێن)[١٨٩] موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (خالید خۆی و هێزەکەی بەرێکەوتن و لەخوارووی شاری مەککەوە چوونە ناو شارەوە، ڕووبەڕووی هێزەکانی بەنوبەکر بوونەوەو بەجەنگ هاتن لەگەڵیان و ڕاویان نان و نزیکەی بیست کەسیان لێ کوژراو سێ یان چواریش لەهوزەیل لەناوچەی حەزورە کوژران، وشەڕەکەیان بەردەوام بوو تا گەیشتە بەردەرگای مزگەوتەکە، ئەوانی تریان ڕایان کرد تا خۆیان گەیاندە ناو ماڵەکانیان و هەندێکیان بەرەو شاخەکان هەڵاتن وموسوڵمانان دوایان کەوتن....

کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەبەرزایی (کودائەوە) تەماشای شەوقی شمشێرەکانی

---

(١٨٥) أخرجه: مسلم (١٧٨٠)، وأحمد (١٠٩٤٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم وفي (فضائل الصحابة) (١٤٢٥) وقال محققه: اسناده صحيح، وابوداود (١٨٧٢، ٣٠٢٤)، والنسائي (الكبرى) (١١٢٩٨)، والطبراني (الكبير) (٧٢٦٨) و ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٤)، وابن حبان (٤٧٦٠) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٨٦) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤٤/٥).

(١٨٧) أخرجه: ابوداود (٣٠٢٤)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٦١٣).

(١٨٨) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٥) وقال محققه: رجاله ثقات.

(١٨٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٣/٤) وقال فتحي السيد في (صحيح سيرة ابن هشام) (١٦٧٦): حديث صحيح.

دەکرد لەسەر شاخەکە لەکاتی جەنگ کردن لەگەڵ ئەو موشریکانەدا فەرمووی: ((مَا هَذَا؟ وَقَدْ نَهَيْتُ عَنِ الْقِتَالِ)) واتە: (ئەوە چییە ئەی من داوای شەڕ ڕاگرتنم نەکرد؟) موهاجیرەکانی ئەویش وتیان: گومانمان وایە خالید سەرەتا ئەوان لەگەڵی بەشەڕ هاتوون و ناچار بەشەڕکردن بووە، و ئەو هەرگیز فەرمانی تۆ ناشکێنێت و سەرپێچیت ناکات)[190] (لەو شەڕەدا دووان لەئەسپسوارانی خالید شەهید بوون کە ناویان حەبیشی کوڕی ئەشعەرو کورزی کوڕی جابیری فەهری بوو)[191] (ئەو دووانە لەڕێڕەوی سوپاکە لایان دابوو بۆیە هەردووکیان شەهید بوون)[192]. هەندێك لەسەرکردەکانی مەککە وەك صەفوان و عەکریمە و سوهەیل ڕایان کردە دەرەوەی شاری مەککە وە هەندێکی تریان ڕایان کردەوە ناو شار.

## چوونە ناو شاری مەککە

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی بچێتە ناو شاری مەککەوە بەفەرماندەکانی ڕاگەیاندبوو کە سەرەتا لەگەڵ هیچ کەسێك بەشەڕ نەیەن مەگەر تەنها لەگەڵ ئەوانە کەلەگەڵیاندا بەشەڕ دێن، بەڵام فەرمانیدا کەسانێك بکوژرێن گەر لەژێر پەردەکانی کەعبەشدا بن)[193] ناوی ئەو تاوانبارانە لەچەندەها گێڕانەوەدا هاتووە لەوانە: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ دەفەرموێت: (لەڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا پێغەمبەر ﷺ خەڵکی هەموو دڵنیا کردەوە تەنها چوار پیاو و دوو ئافرەت نەبێت وە فەرمووی: ((اقْتُلُوهُمْ وَإِنْ وَجَدْتُمُوهُمْ مُتَعَلِّقِينَ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ)) واتە: ((گەر ئەوانتان دۆزییەوە خۆیان بەپەردەکانی کەعبەدا هەڵواسی بوو هەر بیانکوژن)) ئەوانیش: عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل و عەبدوڵڵای کوڕی خەتل و موقیەسی کوڕی صوبابەو عەبدوڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح)[194].

---

(١٩٠) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤٤/٥).

(١٩١) أخرجه: البخاري (٤٢٨٠).

(١٩٢) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٢/٤).

(١٩٣) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٣/٤) وقال صاحب (صحيح سيرة ابن هشام) (١٦٧٦): حديث صحيح.

(١٩٤) أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٨٠٦٨) وقال محققه: اسناده حسن، والنسائي (٤٠٦٧)، وابوداود (٢٦٨٣) (٤٣٥٩) والبزار (١٨٢١)، والحاكم (٤٥/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والدار قطني (٣٠٠٣)، و ابويعلى (٧٥٧) وقال محققه: رجاله رجال الصحيح، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٧٣٣).

ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لەوێدا فەرمووی: ((إِذَا لَقِيتُمْ هَبَّارَ بْنَ الْأَسْوَدِ وَنَافِعَ بْنَ عَبْدِ الْقَيْسِ فَحَرِّقُوهُمَا بِالنَّارِ)) واتە: ((هەرکەسێکتان هەباری کوڕی ئەلئەسوەدو نافیعی کوڕی عەبد قوبەیسی دییەوە با بیان سوتێنێت بەئاگر)) پاشان فەرمووی: ((لَا يُعَذِّبُ بِالنَّارِ إِلَّا اللَّهُ وَلَكِنْ إِذَا لَقِيتُمُوهُمَا فَاقْتُلُوهُمَا))[١٩٥] واتە: تەنها خودا بۆی هەیە بەئاگر سزا بدات بەڵام گەر ئەوانتان دییەوە بیانکوژن.

ئەبوبەرزەش ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا فەرمووی: (( النَّاسُ آمِنُونَ غَيْرَ عَبْدِ الْعُزَّى بْنِ خَطَلٍ))[١٩٦] واتە: خەڵکی هەموو با دڵنیاو بێ ترس بن تەنها عەبدولعوزای کوڕی خەتل نەبێت.

سەعدی کوڕی یەربوع ﷺ دەفەرموێت: (لەڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( أَرْبَعَةٌ لَا أُؤَمِّنُهُمْ فِي حِلٍّ وَلَا حَرَمٍ: الْحُوَيْرِثُ بْنُ نُقَيْدٍ ، وَمِقْيَسٌ ، وَهِلَالُ بْنُ خَطَلٍ ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي سَرْحٍ))[١٩٧] واتە: چوار کەس پەنا نادەم لەحەرەم و لەدەرەوەی حەرەمدا، ئەوانیش: حومیریسی کوڕی نوفەیل و موقیەسی کوڕی صوبابە و هیلالی کوڕی خەتل و عەبدوڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح.

ئیبنو حەجەری عەسقەلانی ﷺ دەڵێت: (من ناوەکانیانم لەهەموو گێڕانەوە جیاوازەکاندا کۆکردەوە ژمارەیان گەیشتە نۆ پیاو و هەشت ئافرەت).
پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کوشتنی ئەوانەی دەرکرد چونکە هەریەکەیان زیانی گەورەی بەموسوڵمانان گەیاندبوو، بۆ ئەوەی ئەوانە ببنە پەند بۆ هەموو ئەو خوێن ڕێژانەی کە سوکایەتی بەڕۆحی بێ گوناهان دەکەن لەهەموو جێگەو شوێنێکدا[١٩٨].

بەمجۆرە پێغەمبەر ﷺ ڕێگری خوێنڕێژی کرد تەنها ئەوانە نەبێت لاشەی شەهیدەکانی ئوحودیان شێواندبوو وە ئەنصارییەکان وتبوویان: هەرکات سەربکەوین بەسەریاندا ئێمەش لاشەی کوژراوەکانیان وا لێ دەکەین، لەڕۆژی ئازادکردنی شاری

---

(١٩٥) أخرجه: أحمد (٣٠٧/٢)، والبخاري (٣٠١٦)، وابوداود (٢٦٨٦)، والترمذي (١٥٧١)، وابن حبان (٥٦١١) وقال محققه: حديث صحيح.

(١٩٦) أخرجه: أحمد (١٩٨٠٣)، وقال محققوه: اسناده حسن.

(١٩٧) أخرجه: ابوداود (٢٦٨٤)، والطبراني (الكبير) (٥٥٢٩)، وقال محققوه (زاد المعاد) (١٢٢/٣): سنده حسن.

(١٩٨) انظر: (السيرة الصحيحة) (٤٨٠/٢)، وفتح الباري (١١/٨) برقم (١٨٤٦)، و (السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية) (ص:٥٦٧).

مەککەدا پیاوێکی نەناسراو وتی: نابێت قورەیش بمێنێت لێرە بەدواوە، لەوێدا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾﴾ (النحل) لەوڕۆژەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دەرکردو فەرمووی: ((کفوا عن القوم غیر اربعة))[١٩٩] واتە: دەستیان لێ نەکەنەوە تەنها چواریان نەبێت.

پێغەمبەر ﷺ لەسەرو مەککەوە چووە ناو شار لەناوچەی (بەتحا لە کیدا) ئەمەش بۆ هاتنەدی شیعرەکانی حەسان بوو کە وتبووی:

بەنیەتی خۆم پێداگری دەکەم دەبێت ببینن
سوپاکەمان لەکیدا ئەوە تۆز بەئاسماندا هەڵسێنێت
ئەسپەکانمان بەکۆپانەوە خێرا بۆ ناو شار بچن
ئافرەتەکانتان مەگەر بەسەر پۆشەکانیان پێشیان لێ بگرن[٢٠٠]

عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: (لەساڵی ئازادکردنی شاری مەککەدا پێغەمبەر ﷺ چووە ناوشارو ئافرەتانیانی بینی سەرپۆشەکانیان دەکێشا بەڕووی ئەسپەکاندا، لەوێدا خەندەیەکی بۆ ئەبوبەکر کردو فەرمووی: ((يَا أَبَا بَكْرٍ، كَيْفَ قَالَ حَسَّانُ)) واتە: ((ئەبوبەکر شیعرەکەی حەسان چۆن بوو...... ئەویش بۆی دووبارە کردەوەو پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ادْخُلُوا مِنْ حَيْثُ قَالَ حَسَّانُ))[٢٠١] واتە: لەو جێگەوە بچنە ناوشار کە حەسان وتبووی.

ئازادکردنی شاری مەککە وەك ئیبنو عەبباس ﷺ دەفەرموێت: (لەڕۆژی سیازدەی ڕەمەزاندا بوو)[٢٠٢].

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەنێو کۆچکردووە دێرینەکاندا لەگەڵ کۆتاییەکانی سوپادا چوونە ناو شاری مەککەوە. لە بەرزاییەکە هاتە خوارەوە و بەسەر چیای (الحجون) دا ڕۆیشت، زوبەیریش بە ئاڵاکەیەوە هێرشی برد تا گەیشتە

(١٩٩) أخرجه: الترمذي (٣١٢٨)، والحاكم (٣٥٩/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والطبراني (الكبير) (٢٩٣٨)، والبيهقي (الدلائل) (٢٨٩/٣)، وابن حيان (٤٨٧) وقال محققه: اسناده حسن.

(٢٠٠) أخرجه: البخاري (٤٢٩٠،١٥٧٩)، ومسلم (١٢٥٨)، والنسائي (٢٠٠/٥).

(٢٠١) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٦٦/٥)، وقال الحافظ (الفتح) (١٠/٨): اسناده حسن.

(٢٠٢) أخرجه: أحمد (٢٥٠٠) وقال محققه: اسناده حسن.

بەردەم دەرگای مزگەوتی حەرام..)[٢٠٣] دەوارێك ئامادە کرا بۆ دابەزینی پێغەمبەر ﷺ لە چیای (الحجون)دا و هەر لەوێ مایەوە و لای نەدایە هیچ بارەگایەك و دەستی بەسەر هیچ خانوویەکدا نەگرت[٢٠٤].

پێغەمبەر ﷺ بەسەر وشترەکەیەوە لەکاتی چوونە ناو مەککە سورەتی (الفتح) ی دەخوێندەوە. عەبدولای کوڕی موغەفەل ﷺ دەفەرموێت: (لەڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا پێغەمبەرم ﷺ بینی بەسەر پشتی وشترەکەیەوە سورەتی (الفتح)ی دەخوێندەوەو دەنگی پێ درێژ کردەوە بەوێنەی (ئاا ئاا ئاا)[٢٠٥].

پێغەمبەر ﷺ وەك زۆرداره خوێنڕێژەکان نەچووە ناو شاری مەککەوە، بەڵکو بەکزۆڵی و خۆبەکەم زانین و سوپاس گوزارانە چووە ناویەوە سەبارەت بەم باسە چەندەها گێڕانەوەی لاواز هاتووە لەوانە:

عەبدولای کوڕی ئەبو بەکری کوڕی حەزم دەڵێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ دابەزییە ناوچەی (توا) و بەچاوی خۆی بینی چۆن خودا ڕێزی لێگرتووە، لەوێدا خۆ بەکەم زانینی بۆ خوا نیشان دەداو لەدانیشتنەکەی لەسەر وشترەکەی ئەوەندە سەری نزم کردبووەوە دەتوت نزیکە ڕیشی بەر ناوەڕاستی کۆپانەکە بکەوێت)[٢٠٦].

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ چووە ناو شاری مەککەوە هەموو خەڵکی تەماشایان دەکرد، ئەویش سەری نزم دەکردەوە لە خۆ بەکەم زانینیدا)[٢٠٧]. هەروەها دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا چووە ناو شارو نزیك بوو چەناگەی بەر کۆپانی وشترەکەی بکەوێت لە خۆ بەکەم زانینیدا)[٢٠٨].

---

(٢٠٣) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤٤/٥).

(٢٠٤) أخرجه: البخاري (٤٢٨٤،٤٢٨٢)، ومسلم (١٣٥١).

(٢٠٥) أخرجه: البخاري (٤٨١)، ومسلم (٧٩٤)، وابوداود (١٤٧٦).

(٢٠٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٠/٤) رقم (٩١٩)، والبيهقي (الدلائل) (٦٨/٥) وقال صاحبه (صحيح سيرة ابن هشام) (١٦٦٨): حديث حسن اسناده مرسل.

(٢٠٧) أخرجه: ابويعلى (٣٣٩٣) وقال محققه: اسناده ضعيف، واورده القاضي عياض في (الشفا) (٢٩٦) وقال محققه: اسناده ضعيف.

(٢٠٨) أخرجه: الحاكم (٤٧،٣١٧/٤) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (٦٨/٥)، وضعفه الشيخ الالباني رحمه الله في (فقة السيرة) (ص:٤١٢).

لەورۆژەدا پێغەمبەر ﷺ کڵاوی زرێی لەسەردابوو پاشان لایبردو جەمەدانەی ڕەشی بەسەریەوە بەست، ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ چووە ناوشاری مەککەو کڵاوی زرێداری لەسەردابوو پاشان لایبرد، پێی وترا ئیبنو خەتەل بەپەردەی کەعبەدا خۆی هەڵواسیوەو دەستی پێوەگرتووە، فەرمووی: بیکوژن)[٢٠٩].

لەچوونە ناو مەککەدا شێوازی قەدەغەکردنی هاتوچۆی پیادە کرد بۆئەوەی خوێن کەم برژێت، بەم جۆرە مەککە ئازاد کراو هێمنی بۆ گەڕایەوە لەدوای ئەوەی خەڵکی چوونەوە ناو ماڵەکانیان یاخود ناو مزگەوتەکەو ناو کەعبەو و ماڵی ئەبوسوفیان بەم جۆرە سوپای موسوڵمانان چووە ناو شارو لەهەموو لایەکەوە زاڵ بوون و هێزو دەسەڵاتی خۆیان سەپاند دواتر پێغەمبەر ﷺ لێپرسینەوەی لەگەڵ خالید کرد سەبارەت بەکوشتارەکەی ناوچەی ئەلخەندەمەو پێی وت: ((لِمَ قَاتَلْتَ وَقَدْ نَهَيْتُكَ عَنِ الْقِتَالِ؟)) واتە: بۆچی بەجەنگ هاتیت ئەی من پێشتر پێم نەوتیت لەگەڵ کەسدا مەجەنگە؟ وتی: ئەوان دەست پێشخەریان کردو لەگەڵمان جەنگان و تیر بارانیان کردین وبەچەکەکانیانەوە ڕووبەڕوومان وەستانەوە، ئەوەندەی توانیم خۆم لەجەنگ کردن لەگەڵیاندا پاراست.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((قَضاءُ اللّهُ عَزَوَجَل خَير))[٢١٠] واتە: ئەوەی خودا هێنایە پێش هەر ئەوە چاکترە.

ئیبنو عەبباس ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناو شاری مەککە منداڵانی خزمانی خۆی لەعەبدولموتەلیب پێشوازییان لێکرد (ئەویش قوسمی کوڕی عەبباسی لەپێشی خۆیەوە لەسەر وشترەکە سوارکردو فەزلیشی لەدوای خۆیەوە سوارکرد)[٢١١].

---

(٢٠٩) أخرجه: البخاري (٤٢٨٦)، ومسلم (١٣٥٧)، وابوداود (٢٦٨٥).

(٢١٠) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤٨/٥) من رواية موسى بن عقبة، وابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨١٠٤).

(٢١١) أخرجه: البخاري (٥٩٦٥، ٥٩٦٦).

## شکاندنی بتەکان

سەفییەی کچی شەیبە ﵂ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێك چووە ناو شاری مەککەو خەڵکی هێمن بوونەوە (پاشان لەسەرو مەککەوە دابەزییە ناو شارو ئوسامەی لەپشتییەوە سوارکردبوو، وە بیلالیشی لەگەڵدا بوو وە عوسمانی کوڕی تەلحەی دەرگاوانی کەعبەی لەگەڵدا بوو، هاتە لای کەعبە کە لەو کاتەدا لە (ولە چواردەوری سێ سەدو شەست بتی لێ بوو)[٢١٢] (پاشان خەڵکی لەهەموو لایەکەوە ڕژانە ناو مزگەوت و موشریکەکانیش وەستابوون تەماشای خۆی و هاوەڵەکانیان دەکرد)[٢١٣] (سەرەتا چووە ناو مزگەوت (بەگۆچانەکەی)[٢١٤] دەستی لە بەردە ڕەشەکە داو پاشان حەوت جار لەسەر پشتی وشترەکەی تەوافی بەچواردەوری کەعبەدا کرد.... لەدوای تەواوبوونی تەوافەکەی)[٢١٥] (وشترەکەی یەخدا لەمزگەوتەکەدا)[٢١٦] (و دابەزی وشترەکەی برایە دەرەوە)[٢١٧] پاشان (دوو ڕکات نوێژی لەپشتی مەقامی ئیبراهیمەوە کرد، دواتر چووە لای بتێك لەپەنا کەعبەدا کە پێشتر دەیان پەرست، پێغەمبەر ﷺ کەوانەکەی خۆی بەدەستەوە گرتبوو)[٢١٨] (کەوانەکەی دەکرد بەناو چاوی بتەکەداو دەیفەرمووو: ﴿وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾﴾ (الإسراء)[٢١٩] هەروەها دەیفەرمووو: ﴿قُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾﴾ (سبأ)[٢٢٠] دواتر کەوانەکەی ئاڕاستەی هەر بتێك دەکرد (هەرچەندە بتەکانیش قاچەکانیان بەقورقوشم چەقاندبوو)[٢٢١]، ڕاستەوخۆ بتەکە بەسەر ڕوودا دەکەوت (بەبێ ئەوەی

---

(٢١٢) أخرجه: البخاري (٤٢٨٨،٤٢٨١،٣٣٥٢)، ومسلم (١٧٨١).

(٢١٣) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤٥/٥) عن موسى بن عقبة رحمه الله.

(٢١٤) أخرجه: ابوداود (١٨٧٨)، والطبراني (الكبير) (٢٤/(٨١٠))، وابن هشام (السيرة) (٢٦/٤) رقم (٩٣٠) وقال محققه: اسناده حسن، وحسن اسناده ايضاً الحافظ في (الفتح) (٢٢/٨).

(٢١٥) نفس المصدر.

(٢١٦) أخرجه: البخاري (٢٩٩٨).

(٢١٧) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤٥/٥) عن موسى بن عقبة ﷺ.

(٢١٨) أخرجه: مسلم (١٧٨٠)، وأحمد (١٠٩٤٨) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم وفي (الفضائل) (١٤٢٥)، وابوداود (٣٠٢٤).

(٢١٩) أخرجه: مسلم (١٧٨٠)، وأحمد (١٠٩٤٨) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(٢٢٠) أخرجه: البخاري (٤٢٨٧).

(٢٢١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٠٦٥٦)، والبزاز (١٨٢٥)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٢٥٤): رجاله ثقات.

دەستی بیگاتێ)[٢٢٢] تا هەموویانی شکاند (ئینجا فەرمانیدا هەموو بتەکانی تر بەسەر ڕوویاندا بخەن)[٢٢٣] (تا چووە لای دوو بتەکەی بەرانبەر دەرگای کەعبە کە ناویان (ئیساف و نائیلە) بووە فەرمووی: ((خاپوریان بکەن)). موسوڵمانان فڕێیاندان و خستیانە خوارەوەو وتیان: ئێستا ئێمە چی بڵێین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟ فەرمووی بڵێن: ((صَدَقَ اللَّهُ وَعْدَهُ. وَنَصَرَ عَبْدَهُ. وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ))[٢٢٤] واتە: خوای گەورە بەڕاستی بەڵێنی خۆی هێنایە دی و بەندەی خۆی سەرخست و هەرخۆی هەموو لایەنەکانی بەزاند.

## پێغەمبەرﷺ داوای کلیلەکانی کەعبە دەکات

کلیلی دەرگای کەعبە هەر لەمێژەوە لای کوڕانی بەنی شەیبە بوو، وە هەر لای ئەوانیش مابووەوە، کاتێك پێغەمبەرﷺ مەککەی ئازادکرد داوای لەعوسمانی کوڕی تەلحەی دەرگاوانی کەعبە کرد تا کلیلەکەی بۆ بهێنێت:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ عوسمانی بانگکرد و پێی فەرموو: ((أَيْ عُثْمَانُ ، أَيْنَ الْمِفْتَاحُ؟)) واتە: ((ئەی عوسمان کلیلەکە لەکوێیە؟)) وتی: لای دایکمە سولافەی کچی سەعد))[٢٢٥] پێی فەرموو: ((أْتيني بالْمِفْتَاحِ)) واتە: ((بڕۆ بۆم بهێنە))؟ عوسمان ڕۆیشت بەڵام دایکی قایل نەبوو بیداتێ[٢٢٦] (پێی وت: نا بەلات و عوزا هەرگیز کلیلەکەی نادەمێ)[٢٢٧] (چونکە گەر لێتانی وەربگرێت هەرگیز بۆتانی ناگێڕێتەوە) عوسمان وتی: (سوێند بەخوا یان ئەوەتا کلیلەکەی پێ دەدەیت یان ئەوەتا ئەو شمشێرە دەکەم بەسکمداو لەپشتمەوە دەربچێت) (چونکە ئێستا بارودۆخەکە وەك جاران نییە و زۆر گۆڕاوە، تۆ گەر پێی نەدەیت من و براکەم دەکوژرێین) (عوسمان زۆری لەگەڵدا وت)[٢٢٨] (تا دواجار قایل بوو کلیلەکەی پێدا)

---

(٢٢٢) أخرجه: ابن حبان (٤٧٦٠) وقال محققه: صحيح.

(٢٢٣) أخرجه: ابن ابـي شيبة (المصنف) (٣٨٠٦٠) وقال الحافظ في (المطالب) (٤٣٠٣): اسناده حسن.

(٢٢٤) أخرجه: ابن ابـي شيبة (المصنف) (٣٨٠٧٥) وقال محققه: له شواهد يصح بها.

(٢٢٥) أخرجه: ابن ابـي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٥) وقال محققه: مرسل اسناده حسن.

(٢٢٦) أخرجه: مسلم (١٣٢٩،٣٢١٩).

(٢٢٧) أخرجه: ابن ابـي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٥) وقال محققه: مرسل اسناده حسن.

(٢٢٨) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨٣٩٥).

بەهۆیەوە عوسمان زۆری پێچوو، پێغەمبەریش ﷺ لەو بەر خۆرە بەپێوە وەستابوو ئارەقی لێ دەچۆڕا چاوەڕێی دەکردو دەیفەرموو: ((بزانن چی دوای خست)) و پیاوێکی بەدوادا نارد)[٢٢٩] (ئەوەندەی پێ نەچوو عوسمان گەڕایەوەو کلیلەکەی بەدەستەوە بوو بەرەو ڕووی پێغەمبەر ﷺ هات و قاچی هەڵکەوت و کلیلەکەی لەدەست پەڕی و پێغەمبەریش ﷺ ڕۆیشت و لایەکی پۆشاکەکەی بەسەردا دا)[٢٣٠] (کلیلەکەی هەڵگرت و دایە دەستی و پاشان عوسمان وەری گرت و دەرگاکەی کردەوە)[٢٣١] (هەموو ئەو ناودارانەی قوڕەیش کەچووبوونە کەعبە هەموو هاتنە دەرەوەی دەت وت هەموو لەگۆڕ هێنراونەتە دەرو پاشان هەموویان موسوڵمان بوون)[٢٣٢].

## دەرهێنانی بتەکان و سڕینەوەی وێنەکان لەناو کەعبە

ئیبنو عەبباس ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ هاتە ناو شاری مەککە نەچووە ناو کەعبە لەبەر ئەو بتانەی کە تیایدا بوو، فەرمانی کرد هەمووی بشکێنرین و فڕێ بدرێن، یەکێك لەوانە هێنرایە دەرەوە وێنەی پێغەمبەر ئیبراهیم و ئیسماعیل بوو کەکیفی تیری بەخت گرتنەوەیان بەدەستەوەبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قاتَلَهُمْ الله (وَاللهِ)[٢٣٣] لَقَدْ عَلِمُوا (إنَهما) ما استَقْسِمُوا (بِالأَزلامِ)[٢٣٤] قَط)[٢٣٥] واتە: خوا بیان کوژێت سوێند بەخوا هەموو دەزانن کە ئەوان هەرگیز کاری وەهایان ئەنجام نەداوە.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ وێنەکانی ناو کەعبەی بینی فەرمانیدا بسڕدرێنەوەو نەچووە ژوورەوە تا هەمووی سڕرایەوە))[٢٣٦]. لەگێڕانەوەیەکی تردا جابر ﷺ دەفەرموێت: (لەناو کەعبەدا چەندەها وێنە هەبووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دایە عومەری کوڕی

---

(٢٢٩) أخرجه: نفس المصدر السابق.

(٢٣٠) أخرجه: ابن ابـي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٥) وقال محققه: مرسل اسناده حسن.

(٢٣١) أخرجه: البخاري (٢٩٨٨).

(٢٣٢) أخرجه: البـيهقي (الدلائل) (٥٨/٥).

(٢٣٣) أخرجه: البخاري (٣٣٥٧).

(٢٣٤) أخرجه: البخاري (٣٣٥٢).

(٢٣٥) أخرجه: البخاري (٤٢٨٨) و (١٦٠١)، وأحمد (٣٣٤/١).

(٢٣٦) أخرجه: البخاري (٣٣٥٢)، وابوداود (٤١٥٦).

خەتتاب (تا بچێتە ناو کەعبە و هەموو ئەو وێنانەی لەسەر دیوارەکانی ناوەوەی هەیە بیان سڕێتەوە)[٢٣٧] پاشان عومەر پۆشاکێکی هێنا تەڕی کردو سڕینیەوە (پێغەمبەریش ﷺ تا هەموو وێنەکان نەسڕرانەوە نەچووە ژوورەوە) کاتێك هەموو سڕرانەوە ئینجا پێغەمبەر ﷺ چووە ناو کەعبە)[٢٣٨]. کاتێك چووە ناو کەعبە بینی هەندێك وێنە بەجوانی نەسڕراونەتەوە. ئیبنو عەبباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێك چووە ناو کەعبە وێنەی ئیبراهیم و مەریەمی لەناودا بینی و فەرمووی: ((أَمَّا هُمْ لَقَدْ سَمِعُوا أَنَّ الْمَلَائِكَةَ لَا تَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ صُورَةٌ، هَذَا إِبْرَاهِيمُ مُصَوَّرٌ، فَمَا بَالُهُ يستقسم)) واتە: ((بەڵام ئەوان بیستوویانە کە فریشتە ناچێتەماڵێکەوە کە وێنەی تیابێت، ئەوەتا وێنەی ئیبراهیمیان کێشاوە بەڵام ئەی بۆ کیفی یانسیب و بەخت گرتنەوەی بەدەستەوەیە)).

لەگێڕانەوەیەکی تردا فەرمووی: ((قَاتَلَهُمْ اللَّهُ جَعَلُوا شيخنا يَسْتَقْسِمُ بِالأَزْلامِ مَا شَأْنَ إِبْرَاهِيمُ وَالأَزْلامُ ﴿ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾(ال عمران)[٢٣٩]. واتە: (خوا بیان کوژێت وایان نیشانداوە کە پیاوە گەورەکەمان تیری بەخت گرتنەوەی لەدەست دایە، ئەوە ڕاست نییە ئیبراهیم لەکوێ و ئەو کارە لەکوێ، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە ئیبراهیم نە جولەکە بووەو نە گاور بەڵکو موسوڵمانێکی پوخت بووەو هەرگیز لەموشریکەکان نەبووە).

ئینجا پێغەمبەر ﷺ خۆی پاشماوەی ئەو وێنانەی بەدەستی خۆی سڕییەوە، ئوسامە ﷺ دەفەرموێت: (من لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ چوومە ناو کەعبەو لەوێدا هەندێك وێنەی بینی و بەمنی وت: (سەتڵێك ئاوم بۆ بهێنە، منیش بۆم هێنا و (پارچە قوماشێکی هێناو بەئاوەکە تەڕی کردو بەسەر وێنەکاندا دەیهێنا) (تا) هەموو وێنەکانی پێ سڕییەوە) وفەرمووی: ((قَاتَلَ اللَّهُ قَوْمًا يُصَوِّرُونَ مَا لَا يَخْلُقُونَ))[٢٤٠] واتە: خوای گەورە ئەو کەسانە بکوژێت کە وێنە دروست دەکەن و ناتوانن گیانی بەبەردا

(٢٣٧) أخرجه: أحمد (١٤٥٩٦) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(٢٣٨) أخرجه: أحمد (١٥٢٦١) وقال محققوه: حديث صحيح.

(٢٣٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٧/٤).

(٢٤٠) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٦٥)، وأحمد (٤١٥٤) وقال محققه: اسناده صحيح، والترمذي (١٦١١) والطيالسي (١٨٥٢)، والطبراني (الكبير) (٣٣٣٣،٣٣٣٨).

بکەن، پاشان داوای گوڵاوی زەعفەرانی کرد و دیوارەکانی پێ بۆنخۆش کرد)[٢٤١].

سەفییەی کچی شەیبە ﵂ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ چووە ناو کەعبە) وکۆترێکی تیا بینی کە بەچیلکە دروست کرابوو بەدەستی خۆی تێکی شکاندو (فڕێی دایە) (دەرەوەی کەعبە) ومن تەماشام دەکرد)[٢٤٢].

پێغەمبەرﷺ بیلال و ئوسامە و عوسمانی ﵃ لەگەڵدا بوو کاتێك چووە ناو کەعبە، لەدوای خاوێن کردنەوەی دەرگاکەی داخست و لەهەموو گۆشەیەکی کەعبەدا (الله أکبر) و (الحمدلله) و ستایشی خوای دەکرد: ئوسامە و ئیبنو عەبباس ﵃ دەفەرموون: (پێغەمبەر ﷺ چووە ناو کەعبەوەو بیلال و ئوسامەو عوسمانی کوڕی تەلحەی لەگەڵدا بوو (ڕێگەی نەدا کەسی تریان لەگەڵدا بچێتە ژوورەوە)[٢٤٣] (فەرمانی دایە بیلال کە دەرگاکەیان لەسەر دابخات) و دەرگاکەی داخست)[٢٤٤] (کەعبەش لەو ڕۆژەدا شەش کۆڵەکەی هەبوو، پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت و لەنێوان ئەو دوو پایەیەی کەبەرانبەر دەرگاکەیە لەوێدا سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردو (الله أکبر) و (لا اله الا الله) ی دووبارە کردەوەو دوعاو نزای کردو داوای لێخۆش بوونی کرد، پاشان چووە لای هەموو یەکێك لەپایەکانی ترو ئەوانەی دووبارە کردەوە)[٢٤٥].

ئەبو سەلەمە و یەحیای کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی حاتەب ﵃ دەفەرموون: (پێغەمبەر ﷺ (الله أکبر) و (الحمدلله) ی لەهەموو گۆشەکانی کەعبەدا کرد، ئینجا دوو ڕکات نوێژی لەنێوان دوو کۆڵەکەکەدا کرد [٢٤٦] (و ماوەیەکی زۆر لەوێ مایەوە پاشان)[٢٤٧] (دەرگاکەی کردەوەو هاتەدەرەوە، و ئیبنو عومەر چووە ناو کەعبەو پرسیاری لەبیلال کرد: ئایا پێغەمبەر ﷺ لەنێوان کام دوو پایەیەدا نوێژی کرد؟ ئیبنو عومەر

(٢٤١) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٦٠) واسناده حسن كما قال الحافظ في (المطالب) (٤٣٠٣) والبوصيري (اتحاف الخيرة المهرة) (٦٢٩٦).

(٢٤٢) أخرجه: ابوداود (١٨٧٨)، وابن ماجة (٢٩٤٧)، والطبراني (الكبير) (٨١١،٨١٠)، وابن هشام (السيرة) (٩٣٠) وقال محققه: اسناده حسن، وكذا قال: الذهبي (المغازي) (ص:٥٥٢) والشيخ الالباني في الصحيح ابي داود) (١٦٤١).

(٢٤٣) أخرجه: مسلم (١٣٢٩).

(٢٤٤) أخرجه: البخاري (٤٤٠٠).

(٢٤٥) أخرجه: النسائي (٢٩١٤،٢٩١٥)، وصحح اسناده: الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٢٧٢٨)، (٢٧٢٩).

(٢٤٦) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٥) وقال محققه: مرسل اسناده حسن.

(٢٤٧) أخرجه: مسلم (١٣٢٩).

دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەکەعبە هاتەدەرەوە هەندێك کەس ویستیان بچنە ناو کەعبە، من لەو ڕۆژەدا گەنجێکی بەتوانا بووم، لەوێدا پێشیان کەوتم (ومن یەکەم کەس بووم لەدوای پێغەمبەر ﷺ چوومە ناو کەعبە) (بە پلیکانەکاندا سەرکەوتم و ویستم بچمە ژوورەوە پێغەمبەرم ﷺ بەرِودا هات دەیویست بێتە دەرو بیلالیش لای دەرگاکە لەدوایەوە بوو، من پێم وت: (ئایا پێغەمبەر ﷺ لەناو کەعبەدا نوێژی کرد؟ وتی: بەڵێ) وتم: (لەکوێدا نوێژی کرد)؟ وتی: لەنێوان ئەو دوو پایەیەی پێشەوەدا ئەو ڕۆژەش کەعبە لەسەر دوو ڕیزی سێ پایەیی بوونیاد نرابوو، پێغەمبەر ﷺ لەنێوان دوو پایەی ڕیزی یەکەمدا دەرگاکەش ڕاستەوخۆ لەدوایەوە بوو ئالەوێدا ڕوو بەدیواری کەعبە)[٢٤٨] (کە سێ گەز)[٢٤٩] دووربوو لەدیوارەکەوە (دوو ڕکات نوێژی کرد)[٢٥٠].

لەدواتردا کە هاتە دەرەوە دوو ڕکات نوێژی تریشی بەرامبەر دەرگای کەعبە کرد، ئوسامە دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە لەکەعبەو دوو ڕکات نوێژی بەرانبەر (دەرگای کەعبە)[٢٥١] کرد، پاشان فەرمووی: ((هَذِهِ الْقِبْلَةُ، هَذِهِ الْقِبْلَةُ))[٢٥٢] واتە: ئا ئەمە قیبلەیە ئا ئەمە قیبلەیە.

پاشان عوسمانی بانگ کرد و کلیلی کەعبەی بۆ گەڕاندەوە، موجاهید رحمه الله دەفەرموێت: (دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لەکەعبە هاتە دەرەوە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا .... ﴿٥٨﴾ ﴾(النساء)[٢٥٣] وە فەرمووی: ((عوسمان لەکوێ یە))[٢٥٤]؟. پاشان پێی فەرموو: ((هَاكَ فَخُذْهَا ، فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ رَضِيَ لَكُمْ بِهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَالْإِسْلَامِ))[٢٥٥] واتە: ئەوە کلیلەکەیە بیگرە، خودای گەورە لەزەمانی نەفامی

---

(٢٤٨) أخرجه: البخاري (٤٤٠٠).

(٢٤٩) أخرجه: ابوداود (٢٠٢٤)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٧٨١).

(٢٥٠) أخرجه: ابوداود (٢٠٢٦)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٧٨٣).

(٢٥١) أخرجه: أحمد (٢١٢/١)، وقال الشيخ الالباني في (الثمر المستطاب) (٨٤٥/٢): اسناده صحيح.

(٢٥٢) أخرجه: النسائي (٢٩١٤) وصحح اسناده الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٢٧٢٨).

(٢٥٣) أخرجه: الطبري (التفسير) (٩٨٤٦)، والطبراني (الكبير) (١١٢٣٤)، وقال محقق (تفسير القرطبي) (٢٢٨١): الحديث حسن بأصله.

(٢٥٤) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٥) وقال محققه: حديث مرسل اسناده حسن.

(٢٥٥) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٩٥) وقال محققه: مرسل اسناده حسن.

و ئیسلامدا ڕازی بووە کە کلیلەکە لای ئێوە بێت. کلیلەکەی پێداو فەرمووی: ((خُذْهَا خالدة تالدة لَا يَنْزِعهَا مِنْكُم إِلَّا ظَالِم))[٢٥٦] واتە: بگرە ئێوە یەکەم کەس بوون کەپێتان بووەو بۆ هەتا هەتایە دەبێت هەر لای ئێوە بێت، ئەوەشی لێتان دەسێنێتەوە ستەمکارە.

لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: (پێغەمبەر ﷺ بە پۆشاکەکەی کلیلەکەی گرتبوو وهەرواش دایە دەستی عوسمان)[٢٥٧]. فەرمانیشی پێکرد پەردەیەك بدات بەسەر دوو شاخە بەرانەکەی ناو کەعبە، عوسمانی کوڕی تەلحە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەدوای هاتنە دەرەوەی لەکەعبە منی بانگ کرد و پێی فەرمووم: ((إِنِّي رَأَيْتُ قَرْنَيِ الْكَبْشِ، فَلَمْ آمُرْكَ أَنْ تُخَمِّرَهَا فَإِنَّهُ لَا يَنْبَغِي أَنْ يَكُونَ فِي الْبَيْتِ شَيْءٌ يَشْغَلُ مُصَلِّيًا)). واتە: کاتێك چوومە ناوکەعبەوە دوو شاخی بەرانەکەم بینی و بیرم چووەوە کە فەرمانت پێ بکەم دایپۆشیت، ئیستا بچۆ دایبپۆشە، چونکە نابێت شتێك لەماڵدا هەبێت نوێژخوێن سەرقاڵ بکات. سوفیانی کوڕی عویینە دەڵێت: ئەو دوو شاخە هەر مایەوە لەناو کەعبە تا ساڵێك ئاگرێك کەوتەوە هەموو ئەوانەی ناو کەعبەی سوتاندو دوو شاخەکەش لەگەڵیان سووتا)[٢٥٨].

---

(٢٥٦) أخرجه: الطبري (التفسير) (٩٨٤٦)، والطبراني (١١٢٣٤) وقال (محقق تفسير القرطبي) (٢٢٨١): الحديث حسن باصله.

(٢٥٧) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٩٠٧٥،٩٠٧٦) من مرسل ابن المسيب ومرا سيلة صحيحة.

(٢٥٨) أخرجه: أحمد (١٦٦٣٧) وقال محققوه: اسناده صحيح، وعبدالرزاق (٩٠٨٣)، وابوداود (١٧٨٦)، والطبراني (٨٣٩٦).

## وتاری یەکەم

سەفیەی کچی شەیبە رضي الله عنها دەفەرموێت: (لەدوای ئەنجامدانی دوو ڕکات نوێژ لەکەعبە ئینجا پێغەمبەر ﷺ لەپەنا دەرگای کەعبە وەستاو مزگەوت پڕبوو لەخەڵکی مەککە)[٢٥٩] (پاشان پێغەمبەر ﷺ هەردوو دەستی بەهەردوولای دەرگاکەوە گرت)[٢٦٠] و فەرمووی: ((مَا تَقُولُونَ وَمَا تَظُنُّونَ))؟ واتە: گومانتان چییەو چی دەڵێن؟)) هەموو خەڵکی مەککە وتیان: دەڵێین تۆ برازاو ئامۆزاییەکی بەبەزەیی و لەسەرخۆیت، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دیسان فەرمووی: ((گومانتان چییەو چی دەڵێن))؟ ئەوانیش وتەی یەکەم جاریان دووبارە کردەوە....... تا سێ جار لەگێڕانەوەیەکدا وتیان: برایەکی بەڕێزیت و برازایەکی بەڕێزیت) ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((منیش وەك پێغەمبەر یوسف دەڵێم: ﴿ قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٩٢﴾ ﴾ (یوسف)[٢٦١]. واتە: هیچ ڕەخنەو گلەییەکم نییە بەرانبەرتان ئەمڕۆ دەڵێم خوا لێتان خۆش دەبێت وە خوا لەهەموو کەس بە بەزەیی ترە بۆ بەندەکانی.

پاشان لەوێدا وتارێکی بۆدان و ئامۆژگاری کردن و هەندێك لەیاساکانی ئاینی بۆ ڕوون کردنەوە: ئیبنو عومەر رضي الله عنه دەفەرموێت: ((پێغەمبەر ﷺ پاشان لەسەر قادرمەی پلیکانەکانی بەردەم دەرگای کەعبە وەستا: (فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ) واتە: سوپاس و ستایشی خوای کرد)[٢٦٢] (وكبّر ثلاثاً) واتە: سێ جار (ألله أكبر) کرد پاشان فەرمووی: ((لا إلهَ إلا اللهُ (وحدَه) (الْحَمْدُ اللَّهِ الَّذِي) ، صدَقَ وعده ، ونصَرَ عبده ، وهزمَ الأحزابَ وَحدهُ ، ألا إن كلَّ مَأثُرَةٍ كانت في الجاهليةِ تُذْكَرُ وتُدْعَى مِن دَمٍ ، أو مالٍ ، تحتَ قدميَّ ، إلا ما كان مِن سِقايَةِ الحاجِّ ، وسِدَانَةِ البيتِ . ثم قال : ألا إن دِيَةَ الخطأِ شبهِ العَمْدِ ما كان بالسَّوْطِ والعصا؛ مائةٌ مِن الإبلِ : منها أربعون في بطونِها أولادُها. (فَقَدْ أَمْضَيْتُهَا لِأَهْلِهَا) (كَما كَانَا))) ثُمَّ قَالَ: ((أَلَا إِنَّ دِيَةَ الْخَطَإِ شِبْهِ الْعَمْدِ مَا كَانَ بِالسَّوْطِ، وَالْعَصَا، (والحَجَر) فِيهِ مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ: (مغلَّظَةً) مِنْهَا أَرْبَعُونَ

(٢٥٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٦/٤) رقم (٩٣٠) وقال محققه: اسناده حسن. وكذا قال الحافظ في (الفتح) (٢٢/٨).

(٢٦٠) أخرجه: ابوداود (٣٠٢٤)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٦١٣).

(٢٦١) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٥/٥٧، ٨٦)، واخرجه ابوعبيد (الاموال) (ص:١٤٣) باسناد حسن مرسل كما في (السيرة في ضوء مصادره الاصلية) (ص:٥٦٩)، وضعفه الحافظ العراقي في (الاحياء) (١٨٣/٣) واوردناه للعلم فقط.

(٢٦٢) أخرجه: النسائي (٤٧٩٩)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٤٤٦٦).

فِي بُطُونِ أَوْلَادِهَا))[٣٦٣] (أَيُّهَا النَّاسُ فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ (أي: الكبر والفخر) الْجَاهِلِيَّةِ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا النَّاسُ رَجُلَانِ: (رَجل) بَرٌّ تقيٌّ كَرِيمٌ عَلَى رَبِّهِ وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ هَيِّنٌ عَلَى رَبِّهِ) ثُمَّ تَلَاه[٣٦٤] ثُمَّ تلاه﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾(الحجرات). واتە: سوپاس بۆ خوا بەڵێنەکانی خۆی بۆ هێنایەدی و بەندەی خۆی سەرخست و هەر خۆی هەموو لایەنەکانی بەزاند، ئاگاداربن هەموو داوایەکی زەمانی نەفامی کە داوا دەکراو باسی دەکرا سەبارەت بەهەر خوێن و سامانێك بێت هەموو لەژێر هەردوو قاچمدایە (واتە: هەڵوەشێنراوەتەوە هیچ بایەخێکی نەماوە) تەنها ئاودانی میوانانی ماڵی خواو خزمەتگوزاری ماڵی خوا (ئەوانە بایەخدارن هەر بەدەست خاوەنەکانیانەوە دەمێننەوە) (وەك پێشتر) پاشان فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە خوای گەورە پاکی کردونەتەوە لە فەخرو فیزو (شانازی کردن بە باوباپیرانەوە)، ئەی خەڵکینە خەڵکی دوو جۆر مرۆڤن: کەسێکی چاکەکارو خۆپارێز لەحەرام و بەرێز لەلای خوا وە کەسێکی تاوانباری تیاچووی بێ ڕێز لەلای خوا. پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ئەی خەڵکینە ئێمە دروستمان کردوون لەنێرو مێ و ئێوەمان کردوەتە چەندەها گەل و هۆز بۆ ئەوەی یەکتر بناسن و بەڕێزترینتان لای خوا گوێڕایەڵترینتانەو خۆپارێزترینتانە لەحەرام. پاشان فەرمووی: ((أَقُولُ هَذَا وَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ لِي وَلَكُمْ))[٣٦٥] واتە: ئەمە وتەکانم بوو داوای لێخۆش بوون بۆ خۆم و ئێوە دەکەم لەخوا.

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (.....ئینجا لەقادرمەکان چووە خوارەوە بۆلای ئاوی زەمزەم و تەماشای بیرەکەی کردو فەرمووی: ((لَوْلَا أَنْ تُغْلَبَ بَنُو عَبْدِ الْمُطَّلِبِ عَلَى سِقَايَتِهِمْ لَنَزَعْتُ مِنْهَا بِيَدِي [دَلْوًا])) واتە: ((گەر لەبەرئەوە نەبێت کەبەنوعەبدول موتەلیب ئاودانەکەیان لێزەوت بکرێت دەچووم و بەدەستی خۆم دۆڵچەیەکەم

(٣٦٣) أخرجه: ابوداود (٤٥٤٧،٥١١٦)، وابن ماجة (٢٦٢٧)، وأحمد (٦٥٣٣) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن حبان (٦٠١١) وقال محققه: اسناده صحيح واللفظ له، وصححه ايضاً الشيخ الالباني في صحيح ابي داود (٣٨٠٧)، و (صحيح ابن ماجة) ٢١٢٨)، وفي (الارواء) (٢١٩٧).

(٣٦٤) وجاء في رواية ابي داود (انتم بنو آدم وادم من تراب ليد عن رجال فخرهم باقوام انمّا هم فحمٌ مِن فحم جهنم او ليكوننَّ اهون على الله من الجعلات التي تدفع بانفها (النتن) أخرجه: ابوداود (٥١١٦) وحسنه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٧٠٠).

(٣٦٥) أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٨٠٧٤)، والترمزي (٣٢٧٠)، وابن خزيمة (٢٧٨١) وقال محققه: صحيح، وابن حبان (٣٨٢٨) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٨٠٣).

هەڵدەهێنجا لەزەمزەم)) پاشان چووە لای مەقامی ئیبراهیم ئەوکات بەدیواری کەعبەوە نووسابوو کەمێك بردیە دواوەو داوای جامێك ئاوی زەمزەمی کردو لێی خواردەوەو دەستنوێژی لێ تازە کردەوە، موسوڵمانان پەلاماری ئاوی دەستنوێژەکەیان دەداو دەیان پرژاند بەڕووخساریاندا (هیچ دڵۆپە ئاوێکی بەفیرۆ نەدەچوو دەکەوتە ناو لەپی دەستی یەکێکیان و دەیان خواردەوە)[٢٦٦]، (لەو کاتەدا موشریکەکان هەموو تەماشایان دەکردو سەریان سوڕمابوو وە دەیان وت: هیچ پاشایەکمان نەبینیوە گەیشتبێتە ئەو ئاستەو نەشمان بیستووە)[٢٦٧].

## بیلال بانگ ئەدات لەسەر کەعبە

عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: (پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بە بیلال و چووەسەر کەعبە بانگی دا بۆئەوەی موشریکەکانی پێ توڕەو خەفەتبار بکات)[٢٦٨]. لە گێڕنەوەیەکی تردا: ئیبنو ئەبو مولەیکە دەڵێت: (لەڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە بیلال لەسەربانی کەعبە بانگ بدات. لەو کاتەدا ناودارێکی قوڕەیش کەناوی حاریسی کوڕی هیشام بوو بەهاوڕێیەکی وت: تەماشا ناکەیت ئەو کۆیلەیە چووەتە سەر کوێ؟ ئەویش وتی: لێگەڕێ گەر خوا پێی ناخۆش بێت بارەکە دەگۆڕێت)[٢٦٩]. لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: (لەوێدا یەکێك لەکوڕانی سەعیدی کوڕی عاص وتی: خوا ڕێزی لە سەعید گرت و بردیە لای خۆی پێش ئەوەی ببینێ و ببیستێت ئەو کۆیلە ڕەشە لەسەر کەعبە چی دەڵێت)[٢٧٠].

لەگێڕانەوەیەکی تردا ئەبو سەلەمەو یەحیای کوڕی عەبدول ڕەحمانی کوڕی حاتەب ﷺ فەرموویانە: (..... پاشان بیلال سەرکەوت وچووە سەر کەعبەو بانگیدا.

---

(٢٦٦) أخرجه: ابن ابـي شيبة (٣٨٠٧٤).

(٢٦٧) أخرجه: البـيهقي (الدلائل) (٤٥/٥).

(٢٦٨)أخرجه: ابن ابـي شيبة (المصنف) (٣٨٠٨١) وقال محققه: مرسل اسناده حسن، والبـيهقي (الدلائل) (٧٨/٥) و الذهبـي (المغازي) (ص:٥٥٥) و اسناده صحيح كما في (السيرة في ضوء المصادر الاصلية) (ص:٥٧١).

(٢٦٩) أخرجه: ابن ابـي شيبة (المصنف) (٣٨٠٨٥) وقال محققه: رجاله ثقات، وعبدالرزاق (المصنف) (١٩٤٦٤)، والازرقي (اخبار مكة) (٢٧٤/١)، وابن سعد (٢٣٤/٣)، والبـيهقي (الدلائل) (٧٩/٥) واللفظ له.

(٢٧٠) أخرجه· البـيهقي (الدلائل) (٧٩/٥)، والذهبـي (المغازي) ص(٥٥٥) واسناده حسن كما في (السيرة في ضوء المصادر الاصلـ (ص:٥٧١).

لەوکاتەدا خالیدی کوڕی ئوسەید وتی: ئەو دەنگە چییە؟ وتیان: ئەوە بیلالی کوڕی ڕەباحە. وتی: کۆیلەکەی ئەبوبەکر...؟ وتیان: بەڵێ. وتی: لەکوێیە؟ وتیان: لەسەربانی کەعبەیە؟ وتی: لەشوێنی چاودێرییەکەی کوڕانی ئەبو تەڵحەیە؟ وتیان: بەڵێ. وتی: دەڵێت چی؟ وتیان: دەڵێت شایەتی ئەدەم هیچ خوایەك نییە جگە لە (الله) و شایەتیش ئەدەم کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە. وتی: خوا ڕێزی لەباوکی خالید گرتووەو کاتێك نەماوە تا گوێی لەو دەنگە بێت[٢٧١]. (واتە: مەبەستی لە باوکی خۆیەتی، کەیەکێکە لەکوژراوانی جەنگی بەدر).

پێ دەچێت ئەو بانگەشی بانگی نیوەڕۆ بوو بێت. ئیبنو عومەر ﷺ دەفەرموێت: (....بیلال بانگی داو موسوڵمانان قۆڵیان هەڵکردو پەشتەماڵیان لەخۆیان توند کردو سەتڵیان دەبردو ئاوی زەمزەمیان دەهێناو ڕووکاری دەرەوەو ناوەوەی کەعبەیان شۆردو هەموو ئاسەوارێکی موشریکەکانیان لێ پاك کردەوەو هەموویان شۆرد)[٢٧٢].

## وتەی ئەنصارییەکان لەنێو خۆیاندا

ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: (.....پاشان پێغەمبەر ﷺ چووەلای تەپۆڵکەی سەفا (ولەوێوە تەماشای کەعبەی دەکردو هەردوو دەستی بەرز کردبووەوەو (سوپاس و ستایشی) (ویادی خوای دەکرد بەوەی کەخۆی دەیویست) (ولێی دەپاڕایەوەو ئەو نزایانەی دەکرد کەخۆی دەیویست) و ئەنصارییەکانیش لەلای بوون (و هەندێکیان بەهەندێکیانی دەوت): ئەو پیاوە ئاواتی گەیشتن بەشارەکەی و بەسۆزبوونەوە بۆ خزمەکانی بۆ هاتەدی. لەو کاتەدا نیگا لەخوا هات و هەرکاتێکیش بهاتایە هەموو پێمان دەزانی و هیچ کەسێکیش چاوی بەرز نەدەکردەوە تا تەماشای روخساری پێغەمبەر ﷺ بکات و هەموو سەرو چاویان نەوی دەکرد تا نیگاکە تەواو دەبوو، کاتێك نیگاکە تەواوبوو پێغەمبەر ﷺ سەری بەرز کردەوەو پاشان فەرمووی: ((يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ! )) واتە: ((ئەی ئەنصارییەکان)) هەموو وتیان: بەڵێ ئەوا هاتین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ((قُلْتُمْ: أَمَّا الرَّجُلُ فَأَدْرَكَتْهُ رَغْبَةٌ فِي قَرْيَتِهِ، وَرَأْفَةٌ فِي عَشِيرَتِهِ))؟ واتە: ((ئێوە وتتان ئەو ئاواتی گەیشتن بەشارەکەی و نەرم بوون لەگەڵ خزمەکانی

---

(٢٧١) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٥) وقال محققه: مرسل اسناده حسن.

(٢٧٢) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٧٤) وقال محققوه: فيه ضعيف.

بۆ گەڕایەوە؟ وتیان: ڕاستە ئێمە وامان وت ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((كَلَّا فَمَا اسْمِي إِذًا (ثَلَاثَ مرات) كَلَّا إِ! إِنِّي عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ، [هاجرتُ إلى اللهِ وَإليكُمْ] الْمَحْيَا مَحْيَاكُمْ، وَالْمَمَاتُ مَمَاتُكُمْ، كلا فما اسمي اذاً (ثلاث مرّات) كلاّ اِنِي عَبداللّهِ وَرَسُولَهَ المَحيا مَحياكُمْ وَالمَمات مَماتُكُمْ)) واتە: ((نەخێر شتی وەها نابێت ئەی کەواتە من ناوم چییە؟ (سێ جار دووبارەی کردەوە)) نا من بەندەو پێغەمبەری خوام (کۆچم کردووە بۆلای خواو (پاشان) ئێوە) دڵنیا بن ژیانم لەگەڵ ژیانتانە و مردنیشم لەگەڵ مردنتانە)) ئینجا ئەنصارییەکان هەموو هاتنەوە لای دەگریان و دەیان وت: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەخوا ئێمە (ئەوەمان بۆیە وت) چونکە گومانی چاکمان هەیە بەخواو پێغەمبەرەکەی.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((إِنَّ اللهَ وَرَسُولَهُ يُصَدِّقَانِكُمْ وَيَعْذِرَانِكُمْ))[٢٧٣] واتە: خواو پێغەمبەرەکەی بەڕاستتان دەزانن و پاساویشتان قبوڵ دەکەن. پاشان پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی لەگەڵ موسوڵمانان کردو هەموو خەڵکی هێور کردەوە تەنها خوزاعە نەبێت کەبۆیان هەبوو تۆڵەی خۆیان لەبەنی بەکر بکەنەوە، ئەوەش تا کاتی عەسر بەردەوام بوو پاشان قەدەغەی کرد.

ئیبنو عومەر ﷺ دەفەرموێت: ((پێغەمبەر ﷺ مەککەی ئازادکردو پاڵی دایەوە بەدیواری کەعبەوەو فەرمووی: ((كُفُّوا السِّلَاحَ إِلَّا خُزَاعَةَ عَنْ بَكْرٍ سَاعَةً)) واتە: ((چەك بەکار مەهێنن، تەنها خوزاعە ڕێگە دراوە چەك لەدژی بەنی بەکر بەکاربهێنێت.....))[٢٧٤].

ئەبو شورەیحی خوزاعی ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا ڕێگەی شەڕکردنی پێداین لەگەڵ بەنی بەکردا تا تۆڵەی خۆمان لێکردنەوە لەمەککە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا شمشێرەکانمان دابنێین)[٢٧٥]. عەبدوڵڵای کوڕی عەمریش ﷺ دەفەرموێت: (لەڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((كُفُّوا السِّلَاحَ إِلَّا خُزَاعَةَ مِنْ بَنِي بَكْرٍ ، فَأَذِنَ لَهُمْ حَتَّى صَلَّوَا الْعَصْرَ ،

---

(٢٧٣) أخرجه: مسلم (١٧٨٠)، وأحمد (المسند) (١٠٩٤٨) وقال محققوه اسناده على شرط مسلم واللفظ لهما.

(٢٧٤) أخرجه: ابن حبان (الصحيح) (٥٩٩٦) وقال محققه: اسناده حسن.

(٢٧٥) أخرجه: البخاري (٤٢٩٥)، ومسلم (١٣٥٤، ١٧٨١)، والترمذي (٣١٣٨)، والطبراني (الكبير) (٤٨٤/١٢)، وابن حبان (١٧٠٢).

ثُمَّ قَالَ لَهُمْ: كُفُّوا السِّلَاحَ))[٢٧٦]. واتە: هەمووتان چەك دابنێن تەنها خوزاعە نەبێت دژ بە بەنی بەکر)) ئەوکات تەنها ڕێگەی ئەوانی دا، تا نوێژی عەسریان کرد، پاشان پێی فەرموون: هەموو چەك دابنێن و شەڕ ڕابگرن.

## موسوڵمانبوونی ئەبوقوحافەی باوکی ئەبوبەکری صدیق رضي الله عنه

ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صدیق رضي الله عنه دەفەرموێت: (.....کاتێك پێغەمبەر ﷺ مەککەی ئازادکردو چووە ناو مزگەوتەکە، ئەبوبەکر چوو دەستی باوکی گرت و هێنای (لەگێڕانەوەیەکدا: باوکی بەکۆڵ هەڵگرتبوو تا هێنایە بەردەم پێغەمبەر ﷺ)[٢٧٧]. لەوێدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هَلَّا تَرَكْتَ الشَّيْخَ فِي بَيْتِهِ حَتَّى أَكُونَ أَنَا آتِيهِ فِيهِ)) (تَكْرِمَةً لِأَبِي بَكْرٍ) واتە: (بۆ لێ نەگەڕایت ئەم بەساڵاچووە لەماڵەکەی خۆی بمێنێتەوە تا من بچمە ماڵەوە بۆلای). (وەك ڕێزێك بۆ ئەبوبەکر)؟ ئەبوبەکر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو پێویستترە بێت بۆلات نەك تۆ بچیت بۆلای ئەو. لەبەردەم پێغەمبەر ﷺ دایناو پاشان پێغەمبەریش دەستی بەسنگی ئەبو قوحافەدا هێناو پێی وت: ((موسوڵمان ببە)). ئەویش موسوڵمان بوو. لەو کاتەدا (سەرو ڕیشی وەك لۆکە سپی بوو)[٢٧٨] پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((غَيِّرِ وهما وجَنبُوهما السّواد))[٢٧٩] واتە: ڕەنگی سەروڕیشی بگۆڕن و ڕەشی مەکەن)[٢٨٠].

زەیدی کوڕی ئەسلم رضي الله عنه دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ پیرۆزبایی کرد لەئەبوبەکر بەهۆی موسوڵمان بوونی باوکییەوە)[٢٨١].

---

(٢٧٦) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٩) وقال محققوه: اسناده قوي و أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣١٧/٢٥) باسناده حسن، وأحمد (٦٦٨١) وقال محققوه: اسناده حسن، وابن حبان (٥٩٩٦) وقال محققه: اسناده حسن.

(٢٧٧) أخرجه: أحمد (١٢٦٣٥) وقال محقيقوهُ: اسناده صحيح على شرط مسلم، والحاكم (٢٤٤/٣)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيحة) (٤٩٦).

(٢٧٨) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨٣٢٥).

(٢٧٩) أخرجه: أبو يعلى (٢٨٣١)، والحاكم (٢١٤/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٥٤٧٢) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(٢٨٠) أخرجه: أحمد (٢٦٩٥٦) وقال محققوه: اسناده حسن، والطبراني (الكبير) (٢٣٦/٢٤- ٢٣٧))، والحاكم (٤٦/٣) وصححه على شرط مسلم، والبيهقي (الدلائل) (٩٥/٥)، وابن حبان (٧٢٠٨) وقال محققه: اسناده حسن، وابن هشام (السيرة) (٢٠/٤) (٩٢٠) وقال محققه: اسناده حسن، وصحح اسناده الحافظ في (الاصابة) (٤٦٠/٢) رقم (٥٤٤٢).

(٢٨١) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٩٦/٥).

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (.....کاتێك ئەبوقوحافە دەستی برد تا بەڵێنی موسوڵمانییەتی بداتە پێغەمبەر ﷺ. لەو کاتەدا ئەبوبەکر گریاو پێی فەرموو: ((ما یبکیك))؟ واتە: ((چی دەتگریەنێت))؟ ئەبوبەکر فەرمووی: گەر دەستی مامت لەجێی دەستی باوکم بووایەو ئەو موسوڵمان بووایەو تۆش بەو موسوڵمان بوونەی دڵخۆش بوویتایە لەموسوڵمان بوونی باوکم لام خۆشتر دەبوو)[٢٨٢].

## شەوی ئازادکردنی شاری مەککە

سەعیدی کوڕی موسەیب ﷺ دەفەرموێت: (لەشەوی یەکەمی ئازادکردنی شاری مەککەدا موسوڵمانان تێکڕا تەوافیان دەکردو (الله أكبر) و (لا اله الا الله) یان دەوت هەتا ڕۆژهەڵاتن، بەیانییەکەی ئەبوسوفیان بەهاوسەرەکەی (هند) وت: ئایا گۆڕینی ئەم بارودۆخە لەخواوەیە؟ لەو بەیانییەدا ئەبوسوفیان چوو سەردانی پێغەمبەری ﷺ کرد، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: ((قُلْتُ لِهْنْد: أتَرينَ هَذا مِن اللهِ نَعَم هو مِنْ عِنْد اللهِ)) واتە: تۆ بەهیندت وت: ئایا گۆڕینی ئەم بارودۆخە لەخواوە بووە بەڵێ هەمووی لەلایەن خواوە بوو)). ئەبوسوفیان وتی: شایەتی ئەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت، سوێند بێت بەوانەی کە ئەبوسوفیان سوێندیان پێ دەخوات ئەو وتەیەی من تەنها هەر هیند گوێی لێ بوو هیچ کەسێکی تر گوێی لێ نەبووە و نەیبیستووە[٢٨٣].

## وتاری دووەم لەڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککە

لەدووەم ڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا هۆزی خوزاعە یەکێکیان کوشت لەهۆزی بەنی بەکر، ئەو هەواڵەش گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ و سێ جار وتاری بۆدان هەندێك لە بنەما شەرعییەکانی بۆ ڕوونکردنەوە:

### وتاری یەکەم:

ئەبو شورەیحی خوزاعی ﷺ دەفەرموێت: (ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین لەکاتی

(٢٨٢) أخرجه: ابويعلى (٤٧٥٦)، وقال الحافظ في (الاصابة) (١١٦/٤): سنده صحيح.

(٢٨٣) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١٠٣/٥)، والسيوطي كما في (كنز العمال) (٣٠١٦٨) ومراسيل سعيد بن المسيب صحيحة عند العلماء.

ئازادکردنی شاری مەککەدا، ڕێگەی داین جەنگ بکەین لەگەڵ بەنی بەکردا تا تۆڵەی خۆمانمان لێکردنەوە لەمەککەدا، پاشان فەرمانیدا کە چەکەکانمان دابنێین، بۆ ڕۆژی دواتر: هەندێك کەسانی ئێمە پیاوێکی بەنی بەکریان لە موزدەلیفە پێگەیشتبوو کە دەیویست بۆلای پێغەمبەر ﷺ بېێت تا موسوڵمان بێت، بەڵام ئەو پیاوە چەند کەسێکی لەخوزاعە لەکاتی نەفامیدا کوشت بوو، خوزاعەش بەدوایدا دەگەڕان تا بیکوژنەوە، ئەوان لەوێدا نەیان هێشت لەدەستیان دەرباز بێت و کوشتیان، چونکە دەترسان بگاتە لای پێغەمبەر ﷺ و پەنای بدات و کەس نەتوانێت هیچ بەرامبەری بکات. کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتەوە بەپێغەمبەر ﷺ زۆر زۆر تورە بوو سوێند بەخوا هیچ کاتێکی تر تورەبوونی وەهام پێوە نەدیوە.

ئێمەی خوزاعە چووینە لای ئەبوبەکر و عومەرو عەلی تا ببنە تکاکار بۆمان لای پێغەمبەر ﷺ و ترساین کەتیاچووبین، کاتێك پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد[٢٨٤]، ئینجا هەستاو وتارێکی بۆداین (سوپاس و ستایشی شایستەی خوای کرد) وفەرمووی: ((يا أَيُّهَا النَّاسُ [إِنَّ اللهَ حَبَسَ عن مكةَ الفيلَ، وَسَلَّطَ عليْها رسولَ اللهِ والمؤمنينَ][٢٨٥] يا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ حَرَّمَ مَكَّةَ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ [ولم يحرمها الناس][٢٨٦]، فَهِيَ حَرَامٌ مِنْ حَرَامِ اللهِ تَعَالَى إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، لَا يَحِلُّ لِامْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ يَسْفِكَ فِيهَا دَمًا، وَلَا يَعْضِدَ بِهَا شَجَرًا، لَمْ تَحْلِلْ لِأَحَدٍ كَانَ قَبْلِي، وَلَا تَحِلُّ لِأَحَدٍ يَكُونُ بَعْدِي، وَلَمْ تَحْلِلْ لِي [قطُّ][٢٨٧] إِلَّا هَذِهِ السَّاعَةَ غَضَبًا عَلَى أَهْلِهَا، أَلَا ثُمَّ قَدْ رَجَعَتْ كَحُرْمَتِهَا بِالْأَمْسِ، أَلَا فَلْيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ مِنْكُمُ الْغَائِبَ، فَمَنْ قَالَ لَكُمْ إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَدْ قَاتَلَ بِهَا فَقُولُوا: إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ [أَذِنَ] لِرَسُولِهِ وَلَمْ [أَذِنَ] لَكُمْ، يَا مَعْشَرَ خُزَاعَةَ، ارْفَعُوا أَيْدِيَكُمْ عَنِ الْقَتْلِ، فَقَدْ كَثُرَ [القَتْل أَنْ يَقَعَ، لَقَد][٢٨٨] لَئِنْ قَتَلْتُمْ قَتِيلًا لَأَدِيَنَّهُ، فَمَنْ قُتِلَ بَعْدَ مَقَامِي هَذَا فَأَهْلُهُ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ، إِنْ شَاءُوا فَدَمُ قَاتِلِهِ وَإِنْ شَاءُوا فَعَقْلُهُ »، ثُمَّ وَدَى رَسُولُ اللهِ ﷺ (ذلك) الرَّجُلَ الَّذِي قَتَلَتْهُ خُزَاعَةُ)[٢٨٩] واتە: ((ئەی خەڵکینە (خوای گەورە مەککەی پاراست لەخاوەن فیلەکان بەڵام خۆی پێغەمبەرو بڕوادارەکانی بەسەردا

(٢٨٤) أخرجه: أحمد (١٦٣٧٦) وقال محققوه: حديث صحيح، والطبراني (٥٠٠/٢٢)، والحاكم (٣٤٩/٤)، والبـيهقي (٧١/٨).

(٢٨٥) أخرجه: البخاري (٢٤٣٩)، ومسلم (١٣٥٥)، وابوداود (١٤٠٥).

(٢٨٦) أخرجه: أحمد (١٦٣٧٣) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

(٢٨٧) أخرجه: البخاري (٤٣١٣).

(٢٨٨) أخرجه: ابن هشام (٣٠/٤) رقم (٩٣٨) وقال محققه: اسناده حسن، والطبراني (الكبير) (٤٨٥/٢٢).

(٢٨٩) أخرجه: أحمد (١٦٣٧٧) وقال محققوه: حديث صحيح واسناده حسن. واللفظ له.

زاڵکردن) ئاگاداربن خوای گەورە خۆی مەککەی حەرام و قەدەغە کردووە لەو ڕۆژەوە کە ئاسمانەکان و زەوی تیادا دروست کردووە (وحەرام و قەدەغە کردنی لەلایەن خەڵکیەوە نەبووە).

کەواتە حەرامە لەحەرام کردنەکەی خواوە تا ڕۆژی کۆتایی، ڕێگە بە هیچ کەسێك نادرێت کەبڕوای هەیە بەخواو ڕۆژی دوایی کەخوێن ڕێژییەکی تیادا ئەنجام بدات و درەختێکی بشکێنێت و ببڕێت، ئەوەش ڕێگە نەدراوە بۆ هیچ کەسێکی تری پێش من وەرێگەش نادرێت بۆ هیچ کەسێکی تر لەدوای من، ڕێگەش بەمن نەدراوە هەرگیز پێش ئێستا تەنها لەم ساتەدا ڕێگەم پێدراوە ئەویش بەهۆی توڕەیی خوا لە دانیشتوانەکەی. ئاگاداربن لێرە بەدواوە وەك جاران حەرام و قەدەغەیە، با ئامادەبووانی ئێرە ئەمە بگەیەنن بەوانەی کە لێرە نین، هەرکەسێکیش پێی وتن: پێغەمبەر ﷺ جەنگاوە لەم شارەدا، ئێوەش پێی بڵێن: خوای گەورە ڕێگەی بەپێغەمبەرەکەی داوەو ڕێگەی بەئێوە نەداوە. ئەی هۆزی خوزاعە دەست هەڵگرن لەکوشتن، چونکە (کوشتار زۆر ڕویدا گەر سوودی هەبێت) ئێوە پیاوێکتان کوشتووەو منیش خوێنەکەی دەدەم هەرکەسێکیش لەدوای ئەم وتارەمەوە بکوژرێت خاوەنەکەی سەرپشك دەبن لەنێوان دوو چاکەدا یان ئەوەتا بکوژەکە دەکوژنەوە یان ئەوەتا خوێنەکەی لەخزمانی بکوژەکە وەردەگرنەوە). پاشان پێغەمبەر ﷺ باربۆی خوێنی کوژراوەکەی دا).

### وتاری دووەم:

عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: (خوای گەورە مەککەی بۆ ئازاد کردین کاتێك پێغەمبەر ﷺ پاڵی دابوو بەکەعبەوە فەرمووی: ((كُفُّوا السِّلَاحَ إِلَّا خُزَاعَةَ عَنْ بَكْرٍ)) واتە: ((چەك بەکار مەهێنن تەنها خوزاعە بۆی هەیە چەك لەدژی بەنی بەکر بەکاربهێنێت.

لە ڕۆژی دواتردا پیاوێکی خوزاعە لەموزدەلیفە گەیشتبوو بەیەکێك لەبەنی بەکرو کوشتبووی[٢٩٠]. پیاوێك هات و هەواڵەکەی بەپێغەمبەر ﷺ گەیاند (لەوێدا

(٢٩٠) أخرجه: أحمد (٦٦٨١) وقال محققوه: اسناده حسن.

هەستاو پاڵی دا بەکەعبەوە) وفەرمووی: ((إِنَّ هَذَا الحَرَمَ حَرَامٌ عَنْ أمرِ اللَّهِ ، لَمْ يَحِلَّ لِمَنْ كَانَ قَبْلِي ، وَلَا يَحِلُّ لِمَنْ بَعْدِي ، وَإِنَّهُ لَمْ يَحِلَّ لِي إِلَّا سَاعَةً وَاحِدَةً ، وَإِنَّهُ لَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَشْهَرَ فِيهِ سِلَاحًا ، وَإِنَّهُ لَا يُخْتَلَى خَلَاهُ ، وَلَا يُعْضَدُ شَجَرُهُ ، وَلَا يُنَفَّرُ صَيْدُهُ (ولا تحِل ساقطتها الِا لمُنشدٍ))[٢٩١] واتە: ((ئەم شوینە پیرۆزە لەسەر بڕیاری خوا حەرام کراوەو بەکەس حەڵاڵ نەبووە پێش من و بە کەسیش لەدوای من حەڵاڵ نابێت. و تەنها ساتێکیش بۆ من حەڵاڵ کرا، لەبەر ئەوە ڕێگە نادرێت بەهیچ موسوڵمانێك کە چەکی تیا بەکاربهێنێت بۆ جەنگ کردن، و نابێت گیای تەڕی ئەم ناوچەیە ببڕن و درەختی بشکێنن و نێچیریشی ڕاو بنێن (و نابێت دۆزراوەکەشی هەڵبگرنەوە تەنها بۆ ئەوانە دروستە کە دەیگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان) لەوێدا (عەبباسی مامی)[٢٩٢] وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگە بدە گیای ئەزخەر ببڕین (چونکە پێویستمان پێی هەیە بۆ دروست کردنی خانووەکانمان و گۆڕەکانمان)[٢٩٣] (وە بۆ ئاسنگەرەکانمان)[٢٩٤]، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إِلَّا الْإِذْخَرَ (فإنَّهُ حَلال)[٢٩٥] ، وَإِنَّ أَعْتَى النَّاسِ عَلَى اللَّهِ ثَلَاثَةٌ: مَنْ قَتَلَ فِي حَرَمِ اللَّهِ، أَوْ قَتَلَ غَيْرَ قَاتِلِهِ أَوْ قَتَلَ لِذَحْلِ (مُسلِماً) (بِذُحُولِ (أي: عداوة وإحقاد)) الْجَاهِلِيَّةِ) واتە: ((تەنها بڕینی گیای ئەزخەرتان بۆ حەڵاڵە). بزانن لاسارترین مرۆڤ لای خوا سیانن: ئەوەی کەسێك دەکوژێت لەحەرەمی خوادا ومئەوەی جگە لەبکوژەکە کەسێکی تر دەکوژێت وە ئەوەی (موسوڵمانێك) دەکوژێت لەسەر ڕق و دوژمنایەتی پێش ئیسلامدا)).

لەوێدا پیاوێك هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پێشتر من جووت بووم لەگەڵ کەنیزەکێکی بنەماڵەی فلانە کەسداو منداڵێکم لێی بوو فەرمان بکە تا منداڵەکەی خۆمم بۆ بگێڕنەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لَيْسَ بِوَلَدِكَ، لَا يَجُوزُ هَذَا فِي الْإِسْلَامِ، وَالْمُدَّعَى عَلَيْهِ أَوْلَى بِالْيَمِينِ إلا أن تقوم بينة، (لَا دَعْوَةَ فِي الْإِسْلَامِ، ذَهَبَ أَمْرُ الْجَاهِلِيَّةِ))[٢٩٦] الولد لصحاب الْفِرَاشِ، وَبِفِي الْعَاهِرِ الْأَثْلِبُ)) واتە: ((ئەوە منداڵی تۆ نییە ئەوە کارێکی نەشیاوە لەئیسلامدا. شکاتلێکراو پێویستە سوێند بخوات مەگەر بەڵگەی ئاشکرا لەبەردەستدا

(٢٩١) أخرجه: البخاري (٢٤٣٩)، ومسلم (١٣٥٥).

(٢٩٢) أخرجه: مسلم (١٣٥٥).

(٢٩٣) أخرجه: نفس المصدر.

(٢٩٤) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٥) وقال محققه: مرسل اسناده حسن.

(٢٩٥) أخرجه: البخاري (٣١٣٤).

(٢٩٦) أخرجه: ابوداود (٢٣٤٧)، وأحمد (٦٦٨١) وقال محققوه: اسناده حسن.

هەبێت (زەمانی نەفامی کۆتایی پێهات و داواکاری ناڕەوا لەئیسلامدا نییە) منداڵ بۆ خاوەن ماڵەو زیناکاریش هەر بەردی بۆ دەمێنێتەوە.

پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (بەردی بۆ دەمێنێتەوە) واتای چی دەگەیەنێت؟ فەرمووی: ((واتە تەنها بەردێکی دەست دەکەوێت)) هەرکەسێك داوێنپیسی لەگەڵ ئافرەتێکی خەڵکی تردا بکات و بەهۆیەوە منداڵێکی ببێت ئەوە هی ئەو پیاوە نییە، نە میراتی لێ دەبات و نەمیراتی لێ وەردەگیرێت (لەتۆڵەی شکاندنی هەر پەنجەیەك پێویستە دە وشتر بدرێت وە لەو برینداری کردنانەدا کەئێسك دەردەخات پێویستە پێنج وشتر بدرێت)[٢٩٧] (لا حِلْفَ في الإسلامِ)[٢٩٨] واتە: (هیچ پەیمان و کۆمەڵ و کۆمەڵێنێك لەئیسلامدا دروست نییە) (وأيُّما حِلْفٍ كان في الجاهليَّةِ لم يزِدهُ الإسلامُ إلَّا شِدَّةً وَلا هِجْرَةَ بَعْدَ الفتحِ)[٢٩٩] وَالْمُؤْمِنُونَ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ، تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ، يُجِيرُ عَلَيْهِمْ أَوْلُهُمْ، وَيَرُدُّ عَلَيْهِمْ أَقْصَاهُمْ، وَلَا يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ، وَلَا ذُو عَهْدٍ فِي عَهْدِهِ، (دية الكافر نصف دية المسلم، لا جلبَ ولا جنبَ، ولا تؤخذ صدقاتهم إلاّ في دورهم)[٣٠٠] وَلَا يَتَوَارَثُ أَهْلُ مِلَّتَيْنِ، وَلَا تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا، وَلَا عَلَى خَالَتِهَا، وَلَا تُسَافِرُ ثَلَاثًا مَعَ غَيْرِ ذِي مَحْرَمٍ، وَلَا تُصَلُّوا بَعْدَ الْفَجْرِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ][٣٠١] ولا تُسافرُ (المرأةُ) ثلاثاً مَعَ غَيرِ ذي مَحرمٍ، وَلَا تُصَلُّوا بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ))[٣٠٢] وَفِي رواية ((وَلَا تَصُومُوا يَوْمَ الفِطْرِ مِنْ شَهْرِ رَمَضان وَلَا يَومَ النَحْرِ))[٣٠٣] ((وإيّاكُمْ واللبّتين والطَّعمتين)).

واتە: (هەر پەیمانێکی شیاو لەنەفامیدا بڕیاری لەسەر درا بێت، ئیسلام زیاتر توندو تۆڵتری دەکات، هیچ کۆچکردنێك نییە بۆ شاری مەککە لەدوای ئازادکردنی) بڕواداران هەموو وەك یەك دەستن بەرانبەر دوژمنانیان، و هەموو خوێنیان وەك یەکە، لەسەر تاکەیان مافی پەنادانی هەیە بەسەر هەمووانەوە و وکەمترینیشیان مافی

(٢٩٧) أخرجه: نفس المصدر السابق.

(٢٩٨) أخرجه: البخاري (الادب المفرد) (٥٧٠)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الادب المفرد) (٤٤٣).

(٢٩٩) أخرجه: مسلم (٢٥٣٠)، والحاكم (٢/٢٢٠)، وابن حبان (٤٣٧٢).

(٣٠٠) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٥/٨٦).

(٣٠١) أخرجه: أحمد (٦٦٨١) وقال محققه: اسناده حسن، والنسائي (٥/٦٥).

(٣٠٢) أخرجه: النسائي (٨/٥٢٤)، والطبراني (الاحاديث الطوال) رقم (٥٩) واسناده حسن كما قال محقق (المصنف) لابن ابي شيبة رقم (٣٨٠٥٩)، وابن حبان (٥٩٩٦) وقال محققه: اسناده حسن. واللفظ له والزيادات لا حمد وغيره.

(٣٠٣) أخرجه: البوصيري (اتحاف الخيرة المهرة) (٦٣٠٨).

خۆی پێ دەدرێتەوە، هەرگیز بڕوادارێك لەسەر کوشتنی بێ بڕوایەك یان پەنادراوێك ناکوژرێتەوە (وبژاردنی خوێنی بێ بڕوایەك وەك نیوەی خوێنی موسوڵمانێکە) (گزی کردن و پونابوون دروست نییە، و خێرو زەکاتەکانیشیان لەناو ماڵ و خانووەکانی خۆیان لێ وەردەگیرێت) دوو کەسی ئاین جیاواز میراتی لەیەکتر نابەن، وە هیچ ئافرەتێکیش بەسەر خوشکی باوکی و خوشکی دایکیدا نادرێتە شوو (هیچ ئافرەتێك بۆی نییە ببەخشێت بەبێ ڕەزامەندی مێردەکەی) (ئافرەت بۆی نییە گەشتێکی سێ ڕۆژە بکات بەبێ بوونی مەحرەمی، لەدوای نوێژی بەیانی نوێژ مەکەن هەتا ڕۆژ هەڵدێت، وەلەدوای نوێژی عەسریش نوێژ مەکەن تا ڕۆژئاوا دەبێت) وە (ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان بەڕۆژوو مەبن) (خۆ دووربگرن لەدوو جۆر دانیشتن و دوو جۆر نان خواردن) (ئەوەی فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە دەڵێت): لەباوکم پرسی ئەو دوو جۆر دانیشتنە چین؟ وتی: ئەوەیە مرۆڤ هەردوو ئەژنۆی بەرز بکاتەوەو عەورەتی لەنێوان هەردوو قاچییەوە دیار بێت یاخود پۆشاکێك لەخۆیەوە بپێچێت و لایەکی جەستەی دەربکەوێت. وتم: ئەی ئەو دوو جۆر نان خواردنە چۆنە؟ وتی: ئەوەیە مرۆڤ بەدەستی چەپی نان بخوات یاخود بەسەردەمدا پاڵ کەوتبێت و نان بخوات)[٣٠٤] (لەوێدا ئەبو شاە کەپیاوێکی خەڵکی یەمەن بوو هەستاو وتی: ئەو ئامۆژگاریانەم بۆ بنووسن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش فەرمووی: ((اكتبوا لأبي شاه)) واتە: ((بینووسن بۆ ئەبو شاە))[٣٠٥]

**وتاری سێهەم:**

جابر ﷺ دەفەرموێت: (گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ لەئازادکردنی شاری مەککەدا دەیفەرموو: ((إِنَّ اللهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ، وَالْمَيْتَةِ، وَالْخِنْزِيرِ، وَالْأَصْنَامِ)) واتە: خواو پێغەمبەر فرۆشتنی مەی و مردارەوە بوو وە بەرازو بتیان حەرام کردووە. وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی چەوری مردارەوە بوو چونکە ئەوە بۆ بۆیاخ کردنی کەشتی و پێستە خۆشکردن و چرای ڕووناك کەرەوە بەکاردەهێنرێت؟ فەرمووی: ((نابێت چونکە ئەوە حەرامە)) پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ، إِنَّ اللَّهَ

---

(٣٠٤) أخرجه: البيهقي (دلائل النبوة) (٨٧/٥).

(٣٠٥) أخرجه: البخاري (٢٤٣٤)، ومسلم (١٣٥٥).

لَمَّا حَرَّمَ عَلَيْهِمْ شُحُومَهَا أَجْمَلُوهُ ثُمَّ بَاعُوهُ فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ))[٣٠٦] واتە: جولەکەکان خوا بەکوشتنیان بەرێت کاتێك چەوری ئەو ئاژەڵانەیان لێ حەرام و قەدەغە کرا چوون تواندیانەوەو پاشان فرۆشتیان و پارەکەیان خوارد).

## ئەوانەی فەرمانی کوشتنیان درابوو

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کوشتنی نۆ پیاو و هەشت ئافرەتی دا لەکاتی ئازادکردنی شاری مەککەدا بەهۆی کارە قێزەونەکانیانەوە، هەندێکیان لەئیسلام پاشگەز ببوونەوە، وە هەندێکیشیان موسوڵمانانیان کوشت بوو یاخود بانگخوازانی ئیسلامیان ئازار دابوو، یاخود جوێنی ناشرینیان بەپێغەمبەر ﷺ دابوو، ئەوانە هەندێکیان کوژران و ئەوانی تریان ڕایانکرد یاخود خۆیان گەیاندە پێغەمبەر ﷺ و لێیان بوورا، لەوانەی کە کوژران: عەبدوڵڵای کوڕی خەتل بوو.

موصعەبی کوڕی سەعیدی کوڕی ئەبو عاص ﷺ دەڵێت: (.....عەبدوڵڵایان دیوە دەستی گرتبوو بەپەردەی کەعبەوە، لەوێدا سەعیدی کوڕی حەریس و عەمماری کوڕی یاسری بۆ ڕۆیشت و سەعید گەنجتر بوو زوتر گەیشتە عەبدوڵڵاو کوشتی)[٣٠٧].

بەڵام مەقیەسی کوڕی سوبابە لەنێوان سەفاو مەڕوەدا بینراو ئەبو سەلەمەو عەبدولڕەحمانی کوڕی حاتەب ﷺ دەفەرموون: (لەنێوان سەفاو مەڕوەدا مەقیەسی کوڕی سوبابەیان دییەوەو پیاوانێکی بەنی کەعب ویستییان بیکوژن بەڵام نومەیلەی ئامۆزای وتی: لێی دووركەونەوە سوێند بەخوا ئەمڕۆ هەر پیاوێك لێی نزیك ببێتەوە بەشمشێرەکەم دەیکوژم. ئینجا ئەوان لێی دوورکەوتنەوەو ئەبونومەیلەی ئامۆزای بۆی چوو بەشمشێر دای بەسەریداو کردیە دوو کەرتەوەو کوشتی.....)[٣٠٨] (بەڵام حوومیریس عەلی کوڕی ئەبو تالیب کوشتی.... وهیلالی کوڕی خەتل زوبەیر کوشتی..... و دوو ئافرەتە گۆرانیبێژەکەش کە بەگۆرانی جوێنیان بەپێغەمبەر ﷺ دەدا یەکێکیان

(٣٠٦) أخرجه: البخاري (٢٢٣٦)، ومسلم (١٥٨١)، والترمذي (١٢٩٧)، وابوداود (٣٤٨٦)، والنسائي (٣٠٩/٧).

(٣٠٧) أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٨٠٦٨) وقال محققه: اسناده حسن، والنسائي (١٠٥/٧) (٤٠٧٣)، و ابوداود (٢٦٨٣)، والبزار (١٨٢)، والحاكم (٤٥/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والطبراني (٤٣٠٠)، و ابويعلى (٧٥٧) وقال محققه رجاله رجال الصحيح.

(٣٠٨) أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٨٠٥٥) وقال محققه: مرسل واسناده حسن، والبيهقي (الدلائل) (٣٢/٥).

کوژراو ئەوی تریان دواتر موسوڵمان بوو)[٣٠٩] (ئەرنەبەی کچی سەعدیش لەگەڵ دایکی سارەدا کوژران، بەڵام کەعبی کوڕی زوهەیرو هیندی کچی عوتبەو عەکریمەی کوڕی ئەبوجەهل و سەفوانی کوڕی ئومەیەو ئیبنو زەعبەری و سوهەیلی کوڕی عەمر هەموو ئەوانە بەخشران لەلایەن پێغەمبەرەوەو ﷺ موسوڵمان بوون)[٣١٠].

بەڵام حەرسی کوڕی هیشامی برای ئەبوجەهل و زوهەیری کوڕی ئەبو ئومەییە رایان کرد و لای ئوم هانی خوشکی عەلی مانەوەو پەنای دان و دواتر بەخشران: ئوم هانی دەفەرموێت: (لەکاتی ئازادکردنی شاری مەککەدا (دوو برای مێردەکەم لەبەنی مەخزوم رایانکرد و هاتنە لام)[٣١١] منیش بردمنە ژوورەوە (و لەماڵەکەمدا شاردمنەوە)[٣١٢] و دەرگام لەسەر داخستن، پاشان عەلی کوڕی ئەبو تالیبی برام هات وتی: (دەیان کوژم) و شمشێری لێ دەرکردن بۆئەوەی بیان کوژێت و وتی: موشریکەکان پەنا دەدەیت؟ وتم: سوێند بەخوا رێگە نادەم بیانکوژیت تا لەپێشدا من نەکوژیت، ئینجا وازی هێناو لەماڵەکە چووە دەرەوە، وەمنیش دەرگاکەم لێ داخستن وتم ئاگاتان لێیان بێت[٣١٣]. پاشان کاتێك رۆژ بەرز بووەوەو چێشتەنگاو بوو چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ [٣١٤] بەڵام لەوێ نەبوو، فاتیمە لەوێ بوو بۆم گێڕایەوە. ئەویش لەمێردەکەی زیاتر دژم وەستایەوەو ئەوەندەی نەخایاند پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە تۆزاوی بوو (من سڵاوم لێکردو) فەرمووی: (ئەوە کێیە)؟ وتم: منم ئوم هانی کچی ئەبوتالیب)[٣١٥] کاتێك منی بینی پێشوازی لێکردم و فەرمووی: ((مرحبًا بفاتخة أم هانئ (ما جاء بك))؟ واتە: (مەرحەبا ئوم هانی چی تۆی هێناوەتە ئێرە)؟ وتم: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دووان لە هێوەرەکانم پەنا داوە)[٣١٦] کە موشریکن، بەڵام

(٣٠٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٥٢٩). وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠٢٤٢): رجاله ثقات.

(٣١٠) انظر: (فتح الباري) (١١/٨).

(٣١١) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٥/٤) رقم (٩٢٩).

(٣١٢) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٨٣).

(٣١٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٤/رقم ١٠١٣)، والحاكم (٥٢/٤)، والبيهقي (الكبرى) (٩٥/٩).

(٣١٤) أخرجه: البخاري (٣٥٧)، (٣١٧) مسلم (٣٣٦)، والترمذي (٢٧٣٤)، وأحمد (٢٦٩٠٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

(٣١٥) أخرجه: البخاري (٣٥٧)، (٣١٧) مسلم (٣٣٦)، والترمذي (٢٧٣٤)، وأحمد (٢٦٩٠٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

(٣١٦) أخرجه: ابن هشام (٢٦/٤) وقال هما: الحرث بن هشام، وزهير بن ابي امية.

عەلی دەیەوێت بیان کوژێت؟ فەرمووی: ((قَدْ أَجَرْنَا مَنْ أَجَرْتِ، وَأَمَّنَّا مَنْ أَمَّنْتِ)) واتە: ((ئەوەی تۆ پەنای بدەیت ئێمەش پەنای دەدەین)).

پاشان داوای کردو فاتیمە ئاوی بۆ هێناو (و ڕژاندیە ناو تەشتێکەوە کەپێشتر هەویری تێدا شێلرابوو پاشماوەی کەمی هەویرەکە بەتەشتەکەوە مابوو)[٣١٧]. (فاتیمەش پەردەیەکی بۆ گێڕاو)[٣١٨] وخۆی شۆرد، و پاشان پۆشاکێکی بەخۆیەوە ئاڵاند (و خۆی وشك کردەوەو جلەکانی لەبەرکرد)[٣١٩] (و هەستاو هەشت ڕکات سوننەتی چێشتەنگاوی کرد)[٣٢٠] (من نازانم ئایا وەستانەکەی)[٣٢١] درێژتربوو یاخود ڕکوعەکەی)[٣٢٢].

ئوم هانی دەڵێت: (من لەشەودا لەسەر جێی خەوتنەکەم بووم گوێم لەدەنگی قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ بوو لەنوێژەکەیدا لەلای کەعبە)[٣٢٣].

## موسوڵمانبوونی سەفوانی کوڕی ئومەییە

لەکاتی ئازادکردنی شاری مەککەدا هەندێك لە سەرکردەو فەرماندەکانی قوڕەیش ڕایان کردو هەڵاتن پاشان سەفوان و عەکریمە و ئیبنو زەعبەری گەڕانەوەو موسوڵمان بوون، هەواڵی موسوڵمان بوونی سەفوانی کوڕی ئومەییە بەدوو شێوە گێڕاویانەتەوە:

١- موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (سەفوانی کوڕی ئومەییە بەرەو دەریا هەڵات، وعومەیری کوڕی وەهەبی ئامۆزای هاتەلای پێغەمبەر ﷺ وداوای لێکرد سەفوان ببەخشێت وتی: ئەو بەرەو دەریا هەڵاتووەو من دەترسم خۆی لەناو ببات ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من بنێرە بەدوایداو بیبەخشە چونکە تۆ ئەمڕۆ هەموو

---

(٣١٧) أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٨٠٩٣)، وأحمد (٢٧٣٨٠) وقال محققوه: اسناده صحيح، والطبراني (الكبير) (١٠٣٩/٢٤).

(٣١٨) أخرجه: البخاري (٣٥٧، ٣١٧١)، ومسلم (٣٣٦).

(٣١٩) أخرجه: نفس المصدر.

(٣٢٠) أخرجه: أحمد (المسند) (٢٦٨٩٦) وقال محققوه: اسناده حسن، وابن حبان (٢٥٣٧)، والطبراني (١٠١٧/٢٤).

(٣٢١) أخرجه: مسلم (٨١)، والنسائي (الكبرى) (٤٨٥)، وأحمد (٢٦٨٩٩) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(٣٢٢) أخرجه: الترمذي (١٥٧٩)، والنسائي (الكبرى) (٨٦٨٤)، وأحمد (٢٦٨٩٢) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(٣٢٣) أخرجه: أحمد (٢٦٩٠٥،٢٦٨٩٤) وقال محققوه: اسناده صحيح، والطبراني (٩٩٩/٢٤)، والبيهقي (الدلائل) (٢٥٧/٦).

ڕەش و سپییەکت بەخشیوەو لێیان بووراویت.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((أَدْرِكِ ابْنَ عَمِّكَ فَهُوَ آمِنٌ)) واتە: ((بگەرە ئامۆزاکەت ودڵنیای بکە با بێ خەم بێت کەس نایکوژێت)). پاشان عومەیر بەدوای چوو تا پێی گەیشت وتی: پێغەمبەر ﷺ لێت بووراوە. بەڵام سەفوان لەهەواڵەکەم دڵنیا نەبوو بۆیە داوای کرد بەڵگەیەکی ناسراوی بۆ بهێنم لەسەر ڕاستی هەواڵەکە. منیش گەڕامەوە لای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەم پێ گەیاند، پێغەمبەریش ﷺ دەسماڵێکی ڕەشی خۆی پێدام و منیش بردم بۆلای سەفوان و ئەویش کەبینی ئینجا دڵنیاو ئارام بوو و لەگەڵ عومەیردا گەڕایەوە ناوشاری مەککەو چووە مزگەوتی حەرام بۆلای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئایا لەمن بووراویت وەك عومەیر دەڵێت؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) سەفوان وتی: ماوەی مانگێك ڕێگەم بدە تا بیری لێ بکەمەوە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بَلْ لَكَ شَهْرَانِ لَعَلَّ اللهَ أَنْ يَهْدِيَكَ))(٣٢٤) واتە: بەڵکو دوو مانگ مۆڵەت بێت بۆت بەڵکو خوا ڕێنموییت بکات.

ئیمامی زوهری ﵀ لەگێڕانەوەکەی خۆیدا بۆ ئەم باسە دەڵێت: (سەفوان ڕایکردو بەرەو دەریا چوو، پێغەمبەریش ﷺ عومەیری ئامۆزای بەدوادا نارد.... و داوای کرد پێی ڕابگەیەنێت کە موسوڵمان بێت و بگەڕێتەوە و گەر پێی خۆش بێت خۆی سەرپشك بێت لەموسوڵمان بوونیدا....

کاتێك سەفوان گەڕایەوە بەسەر ئەسپەکەیەوە هاواری کردو وتی: ئەی موحەممەد تۆ عومەیری کوڕی وەهەبت بۆلا ناردوم و پێی ڕاگەیاندم کە تۆ داوات کردووە من بگەڕێمەوەو خۆم سەرپشك بم یان تا دوو مانگ مۆڵەتم دەدەیت؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دابەزە ئەی کوڕەکەی وەهەب)). وتی: نا وەڵاهی دانابەزم تا بۆم ڕوون نەکەیتەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لَا، بَلْ لَكَ سَيْرُ أَرْبَعَةٍ...))(٣٢٥) واتە: ((بەڵکو تا چوار مانگ مۆڵەتت هەیە)).

٢- عوروەی کوڕی زوبەیر ﵁ دەڵێت: (سەفوان لەمەککە ڕایکردو خۆی گەیاندە

(٣٢٤) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤٦/٥) عن موسى بن عقبة (المغازي)(ص:٢٨١) (ص:٢٧٦). ومغازية من اصح المغازي عند اهل العلم.

(٣٢٥) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (١٢٦٤٦)، والبيهقي (الدلائل) (٩٧/٥).

بەندەری جدە تا لەوێدا سواری کەشتی ببێت و بەرەو وڵاتی یەمەن بڕوات. عومەیری ئامۆزای چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا سەفوانی کوڕی ئومەییە سەرکردەی خزمانی خۆیەتی و لەترسی تۆ ڕایکردووە تا خۆی بخاتە دەریاوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بێ ترس بێت و هیچی بەرانبەر ناکەین)) عومەیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نیشان و بەڵگەیەکم بدەرێ تا دڵنیا بێت. پێغەمبەریش ﷺ جەمەدانەکەی خۆی پێدا کە لەسەریابوو لەکاتی ئازادکردنی مەککە، عومەیر چوو وگەیشتەوە بەسەفوان ودەیویست سواری کەشتی بێت و پێی وت: سەفوان بەدایك و بابەوە فیدات بم تو خاتری خوا هیچ بەسەر خۆت نەهێنیت ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ لێت بووراوەو بێ خەمی کردوویت و ئەمەش جەمەدانەکەیەتی و بەڵگەی ڕاستی وتەکانمە، سەفوان وتی: هاوار بۆ تۆ لێم دووربکەوەو قسەم لەگەڵ مەکە. عومەیر وتی: سەفوان بەدایك وبابەوە فیدات بم ئەو چاکترین و هێمنترین و بەوەفاترین کەسەو ئامۆزای خۆتە سەربەرز و پایەدار و دەسەڵاتداری تۆیە. وتی: دەترسم شتێکم لێ بکات. عومەیر وتی: نا ئەو زۆر لەوە متمانە پێ کراو ڕێزدارترە. سەفوان لەگەڵی گەڕایەوەو تا چووە بەردەم پێغەمبەر ﷺ و سەفوان وتی: عومەیر دەڵێت تۆ لەمن بوراویت و بێ خەمت کردووم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( ڕاستی کردووە)). سەفوان وتی: دوو مانگ مۆڵەتم بدەرێ. فەرمووی: ((أَنْتَ بِالْخِيَارِ فِيهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ))[٣٢٦] واتە: ((خۆت سەرپشك بە تا چوار مانگی تر)). بەم جۆرە سەفوان موسوڵمان بوو وە گەڕایەوە ناو ماڵ و خێزانی و لەیەکێك لەڕۆژەکانی دواییدا دیارییەکی نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ.

کلدەی کوڕی حەنبەل ﷺ کە زڕبرای سەفوانە دەڵێت: (سەفوان لەڕۆژانی ئازادبوونی شاری مەککەدا دیارییەکی بەمندا نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ کە بریتی بوو لە فرۆ وچتیرێك و هەندێك ترۆزی منیش بردمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و چوومە ژوورەوە بۆلای، من ئەوکات هێشتا موسوڵمان نەبوو بووم و سەلامم نەکردو ئیزنم وەرنەگرت، پێغەمبەر ﷺ بەمنی وت: ((ارْجِعْ فَقُلْ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَأَدْخُلُ)) واتە: بگەڕێرەوە دەرەوەو بڵێ: (السّلامُ عَليكُمْ) ئایا بێمە ژوورەوە، منیش ئەوکارەم جێبەجێ

(٣٢٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣٢/٤) رقم ٩٤٣ مرسلًا وأورده ابن كثير (البداية) (٣٥٢/٤) عن عروة عن عائشة ﵄ موصولاً.

کرد ئەمەش لەدوای موسوڵمان بوونی سەفوان بوو[٣٢٧]. لەڕۆژێکی تردا سەفوان سەردانی پێغەمبەری ﷺ کردو دزێکی گرت بوو کە ویستبووی عەبایەکەی بدزێت.

سەفوانی کوڕی ئومەیە ﷺ دەفەرمویت: (من ئەم وتەیەم لەدەمی خەڵکی دەبیست کە دەیان وت: ئەوەی کۆچی نەکردبێت ناچێتە بەهەشتەوە، منیش وتم ناگەڕێمەوە ماڵەوە هەتا نەچم ئەو پرسیارە لەپێغەمبەر ﷺ نەکەم، ئەوەبوو من چوومە خزمەتی وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان دەڵێن: کەسێك لەبەرخوا کۆچی نەکردبێت ناچێتە بەهەشتەوە ئایا ئەوە ڕاستە؟

فەرمووی: ((كَلَّا أَبَا وَهْبٍ، فَارْجِعْ إِلَى أَبَاطِحِ مَكَّةَ)[٣٢٨] لَا هِجْرَةَ بَعْدَ فَتْحِ مَكَّةَ وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا)) واتە: ((نەخێر باوکی وەهەب بگەڕێرەوە ناو شاری مەککە) وهیجرەت و کۆچ کردن بۆ شاری مەککە لەدوای ئازادکردنی کۆتایی پێ هاتووە، بەڵام فەرمبووی بەنیەتپاکی و تێکۆشان لەپێناوی خوادا دەبێت، هەر کاتێکیش بانگێشت کران بۆ جیهادو تێکۆشان بڕۆن).

سەفوان دەڵێت: من پێشتر کاتێك لەمزگەوتی حەرامدا پاڵ کەوتبووم و عەبایەکی خەت خەتم بەخۆما دابوو[٣٢٩] دزێك هات و سەری عەبایەکەی کە لەژێر سەرمدا بوو ڕایکێشاو عەباکەی دزیم و منیش دوای کەوتم و دەستگیرم کردو هێنامە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتم[٣٣٠]: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم پیاوە عەبایەکەی دزیم، ئەویش فەرمانی دا بیبەن و دەستی ببڕن، منیش وتم: (ئایا ئەوە لەبەر عەبایەك کەنرخی سی درهەمە)[٣٣١] (من ئەوەم نەویست، عەباکەم بەخشییە ئەو)[٣٣٢] ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوا کردمە دیاری بۆ ئەو. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فهَلاّ قبل ان تأتيني به))[٣٣٣] واتە: ((ئەی ئەو کارەت بۆنەکرد لەپێش ئەوەی بیگەیەنیتە لای من)).

---

(٣٢٧) أخرجه: البخاري (الادب المفرد) (١٠٨١)، وابوداود (٥١٧٦)، والترمذي (٢٧١٠)، والنسائي (الكبرى) (٦٧٣٥)، وأحمد (١٥٤٢٥) وقال محققوه: اسناده صحيح، وابن السني (عمل اليوم الليلة) (٦٦٤) وقال محققه صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الادب المفرد) (٨٢٥)، و (صحيح ابي داود) (٤٣١١).

(٣٢٨) أخرجه: أحمد (١٥٣٠٣) وقال محققوه: حديث صحيح بطرقه.

(٣٢٩) أخرجه: أحمد (١٥٣٠٩) وقال محققوه: حديث صحيح بطرقه.

(٣٣٠) أخرجه: أحمد (١٥٣٠٣) وقال محققوه: حديث صحيح بطريقه.

(٣٣١) أخرجه: أحمد (١٥٣٠٩).

(٣٣٢) أخرجه: أحمد (١٥٣٠٣)، وعبدالرزاق (١٢٦٤٧)، والطماوي (١٤٩/٢)، وقال الحافظ (بلوغ المرام) (٩٤٥): مرسل صحيح الاسناد.

(٣٣٣) أخرجه: أحمد (٢٧٦٤٠، ١٥٣٠٦) وقال محققوه: حديث صحيح بطرقه، والنسائي (١٤٦/٧)، والبيهقي (٢٦٥/٨).

## موسوڵمانبوونی عەکریمەی کوڕی ئەبوجەهل

عەکریمە یەکێك بوو لەوانەی کەفەرمانی کوشتنی درابوو، لەدوای ئازادبوونی شاری مەککە هەڵات بەرەو دەریا و ڕۆیشت تا بەرەو یەمەن بڕوات. ئوم حەکیمی هاوسەری هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و متمانەی پێ بەخشی تا بگەڕێتەوە شاری مەککە، پاشان ئوم حەکیم ڕۆیشت و عەکریمەی هێنایەوەو موسوڵمان بوو.

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (ئوم حەکیمی کچی حاریس موسوڵمان بوو لەکاتی ئازادکردنی شاری مەککەداو عەکریمەی مێردی هەڵات)[٣٣٤] (بەرەو یەمەن)[٣٣٥] ئەویش هاتەلای پێغەمبەر ﷺ و ڕێگەی دا بچێت بەدوای مێردەکەیداو دڵنیای بکاتەوە کەهیچی بەرانبەر ناکرێت، ئوم حەکیم مەککەی بەجێهێشت بەیاوەری بەندەیەکی ڕۆمانی خۆی (ئەو ڕۆمانییەش لەڕێگا دەیویست دەست درێژی بکاتە سەر) بەڵام ئوم حەکیم هەر دەیخلافاندو بەڵێنی پێ دەدا تا لەڕێگادا خۆی گەیاندە خەڵکێکی هۆزی عوك و داوای فریاکەوتنی لێکردن و ئەوانیش بەندەکەیان قۆڵ بەست کرد (عەکریمەش سواری کەشتی ببوو لەدەریادا زریان هەڵی کرد بوو لێیان و هاواری لەلات و عوزای دەکرد، خاوەنی کەشتییەکە وتی: تەنها داوا لەخوا بکەن چونکە بتەکانتان لێرە هیچ سودێکی بۆ ئێوە نابێت (لێرە دروست نییە داوا لەکەس بکەن تەنها لەخوای گەورە نەبێت) عەکریمەش وتی: سوێند بەخوا گەر هەر خودا ڕزگارم بکات لەم دەریایە تەنها هەر ئەویش دەتوانێت ڕزگارم بکات لە وشکانی، کەواتە خوایە بەڵێنت پێ دەدەم گەر بە سەلامەتی لەم کارەساتە ڕزگارم بکەیت دەگەڕێمەوە بۆلای موحەممەد و دەست دەخەمە ناو دەستی، دەزانم کە ئەو بەڕێزو لێبوردەیە)[٣٣٦] (ئوم حەکیمیش بەڕێ کەوت تا گەیشتە یەمەن و دۆزییەوەو بانگی کرد بۆ ئیسلام و موسوڵمان بوو)[٣٣٧] دواتر (عەکریمە لەگەڵ هاوسەرەکەی گەڕانەوە

(٣٣٤) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (١٢٦٤٦)، والبيهقي (الدلائل) (٩٧/٥) عن الزهري.

(٣٣٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٧/(١٠٢٠))، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٢٤٥) مرسل وفيه ابن لهيعة.

(٣٣٦) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٦٨) وقال محققه: اسناده حسن، وابوداود (٢٦٨٣) والنسائي (الكبرى) (٣٥١٦) وفي (الصغرى) (١٠٥/٧)، والبزار (١٨٢١)، وابويعلى (٧٥٧)، والبيهقي (الدلائل) (٥٩/٥) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٣٣٤) و (صحيح النسائي) (٣٩١).

(٣٣٧) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (١٢٦٤٦)، والبيهقي (الدلائل) (٩٧/٥).

لای پێغەمبەر ﷺ) (کاتێکیش بەدەرکەوتن پێغەمبەر ﷺ بەبێ ئەوەی عەباکەی لەبەربکات خێرا هەستاو چوو بۆلای و بەڵێنی موسوڵمان بوونی لێ وەرگرت)[٣٣٨].

(عەکریمە دەڵێت: کاتێك گەیشتمە لای پێغەمبەر ﷺ وتم: ئەی موحەممەد ئوم حەکیمی هاوسەرم پێی ڕاگەیاندم کەدڵنیات کردووم؟ فەرمووی: ((أَنْتَ آمِنٌ)) واتە: ((تۆ دڵنیاو بێ خەم بە)) وتم: شایەتی ئەدەم تەنها هەر (الله) خودایەو تاك وتەنهایەو هاوەڵی نییەو تۆش بەندەی خواو پێغەمبەری خوایت وە تۆ چاکترین و ڕاستگۆترین و بەوەفاترینی خەڵکیت.

عەکریمە دەڵێت: کاتێك من ئەو وتانەم دەوت سەرم شۆڕکرد بوو ئەوەندە شەرمم لێ دەکرد پاشان وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆش بوونت لێدەکەم لەهەموو کارێکی دوژمن کارانە کە بەرانبەر بەتۆ ئەنجامم داوە یاخود لەهەر کۆڕێکدا بەشداریم کردبێت بۆ سەرخستنی ئاینی هاوتا بۆخوا دانەران.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( قُلْ: أَشْهَدُ أَنَّ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَتُجَاهِدُ فِي سَبِيلِهِ)) واتە: ((خوایە لەعەکریمە خۆشبە سەبارەت بەهەر دوژمنکارییەك بەرانبەرم ئەنجامی داوە یاخود بەشداری لەهەر کۆڕێکدا کردبێت بۆ ئەوەی ڕێگە بەدینی تۆ بگرێت و خەڵکی لێ دووربخاتەوە)).

وتم: ئەی پێغەمبەری خوا فەرمانم پێ بکە بەچاکە فێرم بکە. فەرموی: (( قُلْ: أَشْهَدُ أَنَّ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَتُجَاهِدُ فِي سَبِيلِهِ)) واتە: بڵێ شایەتی ئەدەم کە خودا تاك و تەنهایە و هیچ هاوەڵێکی نییە، وە موحەممەد بەندەو نێردراوی خوایە وە تێبکۆشە لە پێناوی خودا دا. پاشان عەکریمە وتی: بەڵام سوێند بەخوا لێرە بەدواوە ئەی پێغەمبەری خوا هەر خەرجییەکم بەکارهێنابێت بۆ ڕێگرتن لەئاینی خوا دەبێت دووهێندە زیاتر لەوە خەرج بکەم لەپێناوی خوادا، چەندە جەنگابم بۆ ڕێگرتن لەئاینی خوا دەبێت دوو هێندە بجەنگم لەپێناوی خوادا....)[٣٣٩].

---

(٣٣٨) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤٧/٥، ٩٨) عن موسى بن عقبة ﷺ.

(٣٣٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٧/(١٠٢١،١٠١٩))، والحاكم (المستدرك) (٢٤١/٣) رقم (٥١٠٥) وقال محققه: مرسل صحيح، وموسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٨١).

لەپێش هاتنی عەکریمە و موسوڵمان بوونی پێغەمبەر ﷺ خەوێکی بینی:

دایکی بڕواداران عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لەخەودا بینیم ئەبوجەهل هات و بەڵێنی موسوڵمان بوونی پێدام))، کاتێك خالید موسوڵمان بوو. وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەوە هاتەدی) (خوای گەورە خەوەکەی بەڕاستی بۆ هێنایەدی ئەوەتا خالیدی کوڕی وەلیدی ئامۆزای ئەبوجەهل موسوڵمان بوو) فەرمووی: نا موسوڵمان بوونی کەسێکی ترە). تا عەکریمە موسوڵمان بوو ئینجا فەرمووی: ((خەوەکە موسوڵمان بوونی عەکریمە بوو))[٣٤٠] (عەکریمە لەشاری مەدینەدا هاتوچۆی بکردایە پێی دەوترا: ئەوە کوڕی دوژمنەکەی خوایە ئەبوجەهل، پێغەمبەریش ﷺ وتاری بۆ موسوڵمانان داو فەرمووی: ((إِنَّ النَّاسَ مَعَادِنُ، خِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الْإِسْلَامِ إِذَا فَقِهُوا))[٣٤١] ((لَا تُؤْذُوا مُسْلِمًا بِشَتْمِ كَافِرٍ))[٣٤٢]. واتە: خەڵکی ناخیان گرنگە چاکترینیان لەنەفامیدا چاکترینیانە گەر لە ئیسلام تێبگات و بەجنێودان بەبێ بڕوایەك موسوڵمانێك ئازار مەدەن)).

## موسوڵمانبوونی سوهەیل و ئیبنو زەعبەری

لەدوای ئازادکردنی مەککە سوهەیل خۆی لەماڵەکەیدا شاردەوەو پاشان عەبدوڵڵای کوڕی متمانەی بۆ وەرگرت و پێغەمبەر ﷺ لێی بورا:

بەسەرهاتی موسوڵمان بوونەکەی لەچەندەها ڕێگەی (لاوازەوە) گێڕدراوەتەوە لەوانە: جابر رضي الله عنه دەفەرموێت: (....سوهەیل دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ هاتە ناو شاری مەککەوە گەڕامەوە ماڵی خۆم و دەرگام لەسەرخۆم داخست و کەسێکم ناردە لای عەبدوڵڵای کوڕم تا پەنادانێکم لەپێغەمبەر ﷺ بۆ وەرگرێت چونکە من دەترسم بکوژرێم، عەبدوڵڵاش چوو بوو بە پێغەمبەری ﷺ وتبوو ئەی پێغەمبەری خوا باوکم دەیەوێت پەنای بدەیت و دڵنیای بکەیت؟ فەرمووی: ((نَعَمْ هُوَ آمَنٌ بِأَمَانِ اللَّهِ فَلْيَظْهَرْ))

---

(٣٤٠) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٢٠٣٦٥)، والحاكم (٢٤٢/٣) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي وقال محققه (٥١٠٨): صحيح موصولاً.

(٣٤١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٦٧٣/٢٣)، والحاكم (٢٤٢/٣) وصححه وقال الذهبي: فيه ضعيفان وموسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٨٠) والحديث له شواهد.

(٣٤٢) أخرجه: البيهقي (الكبرى) (٧٥/٤) وفي (شعب الايمان) رقم (٦٢٥٣) وقال محققه: رجاله موثقون، وصححه الشيخ الالباني في: (صحيح الجامع) (٧١٩١).

واتە: بەڵێ باشە ئێمە بەپەنای خوا پەنای دەدەین با خۆی دەربخات و نەترسێت.

پاشان بەهاوەڵانی فەرموو: ((مَنْ لَقِيَ سُهَيْلَ بْنَ عَمْرٍو فَلَا يَشُدَّ إِلَيْهِ، فَلَعَمْرِي إِنَّ سُهَيْلًا لَهُ عَقْلٌ وَشَرَفٌ، وَمَا مِثْلُ سُهَيْلٍ جَهِلَ الْإِسْلَامَ)) واتە: ((هەر کەسێك لەئێوە گەر سوهەیلی کوڕی عەمری بینی با چاوی لێ تیژ نەکاتەوە چونکە سوێند بێت سوهەیل گەورە و ژیرە و کەسێکی وەك ئەو ڕاستی ئیسلامی لێ ون نییە)).

عەبدوڵای کوڕی سوهەیل چوو هەواڵەکەی گەیاندە باوکی و سوهەیل وتی: سوێند بەخوا ئەو لەمنداڵی و گەورەییدا هەر چاکەکارو بەوەفا بووە. دواتر سوهەیل دەهات و دەچوو هێشتا دەترسا وەهێشتا هاوتا بۆخوا دانەربوو تا لەناوچەی جوعرانە موسوڵمان بوو)[٣٤٣].

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ﷺ دەڵێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ هاتە ناو شاری مەککە هوبەیرەی کوڕی ئەبو وەهەب و عەبدوڵای کوڕی زەعبەری هەڵاتن و چوونە ناوچەی نەجرانی یەمەن. هوبەیرە لەوێ مایەوە تا لەسەر هاوتا بۆ خوا دانانی خۆی لەناوچوو، بەڵام ئیبنو زەعبەری دواتر گەڕایەوە لای پێغەمبەر ﷺ و چەندەها دێڕ شیعری سەبارەت بەموسوڵمان بوونی خوێندەوەو داوای لێبووردنی کرد....)[٣٤٤].

## موسوڵمانبوونی حووەیتبی کوڕی عەبدعوزا

موسای کوڕی عوقبە لەمونزیری کوڕی جەهمەوە ﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: حووەیتیب دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ هاتە ناو شاری مەککەوە یەکجار ترسام و ماڵەکەم چۆڵکرد و خانەوادەکەم لەچەندەها شوێنی تر بڵاوە پێکرد کەئەوان جێی متمانەی من بوون، خۆم چوومە لای دیوارەکەی ماڵی عەوف، لەناکاو ئەبو زەڕم بینی کە پێشتر خۆشەویستییەکی تەواو لەنێوانماندا هەبوو، ئەوەش وایکرد کە زیان بەیەکتر نەگەیەنین هەرگیز.

کاتێك ئەوم بینی ڕامکرد بانگی لێکردم وتی: باوکی موحەممەد؟ وتم: بەڵێ ئەوا هاتم وتی: ئەوە بۆ ڕا دەکەیت؟ وتم: لەترساندا. وتی: هیچ ترسێکت لەسەر نییەو

---

(٣٤٣) أخرجه: الحاكم (٢٨٠/٣) عن الواقدي (المغازي) (٨٤٦/٢) وهو متروك واورده: البخاري (التاريخ الكبير) (١٠٣/٤).

(٣٤٤) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣٤/٤)، والبيهقي (الدلائل) (٩٩/٥).

تۆ بە پەنای خوا پەنا دراویت. منیش گەڕامەوە لای و سڵاوم لێکرد و وتی: بگەڕێوە ماڵەکەی خۆت. وتم: جا ڕێگەیەك هەیە من بێ ترس پیایدا بگەڕێمەوە ماڵەکەی خۆم؟ سوێند بەخوا من وا نابینم بەزیندوویی بگەمەوە ماڵەکەی خۆم یان ئەوەتا پیاوێکم پێ دەگات دەمکوژێت یان، دێتە ناو ماڵەکەم و دەمکوژێت، خانەوادەکەم لەچەندەها جێگەی جیاواز داناوەو بڵاوەم پێکردووە. ئەبو زەڕ وتی: بڕۆ خۆت و خانەوادەکەت لەجێگەیەك کۆببنەوەو من لەگەڵتدا دەگەڕێمەوە تا ماڵەکەت. ئەبو زەڕ بەوجۆرە لەگەڵم گەڕایەوە تا ماڵەکەم و دەیوت: حوومیتیب متمانەی پێدراوە و کەس هێرشی نەکاتە سەر. پاشان چوومەوە لای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەی پێدا.

ئینجا منیش هەموو خانەوادەکەم گەڕاندەوە ماڵەوەو دواتر ئەبو زەڕ هات بۆلام وتی: هەتا کەی باوکی موحەممەد تۆ هەر دوا دەکەویت و خەڵکی تر پێشت دەکەون لەهەموو چاکەیەکدا، پەلە بکە هێشتا خێری زۆر ماوە لەدەستی نەدەیت، بڕۆ لای پێغەمبەر ﷺ موسوڵمان ببە با سەلامەت بیت، پێغەمبەری خوا ﷺ چاکترین و بەوەفاترین و چاو لێپۆشترینی خەڵکییەو سەربەرزی و شکۆمەندی ئەو سەربەرزی و شکۆمەندی تۆیە. حومیتیب وتی: ئەوا من لەگەڵ تۆ دێم، ئینجا هەردووکیان چوونە لای پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا ئەبوبەکرو عومەری لەلا بوو، حومیتیب دەڵێت: لەلای سەری پێغەمبەر ﷺ وەستام و بە ئەبو زەڕم وت: چی دەوترێت گەر سەلامی لێ بکەیت؟ وتی: بڵێ: (السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ) ئینجا منیش وتم. پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی دامەوەو فەرمووی: ((وە عەلەیکە سەلام حومیتیب)).

منیش وتم: شایەتی ئەدەم کە هیچ خوایەك نییە تەنها (الله) نەبێت وە تۆش پێغەمبەری خوایت. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَاكَ)) سوپاس بۆ ئەو خودایەی کەهیدایەتی دایت)). وە زۆر دڵخۆش بوو بە موسوڵمان بوونم)[٣٤٥].

(٣٤٥) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٨٢).

## خەڵکی مەککە بەڵێن دەدەنە پێغەمبەر ﷺ

ئەسوەدی کوڕی خەلەف دەڵێت: (لەڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا پێغەمبەرم ﷺ بینی لای بەرزایی مەسفەلەی نزیك خانووەکانی سومامەو چواردەوری و نزیك خانووەکەی سەمورە دانیشتبوو، وە خەڵکی تێکڕا بەگەورەو بچووك و پیاوان و ئافرەتانەوە دەهاتنە خزمەتی و شایەتمانیان دەهێناو موسوڵمان دەبوون...)[٣٤٦].

موجاشیعی کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێت: (لە ئازادکردنی شاری مەککەدا موجالیدی برامم بردە لای پێغەمبەر ﷺ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا براکەم هێناوەتە لات تا بەڵێنی کۆچ کردنی لێ وەرگریت؟ فەرمووی: ((ذَهَبَ أَهْلُ الْهِجْرَةِ بِمَا فِيهَا (لاهِجْرَةَ بَعْدَ الفتحِ))[٣٤٧] واتە: کۆچکاران بە پاداشتی خۆیانەوە ڕۆیشتن کۆچ کردن نەما لە مەککە لە دوای ئازاد کردنی. وتم: ئەی بەڵێنی لەسەر چی لێ وەردەگیرێت؟ فەرمووی: ((أُبَايِعُهُ عَلَى الْإِيمَانِ وَالْإِسْلَامِ وَالْجِهَادِ)[٣٤٨]. واتە: بەڵێنی لێ وەردەگرم لەسەر ئیسلام و ئیمان و تێکۆشان.

عائیشەی کچی قودامە ﷺ دەڵێت: (من لەگەڵ دایکم بووم کەناوی رائیتەی کچی سوفیانی خوزاعیە، تەماشامان کرد پێغەمبەر ﷺ بەڵێن لەئافرەتان وەردەگرێت و پێیان دەفەرموێت: ((أُبَايِعُكُنَّ عَلَى أَنْ لَا تُشْرِكْنَ بِاللهِ شَيْئًا، وَلَا تَسْرِقْنَ، وَلَا تَزْنِينَ، وَلَا تَقْتُلْنَ أَوْلَادَكُنَّ، وَلَا تَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ تَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُنَّ وَأَرْجُلِكُنَّ، وَلَا تَعْصِينَ فِي مَعْرُوفٍ)) واتە: ((بەڵێنتان لێ وەردەگرم لەسەر ئەوەی هاوتا بۆ خودا دانەنێن و دزی نەکەن و زینا نەکەن و منداڵەکانتان نەکوژن و بوختان نەکەن.... هەروەها سەرپێچی نەکەن لەئەنجامدانی کاری چاکەدا)) هەموو سەریان داخست بوو پاشان پێی فەرموون: (قُلْنَ: نَعَمْ فِيمَا اسْتَطَعْتُنَّ (وَأَطَقْتُنَّ)) واتە: ((بڵێن: بەڵێ جێبەجێی دەکەین بەگوێرەی توانامان)).

ئێمەش وتمان: خواو پێغەمبەرەکەی بەبەزەیی ترن بۆمان لەخودی خۆمان

(٣٤٦) أخرجه: عبدالرزاق (٩٨٢٠)، وأحمد (١٥٤٣١) وقال محققوه: اسناده يحتمل التحسين، والطبراني (الكبير) (٨١٥) في (الاوسط) (٢٤١٨)، والحاكم (٢٩٦/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٩٤/٥) وقال الشيخ الالباني (فقه السيرة) (ص:٤١٩): حديث حسن، واللفظ لبيهقي والزيادة لعبدالرزاق والحاكم.

(٣٤٧) أخرجه: البخاري (٣٠٧٨).

(٣٤٨) أخرجه: البخاري (٤٣٠٥،٤٣٠٨)، ومسلم (١٨٦٣)، وأحمد (٣٦٨/٣).

با بەڵێنت بدەینێ ئەی پێغەمبەری خوا)[٣٤٩] (ئایا تەوقەمان لەگەڵ ناکەیت)[٣٥٠] فەرمووی: ((إِنِّي لَا أُصَافِحُ النِّسَاءَ (اذْهَبْنَ، فَقَدْ بَايَعْتُكُنَّ)[٣٥١] (إِنَّمَا وَقَوْلِي لِامْرَأَةٍ وَاحِدَةٍ كَقَوْلِي لِمِائَةِ امْرَأَةٍ)) واتە: ((من تەوقە لەگەڵ ئافرەتان ناکەم (بڕۆن ئەوا بەڵێنم لێ وەرگرتن) (وتەی من بۆ یەك ئافرەت وەك وتەی منە بۆ سەد ئافرەت)[٣٥٢].

ئینجا ئافرەتان ئەوانەیان دووبارەکردەوە و منیش دایکم پێی دەوتم: کچی خۆم بڵێ: بەڵێ باش بەگوێرەی توانامان (ئیتر منیش ئەوەم دەوت کەئەوان دەیان وتەوە)[٣٥٣].

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لەئازادکردنی شاری مەککەدا دەیفەرموو: ((لَا هِجْرَةَ بَعْدَ الْفَتْحِ ، وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا))[٣٥٤] واتە: ((کۆچ کردن لە شاری مەککە کۆتایی پێهات لەدوای ئازادکردنی، بەڵام تێکۆشان و نیەتپاکی ماوە و گەر داوای بەشداری سوپاتان لێکرا بەدەم ئەو داواکارییەوە بچن)).

موسای کوڕی عوقبە لەئەبو حەبیبەوە ئەویش لەعەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: (کاتێك مەککە ئازادکرا هیندی کچی عوتبە موسوڵمان بوو وە ئوم حەکیمی کچی حاریس موسوڵمان بوو وە هاوسەرەکەی سەفوانی کوڕی ئومەیە موسوڵمان بوو کەناوی (بەغومی کچی موعەزیل) بوو، وە فاتمەی کچی وەلیدی کوڕی موغیرە، وەهیندی کچی مونەبیهی کچی حەجاج کەدایکی عەبدوڵڵای کوڕی عاسە، لەگەڵ دە ئافرەتی تری قورەیش هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەناوچەی (ئەبتەح) و بەڵێنیان پێدا، لەو کاتەدا یەکێك لەهاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ و فاتیمەی کچی لەگەڵ هەندێك ئافرەتانی بەنی عەبدولموتەلیب لەوێ بوون، هیندی کچی عوتبە قسەی کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوپاس بۆ خوا کە ئەو ئاینەی سەرخست کەبۆ خۆی هەڵیبژاردبوو تۆش بەزەییت هەبێت بۆ من چونکە من

---

(٣٤٩) أخرجه: أحمد (٢٧٠٠٩) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(٣٥٠) أخرجه: أحمد (٢٧٠٠٨) وقال محققوه: اسناده صحيح، والنسائي (الكبرى) (٨٧١٣)، وابن حبان (٤٥٥٣)، والطبراني (الكبير) (٤٧١/٢٤).

(٣٥١) أخرجه: أحمد (٢٧٠٠٧) وقال محققوه: اسناده حسن.

(٣٥٢) أخرجه: أحمد (٢٧٠٠٩) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(٣٥٣) أخرجه: نفس المصدر السابق.

(٣٥٤) أخرجه: البخاري (٣٠٧٧)، ومسلم (١٣٥٣،٤٤٥)، وابوداود (٢٤٨٠)، والنسائي (٧٧٩٣).

ئافرەتێکم بڕوام بەخوا هەیەو بەڕاستی دەزانم. پاشان پەچەکەی لابردو وتی: من هیندی کچی عوتبەم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((پێشوازیت لێ بێت)) هیند وتی: وەڵاهی ئەی پێغەمبەری خودا هیچ بنەماڵەو خانەوادەیەکی ئەم سەر زەوییە نەبووە کە من پێم خۆش بێت خوای گەورە (سەرشۆڕیان بکات)[٣٥٥] وەك بنەماڵەی تۆ، بەڵام ئێستا لەسەر زەویدا هیچ خانەوادەو بنەماڵەیەك نییە لای من خۆشەویستتر بێت کەخوا (سەربەرزیان بکات) وەك بنەماڵەکەی تۆ.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((وَأَيْضًا، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ))[٣٥٦] واتە: ((چی تر دەڵێیت ڕاستە سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە)) پاشان پێغەمبەر ﷺ قورئانی بۆ خوێندنەوەو پەیمان و بەڵێنی لێ وەرگرتن[٣٥٧].

ئیمامی شەعبی ﷺ دەڵێت: (هیند هات و بەڵێنیدا تا گەیشتە ئەو مەرجە: وە نابێت دزی بکەن[٣٥٨]. هیند وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوسوفیان پیاوێکی چروکەو ئەوەندە (خەرجی)[٣٥٩] نادات بەمن کە بەشی خۆم و (منداڵەکانم بکات) مەگەر لەگەڵ ئەوانەی کە لێی دەبەم و ئەو نازانێت ئینجا بەشم دەکات (ئایا من گوناهبار دەبم گەر لەسامانەکەی ببەم بەنهێنی))[٣٦٠]. پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((أَنْفِقِي عَلَى عِيَالِهِ مِنْ مَالِهِ بِغَيْرِ إِذْنِهِ، لَا حَرَجَ عَلَيْكِ))[٣٦١]. واتە: لەسامانەکەی خەرج بکە بۆ منداڵەکانی بەبێ ڕەزامەندی ئەو هیچ کێشەیەك نابێت لەسەرت. ((خُذِي مِنْ مَالِهِ بِالْمَعْرُوفِ مَا يَكْفِيكِ وَيَكْفِي بَنِيكِ))[٣٦٢] واتە: لەسامانەکەی ببە بەگوێرەی ئەوەندەی بەشی خۆت و منداڵەکانت بکات.....)[٣٦٣].

---

(٣٥٥) أخرجه: مسلم (٤٤٥٤) (١٧١٤) بترقيمين مختلفين.

(٣٥٦) أخرجه: البخاري (٦٦٤١).

(٣٥٧) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٧٨).

(٣٥٨) أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٩٦،٢٣٧/٨) وسنده صحيح مرسل كما قال الحافظ في (الاصابة) (٣٨٤/٨) برقم (١١٨٦٠) وقال في (الفتح) (٦٣٧/٩) رجاله رجال الصحيح.

(٣٥٩) أخرجه: مسلم (٤٤٥٢،١٧١٤).

(٣٦٠) أخرجه: البخاري (٢٢١١).

(٣٦١) أخرجه: مسلم (٤٤٥٤) ورقم (١٧١٤).

(٣٦٢) أخرجه: مسلم (٤٤٥٢) ورقم (١٧١٤).

(٣٦٣) أخرجه: البخاري (٥٣٦٤)، ومسلم (١٧١٤).

(وەلەبەڵێن و پەیمانەکەدا کاتێك وترا: (وَلَايَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ) (هیند وتی: ئێمە بەمنداڵی پەروەردەمان کردوون وە بەگەورەیی تۆ ئەوانت کوشت)[٣٦٤] وکاتێك وترا: (ولایزنین) واتە: نابێت زینا بکەن (هیند دەستی لەسەرسەری دانا لەشەرمدا)[٣٦٥] و وتی: ئایا ئافرەتی ئازاد زینا دەکات؟ پێغەمبەر ﷺ سەرسام بوو لەو هەڵوێستانەی کە لەهیندی بینی. عائیشە رضي الله عنها فەرمووی: پەیمان و بەڵێن لەسەر ئەوانە بدە ژنەکە، سوێند بەخوا ئێمەش ئاوها پەیمان و بەڵێنمان لێ وەرگیراوە. ئەویش وتی: باشە منیش بەڵێن ئەدەم لەسەر ئەوانەی لەبەڵێنەکەدا هاتووە)[٣٦٦].

لەگێڕانەوەیەکی تردا: (فاتیمەی کچی عوتبە رضي الله عنها دەڵێت: ئەبوحوزەیفە کوڕی عوتبە فاتیمەو هیندی خوشکی هێنا بۆلای پێغەمبەر ﷺ تا بەڵێن و پەیمانیان لێ وەربگرێت، پێغەمبەر ﷺ بەڵێنی لەسەر هەندێك شت لێ وەرگرتین منیش وتم: ئەرێ شتی وەها ڕوویداوە لەناو خزماندا؟ ئەبوحوزەیفە وتی: ئەی هاوار تۆ بەڵێنی بدەرێ چونکە ئەو هەر لەسەر ئەو شتانە بەڵێن وەردەگرێت و ئەو مەرجانەی هەیە. هیند لەوێدا وتی: سەبارەت بەدزی کردن من بەڵێنت نادەمێ چونکە من سامانی مێردەکەم دەدزم، و دەستی کێشایەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ناردی بەدوای ئەبوسوفیاندا تا گەردنی ئازاد بکات، ئەبوسوفیان وتی: خواردنی تەڕە ڕێگەت پێ دراوە بەڵام وشکە ڕێگەت پێ نەدراوە هەرگیز، پاشان بەڵێنیان پێداو فاتیمە وتی: هیچ دەوارێك نەبووە بوغزاوتر بێت لای من وەك دەوارەکەی تۆ بەڵام ئێستا سوێند بەخوا هیچ دەوارێك نییە من پێم خۆش بێت خوا ئاوەدانی بکات و بەرەکەتی تێ بکات وەك دەوارەکەی تۆ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((وأَيْضاً والله لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ، حتَّى أكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِن والِدِهِ ووَلَدِهِ ))[٣٦٧]. واتە: لەگەڵ ئەوشدا وەڵاهی یەکێك لەئێوە بڕوای نییە هەتا منی خۆشترنەوێت لەمنداڵەکەی و لەباوکی خۆی)).

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص رضي الله عنه دەفەرموێت: (......عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو سەرح لای

(٣٦٤) أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٩٦/٨، ٢٣٧)) وسنده صحيح مرسل كما قال الحافظ (الاصابة) رقم (١١٨٦٠).

(٣٦٥) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٩٨٢٧).

(٣٦٦) أخرجه: نفس المصدر السابق.

(٣٦٧) أخرجه: الحاكم (٤٨٦/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والطبراني (الكبير) (٩٠٤/٢٤) مختصراً، وقال الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (٦٦/٢) تحت الحديث رقم (٥٢٩): اسناده حسن.

عوسمانی کوڕی عەففان خۆی شاردەوە چونکە برای شیریی بوو، کاتێك پێغەمبەر ﷺ خەڵکی بانگ کرد تا پەیمان و بەڵێنی بدەنێ، عوسمان هات و عەبدوڵلای لەگەڵ خۆی هێنا تا بردیە بەردەم پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەڵێن و پەیمان لەعەبدوڵلا وەربگرە. پێغەمبەریش ﷺ سەری بەرزکردەوە سێ جارو بەڵێنی لێ وەرنەگرت، پاشان بەڵێنی لێ وەرگرت بە (پەنجەکانی)[٣٦٨]، دواتر پێغەمبەر ﷺ ڕووی کردە هاوەڵانی و فەرمووی: ((أَمَا كَانَ فِيكُمْ رَجُلٌ رَشِيدٌ يَقُومُ إِلَى هَذَا حَيْثُ رَآنِي كَفَفْتُ يَدِي عَنْ بَيْعَتِهِ فَيَقْتُلُهُ؟)) واتە: ئایا پیاوێکی لێزانتان تیانەبوو بیکوژێت کاتێك منی بینی ڕازی نەبووم بەڵێنی لێ وەرگرم. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا جا ئێمە چۆن بزانین چی لەدەروونتدا هەیە ئەی بۆ بەچاوت ئاماژەیەکت بۆ نەکردین؟! فەرمووی: ((إِنَّهُ لا يَنْبَغِي لِنَبِيّ أَنْ تَكُونَ لَهُ خائِنَةَ الأَعْيُنِ))[٣٦٩] واتە: ئەوە بۆ پێغەمبەر ناشێت چاوی ناپاکی هەبێت. لەگێڕانەوەیەکدا: (...یەکێکیان وتی: گەر ئاماژەیەکت بۆ من بکردایە من دەم کوشت ئەی پێغەمبەری خوا. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لَا تَفْعَلْ ذلك))[٣٧٠] واتە: هەرگیز وا مەکە؟!.

## مەفرەزەکانی پێغەمبەر ﷺ

لەماوەی مانەوەی پێغەمبەر ﷺ لەشاری مەککە چەندەها کارو ڕوداوێك ڕویدا لەوانە: ناردنی مەفرەزەیەك بۆ شکاندنی ئەو بتانەی کەهێشتا مابوون لەدوای پاك کردنەوەی کەعبە لەبت (پێغەمبەر ﷺ کەسێکی ناردو جاڕی دا بەناو شاری مەککەدا و وتی: هەرکەسێك بڕوای بەخواو ڕۆژی کۆتایی هەیە با بت لەماڵەکەیدا نەهێڵێت و بیشکێنێت)[٣٧١] بەم جۆرە شارەکە پاك کرایەوە لەهەموو جۆرە بتێك کە دەپەرسترا جگە لەخوا، پاشان چەند مەفرەزەیەکی نارد بۆ ڕووخاندنی بتەکانی (مەنات و عوزاو سواع) ی دەرەوەی شاری مەککە.

---

(٣٦٨) أخرجه: البزار (١٨٨٢)، وابي يعلى (٧٥٧).

(٣٦٩) أخرجه: ابوداود (٢٦٨٣)، والنسائي (الصغرى) (١٠٥/٧) وفي (الكبرى) (٣٥١٦)، وابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٦٨) وقال محققه: اسناده حسن، والبيهقي (الكبرى) (٢٠٥/٨) وفي الدلائل (٥٩/٥)، والحاكم (٤٥/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبزار (١٨٨٢)، وابي يعلى (٧٥٧)، وابن هشام (٢٣/٤)، والطبري (التاريخ) (٥٨/٣)، والدار قطني (٤٣٠٠).

(٣٧٠) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٧٤)، ونقله عنه البيهقي (الدلائل) (٤٥/٥).

(٣٧١) انظر: (زاد المعاد) (١٠٢/٣).

## مەفرەزەی سەعدی کوڕی زەید بۆ ڕووخاندنی مەنات

مەنات بتێك بوو لە قەراخی دەریای سوور نزیك ناوچەی (قەدید)، ناسرابوو بەموشەللەل و تایبەت بوو بەهۆزەکانی ئەوس و خەزرەج و غەسان و ئەوانەی هاودینیان بوون، بەگەورەیان دەزانی و لە پیرۆزیدا لەو جێیەوە بەرەو حەج بەڕێدەکەوتن وە تەوافیان نەدەکرد لەنێوان سەفاو مەروەدا (هەر بەوجۆرەش نەریتی باوو باپیرانیان بوو ئەوەی ئیحرامی لەبەر بکردایە بۆ مەنات تەوافی نێوان سەفاو مەروەی نەدەکرد)[٣٧٢]. لە دوای ئازادکردنی شاری مەککە لە بیست و چواری ڕەمەزاندا، پێغەمبەر ﷺ سەعدی کوڕی زەیدی لەگەڵ بیست سواردا نارد بۆ ڕوخاندنی مەنات. زەید لەگەڵ مەفرەزەکە بەڕێکەوتن تا گەیشتنە بتی مەنات، لەوێدا زێوانەکە وتی: چیت دەوێت؟ زەید وتی: ڕوخاندنی مەنات. ئەویش وتی: باشە فەرموو. سەعد ڕۆیشت بۆ ڕوخاندنی لەوکاتەدا ئافرەتێکی ڕەش پێستی قژبڵ دەرچوو هاوارو شینی دەکردو لەسەر سنگی خۆی دەدا زێوانەکە بانگی لێکرد و وتی: مەنات ئەوەتا هەندێك لەسەر پێچی کارانت بیان گرەو لەناویان بەرە. بەڵام زەید بەشمشێرەکەی لێیداو کوشتی پاشان بتەکەیان خاپوور کرد و لە گەنجینەکەیدا هیچیان نەدۆزییەوە، پاشان گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ [٣٧٣].

## مەفرەزەکەی خالیدی کوڕی وەلید بۆ ڕووخاندنی عوزا

عوزا بەواتای شکۆمەند (العزيز) دێت و گوایە لەو ناوە پیرۆزەی خواوە وەرگیراوەو عەرەبیش ناوی (عبدالعزى)یان لەناودا باوبووە.

بتی عوزا خانویەك وە درەختێکی گەورە بوو لەناوچەی (نەخلە) لەسەر ڕێگای (تائیف)[٣٧٤] ئیبنو عەبباس ﷺ دەفەرموێت: (ئەو بتە خانوویەك بوو لەسەر (سێ

---

(٣٧٢) أخرجه: مسلم (شرح النووي) (٩/ ٢٢،٢٤)، والبخاري (فتح ١٧٥/٨).

(٣٧٣) أخرجه: الواقدي (المغازي) (٨٧٠/٢) وابن سعد (الطبقات) (٥/٢، ١٤٦)، والطبري (التاريخ) (٦٦/٣)، وابن هشام (٨٦/١) و(البداية) (٣٧٥/٤) والحديث ضعيف أوردناه للعلم فقط.

(٣٧٤) انضر: (الاصنام) للكلبي (١٨)، و (الفتح القدير) للشوكاني (١٠٨/٥)، و (السرايا و البعوث النبوية) د.بريك العمري (ص:٢٧٩).

درەختی سومەر)[٣٧٥] دروست کرابوو. شوێنێکی زۆر پیرۆزبوو لای قورەیش و کینانەو هۆزی موزەر، زێوانەکەی لەهۆزی بەنی شەیبان و بەنی سولەیم بوو[٣٧٦]، ئەوەندە بەپیرۆزیان دەزانی (قورەیش شیوی حیرازی بۆ ئەو بتە کردبووە حەرەم و قەدەغەکراو) وەك حەرەمی کەعبەو ناوچەی سەربڕینی قوربانیشیان بۆ دیاری کردبوو کەناوی (غەبغەب) بوو[٣٧٧].

پێغەمبەر ﷺ خالیدی کوڕی وەلیدی لەگەڵ سی سواردا لە بیست و پێنجی ڕەمەزاندا[٣٧٨] نارده ئەو ناوچەیە، کاتێك مەفرەزەکە گەیشتە ئەوێ، خالید هەرسێ درەختە (سومەرە) کانی بڕی و خانووەکەشی وێران کرد، لەو کاتەدا دەی وت: ئەی عوزا ئێمە باوەڕمان پێت نییەو بەچەپەڵت دەزانین و دەبینین کەخوا ڕیسوای کردوویت[٣٧٩].

ئەبوتوفەیل ئەو بەسەرهاتە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت:

(کاتێك پێغەمبەر ﷺ مەککەی ئازادکرد، خالیدی کوڕی وەلیدی نارده ناوچەی (نەخلە) کەبتی عوزای لێ بوو، خالید چوو سێ درەختە (سومەرەکەی) بڕی و خانووەکەی وێران کرد کەلەسەری بونیاد نرابوو، پاشان گەڕایەوە لای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوەو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ارْجِعْ فانَّكَ لَمْ تَصْنَعْ شَيئاً)) واتە: ((بگەڕێوە چونکە تۆ هیچت نەکردووە)). خالید و مەفرەزەکەی دووبارە گەڕانەوە ئەو ناوچەیەو کاتێك زێوانەکانی ئەوانیان بینی بەرەو شاخەکە هەڵاتن و دەیان وت: ئەی عوزا شێتیان بکە ئەی عوزا کوێریان بکە یان با لووتیان بشکێنە و لەناویان بەرە. خالید، چووە پێش لەبتە شکاوەکەو لەوکاتەدا ئافرەتێکی قژبژی ڕووتی بەرووودا هات خۆڵی دەکرد بەسەر خۆیدا، خالید بەشمشێرەکەی لێیداو کوشتی و پاشان گەڕایەوە لای پێغەمبەر ﷺ و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە و پێغەمبەر ﷺ پێ ی فەرموو: ((تلك هِي العُزى))[٣٨٠] واتە: ئەوە عوزا بوو.

---

(٣٧٥) أخرجه: ابو نعيم (الدلائل) (٥٣٥/٢)، والبيهقي (الدلائل) (٧٧/٥)، والكلبي (الاصنام) (١٢٥).

(٣٧٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٤٢٦/٤) وابن سعد (الطبقات) (١٤٦/٢) والكلبي (الاصنام) (٢٢).

(٣٧٧) أخرجه: الكلبي (الاصنام) (١٨)، والزرقاني (شرح المواهب) (٣٤٧/٢).

(٣٧٨) أخرجه: الواقدي (المغازي) (٨٧٣/٣)، ابن سعد (الطبقات) (١٤٥/٢).

(٣٧٩) أخرجه: خليفة بن خياط (التاريخ) (٨٨) بسند حسن مرسل كما في (السرايا والبعوث النبوية) (ص:٢٨٢).

(٣٨٠) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٧٧٨٨) وقال محققه: اسناده حسن مرسل، والنسائي (الكبرى) (١١٥٤٧) وفي

# مەفرەزەکەی خالیدی کوڕی وەلید بۆ هۆزی بەنی جوزەیمە

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ چەندەها مەفرەزەی بەچواردەوری مەککەدا بڵاوەپێکرد بۆ گەیاندنی پەیامی خوا بەو ناوچانەو فەرمانی شەڕکردنی پێ نەدابوون، لەوانە خالیدی کوڕی وەلیدی ﷺ نارد بۆ گەیاندنی بانگەوازەکە بۆ ناوچەی خوارووی چیاکانی توهامە نەك بۆ شەڕکردن)[٣٨١].

ئەم مەفرەزەیە لەمانگی شەوالی ساڵی هەشتی کۆچی لەخوارووی شاری مەککەوە ئاڕاستەی ناوچەی (یەملەم)ی نزیك حونەین کران و پێکهاتبوون لە سێ سەد و پەنجا جەنگاوەری موهاجیرین و ئەنصارو هەندێك لەهۆزەکانی بەنو سولەیم و بەنی مودلیج و هەندێك ناوداری تێدابوو وەك عەبدوڵای کوڕی عەمرو عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و سالیمی خزمەتکاری ئەبوحوزەیفەو ئەبو قەتادە[٣٨٢].

لەگێڕانەوەیەکدا هاتووە: (کاتێك بەنی جوزەیمە هەواڵی هاتنی مەفرەزەکەیان زانی خۆیان ئامادەکرد بۆ جەنگ و چەکیان هەڵگرت و لەسەر چیای (غومەیما) هەردوولا بەیەك گەیشتن، خالید بانگی کردن بۆ ئاینی ئیسلام ئەوان نەیان زانی بڵێن: موسوڵمان بووین، بەڵکو دەیان وت: لەئاین دەرچووین.....و خالیدیش چاوەڕوانی کرد تا کاتی نوێژی عەسرو مەغریب و عیشا بەڵام بانگی لێیان نەبیست، پاشان هێرشی کردە سەریان.... و کاتێك موسوڵمانان بەسەریاندا زاڵبوون هەر دەیان وت: لەئاین دەرچووین)[٣٨٣] و ئەو وتەیەش بۆ مانای سوکایەتی و بەکەم زانین بوو. وردەکارییەکانی ئەم بەسەرهاتە لەفەرموودەیەکی ڕاستدا هاتووەو عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێت:

---

(التفسير) (٥٦٧) وقال محققه: اسناده حسن، وابي يعلى (٩٠٢) وقال محققه: اسناده صحيح، وابونعيم (الدلائل) (٤٦٣)، والبيهقي (الدلائل) (٧٧/٥)، والطبري (التاريخ) (٦٥/٣) وابن هشام (السيرة) (٥٠/٤)، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (٥٣٣): حديث حسن.

(٣٨١) أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (١٤٧/٢)، وانظر (فتح الباري) (٧١/٨).

(٣٨٢) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١١٤/٥)، والطبري (التاريخ) (٦٦/٣)، وابن هشام (٥٠/٤).

(٣٨٣) أخرجه: البخاري (فتح) ( ٥٧/٨، ١٨٢/١٣).

(پێغەمبەر ﷺ خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆلای هۆزی بەنی جوزمیمە و بانگی کردن بۆ ئیسلام، ئەوان نەیان زانی بڵێن: موسوڵمان بووین وهەر دەیان وت: لەئاین دەرچووین و لەئاین دەرچووین) خالیدیش جەنگا لەگەڵیاندا و هەندێکی لێ کوشتن و هەندێکی لێ بەدیل گرتن و هەریەکەیانی دایە دەست یەکێك لەجەنگاوەری موسوڵمانان، لەڕۆژێکدا خالید فەرمانی کرد هەموو یەکێك لەئێمە دیلەکەی خۆی بکوژێت، منیش وتم سوێند بەخوا من دیلەکەی خۆم ناکوژم و نابێت هیچ کەسێك دیلەکەی بکوژێت، بەوجۆرە ماینەو تا گەڕاینەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و بەسەرهاتەکەمان بۆ گێڕایەوە، پاشان هەردوو دەستی بەرزکردەوە دووجار ئەمەی فەرموو: ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ خَالِدٌ))[٣٨٤]. واتە: خوایە من بەریم لەوکارەی کەخالید ئەنجامی داوە (چونکە خالید سێ کەسی لەوان بە هەڵە کوشتبوو).

لەنێو دیلەکاندا پیاوێکی بێگانەی تێدابوو کە ئاشقی ئافرەتێکی بەنی جوزمیمە بوو، ئەویش لەگەڵ سی کەس لەبەنی جوزمیمە هەموو کوژران، ئیبنو ئەبو حەدرەد رضي الله عنه دەفەرموێت: (من لەو ڕۆژەدا یەکێك بووم لەئەسپسوارانی خالیدی کوڕی وەلید، گەنجێکی هاوتەمەنی خۆم لەبەنی جوزمیمە هەردوو دەستی بەگوریسێکی کۆن بەسرابووەوە و ئافرەتانێکیش لەولاوە کەمێك لێك دوور بوو. ئەو گەنجە وتی: ئەی گەنج؟ وتم: چیت دەوێت؟ وتی: تۆ بەم گوریسە من ڕابکێشەو بمبەرە لای ئەو ئافرەتانە من پێویستییەکم پێیانەو دواتر من بگێڕەوە شوێنی یەکەم جارم و چیم لێ دەکەن سەرپشك بن. منیش وتم: سوێند بەخوا داواکەت زۆر ئاسانە، منیش بەگوریسەکەی گرتم و پێش خۆمم داو بردم تا گەیاندمە لای ئافرەتەکان و لەلایان وەستاو وتی: (حوبەیش) تۆش سەلامەت بیت لەکۆتایی ئەم ژیانەدا.... ئافرەتەکەش وتی: تۆش هەروەها سەلامەت بژیت. پاشان پیاوەکەم گێڕایەوەو لەگەردنی درا)[٣٨٥].

لەگێڕانەوەیەکی تردا ئیبنو عەبباس رضي الله عنه دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ مەفرەزەیەکی نارد هەندێك دەسکەوتیان دەست کەوت و پیاوێکیان دەستبەسەر کرد بوو بەوانی دەوت: من کەسێکی ئەو هۆزە نیم بەڵام ئاشقی ئافرەتێکیان بووم و شوێنی کەوتووم لێم بگەڕێن با یەك جار تەماشای بکەم، دواتر چیم لێ دەکەن خۆتان سەرپشك بن،

---

(٣٨٤) أخرجه: البخاري (٤٤٣٩)، والنسائي (٢٣٧/٨).

(٣٨٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٤٨/٤) رقم (٩٦٦) وقال محققه: اسناده حسن.

ئەو ئافرەتەش ئافرەتێکی سپی باڵابەرز بوو پیاوەکە پێی وت: (حوبەیش) تۆش سەلامەت بیت لەکۆتایی ئەم ژیانەدا..... ئافرەتەکەش وتی: تۆش هەروەها من فیدات بم، پاشان پیاوەکەیان بردو کوشتیان. ئافرەتەکەش هات و خۆیدا بەسەر لاشەکەیداو یەك دوو هەناسەی هەڵکێشا پاشان مرد. کاتێك گەڕانەوەو ئەو بەسەرهاتەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، ئەویش پێی فەرموون: ((أَمَا كَانَ فِيكُمْ رَجُلٌ رَحِيمٌ))[٣٨٦] واتە: باشە ئێوە تەنها پیاوێکی بەبەزەیتان لەناودا نەبوو. (واتە: کاری وەهاتان بۆ کرد؟!!!)

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (لەو مەفرەزەیەدا لەنێوان خالیدو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفدا کێشەیەك ڕوویداو خالید بە عەبدوڕەحمانی وت: خۆتان بەگەورە دەزانن بەسەرماندا تەنها لەبەر چەند ڕۆژێك کە لەئیسلامەتیدا پێشمان کەوتوون. دواتر ئەوە گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ...... عەبدوڕەحمان شکاتی لە خالید کردو پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((يَا خَالِدُ لِمَ تُؤْذِي رَجلاً مِنْ أَهلِ بَدْر لَوْ أَنْفَقْتَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا، لَمْ تُدْرِكْ عَمَلَهُ )) واتە: خالید چۆن تۆ ئازاری پیاوێکی بەشداربووی جەنگی بەدر دەدەیت گەر بەوێنەی چیای ئوحود ئاڵتون ببەخشیت هێشتا تۆ ناگەیتەوە بە کارەکانی ئەو. خالید وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوان قسەم پێ دەڵێن و منیش وەڵامیان دەدەمەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لَا تُؤْذُوا خَالِدًا، فَإِنَّهُ سَيْفٌ مِنْ سُيُوفِ اللَّهِ صَبَّهُ اللَّهُ عَلَى الْكُفَّارِ))[٣٨٧] واتە: ((ئازاری خالید مەدەن چونکە ئەو یەکێکە لە شمشێرەکانی خودا بەگەڕی خستووە لەسەر بێ باوەڕاندا)).

لەدوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ عەلی کوڕی ئەبو تالیبی نارد بۆلای هۆزی بەنی جوزەیمەو پارەی خوێنی هەموو کوژراوەکانی پێدان و قەرەبووی هەموو زیانەکانی بۆ بژاردن و لەدوایدا پێی فەرموون: (ئایا هیچ خوێن و سامانێکتان ماوە بۆتان قەرەبوو نەکرابێتەوە؟ وتیان: نەخێر. فەرمووی: ئەو پارە زیادەیەش کە لام ماوەتەوە پێتان دەبەخشم وەك ئەستۆپاکییەکی پێغەمبەر ﷺ بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەوەی

---

(٣٨٦) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٢٠٣٧)، في (الاوسط) (١٦٩٧) وقال محققه: اسناده حسن، والنسائي (٣١٦/١)، والبيهقي (الدلائل) (١١٧/٥) وقال الحافظ (الفتح) (٧٢/٨): اسناده صحيح، وقال الهيثمي (المجمع) (٢١٠/٦) رواه الطبراني (الكبير والاوسط) واسناده حسن، وقال الشيخ الالباني (الصحيحة) (٢٥٩٤): اسناده حسن.

(٣٨٧) أخرجه: أحمد (٢٦٦/٣) وأحمد (الفضائل) (١٣) وقال محققه: اسناده صحيح، والبزار (٢٥٩٢)، والحاكم (٢٩٨/٣) وصححه، والطبراني (الكبير) (١٢١/٤)، وابن حبان (٧٠٩١) وقال محققه: صحيح، وصححه: الشيخ الالباني (الصحيحة) (١٩٢٣،١٢٣٧)، و(صحيح الجامع) (٣٠٢٧).

ئەو پێی نەزانیوەو ئێوەش نەتان زانیوە. هەمووی بەخشیە ئەوان و پاشان گەڕایەوە لای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوەو فەرمووی: ((أَصَبْتَ وَأَحْسَنْتَ)) واتە: ((چاکت کردو لەجێی خۆی بوو)[٣٨٨].

لەڕاستیدا هەڵەکەی خالید ﷺ بەهۆی لێکدانەوەیەکی هەڵەوە بوو وەك ئەبوبەکر ﷺ فەرمووی: (خالید هەرگیز هیچ کەسێك ناکوژێت، یان ئەوەتا لەسەر حەق بووە یان لێکدانەوەو بۆچونێکی خۆی بووە)[٣٨٩]. لەڕاستیدا بەڵێ جوزەیمە مێژوویەکی دێرینیان هەبوو لەغەدرو تاواندا، خالید ویستی ئاینی ئیسلام سەربخات و موسوڵمانان شکۆمەند بکات لە وتەکەی ئەوان کەدەیان وت بێ دین بووین وای دەزانی کەسوکایەتی بە ئیسلام دەکەن و بەپەلە لێیان هاتە دەست، لەبەرئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ سزای نەداو بەردەوام دەیکردە پێشەوای هەموو مەفرەزەکان و لەسەر کارەکەی لای نەدەدا هەتا لەژیاندا مابوو.

## مەفرەزەکەی عەمری کوڕی عاص بۆ ڕووخاندنی سواع

سواع ناوی بتێکی دێرینی زەمانی پێغەمبەر نوح ﷺ بوو، لەپاشان (هۆزی هوزەیل دەیان پەرست)[٣٩٠] و لە ناوچەی (ڕەهات)[٣٩١] دایان نابوو، زێوانەکانی لەهۆزی بەنو لوحیان بوون، بتەکەش بەردێك بوو لەسەر وێنەی ئافرەتێك[٣٩٢].

لەدوای ئازادکردنی شاری مەککە، پێغەمبەر ﷺ مەفرەزەیەکی بۆ خاپورکردنی نارد بەسەرکردایەتی عەمری کوڕی عاص، عەمر دەفەرموێت: (..... ڕۆیشتین تا گەیشتمە بەردەم زێوانەکەی ئەو پێی وتم: چیت دەوێت؟ وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووم بیڕوخێنم و خاپوری بکەم. وتی: تۆ ناتوانیت ئەو کارە بکەیت؟! وتم: بۆ؟ وتی: ئەو بەرگری لەخۆی دەکات. وتم: تا ئێستا تۆ هەر لەسەر ناڕەواییت هاوار بۆ تۆ ئایا ئەو بتە دەبینێت و دەبیستێت؟ پاشان لێی نزیك بوومەوەو شکاندم

---

(٣٨٨) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٤٥/٤) واسناده مرسل وضعيف.

(٣٨٩) أخرجه: خليفة بن خياط (تاريخ خليفة بن خياط) (١٠٥) واسناده حسن كما قال في (السرايا والبعوث النبوية) د.بريك العمري (ص:٢٥٥).

(٣٩٠) أخرجه: البخاري (٦٦٧/٨) معلقاً عن ابن عباس ﷺ.

(٣٩١) انظر: (فتح الباري) (٦٦٨/٨)، و (الاصنام) للكلبي (ص:٥٧٠).

(٣٩٢) انظر: (التاريخ) للطبري (٦٦/٣).

و لەگەڵ هاوەڵانم بەتەواوی خاپورمان کرد و ڤاسەکەیمان شکاندو هیچی تیا نەبوو، دواتر بە زێوانەکەم وت: ئایا هیچ ڕوویدا؟ وتی: منیش بەخوا موسوڵمان دەبم)[٣٩٣].

# ئەو ڕووداوانەی لەکاتی مانەوەی پێغەمبەرﷺ لە مەککە ڕویاندا

لەکاتی مانەوەی پێغەمبەر ﷺ لەمەککە هەندێك شت ڕوویاندا لەوانە:

### ١. دەست بڕینی ئافرەتە دزەکەی بەنی مەخزوم:

دایکی بڕواداران عائیشە ﵂ و نافیع و سەعیدی کوڕی موسەیەب ﵀ دەفەرموون: ((ئافرەتێك لەبنەماڵەیەکی گەورە و ناوداری قوڕەیش (لەهۆزی بەنی مەخزوم)[٣٩٤] چووبووە لای هەندێك خاوەن ماڵ وتبووی (من لەهۆزی فلانە کەسم)[٣٩٥] (واتە: بەناوی دراوسێکانی ئەوانەوە)[٣٩٦] (ئەوانیش کەسانێکی ناسراو بوون بەڵام ئەو ئافرەتە نەناسراوبوو)[٣٩٧] وتی: (ئەوان داوای هەندێك خشڵی ئاڵتونتان لێ دەکەن)[٣٩٨] پاشان بۆتان دەگێڕنەوە؟ ئەوانیش ئەو خشڵانەیان پێداو (ئەو ئافرەتەش هەمووی کۆکردەوەو لای خۆی شاردیەوە)[٣٩٩] (پاشان هەموویانی فرۆشت و پارەکەی لای خۆی قایم کرد)[٤٠٠]. ئەو خەڵکەش دوایی چوونە لای ئەو کەسە ناسراوانە ئەوان بێ ئاگایی خۆیان لەو باسە ڕاگەیاند، پاشان گەڕانەوە لای ئەو ئافرەتە و ئەو هەواڵانەی بەدرۆخستەوەو بێ ئاگایی خۆی لێ ڕاگەیاند، پاشان چوونە لای پێغەمبەر ﷺ و ئەویش ئافرەتەکەی بانگ کردو لێ پرسینەوەی لەگەڵدا ئەنجامداو ئافرەتەکە وتی: سوێند بەوەی تۆی بەڕاستی ناردووە من هیچ سپاردەیەکم لەوان وەرنەگرتووە.

(٣٩٣) أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (١٤٦/٢) عن جميع شيوخه، والواقدي (المغازي) (٨٧٠/٢) واسناده ضعيف كما في (السرايا والبعوث النبوية) (ص:٢٩٣).

(٣٩٤) أخرجه: مسلم (١٦٨١،٤٣٨٨) واسمها (فاطمة بنت الاسود) كما في (فتح الباري) (١٠٥/١٢)

(٣٩٥) أخرجه: عبدالرزاق (١٢٧٥٦) بسند صحيح كما قال الحافظ (الفتح) (١٠٩/١٢).

(٣٩٦) أخرجه: النسائي (٤٨٨٨)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٤٥٤١) من قول عائشة ﵂

(٣٩٧) أخرجه: عبدالرزاق (١٢٧٥٦) بسند صحيح من قول ابن المسيب.

(٣٩٨) أخرجه: النسائي (٤٨٩٨)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٤٥٤٨) من قول عائشة ﵂.

(٣٩٩) أخرجه: النسائي (٤٨٩٠)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٤٥٤٢) من قول عائشة ﵂.

(٤٠٠) أخرجه: النسائي (٤٨٩٨)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٤٥٤٨) من قول عائشة ﵂.

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((اذْهَبُوا إلى بَيْتِها تَجِدُوهُ تَحْتَ فِرْاشِها . فَأْتُوهُ فَأَخذُوهُ)) واتە: ((برۆن ماڵەکەی بپشکنن لەژێر فەرشەکەیدا دەیدۆزنەوە)). ئەوانیش چوون و دۆزیانەوە. دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ هەستاو وتاری داو فەرمووی: ((هَلْ مِنْ إِمْرَأَةٍ تائِبَةٍ إلى اللهِ وَرَسُولِهِ)) ثلاثَ مرّاتٍ)[٤٠١] واتە: ((ئایا ئافرەتێك هەیە دەیەوێت تۆبە بکات لای خواو پێغەمبەرەکەی)) ئەوەی سێ جار دووبارە کردەوە) و پاشان فەرمووی: ((لِتَتُبْ هِذهِ المرأة وَتُؤَدي مَا عِنْدَها)) مِراراً)[٤٠٢] واتە: ((ئافرەتێك پێویستە تۆبە بکات و ئەوەی لایەتی بیگێڕێتەوە)) چەندەها جار ئەوەشی دووبارە کردەوە)) (لەوکاتەدا ئەو ئافرەتە لەوێ بوو بەڵام هەستاو قسەشی نەکرد)[٤٠٣]. (لە ئەنجامدا پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا دەستی ببڕدرێتەوە)[٤٠٤].

قورەیش زۆر لەخەمی ئەو ئافرەتە (مەخزومیەدا بوون)[٤٠٥] ....... وتیان: کێ دەتوانێت تکای بۆ بکات لای پێغەمبەر ﷺ بڕوا ناکەین کەس هەبێت بتوانێت ئەوکارە بکات جگە لەئوسامەی کوڕی زەیدی خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ (دواتر خزمانی ئەو ئافرەتە چوونەلای ئوسامەو داوایان لێکرد بۆ ئەوەی تکایان بۆ بکات سەبارەت بەو ئافرەتە)[٤٠٦]. ئافرەتەکەیان هێنا تا دەستی ببڕن و ئوسامە تکای بۆ کرد و پێغەمبەریش ﷺ لە توڕەیدا ڕووخسار و دەم و چاوی گۆڕا و بە ئوسامەی فەرموو: ((أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ) (يَا أُسَامَةُ، إِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنَّمَا هَلَكُوا بِمِثْلِ هَذَا)[٤٠٧] (حِيَن كَانُوا إِذَا أَصَابَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ الْحَدَّ تَرَكُوهُ، وَلَمْ يُقِيمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا أَصَابَ الْوَضِيعُ أَقَامُوا عَلَيْهِ لَوْ كَانَتْ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ لَقَطَعْتُهَا))[٤٠٨]. واتە: (ئایا تکای ڕاگرتنی یەکێك لە سنور و یاساکانی خوا دەکەیت ئەی ئوسامە، بەنی ئیسرائیل بەهۆی کاری وەهاوە تیاچوون، کاتێك کەناودارێك سزایەکی بەردەکەوت بەسەریدا جێ بەجێیان نەدەکرد، بەڵام گەر بێ

(٤٠١) أخرجه: ابوداود (٤٣٩٥) وهو حديث صحيح من قول عائشة ﵂، والفقرة قبلها من رواية عبدالرزاق (١٢٧٥٦) واسناده صحيح كما قال الحافظ.

(٤٠٢) أخرجه: النسائي (٤٨٩٠)، وصححه الشيخ الالباني في (الارواء) (٦٦/٨) و (صحيح النسائي) (٤٥٤٢) من قول نافع.

(٤٠٣) أخرجه: ابوداود (٥٩٣٤) وهو حديث صحيح.

(٤٠٤) أخرجه: مسلم (١٦٨٨، ٤٣٨٨) من قول عائشة ﵂.

(٤٠٥) أخرجه: مسلم (١٦٨٨، ٤٣٨٦).

(٤٠٦) أخرجه: البخاري (٤٣٠٤).

(٤٠٧) أخرجه: النسائي (٤٨٩٧)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٤٥٤٧).

(٤٠٨) أخرجه: النسائي (٤٨٩٥)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٤٥٤٨) و(الارواء) (٢٣١٩).

توانایەك گەر سزایەکی بەر بکەوتایە بەسەریدا جێ بەجێیان دەکرد، گەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکات من سزای خوای بەسەردا جێبەجێ دەکەم).

ئوسامە پاشان وتی: داوای لێ خۆشبوونم بۆ بکە ئەی پێغەمبەری خوا. لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاو وتارێکی داو سوپاس و ستایشی خوای کرد و پاشان فەرمووی: (( (أَيُّها النَّاس)[409] (إِنَّمَا هَلَكَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ)[410] قَبْلَكُمْ، أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ، تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ، أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ، وَايْمُ اللَّهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا)) واتە: (ئەی خەڵکینە بەنو ئیسرائیل کاتێك لەناوچوون گەر ناودارێکیان دزی بکردایە وازیان لێ دەهێناو بەسەریدا جێ بەجێیان نەدەکرد، وەگەر لاوازێکیان دزی بکردایە سزاکەیان بەسەردا جێبەجێ دەکرد، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە گەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکردایە، من دەستم دەبڕی. پاشان پێغەمبەرﷺ فەرمانی داو دەستی ئافرەتەکە بڕایەوە). عائیشە رضي الله عنها دەفەرموێت: دواتر ئەو ئافرەتە تۆبەی کردو زۆرباش بوو و لەدوایدا شوی کردو دەهاتە لام و پێویستییەکانیم دەگەیاندە لای پێغەمبەر ﷺ [411].

٢. جەڵدکردنی ئارەقخۆرێك:

عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەزهەر رضي الله عنه دەفەرموێت: (لەڕۆژەکانی ئازادکردنی شاری مەککەدا، من گەنجێك بووم، بینیم پێغەمبەر ﷺ بەناو خەڵکدا دەڕۆیشت و پرسیاری شوێن و جێگەی خالیدی کوڕی وەلیدی دەکرد، لەو کاتەدا پیاوێکیان بۆلای هێناو وتیان ئارەقی خواردووەتەوە، فەرمووی: ((اضْرِبُوا))[412] واتە: ((لێی بدەن)) ئەوەی لەوێ بوو لێیدا هەبوو بەقەمچی و هەبوو بەگۆچان وهەبوو بەنەعل، تا لەدوایدا فەرمووی: واتە: ((ارْفَعُوا)) فرفعوا)[413] ((دەستی لێ هەڵگرن)) پاشان دەستیان لێ هەڵگرت. (پاشان پێغەمبەر ﷺ مشتە خۆڵێکی لەزەوی هەڵگرت و بەڕوویدا پرژاندی)[414])[415].

---

(٤٠٩) أخرجه: البخاري (٦٧٨٨).

(٤١٠) أخرجه: النسائي (٤٨٩٥)، وصححه الشيخ الالباني في (الارواء) (٢٣١٩).

(٤١١) أخرجه: البخاري (٤٣٠٤، ٤٣٨٧)، ومسلم (١٦٨٨)، والترمذي (١٤٣٠).

(٤١٢) أخرجه: ابوداود (٤٤٨٧) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٣٧٦٦).

(٤١٣) أخرجه: أحمد (١٦٨٠٩) وقال محققوه: حديث حسن، ابوداود (٤٤٨٨) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٣٧٦٧).

(٤١٤) أخرجه: ابوداود (٤٤٨٧) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٣٧٦٦).

(٤١٥) أخرجه: ابوداود (٤٤٨٩) وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٣٧٦٨).

### ٣. هاتنی سائیب بۆلای پێغەمبەر ﷺ:

**سائیب لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ سەرقاڵی بازرگانی بوو لەپێش ئیسلامدا، لەدوای ئازادکردنی مەککە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ.**

**سائیب ﷺ دەڵێت: (لەپێش ئیسلامدا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بازرگانیمان دەکرد، لەڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا چوومە خزمەت پێغەمبەرو ﷺ خەڵکی منیان دەناساند بە پێغەمبەر ﷺ و باسی چاکەکانی منیان بۆ دەکرد، تا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أنا أَعْلَمُكُمْ (بِهِ))[٤١٦] مَرْحَباً بِأَخِي وَشَرِيْكِي (كُنْتَ شِرْيكِي فِي الجاهليَّةِ فَكنتَ خيرَ شريكٍ لا تُداريني ولا تُماريني)) واتە: ((من لەهەمووتان باشتر دەیناسم)) ((پێشوازی لە شەریك وبرام (تۆ لەسەردەمی نەفامیدا هاوەڵ و شەریکم بوویت بەڕاستی باشترین هاوڕێ و شەریك بوویت گونجاو بوویت و دەمەقاڵەت نەدەکرد)). منیش وتم: ڕاست دەکەیت بەدایك و باوکەوە فیدات بم تۆش باشترین هاوڕێ و شەریکم بوویت زۆر گونجاو بوویت و هەموو مافێکت دەبەخشی[٤١٧].**

**پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((يَا سَائِبُ ، قَدْ كُنْتُ تَعْمَلُ أَعْمَالًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ لا تَسْتَقْبَلُ مِنْكَ وَهِيَ الْيَوْمُ تَسْتَقْبل مِنْكَ))[٤١٨] واتە: ((سائیب تۆ لەنەفامیدا زۆر کارت دەکرد لێت قبوڵ نەدەکرا بەڵام ئەمڕۆ لێت قبوڵ دەکرێت)) ((انْظُرْ أَخْلَاقَكَ الَّتِي كُنْتَ تَصْنَعُهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَاجْعَلْهَا فِي الْإِسْلَامِ، أَقْرِ الضَّيْفَ، وَأَكْرِمِ الْيَتِيمَ، وَأَحْسِنْ إِلَى جَارِكَ))[٤١٩] واتە: بڕوانە ئەو ڕەوشتانەی کە لەنەفامیدا ئەنجامت دەدا ئێستا لەئیسلامدا ئەنجامی بدە: میوانداری بکەو ڕێز لەبێ باوك بگرەو چاکبە بۆ دراوسێکانت)).**

---

(٤١٦) أخرجه: ابوداود (٤٨٣٦) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٤٠٤٩).

(٤١٧) أخرجه: نفس المصدر.

(٤١٨) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨١٠٣) وقال محققه: اسناده على رسم الصحيح وفيه اضطراب، وأحمد (١٥٥٠٥) وقال محققه: اسناده ضعيف.

(٤١٩) أخرجه: أحمد (١٥٥٠٢،١٥٥٠٥) وقال محققوه: اسناده ضعيف، وابن ابي شيبة (٣٨١٠٣)، والنسائي (الكبرى) (١٠١٤٤) وفي (عمل اليوم والليلة) (٣١٢) وقال محققه: اسناده حسن صحيح وفيه اضطراب، وابوداود (٤٨٣٦)، وابن ماجة (٢٢٨٧)، والطبراني (الكبير) (٦٦١٨) وفي (الاوسط) (٨٧١،١٥٢٢)، والحاكم (٦١/٢) وصححه ووافقه الذهبي و(٤٨/٣)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٤٠٤٩)، وفي (صحيح ابن ماجة) (١٨٥٣) وقال الارناؤوط في تخريج (ابي داود) (٢٠٦/٧) (٤٨٣٦): رجاله ثقات.

### ٤. قەدەغەکردنی فرۆشتنی مەی:

ئیبنو عەبباس ﵁ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ هاوڕێیەکی هەبوو لە هۆزی سەقیف یان دەوس، لەئازادکردنی شاری مەککەدا پێی گەیشت)[٤٢٠]. دوو مەشکە ئارەقی هێنا بەسەر پشتی وشترەکەیەوە وەك دیارییەك بۆ پێغەمبەر ﷺ تا پێغەمبەری ﷺ دۆزییەوە لەجێگەیەك دانیشتبوو پێی فەرموو: ((ما هَذا مَعَكَ)) واتە: ((ئەوە چییە لەگەڵ خۆتدا هێناوتە؟ وتی: دوو مەشکە ئارەقم وەك دیاری بۆ هێناویت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((يا أَبَا فُلان هَلْ عَلِمْتَ أَنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالى حَرَّمَها))؟ واتە: (ئەی باوکی فڵان) نەتزانیوە خوای گەورە حەرامی کردووە؟ وتی: ئایا خوا حەرامی کردووە بەتەواوی؟ پاشان ئاوڕی دایەوە بەلای خزمەتکارێکی کە وشترەکەی لێ دەخوڕی وە بەنهێنی پێی وت: برۆ بیفرۆشە. پێغەمبەریش ﷺ پرسیاری لێکرد فەرمووی: ((مَاذا قُلْتُ لَهُ))؟ واتە: ((چیت پێ وت))؟ وتی: فەرمانم پێکرد بڕوات بیفرۆشێت. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إِنَّ الَّذِي حَرَّمَ شُرْبَهَا حَرَّمَ بَيْعَهَا (وأَكْلُ ثَمَنِها)[٤٢١])) واتە: ((ئەو خودایەی کە خواردنەوەکەی حەرام کردووە فرۆشتن و (خواردنی پارەکەشی حەرام کردووە). ئینجا (فەرمانی کرد دەمی هەردوو مەشکەکە بکرێتەوەو (تا هەردووکیان بەتەواوەتی خاڵی بوون)[٤٢٢] (و هەمووی ڕژێنرایە سەر خۆڵی زەوییەکەو دوو مەشکەکەشم بەبەتاڵی بینی)[٤٢٣].

### ٥. خۆبەکەم زانینی پێغەمبەر ﷺ:

ئەبو مەسعود ﵁ دەفەرموێت: (پیاوێك لەڕۆژانی ئازادکردنی شاری مەککەدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دا تاو لەرز گرتی و تا هەموو گیانی هاتە لەرزە)[٤٢٤] و پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: ((هَوِّنْ (عَلَيْكَ، فَإِنِّي لَسْتُ بِمَلِكٍ، إِنَّمَا)[٤٢٥] أَنَا ابْنُ امْرَأَةٍ مِنْ قُرَيْشٍ، كَانَتْ تَأْكُلُ

---

(٤٢٠) أخرجه: أحمد (٢٠٤١) وقال محققوه: حديث صحيح.

(٤٢١) أخرجه: أحمد (٢١٩٠) وقال محققوه: إسناده حسن.

(٤٢٢) أخرجه: مسلم (١٥٧٩).

(٤٢٣) أخرجه: أحمد (٢٩٧٨) وقال محققوه: اسناده حسن، وابن حبان (٤٩٤٤) وقال محققه: اسناده صحيح، وابويعلى (٢٥٩٠) وقال محققه: اسناده صحيح.

(٤٢٤) أخرجه: ابن ماجة (٣٣١٢) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٦٧٧).

(٤٢٥) أخرجه: نفس المصدر السابق.

الْقَدِيدَ))[٤٣٦]. واتە: لەسەرخۆبە من پاشا نیم من كوڕی ئافرەتێكم لە قوڕەیش كە قەدیدی دەخوارد (واتە: پارچە گۆشتی وشك كراوی بەر خۆری دەخوارد).

### ٦. پێغەمبەر ﷺ هەموو نوێژەكان بەیەك دەستنوێژ دەكات:

بورەیدە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ پێشتر بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژی دەگرت، بەڵام لەئازادكردنی شاری مەككەدا هەموو نوێژەكانی بەیەك دەستنوێژ كرد)[٤٣٧]. و (مەسحی خوفەكانی كرد. عومەر پێی وت: ئەمڕۆ تۆم بینی شتێكت كرد پێشتر شتی وەهات نەكردووە؟ فەرمووی: ((عَمْداً صَنَعْتُهُ يا عُمَر))[٤٣٨] واتە: ئەی عومەر ئەو كارەم بەئەنقەست ئەنجامدا.

### ٧. ئەنجامدانی نوێژی بەیانی لای كەعبە:

لەیەكێك لەڕۆژەكانی ساتەوەختی ئازادكردنی شاری مەككەدا، پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەیانی بۆ موسوڵمانان كردو لەنوێژەكەدا توشی كۆكە هات:

عەبدوڵڵای كوڕی سائیب ﷺ دەفەرموێت: (لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووم لەساتەكانی ئازادكردنی شاری مەككەدا (بەیانیەكیان نوێژی بۆكردین)[٤٣٩] لەبەردەم كەعبەدا نەعلەكانی داناو كردیە لای چەپی، پاشان لەنوێژەكەدا سورەتی(المؤمنون)ی خوێند كاتێك گەیشتە باسی موساو هارون یان عیساو موسا توشی كۆكە هات و ناچار بڕیی و چووە ڕكوع)[٤٣٠].

### ٨. گەورەیی شاری مەككە:

عەبدوڵڵای كوڕی عەدی كوڕی ئەلحەمراء ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوام

---

(٤٣٦) أخرجه: الحاكم (٤٧/٣) وصححه على شرطهما، ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (٦٩/٥)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٨٧٦).

(٤٣٧) أخرجه: ابن ماجة (٥١٠)، وابن حبان (١٧٠٧) وقال محققه: اسناده صحيح.

(٤٣٨) أخرجه: مسلم (٢٧٧)، وابوداود (١٧٢)، والترمذي (٦١)، والنسائي (٦١/١)، وابن ماجة (١٧٢) واللفظ له، وابن حبان (١٧٠٨) وقال محققه: اسناده صحيح.

(٤٣٩) أخرجه: ابوداود (٦٤٩) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٦٠٤).

(٤٣٠) أخرجه: أحمد (٤٤١/٣)، ومسلم (٤٥٥)، وعبدالرزاق (٢٧٠٧)، وابوداود (٦٤٩)، وابن ماجة (١٤٣١)، والنسائي (١٧٦/٢)، وابن خزيمة (٥٤٦)، والحاكم (٢٥٩/١)، وابن حبان (١٨١٥) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

ﷺ بینی)[٤٣١] (بەسواری وشترەکەیەوە وەستابوو لەناوچەی حەزوەرەی)[٤٣٢] بازاڕی مەککەو بە مەککەی دەفەرموو: ((وَاللهِ إِنَّكِ لَخَيْرُ أَرْضِ اللهِ، وَأَحَبُّ أَرْضِ اللهِ إِلَى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَلَوْلَا أَنِّي أُخْرِجْتُ مِنْكِ مَا خَرَجْتُ))[٤٣٣] واتە: سوێند بەخوا (ئەی مەککە) تۆ چاکترین زەوی خودایت و وە خۆشەویسترین پارچە زەوی خودایت لای خوای گەورە، گەر من لەتۆ وەدەر نەدەنرام هەرگیز تۆم بەجێ نەدەهێشت و لێت دەرنەدەچووم.

لەگێڕانەوەیەکی تردا: ئیبنو عباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بەشاری مەککەی فەرموو: ((مَا أَطْيَبَكِ مِنْ بَلَدٍ، وَأَحَبَّكِ إِلَيَّ، وَلَوْلَا أَنَّ قَوْمِي أَخْرَجُونِي مِنْكِ مَا سَكَنْتُ غَيْرَكِ))[٤٣٤]. واتە: چەندە شارێکی پاك وخۆشیت و خۆشەویستیت لەلای من، گەر خزمانم منیان لەتۆ وەدەرنەنایە هەرگیز من نیشتەجێی جێگەی تر نەدەبووم.

لەگێڕانەوەیەکی تردا: ئەبوهورەیرە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەساتەکانی ئازادکردنی شاری مەککەدا لەناوچەی (حەجون) دا وەستابوو دەیفەرموو: ((وَاللَّهِ إِنَّكِ لَخَيْرُ أَرْضِ اللَّهِ، وَلَوْ لَمْ أُخْرَجْ مِنْكِ مَا خَرَجْتُ))[٤٣٥] واتە: سوێند بەخوا تۆ باشترین زەوی خوایت، گەر من لەتۆ وەدەر نەنرایەم هەرگیز لێت دەرنەدەچووم.

### ٩. گەورەیی نوێژی مزگەوتی حەرامی شاری مەککە:

جابر ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێك لەڕۆژانی ئازادکردنی شاری مەککەدا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من نەزرم کردووە بۆ خوا گەر شاری مەککەت بۆ ئازاد بکات دەبێت بچم لەمزگەوتی قودس (دوو ڕکات نوێژ بۆ خوا بکەم)[٤٣٦]. پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((صَلِّ ها هُنا)) (يَعنِي المَسجد الحَرام). واتە: ((لێرە نوێژەکەت بکە)) مەبەستی مزگەوتی حەرام بوو..... پاشان دووبارەی کردەوە.

(٤٣١) أخرجه: الترمذي (٣٩٢٥) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٣٠٨٢).

(٤٣٢) أخرجه: ابن ماجة (٣١٠٨)، وابن حبان (٣٧٠٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(٤٣٣) أخرجه: أحمد (١٨٧١٥،١٨٧١٦) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والنسائي (الكبرى) (٤٢٥٢)، والحاكم (٧/٣) وصححه على شرطهما، ووافقه الذهبي.

(٤٣٤) أخرجه: الترمذي (٣٩٢٦)، والطبراني (١٠٦٢٤)، والحاكم (٤٨٦/١) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وابن حبان (٣٧٠٩) وقال محققه: حديث صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٣٠٨٣).

(٤٣٥) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠٥٥) وقال محققه: اسناده حسن، وابو يعلى (٥٩٥٤) وقال محققه: اسناده حسن.

(٤٣٦) أخرجه: ابوداود (٣٣٠٥)، وصححه الشيخ الالباني في (الارواء) (٢٥٩٧).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((صلِّ ها هُنَا))[٤٣٧] واتە: لێرە نوێژەکەت بکە، پیاوەکە سێ بارەی کردەوە، کاتی وتیەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((فَشأنَكَ إذا))[٤٣٨] (صلِّ حَيثُ قُلْتَ))[٤٣٩] ((ئیتر بەویستی خۆت (نوێژ لەوشوێنە بکە کە وتت).

**١٠. نوێکردنەوەی سنورەکانی حەرەمی مەککە:**

ئیبنو عەبباس رضي الله عنه دەفەرموێت: (لەساڵی ئازادکردنی شاری مەککەدا پێغەمبەر ﷺ ئەسەدی خوزاعی نارد بۆ تازەکردنەوەی سنورەکانی حەرەم و تازەکرایەوە چونکە پێشتر پێغەمبەر ئیبراهیم دیاری کردبوو بەچاودێری جبریل بۆی)[٤٤٠].

**١١. ئیسلام هەردەم بەرز دەبێت و هیچی تری بەسەردا بەرز نابێتەوە:**

عائیزی کوڕی عەمر رضي الله عنه دەفەرموێت: (لەڕۆژانی ئازادکردنی شاری مەککەدا من لەگەڵ ئەبوسوفیانی کوڕی حاریسدا چووین بۆلای پێغەمبەر ﷺ وهاوەڵانی بەچواردەوریەوە دانیشتبوون وتیان: ئەوە ئەبوسوفیان و عائیزی کوڕی عەمرە. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هَذَا عَائِذُ بْنُ عَمْرٍو وَأَبُو سُفْيَانَ، الْإِسْلَامُ أَعَزُّ مِنْ ذَلِكَ الْإِسْلَامُ يَعْلُو وَلَا يُعْلَى))[٤٤١]. واتە: ئەوە عائیزی کوڕی عەمرە لەگەڵ ئەبوسوفیان، ئیسلام لەوان شکۆدارترە، ئیسلام هەردەم بەرز دەبێت و هیچی تر بەسەریدا بەرز نابێتەوە.

**١٢. کوڕەکەی زەمعە:**

عائیشە رضي الله عنها دەفەمورێت: (عوتبەی کوڕی ئەبو وەقاص، سەعدی برای ڕاسپاردبوو کە کوڕی کەنیزەکەکەی زەمعەی بۆ ببات چونکە عوتبە وتبووی ئەوە کوڕی خۆمە. کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەمەککە بوو لەڕۆژانی ئازادکردنیدا. (سەعد کوڕەکەی بینی و بەلەیەکچوونی لەعوتبە ناسییەوەو باوەشی پیاکردو وتی: تۆ کوڕی براکەی منی

(٤٣٧) أخرجه: ابويعلى (٢٢٢٤) وقال محققه: اسناده صحيح.

(٤٣٨) أخرجه: ابويعلى (٢١١٦) وقال محققه: اسناده صحيح، والدارمي (٢٣٣٩).

(٤٣٩) أخرجه: أحمد (١٤٩١٩) وقال محققوه: اسناده قوي، وعبدالرزاق (١٥٨٩١)، والحاكم (٣٠٤/٤)، وصححه الشيخ الالباني في (الارواء) (٢٥٩٧).

(٤٤٠) أخرجه: ابونعيم باسناد حسن كما قال الحافظ في (الاصابة) (١٨٣/١) رقم (٨٣٥)، و(الفتح) (٢٩٥/٤) و أخرجه: عبدالرزاق (٨٨٦٤).

(٤٤١) أخرجه: الدارقطني (السنن) (٣٥٧٨)، والبيهقي (الكبرى) (٢٠٥/٦) واللفظ له، وحسّنه الشيخ الالباني في (الارواء) (١٢٦٨) و (صحيح الجامع) (٢٧٧٨).

سوێند بەخوای کەعبە. لەو کاتەدا عەبدی کوڕی زەمعە هات وتی: نەخێر بەڵکو ئەو برای منەو لەسەر جێی باوکم لەدایك بووە لەکەنیزەکەکەیەوە)[٤٤٢] (سەعد کوڕەکەی گرت و بردی بۆلای پێغەمبەر ﷺ) (اخْتَصَمَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي ابْنِ أَمَةِ زَمْعَةَ) (وعەبدی کوڕی زەمعە و خوشکەکەی لەگەڵی چوون)[٤٤٣] سەعد لەوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، براکەم ڕایسپاردم (کاتێك کەمن گەیشتمە مەککە)[٤٤٤] کوڕی کەنیزەکەکەی زەمعەی بۆ بەرم چونکە ئەوە کوڕی ئەوە)[٤٤٥] ئەی پێغەمبەری خوا (تەماشا بکە ئەوەتا لەعوتبە دەچێت)[٤٤٦].

عەبدی کوڕی زەمعە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەڵکو ئەو برامە ئەو کوڕی کەنیزەکەکەی زەمعەیە لەسەر جێی باوکم لەدایك بووە، پێغەمبەر ﷺ تەماشای کوڕەکەی کرد کەس نەبووە وەکو ئەو لەزەمعە بچێت. پاشان فەرمووی: واتە: ((هُوَ لَكَ هُوَ أَخُوكَ يَا عَبْدُ بْنَ زَمْعَةَ ((الوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الحَجَرُ، وَاحْتَجِبِي مِنْهُ يَا سَوْدَةُ بِنْتَ زَمْعَةَ)) ((ئەو بۆ تۆیە، ئەو براتە ئەی عەبدی کوڕی زەمعە، منداڵ بۆ ئەو کەسەیە کەخاوەن جێیە، زیناکاریش هەر بەردی دەست دەکەوێت، تۆش سەودەی کچی زەمعە خۆتی لێ دوورگرە)) سەودە دواتر نەیبینییەوە))[٤٤٧] (هەتا وەفاتی کرد)[٤٤٨] ئەوەش لەبەر ئەو لێکچوونە بەهێزەی بوو لەگەڵ عوتبەی کوڕی وەقاص)[٤٤٩].

## ١٣. بڵاوبوونەوەی ئیسلام:

ئوم فەزل و عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ: دەفەرموون: (پێغەمبەر ﷺ شەوێك لەمەککە لەنیوەی شەودا هەستاو سێ جار فەرمووی: ((اللهُمَّ هَلْ بَلَّغتُ)) واتە: ((خوایە ئایا ئاینەکەم گەیاند؟)). عومەری کوڕی خەتاب ﷺ کە پیاوێکی دوعاکار بوو بۆی هەستا وتی: خوا ئاگادارە، بەڵێ پێداگریت کردو ئامۆژکاریت کردو کۆششت کرد

(٤٤٢) أخرجه: عبدالرزاق (١٣٨١٨)، وأحمد (٢٥٨٩٤) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

(٤٤٣) أخرجه: البخاري (٢٤٢١).

(٤٤٤) أخرجه: ابن ماجة (٢٠٠٤).

(٤٤٥) أخرجه: البخاري (٢٤٢١).

(٤٤٦) أخرجه: أحمد (٢٥٨٩٤) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

(٤٤٧) أخرجه: البخاري (٢٢١٨).

(٤٤٨) أخرجه: البخاري (٦٧٤٩).

(٤٤٩) أخرجه: البخاري (٤٣٠٣)، ومسلم (١٤٥٧).

ئەوەی دووجار دووبارە کردەوە لەبەیانیدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لَيَظْهَرَنَّ الْإِيمَانُ حَتَّى يَرُدَّ الْكُفْرَ إِلَى مَوَاطِنِهِ وَلَيُخَاضُ الْبِحَارُ بِالْإِسْلَامِ، وَلَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَتَعَلَّمُونَ فِيهِ الْقُرْآنَ فَيَعَلَّمُونَهُ وَيَقْرَءُونَهُ، ثُمَّ يَقُولُونَ قَدْ قَرَأْنَا وَعَلَّمْنَا فَمَنْ ذَا الَّذِي هُوَ خَيْرٌ مِنَّا؟ فَهَلْ فِي أُولَئِكَ مِنْ خَيْرٍ؟)) قَالُوا: لَا : واتە: ((باوەڕداری ئاشکرا و زاڵ دەبێت تا بێ بڕوایی دەگەڕێتەوە ناوچەکانی خۆی، دواتر ئیسلام لەڕێگەی دەریاکانەوە بڵاودەبێتەوەو کات و ساتێك بەسەر خەڵکدا دێت قورئانی تێدا فێردەبن و دەیخوێننەوەو پاشان دەڵێن: ئەوەتا قورئانمان خوێندەوەو پاشان زانیشمان ئیتر کێ هەیە لەئێمە چاکتر بێت؟ ئایا ئەوانە چاکەو خێریان تێدایە؟ ئەوانیش وتیان: نا ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە کێن؟ فەرمووی: ((أُولَئِكَ مِنْكُمْ، وَأُولَئِكَ هُمْ وَقُودُ النَّارِ))[٤٥٠] واتە: ((ئەوانە لەئێوەن و ئەوانە سوتەمەنی دۆزەخن)).

لەگێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (((يَظْهَرُ هَذَا الدِّينُ حَتَّى يُجَاوِزَ الْبِحَارَ ، وَحَتَّى يُخَاضَ بِالْخَيْلِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ، ثُمَّ يَأْتِي أَقْوَامٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ ، فَإِذَا قَرَءُوهُ ، قَالُوا : قَدْ قَرَأْنَا الْقُرْآنَ ، فَمَنْ أَقْرَأُ مِنَّا ؟ مَنْ أَعْلَمُ مِنَّا ؟ (مَنْ أَفْقَهُ مِنَّا) ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَى أَصْحَابِهِ ، فَقَالَ : هَلْ تَرَوْنَ فِي أُولَئِكَ مِنْ خَيْرٍ ؟ قَالُوا : لا )) واتە: ((ئەم ئاینە ئاشکرا و زاڵ و باڵا دەست دەبێت تاسنووری دەریاکان دەبەزێنێت و ئەسپەکانیش بە هەموولادا بڵاودەبنەوە لەپێناوی خوادا، پاشان کەسانێك دێن و قورئان دەخوێننەوەو دواتر دەڵێن: قورئانیشمان خوێند ئیتر کێ هەیە لەئێمە قورئان خوێنتر، کێ هەیە لەئێمە زاناتر، (کێ هەیە لەئێمە تێگەیشتوتر). پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕووی کرد بەلای هاوەڵانیدا و پێی فەرموون: ئایا ئێوە خێر لەوانە دەبینن))؟ ئەوانیش وتیان: نەخێر. پاشان فەرمووی: ((وَأُولَئِكَ مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ ، وَأُولَئِكَ هُمْ وَقُودُ النَّارِ))[٤٥١] واتە: ((ئەوان لەئێوەن لەم ئومەتەو ئەوانە سوتەمەنی دۆزەخن)).

### ١٤. نەگێڕانەوەی کۆیلەکان:

پێشەوا عەلی ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ مەککەی ئازادکرد، پیاوانێکی

(٤٥٠) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٣٠١٩) و (٢٧/٢٥)، وقال المنذري (الترغيب) (٢٣١): اسناده حسن، وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح الترغيب) (١٣٧).

(٤٥١) أخرجه: ابن المبارك (الزهد) (١٥٢)، وابويعلى (٦٦٩٨)، والبزار (١٧٤)، وحسنه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٣٢٣٠) و (صحيح الترغيب) (١٣٦).

ناوداری قورەیشی هاتنەلای وتیان: ئەی موحەممەد ئێمە خزم و پشتیوانی تۆین، کەسانێك لە کۆیلەو ژێردەستەکانمان پێشتر هاتوونەتە لات. بەڵام ئەوان بۆ ئیسلام بوون نەهاتوونەتە لات بەڵکو بەمەبەستی هەڵاتن لەکارەکانیان هاتوونەتە لات ئێستا ئەوانە بگێڕەرەوە بۆمان. پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی بە ئەبوبەکرو عومەر ﵄ کردو پاشان فەرمووی: ((يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ، (لَتُقِيمُنَّ الصَّلَاةَ وَلَتُؤْتُنَّ الزَّكَاةَ) أَوْ لَيَبْعَثَنَّ اللَّهُ عَلَيْكُمْ رَجُلًا مِنْكُمْ، امْتَحَنَ اللَّهُ قَلْبَهُ لِلْإِيمَانِ، يَضْرِبُ رِقَابَكُمْ عَلَى الدِّينِ)) واتە: ((ئەی کۆمەڵانی قورەیش (نوێژەکانتان ئەنجام دەدەن و زەکاتی ماڵەکانتان دەبەخشن) یان ئەوەتا پیاوێکی خۆتان کەخودا دڵی پڕکردووە لەباوەڕ خودا زاڵی دەکات بەسەرتاندا لەگەردنتان دەدات لەسەر ئەو ئاینە)).

ئەبوبەکر ﵁ وتی: ئەو پیاوە منم ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: نەخێر، عومەریش ﵁ فەرمووی: ئەو پیاوە منم ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((لَا، وَلَكِنَّهُ خَاصِفُ النَّعْلِ فِي الْمَسْجِدِ)) وَقَدْ كَانَ أَلْقَى نَعْلَهُ إِلَى عَلِيٍّ يَخْصِفُهَا (وَأَبَى أَنْ يَرُدَّهم) ثُمَّ قَالَ: علي: أَمَا أَنِّي سَمِعْتُهُ يَقُولُ:..)) واتە: (نەخێر ئەو پیاوە ئەو کەسەیە کە ئەو نەعلەی بەدەستەوەیەو چاکی دەکات لەئەم مزگەوتەدا). پێشتر پێغەمبەر ﷺ هەردوو نەعلەکەی دابووە عەلی ﵁ تا بۆی چاك بکات. پێغەمبەر ﷺ هەرگیز قایل نەبوو ئەو موسوڵمانانە بگێڕێتەوە بۆ کۆیلایەتی و ژێردەستەیی ئەوان.....). پاشان عەلی ﵁ دەڵێت: گوێم لێبوو پیغەمبەری خوا ﷺ دەی فەرموو: ((لَا تَكْذِبُوا عَلَيَّ فَإِنَّهُ مَنْ يَكْذِبْ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَلِجِ النَّارَ))[٤٥٢] واتە: درۆ مەکەن بەدەمی منەوە ئەوەی درۆ بەناوی منەوە هەڵببەستێ دەچێتە دۆزەخەوە.

### ١٥. پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی قورئان خوێندندا سوجدە دەبات:

جارێکیان هەر لەمەککە پێغەمبەر ﷺ چەند ئایەتێکی قورئانی خوێندەوە کە سوجدە بردنی تێدابوو، خۆی سوجدەی برد لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە لەوێ بوون. عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵁ دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ لەساتەکانی دوای ئازادکردنی شاری مەککەدا

(٤٥٢) أخرجه: الحاكم (١٣٨/٢) و (٩٨/٤) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي وقال محققه (٧٨٨٩): صحيح والزيادة للحاكم وابي داود نبحوه (٢٧٠٠) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٣٤٩).

قورئانی خوێند هەموو خەڵکی لەوێ کڕنوش و سوجدەیان بۆ خودا برد هەتا ئەوانەی سواربوون لەسەر دەستییان ناوچەوانیان دادەناو سوجدەیان دەبرد)[٤٥٣].

**١٦. هاوارو قیژەی ئیبلیس:**

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێك مەککەی ئازادکرد ئیبلیس هاوارو قیژەیەکی کرد هەموو سەربازەکانی خۆی لێی کۆبوونەوە ئینجا وتی: لێرە بەدواوە بێ ئومێدبن لەوەی ئوممەتی موحەممەد لەسەر هاوتا بۆخوا دانان ببینن، بەڵام وەریانگێڕن لە ئاینەکەیان و شین و شەپۆڕیان لەناودا بڵاو بکەنەوە)[٤٥٤].

**١٧. قەدەغەکردنی نیکاحی موتعە:**

سەبرەی کوڕی مەعبەدی جوهەنی ﷺ دەفەرموێت : (لەڕۆژانی ئازادکردنی شاری مەککەدا سەرەتا پێغەمبەر ﷺ ڕێگای نیکاحی موتعەی داین تا سێ ڕۆژ..... دواتر لێی قەدەغەکردین)[٤٥٥]. فەرمووی: ((أَلَا إِنَّهَا حَرَامٌ مِنْ يَوْمِكُمْ هَذَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ...))[٤٥٦]. واتە: ئاگاداربن ئەو کارە قەدەغەیە لێتان لەم ڕۆژەتانەوە هەتا ڕۆژی کۆتایی....).

**١٨. ڕوونکردنەوەی سەروەری و گەورەیی قوڕەیش:**

پێغەمبەر ﷺ داوای لەعومەری کوڕی خەتاب کرد هەموو قوڕیش کۆبکاتەوە، هەموو کۆبوونەوە وتارێکی بۆدان: ڕیفاعەی کوڕی ڕافیع ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بەعومەری کوڕی خەتابی فەرموو: ((اجْمَعْ لِي قَوْمَكَ يا عُمر)) واتە: ((هەموو خزمەکانتم بۆ کۆبکەرەوە)) ئەویش هەموویانی بۆ کۆکردەوەو چوونە بەردەم دەوارەکەی، پاشان عومەر چووە ژوورەوەو وتی: هەموو خزمەکانم بۆ کۆکردیتەوە. ئەنصارییەکانیش کە ئەومیان بیست وتیان: دیارە ئایەت سەبارەت بەقورەیش دابەزیوە. لەبەرئەوە زۆریان هاتنە ئەو جێگەیە تا ببینن و ببیستن چییان پێ دەوترێت، پاشان

(٤٥٣) أخرجه: البخاري (١٠٧٨، ١٠٧٩)، ومسلم (١٥٧٥)، وابوداود (١٤١٢)، والحاكم (٢١٩/١) وصححه ووافقه الذهبي. واللفظ للحاكم.

(٤٥٤) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٩/١٢)، وحسّنه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٣٤٦٧).

(٤٥٥) أخرجه: البخاري (٥٦)، ومسلم (١٤٠٥)، وأحمد (١٥٢٤) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما، وابوداود (٢٠٧٢)، وابن ماجة (١٥٩٨)، وابن حبان (٤١٤٦)، والطبراني (٦٥٢٧)، وابويعلى (٩٣٨).

(٤٥٦) أخرجه: مسلم (١٤٠٦)، والحميدي (٨٤٦)، والنسائي (٣٣٦٨)، وابم ماجة (١٩٦٢).

پێغەمبەر ﷺ چووە دەرەوەو لەناویاندا وەستاو فەرمووی: ((هَلْ فِيكُمْ مِنْ غَيرِكُمْ))؟ واتە: ((ئایا کەسی ترتان لەناودایە جگە لەخۆتان))؟ وتیان: بەڵێ هاوپەیمان و لایەنگرو خوشکەزاکانی خۆمانمان لەگەڵدایە. فەرمووی: ((حَلِيفُنَا مِنَّا وَابْنُ أُخْتِنَا مِنَّا، وَمَوْلَانَا مِنَّا، أَنْتُمْ تَسْمَعُونَ، إِنَّ أَوْلِيَائِيَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْمُتَّقُونَ، فَإِنْ كُنْتُمْ أُولَئِكَ فَذَاكَ وَإِلَّا فَانْظُرُوا لَا يَأْتِ النَّاسُ بِالْأَعْمَالِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَتَأْتُونَ بِالْأَثْقَالِ، (تَأْتُونَ بِالدُّنيا تَحْمِلونَها على رِقَابِكُمْ ، فتَقُولونَ : يا محمدُ ! فأقولُ هكذا و هكذا : لا (وَأَعْرَضَ فِي كِلَا عِطْفَيْهِ))[٤٥٧] واتە: ((هاوپەیمانانمان لەئێمەن وە لایەنگرانمان لەئێمەن وە خوشکەزاکانمان لەئێمەن ئێوە باش گوێ بگرن: پیاوچاکان لەناو ئێوەدا لەڕۆژی کۆتاییدا ئەوانەتانن کە گوێ ڕایەڵ و خۆدوورگرن لەحەرام، ئەگەر ئێوە لەوانن ئەوا باشە، گەر واش نەبێت تەماشاکەن ئێوە وا مەبن خەڵکی لەڕۆژی کۆتایدا بەکاری چاکەی زۆرەوە بێن و ئێوەش باری گرانی (دونیاتان بەسەر ملتان هەڵبگرن ئینجا دێن دەڵێن: ئەی موحەممەد (فریامان کەوە) منیش بەهەردوو لادا ڕووتان لێ وەردەگێڕم)) .

پاشان دەنگی بەرزکردەوەو هەردوو دەستی بەرزکردەوە بەسەر قوڕەیشییەکانداو دای دەناو دەیفەرموو: ((أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ قُرَيْشًا أَهْلُ أَمَانَةٍ مَنْ بَغَاهُمُ الْعَوَاثِرَ  يَقُولُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ))[٤٥٨] واتە: ((خەڵكینە قوڕەیش کەسانێکی ئەمانەت پارێزن هەرکەسێك بەدوای ئابڕوچوونیان بکەوێت خودا لەسەر ڕوو دەیدا بەزەویدا)) سێ جار ئەوەی دووپات کردەوە)). هەروەها فەرمووی: ((النَّاسُ تبَعٌ لقريشٍ في الخيرِ والشَّرِّ))[٤٥٩] واتە: خەڵكی هەموو پاشکۆی قوڕەیشن لەخێرو شەڕدا وە دەیفەرموو: ((مَن يُرِدْ هَوانَ قُرَيشٍ، أهانَهُ اللهُ))[٤٦٠]. واتە: هەر کەسێك سوکی و ڕیسوایی قوڕەیشی بووێت خودا ئەو کەسە سوك و ڕیسوا دەکات.

---

(٤٥٧) أخرجه: البخاري (الادب المفرد) (٨٩٧) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الادب المفرد) (٦٨٨)، و (الصحيحة) (٧٦٥)، و (الظلال) (٤٨٦).

(٤٥٨) أخرجه: البخاري (الادب المفرد) (٧٥)، والطبراني (الكبير) (٤٥٤٤)، وأحمد (٣٤٠/٤)، وحسنه الشيخ الالباني في (الصحيحة) و (١٦٨٨) و (صحيح الادب المفرد) (٥٥).

(٤٥٩) أخرجه: مسلم (١٨١٩).

(٤٦٠) أخرجه: الحاكم (٧٤/٤) وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١١٧٨).

# غەزای حونەین

پێغەمبەری خوا ﷺ نۆزدە ڕۆژ لەشاری مەککە مایەوە[٤٦١]. لەڕاستیدا ئازادکردنی شاری مەککە پەرچەکردارێکی بەهێزی لێ کەوتەوە لەلایەن تێکڕای هۆزەکانی عەرەب و بەتایبەتیش هۆزی گەورەی هەوازن و سەقیف، ئەوان دەیان ویست گورزێکی توند لەموسوڵمانان بوەشێنن پێش ئەوەی لایەنگرانیان زیاد بێت و دەسەڵاتیان فراوانتر بێت و بەهێزتر بن. هەوازن دڵنیا بوون لەوەی پاش ماوەیەکی تر سەرەی ئەوانیش دێت و هێزی سەربازەکانی موسوڵمانان دەگاتە ناوچەکەیان و لەبەرانبەریشدا ئەوان هێزو دەسەڵاتیان جار لەدوای جار لاوازتر دەبێت و تواناو دەسەڵاتیان لەدەست دەدەن، لەئەنجامدا خۆیان بەتەنها لەبەردەم لافاوی موسوڵماناندا دەمێننەوە. ئەوان هەر لەسەرەتای دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ لەمەدینە لەو باوەڕەدابوون کەبەرەو ئەوان هێرش دەهێنێت و لەگەڵیاندا دەکەوێتە جەنگەوە. لەدوای ئەوەی خودا پێغەمبەرەکەی ﷺ زاڵکرد بەسەر مەککەدا و دواتر هەموو موسوڵمان بوون، لەوکاتەدا سەرانی هەوازن بەهۆزەکەیان وت: ئێستا ئەوان دەستبەتاڵ بوون بۆ ئێمەو هیچ شتێکیش نییە ڕێگری بکات کەواتە بۆچوونی ڕاست لەوەدایە کە ئێمە دەستپێشخەری بکەین و هێرش بەرینە سەریان.

بەوجۆرە کەوتنە خۆ ئامادەکردن و دروست کردنی بەرەیەکی بەهێز لەهۆزەکانی غەتەفان و بەنونەسری خزمانی مالیکی کوڕی عەوفی نەسری و بەنوجوشمی خزمانی دورەیدەی کوڕی صوممە، وبەنو سەعدی کوڕی بەنوبەکر کە لەوکاتەدا پێغەمبەریان ﷺ لەئامێز گرتبوو و بەنو هیلال و کەسانێکی بەنوعەمری کوڕی عامرو عەوفی کوڕی عامر و سەقیف و هاوپەیمانەکانی و تێکڕای بەنومالیك، بەڵام دوو لایەنی بەهێزی هەوازن بڕیاریاندا بەشداری نەکەن ئەوانیش بەنوکەعب و بەنو کیلاب بوون. بەوجۆرە هەوازن لەماوەیەکی کەمدا توانیان هێزێکی گەورە ئامادە بکەن کە ژمارەیان دەگەیشتە بیست هەزار وەك هەندێك سەرچاوە ئاماژەی پێ دەکەن.

پێغەمبەر ﷺ عەبدوڵلای کوڕی حەدرەد وەك هەواڵگرێك دەنێرێت تا هەواڵی بۆ

---

(٤٦١) أخرجه: البخاري.

بهێنێت: لەدوای گەیشتنی هەواڵی جموجۆڵەکانی هەوازن و هۆزەکانی تر، پێغەمبەر ﷺ یەکێك لەهاوەڵانی نارد تا خۆی بگەیەنێتە ناو ڕیزەکانیان و هەموو هەواڵەکانیان بزانێت و پاشان بگەڕێتەوە.

جابر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەدوای تەواوبوونی لەئازادکردنی شاری مەککە. مالیکی کوڕی عەوفی نەسری و بەنی جوشم و بەنی سەعدو بەنی هیلال لەگەڵ کەسانێکی بەنی عەمرو بەنی عەوف و هاوپەیمانانی سەقیف و بەنی مالیك هەموو ئەوانە پێکەوە بەرمیەکیان ئامادەکردو لەشکر کێشییان ئەنجامداو هێزەکانیان لەگەڵ ژن و منداڵەکانیان هەموو پێکەوە جوڵاند. کاتێك ئەو هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر ﷺ عەبدوڵلای کوڕی حەدرەدی نارده ناویان و پێی فەرموو: ((اذْهَبْ فَادْخُلْ بِالْقَوْمِ حَتَّى تَعْلَمَ لَنَا مِنْ عِلْمِهِمْ)) واتە: ((برۆ تا دەچیتە ناویان پاشان هەواڵیانمان بۆ بهێنە)).

عەبدوڵلا ڕۆیشت و چووە ناویان و یەك دوو ڕۆژ لەناویان مایەوەو لەشەودا لەمالیکی کوڕی عەوف نزیك بووەوەو گوێی لێ بوو ئامۆژگاری هاوەڵانی دەکردو دەی وت: کە ڕۆژ بووەوە هێرشیان بکەنە سەر وەك هێرشی یەك پیاو و کیفی شمشێرەکانتان بشکێنن و ژنان و ئاژەڵانتان بەڕیز لەدوای خۆتان ڕاوەستێنن و پاشان هێرشیان بکەنە سەر)[٤٦٢]. دواتر عەبدوڕەحمان گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ و هەموو هەواڵەکانی پێ گەیاندو پێغەمبەر ﷺ بەعومەری کوڕی خەتتابی فەرموو: (أَلَا تَسْمَعُ مَا يَقُولُ ابْنُ أَبِي حَدْرَدٍ؟) ((گوێت لێ نییە کوڕەکەی ئەبوحەدرەد چی دەڵێت))؟ عومەریش وتی: ئەو درۆ دەکات. عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوحەدرەدیش پێی وت: منت بەدرۆ خستەوە پێشتریش لەمن چاکترت بەدرۆ خستەوە. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((أَلَا تَسْمَعُ مَا يَقُولُ ابْنُ أَبِي حَدْرَدٍ؟)) واتە: ((گوێت لێ نییە کوڕەکەی ئەبوحەدرەد چی دەڵێت؟)) پاشان پێی فەرموو: ((قَدْ كُنْتَ يَا عُمَرُ ضَالًّا فَهَدَاكَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ))[٤٦٣] واتە: ((تۆش پێشتر سەر لێ شێواو بوویت پاشان خوای گەورە هیدایەتی دایت)).

---

(٤٦٢) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٨٤)، والبيهقي (الدلائل) (١٣٠/٥).

(٤٦٣) أخرجه: الحاكم (٤٨/٣) وصححه ووافقه الذهبي وقال محققه (٤٤٢٦): اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (الارواء) (٣٤٤/٥).

# خۆئامادەکردن بۆ جەنگەکە

لەدوای کۆکردنەوەی هەواڵە سەربازییەکان و تێگەیشتن لە مەرامەکان و ئامانجەکانی دوژمن وحاڵی بوون لەمەترسییەکانی دواخستنی هێرش کردنە سەریان، پێغەمبەر ﷺ ئامادەبوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان هەرچەندە کەرستەکانی جەنگ و پێویستییەکانی وەك وشترو قەڵغان بوونی بوو جەیەکی پێویست بۆ ئەو سوپا گەورەیە لەئارادا نەبوو، بەڵام پێغەمبەر ﷺ چەندەها قەڵغانی لەسەفوان خواست، هەروەها سی وشتری تریشی لە یەعلای کوڕی سەفوان خواست، سێ هەزار ڕمیشی لە نەوفەل خواست.

موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەین ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا هێرش بباتە سەر هەوازن و ڕووبەڕوویان ببێتەوە، پێی وترا: سەفوانی کوڕی ئومەییە چەندەها قەڵغان و چەکی هەیە. پێغەمبەر ﷺ ناردی بەدوایدا پێی فەرموو: ((يَا صَفْوَانُ هَلْ عِنْدَكَ مِنْ سِلَاحٍ؟))[٤٦٤] ((يا أبا أُمَيَّةَ، أعِرْنا سلاحَك هذا، نَلْقَى فيه عدوَّنا غدًا)) واتە: ((سەفوان ئایا چەکت لەلا هەیە؟))، ئەی باوکی ئومەییە ئەو چەکانەی خۆتمان پێ بسپێرە تا ڕووبەڕووی دوژمنەکەمانی پێ ببینەوە)) سەفوان وتی: لێم زەوت دەکەیت ئەی موحەممەد؟ فەرمووی: ((بَلْ عَارِيَةٌ مَضْمُونَةٌ حَتَّى نُؤَدِّيَهَا إِلَيْكَ)) ((بەڵکو سپاردەیەکی مسۆگەر دەبێت لەلامان تا بۆتی دەگێڕینەوە)) وتی: کەواتە خراپ نییە، سەفوان سەد قەڵغان و چەکی دایە پێغەمبەر ﷺ[٤٦٥]. وا باسی دەکرێت کە پێغەمبەر ﷺ داوای لێکردووە کە بۆی بگەیەنێتە شەڕگەکە[٤٦٦].

جابریش ﷺ دەفەرموێت: ((ثُمَّ بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ فَسَأَلَهُ أَدْرَاعًا مِائَةَ دِرْعٍ، وَمَا يُصْلِحُهَا مِنْ عِدَّتِهَا، فَقَالَ: أَغَصْبًا يَا مُحَمَّدُ؟ قَالَ: «بَلْ عَارِيَةٌ مَضْمُونَةٌ حَتَّى نُؤَدِّيَهَا إِلَيْكَ»))[٤٦٧] واتە: ((پاشان پێغەمبەر ﷺ کەسێکی ناردە لای سەفوان تا سەد قەڵغان

---

(٤٦٤) أخرجه: ابوداود (٣٥٦٣)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٣٠٤٣).

(٤٦٥) في رواية ابي داود (٣٥٦٣) (فاعطاهُ ما بين الثلاثين الى الأربعين درعاً).

(٤٦٦) أخرجه: ابن هشام (٥٥/٤)، والطبري (٧٢/٣)، وابوداود (٣٥٦٢)، والحاكم (٤٨/٣)، والبيهقي (٨٩/٦)، وقال مجدي السعيد (صحيح سيرة ابن هشام) (١٧٤١): حديث صحيح.

(٤٦٧) أخرجه: الحاكم (٤٨/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الكبرى) (٨٩/٦)، وحسنه الشيخ الالباني في (الارواء)

و کەرستەکانی بۆ بنێرێت. سەفوان وتی: ئایا لێم زەوت دەکەی ئەی موحەممەد؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڵکو سپاردەیەکی زەمانەتکراو دەبێت لەلامان تا دواتر بۆتی دەگێڕینەوە.))

لە گێڕانەوەیەکی تردا: یەعلای کوڕی ئومەییە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((إِذَا أَتَتْكَ رُسُلِي فَأَعْطِهِمْ ثَلَاثِينَ دِرْعًا، وَثَلَاثِينَ بَعِيرًا)) واتە: ((گەر نێرراوەکانم هاتنە لات سی وشترو سی قەڵغانمان بدەرێ)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا دواتر بۆمانی دەگێڕیتەوە؟ فەرمووی: ((بل مؤداة))[٤٦٨] واتە: ((بەڵێ بۆتانی دەگێڕمەوە)). لەگێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ چل هەزار درهەمی لە حوەیتیبی کوڕی عەبدولعەزیز بەقەرز وەرگرت[٤٦٩]، وە سێ هەزار ڕمی لەنەوفەلی کوڕی حاریسی کوڕی عەبدولموتەلیب وەك یارمەتی وەرگرت. پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: ((كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رِمَاحِكَ تُقْصَفُ فِي أَصْلَابِ الْمُشْرِكِينَ))[٤٧٠] واتە: ((ئێستا لەبەرچاومە کە ڕمەکانت پشتی موشریکەکان دەشکێنن)).

## بەڕێکەوتن بەرەو دوژمن

هەرچەندە پێویستی و کەل وپەلە سەربازییەکان سنووورداربوون، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بڕیاری خۆئامادەکردنیدا بۆ لەشکرکێشی ڕووەو دوژمن. لەو کاتەدا: عیتابی کوڕی ئوسەیدو معازی کوڕی جەبەلی ﷺ بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی شاری مەککە دیاری کرد، هەروەها ڕۆژی پێنج شەممەی بەرواری پێنجی شەوالی دیاری کرد بۆ لەشکرکێشیەکە[٤٧١].

---

(٣٤٤،٣٤٩/٥) و (الصحيحة) تحت الحديث رقم (٦٣١)، وحسن اسناده أيضاً محققوا مسند أحمد تحت الحديث رقم (١٥٣٠٢).

(٤٦٨) أخرجه: ابوداود (٣٥٦٦)، والنسائي (٥٧٧٦)، وابن حبان (٤٧٢٠) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٦٣٠) والشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (١٢١٩).

(٤٦٩) أخرجه: الحاكم (٤٨/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الكبرى) (٨٩/٦)، وحسنه الشيخ الالباني في (الارواء) (٣٤٤/٥، ٣٤٩) و (الصحيحة) تحت الحديث رقم (٦٣١)، وحسن اسناده أيضاً محققوا مسند أحمد تحت الحديث رقم (١٥٣٠٢).

(٤٧٠) أخرجه: الحاكم (٢٤٦/٣)، وابن عبدالبر (الاستيعاب) (٥٣٧/٣) معلقاً.

(٤٧١) انظر: (فتح الباري) (٢٧/٨)، و(السيرة الصحيحة) (٤٩٥/٢)، و (صحيح السيرة) (٤٣١/٢)، و (السيرة في ضوء المصادر الأصلية) (ص:٥٨٣).

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر ﷺ دەفەرمویّت: (پێغەمبەر ﷺ عیتابی کوڕی ئوسەیدی کردە فەرمانڕەوای شاری مەککە بەسەر ئەوانەی کە لەشاردا مابوونەوە))[٤٧٢]. عورووش ﷺ دەفەرمویّت: (هەروەها پێغەمبەر ﷺ موعازی کوڕی جەبەلیشی کردە پێشەوای شاری مەککە بۆ ئەوەی قورئانیان فێربکات و لەئاینەکەیان شارەزا بکات....)[٤٧٣].

ژمارەی تێکڕای سوپاکەی پێغەمبەر ﷺ دە هەزار کەس بوون لەموسوڵمانەکان و دوو هەزاریش لەئازادکراوەکانی شاری مەککەیان لەگەڵ بوو، ئەنەس ﷺ دەفەرمویّت: (...پێغەمبەر ﷺ دە هەزار کەسی لەگەڵدا بوو، هەروەها ئازادکراوەکانیشی لەگەڵدا بوو)[٤٧٤].

عەبدوڵڵای کوڕی عیاز ﷺ دەفەرمویّت: (پێغەمبەر ﷺ هێرشی کردە سەر هەوازینەکان و دوازدە هەزار کەسی لەگەڵدا بوو)[٤٧٥].

لەم جەنگەدا زۆرینەی دانیشتوانی شاری مەککە بەشدارییان کرد کە هەندێکیان هێشتا موشریك بوون، بەڵام بەئومێدی دەست خستنی دەستکەوت و بینینی شکستی موسوڵمانەکان بەشدارییان کردبوو، موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرمویّت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ بەرەو حونەین ڕۆیشت تێکڕای سوارو پیادەکانی شاری مەککەی لەگەڵدا ڕۆیشت و ئافرەتانیشیان بەشدارییان کرد تەنها وەك چاودێرو بەئومێدی دەستخستنی دەستکەوت وە ئاسایی بوو لایان گەر پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی شکست بهێنن. ئەبوسوفیان لەدوای سوپاکەوە دەڕۆیشت هەر قەڵغان و شمشێرێکیان لێ بکەوتایە بانگی لەپێغەمبەر ﷺ دەکردو دەیوت: بیدەنە من تا بۆتان هەڵگرم. بەردەوام بوو لەوکارەی دا تا باری وشترەکەی بەتەواوی پڕکرد، سەفوانی کوڕی ئومەییەشیان لەگەڵ بوو خۆی کافربوو بەڵام ژنەکەی موسوڵمان بوو، پێغەمبەریش

---

(٤٧٢) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٥٦/٤) (٩٧٤)، وخليفه بن خياط (ص:٨٨) والبخاري (التاريخ الكبير) (١٥٤/٧) والطبري (التاريخ) (٧٣،٨٦/٣) مرسلاً عن عبدالله بن ابي بكر، والحاكم (٥٩٥/٣)، وحسن اسناده الحافظ (الاصابة) (٤٥١/٢)، وحسنه ايضاً الشيخ الالباني (فقة السيرة) ص٤٣٣، واورده البرزنجي في (صحيح الطبري) (رقم:٢٥٦).

(٤٧٣) أخرجه: الحاكم (المستدرك) (٢٧٠/٣) عن عروة بن الزبير ﷺ مرسلًا.

(٤٧٤) أخرجه: مسلم (١٠٥٩، ١٣٥).

(٤٧٥) أخرجه: الحاكم (المستدرك) (١٢١/٢) وصححه ووافقه الذهبي.

ﷺ لەیەکی جیا نەکردبوونەوە)[٤٧٦].

دەرچوونی موسوڵمانان بۆ ئەو جەنگە لەڕۆژێکی زۆر گەرمدا بوو، سەرەتا زۆر خێرا ڕۆیشتن[٤٧٧] بەڵام دواتر لەبەر گەرماو تەپوتۆز خاو دەڕۆیشتن، ئەو ڕۆژەو شەوەکەی هەر بەڕێگەوە بوون و دەڕۆیشتن، ئەبو عەبدولڕەحمانی فیهری ﷺ دەفەرموێت: (لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین لەغەزای حونەین دا، لەڕۆژێکدا ڕۆیشتین زۆر گەرم بوو بۆیە پێش نیوەڕۆ لاماندایە ژێر سێبەری درەختەکانی ئەو ناوچەیە، لەدوای نیوەڕۆ چەکەکەمم لەخۆبەست و سواری ئەسپەکەم بووم و چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەدەوارەکەیدا وتم: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ) وە پێغەمبەر فەرمووی (وَعَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ) وتم: ئێستا کاتی بەڕێکەوتنە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی ((بەڵێ)) وبانگی لە بیلال کردو فەرمووی: ((بیلال هەستە)). بیلالیش هەستا لەژێر سێبەری درەختێك دا سێبەرەکەی وەك سێبەری باڵندەیەك بوو وتی: بەڵێ فیدات بم ئەی پێغەمبەری خوا. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((کۆپانەکە بخەرە سەر پشتی ئەسپەکەم)) ئەویش کۆپانەکەی هێنا ئەملاوئەولای لیف بوو، هیچ جوانکاری و فیزێکی پێوە نەبوو، هێنای و خستییە سەر پشتی ئەسپەکەو پاشان پێغەمبەر ﷺ سواربوو، ئێمەش سواری وڵاخەکانمان بووین و (ئەو ڕۆژە) لەگەڵ ئێوارەو شەوەکەیدا هەر بەردەوام بووین لەڕۆیشتنەکەماندا)[٤٧٨].

## کوشتنی سیخوڕێکی دوژمن

لەڕۆژی دواتردا، کاتێك موسوڵمانەکان لەچێشتەنگاودا لایان دابووە ناوچەیەك بۆئەوەی بحەوێنەوەو نان بخۆن، لەو کاتەدا سیخوڕێکی دوژمن هاتە ناو موسوڵمانان تا هەواڵگرییان بەسەرەوە بکات، دواتر ویستی ڕا بکات بەڵام دەستگیر کراو کوژرا:

---

(٤٧٦) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) ص٢٨٤، وعنه البيهقي (الدلائل) (١٣٠/٥)، واورده ابن هشام (السيرة) (٥٥/٤) والذهبي (المغازي) (٥٧٢) وعن ابن اسحاق وعن الزهري وقد صرح بالتحديث.

(٤٧٧) أخرجه: الحاكم (المستدرك) (١٢١/٢) وصححه ووافقه الذهبي.

(٤٧٨) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (١٨٨٤٤)، وأحمد (٢٢٤٦٧) وقال محققه: حسن لغيره، والطيالسي (١٣٧١، ١٤٦٨)، وابوداود (٥٢٣٣)، والدارمي (٢٤٩٦) وقال محققه: اسناده قوي، والحاكم (١٣٠/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبزار (١٨٢٣)، والطبراني (الكبير) (٧٤١/٢٢)، والبيهقي (الدلائل) (١٤١/٥)، وصحح اسناده البوصيري كما في (الاتحاف) (٦٣١٣) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٤٣٦٠) واللفظ للطبراني والزيادات لابي داود والطيالسي.

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەفەرموێت: (لەجەنگی هەوازندا (واتە: حونەین) بەشداریمان کرد و (زۆرینەمان پیادەڕەو و بێ توانابووین) کاتێك ئێمە دانیشتبووین و نانی چێشتەنگاومان دەخوارد لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ گەنجێك بەسواری وشترێکی سوورەوە هات (سیخوڕی موشریکەکان) بوو وشترەکەی یخ لێداو پاڵی خست لەکۆپانەکەی گوریسێکی دەرهێناو قاچی وشترەکەی پێ بەستەوە، پاشان بەپێ هات تا لەگەڵماندا دانیشت و نانی لەگەڵ خواردین، بەوردی تەماشای ڕووخسارمانی دەکردو چاودێری دەکردین (ئێمەش هەندێکمان پیادەڕەو بووین و وڵاخەکانیشمان کەم و بێ توانا بوون (کاتێك ئەم دۆخەی بینی) وبەگفتوگۆ کردن سەرقاڵی کردبووین، لەناکاودا بەخێرایی دەرچوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((اطْلُبُوهُ، وَاقْتُلُوهُ)) ((مَنْ قَتَلَهُ، فَلَهُ سَلَبُهُ)) واتە: ((دوای کەون و بیکوژن (و هەرکەسێکیش بیکوژێت کەل وپەلەکەی بۆ ئەو دەبێت))). پیاوەکەش زۆر خێرا ڕۆیشت و چووە لای وشترەکەی و داینیشان و سواری پشتی بوو پاشان هەڵیسان و خێرا تاویدا[٤٧٩] (چونکە ئەو سیخوڕ بوو) پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ سواری وشترێکی ڕەشباو بوو کە چاکترین وڵاخی ئەو ناوە بوو، منیش بەڕاکردن دوای کەوتم، وشتری هاوەڵەکەمان لەدوای وشتری ئەوەوە بوو منیش کەمێك لەدوایەوە بووم، پێشی کەوتم و ڕەشمەی وشتری سیخوڕەکەم گرت و وشترەکەیم وەستاندو پاڵم خست، و یەکسەر شمشێرەکەم دەرهێناو لەگەردنیم داو سەری پەڕی، پاشان وشترەکەی و کەل وپەلەکەم هێنا بۆلای پێغەمبەر ﷺ و ئەو خەڵکەی لەپێشوازیماندا بوون و فەرمووی: ((مَنْ قُتِلَ الرَّجل)) واتە: ((کێ ئەو پیاوەی کوشت))؟ هەموو وتیان: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لَهُ سَلَبُهُ أَجْمَعُ))[٤٨٠] واتە: ((هەموو کەل وپەل ودەستکەوتەکەی بۆ سەلەمەیە)).

لەچەندەها گێڕانەوەی لاوازدا هاتووە کە مالیکی کوڕی عەوف سەرکردەی هەوازینەکان چەندەها سیخوڕی ناردبوو بۆ چاودێری کردنی جموجوڵەکانی موسوڵمانەکان و دواتر هەموویان بەترس و لەرزێکی زۆرەوە گەڕابوونەوە، ئومەییەی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەمر ﷺ دەفەرموێت: (مالیکی کوڕی عەوف چەندەها

(٤٧٩) أخرجه: البخاري (٣٠٥١) وابوداود (٢٦٥٣).

(٤٨٠) أخرجه: مسلم (١٧٥٤)ن وابوداود (٢٦٥٤)، وأحمد (١٦٥٢٣) وقال محققوه: اسناده على صحح على شرط مسلم، والطبراني (الكبير) (٦٢٤١)، وابن حبان (٤٨٤٣) وقال محققه: اسناده حسن على شرط مسلم.

پیاوی ناردبوو بۆ سیخوڕی کردن بەسەر موسوڵمانەکانەوە، دواتر هەموو بەترس و لەرزێکی زۆرەوە گەڕابوونەوەو پێی وتن: هاوار بۆ ئێوە ئەوە بۆ واتان لێ هاتووە؟ وتیان: چەندەها پیاوی ڕووخسار سپیمان دی بەسواری ئەسپی بەڵەکەوە بوون. ئیتر ئێمەش ئاوهامان بەسەرهات. ئەو بەسەرهاتەش مالیکی پەشیمان نەکردەوە لەو جەنگ و مەرامەی خۆی)[٤٨١].

## بەشداریکردنی ئازادکراوەکانی مەککە لەم غەزایەدا

ئازادکراوانی مەککە ئەوانەن کە تەنها ماوەی بیست ڕۆژە موسوڵمان بوون و هێشتا پاشماوەی بێ باوەڕی و موشریکی لە دڵ و دەرونیاندا ماوەتەوەو ژمارەیان دوو هەزار کەس بوو[٤٨٢] هەشتا کەسیان هێشتا کافرو موشریك بوون و موسوڵمان بوونی خۆیان ڕانەگەیاندبوو)[٤٨٣].

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (تێکڕای دانیشتوانی مەککە لەم غەزایەدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەشدار بوون هەتا ئافرەتانێکی زۆریشیان هاتبوون و لەڕیزەکانی دواوە بوون وەك چاودێرو بەئومێد بوون دەسکەوتەکانیان دەست بکەوێت و شکستی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەلایانەوە سادەبوو، عەبدوڵڵای کوڕی بەکری کوڕی حەزم ﷺ دەفەرموێت: ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ هاتبوو بۆ غەزای حونەین هەرچەندە موسوڵمان بوونی خۆی ئاشکرا دەکرد بەڵام تیری بەختەکانی لە کیفەکەیدا هێشتا پێ مابوو)[٤٨٤].

## درەختی شەخسەکە

بەشداربوونی ئازادکراوەکانی شاری مەککە هەندێك سەرەنجامی خراپی هەبوو بۆ موسوڵمانان، چونکە ئەوان تازەبوون و زۆر شتی نەریتی نەفامیان هێشتا تیا

---

(٤٨١) أخرجه: ابن هشام (٥٤/٤)، وفي الطبري (التاريخ) (٧٢/٣)، والبيهقي (الدلائل) (١٢٣/٥) واورد، البرزنجي في (ضعيف الطبري) (٣٢٥).

(٤٨٢) أخرجه: مسلم (١٥٣/١٠٥٩).

(٤٨٣) أخرجه: القسطلاني (المواهب) (١٦٢/١)، والزرقاني في (شرح المواهب) (٥/٣) من طرق ضعيفة كما في (السيرة على ضوء المصادر الاصلية) (ص:٥٨٥).

(٤٨٤) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٨٤)، وعنه البيهقي (الدلائل) (١٢٨/٥).

مابوو. نەفامانی پێشی ئیسلام گەر درەختێکی گەورەیان بدیایە پەڕۆو گرێ و شتیان پیا هەڵدەواسی و بەسەرچاوەی سەرکەوتن و ڕزق و بەرەکەتیان دەزانی، بۆیە مورو نوشتەو چاوەزاریان پیا هەڵدەواسی لەگەڵ شمشێرەکانیان بەئومێدی بەرەکەت و سەرکەوتن وە لەژێر سێبەرەکەی دەمانەوە، لەوێدا ئەو ئازادکراوە تازە موسوڵمانانە داوای شتێکی وایان کرد لەپێغەمبەر ﷺ بەڵام بۆی ڕوونکردنەوە ئەوە کارێکی قەدەغەکراو و هاوتا بۆ خوادانانە.

ئەبو واقیدی لەیسی ﷺ دەفەرموێت: (لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ چووین بۆ غەزای حونەین و ئێمە تازە موسوڵمان بووبووین، هێشتا نەفامی و بێ باوەڕیمان لەناودا مابوو، بێ باوەڕانی قوڕەیش و عەرەبەکان درەختێکی سەوزی گەورەیان هەبوو پێی دەوترا (درەختە پیاهەڵواسراوەکە) لەهەموو ساڵێکدا ڕۆژێك دەچوون و شمشێرەکانیان پیا هەڵدەواسی و ئاژەڵیان لەلا سەردەبڕی و لای دەمانەوە، ئێمەشی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بووین و لەو کاتەدا دار سیدرێکی سەوزی گەورەمان بینی و لەملاو ئەولاوە بانگمان لەپێغەمبەر ﷺ کرد: ئەی پێغەمبەری خوا تۆش دار شەخسێکمان بۆ دیاری بکە وەك چۆن ئەوان دار شەخسیان هەیە. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((اللّهُ أَكْبرُ قُلْتُمْ وَالذي نَفْسُ مُحمَدٍ بِيدهِ كَما قَالَ قَومُ مُوسى لموسى)) ﴿....ٱجْعَل لَّنَآ إِلَـٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿١٣٨﴾﴾ (الأعراف).

واتە: (اللّهُ أَكبر) سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئێوەش وەك شوێن کەوتووانی موسا بە موسایان وت: (ئەی موسا تۆش بتێکمان بۆ بکەرە خواوەند وەك چۆن ئەو خەڵکە بتیان هەیە، موساش فەرمووی: ئێوە خەڵکێکی گێل و نەزانن). پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إِنَّهَا السُّنَنُ (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنَّكُمْ) لَتَرْكَبُنَّ سَنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ (سُنَّةً سُنَّةً))[٤٨٥] ((سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە) ئێوەش شوێنی نەریتی کەسانی پێش خۆتان دەکەون نەریت بەنەریت (و بست بە بست و گەز بەگەز.....)).

(٤٨٥) أخرجه: عند الرزاق (٢٠٧٦٣) النسائي (الكبرى) (١١١٨٩)، والترمذي (٢١٨٠)، وأحمد (٢١٨٩٧،٢١٩٠٠) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما، والطيالسي (١٣٤٦)، وابويعلى (١٤٤١) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن حبان (٦٧٠٢) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والطبراني (الكبير) (٣٢٩٣)، ابن هشام (السيرة) (٥٨/٤) (٩٧٦) وقال محققه: اسناده حسن، وقال مجدي السيد (صحيح سيرة ابن هشام) (١٧٤٤): اسناده صحيح.

## سەرسامبوونی هەندێك موسوڵمانان بەژمارە زۆریی سوپاکەیان

لەو رێ رۆیشتنەیاندا هەندێك لەموسوڵمانان بە سەرسامییەوە وتیان: ئەمرۆ کەس ناتوانێت بەسەرماندا زاڵ بێت بەهۆی ژمارە زۆریمانەوە. ئەو وتەیەش زۆر گران و ناخۆش بوو لای پێغەمبەر ﷺ. رەبیعی کوڕی ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (لەپێش جەنگی حونەیندا پیاوێکمان وتی: ئیتر ئەمرۆ ناشکێین بەهۆی ژمارە کەمیمانەوە (واتە زۆرین). ئەو وتەیە پێغەمبەری ﷺ نیگەران کرد)[٤٨٦].

ئەنەسیش ﷺ دەفەرموێت: (لەکاتێکدا خەڵکی مەککەو مەدینە لەناو یەك سوپادا بوون، وترا: سوێند بەخوا لەدوای ئەوەی بوونە یەك ئیتر کەس ناتوانێت بەرەنگارمان ببێتەوە. پێغەمبەریش ﷺ ئەم وتەیە و سەرسام بوونانەی لا ناخۆش بوو)[٤٨٧]. سەعیدی کوڕی موسەیببیشی ﷺ دەفەرموێت: (ئەبوبەکری صدیق ﷺ لەو رۆژەدا بەپێغەمبەری ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ئیتر  بە پاساوی ژمارە کەمیمانەوە کەس ناتوانێت بەسەرماندا زاڵ بێت. خوای گەورەش ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ ۙ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ ۙ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾﴾(التوبة)[٤٨٨]. خاوەنی ئەو وتەیە لە هەندێك گێڕانەوەدا هاتووە کە (پێغەمبەر ﷺ بووە)[٤٨٩] لەهەندێکی تریاندا (گەنجێکی ئەنصاری بووە)[٤٩٠].

لەهەندێکی تریاندا (عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب بووە)[٤٩١]. وە لەهەندێکی تریاندا (پیاوێکی بەنی بەکر بووە یاخود سەلەمەی کوڕی سەلامە)[٤٩٢].

---

(٤٨٦) أخرجه: البـيهقي (الدلائل) (١٢٣/٥).

(٤٨٧) أخرجه: الحاكم (١٠١/٢).

(٤٨٨) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٨٦)، وابن قانع (معجم الصحابة) (٢٤٨/٢٢)، وابونعيم (معرفة الصحابة) (٢٤٥/٢).

(٤٨٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٦٠/٤) رقم (٩٧٩).

(٤٩٠) أخرجه: البزار (١٨٢٧)، وحسن اسناده الحافظ (الفتح) (٤٢/٨).

(٤٩١) أخرجه: البـيهقي (الدلائل) (١٢٤/٥)، والصالحي (السيرة الشامية) (٤٩٦/٥).

(٤٩٢) انظر: (السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية) (ص:٥٨٤).

## دوعاو نزای پێغەمبەر ﷺ

پێغەمبەر ﷺ دەترسا لە لەخۆبایی بوونی هەندێك لەهاوەڵانی بەژمارە زۆری سوپاکەوە، چونکە لەڕاستیدا سەرکەوتن بەهرەی خودایەو دەیبەخشێتە ئەوەی کەخۆی دەیەوێت لەدوای گرتنەبەری هەموو هۆکارەکانی بەدەست هێنانی سەرکەوتن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ .....وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾ ﴾ (آل عمران) واتە: سەرکەوتن تەنها بەدەستی خوای باڵادەست و کارجوانە، چونکە گەر بیەوێ سەرتان دەخات، هەروەها دەفەرموێت: ﴿ .....كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ..... ﴿٢٤٩﴾ ﴾ (البقرة) واتە: گەلێ جار بەفەرمانی خوا کۆمەڵێکی کەم بەسەر کۆمەڵێکی زۆردا سەرکەوتوون، واتە: زاڵبوون وسەرکەوتن بەژمارەی زۆر و کەم نیە، بەڵکو هەر بەئیرادە و فەرمانی خوایە. هەروەها دەفەرموێت: ﴿ .....إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ..... ﴿٧﴾ ﴾ (محمد) واتە: ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە! دڵنیابن ئەگەر ئێوە یارمەتی ئایینەکەی خوا بدەن، ئەوا بێگومان خوایش یارمەتی ئێوە دەدا و بەسەر دوژمنانتاندا سەرتان ئەخات.

سوهەیب ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕۆژانی پێش جەنگی حونەیندا (لەدوای نوێژی بەیانی هەردوو لێوی دەجوڵاند دوعایەکی دەخوێند) کەپێشتر ئەو دوعایەی نەدەخوێند، ئێمە وتمان ئەی پێغەمبەری خوا دەبینین کارێك دەکەیت کە پێشتر نەت دەکرد، ئەوە هەردوو لێوت دەجوڵێنیت چی دەخوێنیت (لەدوای نوێژی بەیانی)؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئایا ئاگاتان لێم بووە))؟ یەکێك وتی: بەڵێ. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

((إِنِّي ذَكَرْتُ نَبِيًّا مِنَ الأَنْبِيَاءِ أُعْطِيَ جُنُودًا مِنْ قَوْمِهِ) (و) أَعْجَبَتْهُ كَثْرَةُ أُمَتِهِ فَقَالَ: ( مَنْ يَقُومُ لِهَؤُلاءِ؟)؟) فَأَوْحَى اللهُ إِلَيْهِ: أَنْ خَيِّرْ أُمَّتَكَ بَيْنَ إِحْدَى ثَلَاثٍ: إِمَّا أَنْ نُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ غَيْرِهِمْ فَيَسْتَبِيحَهُمْ، أَوِ الْجُوعَ، وَإِمَّا أَنْ أُرْسِلَ عَلَيْهِمُ الْمَوْتَ، فَشَاوَرَهُمْ، فَقَالُوا: أَمَّا الْعَدُوُّ، فَلَا طَاقَةَ لَنَا بِهِمْ، وَأَمَّا الْجُوعُ فَلَا صَبْرَ لَنَا عَلَيْهِ، وَلَكِنِ الْمَوْتُ وفي رواية [فقالوا: فَقَالُوا: أَنْتَ نَبِيُّ اللَّهِ، نَكِلُ ذَلِكَ إِلَيْكَ، خِرْ لَنَا، فَقَامَ إِلَى الصَّلاةِ، وَكَانُوا إِذَا فَزِعُوا، فَزِعُوا إِلَى الصَّلاةِ، فَصَلَّى مَا شَاءَ اللَّهُ، فقال: اي ربِّ أَمَّا عَدوهُمْ مِنْ غَيرِهِمْ وَالجُوع فَلا وَلكِنْ المَوت] فَأَرْسَلَ عَلَيْهِمُ الْمَوْتَ ، فَمَاتَ مِنْهُمْ فِي ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ

سَبْعُونَ أَلْفًا، (فَهَمْسِي الَّذِي تَرَوْنَ أَنِّي أَقُولُ: اللهُمَّ يا رَب بِكَ) أُحَاوِلُ وَبِكَ أُصَاوِلُ وَبِكَ أُقَاتِلُ ( ولا حولَ ولا قوَّةَ إلَّا باللهِ))[٤٩٣].

واتە: ((من یادی یەکێك لە پێغەمبەرانی خوا دەکەمەوە خودا سەربازێکی زۆری پێ بەخشی بوو لە گەلەکەی، و ئەو سەرسام بوو بەژمارە زۆری شوێنکەوتووانی وتی: کێ دەتوانێت لەڕووی ئەمانەدا بوەستێتەوە، خوای گەورەش نیگای بۆ کرد: شوێنکەوتووانت سەرپشك بکە لەنێوان یەکێك لەو سێ شتەدا: یان ئەوەتا دوژمنێکی جیاواز لەخۆیان زاڵدەکەم بەسەریانداو ڕیشەکێشیان بکات، یان برسێتی زاڵدەکەم بەسەریاندا یان بەمردن لەناویان دەبەم، پێغەمبەرەکەش ڕاوێژی پێکردن و ئەوان وتیان: توانامان تێدا نییە دوژمنمان بەسەردا زاڵبێت وە ئارامگریشمان نییە لەسەر برسیەتی، بەڵام مردن هەڵدەبژێرین لەگێڕانەومیەکی تردا (وتیان: تۆ پێغەمبەری خودای هەمووی بۆلای تۆ دەگێڕینەوە تۆ یەکێك لەوانەمان بۆ هەڵبژێرە، پێغەمبەرەکەشیان دەستی کرد بەنوێژکردن و ئەوان هەر کارێکی مەترسیداریان لێ بهاتایەتە پێش پەنایان بۆ نوێژکردن دەبرد، پێغەمبەرەکەیان تا خودا ویستی لێ بوو نوێژی کرد.... و پاشان وتی: ئەی خوای پەروەردگار دوژمن و برسیەتی زاڵکردن بەسەریاندا هەڵنابژێرم بەڵام مردنیان بۆ هەڵدەبژێرم). دواتر خوای گەورە مردنی نارده سەریان و تەنها لەسێ ڕۆژدا حەفتا هەزاریان لێ مرد (منیش ئەوەی بەچپە دەیڵێم ئەومیە: ئەی خوای پەروەردگار بەتۆ هێرشیان دەبەمە سەر بەتۆ کۆشش دەکەم بەتۆ لەگەڵیان دەجەنگێم وە هیچ تواناو خۆ لادانێکم نییە بەبێ یارمەتی تۆ).

## هەوازن دادەبەزنە ناوچەی ئەوتاس

هەوازن و سەقیف پێشڕەویان کردو لەناوچەی ئەوتاس لایانداو پیاوێکی بەساڵاچووی هۆزی بەنی جوشمیان لەگەڵ بوو کە زاناو کارناس بوو بەجەنگ و سەرکردایەتی ناوی (دورەیدی کوڕی ئەلصومە) بوو، هێنابوویان تا کەڵك لەزانیارییە

(٤٩٣) أخرجه: عبدالرزاق (٣٩٧٥١)، والنسائي (الكبرى) (٨٦٣٣)، وأحمد (١٨٩٤٠،١٨٩٣٧) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والطبراني (الكبير) (٧٣١٨) وفي (الدعاء) (٦٦٤) وقال محققه: اسناده صحيح، والدارمي (١٣٦١)، والبيهقي (الكبرى) (١٨٢٤٥)، والقضاعي (١٤٨٣)، وابن السني (١١٧) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن حبان (١٩٧٥،٤٧٥٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الالباني يرحمه الله في (الصحيحة) (١٠٦١).

سەربازیەکانی وەرگرن. دواتر دەمەقاڵەیەك لەنێوان ئەو و مالیکی کوڕی عەوف دا ڕوویدا، چونکە مالیك دەیویست گۆڕەپانی جەنگەکە بباتە ناوچەی حونەین و پێشی موسوڵمانان بکەوێت بۆ خۆگەیاندنە ئەو ناوچە بەردەڵانەی کە دەربەندێك بوو لەنێوان دوو چیادا، لەوێدا ئەسپ سوارەکانی بەڕیز ڕێك بخات لەبەرانبەر موسوڵمانەکان و بۆسەیەکی گەورەیان بۆ دابڕێژێت و موسوڵمانان بەناچاری بهێنێتە ناو ئەو دەربەندە وە لەڕێی پاشەکشەیەکی پلان بۆ دانراو تا دواتر لەهەموو لایەکەوە تیر بارانیان بکەن.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك هەواڵەکانی ئازادکردنی شاری مەککە گەیشتە هۆزی هەوازن، مالیکی کوڕی عەوفی نەضیری هەموو هەوازنی کۆکردەوە لەگەڵ هۆزەکانی سەقیفدا، هۆزەکانی نەصرو جوشم و سەعدی کوڕی بەکریان هەموو لەگەڵ بوو، بەیارمەتی کەسانێك لەهۆزی بەنی هیلال، بەڵام هۆزی قەیسی کوڕی عەیلان تەنها چەند کەسانێکیان لەم جەنگەدا ئامادەبوون و زۆربەیان لەگەڵیان دا نەهاتن، هۆزەکانی کەعب و کیلابیش هیچ یەکێکیان ئامادەی ئەم جەنگە نەبوون. لەهۆزی بەنی جوشم پیاوێکی بەساڵاچوویان لەگەڵ بوو کەناوی (دورەیدی کوڕی ئەلصومە) بوو توانای جەنگ کردنی نەمابوو، بەڵام لەبەر شارەزایی بەجەنگەکان هێنابوویان تا کەڵك لە بۆچوونەکانی وەرگرن چونکە بەڕاستی کارناسی جەنگ بوو. لەهۆزی سەقیفیشدا دوو ناوداریان لەگەڵ بوو ناویان: (قاریبی کوڕی ئەلئەسوەد) لەبەنی موعتیب، (سەبیعی کوڕی ئەلحاریس کوڕی مالیك و براکەی ئەحمەدی کوڕی حارس) و پێشەوای گشتی هەموویان مالیکی کوڕی عەوف بوو.

کاتێك مالیك بڕیاری لەشکرکێشیدا دژ بە موسوڵمانان بڕیاریدا هەموو منداڵ و ئافرەت و سامانەکانیان لەگەڵ خۆیان دا بهێنن کاتێك لەناوچەی ئەوتاس لایاندا، دورەیدی کوڕی ئەلصومەیان لەکەژاوەکەیدا بۆ لا هێناو وتی: لەچ شیوێك لاتان داوە؟ وتیان: لەئەوتاس. وتی: بەڵێ شیوێکی گونجاوە بۆ ئەسپ سوارەکان نەئەوەیە بەردەڵان و ڕەق وتیژ بێت نەئەوەشە کە خۆڵەکەی نەرم و خلیسك بێت، بەڵام بۆ دەنگی گوێ درێژو وشترو مەڕو گریانی منداڵ دەبیستم؟ وتیان: مالیکی کوڕی عەوف بڕیاریداوە هەموو جەنگاوەرەکان پێویستە سامانەکانیان و ژن و منداڵەکانیان لەگەڵ بێت. وتی: کوا مالیك؟ دواتر بۆیان بانگکرد کاتێك هات پێی وت: مالیك ئێستا تۆ

سەرکردەی هۆزەکەی خۆتی، ئەمرۆش ڕۆژێکە تێکڕای ڕۆژەکانی دواتری پێوە بەندە، بۆچی من دەنگی بۆڕە بۆڕی وشترو زەڕە زەڕی گوێ درێژو باعە باعی مەڕو مەڵات و گریانی منداڵان دەبیستم؟ وتی: بڕیارێکی بەو جۆرەم داوە.

وتی: بۆچی؟ وتی: ویستومە لەدوای هەموو جەنگاوەرێکەوە هاوسەرو منداڵەکانی لەدواوە بێت تا پارێزگارییان لێ بکات. دورەید دەنگی بەسەردا بەرز کردەوەو هاواری لێکرد وتی: بەڕاستی تۆ تەنها شیاوی ئەوەی کە شوانی مەڕ بیت، بۆ گەر پیاو بەزیو ڕایکرد هاوسەرو منداڵی دەیگێڕێتەوە. تۆ تەنها سوود لەشیرو ڕمی جەنگاوەرەکان وەردەگریت، خۆ گەر لەجەنگەکە شکستت خوارد ئەوا ڕیسوا دەبیت و تەواوی هاوسەرو منداڵ و سامانەکەت لەدەست دەدەیت. پاشان دورەید وتی: هۆزی کەعب و کیلاب لەکوێن؟ وترا: ئامادەی ئەم جەنگە نەبوون؟ وتی: کەواتە ئازاکان و بوێرەکان لەم جەنگە بەشدار نەبوون، گەر ئەمڕۆ سەرکەوتنی لەدوا بووایە ئەوان ئێستا لێرە ئامادە دەبوون، من خۆزگە دەخوازم ئێوەش وەك ئەوان بەشداری ئەم جەنگە نەدەبوون، ئەی باشە کێ لێرە بەشدارە؟ وترا: دوو هۆزی عەوف و عەمری کوڕی عامیر. وتی: ئەو دووانە هەردووکیان لاوازن ناتوانن نە سوود بگەیەنن وە نە زیان. مالیك تۆ هەڵەیەکی گەورە دەکەیت بەوەی تێکڕای هۆزی هەوازن دەخەیتە بەردەم ئەسپەکانی دوژمن، وا مەکە بیان گێڕەوە بۆ بەرزاییەکانی ناوچە سەختەکانی خۆیان پاشان بەسوارەکانت ڕووبەڕووی دوژمن بەرەوە گەر سەرکەوتوو بیت تێکڕای هۆزەکەت لەدواوە پشتگیریت دەکەن، خۆ گەر سەرکەوتووش نەبوویت ئەوکات هاوسەرو منداڵ و سامانەکانت پارێزراو دەبن[٤٩٤].

مالیك وتی: نا سوێند بەخوا کاری وەها ناکەم و نەخشەی جەنگی خۆم ناگۆڕم، تۆش پیر بوویت و ئەقڵ و زانیارییەکانت کۆن بوون و لەدوات کەسانێکی تری شارەزا بەجەنگ لەئارادان، دورەید وتی: ئەی خانەدانەکانی هۆزی هەوازن سوێند بەخوا ئەوە نەخشەی جەنگی گونجاو نییە بۆ ئێوە، مالیك نهێنی و لاوازییەکانتان بە دوژمن ئاشکرا دەکات و ئەوان زاڵ دەکات بەسەرتاندا، دواتریش ڕا دەکات بۆ قەڵاکانی سەقیف و ئێوە بەتەنها بەجێ دەهێڵێت، لەبەر ئەوە بگەڕێنەوەو ئێرە بەجێ بهێڵن.

---

(٤٩٤) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٥٣/٤) معلقاً، ورواه الذهبي (المغازي) (ص:٥٧٣) باسناده حسن من حديث جابر موصولاً، وانظر: (السيرة النبوية في مصادرها الاصلية) (ص:٥٨١).

مالیك شمشێرەکەی خۆی دەرکردو دەسکەکەی لەزەوی چەقاند)[٤٩٥] (پاشان وتی: ئەی هۆزەکانی هەوازن سوێند بەخوا یان ئەوەتا گوێڕایەڵم دەبن یان ئەوەتا خۆم دەدەم بەسەر ئەم شمشێرەدا تا لەپشتمەوە دەردەچێت. (ئەوەی لەبەرئەوە وت کە ناوداری تەنها هەر بۆخۆی بێت و ناوی دورەید نەکەوێتە ناو ناوانەوە). هۆزەکەی وەڵامیان دایەوە وتیان: هەموو ملکەچی تۆین. دورەیدیش وتی: ئێوە شایەت بن ئەمە ڕۆژێکە من تیایدا ئامادە نەبووم و لەدەستیشم نەچووە. پاشان مالیك بەخەڵکەکەی وت: گەر دوژمنتان بینی کیفی شمشێرەکانتان بشکێنن و پاشان هەموو وەك یەك پیاو هێرش بەرنە سەریان)[٤٩٦] (لەڕاستیدا مالیکی کوڕی عەوف پێشەوایەکی بوێر بوو)[٤٩٧].

## پێغەمبەر ﷺ مژدە دەداتە هاوەڵانی

لەدوای ڕێ ڕۆیشتنی چوار ڕۆژ لەسەرخۆ، موسوڵمانان نزیك بوونەوە لەشیوی حونەین کە بیست کیلۆمەتر لەڕۆژهەڵاتی شاری مەککەوە دوورە ئێستا ئەو ناوچەیە ناوی (ئەلشەرائعە)[٤٩٨].

لەبەرەبەیانی ڕۆژێك پێش جەنگەکە پێغەمبەر ﷺ کەسێکی نارد تا هەواڵی هەوازنی بۆ بهێنێتەوە، عەبباس ﷺ دەفەرموێت: (پێش جەنگی حونەین پێغەمبەر ﷺ (قەعقاعی کوڕی مەعبەدی کوڕی زورارەی تەمیمی نارد تا هەواڵەکانی ئەو ناوچەیەی بۆ بهێنێت)[٤٩٩] کاتێك گەڕایەوە هەواڵی ژمارە زۆری دوژمنانی گەیاندە پێغەمبەر ﷺ ئەویش مژدەی دایە هاوەڵانی کە سەرکەوتوو دەبن و دەسکەوتی باشیان دەست دەکەوێت.

سەهلی کوڕی ئەلحەنزەلیە ﷺ دەفەرموێت: (ئێمە لەسەرخۆ لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەرەو جەنگی حونەین دەڕۆیشتین، تا ئێوارەمان بەسەرهات و کاتی نوێژ بوو،

---

(٤٩٥) أخرجه: الواقدي (المغازي) (ص:٥٩٤).

(٤٩٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٥٣/٤) معلقاً و أخرجه: الذهبي (المغازي) (ص:٥٧٣) باسناد حسن موصولًا وانظر: (السيرة النبوية كما في مصادرها الاصلية) (ص:٥٨١).

(٤٩٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣٠١/١٩) عن خليفة بن خياط.

(٤٩٨) انظر: (كتاب المناسك) للحربي (ص:٤٧١).

(٤٩٩) أخرجه: ابن حجر (الاصابة) (٣٥٦/٥) (٧١٤٣) وقال: اسناده صحيح وقال محققه: و أخرجه: ابوعوانة (٦٧٥٦) وقال: اسناده صحيح.

کەسێکی سوار هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و پێی وت: من پێشتان کەوتم تا ڕۆیشتمە سەر چیای ئەو ناوچەیە و تەماشام کرد هۆزەکانی هەوازن هەموویان بە هاوسەرو منداڵ و مەڕو ماڵات و سامانەکانیانەوە لەناوچەی حونەین جێگیر بوون. پێغەمبەریش ﷺ بە زەردەخەنەیەکەوە فەرمووی: ((تِلْكَ غَنِيمَةُ الْمُسْلِمِينَ غَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهُ)). واتە: ((هەموو ئەوانە سبەینێ دەبنە دەسکەوتی موسوڵمانانە إن شاء الله). پاشان فەرمووی: ((مَنْ يَحْرُسُنَا اللَّيْلَةَ؟)) واتە: ((کێ ئەمشەو پاسەوانیمان دەکات)) ئەنەسی کوڕی مورسیدی غەنەوی وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: ((بڕۆ سواری ئەسپەکەت ببە)) پاشان بە سواری ئەسپەکەیەوە هات و پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((اسْتَقْبِلْ هَذَا الشِّعْبَ حَتَّى تَكُونَ فِي أَعْلَاهُ، وَلَا نُغَرَّنَّ مِنْ قِبَلِكَ اللَّيْلَةَ)) ((ڕوو بکەرە ئەم شیوەو هەتا سەرەوەی بڕۆو لەوێ جێگیر ببەو وریا بە کەسمان لەلای تۆوە ئەمشەو بەڕوودا نەیەت)).

کاتێك ڕۆژمان کردەوە، پێغەمبەر ﷺ بەرەو جێی نوێژکردنەکەی ئەو ناوچەیە ڕۆیشت و دوو ڕکات پێش نوێژی بۆ کردن پاشان فەرمووی: ((هَلْ أَحْسَسْتُمْ فَارِسَكُمْ))؟ واتە: ((هەست دەکەن سوارەکەتان گەڕابێتەوە))؟ وتیان: نەخێر هەستمان پێ نەکردووە. پاشان قامەت کراو پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژی بۆ کردین و لەنوێژەکەدا بە لاچاو تەماشای ئەو شیوەی دەکرد، دواتر لەنوێژەکەی بووەوەو سەلامی دایەوەو فەرمووی: ((أَبْشِرُوا فَقَدْ جَاءَكُمْ فَارِسُكُمْ)) واتە: ((مژدەتان لێ بێت ئەسپ سوارەکەتان گەڕایەوە)). ئێمەش تەماشامان دەکرد لەنێوان درەختەکانی ئەو شیوەوە، تا گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ وەستاو سەلامی کردو وتی: من چووم هەتا گەیشتمە سەر ئەو شیوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردبووم ئەو شیوەو شیوەکەی ئەولاترم پشکنی و هیچ کەسێکم نەدی. پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((هَلْ نَزَلْتَ اللَّيْلَةَ؟))؟ واتە: ((ئایا ئەمشەو لەئەسپەکەت دابەزیت)) وتی: نەخێر مەگەر بۆ سەرئاو یان بۆ شەونوێژ کردن. پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: ((قَدْ أَوْجَبْتَ فَلَا عَلَيْكَ أَنْ لَا تَعْمَلَ بَعْدَهَا)) واتە: ((بەم کارە بەهەشتت بۆ مسۆگەر بوو هەرچەندە لەدواتردا هیچ کارێکی تریش نەکەیت))[٥٠٠].

(٥٠٠) أخرجه: ابوداود (٢٥٠١)، والحاكم (٨٣/٢) وصححه ووافقه، وقال الحافظ (الاصابه) (١١٧/١): اسناده صحيح. وقال في (الفتح) (٢٧/٨) سنده حسن، وصححه الشيخ الالباني في (الارواء) (٣٧١) و (الصحيحة) (٣٧٨) و (فقه السيرة) (٤٢١)، وصححه الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٤٦٣).

# بەڕێوەچوونی جەنگەکە

لەشەوی جەنگەکەدا مالیکی کوڕی عەوف سوپاکەی ڕێکخست و بردنیە دەربەندی شیوی حونەین کەشیوێکی سەربەرەو خوار و بەردەڵان بوو وە گەروی زۆری لەناودا هەبوو، لەوێ بەشێکی سوپاکەی بەهەموو لایەکدا بڵاوکردەوەو چەندەها بۆسەی لەو ناوە بڵاوە پێکرد و دایمەزراندن و فەرمانیدا لەهەموو لایەکەوە سوپای موسوڵمانان تیر باران بکەن، لەبەردەم دەربەندو گەروەکاندا بەشەکەی تری سوپاکەی بەڕیزی یەك لەدوای یەك ڕێکخست، ئەسپ سوارەکان لەپێشەوە بوون پاشان پیادەڕەوەکان، پاشان ئافرەتان و منداڵان پاشان مەڕو مانگاو وشترەکانیان، فەرمانیدا گەر موسوڵمانەکان نزیك بوونەوە دەست بەجێ هێرشێکی کوتوپڕیان بکەنە سەر، داوای لەسەربازەکانی کرد خۆڕاگربن و دڵنیابن ئەوان ژمارەیان زیاترەو سەر دەکەون بەسەریاندا چونکە موسوڵمانەکان شوێنی ئەمان نازانن و ئەم ناوچەیە شارەزانین، وە تا ئێستا موسوڵمانەکان ڕووبەڕووی سوپایەکی شەڕزان و بەجەرگی وەك ئەوان نەبوونەتەوە. لەبەرانبەردا پێغەمبەر ﷺ لەپارشێودا سوپاکەی ڕێکخست و ئاڵاکانی بەسەردا دابەشکردن و ئەم سێ ناونیشانەی کردە دروشمیان تا یەکتری پێ بناسنەوە ئەویش: ((یا بَنِي عَبْدُاللَّه، یا بَنِي عَبْدُالرَحْمن، یا بَنِي عُبَیدُاللَّه))[٥٠١]. هۆزی بەنی سولەیمی لەڕیزی پێشەوەی سوپاکەی جێگیرکرد و پاشان لەدوایان ئەسپ سوارەکانی جێگیر کرد بەفەرماندەیی خالیدی کوڕی وەلید. (کاتێك ڕۆژ بووەوەو دونیا ڕووناك بووەوە هەردوو سوپاکە تەماشای یەکتریان دەکرد، لەو کاتەدا ئەبوسوفیان و صەفوان و موعاویەو حەکیمی کوڕی حوزام خۆیان جیاکردەوە لەسوپای موسوڵمانان و چوونە پشت تەپۆڵکەیەکی ئەو ناوچەیە تا ببینن کام لەم دوو سوپایە دەشکێت. پێغەمبەر ﷺ سواری هێسترەکەی بوو کەناوی (شەهبایان بەیزا) بوو ڕووی کردە ڕیزەکانی موسوڵمانان و هانیدان بۆ جەنگکردن و مژدەی سەرکەوتنی پێ بەخشین گەر ئەوان ڕاستگۆیانەو ئارامگرانە جەنگەکە بەڕیوەبەرن)[٥٠٢].

---

(٥٠١) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٨٥).

(٥٠٢) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٨٤)، وعنه البيهقي (الدلائل) (١٣٠/٥). وعروة بن الزبير كما في (البداية) (٣٦٨/٤).

پاشان موسوڵمانەکان پێش ڕەوییان کرد لە تاریکی بەرەبەیانداو بەو شیوە بەر تەسکەدا بەرەو خوار کەوتنە ڕێ تا ڕیزەکانی سوپای دوژمنیان بەرچاو کەوت. ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (لەجەنگی حونەیندا موشریکەکان بەجوانترین ڕیز وەستابوون، ڕیزی ئەسپ سوارەکانیان لەپێشەوە بوو پاشان ڕیزی شەرکەرە پیادەڕەوەکان، پاشان ئافرەتەکانیان بەسواری وشترەوە بوون لەدوایانەوە، پاشان مەڕەکانیان پاشان ئاژەڵەکانی تریان)[٥٠٣].

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەفەرموێت: (لەکاتێکدا ڕوومانکردە شیوەکەی حونەین کە شیوێکی بەرتەسك و سەربەرەوخوار بوو بەئاسانی تێیدا بەرەو خوارەوە دەچوین لە تاریکی بەرەبەیانی ئەو ڕۆژەدا، بەڵام دوژمن پێش ئێمە خۆیان لەوێ دابەزاندبوو وە بۆسەیان بۆ دانابووین و ئەوان لە هەمووولایەکەوە خۆیان ئامادە کردبوو بۆمان)[٥٠٤].

لەبەرەبەیانی ئەو ڕۆژەدا جەنگ بەرپابوو و بەردەوام بوو هەتا خەوتنان و تێکڕای شەو وەك عەبدولڕەحمانی ئەلفەهری ﷺ دەفەرموێت: (بەدوژمن گەیشتین (و لەڕوویان دا وەستاینەوە هەتا ئێوارەو تێکڕای ئەو شەوەمان)[٥٠٥]، ئەسپ سوارانی هەردوولا تێك ڕژان و بەشەڕ هاتین لەگەڵیان)دا[٥٠٦].

لەڕۆژی دواتردا هەوازن نەخشەیان وابوو کە پێشەکی سوپاکەیان لەگەڵ موسوڵمانان بەجەنگ بێن و دواتر لەڕوویاندا ڕابکەن و بکشێنەوە تا موسوڵمانان دوایان بکەون و پەلکێشیان بکەن بۆ ناوچەیەکی بەرتەسکی دواوەوە، و لەوێدا ئابڵوقەیان بدەن. ئەو لەپێشەوەو بۆسەی بۆ دانا بوون، وە تیر هاوێژەکانیشیان لەدواوە دواتر تیر بارانیان بکەن لەهەموو لایەکەوەو هێرشێکی زۆر گەورەو خێرا بکەنە سەریان.

---

(٥٠٣) أخرجه: مسلم (١٣٦/١٠٥٩).

(٥٠٤) أخرجه: أحمد (١٥٠٢٧) وقال محققوه: اسناده حسن، وابن حبان (٤٧٧٤) وقال محققه: اسناده حسن وابويعلى (١٨٦٢)، والبزار (١٨٣٢)، والحاكم (٤٨/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (١٢٦/٥) وابن هشام (السيرة) (٥٨/٤ (٩٧٦) وقال محققه: اسناده حسن.

(٥٠٥) أخرجه: البزار (٣٥/٢)، والحارث بن اسامة كما في (الاتحاف) (٦٣١٤).

(٥٠٦) أخرجه: ابوداود (٥٢٣٣)، وأحمد (٢٢٤٦٧) وقال محققوه: حسن لغيره، والدارمي (٢٤٥٢،٢٤٩٦) وقال محققه: اسناده قوي، والطيالسي (١٣٧١) واسناده صحيح كما قال البوصيري (الاتحاف) (٦٣١٣)، وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٧١٨).

بەرائی کوڕی عازیب ﷺ دەفەرموێت: (هەوازن زۆربەیان تیرهاوێژبوون کاتێك پێیان گەیشتن و هێرشمان بردە سەریان ئەوان ڕایان کردو ئێمە کەوتینە کۆکردنەوەی دەسکەوتەکانیان)[٥٠٧] بەم جۆرە لەهێرشی یەکەمدا موسوڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێناو سەرسام بوون بەسەرکەوتنەکەیان و ژمارە زۆریانەوە. چونکە لەپێش سوپای موسوڵمانانەوە کۆمەڵێك ورە بەرزو گەنجی کەم شارەزا لەجەنگدا هەبوو کە قەڵغان و کەرەستەی جەنگیان وەك پێویست نەبوو وە لەڕیزی سوپاکەشدا ژمارەیەکی زۆر بیروباوەڕ لاوازو تازە موسوڵمان و دەشتەکی یان لەناودا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەی بێ باوەڕان دوو هێندەی موسوڵمانان بوون. لەو کاتەدا سوپای موسوڵمانان سەرقاڵی کۆکردنەوەی دەست کەوتەکانی جەنگ بوون و گەنجە ورە بەرزەکانیشی بەخێرایی دوای دوژمن کەوتبوون لەو ڕێگە بەردەڵانەداو دوژمنیان لێ دیار نەبوو لەبەر تاریکی بەرەبەیان و تەپوتۆزی شەڕکەران و گەرمایەکی زۆردا (هەریەکێك لەوان لەپی دەستی خۆی نەدەدی)[٥٠٨].

جابیر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی بەشیوەکەدا لەتاریکی بەرەبەیاندا دەڕۆیشتن تا گەیشتنە پێدەشتەکە لەوێدا لەناکاو ئەسپ سوارانی دوژمن هێرشیان هێنایە سەر موسوڵمانان)[٥٠٩] بەم جۆرە شەڕ بۆ جارێکی تر بەرپا بووەوە.

ئەبو قەتادە ﷺ دەفەرموێت: (لەجەنگی حونەین دا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین، کاتێك بەیەك گەیشتین سەرەتا موسوڵمانان سەرکەوتن بینیم پیاوێکی موشریك پیاوێکی موسوڵمانی دابوو بە زەویدا منیش پێچم کردەوەو لەدوایەوە بۆی ڕۆیشتم و بەشمشێرەکەم لەناو شانیم داو قەڵغانەکەی سەرسنگیم بڕی و (دەستێکیم بڕی)[٥١٠] بەڵام (ئەو بەدەستەکەی تری ملی گرتم) و زۆر بەتوندی منی گوشی، سوێند بەخوا نزیك بوو (بمکوژێت و گەر خوێنی لەبەر نەڕۆیشتایە دەیکوشتم)[٥١١] بەڵام بەهۆی

---

(٥٠٧) أخرجه: البخاري (٢٨٦٤، ٢٨٧٤، ٤٣١٥)، ومسلم (١٤٠٠/٣).

(٥٠٨) أخرجه: البزار (١٨٢٧)، وقال الحافظ (الفتح) (٤٢/٨) تحت الحديث رقم (٤٣٢٣).

(٥٠٩) أخرجه: أحمد (١٥٠٢٧) وقال محققوه: حسن لغيره، والحاكم (٤٨/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٤٧٧٤) وقال محققه: اسناده حسن، وابويعلى (١٨٦٢)، والبزار (١٨٣٢)، وابن هشام (السيرة) (٥٨/٤) (٩٧٦) وقال محققه: اسناده حسن.

(٥١٠) أخرجه: مسلم (١٧٥١).

(٥١١) أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٨١٥٤)، وأحمد (٢٢٦٠٧) وقال محققوه: حديث صحيح، وحسن اسناده الشيخ الالباني في

زۆر خوێن بەربوونی بەخێرایی نەیتوانی و منی بەرداو بەسەر ئەژنۆدا کەوت و منیش دام بەزەویدا و پاشان کوشتم)[٥١٢].

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەفەرموێت: (لەکاتی جەنگی حونەیندا ڕووبەڕووی دوژمن بووبووینەوە، لەو کاتەدا چوومە سەر بەرزاییەك یەکێکی ئەوانم لێ دەرکەوت و تیرێکم تێگرت و لێم ون بوو نەمزانی چی لێهات، پاشان تەماشام کرد ئەوان لەسەر بەرزاییەکی ترەوە هێرشیان هێناو موسوڵمانان بەرەو ڕوویان چوون و لەگەڵیان دا بەجەنگ هاتن)[٥١٣] (سوێند بەخوا ئێمە بەوجۆرە بەشێوەکەدا دەچووینە خوارەوە کاتێکمان زانی ئەوان لەهەموو لایەکەوە بەیەکجار هێرشیان کردە سەرمان)[٥١٤] (و تیر بارانیان کردین)[٥١٥] ئەوان (کەسانێکی دەست ڕاست بوون دەگمەن بوو تیرێك بەفیڕۆ بدەن و ئامانجیان نەپێکن)[٥١٦] (لەوێدا تیر بارانێکیان کردین دەت وت پۆلە کوللەیە لەئاسمانەوە بەسەرماندا دەباری)[٥١٧] (وتیرەکانیان هەڵەیان نەدەکردو بەهۆیەوە موسوڵمانان خۆیان تەواو نزم دەکردەوە)[٥١٨].

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (ئیتر بەهۆیەوە ئەسپ سوارەکانی پشتەوەمان هەموو هەڵاتن لەگەڵ دەشتەکیەکان (وئەوانەی تازە موسوڵمان بوون)[٥١٩] بەوجۆرە موسوڵمانان بەرەو دواوە ڕایان کرد وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ۝٢٥﴾ (التوبة)[٥٢٠] جابیر ﷺ دەفەرموێت: (ئیتر بەوجۆرە

---

(الارواء) (٥٣/٥)، وابن هشام (السيرة) (٦٣/٤) (٩٨٤)، وانظر (صحيح سيرة ابن هشام) (١٧٥٥) وقال: اسناده صحيح.

(٥١٢) أخرجه: البخاري (٤٣٢١، ٤٣٢٢)، وابوداود (٢٧١٧)، والترمذي (١٥٦٢)، وابن حبان (٤٨٣٦) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما، والبيهقي (٥٠/٩).

(٥١٣) أخرجه: مسلم (١٧٧٧).

(٥١٤) أخرجه: عبدالرزاق (٢٠٧٦٣)، وابن ابي شيبة (١٠١/١٥)، والترمذي (٢١٨٠)، وأحمد (١٥٠٢٧) وقال محققوه: اسناده حسن. والحميدي (٨٤٨)، وابويعلى (١٤٤١)، والطبراني (الكبير) (٣٢٩٠،٣٢٩٤)، وابن حبان (٤٧٧٤) وقال محققه: اسناده حسن، وابن هشام (السيرة) (٥٨/٤) (٩٧٦) وقال محققاه: اسناده حسن.

(٥١٥) أخرجه: البخاري (٢٨٦٤، ٢٨٧٤، ٤٣١٥)، ومسلم (٣/١٤٠٠).

(٥١٦) أخرجه: البخاري (٢٩٣٠)، ومسلم (١٤٠٠).

(٥١٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٦٢٣/٢٢)، وابن ابي شيبة (المصنف) (٢٨١٣٧) وقال الهيثمي (المجمع) (١٨٢/٦): رواه الطبراني ورجاله ثقات.

(٥١٨) أخرجه: البخاري (٢٩٣٠)، ومسلم (١٤٠٠).

(٥١٩) أخرجه: مسلم (١٣٦/١٠٥٩).

(٥٢٠) أخرجه: ابوداود (٥٢٣٣)، وأحمد (٢٢٤٦٧) وقال محققه: حسن لغيره، والطيالسي (١٣٧١) واسناده صحيح كما في

خەڵکی بەرەو دواوە ڕایانکرد و کەس فریای کەس نەدەکەوت و پاشان وشترەکان بەسەر یەکتردا دەکەوتن....)[٥٢١]

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرمویێت: (لەکاتێکدا خەڵکی هەڵاتن و ئەوانەی بیروباوەڕیان لاواز بوو لەخەڵکی مەککە کە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ هاتبوون، هەندێکیان ئەو ڕق و قینەی کە لەناو دڵیان مابوو دژ بە موسوڵمانان لەوێدا دەریان بڕی لەوانە: ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب بوو کە کیفی تیرو پشکی هەڵبژاردنی بەختی نەفامی هێشتا پێ بوو، وتی: شکستەکەیان ناوەستێتەوە تا دەیان گەیەننە دەریا)[٥٢٢].

(وە کیلدەری کوڕێ حەنبەل کە لەگەڵ صەفوانی کوڕی ئومەیەدا بوو وە هێشتا موشریك بوون وتی: ئەمڕۆ سیحرەکەی موحەممەد بەتاڵ بووەوە. صەفوانیش پێی وت: بێ دەنگ بەخوا ناو دەمت بشکێنێت، سوێند بەخوا کەسێکی قوڕەیش ببێتە پێشەوام لام چاکترە لەوەی کەسێکی هەوازن ببێتە پێشەوام)[٥٢٣].

لەگێڕانەوەیەکی تردا: (....پیاوێکی قوڕەیش لەوێدا بەلای صەفواندا ڕۆیشت و پێی وت: مژدەت لێ بێت بەشکستی موحەممەد و هاوەڵانی سوێند بەخوا ئیتر هەتا هەتایە سەرناکەون. سەفوانیش پێی وت: تۆ مژدەم دەدەیتێ بەسەرکەوتنی دەشتەکییەکان؟ سوێند بەخوا کەسێکی قوڕەیشی ببێتە سەروەرم پێم خۆشترە لەوەی یەکێکی دەشتەکی ببێتە سەروەرم)[٥٢٤].

بەم جۆرە زۆربەی سوپای موسوڵمانان ڕایانکرد بەڵام پێغەمبەر ﷺ مایەوە خۆی و چەند کەسێکی موهاجرین و ئەنصار ڕایان نەکردو پێغەمبەریان ﷺ بەجێ نەهێشت. جابیر ﷺ دەفەرمویێت: (.... خێرا خەڵکی ڕوویان وەرگێڕاو بەرەو دواوە

(الاتحاف) (٦٣١٣).

(٥٢١) أخرجه: عبدالرزاق (٢٠٧٦٣)، والترمذي (٢١٨٠)، وأحمد (١٥٠٢٧) وقال محققوه: اسناده حسن، والحميدي (١٨٤٨)، وابن حبان (٤٧٧٤) وقال محققه: اسناده حسن، وابن هشام (السيرة) (٥٨/٤) رقم (٩٧٦) وقال محققه: اسناده حسن.

(٥٢٢) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٥٩/٤)، والبيهقي (الدلائل) (١٢٧/٥) موصولًا، وقال الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (ص:٤٢٢): اسناده صحيح.

(٥٢٣) أخرجه: ابويعلى (١٨٦٣) وقال محققه: اسناده حسن و أخرجه: أحمد (٣٧٦/٣) باسناد صحيح، والبزار (١٨٣٤)، وابن حبان (٤٧٧٤) وقال محققه: اسناده حسن.

(٥٢٤) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٨٥) وعنه البيهقي (الدلائل) (١٣١/٥)، وعروة ابن الزبير كما في (البداية) (٣٦٨/٤).

گەڕانەوەو کەس لەسەر کەس نەدەوەستا پێغەمبەریش ﷺ چووە لای ڕاست.... لەگەڵ کەسانێکی کەمی موهاجرین و ئەنصارو خزمی خۆی مایەوە لەوانە: ئەبوبەکرو عومەرو عەلی و عەبباسی مامی و فەزل و ئەبوسوفیانی کوڕی حاریسی ئامۆزای و ڕەبیعەی کوڕی حەرس و ئوسامەی کوڕی زەیدو ئەیمەنی کوڕی ئوم ئەیمەن....)[٥٢٥] لەگێڕانەوەیەکی تردا (...لەو ڕۆژەدا جابیری کوڕی ئەبوسوفیانی کوڕی حارسیان لەگەڵدا بوو هەروەها قوسمی کوڕی عەبباس و عوتبەو موعتیبی ئەبولەهەب و عەبدولای کوڕی زوبەیرو نەوفەلی کوڕی حاریسی کوڕی عەبدولموتەلیب و عەقیلی کوڕی ئەبوتالیب و شەیبەی کوڕی عوسمانی ئەلجومەحی....)[٥٢٦] لەگێڕانەوەیەکی لاوازدا هاتووە لەئیبنو مەسعودەوە ﷺ دەفەرموێت: (....لەو ڕۆژەدا من و هەشتا پیاو لەموهاجرین و ئەنصار هەشتا پێ دوا بەدوا ڕۆیشتین و ماینەوەو پشتمان تێ نەکردن و ئێمە ئەوانە بووین کەخودا ئارامی خستبووە دڵ و دەرونیانەوە)[٥٢٧].

## خۆگری پێغەمبەر ﷺ و مانەوەی لەگۆڕەپانی جەنگەکەدا

لەم جەنگەدا پێغەمبەر ﷺ لەگۆڕەپاندا مایەوە بەسواری هێسترە سپییەکەی و تەماشای بارودۆخەکەی دەکرد. سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێت:(...لەوکاتەدا ڕام دەکرد بەرەو دواوە... پەشتەماڵەکەم کرایەوە و بەدەستم هەردوو لایەکەیم گرت و بەلای پێغەمبەردا ﷺ (بەرەو دواوە ڕام دەکرد)[٥٢٨] وە ئەو کە سواری هێسترە سپییەکەی بوو بوو فەرمووی: ((لَقَدْ رَأَى ابْنُ الْأَكْوَعِ فَزَعًا))[٥٢٩] واتە: ((کوڕەکەی ئەکوەع

---

(٥٢٥) أخرجه: أحمد (١٥٠٢٧) وقال محققوه: اسناده حسن، وابن هشام (٥٨/٤) (٩٧٧) وقال محققه: اسناده حسن، والبيهقي (الدلائل) (١٢٠،١٢٧/٥) وصححه الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (ص:٤٢٢) والعمري (السيرة الصحيحة) (٥٠١/٢) وانظر: (صحيح الطبري) (٢٥٧)، و (صحيح سيرة ابن هشام) (١٧٤٥).

(٥٢٦) انظر: (فتح الباري) (٣٧/٨) من زيادات الزبير بن بكار علي مغازي ابن اسحاق.

(٥٢٧) أخرجه: أحمد (٤٣٣٦) وقال محققوه: اسناده ضعيف، والبزار (١٨٢٩)، والطبراني (الكبير) (١٠٣٥١)، والحاكم (١١٧/٢) وصححه.

(٥٢٨) هكذا اورده ابن كثير (البداية) (٥٩٤/٤) واللفظ في (صحيح مسلم) (٨١/١٧٧٧): (...ومررت على رسول الله ﷺ منهزماً). قال النووي: هذا حال من ابن الاكوع كما صرّح اولاً بانهزامه ولم يردان رسول الله ﷺ انهزم (شرح مسلم) (٣٨٤/٦) ويدل عليه ايضاً قوله ﷺ لسلمة: (لقد رأى ابن الاكوع فزعاً) وقال الصحابة كلهم: انه لم ينهزم وقال البراء ﷺ : (اشهد على نبي الله ما ولي وفي رواية: ولكن رسول الله ﷺ لم يفرّ) أخرجه: مسلم (١٧٧٦).

(٥٢٩) أخرجه: مسلم (٨١/١٧٧٧).

تۆقیوە لەوەی کە بینیویەتی)).

ئەبوقەتادەش ﵁ دەڵێت: (موسوڵمانان بەرەو دواوە ڕایان کردو منیشیان لەگەڵ بووم عومەری کوڕی خەتتابم بینی و پێم وت: ئەوە خەڵکی چییانە بۆ وا دەکەن؟ وتی: ئەوە لە فەرمان و دەسەڵاتی خوادایە؟)[٥٣٠]، جابیر ﵁ دەڵێت: (خەڵکی بەرەو دواوە ڕایان دەکرد کەس لەسەر کەس نەدەوەستاو پێغەمبەریش ﷺ چووە لای ڕاستی ڕێگاکەو پاشان فەرمووی: ((أَيْنَ أَيُّهَا النَّاسُ؟ هَلُمُّوا إِلَيَّ، أَنَا رَسُولُ اللَّهِ (مَرَّتَيْنِ) أَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ.))[٥٣١] واتە: ((ئەوە بۆ کوێ دەچن ئەی خەڵکینە وەرنەوە بۆلای من، من پێغەمبەری خودام دووجار ئەوەی دووبارە کردەوە منم موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا)) ((يا عِبادَ اللّه أنَا عَبْدُ اللّه وَرَسُولَه يا عِبادَ اللّه أنَا عِبدا للّه وَرسولِه)[٥٣٢] (يا مَعْشَر المُسلِمِيْنَ أنَا رَسُولَ اللّه))[٥٣٣] واتە: (ئەی بەندەکانی خوا من بەندەو پێغەمبەری خوام، ئەی بەندەکانی خوا من بەندەی خواو پێغەمبەری خوام)) (ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان منم پێغەمبەری خودام).

بەراء ﵁ دەفەرموێت: (لەو دەمەدا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەسواری هێسترە سپییەکەوە بوو و ئەبوسوفیانی کوڕی حاریسیش لەغاوەکەی گرتبوو))[٥٣٤] (پاشان پێغەمبەر ﷺ هێسترەکەی تاو دەدا بەرەو ڕووی موشریکەکان. عەبباسی مامی ترساو لغاوەکەی گرت و دەی وەستاند و ئەبوسوفیانیش زین و کۆپانی هێسترەکەی گرتبوو، عەبباس دەفەرموێت: لەوکاتەدا هێسترەکەی بەرەو موشریکەکان تاو دەداو منیش لەغاوەکەیم گرتبوو دەم وەستاند بۆئەوەی خێرا نەڕوات)[٥٣٥] (بەڵام ئەو هەر خێرا تاویدەدا و ئەبوسوفیانی ئامۆزاشی زین و کۆپانەکەی گرتبوو)[٥٣٦]

---

(٥٣٠) أخرجه: البخاري (٤٣٢٢)، ومسلم (١٧٥١).

(٥٣١) أخرجه: أحمد (١٥٠٢٧) وقال محققوه: اسناده حسن، وابن هشام (السيرة) (٥٨/٤) (٩٧٧) وقال محققاه: اسناده حسن، وقال الشيخ الالباني (فقه السيرة) (٤٢٢): حديث صحيح. وانظر (صحيح سيرة ابن هشام) (١٧٤٥)، (صحيح الطبري) (٢٥٧) و (السيرة الصحيحة) (٥٠١/٢).

(٥٣٢) أخرجه: الطيالسي (١٣٧١) و اسناده صحيح كما قال البوصيري (الاتحاف) (٦٣١٣).

(٥٣٣) أخرجه: الحاكم (٤٨/٣) وصححه ووافقه الذهبي.

(٥٣٤) أخرجه: مسلم (٨٠/١٧٧٦).

(٥٣٥) أخرجه: مسلم (١٧٧٥).

(٥٣٦) أخرجه: أحمد (١٧٧٥) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

لەو کاتەدا دەیفەرموو: ((أَنَا النَّبِيُّ لَا كَذِبْ أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ)[٥٣٧] ((أَنَا ابْنُ الْعَوَاتِكِ))[٥٣٨] واتە: (منم پێغەمبەر بێ هیچ درۆیەك منم کوڕەکەی عەبدولموتەلیب) (منم کوڕی (سێ) عاتیکە ناوەکەم) ئەنەس دەفەرموێت: (پاشان پێغەمبەر ﷺ بانگی کردو فەرمووی: (( يَا لَلْمُهَاجِرِينَ، يَا لَلْمُهَاجِرِينَ))[٥٣٩] واتە: (موهاجیرەکان لەکوێن موهاجیرەکان لەکوێن) (يَا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ، أَنَا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ)[٥٤٠] (ئەی موهاجیرەکان منم بەندەی خواو پێغەمبەری خوا) (يَا مَعْشَرَ الْأَنْصار أَنَا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ)[٥٤١] (ئەی پشتیوانەکان منم بەندەی خواو پێغەمبەری خوا) .

پاشان (لەو ڕۆژەدا دوو بانگەوازی کرد بێ ئەوەی هیچ لەنێوانیاندا بڵێت، ئاوڕی بەلای ڕاستدا دایەوەو فەرمووی: ((يَا مَعْشَرَ الْأَنْصار))؟ واتە: ((ئەی کۆمەڵانی پشتیوانەکان)). هەموو وتیان: ئەوا هاتین ئەی پێغەمبەری خوا (لەخزمەتتداین)[٥٤٢] مژدە بۆ تۆ ئێمە لەگەڵتداین، پاشان پێغەمبەر ﷺ بەلای چەپدا ئاوڕی دایەوەو فەرمووی: ((يَا مَعْشَرَ الْأَنْصار))؟ واتە: ((ئەی کۆمەڵانی پشتیوانەکان)) هەموو وتیان: ئەوا هاتین ئەی پێغەمبەری خوا مژدە بۆ تۆ ئێمە لەگەڵتداین))[٥٤٣].

## هاوارو بانگکردنەکەی عەبباس ﷺ

لەو ساتە وەختەدا پێغەمبەرﷺ داوای لەعەبباس کرد ئەویش پیاوێکی دەنگ گەورە بوو تا بانگی هاوەڵانی بکات و هەموو بگەڕێنەوەو بەرەنگاری دوژمن ببنەوە، عەبباس ﷺ دەڵێت: (من لەگەڵ پێغەمبەری خوا بووم ﷺ و لغاوی هێسترە سپییەکەیم گرتبوو من پیاوێکی کەتەو بەخۆوە بووم و دەنگم بەرز بوو، فەرمووی: ((يَا عَبَّاسُ أُصْرُخْ (ناد) يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ: يَا مَعْشَرَ أَصْحَابِ السَّمُرَةِ ))[٥٤٤] واتە: ((ئەی عەبباس

(٥٣٧) أخرجه: مسلم (٨٠/١٧٧٦).

(٥٣٨) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٦٧٢٤)، والبيهقي (الدلائل) (١٣٥/٥) وقال محقق (البداية) (٥٩١/٤): حديث حسن، قال قتيبة: وكان رسول الله ﷺ له ثلاث جدات من اسلم اسمهن عاتكة.

(٥٣٩) أخرجه: مسلم (١٣٦/١٠٥٩) وأحمد (١٢٦٠٨) وقال محققوه: حديث صحيح.

(٥٤٠) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨١٥٣).

(٥٤١) أخرجه: أحمد (١٢٩٧٧) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(٥٤٢) أخرجه: البخاري (٤٣٣٣).

(٥٤٣) أخرجه: البخاري (٤٣٣٧)، وأحمد (١٣٩٧٦) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(٥٤٤) أخرجه: مسلم (١٧٧٥)، وأحمد (١٧٧٥) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما، وابن هشام (٦٠/٤) (٩٨٠) وقال

هاوار بکەو بڵێ: ئەی کۆمەڵی پشتیوانەکان ئەی کۆمەڵی هاوەڵانی درەختەکە (واتە ئەوانەی بەڵێنی مردنیان دابوو بەپێغەمبەر ﷺ. منیش (هاوارم کردو ئەوەم دووبارە کردەوە)[٥٤٥].

(پاشان بەهەموو دەنگم هاوارم کرد: لەکوێن هاوەڵانی درەختەکە)[٥٤٦] (کوان پشتیوانەکان)[٥٤٧] (بەو جۆرە یەکەم جار بانگ کردنەکە بۆ پشتیوانەکان بوو)[٥٤٨] (ئەوانیش دەیان وت: ئەی پشتیوانەکان ئەی پشتیوانەکان، پاشان بانگ کرا لەهۆزی بەنولحاریسی کوڕی خەزرەج (ئەوان خۆڕاگربوون لەجەنگدا)[٥٤٩] (ئینجا بانگیان لەیەکتر دەکردو دەیان وت: ئەی هۆزەکەی حاریسی کوڕی ئەلخەزرەج ئەی هۆزەکەی حاریسی ئەلخەزرەج)[٥٥٠].

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((يَا عَبَّاسُ نَادِ قُلْتُ: يَا أَصْحَابَ السَّمُرَةِ يَا أَصْحَابَ سُورَةِ الْبَقَرَةِ... فَقُلْتُ: يَا أَصْحَابَ السَّمُرَةِ يَا أَصْحَابَ سُورَةِ الْبَقَرَةِ)[٥٥١] (اللهَ، اللهَ، الْكَرَّةَ عَلَى نَبِيِّكُمْ، قَالَ يَا أَنْصَارَ اللهِ! وَأَنْصَارَ رَسُولِهِ، يَا بَنِي الْخَزْرَجِ)) واتە: ((ئەی عەباس بانگی هاوەڵانی درەختەکە بکە، بانگی خاوەنانی سورەتی ئەلبەقەرە بکە))..... منیش هاوارم دەکرد... ئەی هاوەڵانی درەختەکە ئەی هاوەڵانی سورەتی بەقەرە) (بترسن لەخوا، بترسن لەخوا بگەڕێنەوە لای پێغەمبەرەکەتان، ئەی پشتیوانانی خوا ئەی پشتیوانانی پێغەمبەرەکەی، ئەی کوڕانی خەزرەج. پاشان فەرمانی بەهەندێك لە هاوەڵانی کرد کە بەو جۆرە بانگیان بکەن)[٥٥٢] (وە بەزەیدی فەرموو: ((وَيْحَكَ يَا زَيْدُ ، ادْعُ النَّاسَ)) واتە: ((ئەی هاوار لە تۆ زەید بانگی خەڵکی بکە)) ئەویش بانگی کرد وتی: خەڵکینە ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ بانگتان دەکات)[٥٥٣].

---

محققاه: اسناده حسن.

(٥٤٥) أخرجه: الطبري (التاريخ) (٧٥/٣).

(٥٤٦) أخرجه: مسلم (١٧٧٥)، وأحمد (١٧٧٥).

(٥٤٧) أخرجه: أحمد (١٧٧٥) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(٥٤٨) نفس المصدر.

(٥٤٩) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١٢٨/٥).

(٥٥٠) أخرجه: مسلم (١٧٧٥)، وأحمد (١٧٧٥).

(٥٥١) أخرجه: الحميدي (٤٥٩) باسناد صحيح كما قال محقق (المصنف) لابن ابي شيبة تحت الحديث (٣٤٢٥٨).

(٥٥٢) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (٢٨٥)، وعروة بن الزبير كما في (البداية) (٣٦٨/٤).

(٥٥٣) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨١٤٥) وقال محققه: رجاله ثقات، والبزار (١٨٢٨)، واوردهُ البوصيري في (اتحاف

## دوعاو نزای پێغەمبەر ﷺ

لەم ساتە وەختە دژوارەدا پێغەمبەر ﷺ لە سەر پشتی هێسترەکەی هاتە خوارەوەو دوعاو نزای کرد تا خوای گەورە سەری بخات بەسەر دوژمنانیدا، بەراء ﷺ دەفەرموێت: (لەکاتێکدا پێکدادان ڕوویدا لەنێوان پێغەمبەر ﷺ و موشریکەکاندا لەحونەین، لەو ساتەدا پێغەمبەر ﷺ لەپشتی و هێسترەکەی هاتە خوارەوە)[٥٥٤] (دوعای کردو داوای سەرکەوتنی لەخودای میهرەبان کردو فەرمووی: ((اللَّهُمَّ نَزِّلْ نَصْرَكَ))[٥٥٥] واتە: (خودایە سەرکەوتنی خۆتمان بۆ دابەزێنە)) ((اللَّهُمَّ إِنَّكَ إِنْ تَشَأْ لَا تُعْبَدْ بَعْدَ الْيَوْمِ))[٥٥٦]

واتە: ((خودایە تۆ گەر ویستت لێ بێت لەمڕۆ بەدواوە ناپەرسترێیت)) (وە هەردوو دەستی بەرز دەکردەوەو بەردەوام دەیوت: ((اللّهم إِنِّي أَنشِدُكَ ما وَعَدتَنِي، اللّهم لا يَنْبَغِي أَنْ يَظهرُوا عَلَيْنا))[٥٥٧] واتە: خودایە من لێت دەپاڕێمەوە بەڵێنەکەی خۆتم بۆ بهێنە دی، خودایە ڕێگە نەدەی ئەوان بەسەرماندا زاڵبن.

## گەڕانەوەی هاوەڵان

لەیەکەم جاردا شڵەژانێك دروست بوو لەڕیزی سوپای موسوڵماناندا بەهۆیەوە زۆر ئەستەم بوو ئازاو نەبەردەکان خۆیان بگەیەننە لای پێغەمبەر ﷺ و ئەوەش هەندێك کاتی برد تا لەئەنجامدا سەد کەسێك توانیان خۆیان بگەیەننە لای پێغەمبەر ﷺ و پاشان هەموو بانگەوازەکەی پێغەمبەریان ﷺ پێ گەیشت و لەهەموو لایەکەوە گەڕانەوە لای پێغەمبەر ﷺ و ڕیزەکانیان دووبارە ڕێك خستەوەو هێرشیان کردە سەر دوژمن. یەکەم جار تەنها عەبباسی ﷺ مامی لابوو لغاوی هێسترەکەی گرتبوو لەگەڵ ئەبوسوفیانی ئامۆزای ﷺ ئەویش کۆپانەکەی گرتبوو، دواتر دە کەس لەبنەماڵەکەی

---

الخيرة المهرة) (٦٣١٧)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٨١/٦): رواه البزار ورجاله ثقات.

(٥٥٤) أخرجه: ابوداود (٢٦٥٨)، وابويعلى (١٦٧٨)، وابن حبان (٤٥٧٥) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(٥٥٥) أخرجه: البخاري (٤٣١٧)، ومسلم (٧٨،٧٩/١٧٧٦) واللفظ له.

(٥٥٦) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٠٢٠٠) وقال محققه: اسناده صحيح، وأحمد (١٢١/٣) ورقم (٢٢٥٣٨) وقال ابن كثير (البداية) (٥٩٠/٤): اسناده ثلاثي على شرط الشيخين. واللفظ له ولأبن ابي شيبة.

(٥٥٧) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٨٥) وعنه البيهقي (الدلائل) (١٣١/٥)، واورده ابن كثير (البداية) (٣٦٨/٤) عن عروة.

خۆی لەگەڵ ئەبوبەکرو عومەر هاتنەوە لای ئەوانیش: عەلی و ئوسامەو فەزل و ڕەبیعەی کوڕی حاریس و قوسم و جەعفەری کوڕی ئەبوسوفیانی کوڕی حاریس و ئەیمەن کوڕی ئوم ئەیمەن و نەوفەلی کوڕی حاریس و عەقیلی کوڕی ئەبوتالیب و شوعبەی کوڕی عوسمان و کەسانێکی تر ﷺ.

پاشان هەشتا کەس لەهاوەڵانی موهاجرین و پشتیوانان هاتنەوە لای، ئەوان یەکەم جار پشتا و پشت چوونە دواوەو پشتیان نەکردە دوژمن، لەدواتردا بیست کەسی تریش هاتن و پێغەمبەر ﷺ ڕیزەکانی ڕێکخستن و خۆی لەپێشیانەوە بوو وە هێرشیان کردە سەر دوژمن و خۆیان دەدایە پەنای پێغەمبەر ﷺ، لەپاشان هاوەڵان بانگەوازەکەی عەبباسیان پێ گەیشت و بەخێرایی لەهەموو لایەکەوە دەهاتنەوەو دەیان وت: ئەوا هاتین ئەوا هاتین، ئەوانەش کە نەیان دەتوانی وشترەکانیان بگێڕنەوە شمشێرو ڕم و قەڵغانەکانیان لێ دادەگرت و دەگەڕانەوە.

عەبباس ﷺ دەفەرموێت: (سوێند بەخوا هاوەڵان لەدوای بیستنی بانگەوازەکەی من هەموو وەك چۆن مانگا دەگەڕێتەوە بۆ پارێزگاری کردن لەگوێرەکەکەی ئاوها هەموو گەڕانەوەو دەیان وت: ئەوا هاتین ئەوا هاتین)[٥٥٨].

(ئەنەس ﷺ دەڵێت: کاتێك هاوەڵان بانگەوازەکەیان بەر گوێ کەوت گەڕانەوە بەوێنەی گەڕانەوەی وشتر بۆ لای بەچکەکانی)[٥٥٩] (و دەیان وت: ئەوا هاتین بۆلات سوێند بەخوا)[٥٦٠] (وەڵامیان دەدایەوەو دەیان وت: ئەوا هاتین ئەوا هاتین، پیاوی وایان تێدا بوو دەیویست وشترەکەی بگێڕێتەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ نەی دەتوانی، قەڵغانەکەو شمشێرەکەو زرێ پۆشەکەی بەدەستەوە دەگرت و لەسەر پشتی وشترەکەی خۆی هەڵدەدایە خوارێ و وشترەکەی بەجێ دەهێشت بەرەو لای دەنگەکە دەچوو بەو جۆرە تا سەد کەسێکی لەلا کۆبووەوە))[٥٦١].

---

(٥٥٨) أخرجه: مسلم (١٧٧٥)، وأحمد (١٧٧٥).

(٥٥٩) أخرجه: ابويعلى (٣٦٠٦) وقال محققه: اسناده حسن، والطبراني (الاوسط) (٢٧٥٨) وقال محققه: اسناده حسن.

(٥٦٠) أخرجه: الحاكم (٤٨/٣) وصححه و وافقه الذهبي.

(٥٦١) أخرجه: عبدالرزاق (٩٧٤١)، ومسلم (٧٦/١٧٧٥)، وأحمد (١٧٧٥)، وابن هشام (السيرة) (٦٠/٤) (٩٨٠) وقال محققاهُ: اسناده حسن. واللفظ له. والبيهقي (الدلائل) (١٣٧/٥).

**(پاشان پێغەمبەر ﷺ ریزەکانی رێکخستن)[٥٦٢] (و خۆی پێشیان کەوت)[٥٦٣] (بەراء دەڵێت: سوێند بەخوا ئێمە لەترسی هەرە گەورەی جەنگدا خۆمان دەدایە پەنای پێغەمبەر ﷺ وە ئازا ئەو کەسە بوو لە لای شانی پێغەمبەرەوە ﷺ بوەستێت و بجەنگێت)[٥٦٤] (ئیبنو مەسعود ﷺ دەڵێت: هاوەڵان گەرانەوەو شمشێرەکانیان بەدەستی راستیانەوە وەك ئەستێرە دەدرەوشایەوە)[٥٦٥] (دواتر هەزاریان گەرانەوە چواردەوری پێغەمبەر ﷺ و کیفی شمشێرەکانیان فرێ داو روو بەدوژمن وەستانەوە)[٥٦٦] (و بەسەختی لەگەڵیاندا بەجەنگ هاتن)[٥٦٧].**

**هێرشی موشریکەکان زۆر درندانە بوو، راستەوخۆ بەرەو رووی پێغەمبەر ﷺ بوو، بەڵام خوای گەورە فریشتە سەربازەکانی خۆی نارده پارێزگاری پێغەمبەر ﷺ و پاراستی. یەکێك لە موشریکەکان کە دواتر موسوڵمان بوو ناوی عەبدورەحمان بوو ئەو هەواڵەی ئەو کاتەیان دەگێرێتەوەو دەڵێت: (کاتێك ئێمەو هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ رووبەرووی یەك بووینەوە ئەوان ماوەی شیردۆشینێك خۆیان لەبەردەمماندا نەگرت راومان نان گۆرەپانمان پێ بەجێ هێشتن و دوایان کەوتین، تا گەیشتینە ئەوکەسەی کەسواری وشترە سپییەکە ببوو، بە شمشێرەکانمانەوە رووبەرووی رۆیشتین تا دامان بەسەریاندا)[٥٦٨] (لەوێدا پیاوانێکی رووخسار سپی هەبوون وتیان: رووتان رەش بێت بگەرێنەوە دواوە، ئیتر ئێمەش لەدوای ئەو شەوە شکاین)[٥٦٩] (ئەوان شوێنمان کەوتن و بەسەرماندا سەرکەوتن)[٥٧٠] (مالیکی کوری عەوف کەسێکی هێرش بەری ئازا بوو ئەسپەکەی تاو دەدا بەرەو پێغەمبەر ﷺ بروات و هاواری لێ دەکردو زۆری لەگەڵ خەریك بوو بەڵام هەر نەدەرۆیشت)[٥٧١].**

---

(٥٦٢) أخرجه: البخاري (٢٨٦٤)، ومسلم (٧٨/١٧٧٦) واللفظ له.

(٥٦٣) أخرجه: مسلم (١٣٦/١٠٥٩).

(٥٦٤) أخرجه: مسلم (٧٨/١٧٧٦).

(٥٦٥) أخرجه: أحمد (٤٣٣٦) وقال محققوهُ: اسناده ضعيف، والبزار (١٨٢٩)، والطبراني (١٠٥٣١)، والحاكم (١١٧/٢) وصححه.

(٥٦٦) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨١٤٥) وقال محققه: رجاله ثقات، والبزار (١٨٢٨)، وأورده الحافظ في (المطالب) (٤٣٠٧)، والبوصيري (اتحاف الخيرة المهرة) (٦٣١٧) وقال: رجاله ثقات.

(٥٦٧) أخرجه: عبدالرزاق (٩٧٤١)، ومسلم (٧٦/١٧٧٥)، وابن هشام (السيرة) (٦٠/٤) (٩٨٠) وقال محققاهُ: اسناده حسن.

(٥٦٨) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١٤٣/٥)، وقال الذهبي (المغازي) (٥٨٣): اسناده جيّد.

(٥٦٩) نفس المصدر السابق.

(٥٧٠) أخرجه: الحافظ (المطالب العالية) (٤٣٧٠) والبوصيري (اتحاف الخيرة المهرة) (٦٣١٥) عن مسدد.

(٥٧١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣٠١/١٩)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٢٨٦): رواه الطبراني عن خليفة بن خياط ومحمد

## شکستخواردنی هەوازن

بەوجۆرە بەهۆی ئازایەتی و نەبەردی پێغەمبەری خواوە ﷺ و بانگکردنی هاوەڵان و پاشان کۆبوونەوەیان لەلای و هاوکاری خوای گەورەو ناردنی فریشتەکان بۆ پشتیوانی کردنی پێغەمبەر ﷺ هەموو ئەوانە ڕۆڵێکی سەرەکییان هەبوو بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمندا وخوادا هەموو ئەوانەی کردە هۆکار بۆ سەرخستنی موسوڵمانان:

دواتر تێکڕای سوپای موسوڵمانان گەڕانەوە (و دەستەو یەخە بەشەڕ هاتن لەگەڵیان)دا[٥٧٢]. (لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ بەسەر پشتی هێسترەکەیەوە خۆی بەرز دەکردەوە تا جەنگەکە ببینێت ودەیفەرموو: ((هَذَا حِينَ حَمِيَ الْوَطِيسُ))[٥٧٣] واتە: ((ئێستا ئیتر جەنگ بەتەواوەتی گەرم بوو)) لەگێڕانەوەیەکی تردا: (پێغەمبەر ﷺ بەسەر وڵاخەکەیەوە خۆی بەرز دەکردەوە تا بەڕێوەچوونی جەنگەکە ببینێت، تەماشای کردن و فەرمووی: ((الْآنَ حَمِيَ الْوَطِيسُ))[٥٧٤] واتە: ((وە ئێستا جەنگ گەرم بوو)) (وە پاشان لەهێسترەکەی دابەزی)[٥٧٥] (و مشتێك وردە چەوی سپی بەدەستەوە گرت)[٥٧٦] و (ڕوو بە دوژمن هەڵیداو پاشان فەرمووی: ((انْهَزَمُوا وَرَبِّ مُحَمَّدٍ) (انْهَزَمُوا وَرَبِّ الكَعبة، مَرَّتَيْنِ))[٥٧٧] واتە: ((دوژمن شکا سوێند بەخودای موحەممەد)) ((ئەوان شکان سوێند بەخودای کەعبە. ئەوان شکان سوێند بەخودای کەعبە).

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێت: (لەکاتێکدا دوژمن هێرشیان هێنایە سەر پێغەمبەر ﷺ، ئەو لە هێسترەکەی دابەزی و مشتێك خۆڵی زەوی بەدەستەوە گرت و بەرەو ڕووی ئەوان هەڵیداو فەرمووی: ((شَاهَتِ الْوُجُوهُ)) واتە: ((ڕوخسارتان

---

بن سلام وكلاهما ثقة.

(٥٧٢) أخرجه: ابويعلى (٣٦٠٦) وقال محققه: اسناده حسن.

(٥٧٣) أخرجه: عبدالرزاق (٩٧٤١) ومسلم (٧٦/١٧٧٥).

(٥٧٤) أخرجه: عبدالرزاق (٩٧٤١)، وابن هشام (٦٠/٤) (٩٨٠) وقال محققاه: اسناده حسن، والبيهقي (الدلائل) (١٢٩/٥).

(٥٧٥) أخرجه: الحاكم (١١٦/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي.

(٥٧٦) أخرجه: ابويعلى (٣٦٠٦) وقال محققه: اسناده حسن، والطبراني (الاوسط) (٢٧٥٨) وقال محققه: اسناده حسن.

(٥٧٧) أخرجه: مسلم (٧٦/١٧٧٥، ٧٧)، وأحمد (١٧٧٥).

بشێوێت)). ئیتر هەموو دەم و چاویان[٥٧٨] پڕ بوو لە تەپوتۆزی ئەو مشتە خۆڵە[٥٧٩] (عەبباس ؓ دەڵێت: چووم تەماشام کرد جەنگەکە وەك خۆی دەچوو بەڕێوە، بەڵام سوێند بەخوا هەر ئەو مشتە چەو و خۆڵەی تێگرتن ئیتر هەموو شکستیان خواردو سوپاکەیان لە پاشەکشەدا بوو)[٥٨٠].

(عوروە ؓ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ مشتە خۆڵی بەهەر چوار لادا تێگرتن و بەهەر لایەکدا تێی دەگرتن ئەوان لەو قۆڵەوە شکستیان دەخوارد)[٥٨١] (بەتەواوەتی خودا شکستی پێ هێنان و ڕایانکرد)[٥٨٢] لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە دڵ و دەروونی ئەوانی تۆقاندبوو، یەکێك لەموشریکەکان دواتر ئەوە دەگێڕێتەوە ناوی (حارسی کوڕی بەدلە) بوو و دەڵێت: (دواتر پێغەمبەر ﷺ مشتێك خۆڵی سەر زەوی بەڕووماندا هەڵدا ئیتر شکستمان خواردو ڕامانکردو و وامان دەزانی هەموو دارو بەردێکی ئەو ناوە (ئەسپ سوارە)[٥٨٣] بەدوومان کەوتووە)[٥٨٤] پاشان (گوێمان لە گرمەیەك بوو لەئاسمان دەهاتە سەر زەوی دەنگی ئاسنێك کە بکێشرێت بەناو تەشتێکی مسدا)[٥٨٥] (یاخود وەك ئەوە وابوو لەناکاودا بەردێ هەڵبدەیتە ناو تەشتێکەوە، ئەوە کاری لەناو دڵمان دەکردو دەتۆقاین و دەترساین)[٥٨٦].

لەگێڕانەوەیەکی (لاوازدا) هاتووە (یەکێك لەپیاوانی دوژمن مێلورەی ڕەشی دەبینی لە ئاسمانەوە دەبارینە گۆڕەپانی جەنگەکەوەو دەڵێت: من گومانم لەوەدا نەبوو کە ئەوانە فریشتەن ئەوەندەی پێ نەچوو هەموو شکاین و ڕامان کرد)[٥٨٧].

---

(٥٧٨) أخرجه: أحمد (٢٢٤٦٧) وقال محققه: حسن لغيره، وابوداود (٥٢٣٣)، والطبراني (الكبير) (٧٤١/٢٢)، والطيالسي (١٤٦٨) واسناده صحيح كما قال البوصيري (اتحاف الخيره) (٦٣١٣).

(٥٧٩) أخرجه: مسلم (١٧٧٥).

(٥٨٠) أخرجه: مسلم (٨١/١٧٧٧).

(٥٨١) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١٣٣/٥).

(٥٨٢) أخرجه: مسلم (٨١/١٧٧٧).

(٥٨٣) أخرجه: يعقوب بن سفيان (المعرفة والتاريخ) (٣٢٧/١).

(٥٨٤) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣٣٦٨)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٢٧١): رواه الطبراني ورجاله ثقات.

(٥٨٥) أخرجه: أحمد (٢٢٤٦٧) وقال محققهُ: حسن لغيره، وابوداود (٥٢٣٣)، والطبراني (الكبير) (٢٢/(١٧٤١)، والطيالسي (١٤٦٨) واسناده صحيح كما قال البوصيري في (اتحاف الخيرة المهرة) (٦٣١٣).

(٥٨٦) أخرجه: الحميدي (٤٣٩)، والطبراني (الكبير) (٢٣٧/٢٢)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٢٧٩): رواه الطبراني ورجاله ثقات.

(٥٨٧) أخرجه: أحمد (٢٢٤٦٧) وقال محققهُ: حسن لغيره، وابوداود (٥٢٣٣)، والطبراني (الكبير) (٢٢/(١٧٤١)، والطيالسي

(پیاوێکی کەتەو زل ئاڵای موشریکەکانی پێ بوو پۆشاکەکەشی ڕەش بوو سواری وشترێکی سوور بوو پێشی دوژمن کەوتبوو جارجار بە ڕمەکەی دەجەنگاو دواتریش بەرزی دەکردەوە تا هەموو بەدوایدا بێین، عەلی و پیاوێکی ئەنصاری بۆی چوون عەلی لەدواوە دای لەهەردوو قاچی وشترەکەو کابرا بەپشتا کەوتە خوارەوەو ئەنصاریەکەش چووە سەری و سەرەتا لەقاچی دا قرتاندی و پاشان کوشتی، ئیتر جەنگ گەرم تربوو دوژمن شکاو هەموو دەستگیر کران لەکاتێکدا هێشتا پاشماوەی سوپای موسوڵمانان بەتەواوەتی هەموو نەگەڕابوونەوە گۆڕەپانی جەنگەکە)[٥٨٨] (پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانانی هاندا بۆ جەنگەکەو فەرمووی: ((مَنْ قَتَلَ قَتِيلًا، لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلَبُهُ))[٥٨٩] واتە: ((هەر یەکێك کەسێکی دوژمن بکوژێت و بەڵگەی لەسەری هەبێت هەموو دەستکەوت و کەلوپەلی ئەو کەسە بۆ ئەو دەبێت)). (لەو ڕۆژەدا ئەبوتەلحە بیست پیاوی لێ کوشتبوون و کەلوپەلەکانیان بووە دەسکەوتی ئەو)[٥٩٠].

## ڕاونانی دوژمن و شوێنکەوتنیان بۆ ناوچەی نەخلەو ئەوتاس

هەوازن توشی شکستێکی خراپ هاتن بەهەموو لادا هەڵاتن کەمێکیان مانەوەو موسوڵمانان بەئاسانی بەسەریاندا سەرکەوتن، لە ڕاکردنەکەیاندا ژمارەی زیاتریان لێ کوژرا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە موسوڵمانان دا تا شوێنی ڕاکردووەکان بکەون تا لاوازتریان بکەن و جارێکی تر نەتوانن ڕیزەکانیان ڕێك بخەنەوە دژ بەموسوڵمانان.

عەبباس ﷺ دەفەرموێت: (ئێستاش هەر لەپێش چاومە کە پێغەمبەر ﷺ بەسواری هێسترەکەیەوە لەگەڵ موسوڵمانان شوێنی دوژمن کەوتبوو)[٥٩١] دەیفەرموو: ((جزوهم جزاً)) واتە: ((بە تەواوەتی بیان بڕنەوە)) و ئاماژەی کرد بۆ گەردنی خۆی

(١٤٦٨) واسناده صحيح كما قال البوصيري في (اتحاف الخيرة المهرة) (٦٣١٣).

(٥٨٨) أخرجه: الحميدي (٤٣٩)، والطبراني (الكبير) (٢٣٧/٢٢)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٢٧٩): رواه الطبراني ورجاله ثقات.

(٥٨٩) أخرجه: البخاري (٤٣٢١).

(٥٩٠) أخرجه: مسلم (١٨٠٩)، وابوداود (٢٧١٨)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٣٦٢) والاناؤوط في (سنن ابي داود) (٣٥٢/٤).

(٥٩١) أخرجه: مسلم (٧٧/١٧٧٥)، وأحمد (١٧٧٥) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

(واتە: لەگەردنیان بدەن)[٥٩٢] بەم جۆرە هەوازن شکا لەو جەنگەداو بەهەموو چیاو دۆڵی ئەو ناوچەیەدا بڵاو بوونەوە، مالیکی کوڕی عەوف بەرەو تائیف ڕۆیشت خۆی لە قەڵاکەیان قایم کرد، هەندێکیان بەرەو شیوی ئەوتاس چوون کە لەنێوان حونەین و تائیفدایە، وە هەندێکی تریان لەشیوی نەخلە لەنێوان سواحەو شەرائیحدا مانەوە، سوارەکانی موسوڵمانان شوێنیان کەوتن.

پێغەمبەر ﷺ ئەبوعامیری ئەشعەری بەدوایاندا ناردە ئەوتاس و لەوێدا دووبارە لەگەڵیان بەجەنگ هاتن و هەرلەوێ دورەیدی کوڕی سومەیان کوشت و ئەبوعامیریش تیرێك لەکلاوەی ئەژنۆی داو ئەبوموسای لەجێگەکەی خۆی دانا[٥٩٣].

بەسەرهاتەکەش ئەبوموسای ئەشعەری ﷺ دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: (کۆتایی بەجەنگی حونەین هات و پێغەمبەر ﷺ ئەبوعامری کردە سەرکردەی سوپایەك ناردی بۆ ناوچەی ئەوتاس و لەوێ بە دورەیدی کوڕی سوممە گەیشت و ئەوی کوشت و هاوەڵانی هەموو ڕایانکردو خودا ئەوانی شکاند، یەکێك لە دوژمنان تیرێکی گرتە ئەبو عامیرو لەکلاوەی ئەژنۆیدا جێگیربوو ئەمەش لەدوای ئەوەبوو کە دورەیدی کوشت منیش گەیشتمە لای و پێم وت: مامە کێ ئەو تیرەی تێ گرتیت؟ ئەویش یەکێکی لەدوژمن دەست نیشان کردو وتی ئەوە بوو دەیبینیت. منیش بەرەو ڕووی چووم ئەو کەسە کوڕەکەی دورەید بوو، کاتێك پێی گەیشتم و منی بینی پشتی تێ کردم و ڕایکرد منیش بەدوایدا چووم و پێم دەوت: ئەوە شەرم ناکەیت؟ ئەوە تۆ عەرەب نیت؟ ئەوە غیرەتت نییە بوەستیت، ئیتر وەستاو بەشەڕ هاتین و شمشێرێکم لێداو کوشتم.

پاشان گەڕامەوە لای ئەبوعامیر وتم: خوا دوژمنەکەتی کوشت. وتی ئەم تیرەم لێ دەربهێنە، منیش دەرم هێناو ئاوی لێ هاتەخوار وتی: برازا بچۆرەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ و سڵاوی منی پێ بگەیەنەو پێی بڵێ: ئەبوعامیر پێت دەڵێت: داوای لێ خۆشبوونم بۆ بکە.ئەبوعامیر منی کردە بەرپرس لەجێی خۆی بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو گیانی سپارد و مرد...)[٥٩٤].

---

(٥٩٢) أخرجه: البزار (١٨٣٠)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٨١/٦): رواه البزار ورجاله ثقات.

(٥٩٣) انظر: (السيرة الصحيحة) للعمري (٥٠٥/٢).

(٥٩٤) أخرجه: مسلم (١٦٥/٢٤٩٨)، وأحمد (١٩٥٦٧) وقال محققوه: صحيح، والطبراني (الاوسط) (٦٧٣٨) واسناده حسن

موسوڵمانان بۆ لەناوبردنی پاشماوەی سوپای موشریکەکان دوایانکەوتن و لەناوچەی ئەوتاسە جەنگێکی بەهێز لەنێوانیاندا ڕوویداو لەئەنجامدا موسوڵمانان تیایدا سەرکەوتن و دورەیدو سێ سەد کەسیان لێ کوشتن، لەوێدا هەندێك ژن و منداڵیش کوژران (وچەندەهاشیان لێ دەست بەسەرکردن)[٥٩٥] هەواڵی کوشتنی ژن و منداڵ گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ و زۆری پێناخۆش بوو، ئەنەس ﷺ دەڵێت: (دورەید لەگەڵ شەش سەد کەس کە هەموو لەگەڵی بوون لەو ناوچەیە چوونە سەر تەپۆڵکەیەك، هەندێك لەهاوەڵانی پێیان وتبوو: سوێند بەخوا وا یەکەیەکی سەربازیان بەرەو ئێرە دێت. ئەویش وتبووی، شێوەیانم بۆ باس بکەن، وتیان: کەسانێك دەبینین ڕمەکانیان بەدرێژی بەدەستەوەیە و ئەسپ سوارن و تازە وا دەگەنە لای خوارووی تەپۆڵکەکە.

دورەید وتبووی: هیچ خەمتان نەبێت ئەوانە ئەوس و خەزرەجن، دواتر وتبوویان: ئەوا یەکەیەکی تریان دەبینین پڕ چەکن و بەناو شیوەکەدا دێن. وتی: شێوەیانم بۆ باس بکەن، وتبوویان: کەسانێکن ڕمەکانیان لەنێوان هەردوو گوێی ئەسپەکانیان داناوەو دەست و قاچ گۆشتن و ئەوها ئەوهان. دورەید وتی: ئەوانە هۆزی بەنوسولەیمن و هیچ زیانێکیان بۆ ئێوە نابێت و ئەوانیش بەناو شیوەکەدا دەڕۆیشتن.

پاشان وتیان: ئەوە سوارێکە وا بەرەو ئێرە دێت. وتی: هاوار بۆ ئێوە هەر بەتەنها خۆیەتی؟ وتیان: هەر بەتەنها خۆیەتی. وتی: شێوەیم بۆ باس بکەن، وتیان: سوارێکە لبادی سەر ئەسپەکەی شۆڕەو جەمەدانەیەکی ڕەشی لەسەرەو ڕمەکەی لەسەر شانی داناوە. دورەید وتی: ئەوە زوبەیری کوڕی عەواممە سوێند بەخودا ئەو دەتان کوژێت و ئێرەتان پێ چۆڵ دەکات خۆتانی بۆ بگرن. کاتێك زوبەیر گەیشتە سەر تەپۆڵکەکە و ئاوڕی بەلایاندا دایەوەو وتی: ئەوانە بۆ لێرەن؟ ئیتر ئەو لەگەڵ ئەوانەی کە لەگەڵی بوون بەشەڕ هاتن و سێ سەدیان لێ کوشتن و سەری دورەیدی لە لاشەی

---

كما قال الحافظ (الفتح) (٤٣٠/٨)، وابن حبان (٧١٩١) وقال محققه: حديث صحيح. واللفظ لمسلم و الزيادات لأحمد وابن حبان.

(٥٩٥) أخرجه: البخاري (٤٣٢٣)، ومسلم (٣٥/١٠) وأحمد (١٩٧١٣)، وابن حبان (٧١٩٨) وانظر: (صحيح الترمذي) (٣٧/٣) و (صحيح النسائي) (٧٠/٢)، وابو يعلى (٧٢٣٢).

کردەوە)[٥٩٦].

لەو جارەشیاندا ئافرەتانێك لەوان کوژرا، ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێت: (پیاوێکئافرەتێکی دەست بەسەر کردبوو ئەو دەستی دابووە شمشێرەکەی و پیاوەکەش کوشتبووی. ئەم هەواڵە گەیەنرایە پێغەمبەر ﷺ ئەویش (کوشتنی ئافرەتی قەدەغە کرد)[٥٩٧]. حەنزەلەی کاتیبیش دەڵێت: (ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین لەغەزای (حونەین)دا[٥٩٨] خالیدی کوڕی وەلیدیش لەپێشی سوپاکەدا بوو، ڕەبیاح و هەندێك لەهاوەڵانی بەلایدا ڕۆیشتن دەوەستان و سەریان سوڕما بوو لە جوانی ئەو ئافرەتە، تا پێغەمبەر ﷺ هات و بینی وپرسیاری کرد لەکەسێك و ئەویش وەڵامی دایەوە وتی: من لەدواوە لەگەڵ خۆم سواری ئەسپەکەمم کردبوو ئەویش دەیویست من بکوژێت بەڵام من ئەوم کوشت پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا ئەو بنێژرێت)[٥٩٩] (و پاشان فەرمووی: ((نەدەبوو ئەمە بکوژرایە)).

پاشان تەماشای کردن و بەیەکێکیانی فەرموو: (( الْحَقْ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ (فَقُلْ لَهُ: لَا يَقْتُلَنَّ) ذُرِّيَّةً وَلَا عَسِيفًا)) واتە: ((بڕۆ خۆت بگەیەنە بە خالیدی کوڕی وەلید (وپێی بڵێ): کرێگرتەو منداڵیش نەکوژێت))[٦٠٠].

ئەسوەدی کوڕی سەریعیش ﷺ دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ لەدوای جەنگی حونەیندا مەفرەزەیەکی نارد کەوتنە شەڕ لەگەڵ دوژمنداو منداڵیش لەو نێوانەدا کوژرا، هەواڵەکە گەیەنرایە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( مَا بَالُ أَقْوَامٍ جَاوَزَهُمُ الْقَتْلُ الْيَوْمَ حَتَّى قَتَلُوا

---

(٥٩٦) أخرجه: ابن هشام (٧١/٤) وعنه البيهقي (الدلائل) (١٥٤/٥)، و أخرجه: البزار (١٨٢٧) وقال الحافظ في (فتح الباري) (٤٢/٨): اسناده حسن وقال في (مختصر زوائد مسند البزار) (٨١٦): متنه منكر. وصححه مجدي السيّد في (صحيح سيرة ابن هشام) (١٧٦٥). واللفظ للبزار والزيادات لابن هشام.

(٥٩٧) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٤٧٠/١٤)، وأحمد (٢٣١٦) وقال محققه: حسن لغيره، والطبراني (الكبير) (١٢٠٨٢).

(٥٩٨) انظر: (فتح الباري) (١٤٧/٦).

(٥٩٩) أخرجه: مسدد كما في (المطالب) لابن حجر (١٩٧٨)، وقال البوصيري (الاتحاف) (٦٣١٦): مرسل رجاله ثقات.

(٦٠٠) أخرجه: ابوداود (٢٦٦٩)، والنسائي (الكبرى) (٨٥٧١،٨٦٢٥)، وابن ماجة (٢٨٤٢)، وسعيد بن منصور (٢٦٢٣)، وابن حبان (٤٧٨٩) وقال محققه: اسناده صحيح، وموسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٨٦)، والحاكم (١٢٢/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وابونعيم (معرفة الصحابة) (٢٤٥/١) وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٧٠١)، و (صحيح ابي داود) (٢٣٢٤)، و (صحيح ابن ماجة) (٢٢٩٤)، والبوصيري في (مصباح الزجاجة) (٤١٨/٢) وقال: اسناده صحيح.

الذُّرِّيَّةَ)) واتە: ((بۆ کەسانێك ئەمڕۆ زیادەڕەوییان کردووە لە کوشتاردا تا منداڵیشیان کوشتووە)) پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە منداڵانی موشریکەکانن فەرمووی: ((ئەی چاکترینتان (پێشتر) منداڵانی موشریکەکان نەبووە؟!)) پاشان فەرمووی: ((أَلَا لَا تَقْتُلُوا ذُرِّيَّةً، كُلُّ نَسَمَةٍ تُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، حَتَّى يُعْرِبَ عَنْهَا لِسَانُهَا، فَأَبَوَاهَا يُهَوِّدَانِهَا وَيُنَصِّرَانِهَا))[٦٠١] واتە: ((ئاگاداربن منداڵ نەکوژن، ئاگاداربن منداڵ نەکوژن، هەموو کەسێك بەپاکی (واتە: خواناسی) لەدایك دەبێت تا گەورە دەبێت) و بەزمانی خۆی بڕیار دەدات، باوك و دایکی یان دەیکەنە جولەکە یان نەصرانی).

ئیبنو عەبباس ﷺ دەفەرموێت: (لەجەنگی حونەیندا پێغەمبەر ﷺ کوشتنی منداڵانی موشریکەکانی قەدەغەکرد)[٦٠٢].

ئەبوموسای ئەشعەری ﷺ دواتر لەگەڵ مەفرەزەکەی گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکانی پێ گەیاند لەگەڵ داواکارییەکەی ئەبوعامری ئەشعەری: ئەبوموسا ﷺ دەفەرموێت: (ئاڵاکەم هەڵگرت و پاشان لەگەڵ مەفرەزەکە گەڕامەوە لای پێغەمبەر ﷺ و چومە ژوورەوە، پێغەمبەر ﷺ لەسەر قەرەوێڵەیەك بوو کە بەپەلی دارخورما دروست کرابوو ڕاخەرێکی بەسەردا درابوو، کاتێك پێغەمبەر ﷺ هەستا ئاسەواری تاڵەکانی قەرەوێڵەکە بەملاو لای پشتییەوە دیاربوو، کاتێك منی بینی ئاڵاکەم بەدەستەوە بوو فەرمووی: ((ئەبوموسا ئایا ئەبوعامر کوژرا؟)) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا وە هەموو هەواڵەکانمان بۆ گێڕایەوەو پێم وت: ئەبوعامر داوای لێ دەکردیت تۆ داوای لێخۆش بوونی بۆ بکەیت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا ئاوی دەستنوێژی بۆ بهێنن دەستنوێژی گرت و پاشان هەردوو دەستی بەرز کردەوەو فەرمووی: ((اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعُبَيْدٍ أَبِي عَامِرٍ)) واتە: ((خودایە لەو ئەبوعامرەی بەندەی خۆت خۆشببە)) ئەوەندە دەستی بەرزکردبووەوە من سپیایی ژێر باڵەکانیم لێ دیاربوو، پاشان فەرمووی: ((اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ يَوْمَ القِيَامَةِ فَوْقَ كَثِيرٍ مِنْ خَلْقِكَ .....)) واتە: ((خودایە لەقیامەتدا بەرزی بکەرەوە بەسەر زۆرێك لەدروست

---

(٦٠١) أخرجه: أحمد (١٥٥٨٩،١٥٥٨٨) وقال محققوهُ: رجاله ثقات، والنسائي (الكبرى) (٨٦١٦)، والطبراني (الكبير) (٨٢٩)، والحاكم (١٢٣/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (١٣٠/٩).

(٦٠٢) أخرجه: ابن حبان (١٣٧) وقال محققه: اسناده حسن.

کراوەکانتدا....)) منیش وتم: دوعا بۆ منیش بکەو داوای لێ خۆش بوونم بۆ بکە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ ذَنْبَهُ، وَأَدْخِلْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُدْخَلًا كَرِيمًا))[٦٠٣] واتە: ((خودایە لەگوناهی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس خۆش ببەو لەقیامەتدا نیشتەجێی شوێنێکی پڕ ڕێزی بکە)).

## کوژراوانی هەوازن

بەوجۆرە خودای گەورە ئارامی خۆی ناردە سەر پێغەمبەرو بڕواداران و سەرکەوتنێکی گەورەی پێ بەخشین و بەسەدەهاش لەهەوازن کوژراو هەموو شەڕکەرەکانیان ڕایانکرد و ژن و منداڵ و سامان و مەڕو ماڵاتەکانیان بەجێهێشت و هەموو بووە دەسکەوتی موسوڵمانان.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (لەکاتی ڕاکردنی هەوازن کوشتار زۆربوو لەتیرەی بەنی مالیکی سەقیفداو حەفتا پیاویان لێ کوژرا لەژێر ئاڵاکەیان لەوانە عوسمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەبیعەو ئاڵاکەشیان لای زی ئەلخیمار بوو......)[٦٠٤].

عەیازی کوڕی حاریس ﷺ دەڵێت: (لەجەنگی حونەیندا کوژراوانی خەڵکی تائیف ژمارەیان هاوشێوەی ژمارەی کوژراوانی قوڕەیش بوو لەجەنگی بەدر...)[٦٠٥] هەروەها (سێ سەد کەسیان لێ کوژرا لەگەڵ دورەیدی کوڕی ئەلسومەدا)[٦٠٦] وە (بەسەدەها لەتیرەی بەنو نەسری کوڕی موعاویەو پاشان لەتیرەی بەنی ڕیئاب کوژران...)[٦٠٧].

سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ دەفەرموێت: (لەو جەنگەدا شەش هەزار منداڵ و ئافرەت بووە دەسکەوتی موسوڵمانەکان)[٦٠٨] وە (لەسامانەکانیان دەست گیرا بەسەر

---

(٦٠٣) أخرجه: مسلم (١٦٥/٢٤٩٨)، وأحمد (١٩٥٦٧) وقال محققوه: صحيح لغيره، والطبراني (الاوسط) (٦٧٣٨) واسناده حسن كما قال الحافظ (الفتح) (٤٣/٨)، وابن حبان (٧١٩١) و قال محققه: حديث صحيح، واللفظ لمسلم و الزيادات لأحمد وابن حبان.

(٦٠٤) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٦٥/٤) رقم (٩٨٨)، والطبري (التاريخ) (٧٧/٣).

(٦٠٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣٦٨/١٧)، والبيهقي (الدلائل) (١٤١/٥).

(٦٠٦) أخرجه: البزار (١٨٣٧) وقال الحافظ في (الفتح) (٤٢/٨): اسناده حسن، وقال في (مختصر زوائد البزار) (٨١٦): متنه منكر.

(٦٠٧) انظر: (الطبقات) لابن سعد (١٥٢/٢)، و(المغازي) الواقدي (٩١٦/٣)، و (السيرة الصحيحة) للعمري (٥٠٤/٢).

(٦٠٨) أخرجه: عبدالرزاق (٩٧٤١) ورجاله ثقات كما في (زوائد عبدالرزاق) (٩٧)، وابن سعد الطبقات (١٥٥/٢)، والطبري

چوار ئوقیە زیو، وبیست و چوار هەزار وشترو زیاتر لەچل هەزار سەر مەڕ)دا[٦٠٩].
(پێغەمبەر ﷺ: مەسعودی کوڕی عەمری غیفاری کردە بەرپرسی دەسکەوتەکان)[٦١٠]
(وە ئەبوسوفیانی کوڕی حەربی کردە بەرپرسی ژن و منداڵە دەسکەوتەکان.
لەگێڕانەوەیەکی تردا دەڵێت ئەو کەسە ناوی: مەحمیەی کوڕی جەزی هاوپەیمانی قورەیش بوو)[٦١١] پێغەمبەر ﷺ (فەرمانیدایە بودەیلی کوڕی وەرقاء دەسکەوت و سامانەکان هەموو لەناوچەی جوعرانە ڕابگرێت تا خۆی دووبارە دەگەڕێتەوە لایان و ئەوە بوو هەموو لەوێ ڕاگیران)[٦١٢].

## زیانی موسوڵمانەکان

زیانی موسوڵمانەکان یەکجار کەم بوو بەراورد بەو جەنگە گەورەیە کە ژمارەیەکی زۆر لەهەردوولا تیایدا بەشداربوون، ناوی هەندێك لەشەهیدی موسوڵمانەکان (ئەبوعامیری ئەلئەشعەری، ئەیمەنی کوڕی عوبەید، یەزیدی کوڕی زەمعەی کوڕی ئەلئەسوەدو سوراقەی کوڕی حاریس‌ ﷺ)[٦١٣] ژمارەی بریندارەکانیان زۆر بووە بەڵام تەنها ناوی شەش کەسیان هێنراوە (لەوانە: ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان و عەلی ﷺ هەریەکە لەوانە بیست برینیان پێوە بوو)[٦١٤] (وە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا)[٦١٥] و (خالیدی کوڕی ئەلوەلید)[٦١٦]. پێغەمبەر ﷺ بریندارانی بەسەرکردەوە، عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەزهەر ﷺ دەفەرموێت: (لەجەنگی (حونەیندا)[٦١٧] لەدوای شکستی بێ باوەڕەکان، پێغەمبەرم ﷺ بینی بەناو موسوڵمانانندا دەگەڕا (پرسیاری

(التاريخ) (٨٢/٤) من كلام سعيد بن مسيب ومراسيله صحيحة.

(٦٠٩) أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (١٥٢/٢) ومعلقاً بدون اسناد.

(٦١٠) أخرجه: ابن هشام (٧٥/٤).

(٦١١) أخرجه: عبدالرزاق (٩٧٤١)، والبيهقي (الدلائل) (١٥٥/٥) من قول سعيد بن المسيب ومراسيله صحيحة.

(٦١٢) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨١٨٩) وفي (الاوسط) (٧٢٥٢)، والبزار (١٨٣٧)، وقال الحافظ في (الاصابة) (١٤١/١) (٦١٤): اسناده حسن.

(٦١٣) أخرجه: ابن هشام (٧٤/٤)، والطبري (التاريخ) (٨١/٣)، والبيهقي (الدلائل) (١٥٤/٥)، وابن عبدالبر (الدرر) (ص:٢٧٢).

(٦١٤) أخرجه: البزار (١٨٣٧) وقال الحافظ (الفتح) (٤٢/٨): اسناده حسن.

(٦١٥) أخرجه: البخاري (٤٢٣٤).

(٦١٦) أخرجه: الحميدي (٣٩٨/٢) واسناده صحيح كما في (السيرة الصحيحة) (٥٠٤/٢).

(٦١٧) أخرجه: أحمد (١٦٨٠٩، ١٩٠٨٠) وقال محققوهُ: حديث حسن، والنسائي (الكبرى) (٥٨٢٤)، والحاكم (٣٧٤/٤) وصححه ووافقه الذهبي.

جێگەی خالیدی کوڕی وەلیدی دەکرد)[٦١٨] (وە دەیفەرموو: ((مَنْ يَدُلُّ عَلَى رَحْلِ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ)) واتە: ((کێ شوێنی خالیدی کوڕی وەلیدمان پێ نیشان دەدات)). منیش گەنجێك بووم لەپێشیەوە دەڕۆیشتم و دەم وت: کێ جێگەی خالیدی کوڕی ئەلوەلید پێ دەزانێت تا دواجار دۆزیمانەوەو چووینە لای و بینیمان خالید پاڵی داوەتەوە بە کۆپانەکەیەوە، پێغەمبەر ﷺ هات بۆلای و تەماشای برینەکەی کردو دوعای خوێندو فووی بەجێگەی برینەکەیدا کرد)[٦١٩].

لەم جەنگەدا پێغەمبەر ﷺ گلەیی نەبوو لەبەرانبەر ئەوانەی کە ڕایانکرد لەگۆڕەپانی جەنگەکە لەدوای تیربارانی موشریکەکان، ئوم و سولەیم ﷺ (فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو تازە موسوڵمانانە بکوژە کە توشی شکست بوون و ڕایانکرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((يَا أُمَّ سُلَيْمٍ، إِنَّ اللَّهَ قَدْ كَفَى وَأَحْسَنَ))[٦٢٠] واتە: ئەی ئوم و سولەیم خودا شوێنی ئەوانی بۆ پڕ کردینەوە بەباشتر...)).

## غەزای تائیف

(لەدوای ئەوەی موسوڵمانان هەوازنیان پەرتەوازە کردو شوێنیان کەوتن لەناوچەی نەخلەو ئەوتاس، پاشان هەموویان بە مالیکی کوڕی عەوفی سەرکردەکەشیانەوە بەرەو شاری تائیف ڕۆیشتن تا لەقەڵا سەختەکەیدا خۆیان بپارێزن. چونکە شاری تائیف تایبەتمەند بوو بەهۆی هەڵکەوتەی شوێنەکەیەوە لەنێوان چیای سەختداو قەڵاکەیان زۆر بەهێز بوو بۆ بەرەنگاربوونەوەو هیچ ڕێگەیەکی چوونە ناوەوەی نەبوو تەنها دەرگاکانی قەڵاکە نەبێت، ئەوان ئازوقەی ساڵێکیان بردبووە ناو قەڵاکەوە لەگەڵ هەموو جۆرە کەرەستەیەکی سەربازی پێویست کە لەڕێگەیەوە بتوانن تا درێژترین ماوە بەرەنگاری بکەن.

موسوڵمانان لەڕۆژی بیستی شەوالدا گەیشتنە لای شوراکانی قەڵای تائیف بەبێ

(٦١٨) نفس المصدر السابق.

(٦١٩) أخرجه: أحمد (١٦٨١١) وقال محققوه: حديث حسن، والشافعي (المسند) (١٥٦٢)، وابن حبان (٧٠٩٠) وقال محققه: صحيح، والبيهقي (الدلائل) (١٣٩/٥).

(٦٢٠) أخرجه: مسلم (١٨٠٩).

ئەوەی پشو بدەن لەدوای جەنگی حونەینەوە کە لە دەی مانگی شەوالدا بەڕێوەچوو کە ماوەی هەفتەیەکی خایاند)[٦٢١].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ و سوپاکەی بەناوچەی نەخلەی یەمانیدا بەڕێکەوتن پاشان بەسەر بەرزاییەکانی مەنازیلدا) (کە ئێستا هەشتا کیلۆمەتر دووره لەشاری مەککەو پەنجاو سێ کیلۆمەتر دووره لەشاری تائیف) پاشان بەسەر بەردەلانەکەی ڕوغا لەناوچەی (لەیە) کە (ئێستا پانزە کیلۆ مەتر دووره لەخواروی شاری تائیف) و لەوێدا مزگەوتێکی بونیاد ناو نوێژی تێدا کرد)[٦٢٢] دەڵێت: (لەو ناوچەیەدا تۆڵەی خوێن بۆ پیاوێکی هوزەیل کرایەوە لەپیاوێکی بەنی لەیس، وە لەوێدا پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا قەڵاکەی مالیکی کوڕی عەوف بسوتێنرێت و پاشان بڕوخێنرێت[٦٢٣] پاشان بەڕێگەیەکدا گوزەری کرد کە ناوی (زەیقە) بوو لەوێدا پرسیاری کرد سەبارەت بەناوی ڕێگاکە وترا ناوی (بەرتەسکە) فەرمووی: ((بَلْ هِي اليُسرى)) واتە: ((بەمانای بەرفراوانە)) پاشان لەوێوە چووە ناوچەی نەخب و لای دارێکی سیدر لایدا کە پێی دەوترا سادرە)[٦٢٤].

لەفەرموودەیەکی لاوازدا هاتووە: (موسوڵمانان لەکاتێکدا بەرەو شاری تائیف دەرۆیشتن بەلای گۆڕی ئەبو ڕیغالدا تێپەڕ بوون کە لەهۆزی سەقیفە: عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەڵێت: (لەکاتێکدا بەرەو شاری تائیف بەڕێ کەوتبووین تێپەڕبووین بەلای گۆڕی ئەبو ڕیغالدا ئەو بە باوکی سەقیف ناسراوە و لە بنەچەشدا لەقەومی سەمود بووەو لەکاتی لەناوبردنی سەمود ئەو لەچیای (حەرا)ی مەککە بووە و پارێزراو بووە، لەوێدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هَذَا قَبْرُ أَبِي رِغَالٍ، وَكَانَ بِهَذَا الْحَرَمِ يَدْفَعُ عَنْهُ، فَلَمَّا خَرَجَ أَصَابَتْهُ النِّقْمَةُ الَّتِي أَصَابَتْ قَوْمَهُ بِهَذَا الْمَكَانِ، فَدُفِنَ فِيهِ، وَآيَةُ ذَلِكَ أَنَّهُ دُفِنَ مَعَهُ غُصْنٌ مِنْ ذَهَبٍ، إِنْ أَنْتُمْ نَبَشْتُمْ عَنْهُ أَصَبْتُمُوهُ مَعَهُ)) واتە: ((ئەوە گۆڕی ئەبو ڕیغالە ئەو لەحەرەمی مەککەدا بووە کاتی خوای گەورە سزای بۆ قەومەکەی نارد،

---

(٦٢١) انظر: (السيرة الصحيحة) (٥٠٧/٢).

(٦٢٢) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٩٥/٤)، والطبري (التاريخ) (٨٣/٣).

(٦٢٣) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٩٥/٤) رقم (١٠١٤) وقال محققه: اسناده ضعيف لأرساله، والطبري (التاريخ) (٨٣/٣) وقال البرزنجي في (ضعيف تاريخ الطبري)(١٧٥): اسناده ضعيف، ولكنه يشهد له أن إماما اهل السيرة موسى بن عقبة وعروة بن الزبير اخرجاه: كما في (المغازي) لموسى بن عقبة (ص:٢٨٧)، والبيهقي (الدلائل) (١٥٧/٥).

(٦٢٤) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٩٥/٤).

بەڵام کاتێك لەوێ دەرچووە ئەویش لێرە توشی ئەو سزایە هاتووە کە قەومەکەی توشی هاتووەو لێرەدا نێژراوە، بەڵگەش ئەومیە کە پارچە ئاڵتونێکی لەگەڵ نێژراوە گەر ئێوە گۆڕەکەی هەڵبدەنەوە دەیبیننەوە لەگەڵی)) ئیتر خەڵکی گۆڕەکەیان هەڵدایەوەو وپارچە ئاڵتونەکەشیان لێ دەرکرد)[٦٢٥].

لەو ناوچەیەدا پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: ((«اجْمَعُوا، مَنْ وَجَدَ عُودًا فَلْيَأْتِ بِهِ، وَمَنْ وَجَدَ عَظْمًا أَوْ شَيْئًا فَلْيَأْتِ بِهِ» قَالَ: فَمَا كَانَ إِلَّا سَاعَةً حَتَّى جَعَلْنَاهُ رُكَامًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَتَرَوْنَ هَذَا، فَكَذَلِكَ تَجْتَمِعُ الذُّنُوبُ عَلَى الرَّجُلِ مِنْكُمْ كَمَا جَمَعْتُمْ هَذَا، فَلْيَتَّقِ اللهَ رَجُلٌ، فَلَا يُذْنِبْ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً، فَإِنَّهَا مُحْصَاةٌ عَلَيْهِ»))[٦٢٦] واتە: هەریەکەتان ئێسك بێت یان هەر شتێکی تر با بیهێنێت و لەوێدا دایبنێت). ئەوەندەی پێنەچوو بەوێنەی خەرمانێك شتیان کۆ کردەوە دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: ((ئەوە دەبینن ئا بەو جۆرە تاوانیش لەسەر مرۆڤ کۆدەبێتەوە وەك چۆن ئەوانەتان کۆکردەوە لەبەر ئەوە هەموو یەکێك لە ئێوە با بەباشی خۆی دوور بگرێت لە گوناهە بچوك و گەورەکان چونکە هەمووی تێکڕا لەسەر دەنوسرێت) ئەم فەرموودەیە لاوازە تەنها بۆ زانیاری هێناومە.

پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان بەرێ کەوتن تا لەخواروی نزیکی تائیف لایان دا چونکە نەدەتوانرا بەهۆی چیاکانی لای سەروویەوە لەوێ لابدەن. موسوڵمانان ویستیان لەوێدا سەربازگەکەیان جێگیر بکەن بۆئەوەی پێش بگرن بەهەموو یارمەتییەك کە لەڕۆژهەڵات و خوارووی تائیفەوە بێت بۆیان.

ئیبنو هیشام ﷺ دەڵێت: ( کاتێك هێزە پەراگەندەکانی هەوزان گەیشتنە ناو قەڵاکەی سەقیف، دەرگای شارەکەیان لەخۆیان داخست و خۆیان تیادا ئامادەکرد بۆ جەنگ و بەرەنگار بوونەوە)[٦٢٧]. بەهۆی نزیکیان لەقەڵاکانی سەقیف ئەوان تیرەکانیان دەگەیشتە موسوڵمانان بۆیە ناچار بوون لەوێ دووربکەونەوەو پاشەکشە بکەن.

---

(٦٢٥) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٢٠٩٨٩)، و البيهقي في (الكبرى) (١٥٦/٤)، وفي (دلائل النبوة) (٢٩٧/٦)، وابوداود (٣٠٨٨)، وابن حبان (٦١٩٨) وقال محققه: اسناده ضعيف، وقال ابن كثير (البداية) (١٣٠/١) قال الحافظ المزي: حديث حسنٌ عزيز، وضعفه الشيخ الالباني يرحمه الله في: (ضعيف ابي داود) (٦٧٨) و (الضعيفة) (٤٧٣٦)، و (ضعيف الجامع) (٦٠٨٢) واللفظ لابي داود مرفوعاً والزيادة لابن حبان موقوفاً ومرسلاً عند عبدالرزاق.

(٦٢٦) أخرجه: الطبرني (الكبير) (٥٤٨٥)، وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الترغيب و الترهيب) برقم (١٤٧٢).

(٦٢٧) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٩١/٤).

ئیبنو ئیسحاق ﷀ دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ بەڕێکەوت و لە نزیکی تائیف سەربازگەکەی دامەزراندو بەهۆیەوە چەند کەسێك لە هاوەڵانی شەهید بوون، چونکە سەربازگەکە لەشورای قەڵاکە نزیك بوو تیرەکانیان دەگەیشتە موسوڵمانان... بۆیە کشانە دواوە بۆ ئەو جێگەیەی کە مزگەوتەکەی تێدایە ئەمڕۆ..... پێغەمبەر ﷺ دوو لە هاوسەرانی خۆی لەگەڵدا بوو دوو دەواری بۆ هەڵدان وە لەنێوانیانی دوو دەوارەکەدا لەوێ نوێژی دەکرد لەو ماوەیەدا، دواتر کە سەقیف موسوڵمان بوون عەمری کوڕی ئومیە لەوێدا مزگەوتێکی دروستکرد.....)[٦٢٨].

## ئابڵوقەی تائیف

تائیف ئابڵوقە دراو موسوڵمانان لەگەڵیاندا بەشەڕ هاتن بەتیر هاویشتن و پێغەمبەر ﷺ هانی موسوڵمانانی دەدا کە تیرەکانیان بگەیەننە دوژمن: عەمری کوڕی عەبسە ﷺ دەفەرموێت: (لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین ئابڵوقەی شاری تائیفمان دابوو، بیستم دەیفەرموو: ((مَنْ (بَلَغَ الْعَدُوَّ) بِسَهْمٍ، (رَفَعَهُ اللهُ له) بِهِ دَرَجَةً في الجنة))[٦٢٩] واتە: (هەرکەسێك تیرێك بگەیەنێتە دوژمن بەهۆیەوە خوای گەورە پلەیەك بەرزی دەکاتەوە لەبەهەشتدا) (لەو ڕۆژەدا من شازدە تیرم گەیاندە دوژمن، و بیستم کە دەیفەرموو: ((مَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَهُوَ عَدْلُ مُحَرَّرٍ، وَمَنْ شَابَ شَيْبَةً فِي الْإِسْلَامِ كَانَتْ لَهُ نُورًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَأَيُّمَا رَجُلٍ مُسْلِمٍ أَعْتَقَ رَجُلًا مُسْلِمًا، فَإِنَّ اللَّهَ جَاعِلٌ كُلَّ عَظْمٍ مِنْ عِظَامِهِ وَفَاءَ كُلِّ عَظْمٍ بِعَظْمٍ مِنْهُ مِنَ النَّارِ، وَأَيُّمَا امْرَأَةٍ مُسْلِمَةٍ أَعْتَقَتِ امْرَأَةً مُسْلِمَةً، فَإِنَّ اللَّهَ جَاعِلٌ كُلَّ عَظْمٍ مِنْ عِظَامِهَا وَفَاءَ كُلِّ عَظْمٍ مِنْ عِظَامِ مُحَرَّرِهَا مِنَ النَّارِ))[٦٣٠] واتە: ((هەرکەسێك تیرێك بهاوێت لەپێناوی خوادا وەك بەندەیەك ئازاد بکات وەهایە، هەرکەسێکیش تاڵە موویەکی سپی بێت لەپێناوی خوادا دەبێتە نورو ڕووناکی بۆی لەڕۆژی قیامەتدا، هەرکەسێك

---

(٦٢٨) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٩٥/٤) برقم (١٠١٥)، والطبري (التاريخ) (٨٣/٣)، والبيهقي (الدلائل) (١٥٨/٥)، وقال الواقدي (٩٢٥/٣): والزوجة الثانية التي كانت مع النبي ﷺ (زينب بنت جحش) و (ام سلمة).

(٦٢٩) في رواية عن كعب بن عجرة ﷺ قال: قال عبدالرحمن بن النّهام: يا رسول الله وما الدرجة؟ قال: ((اما انّها ليست بعتبة امُك ما بين الدرجتين مائة عام)). أخرجه: النسائي (٢٧/٦)، وابن شيبة (٣٠٦/٥)، وأحمد (١٨٠٦٣) وقال محققه: حسن لغيره: وابن حبان (٤٦١٦) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(٦٣٠) أخرجه: ابوداود (٩٦٥٣)، والترمذي (١٦٣٨)، والنسائي (٢٦/٦)، وابن ماجة (٢٨١٢)، وأحمد (١٧٠٢٢) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والحاكم (١٦١/٩، ٤٩/٣) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وابن حبان (٤٦١٥)، والطيالسي (١١٥٤) وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٧٥٦١).

پیاوێکی کۆیلەی موسوڵمان ئازاد بکات بەهەر ئێسکێکی ئەو ئێسکێکی ئەم لەدۆزەخ ئازاد دەکرێت) هەر ئافرەتێکی موسوڵمانیش ئافرەتێکی کۆیلەی موسوڵمان ئازاد بکات لەبری هەر ئێسکێکی ئەو ئێسکێکی ئەم ئازاد دەکرێت لەدۆزەخ)).

لەهەندێك گێڕانەوەی لاوازدا هاتووە کە موسوڵمانان بۆ یەکەم جار چەکی تانك و مەنجەنیقیان بەکار هێناوە لەوانە:

١- ئیبنو هیشام ﷺ دەڵێت: (لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر ﷺ بە مەنجەنیق (ئاگرو بەرد) بارانی دەکردن، کەسێکی متمانە پێکراو بۆی باسکردم: پێغەمبەر ﷺ یەکەم جار کە مەنجەنیقی بەکارهێنا دژ بەقەڵای تائیف بوو)[٦٣١]

٢- ئەبو عوبەیدەی جەڕاح ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ئابڵوقەی خستە سەر تائیف و مەنجەنیقی لەدژیان بەکارهێنا)[٦٣٢].

٣- سەوری کوڕی یەزید ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ مەنجەنیقی دژ بە تائیف بەکارهێنا)[٦٣٣].

٤- مەکحول ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ دژ بەخەڵکی تائیف مەنجەنیقی بەکارهێنا)[٦٣٤].

٥- عەلی کوڕی ئەبوتالیب ﷺ دەفەرموێت: (دژ بەخەڵکی تائیف پێغەمبەر ﷺ مەنجەنیقی بەکارهێنا)[٦٣٥].

موسوڵمانان تانکێکیان لەو جەنگەدا بەکارهێنا کە بریتی بوو لە ئامێرێکی تەختەو سەرەکەیان بە پێست داپۆشی بوو وە ڕەوڕەوەی هەبوو لەسەری دەڕۆیشت، بەکاردەهێنرا بۆ کون کردنی دیواری قەڵاکان.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەڵێت: (جەنگەکە بەڕێوەچوو تا ڕۆژی کون کردنی دیوارەکە، لەوێدا هەندێك لەهاوەڵان چوونە ژێر تانکەکەو بە زەویدا بردیان بۆلای دیواری

---

(٦٣١) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٩٦/٤) رقم (١٠١٦) وقال محققه: اسناده ضعيف.

(٦٣٢) أخرجه: البيهقي (الكبرى) (٨٤/٩).

(٦٣٣) أخرجه: الترمذي (٢٧٦٢)، وقال الشيخ الالباني في (الضعيفة) (٢٨٨):

(٦٣٤) أخرجه: ابوداود (المراسيل) (٣٣٥)، وابن سعد (الطبقات) (١٥٩/٢) واسناده صحيح الى مكحول كما في (السيرة في وضوء المصادر الأصلية) (ص:٥٩٤) وفي (السيرة الصحيحة) (٥٠٩/٢).

(٦٣٥) أخرجه: العقيلي (الضعفاء) (٢٤٤/٢).

قەڵاکە تا کونێکی تێ بکەن، بەڵام سەقیف پارچە ئاسنی سوورکراوەیان بەسەردا بارانن و ناچاریان کردن لەژێری ڕابکەن و دواتر بەتیر هەندێکیان لێ کوشتن...)[٦٣٦].

لەهەندێك گێڕانەوەدا هاتووە: (ئەوەی بۆی دروست کردن سەلمانی فارسی بوو، یاخود توفەیلی کوڕی عەمر یاخود خالیدی کوڕی سەعید)[٦٣٧] موسوڵمانان ویستیان فشاری دەروونی بخەنە سەر خەڵکی تائیف و گیانی بەرەنگاربوونەوەیان لاواز بکەن لەڕێگەی بڕینەوەی هەندێك لە دارە مێوەکانیان یاخود بانگ کردنی خزمەکانیان بۆ هاتنە دەرەوە:

ئیبنو هیشام ﷺ دەڵێت: (.... ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب و موغیرەی کوڕی شوعبە چوونە پێش لەقەڵاکەو داوایان لە سەقیف کرد تیریان تێ نەگرن تا لەگەڵیاندا بدوێن، ئەوەبوو نزیك بوونەوەو هاواریان لەهەندێك ئافرەتی خزمانیان کرد ئەوان بەجێ بهێڵن و بێنەدەر نەبادا دواجار ببنە دەسکەوتی موسوڵمانان بەڵام کەس لەوان نەهات ئامینەی کچی ئەبوسوفیانیان لەناودا بوو کە ژنی عوروەی کوڕی مەسعود بوو)[٦٣٨].

عوروەی کوڕی زوبەیریش ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا هەموو یەکێك لە موسوڵمانان پێنج دارخورمای گەورەو پێنج دارمێو ببڕنەوە، پاشان عومەری کوڕی خەتتاب هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا زۆربەیان داری زڕو بێ بەرن)[٦٣٩]. موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (هەندێك لەدارە مێوەکانیان بڕین بۆئەوەی بەهۆیەوە تورەیان بکەن. سەقیف وتی: ئەو دارمێوانە مەبڕنەوە چونکە دواجار یان دەبێتە هی ئێمە یان دەبێتە هی ئێوە)[٦٤٠].

عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك موسوڵمانان دەستیان کردە بڕینی، دار مێوەکانی عیینەی کوڕی بەدر بە یەعلای کوڕی مورەی وت: حەرام بێت لەسەرم

(٦٣٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٩٧/٤)، والطبري (التاريخ) (٨٤/٣).

(٦٣٧) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١٦١/٥)، والواقدي (٩٢٧/٣).

(٦٣٨) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٩٧/٤)، والطبري (التاريخ) (٨٤/٣) واسناده مرسل.

(٦٣٩) أخرجه: ابونعيم (الدلائل) (٤٦٠)، والبيهقي (الدلائل) (١٥٧/٥) وفي (الكبرى) (٨٤/٩) وسنده مرسل وفيه مجاهيل. كما في (السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية) (ص:٥٩٥).

(٦٤٠) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٨٧)، وعنه البيهقي (الدلائل) (١٥٧/٥).

بەشی خۆم لەدارمێوەکان ببڕم، یەعلاش پێی وت: گەر دەتەوێت بەشەکەی تۆش لای خۆم لێرە دەبڕم...)[٦٤١].

لەگێڕانەوەیەکدا هاتووە: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا دارمێوەکانیان ببڕدرێن و بسوتێنرێن، سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵای سەقەفی بانگی کرد: بۆ ئەو دارانە دەبڕدرێت یان ئەوەتا بۆ تۆ دەبێت گەر سەرکەویت بەسەرماندا، یان ئەوەتا لەبەرخواو پاشان خزمایەتی وازی لێ بهێنە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فَإِنِّي أَدَعُهَا لِلَّهِ وَلِلرَّحِمِ))[٦٤٢] واتە: ((من لەبەرخواو پاشان خزمایەتی وازی لێ دەهێنم و دواتر وازی لێهێنا)).

دیسان وەك فشارێکی تری دەرونی موسوڵمانان بانگی کۆیلەکانی ناو تائیفیان کرد گەر بێن و خۆیان بدەن بەدەستەوە ئازاد دەکرێن:

عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بانگکارێکی نارد تا بانگیان لێ بکات و بڵێت: هەرکەسێك بێتەدەر بۆلامان ئەوە ئازاد دەکرێت. دواتر چەند کەسێکی ئەوان کە ئەبوبەکرەیان لەناودا بوو کەبرای زیادی کوڕی ئەبوسوفیانە هەموو هاتنەدەر وپێغەمبەر ﷺ ئازادی کردن و هەریەکەیانی دەسپاردە یەکێك لەموسوڵمانان تا یارمەتیان بدەن و لەگەڵ خۆیان سواریان بکەن)[٦٤٣].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەڵێت: (لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ ئابڵوقەی تائیفی دابوو هەندێك لەکۆیلەکانیان هاتنەدەر بۆ ناو موسوڵمانان لەوانە ئەبوبەکرە کە کۆیلەی حاریسی کوڕی کیلدە بوو لەگەڵ مونبەعیس و وردان و کۆمەڵێکی تر هەموو هاتن و موسوڵمان بوون)[٦٤٤] (ئەبو عوسمانی کوڕی نەهدی دەڵێت: (ئەبوبەکرە لەگەڵ بیست و دوو کەسی تردا لەقەڵای تائیف هاتنە خوارەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ)[٦٤٥].

ئیبنو عەبباس ﷺ دەفەرموێت: (لەکاتی ئابڵوقەکەی سەر شاری تائیف دا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مَنْ خَرَجَ إِلَيْنَا مِنَ الْعَبِيدِ فَهُوَ حُرٌّ)) واتە: ((هەر کۆیلەیەك

---

(٦٤١) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١٦٣/٥) مطولًا، وابونعيم (الدلائل) رقم (٤٦٠) مختصراً.

(٦٤٢) أخرجه: الواقدي (المغازي) (٩٢٧/٣) وعنه البيهقي (الدلائل) (١٦٢/٥).

(٦٤٣) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١٥٧/٥) وفي (الكبرى) (٨٤/٩) عن عروة مرسلًا.

(٦٤٤) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١٥٩/٥).

(٦٤٥) أخرجه: البخاري (٤٣٢٦، ٤٣٢٧).

بێتەدەر بۆ ناومان ئازاد دەکرێت)). دواتر هەندێك لەو کۆیلانە هاتنەدەر کە لەناویاندا ئەبوبەکرە بوو وە پێغەمبەر ﷺ ئازادی کردن)[٦٤٦] (چونکە هەر کۆیلەیەکیان بهاتایە بۆلای پێغەمبەر ﷺ ئازادی دەکرد)[٦٤٧]. لەگێڕانەوەیەکی تردا: (هەر کۆیلەیەکیان پێش خاوەنەکەی بهاتایەو موسوڵمان بووایە پێغەمبەر ﷺ ئازادی دەکرد)[٦٤٨]. ئەبوبەکرە ﷺ دەفەرموێت: (من لەگەڵ بیست و سێ کۆیلەدا لەکاتی گەمارۆکەدا هاتینە لای پێغەمبەر ﷺ ئەو ئازادی کردین. ئەو بۆلە کۆیلەیەش دواتر ناویان: ئازادکراوەکان بوو)[٦٤٩].

هەروەها دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ گەمارۆی قەڵاکەی تائیفی دابوو من بە خولخلۆکەیەك لەدیواری قەڵاکەوە خۆم شۆڕ کردەوەو دەرباز بووم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((چۆن هاتیتە خوارەوە))؟ وتم: هاتمە خوارەوە بە بەکرەیەك (واتە: خولخلۆکە). فەرمووی: ((أَنْتَ أَبُو بَكرِهِ))[٦٥٠] واتە: ((ئیتر تۆ ناوت ئەبوبەکرەیە). دواتر کاتێك سەقیفی خەڵکی شاری تائیف موسوڵمان بوون هاتن داوای ئەو کۆیلانەیان کرد تا بۆیان بگێڕێتەوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ قایل نەبوو فەرمووی: ((لَا، هُوَ (هُمْ) طَلِيقُ اللهِ، ثُمَّ طَلِيقُ رَسُولِ اللهِﷺ))[٦٥١] واتە: ((نا ئەوان ئازادکراوی خوا و پاشان ئازادکراوی پێغەمبەری خوان ﷺ).

---

(٦٤٦) أخرجه: أحمد (١٢٢٢٩) وقال محققوه: حسن لغيره.

(٦٤٧) أخرجه: أحمد (٢١٧٦) وقال محققوه: حسن لغيره، وابويعلى (٢٥٦٤)، وابن ابي شيبة (٥١١/١٢)، والدارمي (٢٥٠٨)، والطبراني (١٢٠٧٩).

(٦٤٨) أخرجه: أحمد (٢١١١) وقال محققوه: حسن لغيره.

(٦٤٩) أخرجه: عبدالرزاق (٩٦٨٢)، وقال الهيثمي (المجمع) (٢٤٥/٤): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح.

(٦٥٠) أخرجه: الحاكم (٢٧٨/٤) وصححه و وافقه الذهبي، وقال الهيثمي (المجمع) رقم (١٠٣٠٦): رواه الطبراني وفيه ابوالمنهال البكراوي ولم اعرفه وبقية رجاله ثقات، وقال الحافظ (الفتح) (٥٧/٨): اسناده لابأس به.

(٦٥١) أخرجه: أحمد (١٨٧٧٧) وقال محققوه: حديث صحيح.

## ڕووداوەکانی کاتی گەمارۆدانی شاری تائیف

### ١- ڕزگارکردنی حەنزەلەی کوڕی ڕەبیع:

جابیر ﷛ دەفەرموێت: (لەگەمارۆکەی تائیف دا پێغەمبەر ﷺ حەنزەلەی کوڕی ئەلڕەبیعی نارد بۆلای دانیشتوانی شاری تائیف، ئەو ڕۆیشت و قسەی لەگەڵ کردن بەڵام دواجار پەلاماریاندا و هەڵیانگرت تا بیبەنە ناو قەڵاکەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مَنْ لِهؤُلاءِ وَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ غزاتنا هَذهِ)) واتە: ((کێ دەڕوات بۆیان هەمان پاداشتی ئەم غەزایەمانی بۆ دەنوسرێت)) کەس هەڵنەستا بەتەنها عەبباس ﷛ هەستاو ڕۆیشت نزیك بوو بیبەنە ناو قەڵاکەیانەوە، عەبباس ﷛ پیاوێکی کەتەو گەورە بوو باوەشی بە حەنزەلەدا کردو لەوانی سەندەوەو هێنایەوە و ئەوانیش لەسەر قەڵاکەیانەوە بەرد بارانیان کرد، پێغەمبەر ﷺ دوعای سەلامەتی بۆ کرد تا دواجار بێ زیان گەڕایەوە لای پێغەمبەر ﷺ)[٦٥٢].

### ٢- وتارەکەی پێغەمبەر ﷺ لەناوچەی بەناوەی تائیف:

ئەبو زوهەیری سەقەفی ﷛ دەفەرموێت: (گوێم لەپێغەمبەر ﷺ بوو لە وتارەکەیدا لەناوچەی بەناوەی تائیف دەیفەرموو: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّكُمْ تُوشِكُونَ أَنْ تَعْرِفُوا أَهْلَ الْجَنَّةِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ )) فَقَالَ: رَجُلٌ : (بِماذا) يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: واتە: ((خەڵکینە ئێوە لەوانەیە بەهەشتییەکان بناسنەوەو جیایان بکەنەوە لە دۆزەخییەکان، یاخود دەی فەرموو: ((خِيَارَكُمْ مِنْ شِرَارِكُمْ)) واتە: ((نزیکە چاکەکانتان بناسرینەوە لە خراپەکانتان جیایان بکەنەوە)) پیاوێك وتی: بەچی ئەی پێغەمبەر ﷺ؟ فەرمووی: ((بِالثَّنَاءِ السَّيِّئِ، وَالثَّنَاءِ الْحَسَنِ، وَأَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللهِ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ))[٦٥٣] واتە: ((بەهۆی سەرزەنشت کردنی خراپەو ستایشکردنی چاکەوە، ئێوە گەواهی دەری خودان هەندێکتان لەسەر هەندێکتان)).

---

(٦٥٢) أخرجه: ابن عساكر (تاريخ دمشق) (٣٤١/١١)، والسيوطي (كنز العمال) (٢٤٧/١٠).

(٦٥٣) أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٨١١٥)، وأحمد (٢٧٦٤٥) وقال محققوه: حديث صحيح، والطبراني (الكبير) (٢٠/(٣٨٢))، وابن ماجة (٤٢٢١)، وابن حبان (٧٣٨٤)، والحاكم (٤/١، ٤٣٦/١٢٠) وصححه ووافقه الذهبي، والبزار (٢٣١/٤ كشف)، وصححه كل من: الحافظ في (الاصابة) (٧٧/٤)، والبوصيري (مصباح الزجاجة) (٣٠١/٣)، والشيخ الالباني (صحيح ابن ماجة) (٣٤٠٠) و (الطحاوية) (٢٣٤)، والشيخ مقبل (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٣٧٧).

### ٣- پەنیرەکەی تائیف:

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەفەرموێت: (لەغەزای تائیفدا پەنیرێکیان هێنایە لای پێغەمبەر ﷺ، هاوەڵان بەدار ئەمدیو ئەودیویان دەکردو دەیان وت: دەترسین مردارەوەبووی تێدا بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ضَعُوا فِيهَا السِّكِّينَ واقْطَعُوا، وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ))[٦٥٤] واتە: ((ناوی خودای لەسەر بهێنن و بەچەقۆ لەتلەتی بکەن). لەگێڕانەوەیەکی تردا: (پێغەمبەر ﷺ پرسیاری کرد: (ئەمە لەکوێ دروست کراوە))؟ وترا: لەناوچەی فارس، ئێمە وا دەزانین مردارەوە بووی تێکەڵ بکەن، فەرمووی: ((واقطعوا))[٦٥٥] واتە: ((ناوی خودای لەسەر بهێنن و بەچەقۆ لەتلەتی بکەن و بیخۆن)). لەگێڕانەوەیەکی تردا: (پرسیار لەپێغەمبەر ﷺ کرا سەبارەت بەخواردنی پەنیری ئەوان، فەرمووی: ((اقْطَعْ بِالسِّكِينِ وَاقْطَعُوا واَذْكُر اسمَ اللّهِ عَليهِ وَكُلْ))[٦٥٦] ((بەچەقۆ لەتلەتی بکەن و ناوی خودای لەسەر بهێنن و بیخۆن)).

### ٤- بەسەرهاتی نێرەموکەکە:

دایکی بڕواداران عائیشە ﷺ دەفەرموێت: (نێرەموکێك دەهاتە سەردانی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لێ نەدەکرا و لەوانەیان هەژمار دەکرد کە ئافرەت ناناسێ و پێویستی پێی نییە، جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لای ئوم سەلەمەی خێزانی بوو، ئەو پیاوەش لەوێ بوو (ئوم سەلەمە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە بۆلام و ئەو نێرەموکەم لەلابوو، لەو ساتەدا گەمارۆی تائیفیان دابوو، گوێی لێ بوو بە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئومەییەی[٦٥٧] دەوت: (واتە: برای ئوم سەلەمە): ئەی عەبدوڵڵای کوڕی ئومەییە سبەینێ گەر خودا تائیفی بۆ ئازادکردن من ئافرەتێکت بۆ دەست نیشان دەکەم کە ناوی بادییەی کچی غەیلانە ئەو ئافرەتە ڕووبەڕوو لە پێشەوە دەرکەوت و لەدواشەوە بە بەچوار وەك هەشت کەس وەهایە (واتە: قەڵەوە). پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أَلَا أَرَى هَذَا يَعْرِفُ مَا هَاهُنَا لَا يَدْخُلَنَّ عَلَيْكُنَّ (أَخْرِجُوهُ مِنْ بُيُوتِكُمْ))

---

(٦٥٤) أخرجه: أحمد (٢٠٨٠) وقال محققوه: حسن لغيره، والبزار (٢٨٧٨) والبيهقي (الكبرى) (٦/١٠) والطبراني (الكبير) (١١٨٠٧) واللفظ له، وقال الحافظ ابن رجب (جامع العلوم) (١٦٧/٢): أخرجه: الطبراني واسناده جيّد لكنه غريب.

(٦٥٥) أخرجه: أحمد (٢٧٥٥) وقال محققوه: حسن لغيره.

(٦٥٦) أخرجه: الطبراني (الاوسط) (١٥٧٤) وقال محققه: اسناده حسن لولا شيخ الطبراني فاني لم أجد.

(٦٥٧) أخرجه: البخاري (٤٣٢٤).

فَحَجَبُوهُ)[٦٥٨] واتە: ((وا دەبینم ئەمە شارەزای ئەم ناوەیە، لێرە بەدواوە ڕێگە نەدەن ئەمە بێتە ژوورەوە بۆلاتان و لە ماڵەکانتان دەری بکەن)) و دواتر دوورخرایەوە).

### ٥- باسەکەی خوەیلەی کچی ئەلحەکیم:

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (خومیلی کچی حەکیم... ژنی عوسمانی کوڕی مەزعون بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەر خودا شاری تائیفی بۆ ئازاد کردیت خشڵەکانی بادیەیی کچی غەیلان یان خشڵەکانی فاریعەی کچی عەقیلم بدەرێ، چونکە ئەوان خشڵیان لەهەموو ئافرەتانی تائیف زۆرتربوو. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((وَإِنْ كَانَ لَمْ يُؤْذَنْ لِي فِي ثَقِيفٍ يَا خُوَيْلَةُ؟))[٦٥٩] واتە: ((خومیلە ئەی ئەگەر ڕێگەم پێ نەدرابێت سەقیف ئازاد بکەم؟)). لەگێڕانەوەکەی ئەبو زوبەیردا ﷺ هاتووە: (خوەیلە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: هەواڵم پێ گەیشتووە کە کچەکەی خوزاعە لەهەمووان خشڵی زیاترە گەر سبەینێ خوای گەورە تائیفی بۆ ئازاد کردیت هەمووی بدە بەمن؟! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((إِنْ لَمْ يَكُنْ أَذِنَ لَنَا فِي قِتَالِهِمْ؟))[٦٦٠] واتە: ((ئەی گەر ڕێگەمان پێ نەدرابێت لەگەڵیان ڕووبەڕوو بجەنگێین)).

### ٦- ناردنی عەیینەی کوڕی حوسن بۆ شاری تائیف:

عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: عەیینەی کوڕی حوسن هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ وتی: ڕێگەم بدە تا بچم گفتوگۆیان لەگەڵ بکەم بەڵکو خوای گەورە هیدایەتیان بدات، پێغەمبەریش ﷺ ڕێگەی داو چووە ناو قەڵاکە بۆلایان و وتی: ئەی باوکم بەقوربانتان بێت دەست بەم جێگەیەی خۆتانەوە بگرن و چۆڵی نەکەن، سوێند بەخوا ئێمە لە کۆیلە بێ دەسەڵاتترین. سوێند بەخوا گەر ئەوان ڕووداو و شکستێکیان بەسەر بێت ئێوە دەبنە خاوەنی هەموو عەرەب و لەهەمووان مەزنتر دەبن، لەبەرئەوە دەست لەقەڵاکەتان بەرمەدەن و خۆتان مەدەن بە دەستەوە و بڕینی ئەو درەختانەش ترستان زیاد نەکات.

---

(٦٥٨) أخرجه: البخاري (٤٣٢٤،٥٢٣٥)، ومسلم (٢١٨٠،٢١٨١)، وأحمد (٢٥٢٤٠،٢٦٥٥٢)، والنسائي (الكبرى) (٩٢٤٥،٩٢٤٦) وابوداود (٤١٠٧)، وابن ماجة (١٩٠٢) وابن حبان (٤٤٨٨)، واللفظ للبخاري ومسلم وابوداود.

(٦٥٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٩٨/٤)، والبيهقي (الدلائل) (١٦٩/٥).

(٦٦٠) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨١٠٩).

پاشان عیینە گەڕایەوە لای پێغەمبەرو ﷺ پێی فەرموو: ((ئەی عیینە تۆ چیت بەوان وت))؟ وتی: پێم وتن و فەرمانم پێکردن ئیسلام قبوڵ بکەن و بانگەشەی ئیسلامم پێ گەیاندن و بەئاگام هێنانەوە لە ئاگری دۆزەخ و بەهەشتم نیشاندان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((كَذَبْتَ بَلْ قُلْتَ لَهُمْ كَذَا وَكَذَا)) واتە: تۆ درۆ دەکەیت تۆ بەوانت وت: ئەوە و ئاوها....) تا هەموو وتەکانی خۆی بۆ گێڕایەوە. ئەویش وتی: ڕاست دەکەیت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆبەو دەگەڕێمەوە بۆلای خوای گەورە))[٦٦١].

**٧- دوعاو نزای پێغەمبەر ﷺ لەتائیف:**

ئەبوزوبەیر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ گەمارۆی شاری تائیفی دابوو هاوەڵانی بۆلای هاتن وتیان: تیرەکانی سەقیف هەراسانیان کردووین، دوعایان لێ بکە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ((اللَّهُمَّ اهْدِ ثَقِيفًا مَرَّتَيْنِ (وَأْتِ بِهِمْ) مرّتين))[٦٦٢] واتە: ((خودایە سەقیف هیدایەت بدەو بیان هێنە، خودایە سەقیف هیدایەت بدەو بیان هێنە)).

**٨- شیعرەکانی کەعبی کوڕی مالیك ﷺ:**

ئیبنو سیرین ﷺ دەفەرموێت: (لەکاتێکدا گەمارۆی شاری تائیفیان دابوو، پێغەمبەر ﷺ بە کەعبی کوڕی مالیکی فەرموو: ((دەی)) واتە: هەندێ شیعرمان بۆ بڵێ: ئەویش دەستی پێکرد و فەرمووی:

((هەموو مەترسییەکانی توهامەو خەیبەرمان لەناوبرد
پاشان پشومان دا بە شمشێرەکانمان
سەرپشکمان کردن گەر بهاتنایەتە زمان دەیان وت
جانۆرەی کەرت کەرت کردنی هەردوو هۆزی دەوس و سەقیفە))

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لَهُنَّ أَسْرَعُ فِيهِمْ مِنْ وَقْعِ النَّبْلِ))[٦٦٣] واتە: ((ئەو شیعرانە لەتیر بەرکەوتن خێراتر کاریان تێ دەکات).

---

(٦٦١) أخرجه: ابونعيم (الدلائل) رقم (٤٦٠)، والبيهقي (الدلائل) (١٦٣/٥).

(٦٦٢) أخرجه: أحمد (١٤٧٠٢) وقال محققوه: اسناده قوي على شرط مسلم، وابن ابي شيبة (٣٨١٠٩) وابن هشام (السيرة) (١٠١/٤) رقم (١٠٢٥)، والترمذي (٣٩٤٢) وقال الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (ص:٤٣٢): صحيح على شرط مسلم لولا عنعنة ابي الزبير وهو مدلس.

(٦٦٣) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٢٠٥٠١).

# گەڕانەوەو هەڵگرتنی گەمارۆ

لەماوەی گەمارۆدانی قەڵای تائیف دا هەندێك لە موسوڵمانان کوژران و هەندێکی تریان برینداربوون بەهۆی تیرباران کردنی هۆزی سەقیف لەسەر دیواری قەڵاکەیانەوە، ژمارەی شەهیدەکان (١٢) پیاو بوون حەوتیان لە قورەیش بوون و چواریان لەپشتیوانانی مەدینە بوون لەگەڵ پیاوێکی هۆزی بەنی لەیس، بەڵام تەنها سێ کەس لەموشریکەکان کوژران[٦٦٤]. پێغەمبەر ﷺ شەهیدەکانی لەجێی شەهیدبوونیان ناشت[٦٦٥].

گێڕانەوەکان سەبارەت بەدیاریکردنی ماوەی گەمارۆکە جیاوازن: لای هەندێکیان ماوەی پانزە ڕۆژی خایاندوە[٦٦٦] لای هەندێکی تر شانزە ڕۆژ[٦٦٧] لای هەندێك حەڤدە ڕۆژ[٦٦٨] لای هەندێك هەژدە ڕۆژ[٦٦٩] لای هەندێکیان بیست و پێنج ڕۆژ[٦٧٠]و لای هەندێکیان مانگێك[٦٧١] وە لەگێڕانەوەکەی ئەنەسدا ﷺ دەفەرموێت: (چل ڕۆژ گەمارۆمان دان)[٦٧٢]. بەڵام بۆچوونی پشت ڕاستکراوە ئەوەیە کە ماوەی (سیانزە بۆ هەژدە) ڕۆژی پێ چووە[٦٧٣] ئیبنو ﷺ حەزم دەڵێت: هەر ئەوە ڕاستە بێگومان[٦٧٤].

(پێغەمبەر ﷺ بە گەمارۆکە مەبەستی ئازادکردنی شاری تائیف نەبوو بەڵکو بۆ شکاندنی ورەو هێزو تواناکانیان بوو، تا باش بزانن شارەکەی ئەوان لە مشت و دەستی

---

(٦٦٤) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٣٥٧،١٣٩٨،٤٦٣٧)، وموسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٩٢)، وابن هشام (١٠٠/٤) (١٠٢٣)، والطبري (٨٥/٣).

(٦٦٥) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨١١٤).

(٦٦٦) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨١١٣) والطبري (التاريخ) (٨٢/٣)، وهو صحيح كما في (صحيح تاريخ الطبري) (٣٦٤).

(٦٦٧) أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٨١٠٨).

(٦٦٨) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٩٦/٤).

(٦٦٩) أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٨١٠٨).

(٦٧٠) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤٨/٣).

(٦٧١) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١٦٩/٥) واسناده مرسل حسن = كما في (السيرة النبوية على ضوء المصادر الاصلية) (ص:٥٩٦) و (السيرة الصحيحة) (٥٠٧/٢).

(٦٧٢) أخرجه: مسلم (١٣٦/١٠٥٩).

(٦٧٣) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٨٧)، والبيهقي (الكبرى) (٨٤/٩)، وانظر (السيرة الصحيحة) (٥٠٧/٢).

(٦٧٤) أخرجه: ابن حزم (جوامع السيرة) (ص:٢٤٣).

موسوڵمانان دایەو ئەوان هەرکات بیانەوێت دەیگرن. ئەمەش هۆکاری لەشکرکێشی موسوڵمانان بوو بۆلای قەڵاکەیان و قوربانیدانیان تا بزانن ئەوان بەتەنها هەرخۆیان ماون و ئیسلام لەهەموو لایەکەوە چواردەورەی داون و هیچیان لەبەردەست نەماوە یان موسوڵمان بوون یان خۆ بەدەستەوەدان.

لەلایەکی ترەوە پێغەمبەر ﷺ بەوێنەی قورەیش مەبەستی بوو سەقیفیش بێنە ناو ئیسلامەوە چونکە ئەوان گەر موسوڵمان بوونایە دەبوونە هێز بۆ ئیسلام ئەوان کەسانێکی زۆر زیرەك و ئازا بوون، هەر لەسەرەتای بانگەوازی ئیسلامەوە پێغەمبەر ﷺ دەیویست بیان هێنێتە ناو ئیسلامەوە، لەدوای گەمارۆکەش بۆیان پاڕایەوە لەخواو فەرمووی: ((اللَّهُمَّ اهْدِ ثَقِيفًا))[٦٧٥] واتە: ((خوایە هیدایەتی سەقیف بدە)).

لەکاتێکدا قەڵاکەیان ئەستەم بوو بگیرێت، پێغەمبەر ﷺ داوای لە موسوڵمانان کرد گەمارۆکە هەڵبگرن و بگەڕێنەوە، هەندێکیان ئەمەیان پێ ناخۆش بوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بواریدان زیاتر بجەنگێن تا خۆیان بەو پێشنیارە قایل دەبن، عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ گەمارۆی تائیفیدا و نەیتوانی هیچ زیانێکیان پێ بگەیەنێت فەرمووی: ((إِنَّا قَافِلُونَ غَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهِ)) واتە: ((بەیانی هەموومان دەگەڕێینەوە گەر خودا ویستی لێ بێت)) ئەمە لەسەر دڵی موسوڵمانان گران بوو، وتیان: بڕۆین و ئازادی نەکەین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەیانی لە بەرەبەیاندا هێرشیان ببەنە سەر گەر خوا ویستی لێ بێت)) ئەوە بوو دواتر جەنگان و ژمارەیەکی زۆریان بریندار بوون....)[٦٧٦].

پێشتر پێغەمبەر ﷺ بەخوەیلەی کچی ئەلحەکیمی ڕاگەیاندبوو: ((وَإِنْ كَانَ لَمْ يُؤْذَنْ لِي فِي قِتَالِهِمْ يَا خُوَيْلَةَ؟)) واتە: ((خوەیلە گەر ڕێگەم پێ نەدرابێت بجەنگێم لەگەڵیاندا)) دواتر خوەیلە ئەو هەواڵەی گەیاندە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ و ئەویش چووە ژوورەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ و وتی: (ئەو وتەیەت چییە کە فەرموووتە بە خوەیلەو ئەو دەڵێت خۆی پێی وتووم؟ فەرمووی: ((بەڵێ من وتوومە)). عومەر ﷺ وتی: واتە تۆ ڕێگەت پێ نەدراوە ئەوان بگریت؟ فەرمووی: ((نەخێر)) ڕێگەم پێ نەدراوە))

(٦٧٥) انظر: (السيرة الصحيحة) د.اكرم ضياء العمري (٢/٥١٠).

(٦٧٦) أخرجه: البخاري (٤٣٢٥)، ومسلم (١٧٧٨)، والحميدي (٢٧٠٦)، وابن حبان (٤٧٧٩) واللفظ لمسلم والزيادة للبخاري.

وتی: ئەی مانەوەت لێرە چ سودێکی هەیە لەکاتێکدا ڕێگەت پێ نەدراوە لەگەڵیان بجەنگێیت، ئایا موسوڵمانان ئاگادار بکەمەوە خۆیان ئامادەبکەن بۆ گەڕانەوە؟ فەرمووی: ((فَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالرَّحِيلِ)) واتە: ((بەڵێ ئاگاداریان بکەرەوە خۆیان ئامادە بکەن بۆ گەڕانەوە)).

ئیتر عومەر ﷺ چوو هەمووانی ئاگادارکردەوە)[٦٧٧] (دواتر پێغەمبەر ﷺ بە موسوڵمانانی فەرموو: ((إِنَّا قَافِلُونَ غَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهِ) واتە: ((ئێمە بەیانی بەویستی خودا دەگەڕێینەوە)) هەموو بێ دەنگ بوون و زۆر بەلایانەوە چاك بوو، پێغەمبەریش ﷺ پێکەنینی هات)[٦٧٨]

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەڵێت: (خەڵکی خۆیان ئامادەکرد بۆ گەڕانەوە، لەو کاتەدا سەعیدی کوڕی عوبەید بانگی کرد: ئەوان لەجێی خۆیان هەر دەمێننەوە؟ عیینەی کوڕی حوسن وتی: بەڵێ سوێند بەخوا ئەوا بەسەربەرزی و ڕێزەوە دەمێننەوە یەکێك لە موسوڵمانانیش پێی وت: ئەی خوا بتکوژێت لەناوت بەرێت ئەی عیینە تۆ ستایشی موشریکەکان دەکەیت کە خۆڕاگربوون لەبەرانبەر پێغەمبەر ﷺ، لەکاتێکدا تۆ هاتوویت تا پێغەمبەر ﷺ سەربخەیت لەم جەنگەیدا؟ وتی: سوێند بەخوا من لەگەڵتان نەهاتووم تا بەشەڕ بێم لەگەڵ سەقیفدا بەڵکو هاتووم بۆ ئەوەی گەر موحەممەد تائیفی گرت من ئافرەتێکی ئەوانم پێ بدرێت و بچمە لای تا کوڕێکی ببێت و دواتر ببێتە پیاوێکی بوێر چونکە ئەوان بوێرن)[٦٧٩] (عومەر هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا فەرمانیان پێ بکەم ولاخەکانیان نەبەن بۆ لەوەڕ تا بەیانی بەیەکجاری دەڕۆین؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) عومەر چوو ئەوەی بە هەمووان گەیاندو بەیانی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی سواربوون تا ئەوێ بەجێ بهێڵن لەو کاتەدا دوعای کردو فەرمووی: (( اللَّهُمَّ اهْدِهِمْ وَاكْفِنَا مُؤْنَتَهُمْ))[٦٨٠] واتە: ((خودایە هیدایەتیان بدەو ئەرکیان لەسەرمان لاببە)).

پاشان پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان گەڕانەوە بۆ ناوچەی جەعرانە کە (بیست

(٦٧٧) أخرجه: ابن ابـي شيبة (٣٨١٠٩)، وابن هشام (السيرة) (٩٨/٤)، والبـيهقي (الدلائل) (١٦٩/٥).

(٦٧٨) أخرجه: البخاري (٤٣٢٥)، ومسلم (١٧٧٨).

(٦٧٩) أخرجه: البـيهقي (الدلائل) (١٦٨/٥)، والذهبـي (المغازي) (٥٦٩) عن عروة ﷺ.

(٦٨٠) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٩٨/٤)، والبـيهقي (الدلائل) (١٦٨/٥)، والذهبـي (المغازي) (٥٦٩) عن عروة ﷺ.

کیلۆمەتر دوورە لە مەککە) و لەڕۆژی پێنجی مانگی زولقەعیدە گەیشتە ئەوێ[٦٨١]. کاتێك پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە ئەو ناوچەیە دابەشکردنی دەسکەوتەکانی دواخست بۆ ئەوەی هەوازن بێن و موسوڵمان ببن و ژن و ماڵ و سامانیان لەگەڵ خۆیان ببەنەوە. تەنها هەندێك زیوی سەرەتا دابەش کرد: جابر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك لەتائیف گەڕاینەوە ناوچەی جوعرانە لەوێدا پێغەمبەر ﷺ هەندێك زیوی دابەشکرد بەسەر خەڵکدا)[٦٨٢].

لەوێدا یەکێك لە دووڕووەکان ڕەخنەی گرت لە شێوازی دابەشکردنەکەی پێغەمبەر ﷺ، جابر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە ئەلجوعرانە هەندێك زیو لەپۆشاکێکی بیلالدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بەمشت دابەشی دەکرد بەسەر خەڵکدا، پیاوێك وتی: ئەی موحەممەد دادپەروەر بە تۆ بە دادپەروەری دابەشی ناکەیت؟؟!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((وَيْلَكَ وَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَكُنْ أَعْدِلُ؟ لَقَدْ خِبْتَ وَخَسِرْتَ إِنْ لَمْ أَكُنْ أَعْدِلُ)) واتە: ((هاوار لەتۆ گەر من دادپەروەر نەبم مایەپوچ و زیان لێ کەتوو دەبم)). عومەر ﷺ وتی: لێم گەڕێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تا لەگەردنی ئەم دووڕووە بدەم؟ فەرمووی: ((مَعَاذَ اللهِ، أَنْ يَتَحَدَّثَ النَّاسُ أَنِّي أَقْتُلُ أَصْحَابِي، إِنَّ هَذَا وَأَصْحَابَهُ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ، لَا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنْهُ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ))[٦٨٣] واتە: ((پەنا بەخوا دەگرم دواتر خەڵکی وا باس بکەن کە من هاوەڵانم دەکوژم، ئەمە هاوەڵانێکی بۆ پەیدا دەبن قورئان دەخوێننەوەو لەقوڕگیان دانابەزێتە خوار لەئاین دەردەچن وەك چۆن تیر لەکەوان دەردەچێت)).

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەڵێت: (شەش هەزار منداڵ و ئافرەتی هەوازن لای موسوڵمانان دەست بەسەرکرابوون)[٦٨٤] (لەگەڵ بیست و چوار هەزار سەر وشترو چل هەزار سەر مەڕو، و چوار هەزار ئوقیە زیو)[٦٨٥]. لەدەست بەسەرەکاندا خوشکی شیری

(٦٨١) انظر: (فتح الباري) (٥٩/٨)، و (السيرة الصحيحة) (٥١١/٢).

(٦٨٢) أخرجه: الحاكم (١٢١/٢) وصححه ووافقه الذهبي.

(٦٨٣) أخرجه: مسلم (١٠٦٣)، والبخاري (الادب المفرد) (٧٧٤)، وأحمد (١٤٨١٠)، وابن ماجة (١٧٢)، والنسائي (الكبرى) (٨٠٨٦)، وابن حبان (٤٨١٩). واللفظ لمسلم والزيادة للبخاري.

(٦٨٤) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٠١/٤)، والطبري (التاريخ) (٨٦/٣)، والبيهقي (الدلائل) (١٧١/٥).

(٦٨٥) انظر: (فتح الباري) (٥٩/٨).

پێغەمبەریان ﷺ لەناودا بوو ڕێزی لێ گرتن. ئەم بەسەرهاتە لە چەندەها گێڕانەوەی لاوازدا هاتووە بۆ زیاتر زانیاری دەیانخەینە ڕوو:

١- عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە لەهەندێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (لەدوای گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ خوشکە شیریەکەی هات بۆلای، کاتێك بینی پێشوازی لێکردو پۆشاکێکی بۆ ڕاخست تا لەسەری دابنیشێت، بەڵام ئەو بەلایەوە گەورە بوو لەسەر پۆشاکەکەی پێغەمبەر ﷺ دابنیشێت، دواتر ناچاری کرد لەسەری دابنیشێت و ئەو دانیشت، هەردوو چاوی فرمێسکی لێڕژا تا ڕیشی تەڕکرد، پیاوێك لەوێ وتی: تۆش دەگریت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((نَعَمْ لِرَحْمَتِهَا وَمَا دَخَلَ عَلَيْهَا لَوْ كَانَ لِأَحَدِكُمْ أُحُدٌ ذَهَبًا فَأَعْطَاهُ فِي حَقِّ رَضَاعِهِ مَا أَدَّى حَقَّهَا، أَمَّا حَقِّي الَّذِي آخُذُ مِنْكِ فَلَكِ، وَأَمَّا مَا لِلْمُسْلِمِينَ فَلَسْتُ بِآخِذٍ بِهِ، إِلَّا أَنْ يَطِيبُوا بِهِ نَفْسًا))[٦٨٦] واتە: ((بەڵێ گریانم وەك سۆزو بەزەییە بۆ خۆی و ئەوەی کە بەسەری هاتووە، گەر یەکێك لەئێوە کێوێك ئاڵتونتان هەبێت و بیدەن بە مافی شیر پێدان، هێشتا مافیتان نەداوە، هەرشتێك لای تۆ مافی منی تێدابێت من بۆ خۆتی دەگێڕمەوەو لێتی وەرناگرم، بەڵام گەر مافی موسوڵمانانی تێدابێ ناتوانم مافیان لێ زەوت بکەم مەگەر خۆیان بەڕەزامەندی خۆیان بیبەخشن....)).

٢- قەتادە ﵀ دەفەرموێت: (لەدوای تەواوبوونی جەنگی هەوازن ئافرەتێك هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من خوشکەکەی تۆم من شەیمای کچی حاریسم، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: (( إِنْ تَكُونِي صَادِقَةً فَإِن بك منى أثرا لَا يَبْلَى)) واتە: (( گەر ڕاستگۆ بیت، ئاسەوارێکی من بەجەستەتەوە هەیەو لەناو ناچێت)). ئەویش: مەچەکی دەرخست وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا تۆ بچووك بوویت ئەم گازەت لێگرتم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ پۆشاکەکەی سەرشانی بۆ ڕاخست و فەرمووی: ((سَلِي تُعْطَيْ وَاشْفَعِي تُشَفَّعِي))[٦٨٧] واتە: ((داوا بکە پێت دەدرێت و تکا بکە بۆت جێبەجێ دەکرێت)).

---

(٦٨٦) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٤٧٩/٧) برقم (١٣٩٥٨).

(٦٨٧) أخرجه: الطبري (جامع البيان) (١٠١/١٠)، والبيهقي (الدلائل) (١٩٩/٥)، وقال العمري في (السيرة الصحيحة) (٥٠٦/٢): مرسل اسناده حسن.

٣- ئەبو توفەیل ﷺ دەڵێت: (پێغەمبەرم بینی و گۆشتی دابەش دەکرد لە جوعرانە، ئافرەتێك بۆلای هات و پۆشاکەکەی خۆی بۆ ڕاخست، وتم: ئەوە کێیە؟ وترا: ئەوە زڕ دایکەکەیەتی)(٦٨٨).

٤- عەمری کوڕی ئەلسائیب ﷺ دەفەرموێت: (ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو، زڕ باوکەکەی بۆ لاهات و پۆشاکێکی خۆی بۆ ڕاخست، پاشان زڕ دایکەکەی بۆ لاهات و پۆشاکێکی لەولاترەوە بۆ ڕاخست و لەسەری دانیشت، پاشان زڕ براکەی هات و پێغەمبەر ﷺ لەبەردەمی خۆی داینیشاند...)(٦٨٩)

٥- ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەڵێت: (یەزیدی کوڕی عوبەیدی سەعدی بۆی گێڕامەوەو وتی: کاتێك شەیمایان بردە لای پێغەمبەر ﷺ. وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من زڕ خوشکەکەتم؟ فەرمووی: ((ناونیشانت چییە))؟ وتی: جارێکیان گازێکت لەپشتم گرت. پێغەمبەریش ﷺ بەو ناونیشانەدا ناسییەوەو پۆشاکەکەی خۆی بۆ ڕاخست و داوای لێکرد لەسەری دابنیشێت و پاشان سەرپشکی کردو پێی فەرموو: ((إِنْ أَحْبَبْتِ فَعِنْدِي محببة مُكَرَّمَةٌ، وَإِنْ أَحْبَبْتِ أَنْ أُمَتِّعَكِ وَتَرْجِعِي إِلَى قَوْمِكِ فَعَلْتُ)) واتە: ((گەر پێت خۆشە لەلام بمێنەرەوە و خۆشەویست و ڕێز لێگیراو دەبیت، وە گەر پێت خۆشە پێداویستی و دیاریت پێ دەبەخشم و بگەڕێرەوە ناو خزمانت)) وتی: بەڵکو یارمەتیم بدەو بمگێڕەوە بۆ ناو خزمەکانم)(٦٩٠).

## ڕێنماییەکانی پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەدەسکەوتەکان

پێغەمبەر ﷺ دابەشکردنی دەسکەوتەکانی لە سیانزە بۆ نوزدە ڕۆژ دواخست وەك لە (بوخاریدا هاتووە، بۆئەوەی نوێنەرانی هەوازن بێن و موسوڵمان بوونی خۆیان ڕابگەیەنن تا سامان و دەسکەوتەکانیان بۆ بگێڕدرێتەوە. مەڕوان و مەسوەری کوڕی

(٦٨٨) أخرجه: البخاري (الادب المفرد) (١٢٩٥) وابوداود (٥١٤٤)، والحاكم (١٦٤/٤)، وصححه، وابويعلى (٩٠٠) وقال محققه: اسناده منقطع، والبيهقي (الدلائل) (١٩٩/٥)، وابن حبان (٤٢٣٢) وقال محققه: رجاله ثقات، وقال ابن كثير في (البداية) (٦٣٧/٤): حديث غريب، وقال الشيخ الالباني في (ضعيف ابي داود) (١٠٢): ضعيف الاسناد. وكذا قال ايضاً في (المشكاة) (٤٩٣٧)، و (ضعيف الادب المفرد) (٢١١).

(٦٨٩) أخرجه: ابوداود (٥١٤٥)، وقال الشيخ الالباني تعالى في (ضعيف ابي داود) (١١٠٣): ضعيف الاسناد.

(٦٩٠) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٧٤/٤) برقم (٩٩٨)، والطبري (التاريخ) (٨١/٣)، والبيهقي (الدلائل) (١٩٩/٥)، والحاكم (١٦٤/٤) وصححه، وقال الارناؤط في تخريج (زاد المعاد) (٤٧٥/٣): رجاله ثقات لكنه منقطع.

مەخرەمە ﵄ دەفەرموون: (پێغەمبەر ﷺ لەتائیف گەڕایەوەو سیازدە تا نۆزدە ڕۆژ چاوەڕوانی هەوازنی دەکرد تا بێن بۆلای)[٦٩١].

پێغەمبەر ﷺ چەندەها ڕێنمایی و ئامۆژگاری موسوڵمانانی کرد لەوانە:

١- ڕوەیفیعی کوڕی سابتی ئەنصاری ﵁ دەفەرموێت: (لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر ﷺ هەستاو فەرمووی: ((مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يَسْقِيَنَّ مَاءَهُ زَرْعَ غَيْرِهِ في رواية (وَلَدَ غَيْرِهِ)[٦٩٢] (يَعْنِي إِتْيَانَ الْحَبَالَى مِنَ السَّبَايَا) (حَتى يَضَعْنَ ما فِي بُطُونِهِنَّ)[٦٩٣] وَأَنْ يُصِيبَ امْرَأَةً ثَيِّبًا مِنَ السَّبْيِ حَتَّى يَسْتَبْرِئَهَا (بحيضةٍ)[٦٩٤] (يَعْنِي إِذَا اشْتَرَاهَا) وفي رواية (وَلَا يَقَعُ عَلَى أَمَةٍ حَتَّى تَحِيضَ أَوْ يَبِينَ حَمْلُهَا)[٦٩٥]، وَأَنْ يَبِيعَ مَغْنَمًا حَتَّى يُقْسَمَ، وَأَنْ يَرْكَبَ دَابَّةً مِنْ فَيْءِ الْمُسْلِمِينَ حَتَّى إِذَا أَعْجَفَهَا رَدَّهَا فِيهِ، وَأَنْ يَلْبَسَ ثَوْبًا مِنْ فَيْءِ الْمُسْلِمِينَ حَتَّى إِذَا أَخْلَقَهُ رَدَّهُ فِيهِ))[٦٩٦] واتە: ((هەرکەسێك باوەڕی بەخوا و بەڕۆژی دوایی هەیە با بەئاوی خۆی کشتوکاڵی کەسێکی تر ئاو نەدات (لەگێڕانەوەیەکدا: منداڵی کەسێکی تر) (واتە: با نەچنە لای ئافرەتە سکپڕەکان تا سکەکانیان دادەنێن) وە نابێت بچێتە لای ئافرەتێك تا پاك دەبێتەوە لە سوڕی مانگانە (واتە: لەدوای کڕینی یان دەستکەوتنی) وە (نابێت بچنە لای کەنیزەکێك تا بەمنداڵ بوون یاخود سوڕی مانگانە پاك دەبێتەوە) نابێت دەستکەوتێك بفرۆشرێت پێش دابەشکردن، نابێت سواری وڵاخێکی دەستکەوتی موسوڵمانان ببیت پێش دابەشکردنی بەکاری بهێنێت ولە دوای لاوازبوونی بیگێڕێتەوە، نابێت پۆشاکێکی دەستکەوتی موسوڵمانان پێش دابەش بوون لەبەربکرێت و کۆنی بکات پاشان بیگێڕێتەوە ناو دەستکەوتەکان)).

٢- ئەبوسەعیدی خودری ﵁ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لَا تُوطَأُ حَامِلٌ

(٦٩١) أخرجه: البخاري (٤٣١٨).

(٦٩٢) أخرجه: أحمد (١٦٩٩٢) وقال محققوه: صحيح.

(٦٩٣) اخرجه: أحمد (١٦٩٩٣) وقال محققوه، ضعيف.

(٦٩٤) أخرجه: ابوداود (٢١٥٨)، وحسنه الشيخ الالباني يرحمه الله في (صحيح ابي داود) (١٨٩١).

(٦٩٥) أخرجه: أحمد (١٦٩٩٣) وقال محققوه: صحيح.

(٦٩٦) أخرجه: أحمد (١٦٩٩٧) وقال محققوه: صحيح بشواهده وهذا اسناد حسن، والدارمي (٢٤٨٨)، وسعيد بن منصور (٢٧٢٢)، والطبراني (الكبير) (٤٤٨٢، ٤٤٨٥)، والحاكم (١٩٥/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٤٨٥٠) وقال محققه: اسناده حسن، والبيهقي (الكبرى) (٤٤٩/٧)، وقال الحافظ في (فتح الباري) (٢٥٦/٦): اسناده حسن، وكذا قال الشيخ الالباني في (الارواء) (١٤١/٥).

حَتَّى تَضَعَ، وَلَا غَيْرُ ذَاتِ حَمْلٍ حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً))[٦٩٧] واتە: ئافرەتی سکپڕ کەس بۆی نییە بچێتە لای تا سکەکەی دادەنێت وە ئەوەش سکپڕ نییە دروست نییە تا سوڕێکی مانگانە دەشوات).

٣- هەروەها دەفەرموێت: (هەندێك دەسکەوتی جونەینمان بەسەردا دابەشکرا، ئێمە دەمان ویست بەپارە ئازادیان بکەین و نەیەڵین منداڵیان ببێت، هەندێکمان بە هەندێکمانی دەوت: ئێوە کاری وەها دەکەن و پێغەمبەریشتان ﷺ لەناودایە)[٦٩٨] (ئیتر ئێمەش پرسیاری (عزل)[٦٩٩] (واتە: ڕشتنی شەهوەت لەدەرەوەی جێی منداڵاندا) لە پێغەمبەر ﷺ کردو فەرمووی: ((مَا مِنْ كُلِّ الْمَاءِ يَكُونُ الْوَلَدُ (اصْنَعُوا مَا بَدَا لَكُمْ، فَمَا قَضَى اللهُ فَهُوَ كَائِنٌ)[٧٠٠] وَإِذَا أَرَادَ اللهُ خَلْقَ شَيْءٍ، لَمْ يَمْنَعْهُ شَيْءٌ))[٧٠١] واتە: ((منداڵ لە هەموو ئاوەکە دروست نابێت (چۆنتان دەوێت وەها بکەن ئەوەی خودا بڕیاری لەسەرداوە هەردەبێ ببێت) (وە ئەگەر خودا بیەوێت شتێك دروست بکات هیچ شتێك ناتوانێت پێشگیری پێ بکات).

٤- ئەبو بوردە ﷺ دەفەرموێت: (لەدوای جەنگی جونەین پێغەمبەر ﷺ دەهاتە جێی دابەزینی هەر هۆزێك و دوعای بۆ دەکردن و سەلامی لێ دەکردن، یەکێك لەو هۆزانەی واز لێ هێناو نەچووە لایان، ئەوان گەڕان و تەماشایان کرد لەژێر جلی ژێر کۆپانێکدا بینییان پیاوێکیان ملوانکەیەکی موورویان دۆزییەوە کە خاوەنەکەی لەدەسکەوتەکانیان دزی بووی لەپێش دابەشکردندا، پاشان پێغەمبەر ﷺ هاتە سەردانیان و دوعای بۆ کردن.....)[٧٠٢].

---

(٦٩٧) أخرجه: ابوداود (٢١٥٦)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٨٨٩).

(٦٩٨) أخرجه: مسلم (١٤٣٨/١٣٣)، وأحمد (١١٤٦٢) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابويعلى (١١٥٣)، وابن حبان (٤١٩١). واللفظ لأحمد.

(٦٩٩) أخرجه: أحمد (١١٤٣٨)، وقال محققوه: حديث صحيح واسناده حسن.

(٧٠٠) أخرجه: أحمد (١١٤٣٨)، وقال محققوه: حديث صحيح واسناده حسن.

(٧٠١) أخرجه: أحمد (١١٤٦٢) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٤٦٢).

(٧٠٢) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٩٥٠٣).

## دابەشکردنی دەسکەوتەکان

لەدوای چاوەڕوانی کردنی چەندەها ڕۆژ بەئومێدی هاتنی نوێنەرانی هۆزی هەوازن و موسوڵمان بوونیان و بردنەوەی ماڵ و سامانیان بەڵام ئەوان هەر نەهاتن بۆیە ناچارانە دەسکرا بەدابەشکردنی دەستکەوتەکان و پشکی زیاد بەخشرا بە سەرکردەو ناودارەکانی عەرەب بەئومێدی دڵ ڕاگیربوونیان لەسەر ئیسلام لەوانەش:

١-ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (واتە: پیاوێك (سەفوانی کوڕی ئومەییە) داوای مێگەلە مەڕێکی نێوان دوو چیای لە پێغەمبەر ﷺ کردو پێیدا، ئەویش دواتر گەڕایەوە لای خزمانی و پێی وتن: خزمان بڕۆن موسوڵمان بن سوێند بەخوا موحەممەد وەك کەسێك دەبەخشێتەوە کە هەرگیز لەهەژاری ناترسێت)[٧٠٣].

لەگێڕانەوەیەکی تردا: (سەفوان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەسکەوتەکانی بەسەر دەکردەوە و گەیشتنە شیوێك پڕ بوو لە وشترو مەڕو ئاڵف، لەوێدا سەفوان بەسەرسامییەوە تەماشای دەکردن. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أَ عَجَبَكَ أَبا وَهَب هَذا الشِعَب؟)) واتە: ((ئایا ئەو شیوە سەرسامی کردوویت ئەی باوکی وەهەب))؟! وتی: بەڵێ. فەرمووی: ((هَو لَكَ وَمَا فِيه)) واتە: ((ئەوەو هەموو ئەوانەی لەو شیوەدایە بۆ تۆ)). سەفوان وتی: شایەتی ئەدەم تەنها مەگەر پێغەمبەرێك بێت بەدڵ شتی وەها ببەخشێت و منیش شایەتی دەدەم کەتۆ پێغەمبەری خوایت))[٧٠٤].

سەفوان دەڵێت: (سوێند بەخوا سەرەتا پێغەمبەر ﷺ بەشی دەدام و لەهەموو کەس زیاتر ڕقم لێی بوو، بەردەوام هەر بەشی دەدام تا وای لێهات بووە خۆشەویسترین کەس لەلام. ئەبوشهابی زوهرین ﷺ دەڵێت: لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر ﷺ سێ سەد سەر مەڕی بەخشییە سەفوان)[٧٠٥].

٢-عوروە ﷺ دەفەرموێت (لەدەسکەوتەکانی حونەین پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێکی بەخشییە حەکیمی کوڕی حوزام بەڵام ئەو هەموو ئەوانەی بەلاوە کەم

---

(٧٠٣) أخرجه: مسلم (٢٣١٢).

(٧٠٤) أخرجه: الواقدي (المغازي) (ص:٦٢٩).

(٧٠٥) أخرجه: مسلم (٢٣١٣)، والترمذي (٦٦٦)، وأحمد (١٥٣٠٤) وقال محققوه: صحيح، وابن حبان (٤٨٢٨).

بوو)[٧٠٦]. هۆکارەکەشی ئەوەبوو، یەکەم: ئەو لەجەنگی حونەیندا دوو ئەسپی خۆی بەشدار کردبوون، هەردووکیان بەرکەوتن و لەناوچوون بۆیە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەردوو ئەسپەکانم لەناوچوون گەر فەرمبووم بۆ بکرێتەوە، پێغەمبەریش ﷺ : هەندێکی بەشدا پاشان بۆی زیادکرد)[٧٠٧] هۆکاری دووەمیش: حەکیم وای دەزانی کە بەشی ئەوی کەمتر داوە بەراورد بە هاوڕێکانی.

(سەرەتا پێغەمبەر ﷺ بەشی حەکیمی کەمتر پێ بەخشی بەراورد بەهاوڕێکانی، حەکیم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من گومانم وا نەبوو کەتۆ کەمترم بدەیتێ لەهاوڕێکانم، پێغەمبەریش ﷺ زیاتری پێ بەخشی، پاشان زیاتری پێ بەخشی تا ڕازی بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ: کام لە بەخشینەکانت باشتربوو؟ فەرمووی: (بەشی یەکەمجارت باشتربوو بۆت......)[٧٠٨].

حەکیم ﷺ دەڵێت: (سەرەتا من داکۆکی زۆرم کرد لەپێغەمبەر ﷺ (تا سامانی زیاترم پێ ببەخشێت)[٧٠٩] ئەو پێی بەخشیم، پاشان داوای زیاترم کرد هەر پێی بەخشیم، پاشان داوای زیاترم کرد هەر پێی بەخشیم و پاشان فەرمووی: ((يا حَكِيْم (مَا أَكْثر مَسألتكَ)[٧١٠] إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ [وإنّما هُو أوْساخ أيدي النّاس][٧١١] فَمَنْ أَخَذَهُ (بِطِيبِ) نَفْسٍ ( وَحُسْنِ أُكْلَةٍ)[٧١٢] بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَكَانَ (وَسُوءِ أُكْلَةٍ) لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، (وَكَانَ) كَالَّذِي يَأْكُلُ وَلَا يَشْبَعُ، وَالْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى (وإِنَّ يَدُ اللَّهِ الْعُلْيَا، وَيَدُ الْمُعْطِي الَّتِي تَلِيَهَا وَيَدُ السَّائِلِ السُّفْلَى من ذلك))[٧١٣] واتە: ((ئەی حەکیم (داواکاریەکانت بۆ ئەوەندە زۆرە). ئەم پارەو سامانە جوان و شیرینن (بەڵام هەموو چڵکی دەستی خەڵکین) هەرکەسێك سامانێکی (حەڵاڵ) وەربگرێت بەڕەزامەندی تەواوی بەرامبەرو شەیدا نەبوونی ئەو سامانە، ئەوکات بەرەکەتی بۆ دەکرێتە ناوی،

---

(٧٠٦) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣٠٧٨).

(٧٠٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣٠٧٨)، وعبدالرزاق (المصنف) (٢٠٠٤١).

(٧٠٨) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٢٠٠٤١).

(٧٠٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣٠٨١).

(٧١٠) أخرجه: ابن خزيمة (كتاب التوحيد) (١٢٥) وقال محققه: صحيح.

(٧١١) نفس المصدر السابق.

(٧١٢) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٢٠٠٤١). و الطبراني (الكبير) (٣٠٧٨).

(٧١٣) أخرجه: ابن خزيمة (كتاب التوحيد) (١٢٥) وقال محققه: صحيح.

هەرکەسێك ببێتە خاوەنی سامانێکی حەرام و ناحەڵاڵ و لەدەرونیدا زۆر تامەزرۆو شەیدای بێت، بەرەکەتی بۆ تێ ناکرێت، وەك ئەو کەسەیە کەهەر دەخوات و تێر نابێت. دەستی بڵند باشترە لەدەستی نزم (دەستی خودا هەر بەرزەو پاشان دەستی بەخشندە، دەستی داواکارو وەرگریش نزمترە). حەکیم دەڵێت: وتم: گەر لەتۆش وەرگرم هەر وەهایە؟ فەرمووی ((گەر لەمنیش وەرگریت هەر وەهایە)). منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خودا سوێند بێت بەوەی تۆی بەڕاستی ناردووە لەدوای تۆ داوای هیچ شتێك لەکەس ناکەم هەتا دونیا جێدەهێڵم.

دواتر ئەبوبەکر حەکیمی بانگ دەکرد تا پارمەتی بدات بەڵام ئەو وەری نەدەگرت، پاشان عومەر بانگی دەکرد تا پارمەتی بدات بەڵام ئەو وەری نەدەگرت....بەوجۆرە حەکیم لەدوای پێغەمبەر ﷺ داوای لەکەس نەکرد تا دونیای جێ هێشت)[٧١٤].

٣-عەبباس کوڕی میرداسیش ﷺ لەوانەبوو کەداوای سامانی زیاتری لەپێغەمبەر ﷺ کرد. ئیبنو ئیسحاق ﷬ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ چەند وشترێکی دا بە عەبباسی کوڕی میرداس بەڵام ئەو پێی ناڕازی بوو وە بەچەند دێڕە شیعرێك گلەیی لەپێغەمبەر ﷺ کرد. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((اذْهَبُوا بِهِ فَاقْطَعُوا عني لِسَانه))[٧١٥] واتە: ((بڕۆن لە زمانی بمپارێزن)) (سەرەتا وایان زانی کەداوای کردووە زمانی ببڕن بەڵام دواتر زانییان مەبەستی پێدانی مەڕوبزنە بۆ بێ دەنگکردنی زمانیەتی پاشان بردیان بۆلای دەسکەوتەکان و پێیان وت: فەرموو بە ئارەزووی خۆت لێی ببە، عەبباسیش شەرم گرتی هیچی لێ نەبرد، پاشان پێغەمبەر ﷺ پۆشاکێکی بۆ کردە دیاری و بۆی ناردو ئەویش وەری گرت و لەبەری کرد)[٧١٦].

پێغەمبەر ﷺ سەد وشتری بەخشییە کەسانی تر، ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێت (ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب و سەفوانی کوڕی ئومەیەو عیینەی کوڕی حوسن و ئەقرەعی کوڕی حابیس هەر یەکێك لەوانە پێغەمبەر ﷺ سەد وشتری پێ

---

(٧١٤) أخرجه: البخاري (١٤٧٢)، ومسلم (١٠٣٥)، وأحمد (١٥٥٧٤) واللفظ للبخاري والزيادات لمسلم والطبراني وابن خزيمة وعبدالرزاق.

(٧١٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٠٨/٤) برقم (١٠٣٦)، والطبري (التاريخ) (٩٠/٣)، والبيهقي (الدلائل) (١٨٣/٥).

(٧١٦) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٩٠،٢٨٩)، والبيهقي (الدلائل) (١٧٩/٥).

بەخشین...... وە سەد وشتریشی بەخشییە عەلقەمەی کوڕی عولاسە)[٧١٧] ئیبنو ئیسحاق ﵀ دەڵێت: (هەریەکە لە مخرەمەی کوڕی نەوفەل وعومەیری کوڕی وەهبی جومەحی و هیشامی کوڕی عەمر برایی عامری کوڕی لوئەی......

هەموو یەکێك لەم پیاوانەی قوڕەیش کەمتر لە سەد وشتری پێ بەخشین.... وە پەنجا وشتری بەخشیە سەعیدی کوڕی یەربوع..... وە عەتای کوڕی وائلی سەهمیش هەر پەنجا وشتری پێ بەخشی)[٧١٨]، تێکڕای ئەو کەسانەی تازە موسوڵمان بوو بوون پێغەمبەر ﷺ سەد یان پەنجا وشتری پێ بەخشین ژمارەیان پەنجاو دوو پیاو بوو[٧١٩] هەندێکی تر دەڵێن: بەڵکو ژمارەیان پەنجاو حەوت پیاو بوو[٧٢٠].

## پیاوێکی دووڕوو ناڕازی بوونی خۆی ڕادەگەیەنێت لەسەر شێوازی دابەشکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ دەسکەوتەکان

هەندێك لەعەرەبە دەشتەکییە بەگومانەکان قسەی نابەجێ و زبریان دەربڕی لەکاتی دابەشکردنی دەسکەوتەکانی جەنگی حونەین

ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: (لەکاتی دابەشکردنی دەسکەوتەکانی حونەیندا پێغەمبەر ﷺ بەشی زیاتری دەسکەوتەکانی بەخشییە ناودارەکانی عەرەب وەك ئەقرەع و عولاس و کەسانی تر) لەو ڕۆژەدا پیاوێك وتی: (سوێند بەخوا ئەم دەسکەوتانە بە دادپەروەری دابەش نەکراوە) ولەبەرخوای گەورەش ئەنجام نەدراوە.

ئیبنو مەسعود ﷺ دەڵێت: منیش چووم بۆلای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەم پێ ڕاگەیاند، ئەویش ڕووخساری بەتەواوی سوور هەڵگەڕاو پاشان فەرمووی: ((فَمَنْ يَعْدِلُ إِنْ لَمْ يَعْدِلِ اللهُ وَرَسُولُهُ) رَحْمَه اللهُ مُوسَى، قَدْ أُوذِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ هَذَا فَصَبَرَ))[٧٢١] واتە: ((گەر خوداو پێغەمبەرەکەی دادپەروەر نەبن ئیتر کێ دادپەروەرە) ڕەحمەتی خوا لەموسا

---

(٧١٧) أخرجه: مسلم (١٠٦٠).

(٧١٨) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٠٧/٤) برقم (١٠٣٥)، والطبري (الكبير) (٩٠/٣)، وهو صحيح كما في (صحيح سيرة ابن هشام) (١٨٣٣، ٨٣٩).

(٧١٩) انظر: (السيرة الصحيحة) (٥١٢/٢).

(٧٢٠) انظر: (مرويات غزوة حنين) للدكتور القريبي (ص:٦٤٩).

(٧٢١) أخرجه: البخاري (٣١٥٠،٤٣٣٥،٤٣٣٦)، ومسلم (١٤٠/١٠٦٢)، واللفظ للبخاري والزيادات لمسلم.

بێت زۆر لەمە زیاتر ئازار درا بەڵام ئەو هەر ئارامگربوو).

عەبدوڵڵای کوڕی عەمریش ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێکی هۆزی بەنی تەمیم کەناوی (زول خومیسیرە) بوو هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ وەستا لەکاتێکدا دەسکەوتەکەی دابەش دەکردو پێی وت: ئەی موحەممەد کارەکانی ئەمڕۆتم هەموو بینی. فەرمووی: ((أَجَلْ فَكَيْفَ رَأَيْتَ)) واتە: ((بەڵێ کارەکانت چۆن بینی))؟ وتی: نەمبینی دادپەروەر بیت. پێغەمبەریش ﷺ نیگەران بوو فەرمووی: ((وَيْحَكَ! إِذَا لَمْ يَكُنْ الْعَدْلُ عِنْدِي، فَعِنْدَ مَنْ يَكُونُ)) واتە: ((ئەی هاوار لەدەست تۆ گەر دادپەروەری لەلای من نەبێت ئیتر لەلای کێ دەبێت))؟ عومەری کوڕی خەتاب ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئایا بیکوژم؟ فەرمووی: ((لَا، دَعْهُ فَإِنَّهُ سَيَكُونُ لَهُ شِيعَةٌ يَتَعَمَّقُونَ فِي الدِّينِ حَتَّى يَخْرُجُوا مِنْهُ كَمَا يَخْرُجُ السَّهْمُ مِن الرَّمِيَّةِ، يُنْظَرُ فِي النَّصْلِ (أَي: حديدة السّهم) ، فَلَا يُوجَدُ شَيْءٌ، ثمّ فِي الْقدح (أَي: عود السهم) ، فَلَا يُوجَدُ شَيْءٌ، ثُمَّ فِي الْفُوقِ (أَيّ: طرف السهم الذي يباشر مدخل الوتر) ، فَلَا يُوجَدُ شَيْءٌ، سَبَقَ الْفَرْثَ وَالدَّمَ (أَي: السُّرْعَة السهم وشدة النزع)).[٧٣٢] واتە: ((نا لێی گەڕێ لەمەودوا هاوشێوانێکی بۆ پەیدا دەبێت ڕۆدەچن لەئایندا تا لێی دەردەچن وەك چۆن تیر لەکەوان دەردەچێت، تەماشای نوکەکەی دەکەیت هیچی پێوە نابینیت تەماشای دارەکەی دەکەیت هیچی پێوە نابینیت، تەماشای کۆتاییەکەی دەکەیت هیچی پێوە نابینیت، دەڵێیت پێش ڕژانی سروان و خوێنەکە تیرەکە لەلاشەی پێکراوەکە دەرچووە).

## هۆکارەکانی بەخشینی بەشی زیاتر بەتازە موسوڵمان بووەکان

بە تازە موسوڵمانەکان پێیان دەوترێت (المؤلفة قلوبهم) واتە: ئەوانەی دڵیان ڕاگیر دەکرێت بۆئەوەی بێنە ناو ئیسلامەوە، چونکە موسوڵمان بوونی ئەوانە خێرێکی گەورەی تێدابوو بۆ ئیسلام وموسوڵمانان، لەوانە سەفوان و حەکیم و کەسانێکی تر، وەهەیان بوو زیاتری پێ دەدرا تا بڕوابوونی جێگیرتر بکرێت لەوانەش ئەبوسوفیان

(٧٣٢) أخرجه: أحمد (٧٠٣٨)، وقال محققوه: حديث صحيح وهذا اسناد حسن، وابن هشام (السيرة) (١١٠/٤) برقم (١٠٤٠)، والطبري (التاريخ) (٩٢/٣)، والبيهقي (الدلائل) (١٨٦/٥)، وقال البرزنجي في (صحيح الطبري) برقم (٣٦٧): اسناده حسن.

و کەسانێکی تر، هەیان بوو زیاتری پێ دەدرا تا سۆزو خۆشەویستی دڵیان بەرەو ئیسلام بێت و لەزیانیان بەدوور بن لەوانە ئەقرەع و عەباسی کوڕی میرداس وە کەسانی تر، ئەوەش بەمەبەستی هۆگربوونی دڵی شوێن کەوتوانیان بوو بۆلای ئیسلام چونکە ئەوان لەهەق و ناهەقدا شوێن سەرکردەکانیان دەکەوتن. چونکە کەسانێك هەن هەردەم لەگەڵ بەهێزو خاوەن ساماندان. وەلەبەخشینی بەشی زیاتر بەناودارانی قوڕەیشدا وەك فەرمبوو کردنەوەیەکی ئەو بارودۆخەبوو کەبەسەریاندا هات، بۆئەوەی لەڕێگەی سەرکەوتن و دەسکەوتەوە دڵیان زیاتر هۆگری ئیسلام بێت. ئەو دەسکەوتانەش هۆکارێکی سەرەکی بوون بۆ گۆڕینی حەزو ئارەزووی خێڵەکان وسەرکردەکانیان لەبت پەرستییەوە بۆ ئیسلام، ئەوەبوو دواتر ڕەزامەندی تەواوی خۆیان بۆ ئیسلام ئاشکرا کردو بوونە کەسانێکی موسوڵمانی زۆر چاك و خزمەتی هەرەگەورەیان گەیاند بەئاینی پیرۆزی ئیسلام، وەبوونە کەسانێکی زۆر دڵسۆزو بەئەمەك و نموونەیی بۆ ئیسلام.

بەڵام هەندێك لەموسوڵمانان لەم هەموو دانایی و سوودەگەرانەی ئەو کارە وەکو پێویست حاڵی نەبوون، بۆیە وا پێویستی دەکرد ئەم کارە زیاتر بۆ موسوڵمانان ڕوونتر بکرێتەوە.

عەمری کوڕی تەغلوب ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ سامان و دەسکەوتێکی لەلابوو بەشی زیاتری بەخشییە کەسانێکی تایبەت، دواتر هەواڵی ناڕازی بوونی ئەوانەی پێ گەیشت کە بەشی کەمتریان پێ درابوو، هەستاو سەرەتا سوپاس وستایشی خودای کردو پاشان فەرمووی: ((أَمَّا بَعْدُ فَوَاللَّهِ إِنِّي لَأُعْطِي الرَّجُلَ، وَأَدَعُ الرَّجُلَ، وَالَّذِي أَدَعُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الَّذِي أُعْطِي، وَلَكِنْ أُعْطِي أَقْوَامًا لِمَا أَرَى فِي قُلُوبِهِمْ مِنَ الجَزَعِ وَالهَلَعِ، وَأَكِلُ أَقْوَامًا إِلَى مَا جَعَلَ اللَّهُ فِي قُلُوبِهِمْ مِنَ الغِنَى وَالخَيْرِ، فِيهِمْ عَمْرُو بْنُ تَغْلِبَ)) واتە: ((سوێند بەخوا من سامان دەدەمە کەسانێك و کەسانێکی تری لێ بێ بەش دەکەم و ئەوانەی بێ بەش بوون خۆشەویست ترن لەلام لەوانەی کە بەشم پێدابوون، بەڵام من سامان دەبەخشمە کەسانێك کە دەبینم دڵیان پڕە لەترس وناجێگیرن، وەکەسانێکی تر لێدەگەڕێم بۆ ئەو دەوڵەمەندی و چاکەیەی کەخوا لەدڵیان جێگیری کردووە لەوانە عەمری کوڕی تەغلوب)) عەمری کوڕی تەغلوب ﷺ دەفەرموێت: سوێند بەخوا ئەو

وتەیەی پێغەمبەر ﷺ لەلام بە نرخ تر بوو لەڕەوە وشترێکی قەڵەو)[٧٣٣].

لەگێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((إِنِّي لَأُعْطِي الرَّجُلَ، وَغَيْرُهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهُ، مَخَافَةَ أَنْ يَكُبَّهُ اللهُ فِي النَّارِ))[٧٢٤] واتە: ((من بەشی پیاوی وەها دەدەم کەسی تر هەیە لەو خۆشەویستترە لەلام لەترسی ئەوەی خوا بەسەردا فڕێی نەداتە ناو دۆزەخەوە)).

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەڵێت: (موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم بۆی گێڕامەوە، کەسێك لەهاوەڵان بەپێغەمبەری ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا سەد وشترت بەخشییە عیینەی کوڕی حوسن و ئەقرەعی کوڕی حابیس، بەڵام هیچت نەبەخشییە جوعەیلی کوڕی سوراقەی ئەلزمری؟ فەرمووی: ((أَمَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَجُعَيْلُ بْنُ سُرَاقَةَ خَيْرٌ مِنْ طِلَاعِ الْأَرْضِ كُلُّهُمْ مِثْلُ عُيَيْنَةَ وَالْأَقْرَعِ، وَلَكِنِّي تَأَلَّفْتُهُمَا لِيُسْلِمَا، وَوَكَّلْتُ جُعَيْلًا إِلَى إِسْلَامِهِ))[٧٢٥] واتە: ((سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە جوعەیلی کوڕی سوراقە بەتەنها چاکترە لەپیاوانێکی وەك عیینەی کوڕی حوسن و ئەقرەعی کوڕی حابیس، بەڵام من وام پێباش بوو تا دڵیان بەرەو ئیسلام بهێنم و موسوڵمان بن و جوعەیلی کوڕی سوراقەم بەجێ هێشتووە بۆ ئیسلامەتییەکەی)) ).

لەگێڕانەوەیەکی تردا ئەبوزەڕ ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ پێی وتم: ((جوعەیل چۆن دەبینێت (واتە چۆن کەسێکە)؟ وتم: وەك هاوشێوەکانی خۆی هەژارێکی ناو خەڵکە. فەرمووی: ((وَكَيْفَ تَرَى فُلَاناً؟)) واتە: ((ئەی فلانە پیاو چۆن دەبینیت)) وتم: یەکێك لەسەروەرانی ناو خەڵکی، فەرمووی: (لَجُعَيلٌ خيرٌ مِنْ ملءِ الأرضِ مِثل هذا )) واتە: ((جوعەیل چاکترە پڕ بەزەوی لەپیاوانێکی ئاوها)). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فلانە کەس بەو جۆرەیەو تۆش ئاوهابوویت بۆی؟ فەرمووی: ((إِنَّهُ رَأْسُ قَوْمِهِ فَأَتَأَلَّفُهُمْ))[٧٢٦] واتە: ((ئەو سەرکردەی خزمەکانییەتی و دەمەوێت خۆی

(٧٢٣) خرجه: البخاري (٩٢٣،٣١٤٥،٧٥٣٥)

(٧٢٤) أخرجه: البخاري (١٤٧٨)، ومسلم (١٥٠)، وابوداود (٤٦٨٥)، وابن حبان (١٦٣).

(٧٢٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١١١/٤) برقم (١٠٣٩) وقال محققوه: اسناده ضعيف لارساله، والطبري (جامع البيان) (٩١/٣)، والبيهقي (الدلائل) (١٨٣/٥) وأبو نعيم (الحلية) (٣٥٣/١) وقال الحافظ في (الاصابة) (٤٣١/١): مرسلٌ حسنٌ.

(٧٢٦) أخرجه: الروياني (المسند) (١٢٥٧) وقال الحافظ في (الاصابة) رقم (١١٧٢) اسناده صحيح. وللحديث شاهد عند البخاري برقم (٤٨٠٣٥).

و خزمەکانی لەو ڕێگەیەوە بکەمە هۆگری ئیسلام))).

دواتر هەواڵ گەیشتە پێغەمبەر ﷺ کەپشتیوانان ڕەنجاون لەوەی کەهیچیان پێ نەدراوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ کۆی کردنەوەو کارەکەی بۆ ڕوون کردنەوەو دوعای بۆ کردن.

ئەبوسەعیدی خودری ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەو دەسکەوتانەی حونەینی دەسکەوت (دواتر سەد وشتری بەخشییە پیاوانێك لەقوڕەیش)[٧٢٧] وبەشی هەمووانی دا لەعەرەب و قوڕەیشییەکان، بەڵام نە کەم و نە زۆر هیچی نەبەخشیە ئەنصارییەکان (ئەوان لەناوخۆیاندا وتیان: ئەوە زۆر سەیرە، شمشێرەکانیان خوێنی ئەوانی لێدەتکێ و دەسکەوتەکانیشمان هەر بۆئەوان دەبێت)[٧٢٨] (گەر تەنگانە بێت ئێمە بانگ دەکرێین و دەسکەوتەکانیش دەدرێتە کەسانێکی تر)[٧٢٩] (خودا لەپێغەمبەر ﷺ خۆش بێت بەشی قوڕەیش دەدات و ئێمە فەرامۆش دەکات لەکاتێکدا شمشێرەکانمان خوێنی ئەوانی لێدەتکێت)[٧٣٠] (ئیتر وتە وت و مقۆ مقۆ زۆر بوو لەناویاندا: هەیان بوو دەیوت: ئەوەی لەگەڵی بەجەنگ هات بەشی داو بەڵام ئەوەی لەدژی بەجەنگ نەهات بێ بەشی کرد)[٧٣١]. (پێغەمبەر ﷺ دواجار گەیشتەوە بەخزمانی خۆی، سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ چوو بۆلای پێغەمبەر ﷺ و پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا پشتیوانان لێت ڕەنجاون لەدڵی خۆیاندا، فەرمووی: ((لەسەر چی؟)) وتی: لەسەر دابەشکردنی دەسکەوتەکان (تۆ بەشی خزمانی خۆتت دا، وبەشی گەورەشت بەخشییە هۆزەکان)[٧٣٢] وعەرەبەکانی تر، بەڵام هیچ شتێکت نەبەخشییە پشتیوانەکان.

فەرمووی: ((فَأَيْنَ أَنْتَ مِنْ ذلكَ يَا سَعْد؟)) واتە: ((ئەی تۆ چی دەڵێیت...ئەی سەعد؟))

---

(٧٢٧) أخرجه: البخاري (٤٣٣٤)، ومسلم (١٠٥٩)

(٧٢٨) أخرجه: مسلم (١٣٤/١٠٥٩).

(٧٢٩) أخرجه: مسلم (١٣٥/١٠٥٩).

(٧٣٠) أخرجه: البخاري (٤٣٣٤).

(٧٣١) أخرجه: مسلم (١٣٦/١٠٥٩)، وأحمد (١٢٦٠٨) وقال محققوه: اسناده حسن، واللفظ له.

(٧٣٢) أخرجه: أحمد (١١٧٣٠)، وقال محققوه: اسناده حسن، وصحح اسناده الحافظ (الفتح) (٦٣/٨)، والشيخ الالباني في (فقه السيرة) (٤٢٩)، وصححه ايضاً ابن كثير (البداية) (٦٢٩/٤).

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من تەنها یەکێکم لەگەڵ خزمانی خۆم. فەرمووی: ((فَاجْمَعْ لِي قَوْمَكَ فِي هَذِهِ الْحَظِيرَةِ وَفِي رِوايَة (فِي هذهِ القُبة)[٧٣٣] فَاذا اجْتَمَعُوا فَأَعْلِمْنِي)) واتە: ((خزمەکانتم هەموو بۆ کۆبکەرەوە لەو پشتیرەدا لەگێڕانەوەیەکدا (لەو دەوارو ڕەشماڵەدا) وگەر هەموویان کۆبوونەوە ئاگادارم بکەرەوە).

سەعد ڕۆیشت و هاواری کردو هەموویانی لەو شوێنەدا کۆکردنەوە پاشان پیاوانێکی موهاجیرینیش هاتن ڕێگەی دان وکەسانێکی تر هاتن ڕێگەی نەدان و گێڕانیەوەو فەرمووی: ((بەتەنها ئەنسارییەکان با بێنە ژورەوە بۆلام))[٧٣٤] کاتێك هەموو خڕبوونەوە سەعد هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هەموو ئەنسارییەکان (واتە: پشتیوانان)) کۆبوونەتەوە لەو جێیەدا کە فەرمانت پێکردم.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ هات بۆلایان وفەرمووی: ((کەسێکی تر هەیە لەناوتان جگە لەئێوە))! وتیان: نا مەگەر خوشکەزاکانمان بەتەنها لەگەڵە. فەرمووی: ((خوشکەزای خزمانێك هەر لەخۆیانە))[٧٣٥]. پاشان هەستا وتارێکی بۆدان و سەرەتا سوپاس و ستایشی شایستەی خودای کردو پاشان فەرمووی: ((مَا قَالَةٌ بَلَغَتْنِي عَنْكُمْ، وَجِدَةٌ وَجَدْتُمُوهَا عَلَيَّ فِي أَنْفُسِكُمْ؟ )) ((ئەو وتەیە چییە کە لەئێوەوە پێم گەیشتووە و بەهۆیەوە دڵتان لەمن ڕەنجاوە؟)) هەموو بێ دەنگ بوون، بەڵام داناکانیان وتیان: بەرپرسەکانمان هیچیان نەوتوە بەڵام گەنجەکانمان وتیان: خودا لەپێغەمبەر ﷺ خۆش بێت بەشی قوڕەیش دەدات وئێمەش فەرامۆش دەکات لەکاتێکدا هێشتا خوێنیان لەشمشێرەکانمان دەتکێ. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فَإِنِّي أُعْطِي رِجَالًا حَدِيثِي عَهْدٍ بِكُفْرٍ أَتَأَلَّفُهُمْ)[٧٣٦]. يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ (أ لم اتكونوا إذلةً فاعَزكم الله (بـي) [٧٣٧]، أَلَمْ آتِكُمْ ضُلَّالًا فَهَدَاكُمُ اللهُ (بِي)؟ وَعَالَةً فَأَغْنَاكُمُ اللهُ (بِي)؟ وَأَعْدَاءً فَأَلَّفَ اللهُ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ (بِي)؟ قَالُوا: بَلِ اللهُ وَرَسُولُهُ أَمَنُّ وَأَفْضَلُ. ((وَ) كُلَّمَا قَالَ (رَسُولُ اللهِ ﷺ) شَيْئاً قَالُوا اللهُ وَرَسُولُه آمن)[٧٣٨]، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « أَلَا تُجِيبُونَنِي يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ « قَالُوا: وَبِمَاذَا نُجِيبُكَ يَا رَسُولَ اللهِ، وَلِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ الْمَنُّ وَالْفَضْلُ. قَالَ: « أَمَا وَاللهِ لَوْ شِئْتُمْ

(٧٣٣) أخرجه: البخاري (٤٣٣٤)، ومسلم (١٠٥٩).
(٧٣٤) أخرجه: أحمد (١٢٦٠٨)، وقال محققوه: اسناده حسن.
(٧٣٥) أخرجه: البخاري (٤٣٣٤).
(٧٣٦) أخرجه: البخاري (٤٣٣١)، و مسلم (١٣٥/١٠٥٩).
(٧٣٧) أخرجه: أحمد (١١٥٤٧)، وقال محققوه: اسناده صحيح.
(٧٣٨) أخرجه: البخاري (٤٣٣٠).

لَقُلْتُمْ فَلَصَدَقْتُمْ وَصُدِّقْتُمْ ، أَتَيْتَنَا مُكَذَّبًا فَصَدَّقْنَاكَ، وَطَرِيدًا فَآوَيْنَاكَ، وَعَائِلًا فَآسَيْنَاكَ ، وخائفاً فأمنَّاك وَمَخْذُولًا فَنَصَرْنَاكَ)) فَقالُوا: المَنُّ لِلهِ وَلِرَسُولِهِ، فَقَالَ رَسُولُ الله ﷺ: ((أَوَجَدْتُمْ فِي أَنْفُسِكُمْ يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ فِي لُعَاعَةٍ (أي: بقلةٍ خضراء) مِنَ الدُّنْيَا، تَأَلَّفْتُ بِهَا قَوْمًا (لِيُسْلِمُوا) (إِنَّ قُرَيْشًا حَدِيثُ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ وَمُصِيبَةٍ، وَإِنِّي أَرَدْتُ أَنْ أَجْبُرَهُمْ وَأَتَأَلَّفَهُمْ)[٧٣٩] وَوَكَلْتُكُمْ إِلَى مَا قَسَمَ اللَّهُ لَكُمْ مِنَ الْإِسْلَامِ، أَفَلَا تَرْضَوْنَ يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ إِلَى رِحَالِهِمْ بِالشَّاءِ وَالْبَعِيرِ في رواية (بِالأَموالِ)[٧٤٠] وَ (الدُنْيا وَتَذْهَبُونَ بِرَسُولِ اللَّهِ إِلَى رِحَالِكُمْ، وَفِي رِوايةِ (دِيارِكُمْ)[٧٤١] وَفِي رِوايةِ (بُيُوتِكُمْ)[٧٤٢] (فَوَاللَّهِ لَمَا تَنْقَلِبُونَ بِهِ خَيْرٌ مِمَّا يَنْقَلِبُونَ بِهِ؟))[٧٤٣] .

**واتە: ((من بەشی پیاوانێك دەدەم تازە بێ باوەڕیان بەجێ هێشتووە بۆئەوەی هۆگری ئیسلام ببن). ئەی کۆمەڵانی ئەنصار ئایا ئێوە سەرشۆڕ نەبوون پێشتر خودا بەهۆی منەوە سەربەرزی کردن؟ ئایا ئێوە پێشتر دوژمنی یەکتر نەبوون خودا بەهۆی منەوە دڵەکانتانی پەیوەست کرد بەیەکەوە))؟ وتیان: بەڵێ وابوو ((منەت تەنها بۆ خواو پێغەمبەرەکەیەتی)). دواتر پێغەمبەر ﷺ هەر شتێکی دەفەرموو هەر بەو جۆرە وەڵامیان دەدایەوە.**

**پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی بۆ وەڵامم نادەنەوە ئەی کۆمەڵی ئەنصار))؟ وتیان ئێمە بڵێین چی و بەچی وەڵامت بدەینەوە؟ منەت هەر بۆ خواو پێغەمبەرەکەیەتی. فەرمووی: (سوێند بەخوا گەر بتانەوێت دەڵێن و ڕاستیش دەڵێن و بەڕاستیش دەخرێنەوە (دەتوانن بڵێن: هاتیت بۆلامان هەموو خەڵك بەدرۆیان خستبوویتەوە ئێمەش بەڕاستمان زانیت، هاتیت بۆلامان دەرکراوبوویت ئێمەش پەنامان دایت، هاتیت بۆلامان هەژاربوویت ئێمەش یارمەتیمان دایت، هاتیت بۆلامان ترسابوویت ئێمەش ترسمان لێ دوورخستیتەوە، هاتیت بۆلامان بێ پشتیوان بوویت ئێمەش پشتیوانیمان کردیت و سەرمان خستیت)).**

**وتیان: منەت تەنها هەر بۆخواو پێغەمبەرەکەیەتی. فەرمووی: (ئایا دڵتان لەمن ڕەنجاوە ئەی کۆمەڵانی ئەنصار لەسەر گیا سەوزێکی دونیا کەبەهۆیەوە ویستوومە**

(٧٣٩) أخرجه: البخاري (٤٣٣٤)، و مسلم (١٠٥٩).

(٧٤٠) أخرجه: البخاري (٤٣٣١).

(٧٤١) أخرجه: أحمد (١٢٩٥٢)، وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط البخاري.

(٧٤٢) أخرجه: البخاري (٤٣٣٤).

(٧٤٣) أخرجه: البخاري (٤٣٣٤)، و مسلم (١٠٥٩).

دڵی خەڵکێك ڕابکێشم بۆئەوەی موسوڵمان ببن (قورەیشییەکان ماوەیەکی کەم تێپەڕیوە بەسەر کارەساتیان و وازهێنانیان لەنەفامی، من ویستوومە بیان کەمە هۆگری ئیسلام و فەرمبوویان بکەمەوە) (وئێوەشم گێڕاوەتەوە بۆلای ئەوەی کەخودا لەئیسلامەتیدا بەشی داون، ئەی کۆمەڵانی ئەنصار ئایا ڕازی نابن خەڵکی بە مەڕو وشتر (وسامانەکانیانەوە) بگەڕێنەوە جێگەکانی خۆیان، ئێوەش پێغەمبەری خودا لەگەڵ خۆتان ببەنەوە (وڵات) (وماڵەکانتان) (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەوەی ئێوە لەگەڵ خۆتانی دەبەنەوە زۆر باشترە لەوەی ئەوان لەگەڵ خۆیانی دەبەنەوە). وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە ڕازین.

پاشان فەرمووی: ((الْأَنْصَارُ كَرِشِي، وَعَيْبَتِي)[٧٤٤] فَوَ الذي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ النَّاسَ سَلَكُوا شِعْبًا وَسَلَكَتِ الْأَنْصَارُ شِعْبًا لَسَلَكْتُ شِعْبَ الْأَنْصَارِ (إِنَّكُمْ سَتلقُونَ بَعْدِي أَثَرَةً شَدِيْدةً فَاصْبِرُوا حَتى تلقُونِي عَلى الحَوْضِ)[٧٤٥] واتە: (ئەنصارییەکان توێشەبەرە و کیفی تیرەکانمن) سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە گەر تێکڕای خەڵکی بەشیوێکدا بڕۆن و ئەنصارییەکان بەشیوێکی تردا بڕۆن من بەشیوی ئەنصاردا دەڕۆم ئێوە لەدوای من دووچاری پەراوێز خستنێکی توند دەبنەوە ئارامگربن تا دەگەنەوە بەمن لەسەر حەوزەکە) وتیان: (ئارامگر دەبین) (پاشان فەرمووی: ((وَلَوْلَا الْهِجْرَة لَكُنْت امْرَءًا مِنَ الْأَنْصَارِ، اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْأَنْصَارَ وَأَبْنَاءَ الْأَنْصَارِ وَأَبْنَاءَ أَبْنَاءِ الْأَنْصَارِ)) واتە: ((گەر لەبەر کۆچ و هیجرەت نەبووایە من دەبوومە یەکێك لەئەنصارییەکان، خودایە بە بەزەیی بە بۆ ئەنصارییەکان وە بۆ کوڕانی ئەنصارییەکان وە کوڕانی کوڕانی ئەنصارییەکان)).

ئیتر هەموویان گریان هەتا ڕیشیان بە فرمێسکەکانیان تەڕکرد)[٧٤٦]. لەگێڕانەوەکەی موسای کوڕی عوقبەو عوروەی کوڕی زوبەیردا ﷺ هاتووە: (ئەوان هەموو زۆر گریان وتیان: هەموو چاکەو منەتی خواو پێغەمبەرەکەیەتی بەسەرمانەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فارْجِعُوا إِلَيّ فِيْما كَلَّمْتُكُمْ بِهِ)) واتە: ((دەی وەڵامم بدەنەوە لەسەر ئەوانەی

(٧٤٤) أخرجه: أحمد (١٣٥٧٤)، وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(٧٤٥) أخرجه: البخاري (٤٣٣٠، ٤٣٣٤)، و مسلم (١٠٥٩).

(٧٤٦) الحديث من اوله الى هنا من رواية: أحمد (١١٧٣٠) وقال محققوه: اسناده حسن، وصححه كل من الحافظ (الفتح) (٦٣/٨)، وابن كثير (البداية) (٦٢٩/٤) والشيخ الالباني (فقه السيرة) (ص:٤٢٩) والزيادات من رواية ابن هشام (السيرة) (١١٣/٤) برقم (١٠٤٤) وقال محققوه: اسناده حسن. والزيادات الاخرى مكتوبةٌ كلٌ في مكانهِ مع تخريجه.

قسەم لەگەڵ کردن))؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە هەموو لەتاریکیدا بووین خودا بەهۆی تۆوە دەربازی کردین بەرەو بەهەشت، ئێمە هەموو لەلێواری چاڵێکی ئاگردا بووین خودا بەتۆ ڕزگاری کردین، ئێمە هەموو گومڕاو وێڵ بووین خودا بەتۆ ڕێنمویی کردین، ئێمە هەموو کەم و سەرشۆڕ بووین خودا بەتۆ زۆرو سەربەرزی کردین، ئێمە ڕازین تەنها (الله) خوامان بێت و ئیسلام ئاینمان بێت و موحەممەد پێغەمبەرمان بێت، تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی خۆت ویستت لێیە ئەنجامی بدە تۆ لەلایەن ئێمەوە بەتەواوی ڕێ پێدراویت..... هەموو چاکەو منەتێك تەنها بۆ خواو پێغەمبەرەکەیەتی بەسەر ئێمەو کەسانی ترەوە، پاشان هەموو دووبارە گریانەوە تا گریانیان درێژەی خایەندو پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵیان دا گریا.

لەکۆتاییدا هەموو بەو وشانەی کە لەپێغەمبەریان ﷺ بیست پێیخۆش حاڵتر و گەشبینتر بوون لەهەموو سامانەکانی دونیا)[٧٤٧] وە (وتیان ئێمە ڕازین خواو پێغەمبەرەکەی بەشی ئێمە بێت. پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت و ئەوانیش هەموو ئەو شوێنەیان بەجێ هێشت)[٧٤٨].

## هاتنی نوێنەرانی هەوازن

پێغەمبەر ﷺ چەندەها ڕۆژ چاوەڕێی نوێنەرانی هەوازنی کرد تا بێن و موسوڵمان بوونی خۆیان ڕابگەیەنن و ماڵ و سامانەکانیان ببەنەوە، بەڵام ئەوان لەدوای دابەشکردنی دەسکەوتەکان هاتن و موسوڵمان بوون:

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (لەغەزای حونەین لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین، موشریکەکان هێرشیان هێنایە سەرمان....و کەسێکیان لەناودابوو زیانی زۆری پێگەیاندین تا دواجار خودا ئەوانی بەزاند..... دواتر یەك یەك دەهاتن و بەڵێنیان دەدایە پێغەمبەر ﷺ، لەو کاتەدا یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وتی: نەزر بێت لەسەرم گەر خودا ئەو پیاوەم بهێنێتە بەردەم دەبێت لەگەردنی بدەم، پێغەمبەر ﷺ

(٧٤٧) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٨٨)، والبيهقي (الدلائل) (١٧٩/٥) من رواية عروة بن الزبير ﷺ.

(٧٤٨) أخرجه: أحمد (١١٧٣٠)، وقال محققوه: اسناده حسن، وابن هشام (السيرة) (١١٣/٤) برقم (١٠٤٤)، وقال محققوه: اسناده حسن.

بێ دەنگ بوو و دواتر ئەو پیاوە هێنرا بۆلای پێغەمبەر ﷺ، كاتێك ئەوی بینی وتی: ئەی پێغەمبەری خودا تۆبە بێت لەلای خودا، پێغەمبەریش ﷺ دەستی درێژ نەكرد تا بەڵێنی موسوڵمان بوونی لێ وەربگرێت بۆ ئەوەی موسوڵمانەكە نەزرەكەی خۆی بەجێ بگەیەنێت، موسوڵمانەكەش هەر چاوەڕێی فەرمانی پێغەمبەری ﷺ دەكرد تا فەرمان بەكوشتنی بدات و نەی دەوێرا بەبێ فەرمان و سەربەخۆیانە بیكوژێت. لەدواجاردا كە نەبینرا هیچ ئەنجام بدات بەڵێنی لێ وەرگرت. موسوڵمانەكە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی چی بكەم بۆ نەزرەكەم؟ فەرمووی: ((إِنِّي لَمْ أُمْسِكْ عَنْهُ مُنْذُ الْيَوْمَ إِلَّا لِتُوفِيَ بِنَذْرِكَ)) واتە: ((لەمڕۆدا لەسەرەتاوە من بەڵێنم لێ وەرنەگرت تا نەزرەكەت بەجێ بگەیەنیت)) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی بۆ نیگاو هێمایەكت بۆ نەكردم؟ فەرمووی: ((إِنَّهُ لَيْسَ لِنَبِيٍّ أَنْ يُومِضَ))[٧٤٩] واتە: ((پێغەمبەران بۆیان نییە بەنهێنی بەچاو ئیشارەت و نیگا بۆ كەس بكەن)).

بەم جۆرە هەموو هەوازن بەڵێنی موسوڵمان بوونیان دا بەپێغەمبەر ﷺ، ئەوان داوایان لەپێغەمبەر ﷺ كرد تا منداڵ و ئافرەتەكانیان بۆ بگێڕنەوە. پێغەمبەریش ﷺ بەشی خۆی و خزمانی بۆ گێڕانەوە و داوای لە هەموو موسوڵمانان كرد تا هەموو بۆیان بگێڕنەوە:

عەبدوڵلای كوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: (نوێنەرانی هەوازن هاتن (و نۆ لەناودارانیان لەناودابوون) (و هەموو موسوڵمان بوون و بەڵێنی موسوڵمان بوونیان بەپێغەمبەر ﷺ داو پاشان لەگەڵی دووان سەبارەت بەوانەی لەدەستیان داوە) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە خاوەن بنەماڵەو هۆزی خۆمانین و توشی ئەو بەڵایە هاتووین كەشاراوە نییە لەلات بەڵكو منەت بكەیت بەسەرماندا خوا منەت بكات بەسەرتدا، پیاوێك لەهەوازن كە یەكێك بوو لەكوڕانی بەنی سەعدی كوڕی بەكر ناوی زوهەیر بوو ناسرابوو بە (ئەبولسەرد) لەوێدا هەستاو وتی:

ئەی پێغەمبەری خوا لەبەندكراوەكاندا پورو خاڵۆژن و ئەوانەی كەتۆیان بەمنداڵی دایەنگا كردووە و تۆیان گرتۆتە ئەستۆی خۆیان هەموو ئەوانە لەناویاندا هەن، ئێمە گەر حارسی كوڕی ئەبو شەمەری گەورەی عەرەبەكانی شاممان بەخێوكردبایە یاخود

(٧٤٩) أخرجه: ابوداود (٣١٩٤)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٧٣٥).

نوعمانی کوڕی مونزیری گەورەی عەرەبەکانی عێراقمان بەخێوکردبایە وئەوەی ئێستامان بەسەردا بهاتایە، ئومێدی بەزەیی و وەفاداری ئەوانمان بۆ خۆمان هەبوو، بەڵام تۆ لە هەمووان چاکتریت (پاشان چەند پارچە شیعرێکی بۆ پێغەمبەر ﷺ وت و خزمایەتی و چاکەی ئەوانی بەبیری پێغەمبەر ﷺ هێنایەوە)(٧٥٠).

عوروە ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك هەوازن گەڕانەوە لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئومێدی گەورەمان بەخوا پاشان بەتۆ هەیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆش لەهەمووان چاکەکارترو بەوەفادارتریت و دەزانێت کە ئێمە تێکڕای سەروماڵمان لەدەست چووە)(٧٥١).

(پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (من ئەو داوایەتان بۆ دەکەم لەموسوڵمانان بەڵام ئێستا هەموو ئەوانە بڵاوبوونەتەوە دابەشکراون) خۆشەویسترین وتەش لەلای من ڕاستگۆ یيە، ئێوە دەبێت یەکێك لەو دووانە هەڵبژێرن یان ژن و منداڵەکانتان یان سامان و دەسکەوتەکانتان، دەشزانن کە من زۆر چاوەڕێم کردن تا بێن و بیان بەنەوە پێش دابەشکردنیان)(٧٥٢). پاشان پێی فەرموون: ((أَبْنَاؤُكُمْ وَنِسَاؤُكُمْ أَحَبُّ إِلَيْكُمْ، أَمْ أَمْوَالُكُمْ؟)) واتە: ((ئایا ژنان و منداڵەکانتان لەلا خۆشەویسترە یان سامانەکانتان))؟ (ئەوان بۆیان ڕوون بووەوە کەپێغەمبەر ﷺ تەنها یەکێك لەو دووانەیان بۆ دەگێڕێتەوە).

پاشان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ ئێمەت سەرپشك کردووە لەنێوان سامانەکانمان و نەژادو ژن و منداڵەکانمان (ئێمە ژن و منداڵەکانمان بەهیچ شتێکی دونیا ناگۆڕینەوە) بەڵکو داوا دەکەین کە تەنها ژن و منداڵەکانمان بۆ بگێڕنەوە ئەوان لای ئێمە خۆشەویسترن (ئێمە داوای وشترو مەڕەکانمان ناکەینەوە). پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أَمَّا مَا كَانَ لِي وَلِبَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَهُوَ لَكُمْ ، وَإِذَا مَا أَنَا صَلَّيْتُ الظُّهْرَ بِالنَّاسِ، فَقُومُوا فَقُولُوا: إِنَّا نَسْتَشْفِعُ بِرَسُولِ اللَّهِ إِلَى الْمُسْلِمِينَ، وَبِالْمُسْلِمِينَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ فِي أَبْنَائِنَا وَنِسَائِنَا، فَسَأُعْطِيكُمْ عِنْدَ ذَلِكَ، وَ (سَوْفَ) أَسْأَلُ لَكُمْ، (الْمُسْلِمِينَ وَأَشْفَعُ لَكُمْ) واتە: ((ئەوانەی بووەتە بەشی من و بەنی عەبدولمتەلیب هەمووتان بۆ دەگێڕینەوە، بەڵام کاتێك من نوێژی

---

(٧٥٠) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٣٠٤)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٢٩٣) فيه اسحاق... وبقية رجاله ثقات.

(٧٥١) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٩٧٤١)، وموسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٩١) وقال الشيخ مشهور حسن حفظه الله في (احاديث منتخبة من مغازي موسى بن عقبة) رقم (١٦) وحديث سعيد بن المسيب وعروة بن الزبير مرسلان صحيحان.

(٧٥٢) أخرجه: البخاري (٤٣١٩،٤٣١٨)

نیوەڕۆم بۆ موسوڵمانان کرد ئێوە هەستن و بڵێن: ئێمە پێغەمبەر ﷺ دەکەینە تکاکارمان لای موسوڵمانان و موسوڵمانانیش دەکەینە تکاکارمان لای پێغەمبەر ﷺ تا ژن و منداڵەکانمان بۆ بگێڕنەوە. ئەو کاتە من بەشەکەی خۆمانتان بۆ دەگێڕینەوەو داوا لەموسوڵمانان دەکەم و تکاتان بۆ دەکەم، ئێوەش داوایان لێ بکەن و موسوڵمان بوونی خۆتان ئاشکرا بکەن و بڵێن: ئێمە برایانی ئێوەمین لەئایندا و فێری کردن چۆن قسە بکەن و سەرەتای وتەکانیان بەچی دەست پێ بکەن...)[٧٥٣].

(کاتێك پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردن، ئەوان هەستان و داوایان لەپێغەمبەر ﷺ کرد ڕێگەیان پێ بدات و قسە بکەن، پێغەمبەریش ﷺ ڕێگەی دان و ئەوان وتار بێژەکانیان قسەو وتاری خۆیان وت)[٧٥٤] بەو جۆرەی کە پێغەمبەر ﷺ فێری کردبوون (وتەی زۆر کاریگەریان پێشکەش کردو داوایان لە موسوڵمانان کرد تا ژن و منداڵەکانیان بۆ بگێڕنەوە لەدوای تەواوبوونی وتەکەیان).

(پێغەمبەر ﷺ هەستا لەناو موسوڵماناندا و تاریدا و سەرەتا سوپاس و ستایشی شیاوی خوای گەورەی کردو لەپاشان فەرمووی: ((أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ إِخْوَانَكُمْ هَؤُلَاءِ قَدْ جَاءُوا تَائِبِينَ (مُسْلِمَيْنَ أَوْ مُسْتَسْلِمِينَ، وَإِنَّا قَدْ خَيَّرْنَاهُمْ بَيْنَ الذَّرَارِيِّ وَالْأَمْوَالِ فَلَمْ يَعْدِلُوا بِالْأَحْسَابِ)[٧٥٥] ، وَإِنِّي قَدْ رَأَيْتُ أَنْ أَرُدَّ إِلَيْهِمْ سَبْيَهُمْ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يُطَيِّبَ ذَلِكَ، فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يَكُونَ عَلَى حَظِّهِ حَتَّى نُعْطِيَهُ إِيَّاهُ مِنْ أَوَّلِ مَا يُفِيءُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَيْنَا، فَلْيَفْعَلْ)[٧٥٦] أَمَّا مَا كَانَ لِي وَلِبَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَهُوَ لَكُمْ)) واتە: (ئەوانە برایانی ئێوەن هاتوون و تەوبەیان کردووە (و موسوڵمان بوون.... من سەرپشکم کردوون لەنێوان ژن و منداڵ و سامانەکانیان ئەوان تەنها ژن و منداڵەکانیان داوا کردۆتەوە) منیش بڕیارمداوە ژن و منداڵەکانیان بۆ بگێڕمەوە، وە هەرکەسێکیش لەئێوە ئازادیان دەکات با وەها بکات، وە هەرکەسێکیش لەئێوە بەڕەزامەندی خۆی پێی خۆشە ئەو بەشەی خۆی لەدەست نەدات ئەوە ئێمە لەجیاتی ئەو بەشەی بەشێکی تری بۆ تەرخان دەکەین لەیەکەم دەسکەوت کە خودا پێمان دەبەخشێت) (ئەوەی

(٧٥٣) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٩٠) مرسلًا.

(٧٥٤) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٩٠) مرسلًا.

(٧٥٥) أخرجه: عبدالرزاق (٩٧٤١) عن عروة. وهو مرسل صحيح كما في (احاديث منتخبة من مغازي موسى بن عقبة) رقم (١٦).

(٧٥٦) أخرجه: البخاري (٤٣١٩،٤٣١٨).

بوومتە بەشی من و بەنی عەبدولموتەلیب هەمووی بۆتان دەگێڕینەوە). موهاجیرەکان وتیان: ئەوەی بوومتە بەشی ئێمە دەیبەخشینە پێغەمبەر ﷺ، و ئەنصارییەکانیش وتیان: ئێمەش ئەوەی بوومتە بەشمان هەموو بۆ پێغەمبەر ﷺ دەگێڕینەوە، (قوڕەیشیەکانیش وتیان: بەشی ئێمەش بۆ خواو پێغەمبەرەکەیەتی)[٧٥٧]. ئەقرەعی کوڕی حابیس وتی: بەڵام من و بەنوسولەیمیش هیچ ناگێڕینەوە. بەڵام هەردوو هۆزی بەنوتەمیم و بەنوسولەیم وتیان: درۆ دەکەیت، ئەوەی بەشی ئێمەیە هەمووی بۆ پێغەمبەر ﷺ..... پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ، رُدُّوا عَلَيْهِمْ نِسَاءَهُمْ وَأَبْنَاءَهُمْ)[٧٥٨] أَمَّا مَنْ تَمَسَّكَ مِنْكُمْ بِحَقِّهِ مِنْ هَذَا السَّبْيِ، فَلَهُ بِكُلِّ إِنْسَانٍ سِتُّ فَرَائِضَ مِنْ أَوَّلِ شَيْءٍ نُصِيبُهُ، (يُفِيئُهُ اللَّهُ عَلَيْنَا) فَرَدُّوا عَلَى النَّاسِ أَبْنَاءَهُمْ وَنِسَاءَهُمْ (يفيئهُ اللّه عَلينا) فردّوا إلى النّاسِ ابناءَهم ونساءَهم)[٧٥٩] واتە: (خەڵکینە ژن و منداڵەکانیان بۆ بگێڕنەوە)) ئەو کەسەش دەست بەمافەکەی خۆی دەگرێت لەم دەسکەوتەدا، لەبری هەموو مرۆڤێك کە لەلایەتی بەشەش بەچکە وشتر قەرەبووی دەکەینەوە لەیەکەم دەسکەوت کەخوای گەورە پێمان دەبەخشێت، لەبەرئەوە ئەی خەڵکینە ژن و منداڵەکانیان بۆ بگێڕنەوە) (خەڵکی وتیان: بەدڵ هەمووی دەگێڕینەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ وفەرمووی: ((إِنَّا لَا نَدْرِي مَنْ أَذِنَ مِنْكُمْ فِي ذَلِكَ، مِمَّنْ لَمْ يَأْذَنْ، فَارْجِعُوا حَتَّى يَرْفَعَ إِلَيْنَا عُرَفَاؤُكُمْ أَمْرَكُمْ)) واتە: ((ئێستا ئێمە نازانین کێ لەئێوە ڕازییە یان ناڕازییە بگەڕێنەوە تا بەرپرسەکانتان وەڵامەکانتان بۆلای ئێمە دەهێنێت)). خەڵکی گەڕانەوە دواتر بەرپرسەکانیان هاتنەوە لای پێغەمبەر ﷺ وهەواڵیان پێ گەیاند کەهەموویان ڕازی بوون)[٧٦٠].

(عوروە ﷺ دەفەرموێت: چەند ئافرەتێك درابووە پیاوانی قوڕەیش وەك عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و سەفوانی کوڕی ئومیە، پێغەمبەر ﷺ ئەو ئافرەتانەی سەرپشك کردن بمێننەوە لایان یان بگەڕێنەوە لای خزمەکانیان، لەئەنجامدا بڕیاریان

---

(٧٥٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٣٠٣) وفي (الاوسط) (٤٦٣٠)، وحسنه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٣٢٥٢).

(٧٥٨) أخرجه: أحمد (٦٧٢٩)، وقال محققوه: حديث حسن.

(٧٥٩) أخرجه: البخاري (٤٣١٨،٤٣١٩)، و أحمد (١٨٩١٤)، وقال محققوه: حديث صحيح.

(٧٦٠) حديث عبدالله بن عمر ﷺ أخرجه: أحمد (٧٠٣٧) وقال محققوه: اسناده حسن، والنسائي (٣٦٩٠)، وابن هشام (السيرة) (١٠١/٤) رقم (١٠٢٧) وقال محققوه: اسناده حسن، وقال الحافظ (الفتح) (٣٤/٨): اسناده حسن، وقال الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٩٧٣، ٣٢٥٢): اسناده حسن. واللفظ لابن هشام والزيادات لأحمد والبخاري وعبدالرزاق والطبراني وموسى بن عقبة وعروة بن الزبير.

دا بگەڕێنەوە لای خزمەکانیان)[٧٦١].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: (کەنیزەکێك درابوو بەعومەر ئەویش بەمندا ناردی بۆلای خزمانمان لەبەنی جومەح تا تەواف بکەین، کاتێك لەمزگەوت هاتینە دەرەوە، تەماشامان کرد خەڵکی ڕادەکەن، وتمان ئەوە چی بووە؟ وتیان: (ئێمە هەوازنین) و پێغەمبەر ﷺ ژن و منداڵەکانمانی بۆ گێڕاینەوە (لەوێدا عومەر وتی: عەبدوڵڵا بڕۆ ئەو کەنیزەکە ئازاد بکە....)[٧٦٢]. منیش بەوانم وت: کەسێکی ئێوە لای ئێمەیە لەبەنی جومەح بڕۆن بۆلایان و لێیان وەربگرنەوە)[٧٦٣] .

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەڵێت: (وا باس دەکەن کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داوە کەسێك بگەڕێتەوە ناو مەککە تا پۆشاکیان بۆ بکڕێت (وبیکاتە دیاری بۆیان) وهەموو بەپۆشتەییەوە بگەڕێنەوە لای خزمانی خۆیان، بەڵام (بڕیاری دا خانەوادەی مالیکی کوڕی عەوفی سەرکردەیان لای ئوم عەبدوڵای پوریان بهێڵێتەوە تا مالیك دێت و موسوڵمان دەبێت، نوێنەرانی هەوازن وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوان بنەماڵەیەکی خۆشەویست و ناوداری ئێمەن؟ فەرمووی: ((إنّما اريدُبِهِمُ الخَيْر))[٧٦٤] واتە: ((من تەنها مەبەستی خێرم بەوانە)).

## موسوڵمان بوونی مالیکی کوڕی عەوفی نەزری

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لەنوێنەرانی هەوازن کردو فەرمووی: ((مالیك چی بەچی کرد))؟ وتیان: ئەو ئێستا لەناو سەقیفە لەتائیفە، فەرمووی: ((هەواڵی پێ بگەیەنن گەر ئەو بێت و موسوڵمان ببێت هەموو سامان و ژن و منداڵەکانی بۆ دەگێڕمەوە و سەد وشتریشی پێ دەبەخشم)).

ئەو هەواڵە گەیشتەوە بەمالیك و ئەویش دەی ویست تائیف بەجێ بهێڵێت بەڵام دەترسا گەر سەقیف بەو هەواڵ و کارەی بزانن دەیکوژن یان لای خۆیان بەندی دەکەن،

---

(٧٦١) أخرجه: عبدالرزاق (٩٧٤١)، وموسى وعروة كما في (الدلائل) للبيهقي (١٩٣/٥)، ومغازي (موسى بن عقبة) (ص:٢٩١)، وهو مرسل صحيح كما في (احاديث منتخبة من مغازي موسى بن عقبة) رقم (١٦).

(٧٦٢) أخرجه: البخاري (٤٣٢٠).

(٧٦٣) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٠٣/٤)، والطبري (التاريخ) (٨٨/٣)، وقال البرزنجي في (صحيح التاريخ الطبري) (٢٦٦): اسناده حسن.

(٧٦٤) أخرجه: موسى بن عقبة في (المغازي) (ص:٢٩١).

سەرەتا داوای کرد ئەسپەکەی بۆ ئامادەبکرێت و فەرمانیدا بەنهێنی وشترێکی بۆ بهێنرێتە نزیك تائیف و لەشەودا فرسەتی هێناو سواری ئەسپەکەی بوو تا بەخێرایی زوو لەو ناوچەیە دوورکەوتەوە، تا گەیشت بەو وشترەی کە لەجێی دیاریکراو بۆی ئامادەکرابوو، لەوێ سواری پشتی بوو تا خۆی گەیاندە لای پێغەمبەر ﷺ لەناوچەی جوعرانە لە مەککە موسوڵمان بوو، وە هەموو سامان و ژن و منداڵەکانی بۆ گێڕایەوە و سەد وشترەکەشی وەرگرت و زۆر چاك موسوڵمان بوو.....

پێغەمبەریش ﷺ کردیەوە بە سەرکردەی ئەوانەی کە موسوڵمان بووبوون لەهۆزەکەی، کە بریتی بوون لەهۆزەکانی سومالەو سەلەمەو فەهم (وفەرمانی پێدا لەگەڵ خەڵکی تائیف بجەنگێت). دواتر مالیك بەسەختی دەجەنگا لەگەڵ خەڵکی تائیف و هەر مێگەلە مەڕێکیان بهاتایەتە دەر پەلاماری دەداو دەی برد تا بەتەواوەتی گوشاری خستبووە سەریان)[٧٦٥].

(ئیبنو سەلام ﷺ دەڵێت: مالیك لەدوای موسوڵمان بوونی بەعومەری کوڕی خەتتابی وتبوو: پێغەمبەر ﷺ ئەو سامان و وشترانەی پێ بەخشیم تا من موسوڵمان ببم، بەڵام ئێستا من پێم خۆش نییە لەسەر موسوڵمان بوونم هیچ پاداشتێك وەربگرم بۆیە من هەمووی دەگێڕمەوە! عومەریش فەرمووی: ئەو تەنها بۆیە پێی داویت چونکە بەمافی تۆی زانیوە)[٧٦٦].

## عەرەبە دەشتەکییەکان داوای دەسکەوتی زیاتر دەکەن

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەڵێت: (لەدوای گێڕانەوەی ژن و منداڵەکانی هەوازن بۆلای خاوەنەکانیان، پێغەمبەر ﷺ سواری پشتی وشترەکەی بوو، خەڵکی شوێنی کەوتن و دەیان وت: ئەی پێغەمبەری خودا لە وشترو مەڕی دەسکەوتەکان بەشمان بدە، تا ناچاریانکرد بچێتە لای دارێکی سومرەوە و پۆشاکەکەی سەرشانی برا، پاشان فەرمووی: ((رُدُّوا عَلَيَّ رِدَائِي أَيُّهَا النَّاسُ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ كَانَ لَكُمْ عَدَدُ هَذِهِ الْعِضَاهِ نعما

---

(٧٦٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٠٤/٤)، والطبري (التاريخ) (٨٨/٣)، والطبراني (الكبير) (٣٠٢/١٩) رقم (٦٧٣)، والبيهقي (الدلائل) (١٩٨/٥)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٨٩/٦): رجاله ثقات.

(٧٦٦) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٦٠،١٦٧٢/١٩)، والذهبي (السير) (٧/١٤)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٢٨٦): رواه الطبراني عن خليفة بن خياط ومحمد بن سلام الجمحي وكلاهما ثقة.

لقسمته فِيكُمْ ثُمَّ لَا تَجِدُونِي بَخِيلًا وَلَا جَبَانًا وَلَا كَذَّابًا)) واتە: ((پۆشاکەکەم بۆ بگێڕنەوە، ئەی خەڵکینە سوێند بەخوا گەر بەژمارەی درەختەکانی (دەشتی) توهامە تان هەبێت من بەسەرتاندا دابەشی دەکەم تا دواجار باش دەزانن کە من چروك و ترسنۆك و درۆزننیم)).

پاشان پێغەمبەر ﷺ نوێژی بۆ کردن..... لەپشتی وشترێکی دەسکەوتەکانەوە)[٧٦٧]. (دواتر لای وشترەکەی خۆی وەستاو چەند موویەکی لەسەر کۆپارەکەی لێکردەوەو خستیە نێوان هەردوو پەنجەی شایەتمان و ناوەڕاستی) وبەرزی کردەوە، پاشان فەرمووی: ((يا) أَيهَا النَّاس وَالله مالي مِنْ فَيْئِكُمْ (شيءٌ)[٧٦٨] وَلَا هَذِهِ الْوَبَرَةِ إِلَّا الْخُمُسُ وَالْخُمُسُ مَرْدُودٌ عَلَيْكُمْ، فَأَدُّوا الْخِيَاطَ وَالْمَخِيطَ، فَإِنَّ الْغُلُولَ عَارٌ وَنَارٌ وَشَنَارٌ عَلَى أَهْلِهِ عاراً وَناراً وَشَناراً (أي: أَقْبَح العار) (فِي الدُّنْيا وَالأخِرة)[٧٦٩] (وَجَاهِدُوا النَّاسَ فِي اللهِ تَبَارَكَ وَتَعالى القَرِيْب وَالبَعِيد (وَلَا تَأخذكُمْ) فِي اللهِ لَوْمَةَ لَائِم، وَاقِيْمُوا حُدُودَ اللهِ (فِي القَرِيْبِ وَالبَعِيدِ) وَ فِي الحَضَرِ وَالسَّفَرِ، وَجَاهِدوا فِي سَبِيْل الله فَإِنَّ الجِهادَ بابٌ مِنْ أَبْوابِ الجَنَّة يِنُجي الله تَبَارَكَ وَتَعالى (صَاحبه) مِن الغَمِ وَالهَم))[٧٧٠].

واتە: ((خەڵکینە سوێند بەخوا دەستکەوتەکەتان (هیچی) بۆ من تێدا نییە تەنانەت ئەو موومەش، تەنها پێنج یەکی دەستکەوتەکان بۆ منەو ئەویش دەگێڕدرێتەوە بۆتان، لەبەرئەوە دەرزی و داو و هەموو دەستکەوتەکانتان، چونکە دزی لەدەستکەوت دەبێتە ئاگرو ئابڕوچوونی بۆ خاوەنەکەی لەدنیاو قیامەتدا) (ئێوە لەپێناوی خوادا تێبکۆشن دژ بەنزیك و دوور، وە (لەجێبەجێ کردن)ی فەرمانی خوا لەلۆمەی لۆمەکاران مەترسن، سزای سەرپێچییەکان بسەپێنن بەسەر نزیك و دووردا لەسەفەرو لەماڵدا، وە تێبکۆشن لەپێناوی خوادا چونکە تێکۆشان دەرگایەکە لەدەرگاکانی بەهەشت و خوای گەورە خاوەنەکەی پێ دەپارێزێت لەخەفەتی ئیستا و داهاتوو).

(لەوێدا پیاوێك گلۆڵەیەك دەزووی هێناو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوەم

---

(٧٦٧) أخرجه: ابوداود (٢٦٩٤)، وابن ماجة (٢٨٥٠)، والنسائي (٢٦٢/٦)، ومالك (٥١٤/٢)، وصححه الشيخ الالباني في الصحيحة (٩٨٥)، و (صحيح ابي داود) (٢٣٤٣)، و (صحيح ابن ماجة) (٢٣٠٠).

(٧٦٨) أخرجه: ابوداود (٢٦٩٤).

(٧٦٩) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨١١٧). وأحمد (٢٢٦٩٩) وقال محققه: حديث حسن.

(٧٧٠) أخرجه: أحمد (٢٢٦٩٩)، وقال محققوه: حديث حسن. وحسنه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٩٤٢،١٩٧٢).

بردووە تا ژێر کۆپانێك بدورم بۆ سەر پشتی وشترەکەم چونکە سەرپشتی بریندارە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أَمَّا نَصِيبِي ((وَ) مَا كَانَ لِي وَلِبَنِي عَبْد الْمُطَلِب) مِنْهَا لَكَ)) واتە: ((تەنها ئەو بەشەی کە هی من و کوڕانی عەبدولموتەلیبە هەمووی بۆ تۆ)) وتی: گەر وابێت پێویستم پێی نییەو پاشان خستیەوە ناو دەسکەوتەکان)[٧٧١].

ئەنەس رضي الله عنه دەفەرموێت: (خەڵکی لەدەسکەوتەکانی حونەین داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کردو بەشی دان لەمەڕو مانگاو وشتر تا هەمووی تەواوبوو، ئینجا فەرمووی: ((مَاذَا تُرِيْدُونَ أَتُرِيْدُونَ أَنْ تَبْخَلُونِي فَوَ اللهِ مَا أَنَا بِبَخِيْلٍ وَلاَ جَبَّانٍ وَلاَ كَذُوبٍ)) واتە: ((چیتان دەوێت، دەتانەوێت من دووچاری چروکیم بکەن، سوێند بەخوا من هەرگیز چروك و ترسنۆك و درۆزن نیم)) ئەوەندەیان داوالێکرد تا پۆشاکەکەی سەرشانی ڕاکێشراو کەوتە خوارەوەو هەردوو شانی دەرکەوت دەت وت پارچەیەك لەمانگە لە سپێتیدا)[٧٧٢].

ئیبنو مەسعود رضي الله عنه دەفەرموێت: (لەکاتی دابەشکردنی دەسکەوتەکانی حونەیندا خەڵکی قەرەباڵەغییان لێکرد تا فەرمووی: ((بەندەیەك لەبەندەکان خودا ناردی بۆلای قەومێك ئەوان بەدرۆیان خستەوەو لێیان داو دەم وچاویان بریندارکرد ئەو خوێنەکەی بە دەموچاویەوە دەسڕی و دەی وت: ((اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فَإِنَّهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ)) واتە: خودایە لەخزمانم خۆش ببە ئەوان نەزانن)) ئیبنو مەسعود رضي الله عنه دەڵێت: ئێستاش لەبەرچاومە کەچۆن پێغەمبەر ﷺ لاسایی دەکردەوەو دەموچاوی دەسڕییەوە)[٧٧٣].

ئەبوموسای ئەشعەری رضي الله عنه دەفەرموێت: (من لەناوچەی جوعرانەی نێوان مەککەو مەدینە لای پێغەمبەر ﷺ بووم، عەرەبێکی دەشتەکی هات وتی: ئایا بەڵێنەکانتم بۆ جێبەجێ ناکەیت؟ فەرمووی: ((چاوەڕوانی مژدە بە)) وتی: ئەمرۆ زۆرت ئەوە بۆ من دووبارە کردەوە. پێغەمبەر ﷺ ڕووی کردە ئەبو موساو بیلال وە بەتوڕەبوونەوە پێی فەرموون: ((ئەو کەسە مژدەی منی ڕەتکردەوە ئێوە هەردووکتان مژدە لەمن

---

(٧٧١) أخرجه: أحمد (٦٧٢٩، ٧٠٣٧)، وقال محققه: اسناده حسن، وابن هشام (السيرة) (١٠٥/٤).

(٧٧٢) أخرجه: الطبري (جامع البيان) (١٧٢/١٥) وقال السيوطي: سنده صحيح على شرط الشيخين كما في (كنز العمال) رقم (٣٠٢١٦).

(٧٧٣) أخرجه: البخاري (الادب المفرد) (٧٥٧)، وحسنه الشيخ الالباني يرحمه الله في (صحيح الادب المفرد) (٥٨٢) و (الصحيحة) (٣١٧٥).

وەرگرن)) وتیان: ئەوە مژدەکەتمان وەرگرت....)[٧٧٤].

بەم جۆرە پێغەمبەر ﷺ نمونەی ئارامگری بوو لەگەڵ ئەو دەروون وشکانەدا کە سوور بوون لەسەر دەسخستنی دەسکەوت، بەڕاستی نموونەی پەروەردەکار بوو ئەوانی باش دەناسی و چاوپۆشی لێ دەکردن و ڕەوشتجوانی خۆی بۆ دەنواندن و دڵنیایی دەکردنەوە کەبەرژەوەندییەکانیان بۆ دەپارێزێ و زۆر بەبەزەیی بوو بۆیان هەرگیز مامەڵەی وەك پاشاکان نەبوو لەکەڵ بەردەستەکانیان....

بەڵکو وەکو یەکێك لەوان وابوو لەگەڵی دەدوان و گلەییان لێ دەکردو خۆی لێ ون نەدەکردن، هاوەڵانی بەئەدەبەوە لەگەڵی دەدوان و بەدەنگی نزم و وشەی شیاو چونکە زۆر خۆشیان دەویست و بەگەورەیان دەزانی، بەڵام عەرەبە نەزانەکان خودا ئایاتەکانی توندبوو بەرامبەریان لەسەر کەم شەرمی و زبری و دەنگ بەرزکردنەوەیان لەکاتی ئاخاوتنیان لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ[٧٧٥].

## لەدوای دابەشکردنی دەسکەوتەکان

لەدوای تەواوبوونی دابەشکردنەکە ئەم ڕووداوانە ڕوویاندا:

### ١- دانەوەی قەرزەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ڕەبیعە ﷺ:

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ڕەبیعە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بڕی سی هەزار یان چل هەزار (درهەمی) لێ وەرگرتم بەقەرز، لەدوای گەڕانەوەی لەجەنگەکە هەمووی بۆ گێڕانەوەو فەرمووی: ((بَارَكَ اللهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ، إِنَّمَا جَزَاءُ السَّلَفِ الْوَفَاءُ وَالْحَمْدُ))[٧٧٦] واتە: ((خودا بەرەکەتت بۆ بخاتە هاوسەرو منداڵ و سامانەکەت، پاداشتی قەرز سوپاس و گێڕانەوەیەتی).

### ٢- پۆشاکە زرێپۆشەکانی سەفوانی کوڕی ئومەییە:

ئومەیەی کوڕی سەفوان ﷺ دەفەرموێت: (سەفوان سی تا چل پۆشاکی زرێی دایە پێغەمبەری خودا ﷺ تا دواتر بۆی بگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بەرەو جەنگی حونەین

(٧٧٤) أخرجه: البخاري (٤٣٢٨).

(٧٧٥) انظر: (السيرة النبوية الصحيحة) د. اكرم ضياء العمري (٢/٥١٥).

(٧٧٦) أخرجه: ابن ماجة (٢٤٢٤)، وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (١٩٦٨) وفي (الارواء) (١٣٨٨).

چوو، لەدوای ڕاکردن و شکستی موشریکەکان، زرێکانی سەفوانییان کۆکردەوەو هەندێکیان دیار نەمابوون، پێغەمبەر ﷺ بەسەفوانی فەرموو: ((إِنَّا قَدْ فَقَدْنَا مِنْ أَدْرَاعِكَ أَدْرَاعًا فَهَلْ نَغْرَمُ لَكَ؟))؟ واتە: ((ئێمە هەندێك لەزرێکانتمان لێ ون بووە ئایا قەرەبووت بکەینەوە؟)) وتی: نا ئەی پێغەمبەری خودا ئەو (بڕوایەی)[٧٧٧] ئەمڕۆ لەدڵمدایە پێشتر لەدڵمدا نەبووە[٧٧٨]. وئەمڕۆ زیاتر ئیسلام لەدڵمدا جێگیرە)[٧٧٩].

### ٣- خودا خۆشەویستی خۆی فڕێ ناداتە دۆزەخەوە:

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ئافرەتێکی لەدەسکەوتەکان بینی منداڵەکەی دۆزییەوەو لەئامێزی گرت و شیری پێدا، فەرمووی: واتە: ((«أَتُرَوْنَ هَذِهِ طَارِحَةً وَلَدَهَا فِي النَّارِ» قُلْنَا: لَا، وَهِيَ تَقْدِرُ عَلَى أَنْ لَا تَطْرَحَهُ))؟ ((ئێوە لەو باوەڕەدان ئەو ئافرەتە گەر دەسەڵاتی هەبێت منداڵەکەی فڕێ بداتە ناو ئاگرەوە))؟ وتیان: نەخێر. فەرمووی: ((اللَّهُ أَرْحَمُ بِعِبَادِهِ مِنْ هَذِهِ بِوَلَدِهَا))[٧٨٠] واتە: ((سوێند بەخوا، خودا زیاتر بەبەزەیی ترە بۆ بەندەکانی لەو ئافرەتە بۆ منداڵەکەی)).

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (منداڵێك لەسەر ڕێگەکە بوو، لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ وهەندێك هاوەڵانی بەسواری بەوێدا ڕۆیشتن، دایکی منداڵەکە ئەوانی بینی ترسا منداڵەکەی بەژێر پێی وڵاخەکانیانەوە بێت، خێرا ڕایکردو منداڵەکەی هەڵگرت و دەی وت: ئەی ڕۆڵەکەم، ئەی ڕۆڵەکەم، هەندێك لەهاوەڵان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ئافرەتە هەرگیز کاری وەها ناکات منداڵەکەی فڕێ بداتە ناو ئاگرەوە؟ پێغەمبەر ﷺ بێ دەنگی کردن و فەرمووی: (لَا، وَلَا يُلْقِي اللهُ حَبِيبَهُ فِي النَّارِ))[٧٨١] واتە: ((نا خوای گەورەش خۆشەویستی خۆی فڕێ ناداتە ناو ئاگرەوە)).

### ٤- هەریەکە نوێژ لەجێی خۆی بکات:

ئەبو مەلیح لەباوکییەوە دەیگێڕێتەوە ﷺ ودەفەرموێت: (لەحونەیندا باران باری،

---

(٧٧٧) أخرجه: أحمد (١٥٣٠٢)، وقال محققوه:حديث حسن.

(٧٧٨) أخرجه: ابوداود (٣٥٦٣) والطحاوي (شرح مشكل الاثار) (٤٤٥٤) وقال محققه: صحيح لغيره.

(٧٧٩) أخرجه: النسائي (الكبرى) (٥٧٧٩)، والحاكم (٤٧/٢)، والبيهقي (الكبرى) (٨٩/٦).

(٧٨٠) أخرجه: البخاري (٥٩٩٩).

(٧٨١) أخرجه: أحمد (١٣٤٦٧،١٢٠١٨) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما واللفظ له، وابويعلى (٣٧٤٧)، والحاكم (١٧٧/٥٨،٤/١) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وقال ابن كثير (التفسير) (٢٠٦/٦): اسناده صحيح على شرطهما.

بانگبێژەکەی پێغەمبەر ﷺ (بانگی داو) پاشان فەرمووی: ((أَنْ صَلُّوا فِي الرِّحَالِ))(٧٨٢) واتە: هەریەکە نوێژ لەجێی خۆی بکات)).

### ٥- ڕێزو بەخشین و خۆ بەکەم زانینی پێغەمبەری خوا ﷺ:

عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکر ﷺ دەفەرموێت: (یەکێك لەو پیاوانەی بەشداربوون لەجەنگی حونەیندا وتی: من سواری وشترەکەم ببووم و دوو نەعلی زبرم لەپێدابوو، وشترەکەم لە وشترەکەی پێغەمبەر ﷺ نزیك بووەوەو بەریەك کەوتن بەهۆی تەسکی ڕێڕەوەکە، لەوێدا لایەکی نەعلە زبرەکەم بەر قاچی پێغەمبەر ﷺ کەوت و ئازاری پێ گەیاندو شوڵێکی بەدەستەوە بوو کێشای بەقاچمداو فەرمووی: ((بِسمِ اللّٰهِ أَوْجَعْتَنِي) فَتَأَخَر عَنِي)) واتە: ((بسم الله ئێشت پێ گەیاندم)) لێم دوورکەوە)) منیش ڕۆیشتم (ئەو شەوە سەرانسەر من لۆمەی خۆم دەکردو دەم وت: من ئێشم بە پێغەمبەر گەیاند، وهەر خوا دەزانێت ئەو شەوە حاڵم چۆن بوو.

کاتێك ڕۆژ بووەوە، کەسێك بانگی کرد ئەوە فلان کەس لەکوێ یە؟ تەماشا دەکەم پێغەمبەر ﷺ ئەو کەسەی بۆ دۆزینەوەی منی ناردووە، منیش وتم سوێند بەخوا ئەوە بەهۆی ڕووداوەکەی ڕۆژی پێشترە کە من نەعلەکەم بەر قاچی پێغەمبەر ﷺ کەوت. دواتر ڕۆیشتم بۆلای پێغەمبەر ﷺ و زۆر دەترسام ئەو پێی فەرمووم: ((إِنَّكَ أَصَبْتَ مِنْ رِجْلِي بِالْأَمْسِ فَأَوْجَعْتَنِي فَقَرَعْتُ قَدَمَكَ بِالسَّوْطِ فَدَعَوْتُكَ لِأُعَوِّضَكَ مِنْهَا (فهذه ثمانون نعجة فخذها بها) «فَأَعْطَانِي ثَمَانِينَ نَعْجَةً بِالضَّرْبَةِ الَّتِي ضَرَبَنِي فاعطاني ثمانين نعجة بالضربة التي ضربني»))(٧٨٣) واتە: ((تۆ دوێنێ بەر قاچم کەوتی و ئێشت پێ گەیاندم ومنیش شوڵێکم کێشا بەقاچتدا، من ئێستا تۆم بانگ کردووە تا قەرەبووت بۆ بکەمەوە (ئەوەتا هەشتا سەر بەرخ بۆ تۆ بیبە) بەوجۆرە هەر هەشتا سەرەکەی پێدام لەجیاتی ئەو شوڵەی بەر قاچم کەوت).

---

(٧٨٢) أخرجه: ابوداود (١٠٥٧)، وابن حبان (٢٠٨١) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط البخاري، والنسائي (الصغرى) (١١١/٢) وفي (الكبرى) (١٥٩٦)، وابن خزيمة (١٦٥٨) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (الارواء) (٣٤٢/٢).

(٧٨٣) أخرجه: الطبري (التاريخ) (٩٣/٣) عن ابن اسحاق، والدارمي رقم (٧٣)، وحسنه الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (٣٠٤٣).

**٦- وەفاداری پێغەمبەر ﷺ:**

سوراقەی کوڕی جوعشم لەهیجرەتی پێغەمبەردا ﷺ یارمەتیدا و ئازاری پێ نەگەیاند، پێغەمبەر ﷺ لەوێدا فەرمانی کرد نامەیەکی تۆڵە لێ نەکردنەوەی بۆ بنوسرێت و پێی درا.

لەدوای تەواوبوونی جەنگی حونەین و تائیف لەناوچەی جوعرانە سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشم هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ و دەڵێت: (لەدوای جەنگی حونەین و تائیف نامەکەم لەگەڵ خۆم بردو لەناوچەی جوعرانە پێی گەیشتم کەوتمە ناو پۆلێك لەئەسپ سوارانی ئەنصار، ئەوان بەدەسکی ڕمەکانیان پێیان دەکێشام و دەیان وت: بڕۆ دواوە، بڕۆ دواوە چیت دەوێت؟ دواتر خۆم نزیك کردەوە لەپێغەمبەری خوا ﷺ ئەو بەسواری وشترەکەیەوە بوو کەمێك قاچیم لێ دیاربوو لەسپێتیدا دەت وت جوماری دارخورمایە، لەوێدا نامەکەم بۆ بەرزکردەوەو پێم وت: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوە نامەکەی تۆیە بۆ من، من سوراقەی کوڕی جوعشمم؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((يَوْمُ وَفَاءٍ وَبِرٍّ، ادْنُهْ)) واتە: ((ئەمڕۆ ڕۆژی وەفاداری و چاکەکاریە وەرە پێشەوە، منیش لێی نزیك بوومەوەو موسوڵمان بووم و بیرم کردەوە شتێك بپرسم لەپێغەمبەر ﷺ و هیچم بیر نەکەوتەوە بەڵام من وتم: ئەی پێغەمبەری خودا وشتری ون بوو دێت لەو حەوزە ئاوانە دەخواتەوە کە من پڕم کردووە بۆ وشترەکانی خۆم، ئایا من گەر تێر ئاویان بکەم پاداشتم بۆ هەیە؟ فەرمووی: ((نَعَمْ، فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ حَرَّى أَجْرٌ))[٧٨٤] واتە: ((بەڵێ بۆ هەموو زیندەوەرێکی جگەر گەرم تۆ پاداشتت بۆ هەیە)).

**٧- داوای خوێنی عامیری کوڕی ئەزبەتی ئەشجەعی:**

کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەحونەیندا بوو، دەمەقاڵەیەك دروست بوو لەنێوان ئەقرەعی کوڕی حابیس و عیینەی کوڕی ئەلحوسنی دا لەسەر خوێنی عامری ئەشجەعی، ئەم بەسەرهاتە سەنەدەکەی (لاوازە) و بۆ زیاتر ئاشنابوون دەیگێڕینەوە:

---

(٧٨٤) أخرجه: الحميدي (٩٠٢)، وعبدالرزاق (٩٧٤٣)، والبخاري (٣٩٠٦)، والطبراني (الكبير) (٦٦٠٢) و (٦٦٠٣) و (٨٥/٢٤) رقم (٢٨٤)، وأحمد (١٧٥٨١) وقال محققوه: حديث صحيح، و الفاكهي (أخبار مكة) (٢٨٥١) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن هشام (السيرة) (٨٨/٢) باسناد البخاري واللفظ له، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترغيب) (٩٥٧).

زیادی کوڕی زەمرەی کوڕی سەعد لەباپیرییەوە کەبەشداری جەنگی حونەین بووە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ لە حونەین نوێژی نیوەڕۆی بۆکردین و پاشان چووە بن سێبەری دارێك و دانیشت، لەوێ ئەقرەع و عیینە چوونە لای پێغەمبەر ﷺ و بووە دەمەقاڵەیان لەسەندنەوەی خوێنی عامیری کوڕی ئەزبەتی ئەشجەعی، عیینە سەرکردەی غەتەفان بوو وە داواکاری خوێنەکەی بوو، ئەقرەعی کوڕی حابیسیش پارێزگاری لە موحلیمی کوڕی جوسامە دەکرد بەهۆی نزیکییەوە لەخەندیف، هەردوولا بووە دەمەقاڵەیان لای پێغەمبەر ﷺ وئێمەش گوێمان لێیان بوو، عیینە وتی: سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا لێی ناگەڕێم تا ئافرەتەکانیان غەمبار نەکەم وەك چۆن ئافرەتەکانی ئێمەی غەمبار کرد.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڵکو دەبێت پارەی خوێنەکە پەنجا وشتر وەربگرن لەم سەفەرەمانداو پەنجاکەی تری لەدوای گەڕانەوەماندا)). بەڵام ئەو هەر ڕازی نەدەبوو، پیاوێکی بەنی لەیس کە کورتە باڵایەکی خڕەڵە بوو ناوی موکەیتل بوو هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەخوا ئەو کوژراوە نموونەی لەپاکییەتی ئیسلامدا وەك مێگەلە مەڕێکە بۆ ئاوخواردنەوە دەڕۆن و گەر بەردێکیان گرتە سەرەتاکەیان کۆتاییەکەیان دەوەستن، نابێت ئەمڕۆ بڕیارێك بدرێت و سبەینێ بگۆڕدرێت، پاشان پێغەمبەر ﷺ دەستی بەرزکردەوەو فەرمووی: ((بَلْ تَأْخُذُونَ الدِّيَةَ: خَمْسِينَ فِي سَفَرِنَا هَذَا، وَخَمْسِينَ إِذَا رَجَعْنَا)) (فَلَمْ يَزَلْ بِالْقَوْمِ حَتَّى قَبِلُوا الدِّيَةَ)...)[٧٨٥] واتە: ((بەڵکو دەبێت پەنجا لەم سەفەرەماندا وەربگرن و پەنجاش لەدوای گەڕانەوەمان)) ئینجا گفتوگۆی لەگەڵ کردن تا دواجار بەقبوڵ کردنی پارەی خوێنەکە قایل بوون)....).

### ٨- قەڵغانەکەی ئەبوقەتادە:

لەکاتی بەڕێوەچوونی غەزای حونەین دا ئەبوقەتادە یەکێکی لەموشریکەکان کوشت وبەهۆی شەڕەکەوە لێی دوورکەوتەوەو دواجار نەزانرا کێ قەڵغانەکەی بردووە، لەکاتی دابەشکردنی دەسکەوتەکانی غەزاکەدا، ئەبوقەتادە هەستاو داوای لەخەڵکی کرد قەڵغانەکەی بۆ بگێڕنەوە:

ئەبوقەتادە ﷺ دەفەرموێت: (لەدوای کۆتایهێنانی جەنگەکەو گەڕانەوەی خەڵکەکە

---

(٧٨٥) أخرجه: أحمد (٢١٠٨١،٢٣٨٧٩)، وقال محققوه: اسناده ضعيف، وابوداود (٤٥٠٣)، وابن ماجة (٢٦٢٥)، والطبري (الكبير) (٥٤٥٧)، وضعفه الشيخ الالباني في (ضعيف ابي داود) (٩٧٠).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مَنْ قَتَلَ قَتِيلًا، لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلَبُهُ)) واتە: ((هەرکەسێك یەکێکی لەوان کوشتووە و بەڵگەی لەسەری هەیە هەموو کەل وپەلی ئەو کوژراوە بۆ ئەو دەبێت)). منیش هەستام وتم: کێ شایەتیم بۆ ئەدا؟ پاشان دانیشتم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ وتەکەی سێ بارە کردەوە، پاشان فەرمووی: ((ئەبوقەتادە ئەوە چی بووە))؟ منیش بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوەو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من لەسەر شانی بێ باوەڕێکم داو زرێیەکی لەبەردا بوو، بەڵام ماوەم نەبوو لێی بکەمەوەو بیبەم، تۆ تەماشا بکە تا بزانین کێ بردوویەتی. لەوکاتەدا پیاوێك لەخەڵکەکە هەستاو وتی: ڕاست دەڵێت ئەی پێغەمبەری خوا (من بردوومە) و دەسکەوتەکەی لەلای منەو بیبەخشە بەمن وخۆت بەشتێك ڕازی بکە؟ پێغەمبەر ﷺ بێ دەنگ بوو چونکە ئەو گەر داوای هەر شتێکی لێ بکریە یان بێ دەنگ دەبوو یان پێی دەبەخشی)[٧٨٦].

ئەبوبەکری صدیق ﷺ فەرمووی: نەبەخوا شتی وەها نابێت ئەوەی خودا کردوویەتیە دەسکەوت بۆ شێرێك لەشێرەکانی خۆی کە جەنگاوەرە لەبەر خوداو پێغەمبەرەکەی تێدەکۆشێت لەگێڕانەوەیەکی تردا: (خودا بەخشیویەتیە یەکێك لە شێرەکانی) وپاشان بدرێت بەتۆ شتی وەها چۆن دەبێت؟ پێغەمبەریش ﷺ پێکەنی و فەرمووی: ((صَدَقَ. فَأَعْطِهِ إِيَّاهُ)) واتە: ((ڕاست دەکات دەسکەوتەکەی بۆ بگێڕەرەوە)). ئەبو قەتادە ﷺ: دەفەرموێت: پێم درایەوەو منیش زرێکەم فرۆشت و باخێکم لای خانووەکانی بەنی سەلەمە پێ کڕی و ئەوەش یەکەم سامانم بوو کە من ببمە خاوەنی لەئیسلامدا)[٧٨٧].

### ٩- ئەبو مەحزورە فێری بانگدان دەکرێت:

ئەبومەحزورە ﷺ دەفەرموێت: ( من (لەگەڵ دە گەنجدا ئامادەی جەنگی حونەین بووم لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئێمە لەهەموو خەڵکی زیاتر ڕقمان لەپێغەمبەر ﷺ

(٧٨٦) أخرجه: ابن حبان (٤٨٣٨)، وقال محققه:اسناده صحيح.

(٧٨٧) أخرجه: البخاري (٣١٤٢،٤٣٢١، ٢١٠٠)، ومسلم (١٧٥١)، وابو داود (٢٧١٧)، وأحمد (١٣٩٧٥، ١٢٩٧٧) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والحاكم (١٣٠/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وابن حبان (٤٨٠٥).

بوو)[٧٨٨]، لەکاتی گەڕانەوەدا (بانگ بێژەکەی پێغەمبەر ﷺ بانگیدا)[٧٨٩] وهەموومان گوێمان لەدەنگی بانگەکە بوو، ئێمەش بەدەنگی بەرز لاساییمان دەکردەوەو گاڵتەمان پێ دەکرد.

پێغەمبەر ﷺ گوێی لەدەنگمان بوو بەهاوەڵانی فەرموو: ((أَيُّكُمْ يَعْرِفُ هَذَا الَّذِي أَسْمَعُ الصَّوْتَ؟)) واتە: ((کێ لەئێوە ئەو کەسە دەناسێت کە گوێم لەدەنگەکەیەتی))؟ دواجار کەسانێکی بەدواماندا ناردو ئێمە هەموو چووینە خزمەتی و فەرمووی: ((أَيُّكُمُ الَّذِي سَمِعْتُ صَوْتَهُ قَدِ ارْتَفَعَ؟ )) واتە: ((کێ بوو لەئێوە بیستم دەنگی بەرزکردبووەوە))؟ هەموویان دەستیان ڕاکێشا بۆلای من و ڕاستیان کرد، دواتر هەموویانی ناردەوەو منی لای خۆی هێشتەوەو فەرمووی: ((قُمْ فَأَذِّن بِالصَّلاةِ)). قَالَ:... ثُمَّ (وَقَالَ ((اللَّهُمْ بَارِك فِيهِ وَبَارِكَ عَلَيهِ))) ((بَارَكَ اللَّهُ فِيكَ)) واتە: ((هەستە بانگ بدە))؟! منیش هەستا و لەوکاتەدا زۆرم ڕق لە پێغەمبەر ﷺ و بانگدان بوو، ناچار لەبەردەمیدا هەستام و بانگی فێرکردم و دەیفەرموو: ((قُلِ: اللَّهُ أَكْبَرُ....... أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ....)) واتە: ((بڵێ: قُلِ: اللَّهُ أَكْبَرُ....... أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّه)) و پێی فەرمووم: ((ارجع ْفامْدُدْ مِنْ صَوْتِك)) واتە: ((بگەڕێوەو دەنگی پێ درێژ بکەرەوە))..... (منیش هەموویم دەوتەوە لەدوای تەواوبوونی بانگەکە، بانگی کردم و تورەکەیەکی پێدام هەندێك زیوی تێدابوو وە فەرمووی: ((خودایە بەرەکەتی بۆ تێبکەو بیکەرە بەرەکەت بۆی)) پاشان دەستی هێنا بەدەم وچاومدا دووجار، پاشان دەستی هێنا بەسەر سنگمدا تا گەیاندیە سەر جگەرم و پاشانیش دەستی بەسکمدا هێنا تا ناوکم و پاشان فەرمووی: ((خودا بەرەکەت بخاتە هەموو شتێکت)) لەگێڕانەوەیەکدا: ((بَارَكَ اللَّهُ لَكَ، وَبَارَكَ عَلَيْكَ)) واتە: ((خودا بەرەکەتت بۆ بکاتە هەموو ئەوانەی کە بۆ تۆیەو لەسەر تۆیە)). وتم: ئەی پێغەمبەری خودا من بکەرە بانگ بێژ لەمەککە، فەرمووی: ((تۆم کردە بانگ بێژ لەمەککە)). ئیتر هەموو ئەو ڕق و قینەی دڵم ڕۆیشت و نەماوە لەجێی ئەوە پڕ بوو لەخۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ، دواتر گەڕامەوە مەککەو چوومە لای بەرپرسەکەی پێغەمبەر ﷺ بەسەر شاری مەککەوە کەناوی (عیتابی کوڕی ئوسەید) بوو، ئیتر من

(٧٨٨) أخرجه: أحمد (١٥٣٧٦)، وقال محققوه:حديث صحيح بطرقه.

(٧٨٩) أخرجه: ابن حبان (١٦٨٠)، وقال محققه:اسناده حسن.

بوومە بانگ بێژی (مزگەوتی کەعبە) لەسەر فەرمانی پێغەمبەر ﷺ)[٧٩٠].

### ١٠- گەورەیی ڕزگارکراوان و ئازادکراوان:

جەریر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((االْمُهَاجِرُونَ وَالْأَنْصَارُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَالطُّلَقَاءُ مِنْ قُرَيْشٍ وَالْعُتَقَاءُ مِنْ ثَقِيفٍ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ فِي الدُّنْيَا والآخرة))[٧٩١] واتە: ((کۆچکەر و پشتیوانەکان دۆست و خۆشەویست و یارمەتی دەری یەکترن (لەخۆشی و ناخۆشییەکاندا) لەدونیاو قیامەتدا، ئازادکراوانی لە قورەیش، وڕزگارکراوانی سەقیف هەموو دۆست و خۆشەویست و یارمەتیدەری یەکترن (لەخۆشی و ناخۆشییەکاندا) لەدونیاو قیامەتدا)).

### ١١- جێبەجێ کردنی نەزر:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەجوعرانە بوو لەدوای گەڕانەوەی لەتائیف، عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ پرسیاری لەپێغەمبەر ﷺ کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لەزەمانی نەفامی (پێش ئیسلامدا) نەزرم کردبوو ڕۆژێك لە مەسجدولحەرامدا بمێنمەوەو ئیعتکاف بکەم، ئێستا چی بکەم؟ فەرمووی: ((أَوْفِ بِنَذْرِكَ) اذْهَبْ فَاعْتَكِفْ يَوْمًا....)) واتە: ((برۆ نەزرەکەت جێ بەجێ بکەو برۆ ڕۆژەکە ئیعتکاف بکە)). ئیتر عومەر پێش گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ هاتەوە مەککەو نەزرەکەی خۆی بەجێ گەیاند)[٧٩٢].

لە فەرمودەیەکی (لاوازدا) هاتووە: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ) لە غەزای حونەین گەڕایەوە، خۆی و هاوەڵانی دابەزینە جێگەیەك لەوێدا لایاندا، دواتر داوای لە هاوەڵانی کرد هەموو چیلکەی ئەو ناوەی بۆ کۆبکەنەوە) فەرمودەکە هەرچەندە لاوازە بەڵام فەرمودەیەکی تر هەیە بەهێزی دەکات. فەرمودەکەش سەعدی کوڕی

---

(٧٩٠) أخرجه: ابوداود (٥٠٣)، والنسائي (الكبرى) (١٥٩٦)، و ابن ماجة (٧٠٨)، والطبراني (الكبير) (٦٧٣١)، وابن خزيمة (٣٧٩) وقال محققه: صحيح، وابن حبان (١٦٨٠) وقال محققه: اسناده حسن وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٥١٨)، و (فقه السيرة) (٣٠٢). اللفظ لأحمد وابن حبان.

(٧٩١) أخرجه: أحمد (١٩٢١٥)، وقال محققوه:حديث صحيح، والطيالسي (٦٧١)، وابن حبان (٧٢٦٠) وقال محققه: اسناده حسن.

(٧٩٢) أخرجه: البخاري (٦٦٩٧،٤٣٢٠)، ومسلم (١٦٥٦) واللفظ له، والترمذي (١٥٣٩)، والنسائي (٢١/٧)، وابن ماجة (٢١٢٩)، وأحمد (٣٥/٢).

جەنادە ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (لەدوای تەواو بوونی دابەشکردنی دەسکەوتەکانی حونەین ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ گەڕاینەوە و لە ڕێگادا هەموو لاماندایە ناوچەیەکی ڕووتەنی چۆڵ لەوێدا دابەزین و پشومان دا.

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((اجْمَعُوا، مَنْ وَجَدَ عُودًا فَلْيَأْتِ بِهِ، وَمَنْ وَجَدَ عَظْمًا أَوْ شَيْئًا فَلْيَأْتِ بِهِ)) واتە: بڕۆن هەر شتێکتان لەم ناوە دیەوە بیهێنن و کۆی بکەنەوە، هەرکەسێك چیلکەی دۆزیەوە با بیهێنێت وە هەرکەسێك ئێسکێك یان هەرشتێکی تری دۆزیەوە با بیهێنێت. ئەوەندەی پێنەچوو تا مەڵۆیەکمان بۆ کۆکردەوە ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أَتَرَوْنَ هَذَا، فَكَذَلِكَ تَجْتَمِعُ الذُّنُوبُ عَلَى الرَّجُلِ مِنْكُمْ كَمَا جَمَعْتُمْ هَذَا، فَلْيَتَّقِ اللهَ رَجُلٌ، فَلَا يُذْنِبْ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً، فَإِنَّهَا مُحْصَاةٌ عَلَيْهِ))[٧٩٣].واتە: ئایا ئەوە هەمووی دەبینن، ئابەو جۆرە گوناهەکان لەسەر کەسێك لە ئێوە کۆدەبێتەوە، وەك چۆن ئێوە ئەوەتان کۆ کردەوە، لەبەر ئەوە هەموو یەکێك لە ئێوە با لەخودا بترسێت و گوناهی بچوکیش ئەنجام نەدات چونکە هەمووی لەسەری دەنوسرێت.

## عومرەی جوعرانە

لەدوای ئەم گەشتە پیرۆزو پڕ خێرە کە بەهۆیەوە خەڵکی شاری مەککەو هۆزەکانی هەوازن هەموو پۆل پۆل و تێکڕا هاتنە ناو ئیسلامەوە، موسوڵمانان دەسکەوتی باشیان بەدەست کەوت ولەدوای تەواوبوونی هەموو کارەکان، لەناوچەی جوعرانە کە (میقاتە) لەمانگی زولقەعیدەدا پێغەمبەر ﷺ عومرەی بەجێ گەیاند.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ئیحرامی پۆشی و نییەتی عومرەی هێناو لەئەلجوعرانەوە بەرەو مەککە ڕۆیشت و فەرمانی دا پاشماوەی دەسکەوتەکان ببرێتە ناوچەی (میجەنە) لای (مەڕولزەهران)[٧٩٤].

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ چوار عومرەی کردووە وهەموویان لەمانگی زولقەعیدەدا بوون... ولەوانە عومرەکەی ناوچەی جوعرانە لەدوای دابەش

(٧٩٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٤٨٥)، وقال الهثمي في (المجتمع) (١٩٠/١٠) فيه ضغيف و ضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الترغيب) (١٤٧٢).
(٧٩٤) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١١٤/٤).

کردنی دەسکەوتەکان)[٧٩٥].

لەم عومرەیەیدا پێغەمبەر ﷺ لەناوچەی (کودیە)[٧٩٦] وەمەبەستی بوو بچێتە مەککە. بەڵام پێش ئەوەی ناوچەی جوعرانە بەجێ بهێڵێت پیاوێك هات و پرسیارێکی لێکرد، یەعلای کوڕی مونبە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ هێشتا لەجوعرانە بوو پیاوێك هات بۆلای پۆشاکەکەی زەردی پێوە بوو کە ئاسەواری ڕەنگی بۆنی تایبەتی خێزانەکەی بوو، وتی: فەرمانم بەچی پێ دەکەیت تا من لەم عومرەمدا ئەنجامی بدەم؟ لەوکاتەدا وەحی و سروش بۆ پێغەمبەر ﷺ دابەزی...... ودواتر پێی فەرموو: ((کوا ئەو کەسەی پرسیاری عومرەکەی دەکرد، برۆ ئاسەواری زەردی بۆنەکە بشۆرەو ئەو پۆشاکەت بگۆڕە، چۆن (تەواف) دەکەیت بۆ حەجەکەت ئاوهاش بکە بۆ عومرەکەت)).......)[٧٩٧].

پێغەمبەر ﷺ ناوچەی جوعرانەی بەشەو بەجێ هێشت، هەر لەشەودا گەڕایەوە ناوچەی جوعرانەو بەیەك شەو عومرەکەی ئەنجام دا، بۆیە زۆرێك لەهاوەڵان بێ ئاگابوون لەئەنجامدانی ئەم عومرەیە.

موحەڕیشی کەعبی ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەشەودا ناوچەی جوعرانەی بەجێ هێشت ودەرچوو بەرەو مەککە بۆ ئەنجامدانی عومرەکەی و لەو شەوەدا گەیشتە مەککەو عومرەکەی ئەنجامداو هەر لەو شەوەشدا گەڕایەوە ناوچەی جوعرانە وەکو شەوی لەوێدا بەسەر بردبێت، لەدوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا بەڕێ کەوت بۆ گەڕانەوە و گەیشتە ناوچەی سەرەف و بەو ڕێگەدا بەڕێکەوت، لەبەر ئەوەش بوو کەخەڵکی بەو عومرەیەیان نەزانی)[٧٩٨].

ئیبنو عەبباس ﷺ دەفەرموێت: (لەعومرەی ئەوجارەدا پێغەمبەر ﷺ (وهەندێك) لەهاوەڵانی عومرەیان لە جوعرانەدا دەکردو سێ جار سوڕانەوەی دەوری کەعبەیان کرد بەهەروەلە واتە: (گورگە لۆقە) وچوار سوڕانەوەکەی تریان لەسەرخۆو بەئاسایی

(٧٩٥) أخرجه: البخاري (٤١٤٨) (١٧٧٨) ومسلم (١٢٥٣)، وابوداود (١٩٩٤)، والترمذي (٨١٥).

(٧٩٦) أخرجه: البخاري (١٥٧٨)، ومسلم (١١١٨٠) وأحمد (٢٠١/٦) عن عائشة ﷺ.

(٧٩٧) أخرجه: البخاري (١٥٣٦، ٤٩٨٥)، ومسلم (١١٨٠)، وابوداود (١٨٠٢)، والنسائي (١٣٠/٥).

(٧٩٨) أخرجه: الترمذي (٩٣٥)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٧٤٣).

ئەنجامدا)[٧٩٩] و (شانی ڕاستیان لێ ڕووت کردبوو....)[٨٠٠]. ئیبنو ئیسحاق ﵀ دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ عومرەکەی تەواوکردو عەتابی کوڕی ئوسەیدی کردە بەرپرسی شاری مەککە و موعازی کوڕی جەبەلی لەوێ بەجێ هێشت تا شارەزایان بکات لە ئایینداو قورئانیان فێر بکات، پاشان پێغەمبەر ﷺ وموسوڵمانان لەگەڵ پاشماوەی دەسکەوتەکاندا بەرەو شاری مەدینە گەڕانەوە...)[٨٠١].

ئیبنو هیشام ﵀ دەڵێت: (زەیدی کوڕی ئەسلم گێڕاویەتیەوە و وتویەتی: کاتێك پێغەمبەر ﷺ عەتابی کوڕی ئوسەیدی کردە بەرپرسی شاری مەککە موچەکەی هەموو ڕۆژێك درهەمێك بوو، عەتاب لە وتارێکدا وتی: ئەوەی بە درهەمێك برسی بێت یاخوا هەرگیز تێر نەبێت، پێغەمبەر ﷺ درهەمێکی بەموچەی من داناوە لەهەر ڕۆژێکدا، بۆیە ئێستا من پێویستیم بەکەس نییە)[٨٠٢].

عەمری کوڕی موتەڕمیف ﵁ دەفەرموێت: (عەتابی کوڕی ئوسەید پاڵی دابوو بەکەعبەوە وگوێم لێ بوو دەیوت: سوێند بەخوا دەسکەوتی من لەم کارەمدا تەنها دوو پۆشاك بوو منیش بەخشیمە خزمەتکارەکەم کەناوی: کیسانە)[٨٠٣].

پێغەمبەر ﷺ کاتێك عەتابی کردبووە بەرپرسی شاری مەککە چەند ئامۆژکارییەکی کردبوو لەوانە:

سەعیدی کوڕی موسەییب ﵁ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردبوو بە عەتاب کە کێشی ترێ بزانێت وپاشان زەکاتەکەی بەمێوژ دەربکات....)[٨٠٤].

---

(٧٩٩) أخرجه: ابوداود (١٨٩٠)، وصححه الشيخ الالباني ي في (صحيح ابي داود) (١٦٦٤).

(٨٠٠) أخرجه: ابوداود (١٨٨٤)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٦٥٩).

(٨٠١) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١١٤/٤)، والطبري (التاريخ) (٩٤/٣)، والطبراني (الكبير) (١٦١/١٧)، والحاكم (٢٧٠/٣) و (٥٩٤/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٢٠٢/٥)، وموسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٩٢)، وحسنه الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (ص:٤٣٣).

(٨٠٢) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١١٤/٤).

(٨٠٣) أخرجه: البخاري (التاريخ الكبير) (٥٤/٤)، والطيالسي (١٢٩٣)، والطبراني (الكبير) (٤٢٣/١٧) والحاكم (٥٩٤/٣)، وقال الحافظ في (الاصابة) (٤٣٥/٤): اسناده حسن.

(٨٠٤) أخرجه: النسائي (١٠٩/٥) وقال الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٢٦١٨): حسن الاسناد مرسلًا. وضعفه في (سنن ابي داود) برقم (١٦٠٣).

عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺعەتابی کردە بەرپرسی شاری مەککەو پێی فەرموو: ((أتَدري إلى أينَ أبعثُكَ؟ إلى أهلِ اللهِ وَهُمْ أهلُ مَكَّةَ، فَإنَهَهُمْ عَنْ أَرْبَعٍ، عَنْ بَيْعٍ وَسَلفٍ، وَعَنْ شَرطٍ فِي بَيعٍ، وَربحِ مَا لَمْ يَضمنْ، وَبَيعِ مَا لَيَسَ عِنْدَكَ)) [٨٠٥] واتە: ئایا دەزانیت کە دەمەوێت بتنێرمە کوێ و بتکەمە بەرپرسی؟ من دەتکەمە بەرپرسی شاری مەککە ئەوان خەڵکی خودان چوار جۆر مامەڵەیان لێ قەدەغە بکە: فرۆشتن و قەرز لەیەك مامەڵەدا، وە دوو جۆر مامەڵەی جیا لەیەك کاتدا لەکڕیندا، وە قازانجی ئەوەی لەبەردەستدا نییەو فرۆشتنی شتێك کە لات نییە).

## ئەنجامەکانی ئازادکردنی شاری مەککە

لەم گەشتە پیرۆزەدا خوای گەورە چەندەها سەرکەوتنی سەرسامی بەخشییە بڕواداران و مەککە کەوتە ژێر دەسەڵاتی موسوڵمانان و بوونە هێزی هەرە گەورەی دورگەی عەرەب و وڵاتیان فراوان بوو ژمارەیان زیادبوو وەداراییان بەرەو باشتر چوو وەخەڵکی عەرەب لەهەموو لایەکەوە دواتر پۆل پۆل نێردراوانی خۆیان دەنارده لای پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمان دەبوون:

عەمری کوڕی سەلەمە ﷺ دەفەرموێت (جێگەکەمان لەسەر ڕێی خەڵکی بوو دەچوون و دەهاتنەوە و پرسیارمان لێدەکردن، خەڵکی دژایەتی ئەو پیاوە بۆ دەکەن؟ دەیان وت: ئەو دەڵێت: پێغەمبەری خوایە، وخودا پێی وتووە وا بکات و وابکات (وە جار جار وتەی پێغەمبەریان لامان دەگێڕایەوە) (منیش منداڵێکی زیرەك بووم و زوو زوو ئەوانەم لەبەردەکرد) (وبەهۆیەوە قورئانێکی زۆرم لەبەرکرد).

عەرەب هەموو لەچاوەڕوانی موسوڵمان بوونی قورەیش بوون و دەیان وت: لێگەڕێن گەر بەسەر قەومەکەی خۆیدا سەرکەوت ئەوکات ئەو پێغەمبەرە و ڕاستگۆیە. لەدوای ئازادکردنی شاری مەککە، عەرەبەکان لەهەموو لایەکەوە دەچوون و موسوڵمان دەبوون، (ئێمەش باوکم بەنوێنەرایەتی هۆزەکەمان ڕۆیشتنە لای و موسوڵمان بوون و نوێژ فێربوون).

کاتێك گەڕایەوە (پێشوازیمان لێکرد) وتی: سوێند بەخوا بەڕاستی لەلای پێغەمبەری

---

(٨٠٥) أخرجه: البغوي (حديث بن عيسى بن سالم الشاشي) (١٠٨/١) وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٢١٢).

خودا بووین (وپێی وتین: نوێژی ئەوە لەوکاتەدا بکەن و نوێژی ئەوەش لەوکاتەدا بکەن، گەر کاتی نوێژ هات با یەکێکتان بانگ بدات و با ئەوەی قورئانی زۆر لەبەرە ببێتە پێش نوێژتان. خزمانم تەماشایان کرد کەسێکیان نەبوو لەمن زیاتر قورئانی لەبەربێت (بۆیە بانگیان کردم و فێری ڕکوع و سجودیان کردم) ومنیش پێش نوێژیەکەم بۆ دەکردن. پۆشاکێکی زەردی بچووکم هەبوو لەدواوە کرانەوەیەکی تێدابوو، هەرکات دەچوومە سوجدە دواوەم دەردەکەوت، دواجار ئافرەتێکی خزممان پێی وتین: بۆ دواوەی قورئان خوێنەکەتان داناپۆشن، ئینجا چوون کراسێکی عومانیان بۆ کڕیم، من لەدوای ئیسلامەتیم بەهیچ شتێك دڵخۆش نەبووم بەوێنەی دڵخۆش بوونم بەو پۆشاکە (دواتر لەو ڕۆژە بەدواوە من پێش نوێژیم بۆ دەکرن وە منیش نوێژ لەسەر تەرمەکانیان دەکەم تا ئەمڕۆ)(٨٠٦).

## گەڕانەوە بەرەو مەدینە

ئەم غەزا پیرۆزە دوومانگ و چواردە ڕۆژی پێچوو(٨٠٧). لەبەرئەو ماوە درێژە زوو زوو هەندێك لەهاوەڵان داوایان دەکرد لەپێشەوە بڕۆن و زووتر بگەنە خزمانیان، پێغەمبەر ﷺ لەناوچەیەکدا لایان داو ئامۆژگاری کردن.

ڕیفاعەی کوڕی عورابەی جوهەنی ﷺ دەفەرموێت: (لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەمەککەوە گەڕاینەوە (وگەیشتینە ناوچەی کەدید) لەوێدا کەسانێك دەهاتن و داوایان دەکرد ڕێگەیان بدات (تا ئەوان پێشتر بگەڕێنەوە لای خزمانیان و ڕێگەی دان، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مَا بَالُ شِقِّ الشَّجَرَةِ الَّتِي تَلِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَبْغَضَ إِلَيْكُمْ مِنَ الشِّقِّ الْآخَرِ؟)) واتە: ((بۆچی ئەو بەشە درەختەی کە نزیکە لە پێغەمبەرەوە زیاتر ڕقتان لێیەتی لەوبەشەی ئەولاتر)) دەفەرموێت: لەوکاتەدا هەموو دەستییان کردە گریان و ئەبوبەکر فەرمووی: ئەوکەسەی لێرە بەدواوە داوای ڕێگە پێدانت لێ بکات لەدەروونی خۆمدا بەکەم ئەقڵی دەزانم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هەستاو وتاری دا.

سەرەتا سوپاس و ستایشی خوای کردو فەرمووی: ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ أَشْهَدُ عِنْدَ اللَّهِ مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَومِ الآخِرِ - في رواية (أَلَّا يَمُوتَ عَبْدٌ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ

(٨٠٦) أخرجه: البخاري (٤٣٠٢)، وابوداود (٥٨٥،٥٨٧)، والنسائي (٧٦٧،٧٨٩) واللفظ للبخاري والزيادات لابي داود والنسائي.
(٨٠٧) أخرجه: ابن حزم (جوامع السيرة) (ص:١٥٧).

مُحَمَّدًا رسول الله صَادِقًا مِنْ قَلْبِهِ) ثُمَّ يُسَدِّدُ إِلَّا سَلَكَ به إلى الجنة، وَلَقَدْ وَعَدَنِي رَبِّي أَنْ يُدْخِلَ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعِينَ أَلْفًا لَا حِسَابَ عَلَيْهِمْ وَلَا عَذَابَ، وَإِنِّي لأرجو أَلا يَدْخُلوا حَتى تَتَبَوَّءُوا أَنْتُمْ وَمَنْ صَلَحَ مِنْ (آبائِكُمْ) أَزْوَاجِكُمْ وَذُرِّيَّاتِكُمْ (مَسَاكِنِكُمْ) فِي الْجَنَّةِ)) ثُمَّ قَالَ: ((إِنَّ اللَّهَ يُمْهِلُ حَتَّى)) إِذَا أَمضى شَطر اللَّيْلِ أَوْ ثُلُثَاهُ يَنْزِلُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعالى إِلى السَّماءِ الدُّنْيا فَيَقُولُ: (لَا يَسْأَلُ عِبَادِي غَيْرِي) مَنَ الَّذِي يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ مَنْ الَّذِي يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ؟ ، مَنْ ذَا الَّذِي يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ (حَتى) يَنْفَجِرُ الصُّبْحِ))[٨٠٨]

واتە: ((سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هەرکەسێك لەئێوە باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەبێت. لەگێڕانەوەیەکی تردا (هەر بەندەیەك بمرێت و شایەتی دابێت بەتاك و تەنهایی خواو بە پێغەمبەرایەتی من و (هەڵقوڵاو بێت) بەڕاستی لەناخی دڵیەوە) وپاشان لەسەر ئەو باوەڕە لای نەدابێت، من لەخوداوە شایەتی بۆ ئەدەم کە بەرەو بەهەشت دەبرێت، خودای من بەڵێنی پێداوم حەفتا هەزار لەئوممەتەکەم دەخاتە بەهەشتەوە بەبێ سزاو لێپرسینەوە، من ئومێدم وایە ئەوان نەچنە ژوورەوە هەتا خۆتان و ئەوانەی ملکەچن لەباوکانتان و هاوسەرانتان و منداڵەکانتان نیشتەجێی شوێنی خۆیان دەکرێن لەبەهەشتدا، پاشان فەرمووی خودای گەورە ماوە دەدات هەتا نیوەی یان دوو لەسەر سێی شەو دەڕوات ئەوکات دادەبەزێتە ئاسمانی دونیاوە ودەفەرموێت: (بەندەکانم جگە لەمن داوا لەکەسی تر ناکەن) وکێ داوای شتێکم لێ دەکات تا پێی ببەخشم، کێ داوای لێخۆش بوونم لێ دەکات تا لێی خۆش ببم، کێ هەر داوایەکی هەیە با بۆی جێ بەجێ بکەم، بەوجۆرە بەردەوام دەبێت تا ڕۆژ دەبێتەوە)).

وە لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان بەڕێکەوتن و گەڕانەوە، یەکێك لەسەرکردەکانی سەقیف هات و موسوڵمان بوو پاشان گەڕایەوە تائیف و بانگی کردن بۆ ئیسلام، ئەوان تیرێکیان لێداو کوشتیان و داوای کرد لەگۆڕستانی شەهیدە موسوڵمانەکاندا بنێژرێت.

---

(٨٠٨) أخرجه: أحمد (١٦٢١٨،١٦٢١٦،١٦٢١٥)، وقال محققوه: اسناده صحيح، وابن ماجة (٤٢٨٥)، والطيالسي (١٢٩١)، والبزار (٣٥٤٣)، والطبراني (الكبير) (٤٥٥٨)، والنسائي (الكبرى) (١٠٣٠٩) و(عمل اليوم) (١٤٧٥)، وابن حبان (٢١٢) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط البخاري واللفظ له والزيادات لأحمد والطبراني وغيره، وابن خزيمة (التوحيد) (٢٩٥) وقال محققه: اسناده حسن، وقال الحافظ (الأصابة) (٤٩٣/٢): اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٤٠٥)، و(صحيح ابن ماجة) (٣٤٥٨)، والارواء (١٩٨/٢)، وصححه الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٣٤٣/١).

عوروە ﷺ دەفەرموێت: (لەڕێگادا عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی هاتەلای پێغەمبەر ﷺ وموسوڵمان بوو وە داوای کرد لەپێغەمبەر ﷺ ڕێگەی بدات بگەڕێتەوە بۆلای قەومەکەی و ئیسلامیان پێ ڕابگەیەنێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إِنِّي أَخَافُ أَنْ يَقْتُلُوكَ)) واتە: (من دەترسم بتکوژن) وتی: ئەوان گەر من ببینن لەخەودام هەڵمناسێنن، پێغەمبەریش ﷺ ڕێگەی دا و گەڕایەوە لایان لەکاتی ئێوارەدا سەقیف هاتن بەخێرهاتنەوەیان کرد، ئەو بانگی کردن بۆ ئیسلام، بەڵام ئەوان گومانی خراپیان پێ بردو سەرپێچییان کردو هەندێ وتەی ناشرین و نەشیاویان پێ وت کە ئەو لەو باوەڕەدا نەبوو ئەوان ئاوها وەڵامی بدەنەوە.

پاشان ڕۆیشتن و بەجێیان هێشت دواتر کاتی پارشێو هات و کاتی نوێژی بەیانی بوو، هەستاو چووە سەر ژوورێکی خانووەکەی و بانگی دا تا گەیشتە شایەتومان لەوکاتەدا پیاوێکیان تیرێکی تێگرت. (....... لە سەرەمەرگدا پێیان وت: چی دەڵێیت بەرامبەر ئەم کوشتنەت؟ وتی: ڕێزێکە خودا لێی ناوم و شەهیدیەکە خودا بۆی ناردووم، ئەوەی توشم هاتووە هەمان ئەوەیە کەتوشی ئەو شەهیدانە هاتووە کە کوژراون لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی ئێرە بەجێ بهێڵێت منیش لەگۆڕستانی ئەوان بنێژن). .... دواتر هەواڵەکە بەپێغەمبەر ﷺ گەیشت و فەرمووی: ((مَثَلُ عُرْوَةَ مَثَلُ صَاحِبِ يَاسِينَ، دَعَا قَوْمَهُ إِلَى اللَّهِ فَقَتَلُوهُ))[٨٠٩] واتە: ((نموونەی عوروە وەك نموونەی هاوەڵەکەی یاسینە، ئەو قەومەکەی خۆی بانگ کرد بۆلای خوا (بەڵام) ئەوان کوشتیان)).

کاتێکیش پێغەمبەر ﷺ و سوپاکەی نزیکی شاری مەدینە بوونەوە، هەندێك کەس پەلەیان کرد بۆ گەڕانەوە بۆ ناوشار: ئەبوزەر ﷺ دەفەرموێت: (ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین کەسانێك پەلەیان کردو پێشتر گەڕانەوە شاری مەدینە، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پرسین و پێی ڕاگەیەنرا کە ئەوان بەپەلە بوون بۆ گەڕانەوەیان بۆ ناوشاری مەدینە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((يُوشِكُ أَنْ يَدَعُوهَا أَحْسَنَ مَا كَانَتْ، لَيْتَ شَعْرِي مَتَى تَخْرُجُ نَارٌ مِنْ جَبَلِ الْوَرَّاقِ فَتُضِيءُ لَهَا أَعْنَاقُ الْبُخْتِ بِالْبُصْرَى سُرُوجًا كَضَوْءِ النَّهَارِ))[٨١٠] واتە:

(٨٠٩) أخرجه: الحاكم (٦١٥/٣)، والطبراني (الكبير) (١٣٨/١٧)، رقم (٣٧٤،٣٧٥) عن عروة وموسى بن عقبة، والبيهقي (الدلائل) (٢٩٩/٥) وموسى بن عقبة (المغازي) (ص:٣٠٨)، وقال الهيثمي (المجمع) (٣٨٦،٣٨٩/٩): اسناده حسن، وله شاهد عند ابي يعلى (١٥٩٨) وقال محققه: اسناده ضعيف.

(٨١٠) أخرجه: الحاكم (٤٤٢/٤) وصححه و وافقه الذهبي.

((نزیکە شاری مەدینە بەجێ بهێڵن لەچاکترین کاتیدا، ئای کەی دەبێت ئەو ئاگرە لەچیای وەراقەوە بێتە دەروملی وشترەکانی (ناوچەی) بوسرا ڕووناك بکاتەوە وەك ڕووناکی ڕۆژ)).

پێش ئەوەی سوپاکە بگاتەوە ناو شاری مەدینە (ئوم سولەیم) ﷺ کاتی منداڵ بوونی بوو: ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (ئوم سولەیم لەسەفەرێکدا (لای زانایان: غەزای ئازادکردنی مەککەو حونەین) لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بوو، هەرکات پێغەمبەریش ﷺ لەسەفەر بگەڕایەتەوە بەشەو نەدەگەڕایەوە ناوشار، ئەوان لەوکاتەدا نزیك بوونەوە لەمەدینەو ئوم سولەیم ئازاری منداڵ بوونی دەستی پێکردو ئەبو تەلحەی مێردی لەلای مایەوە، پێغەمبەر ﷺ بەجێی هێشتن ئەبوتەلحەش وتی: خودایە خۆت دەزانیت کە من پێم خۆشە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لەمەدینە دەرچم و هەر لەگەڵ ئەویش بگەڕێمەوە ناو شاری مەدینەو ئێستا ئەوەتا ناتوانم. ئوم سولەیم وتی: ئەبوتەلحە ئەو ئازارەی هەمبوو نەما با بڕۆین، گەڕانەوە شاری مەدینەو منداڵ بوونی دەستی پێکردو لەو شەوەدا کوڕێکی بوو. ئەنەس دەڵێت: دایکم بوو پێی وتم: ئەنەس با کەس شیری پێ نەدا تا بەیانی زوو دەیبەیتە لای پێغەمبەر ﷺ، کە ڕۆژ بووەوە منداڵەکەم هەڵم گرت و بردم بۆلای پێغەمبەر ﷺ لە باوەشیدا دامنا و داوای خورمای عەجوەی کرد، بۆی هێنراو کردیە دەمی خۆی جویی هەتا شل بووەوە پاشان کردیە ناودەمی منداڵەکەوە و خواردی و پاشان بەزمان منداڵەکە چواردەوری دەمی خۆی دەلستەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((انْظُرُوا إِلَى حُبِّ الْأَنْصَارِ التَّمْرَ)) واتە: ((تەماشا کەن ئەنصارییەکان چۆن خورمایان خۆش دەوێت)) پاشان دەستی بەدەم وچاویدا هێناو ناوی نا: عەبدوڵڵا)[٨١١].

(٨١١) أخرجه: مسلم (٢١٤٤)، وأحمد (١٣٠٢٦) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم. واللفظ له.

## ناردنی چەند مەفرەزەیەك لە دوای ئازادکردنی مەککە

لەدوای گەڕانەوە لەغەزای تائیف و ئازادکردنی شاری مەککە، پێغەمبەر ﷺ لەمەدینە لەپێشوازی وەفدەکاندا بوو، بانگخوازانی بەهەموو لایەکدا بڵاودەکردەوەو نامەی بۆ ناوداران دەنارد بۆ موسوڵمان بوونیان وکەسانێکی تری دەنارد بۆ زەکات کۆکردنەوە.

لەساڵی نۆی کۆچیدا کەسێکی نارد بۆلای بەنی سولەیم کە لەرێگەی یەمەن بوو تا زەکاتەکەیان کۆبکاتەوەو بیهێنێت، ئەم بەسەرهاتەش ئەبو حومەیدی ئەلساعیدی ﷺ دەیگێڕێتەوە دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی کردە بەرپرسی زەکات کۆکردنەوەی هۆزی بەنوسولەیم ناوی: (ئیبنو لوتبیە بوو). کاتێك گەڕایەوە (سامانێکی زۆری تایبەت بەخۆی پێ بوو)[٨١٢] (بۆیە لێپێچینەوەی لەگەڵ کرا)[٨١٣] ئەو دەیوت: ئەوە بۆ ئێوەیە و ئەمەش بۆ منە. پێی دەوترا: ئەمەت لەکوێ بوو؟ ئەو دەیوت: ئەوە دیاریەو بەمن دراوە، چوونە لای پێغەمبەر ﷺ و بانگی کردو لێپرسینەوەی لەگەڵ کرد وتی: ئەوانە هی ئێوەن و ئەمەش دیاریەو دراوە بەمن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فَهَلَّا جَلَسْتَ فِي بَيْتِ أَبِيكَ وَأُمِّكَ، حَتَّى تَأْتِيَكَ هَدِيَّتُكَ إِنْ كُنْتَ صَادِقًا)) واتە: ((ئەی بۆناچیت دابنیشیت لەماڵی باوك ودایکت تا بزانیت دیارییەکانت بۆ دێت گەر تۆ ڕاست دەکەیت)). (پاشان لەدوای نوێژی خەوتنان پێغەمبەر ﷺ چووە سەر مینبەرەکەو توڕە دیاربوو)[٨١٤].

سەرەتا سوپاس و ستایشی خوای کردو پاشان فەرمووی: ((أَمَّا بَعْدُ، فَإِنِّي أَسْتَعْمِلُ الرَّجُلَ مِنْكُمْ عَلَى الْعَمَلِ مِمَّا وَلَّانِي اللهُ، فَيَأْتِي فَيَقُولُ: هَذَا مَالُكُمْ، وَهَذَا هَدِيَّةٌ أُهْدِيَتْ لِي، أَفَلَا جَلَسَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ وَأُمِّهِ حَتَّى تَأْتِيَهُ هَدِيَّتُهُ إِنْ كَانَ صَادِقًا، وَاللهِ لَا يَأْخُذُ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنْهَا شَيْئًا بِغَيْرِ حَقِّهِ، إِلَّا لَقِيَ اللهَ تَعَالَى يَحْمِلُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَلَأَعْرِفَنَّ أَحَدًا مِنْكُمْ لَقِيَ اللهَ يَحْمِلُ بَعِيرًا لَهُ رُغَاءٌ، أَوْ بَقَرَةً لَهَا خُوَارٌ، أَوْ شَاةً تَيْعَرُ)).

واتە: ((من پیاوێك لەئێوە دەکەمە بەرپرسی کارێك لەوانەی کەخودا بەمنی سپاردووە، (دواجار) دێتەوە لام و دەڵێت: ئەوە بەشی ئێوەیە، ئەوەش دیارییەو بەمن

(٨١٢) أخرجه: مسلم (٢٩/١٨٣٢).

(٨١٣) أخرجه: مسلم (٢٨/١٨٣٢).

(٨١٤) أخرجه: مسلم (٦٦٣٦).

دراوە، ئەی بۆ ناچێ دابنیشێت لەماڵی باوك ودایكیدا تا بزانێت دیارییەكانی بۆ دەهێنن گەر ڕاست دەكات، سوێند بەخوا هەریەكێك لەئێوە هەرشتێك بەناهەق ببات دواجار بەوشتەوە دەگاتەوە بەخوا لەڕۆژی دواییدا، هیچ یەكێك لەئێوە نەبینمەوە دواجار بگاتەوە بەخوا وشترێكی لەسەرشان بێت و بۆڕە بۆڕ بكات، یاخود مانگایەك ببۆڕێنێت یاخود شەكێك باعەی بێت، پاشان هەردوو دەستی بەرزكردەوە تا سپیایی هەردوو ژێر باڵی دەركەوت و فەرمووی: خوایە ئەوەتا پێم گەیاندن دووجار ئەوەشم بەچاوی خۆم بینی و بەگوێی خۆم بیستم))[٨١٥]. لەو ماوەیەدا چەندەها مەفرەزە بڵاوكرانەوە لەوانە:

## ١- مەفرەزەكەی عیینەی كوڕی حسنی فیزاری:

لەمانگی موحەڕەمی ساڵی نۆی كۆچیدا پێغەمبەر ﷺ عیینەی لەگەڵ پەنجا سواردا نارد كەهیچ ئەنصاری و موهاجیریەكیان لەناودا نەبوو ئەوانی نارد بەرەو لای بەنی تەمیم چونكە ئەوان هانی هۆزەكانی تریان دەدا بۆ زەكات نەدان. مەفرەزەكە ڕۆیشت لەناكاو هێرشیان كردنە سەر وە یازدە پیاو و یازدە ئافرەت وسی منداڵیان لێ دەست بەسەركردن و پاشان گەڕانەوە بۆ مەدینە، دواتر هەندێك لەناودارانیان هاتن و تكایان لە پێغەمبەر ﷺ كردو ئەویش بۆ دڵ ڕاگیربوونیان هەموو ژن و منداڵ و دەست بەسەركراوەكانی بۆ ناردنەوە.

## ٢- مەفرەزەكەی قوتبەی كوڕی عامیر بۆ ناوچەی (تەباڵە):

ئەم هێزە پێكهاتبوو لەبیست پیاو بەسەركردایەتی قوتبە پێغەمبەر ﷺ ناردنی بۆ ئاواییەك لەهۆزی خوسعوم لەناوچەی تەباڵە یان بیشتە كەنزیك بوو لەناوچەی توربە لەمانگی سەفەری ساڵی نۆی كۆچیدا، هێزەكە بەسواری دە وشتر ڕۆیشتن و بەنۆرە سواری پشتی دەبوون و چەكەكانیان شاردبووەوە، بەشەو دەڕۆیشتن و بەڕۆژ لەبۆسەدا بوون ڕۆیشتن تا گەیشتنە ناوچەكەو لەشەودا هێرشیان بردە سەر دوژمن و بووبە شەڕێكی گەرم و دواجار دوژمنیان شكاندو وشترو مەڕو ئافرەتیان لێگرتن، لەبەیانیدا خوسعومییەكان لەهەموو لایەكەوە بەهانایانەوە هاتن و بەدوایاندا چوون و كاتێك لێیان نزیك بوونەوە، خوای گەورە لافاوێكی هێنا لەنێوان موسوڵمانان و

(٨١٥) أخرجه: البخاري (٦٩٧٦، ٧١٧٤، ٧١٩٧)، ومسلم (٣٦/١٨٣٢، ٢٧، ٢٨، ٢٩، ٣٠)، وابوداود (٢٩٤٦).

ئەواندا بەوهۆیەوە خوای گەورە موسوڵمانانی ڕزگار کردو گەڕانەوە مەدینە.

**٣- مەفرەزەکەی زەحاکی کوڕی سوفیانی کیلابی:**

لەمانگی ڕەبیعی یەکەمدا ساڵی نۆی کۆچی پێغەمبەر ﷺ ئەو مەفرەزەیەی نارد بۆلای هۆزی قورتا کە بەشێك بوون لەبەنی کیلاب بۆئەوەی بانگیان بکەن بۆ ئیسلام، بەڵام ئەوان قایل نەبوون و دواجار لەگەڵیان بەشەڕهاتن و موسوڵمانان یەکێکیان لێ کوشتن و ئەوان شکان و ڕایان کرد.

**٤- مەفرەزەکەی عەلقەمەی کوڕی موجەزیزی مودلیجی:**

ئەم هێزە سێ سەد کەس بوون لەمانگی ڕەبیع یەکەمدا ساڵی نۆی کۆچی پێغەمبەر ﷺ ناردنی بۆ دەست گیرکردنی پیاوانێکی حەبەشە کە کۆبووبوونەوە لەقەراخی دەریای جدە بۆ چەتەگەری، کاتێك هەواڵی هاتنی ئەو هێزەیان پێ گەیشت ئەو ناوچەیەیان بەجێ هێشت و هەڵاتن[٨١٦].

**٥- مەفرەزەکەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب رضي الله عنه:**

لەمانگی ڕەبیعی ئاخری ساڵی نۆی کۆچی، پێغەمبەر ﷺ عەلی کوڕی ئەبو تالیبی کردە سەرکردەی سەدو پەنجا کەس سەد وشترو پەنجا ئەسپیان پێ بوو ئاڵای سەرەکییان سپی بوو وە ئاڵایەکی ڕەشیشیان پێ بوو، ڕۆیشتن بۆ ڕوخاندنی بتی (ئەلفەلەس) کە بتی هۆزی (تەیە)بوو، گەیشتنە ئەو ناوچەیەو لە بەرەبەیاندا هێرشیان کردە سەریان و بتەکەیان ڕووخاندو هەموو کەلوپەلەکەیان برد و دەسکەوتی زۆریان لێگرتن، عەدی کوڕی حاتەم ڕایکرد بەرەو شام، مەفرەزەکە گەڕانەوە شاری مەدینەو دواجار پێغەمبەری خوا ﷺ پوری عەدی کوڕی حاتەمی ئازادکردو بەو هۆیەوە عەدیش دواتر موسوڵمان بوو ئەم بەسەرهاتەش لەچەندەها گێڕانەوەدا هاتووە:

١- عەدی کوڕی حاتەم رضي الله عنه دەفەرموێت: (کاتێك هەواڵی پێغەمبەرم ﷺ پێ گەیشت زۆرم ڕق لێ بوو، هەڵاتم ڕۆیشتم بۆ دوورترین خاك لە موسوڵمان لە نزیك

(٨١٦) اخبار هذه السرايا اورده: الواقدي (٣/٩٨١،٩٧٤،٩٧٣)، وابن سعد (٢/١٠٨،١٠٧،١٠٦) بغير اسناد. والواقدي متروك.

سنوری ڕۆمەکان)[٨١٧]. دواتر چوومە لای قەیسەر بەڵام ئەوێم ناخۆشتر بوو وە یەکەم جار، وتم: سوێند بەخودا واچاکە بچم بۆلای ئەو پیاوە گەر درۆزن بوو زیانی نابێت بۆ من و گەر گوێم لێگرت و ڕاستگۆ بوو ئەوە باشتر بۆم ڕوون دەبێتەوە. دواتر چوومە مەدینە و خەڵکی هەموو منیان دەناسی و دەیان وت: ئەوە عەدی کوڕی حاتەمە، ئەوە عەدی کوڕی حاتەمە، چوومە لای پێغەمبەر ﷺ وفەرمووی: (( يَا عَدِيُّ بْنَ حَاتِمٍ ، أَسْلِمْ تَسْلَمْ)) واتە: ((ئەی عەدی کوڕی حاتەم موسوڵمان ببە سەلامەت دەبیت))... سێ جار دووبارەی کردەوە. منیش وتم: من ئاینی خۆم هەیە. فەرمووی: (( أَنَا أَعْلَمُ بِدِينِكَ مِنْكَ )) واتە: ((من لەخۆت ئاشناترم بە ئاینەکەت)) وتم: تۆ لەمن ئاشنا تریت بەئاینەکەم؟ فەرمووی: ((نَعَمْ، أَلَسْتَ مِنَ الرَّكُوسِيَّةِ، وَأَنْتَ تَأْكُلُ مِرْبَاعَ قَوْمِكَ؟)) واتە: ((بەڵێ تۆ لە ڕکوسیەکانیت بەڵام چواریەکی دەسکەوتی هۆزەکەت نەدەخوارد؟)) وتم: بەڵێ. فەرمووی: ((فَإِنَّ هَذَا لَا يَحِلُّ لَكَ فِي دِينِكَ)) واتە: ((خۆ ئەوە بۆ تۆ حەڵاڵ نەبوو لەئاینەکەت))دا. ئیتر کە ئەوەی فەرموو من خۆبەکەمزان بووم بۆی. (لەوکاتەدا پیاوێك هات بۆلای سکاڵای هەژاری لادەکرد، پاشان یەکێکی تر هات و سکاڵای ڕێگرەکانی دەکرد)[٨١٨].

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أَمَا إِنِّي أَعْلَمُ الَّذِي يَمْنَعُكَ مِنَ الْإِسْلَامِ ; تَقُولُ: إِنَّمَا اتَّبَعَهُ ضَعَفَةُ النَّاسِ وَمَنْ لَا قُوَّةَ لَهُم، وَقَدْ رَمَتْهُمُ الْعَرَبُ (يَا عَدِيُّ، هَلْ رَأَيْتَ الحِيرَةَ؟)؟)). قُلْتُ: لَمْ أرها وَقد سَمِعت بهَا: فقَالَ: فو الذى نَفْسِي بِيَدِهِ لَيُتِمَّنَّ اللَّهُ هَذَا الْأَمْرَ (و) فَإِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ، لَتَرَيَنَّ الظَّعِينَةَ تَرْتَحِلُ مِنَ الحِيرَةِ، حَتَّى تَطُوفَ بِالكَعْبَةِ) فِي غِيرِ جِوار أَحد (لاَ تَخَافُ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ)).

واتە: ((من دەزانم چی وات لێ دەکات ئیسلامت لا قبوڵ نەبێت دەڵێیت: بەتەنها هەژارو بێ تواناکان شوێنی کەوتوون و هەموو عەرەب دژی وەستاون، ئەی عەدی ئایا حیرەت بینیوە؟)) وتم: نەمبینیوە بەڵام ناوەکەیم بیستووە. فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە خوای گەورە ئەم ئاینە بەرقەرار دەکات وە گەر زیاتر بژیت دەبینی ئافرەت بەتەنها لەناوچەی حیرە بەڕێ دەکەوێت و دێت تەواف بەدەوری کەعبەدا دەکات و لەپەنای هیچ کەسدا نابێت (وتەنها هەر لەخودا دەترسێت)) (من لەدڵی خۆمدا وتم: ئەی دزەکان و چەتەکانی (تەی) دەبێت چی

(٨١٧) أخرجه: أحمد (١٩٣٧٨) وقال محققوه: اسناده حسن.
(٨١٨) أخرجه: البخاري (٣٥٩٥).

بکەن کە وڵاتیان سوتاندووە پاشان فەرمووی: ((وَلَئِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ لَتُفْتَحَنَّ كُنُوزُ كِسْرَى، قُلْتُ: كِسْرَى بْنِ هُرْمُزَ؟)) قَالَ: كِسْرَى بْنِ هُرْمُزَ، وَلَئِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ، لَتَرَيَنَّ الرَّجُلَ يُخْرِجُ مِلْءَ كَفِّهِ مِنْ ذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ، يَطْلُبُ مَنْ يَقْبَلُهُ مِنْهُ))[٨١٩] .

واتە: ((گەر ژیانت درێژە بکێشێت دەبینیت گەنجینەکانی کیسرای کوڕی هورموز دەستی بەسەردا دەگیرێت)) وتم: کیسرا کوڕی هورموز؟ فەرمووی: ((بەڵێ کیسرا کوڕی هورموز، وە گەر ژیانت درێژە بکێشێت پیاوی وەها دەبینیت پڕ بەمشتی ئاڵتون و زیو دەبات و بەدوای یەکێکدا دەگەڕێت تا هاوکاری بکات بەڵام کەسێك نادۆزێتەوە لێی وەربگرێت). دەفەرموێت: (دواتر پێغەمبەر ﷺ ئیسلامی پێ ناساندم و نوێژی فێرکردم لەکاتەکانی خۆیداو پاشان فەرمووی: ((دەبێت حاڵت چۆن بێت ئەی کوڕەکەی حاتەم کاتێك دێت لەکۆشکەکانی یەمەنەوە سوار دەبیت تا کۆشکەکانی حیرە و تەنها لەخوا دەترسێیت)) وتم: ئەی پیاوە چەتەکانی (تەی) لەکوێ دەبن؟ فەرمووی: ((يَكْفِيْكَ اللّهُ طَيّا وَمِنْ سِواهَا))[٨٢٠] واتە: ((خودا دەتپارێزێت لەهۆزی تەی و ئەوانی تر)). عەدی لەدوای پێغەمبەر ﷺ دەیوت: ئەوەتا ئافرەت لەحیرە دەردەچێت و پێویستی بە پەنای کەسێك نییەو دەچێت تەوافی خۆی دەکات. و منیش یەکێك بووم لەوانەی دەستمان گرت بەسەر گەنجینەکانی کیسرای کوڕی هورموزدا، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە سێهەمەکەشی دێتە دی چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی)[٨٢١].

عەدی لای پێغەمبەر ﷺ پرسیاری سەبارەت بەباوکی خۆی کرد و وتی: (ئەی پێغەمبەری خودا باوکم (واتە: حاتەمی تائی) هەزارانی تێر دەکرد و کۆیلەی ئازاد دەکرد (وئەوە و ئەوەی ئەنجام دەداو پەیوەندی خزمایەتی دەگەیاند) ئایا هیچ پاداشتی بۆ هەیە لەو کارانەیدا؟ فەرمووی: ((إِنَّ أَبَاكَ أَرَادَ أَمْرًا فَأَدْرَكَهُ)) واتە: (باوکت مەبەستێکی هەبوو بۆی هاتەدی)) واتە: بۆ ناو و شۆرەت کردبووی و بەدەستی هێنا. وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من پرسیاری خواردنێکت لێدەکەم کە من تەنها بەدینداری دەزانم خۆمی لێ دووربگرم؟ فەرمووی: ((لا تَدَعْ شيئاً ضارَعتَ فيهِ النَّصرانيَّةَ))

(٨١٩) أخرجه: البخاري (٣٥٩٥).

(٨٢٠) أخرجه: أحمد (١٨٢٥٨) وقال محققوه: حديث صحيح.

(٨٢١) أخرجه: أحمد (١٨٢٦٠) وقال محققوه: اسناده حسن ورقم (١٩٣٨١) وقال محققوه: بعضه صحيح، ولفظ الحديث لأحمد والزيادة له وللبخاري (٣٥٩٥).

واتە: ((خۆت دوور مەگرە لەهیچ شتێك کەپێشتر بەهۆی گاوربوونتەوە خۆت لێ بەدوور گرتووە))[٨٢٢].

پاشان عەدی دەفەرموێت: (کاتێك چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ خاچێکی ئاڵتون لەملمدا بوو فەرمووی: ((يَا عَدِيُّ اطْرَحْ عَنْكَ هَذَا الوَثَنَ)) واتە: ((ئەی عەدی ئەو بتە لەگەردنت فڕێ بدە)). دواتر گوێم لێ بوو سورەتی بەرائەتی دەخوێند: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ...﴾ (التوبة) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ئەوانمان نەکردووەتە خودا؟ فەرمووی: ((أَمَا إِنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا يَعْبُدُونَهُمْ، وَلَكِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا أَحَلُّوا لَهُمْ شَيْئًا اسْتَحَلُّوهُ، وَإِذَا حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ شَيْئًا حَرَّمُوهُ))[٨٢٣] .

واتە: ئەوانتان نەدەپەرست بەڵام ئایا ئەوان ئەوەی خودا لەسەری حەرام کردبوون بۆ ئێوەیان حەڵاڵ نەدەکرد؟ وە ئەوانەی خودا بۆ ئێوەی حەڵاڵ کردبوو لەسەر ئێوەیان حەرام نەدەکرد؟)) لەگێڕانەوەیەکی تردا: ((بَلى أَلَيْسَ يَحِلُونَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ فَتَحِلُّونَهُ، ويُحرِّمونَ عَلَيْكُمْ مَا أَحلَّ اللهُ لَكُمْ فَتحرِّمونَه))؟ واتە: ((بەڵێ ئایا گەر ئەوان هەرشتێکیان بۆ ئێوە حەڵاڵ بکردنایەن ئێوەش بەحەڵاڵتان نەدەزانی؟! و هەر شتێکیان لێ حەرام کردنایەن ئێوەش بەحەرامتان دەزانی؟!)).وتم: بەڵێ وابوو؟ فەرمووی: ((تِلكَ عِبادَتُهُمْ))[٨٢٤] واتە: (ئەوە پەرستشی ئەوان بوو، بەو جۆرەش ئێوە ئەوانتان دەپەرست).

٢- لەگێڕانەوەی دووەمدا عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەفەرموێت: (ئەسپ سوارانی پێغەمبەر ﷺ هاتن ئەوکاتە من لەناوچەی (عەقرەب) بووم لەودەمەدا پورم و کەسانێکی تریان دەست بەسەرکردو بردنیان و بەڕێز وەستاندیانن پێغەمبەر ﷺ هات بۆلایان، پورم وتبووی: ئەی پێغەمبەری خوا نوێنەران دوورکەوتونەتەوە و منداڵم نەماوە و گەورە و بەساڵاچووم و خزمەتی کەسم پێ ناکرێت و منەت بکەو

(٨٢٢) أخرجه: أحمد (١٨٢٦٢) وقال محققوه: اسناده حسن، والطبراني (الكبير) (٢٥٠،٢٥١/١٧)، والطحاوي (مشكل الاثار) (٤٣٦٠،٤٣٦١)، وقال محققهُ حديث حسن.

(٨٢٣) أخرجه: الترمذي (٣٠٩٥) والطبري (التفسير) رقم (١٦٦٣١)، وحسنه الشيخ الألباني يرحمه الله في (صحيح الترمذي) (٢٤٧١)، و (غاية المرام) (٦).

(٨٢٤) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢١٨/١٧)، وابن عبدالبر (جامع بيان فضل العلم) برقم (١٨٦٢) وقال محققه: حديث حسن، واللفظ له. وحسنه ايضاً شيخ الاسلام ابن تيمية (كتاب الايمان) (ص:٦٤).

بێ بەرامبەر ئازادم بکەن خودا منەت بکات بەسەرتانداو ئازادتان بکات. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مَنْ وافِدُك))؟ واتە: ((نوێنەری تۆ کێ بوو))؟ وتی: عەدی کوڕی حاتەم، فەرمووی: ((الذي فرَّ مِن اللّهِ وَرَسولِهِ)) واتە: ((ئەومیە کە لەخوداو پێغەمبەرەکەی ڕایکردووە؟)). وتی: دواتر ئازادی کردم و گەڕامەوە، لەوێدا پیاوێك لێم نزیك بوو وا دەزانم عەلی کوڕی ئەبو تالیب بوو، وتی: بڕۆ داوا بکە تا وڵاخت پێ بدات، منیش ڕۆیشتم و داوام لێکردو پێی دام. عەدی دەڵێت: پاشان ئەو پورەم گەڕایەوە لام و پێی وتم: چاکەیەکی لەگەڵدا کردووم باوکت چاکەی وەهای نەکردووە تۆش لەترسدا بێت یان لەهیوادا بێت بچۆ بۆلای ئەوەتا فلانە کەس چوو بۆلای و بەدیاری و دەسکەوتەوە گەڕایەوە وە فلانە کەسیش هەروەها.

ئیتر منیش بەڕێکەوتم و چووم بۆلای پێغەمبەر ﷺ (لەوکاتەدا لەمزگەوت دانیشتبوو خەڵکی وتیان: ئەوە عەدی کوڕی حاتەمە بەبێ نوسراو ڕێ پێدان هاتووە، دواتر برام بۆلای ئەو دەستی گرتم و پێشتر وتبووی: ((إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ يَجْعَلَ الله يَدهُ فِي يَدِي)) واتە: ((من ئومێدم وایە خوا هەردوو دەستی بخاتە دەستمەوە)) لەگەڵی بووم ئافرەتێك منداڵێکی پێ بوو وتی من کارم پێتە، لەگەڵیان وەستا تا کارەکەیانی بۆ جێ بەجێ کرد، (ئیتر ئەو دەمە من زانیم کە ئەو پاشا نییە وەك قەیسرو کیسرا) پاشان دەستی گرتم و منی بردەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و کچە بچکۆلەیەك دۆشەکێکی بۆ هێناو لەسەری دانیشت و منیش لەبەردەمیدا دانیشتم، سەرەتا سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردو پاشان فەرمووی: ((يا عَدِيّ بن حَاتِمٍ (مَا يُضِرُّكَ أَنْ تَقُولَ لَا إِلَهَ إِلَّا الله؟ فَهَلْ تَعْلَمُ مِنْ إِلَهٍ سِوَى الله؟)) واتە: ((ئەی عەدی کوڕی حاتەم چ زیانێکت پێ دەگات گەر بڵێیت: هیچ خودایەك نییە جگە لە (الله) ئایا هیچ خودایەك پێ دەزانیت جگە لە (الله))) وتم: نەخێر، پاشان ماوەیەك قسەی بۆ کردم و پاشان فەرمووی: ((إِنَّمَا تَفِرُّ أَنْ تَقُولَ الله أَكْبَرُ (فَهَلْ تَعْلَمُ أَنَّ شَيْئٌ هُوَ) أَكبَرُ مِنْ اللّه؟)) واتە: ((تۆ ڕادەکەیت بۆئەوەی نەڵێیت خودا گەورەیە (ئایا هیچ شتێك پێ دەزانیت گەورەتر بێت لە خودا)) وتم: نەخێر. فەرمووی: ((فَإِنَّ الْيَهُودَ مَغْضُوبٌ عَلَيهِمْ وَإِنَّ النَّصَارَى ضُلَّالٌ)) واتە: ((جولەکەکان خودا لێیان توڕەیەو گاورەکانیش گومڕان)). وتم: من هاتووم موسوڵمان ببم. ئیتر بینیم ڕووی کرایەوەو دڵخۆش بوو، پاشان فەرمانی دا ببمە میوانی ماڵێکی ئەنصاری و دواتر بەیانیان و ئێواران دەچوومە خزمەتی، ئێوارەیەکیان هەندێك کەسانی

هەزار هاتن بۆلای و جلی خورییان لەبەردا بوو داوای یارمەتییان لێکرد، لەدوای نوێژی خەوتنان هەستا وتاری بۆدان و سوپاس و ستایشی خودای کردو پاشان پێی فەرموون:

((أَمَا بَعْدُ فَلَكُمْ أَيُّها النَّاس أَنْ تَرْتَضخوا من الفضل (وَلَوْ صَاعٌ وَلَوْ بنصْفِ صَاعٍ وَلَوْ بِقَبْضَةٍ وَلَوْ بِبَعْضِ قَبْضَةٍ يَقِي أَحَدُكُمْ وَجْهَهُ حَرَّ جَهَنَّمَ أَوْ النَّارِ وَلَوْ بِتَمْرَةٍ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَاقِي الله وَقَائِلٌ لَهُ مَا أَقُولُ لَكُمْ أَلَمْ أَجْعَلْ لَكَ سَمْعًا وَبَصَرًا فَيَقُولُ: بَلَى فَيَقُولُ أَلَمْ أَجْعَلْ لَكَ مَالًا وَوَلَدًا؟ فَيَقُولُ: بَلَى، فَيَقُولُ: أَيْنَ مَا قَدَّمْتَ لِنَفْسِكَ؟ فَيَنْظُرُ قُدَّامَهُ وَبَعْدهُ وَعَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ ثُمَّ لَا يَجِدُ شَيْئًا يَقِي بِهِ وَجْهَهُ حَرَّ جَهَنَّمَ (إلاّ بِوَجْهِهِ) لِيَقِ أَحَدُكُمْ وَجْهَهُ النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ فَإِنِّي لَا أَخَافُ عَلَيكُمْ الْفَاقَةَ فَإِنَّ الله نَاصِرُكُمْ وَمُعْطِيكُمْ حَتَّى تَسِيرَ الظَّعِينَةُ فِيمَا بَيْنَ يثْرِبَ وَالْحِيرَةِ أَوْ أَكثَرَ مَا تَخَافُ عَلَى مَطِيَّتِهَا السَّرَقَ)).

واتە: ((ئەی خەڵكینە ئەوەی لێتان زیادە ببەخشن (گەر مەنێکیش بێت یان نیو مەن، گەر مشتێکیش بێت یان نیو مشت بەهۆیەوە یەکێك لەئێوە ڕوخساری خۆی پێ دەپارێزێت لەئاگرو گەرمی دۆزەخ هەرچەندە بەدەنکێك خورماش بێت، هەموو یەکێك لەئێوە دەگەنەوە بەخوداو ئەومتان پێ دەڵێت کە من ئێستا پێتان دەڵێم: ئایا چاو و گوێم پێ نەدایت؟! دەڵێت: بەڵێ. دەفەرموێت: ئایا سامان و منداڵم پێ نەبەخشیت؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ. پێی دەفەرموێت: لەکوێیە ئەوانەی بۆ خۆتت پێش داوە بۆ ئەمڕۆ؟ ئەویش تەماشای پێش و پاش و لای ڕاست و لای چەپی دەکات هیچ نابینێت تا ڕوخساری پێ بپارێزێت لەگەرمای دۆزەخ، لەبەرئەوە هەریەکێك لەئێوە با بە کەرتە خورمایەکیش بێت ڕوخساری پێ بپارێزێت لەدۆزەخ، گەر نەیبوو با وشەیەکی جوان و شیرین بڵێت، من لەوە ناترسم ئێوە هەژار بکەون چونکە خودا سەرتان دەخات و سامانتان پێ دەبەخشێت تا ئافرەت لەنێوان مەدینەوە بۆ حیرە دەڕوات) خەمی دزینی وڵاخەکەی نییە)) عەدی دەڵێت: منیش لەدڵی خۆمدا وتم: ئەی چەتەو دزەکانی تەی دەبێت لەو ڕۆژەدا لەکوێ بن))[٨٢٥].

(٨٢٥) أخرجه: الترمذي (٢٩٥٣،٢٩٥٤)، وأحمد (١٩٣٨١) وقال محققوه: بعضه صحيح، وابن حبان (٦٢٤٦) وقال محققه: حسن لغيره، والطبراني (الكبير) (٢٣٧/١٧) وابونعيم (الحلية) (١٧٠/٧)، والطبري (١٩٤، ٢٠٨)، والبيهقي (الدلائل) (٣٣٩،٣٤٠/٥)، وحسنه الشيخ الالباني يرحمه الله في (صحيح الترمذي) (٢٣٥٣، ٢٣٥٤) و (الطحاوية) (٨١١،٥٣١). واللفظ للترمذي والامام احمد.

## موسوڵمان بوونی کەعبی کوڕی زوهەیری کوڕی ئەبو سولما

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەغەزای تائیفەوە گەڕایەوە مەدینە، بوجەیری کوڕی زوهەیری برای کەعب نامەیەکی بۆ کەعبی برای نوسی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داوە پیاوێك لەمەککە بکوژرێت لەوانەی کە بەشیعر دژی وەستابوونەوە، لەشاعیرانی قورەیشیش تەنها ئیبنو زەعبەری و هوبەیرەی کوڕی وەهەب ماونەتەوەو ئەوانیش هەریەکەیان بەلایەکدا ڕایکردووە، تۆش گەر دەتەوێت هیچت بەسەر نەیەت ڕابکە بۆلای پێغەمبەری خودا چونکە هەرکەسێك تۆبە بکات و بێت بۆلای نایکوژێت.

لەگێڕانەوەیەکدا (باش بزانە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کەسە ناکوژێت کەدێت بۆلای و شایەتی دەدات کەتەنها هەر (الله) خودایەو موحەممەدیش پێغەمبەری خودایە، تۆش گەر ئەم نامەیەی منت بەدەست گەیشت) وەرە موسوڵمان ببە، و ئەگەر واش ناکەیت برۆ چۆن خۆت ڕزگار دەکەیت وا بکە. کەعب پێشتر بەچەند دێرە شیعرێك هێرشی کردبووە سەر پێغەمبەر ﷺ. دواتر کە نامەکە گەیشتە کەعب زۆر ترسا و سەر زەوی لێ تەسك بووەوە لەخۆی زۆر دەترسا، ناحەزانیشیان زیاتر تۆقاندیان و وتیان: ئەوە بەمزوانە دەکوژرێیت، کەعب کاتێك هیچ چارەیەکی نەما چەند هەڵبەستە شیعرێکی وت لە مەدحی پێغەمبەردا ﷺ و باسی ترس و تۆقینی خۆی تیا کردبوو لەترسی تۆڵە لێکردنەوەی.

پاشان ڕۆیشت تا گەیشتە شاری مەدینەو لەوێ چووە لای ناسراوێکی خۆی لەهۆزی جوهەینەو ئەویش بەرەبەیان بردی بۆ مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ و لەگەڵ خەڵکی لەدواوە نوێژی بەیانی کردو پاشان پێی وت: ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ هەستە برۆرە لای و متمانە بوونی لێ وەربگرە، ئەویش ڕۆیشت دەستی خستە ناو دەستی بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئەوی نەدەناسی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەعبی کوڕی زوهەیر هاتووە تۆبەی کردووەو موسوڵمان بووە بۆ ئەوەی زیانی پێ نەگات، ئایا تۆ ئەوەی لێ قبوڵ دەکەیت گەر من ئەو بهێنمە لات؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) (وتی: شایەتی ئەدەم کەهیچ خودایەك نییە جگە لە (الله) و تۆش پێغەمبەری خودایت،

پەنام بدە ئەی پێغەمبەری خودا. فەرمووی: ((ئەی تۆ کێیت))؟

وتم: کەعبی کوڕی زوهەیر. فەرمووی: ((تۆی کە وتوتە: پاشان ئاوڕی دایەوە بەلای ئەبوبەکرداو فەرمووی: ((چۆنی وتبوو ئەی ئەبوبەکر)) ئەویش هەندێك لەشیعرەکانمی بۆ خوێندەوەو پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((تۆ پەنادراویت سوێند بەخودا)). لەوێدا پیاوێکی ئەنصاری پەلاماریداو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا لێم گەڕێ با لەگەردنی ئەم دوژمنەی خودا بدەم؟ فەرمووی: ((لێی دووركەوەرەوە ئەو هاتووە تۆبەی کردووەو دەستی لەو کارە شەرمنگێزییەی پێشتری هەڵگرتووە))[٨٣٦].

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (کەعبی کوڕی زوهەیر هەڵبەستە شیعرێکی هەبوو بەناوی (بانەت سوعاد) واتە: (بە تۆ بەختەوەرین) لەمزگەوتەکەدا بۆ پێغەمبەری ﷺ خوێندەوە تا گەیشتە ئەوەی وتی:

پێغەمبەری خوا ﷺ شمشێرێکی ڕووناك كەرەوەیە
شمشێرێکی تیژی هەڵکێشراوە لەشمشێرەکانی خودا

......لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ بەلەپی دەستی ئیشارەتی بۆ خەڵکەکە کرد تا گوێی لێبگرن)[٨٣٧].

(٨٣٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١١٥/٤)، والحاكم (٥٧٩،٥٨٤/٣) وصححه، والطبراني (الكبير) (١٩/(٤٠٣)، وقال الهيثمي (المجمع) (٣٩٤/٩): رجاله الى ابن اسحاق ثقات. والبيهقي (الكبرى) (٢٤٣/١٠) وفي (الدلائل) (٢٠٧/٥)، وقال الحافظ في (نتائج الأفكار في تخريج احاديث الاذكار) (٣٠٦/١): هذا حديث غريبٌ.

(٨٣٧) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٩٣)، وعنه الحاكم (٥٨٢/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٢١١/٥).

## غەزای تەبوك

هۆکارەکانی ڕوودانی ئەم غەزایە: مێژوونوسان و ژیاننامەنوسان چەندەها هۆکاریان باس کردووە دەربارەی ڕوودانی ئەم غەزایە لەوانە:

١- ئەم غەزایە ڕوویدا بۆ تۆڵە سەندنەوە لەڕۆمەکان بەهۆی غەزای مۆتە وە شەهید کردنی جەعفەر و هاوەڵانی[٨٢٨].

٢- لەکاتێکدا خوای گەورە قەدەغەی کرد بێ باوەران (المشركين) نزیك بکەونەوە لە (المسجد الحرام) لە کاتی حەج و هەموو کاتەکانی تردا قوڕەیشیەکان وتیان: دوکان و بازاڕمان لێ دائەبڕن و ئەوەی دەستمان دەکەوێت لێی لە دەستمان دەچێت لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرمبووی بۆ کردنەوە بەوەی فەرمانی پێکردن کە بجەنگین لەگەڵ (أهل الكتاب) تا ئەوان موسوڵمان دەبن یان ملکەچی ئەوە دەبن کە جزیە بدەن[٨٢٩].

٣- جولەکەکان بە پێغەمبەریان ﷺ وت: ئەی (أبو القاسم) گەر تۆ پێغەمبەرێکی ڕاستگۆیت بۆ شام بەدەست ناهێنیت؟ چونکە شام خاکی پێغەمبەرانە. لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ ئەو غەزایەی بەرپاکرد بۆ بەدەست هێنانی شام[٨٣٠].

٤- کۆمەڵێك لە (ئەنبات) کە لە شامەوە ڕۆنی زەیتیان دەهێنا بۆ مەدینە بۆ موسوڵمانەکانیان باس کرد کە ڕۆمەکان چەند کۆمەڵێکی زۆریان کۆ کردۆتەوە لەشام.... (لخم و جەزام و عاملە و غسان لەگەڵ ئەو عەرەبانەی کە بوونەتە گاور و پێشەنگی سوپاکەیان گەیشتوتە (بلقاء) گەر چی ئەم هەواڵە ڕاستیش نەبوو بەڵام کاتێك گەیشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ هانی خەڵکی دا بۆ دەرچوون بۆ ئەو غەزایە[٨٣١].

---

(٨٢٨) انظر: (تاريخ اليعقوبي) (٦٧/٢).

(٨٢٩) أخرجه: ابن مردوية وابن ابي شيبة كما في (السبيل) (٤٣٣/٥).

(٨٣٠) أخرجه: ابن عساكر (١٦٧/١)، والبيهقي (الدلائل) (٢٥٤/٥) وحسّن اسناده الحافظ في (الفتح) (١٤٠/٨) والصالحي في (للبسل الهدى) (٤٧٩/٥)، وضعفه ابن كثير (التفسير) (٩٨/٥)، ومهدي رزق الله في (السيرة في المصادر الاصلية) (ص:٦١٤).

(٨٣١) أخرجه: ابن سعد (١٦٥/٢).

تەبەرانی ﵀ دەگێڕێتەوە لە عەمرانی کوڕی حەسین ﵁ دەفەرموێت: عەرەبە گاورەکان بۆ هەرقلیان نوسی کە ئەو پیاوەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات تووشی ماندوبوون و قات وقڕی و تیکچوونی ماڵ و سامانمان دەکات ئەگەر دەتەوێت هێرشی دەکەینە سەر، ئەویش یەکێك لە گەورە پیاوانی لەگەڵ چل هەزار کەس نارد ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر ﷺ و فەرمانی جەنگی دەرگرد[٨٣٢].

ئەوەی ئەم بۆ چونانە بە هێز دەکات ئەوەیە کە موسوڵمانان دەترسان لە هێرشی پاشای غەساسینە کە ئەوان لەو عەرەبانە پێك هاتبوون کە پێشتر ببوون بە گاور لە فەرمودەیەکی صحیح دا هاتووە لە ئیمامی عومەرەوە ﵁ دەفەرموێت: (....باسی ئەوەمان دەکرد کە (ال غسان) خۆیان ساز و ئامادە دەکەن بۆ هێرش هینانەسەرمان). وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمێت: [....ئێمە دەترساین لەوەی کە پاشایەك لەپاشاکانی غەساینەکان کە باسیان دەکرد بەرەو لای ئێمە دێت لەبەر ئەوە سنگمان پڕ ترس ببوو لێیان][٨٣٣].

٥- ئیبنو کەسیر ﵀ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ سوور بوو لەسەر ئەوەی کە بجەنگن لەگەڵ ڕۆمەکان لەبەر ئەوەی نزیك ترین شوێن بوو لە موسوڵمانانەوە و شایستە تربوو بۆ ئەوەی بانگ بکرین بۆ ئیسلام لەبەرئەوەی نزیك بوون لە ئیسلام و موسوڵمانان) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلۡكُفَّارِ وَلۡيَجِدُواْ فِيكُمۡ غِلۡظَةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ١٢٣﴾ (التوبة)[٨٣٤]. واتە: (ئەی بڕواداران! لەگەڵ ئەو کافرانەدا بجەنگێن کە لێتانەوە نزیکن، با توندو تیژیی و زەبرو زەنگیشتان لێ ببینن، چاکیش بزانن کە خوا لەگەڵ خۆپارێزانە) لەبەر ئەمە بوو کە پێغەمبەر ﷺ سەرەتا لە عەرەبەکانی دەوروبەریەوە دەستی پێکرد.

لەبەر ئەم هۆکارانە پێغەمبەر ﷺ بڕیارێکی یەکلاکەرەوەی دەرکرد کە دەست پێشخەری بکات لە هێرش کردنە سەر ڕۆمەکان چونکە هێرش کردن باشترین هۆکارە بۆ بەرگریکردن، وە داوای لە موسوڵمانان کرد کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ

(٨٣٢) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٣١/١٨) وفي اسناده ضعف كما في (المجمع) (١٠٣١١)، و (سبل الهدى) (٤٣٣/٥).
(٨٣٣) أخرجه: البخاري (٨٩، ٥١٩١)، ومسلم (١٤٧٩) وأحمد (٣٣/١)، وابن حبان (٤٢٦٨).
(٨٣٤) انظر: (البداية) (٦٥٣/٤).

ڕۆیشتن بۆ شوێنێکی دوور کە ئەویش خاکی ڕۆمەوە وە بۆ شەرکردن لە دژیان. وە بۆی ڕوون کردنەوە تا ئەوان ئەوەی سەختی و قورسی غەزاکردن لە گەرما و بیابان و دووری نێوانیان باش بزانن.

## ئامادەکاریی موسوڵمانان بۆ غەزاکە

بارودۆخی ئەم غەزایە لەکاتی زۆر گەرمی هاویندا بەڕێوەچوو موسوڵمانان توشی قات و قڕی و کەمی وڵاخ و کەرەستەی جەنگی بوون لەوکاتەشدا کاتی میوە پێگەیشتن بوو هەموو کەسێك حەزی دەکرد لە ژێر سیبەری درەخت وماڵەکانیاندا بحەوێنەوە:

ئیبنو ئیسحاق ﵀ دەفەرموێت: [لە دوای گەڕانەوەی لە فەتحی مەککە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان لە نێوان مانگی زولحەجە و ڕەجەبدا مانەوە پاشان فەرمانی بە خەڵکەکە کرد کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ غەزای ڕۆم. ئەویش لەکاتێکدا بوو کە موسوڵمانان توشی قات و قڕی و وشکە ساڵی و دەست تەنگی هاتبوون، لەم کاتەدا تازە میووە پێدەگەیشت هەموو کەسێ پێی خوش بوو لای بەروبومەکانی و لەژێر سێبەردا بمێنێتەوە و بەلایانەوە گران بوو لەکاتێکی ئاوهادا بەرەو غەزا بڕۆن پێغەمبەر ﷺ پێشتر بەرەو هەرناوچەو هەر غەزایەك بڕۆیشتایە ناوی نەدەهێناو ئاشکرای نەدەکرد، بەڵام بەڕوون و ئاشکرایی ناوی ئەوجێگەیەی هێناکە دەیەوێت بۆی بڕوات، ئەویش لەبەر دووری ڕێگاو گەرمی کەش و هەواو زۆری ژمارەی دوژمن بوو بۆ ئەوەی موسوڵمانان زۆر بەباشی خۆیان ساز و ئامادە بکەن بۆ ئەو غەزایە...][٨٣٥].

کەعبی کوڕی مالیك ﵁ دەفەرموێت: [پێغەمبەر ﷺ گەر بیویستایە بۆ هەر غەزایەك بڕوات ناوی بەئاشکرا نەدەهێنا، تەنها ناوی تەبوکی بە ئاشکرا هێنا، چونکە لەکاتی گەرمایەکی زۆردابوو، وە ڕوەو ناوچەیەکی بێ ئاو و دوور دەڕویشتین، وە دوژمنەکەشیان ژمارەیان زۆر بوو، لەبەر ئەوانە هەموو، باسی ئەم غەزایەی بۆ ڕوون کردنەوە تا بە باشی خۆیانی بۆ ئامادە بکەن][٨٣٦].

(٨٣٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٣٢/٤).

(٨٣٦) أخرجه: البخاري (٢٩٤٨)، ومسلم (٢٧٦٩).

بۆ دابین کردنی خەرجی و کەلوپەلی پێویست بۆ ئەم غەزایە، پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانانی هاندا بۆ بەخشین و ئەوانیش بەشدار بوون بەوەی کە لە توانایاندا هەبوو: ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەر ﷺ زۆر باش خۆی ئامادەکرد و فەرمانی بە موسوڵمانان دا ئەوانیش خۆیان سازو ئامادە بکەن دەوڵەمەندەکانی هاندا بۆ زیاتربەخشین و دابین کردنی ئازوقە و وڵاخ و کەل و پەلی پێویست، زۆرێك لەوان بەشدابوون وەك عوسمانی کوڕی عەففان ئەوان بەشداری کارایان هەبوو لەو بوارەدا][٨٣٧].

عەبدولڕەحمانی کوڕی سەمورە ﷺ دەفەرموێت: [عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و هەزار دیناری ئاڵتونی لە پۆشاکەکەیدا هێنابوو وە هەمووی ڕژاندە کوشی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەویش بەدەسی خۆی ئەم دیوو ئەودیوی پێ دەکردن و بەردەوام دەیفەرموو: ((کوڕەکەی عەففان هەرکارێك ئەنجام بدات لەئێستا بەدواوە زیانی بۆی نابێت، ئەمەی چەند جار دووبارە کردەوە))][٨٣٨].

لە گێرانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: ((خودایە من ڕازیم لە عوسمان تۆش لێی ڕزیی ببە))[٨٣٩]. [بەخشینەکانی عوسمان ﷺ گەیشتە بەخشینی چوارسەد ئوقەیە زیوو و چوارسەد وشتر بە پێداویستی و کەلوپەلەکانی][٨٤٠]. یاخود گێردراوەتەوە [کە شەش سەد وشتری بە پێداویستی و کەلو پەلەکانیەوە بەخشیوە][٨٤١]. لە گێرانەوەیەکی (لاوازدا) هاتووە کە چەندەها جۆر یارمەتی تری پێشکەش بە موسوڵمانان کردوە[٨٤٢]. وەك دواتر خۆی بەموسوڵمانانی دەفەرموو: (ئایا نازانن کە من لە سامانی خۆم سوپای تەبوکم ئامادەکرد؟ ئەوانیش وتیان: بەڵێ وابوو)[٨٤٣].

(٨٣٧) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٣٤/٤).

(٨٣٨) أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٨١٦٤)، وأحمد (٦٣/٥) وفي (الفضائل) (٧٣٨) وقال محققه: اسناده حسن، والترمذي (٣٧٠١)، والحاكم (١٠٢/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وحسنه الشيخ الالباني في (المشكاة) (٦٦٤٥)، و (صحيح الترمذي) (٢٩٢٠).

(٨٣٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٣٤/٤) رقم (١٠٦١) و قال محقيقوه: إسناده ضعيف.

(٨٤٠) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٣١/١٨)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٣١١): فيه العباس بن فضل وهو ضعيف.

(٨٤١) أخرجه: أحمد (٧٥/٤)، والترمذي (٣٧٠٠)، والحاكم (١٠٢/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (٢١٤/٥) وضعفه الشيخ الالباني في (المشكاة) (٦٦٣٥).

(٨٤٢) انظر: (السيرة الصحيحة) (٥٢٥/٢).

(٨٤٣) أخرجه: الترمذي (٣٧٠٣) وحسنه الشيخ الالباني في (الارواء) (١٥٩٤).

یاخود دەیفەرموو: [ئایا ئێوە نازانن کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێك پێداویستی و کەلوپەلی سەربازی سوپاکە ئامادەبکات بەهەشت بۆ ئەوە)). ئەوە بوو هەموو پێداویستیەکم بۆ ئامادەکردن تا پێویستتان بە پەتی لغاو و بەستنەوەی وشترێك نەبوو؟ ئەوانیش وتیان: بەڵێ ڕاستە][٨٤٤]. یاخود جارێکی تریان پێی فەرموون: [توخوا بیرتانە کە لە غەزای تەبوکدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کێ دەتوانێت ببەخشێت لەوکاتەدا خەڵکی دەست تەنگ بوون وەمنیش پێداویستی هەموو سوپاکەم ئامادە کرد؟ ئەوانیش وتیان: بەڵێ ڕاستە][٨٤٥].

ئەبو هیشامی زوهری ﷺ دەفەرموێت: [عوسمان ﷺ لەو ڕۆژەدا نۆ سەد و چل وشتری بە کەلوپەلەکانیەوە بەخشی وە لە پاشاندا شەست ئەسپیشی هێنا و بەخشی][٨٤٦].

ئەبو بەکر و عومەر و عبدالرحمان و ئەوانی تر هەموو پیشبڕکێی یەکتریان دەکرد بۆ بەخشین:

عومەر ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بە بەخشین لەو ساتەدا من هەندێك پارەم لە لابوو وتم گەر هیچ ڕۆژێك توانام نەبوو بێت پێشی ئەبوبەکر بدەمەوە دەبێت ئەمڕۆ پێشی بدەمەوە وە نیوەی سامانەکەم هێنا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئایا هیچ سامانت بۆ هاوسەر و خێزانەکەت هێشتۆتەوە؟ وتم: بەڵێ نیوەکەی ترم بۆ ئەوان جێ هێشتووە، لەو ڕۆژەدا ئەبوبەکر هەموو سامانەکەی هێنا و پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((ئەبوبەکر ئایا تۆ هیچ سامانێکت بۆ هاوسەرو خێزانەکەت جێ هێشتووە؟)) فەرمووی: خودا و پێغەمبەرەکەیم بۆ جێهێشتون. منیش وتم: سوێند بەخوا لێرە بەدواوە دەبێت پێشبڕکێت لە هیچ شتێکدا لەگەڵدا نەکەم][٨٤٧].

---

(٨٤٤) أخرجه: البخاري (٢٧٧٨)، والدار قطني (٤٤٠١)، والطيالسي (١٨٢)، والبيهقي (الكبرى) (١٦٧/٦).

(٨٤٥) أخرجه: الترمذي (٢٩١٩)، (٣٩٦٥) وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٢٠٨/٣).

(٨٤٦) أخرجه: أحمد (الفضائل) (٨٤٨) وقال محققه: مرسل رجاله ثقات.

(٨٤٧) أخرجه: الدارمي (١٦١٥)، وابوداود (١٦٧٨)، والترمذي (٣٦٧٥)، والحاكم (٤١٤/١) وصححه على شرط البخاري ووافقه الذهبي وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٤٧٢)، و (صحيح الترمذي) (٢٩٠٢) وصححه ايضاً الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٩٩٦).

قەتادە رحمه الله دەفەرموێت: [عەبدورەحمانی کوڕی عەوف نیوەی سامانەکەی بەخشی لەرێی خوادا کە بریتی بوو لە دوو هەزار درهەم][٨٤٨].

هاوەڵانی تریش هەموو بەشداربوون، ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: [پیاوێك وشترێکی بە کەلوپەلەکانیەوە هێنا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: ئەوە دەبەخشم لەرێی خوادا. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لَكَ بِهَا سَبْعُمِائَةِ نَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ فِي الْجَنَّةِ))[٨٤٩]. واتە: ((حەوسەد وشتری بەوجۆرەت پێ دەبەخشرێت لە بەهەشتدا))].

موسوڵمانێکی هەژار هەموو سامانەکەی دوو کیلۆ و نیو خورمای هەبوو هێنای و کردیە خێر و بەخشی دووڕووەکان گاڵتە جاڕیان پێدەهات و توانجیان تێدەگرت. قەتادە رحمه الله دەفەرموێت: (عەبدو ڕەحمانی کوڕی عەوف هەموو سامانەکەی هەشت هەزار دیناربوو نیوەی بەخشی کە چوار هەزار دینار بوو، کەسانێکی دووڕو وتیان: بەڕاستی عەبدولڕەحمان ڕیابازێکی گەورەیە، وە پیاوێکی هەژار سامانەکەی دوو ساع خورمابوو کە دەکاتە نزیکەی (پێنج کیلۆ) هات و نیوەی کردە خێر و بەخشی، ئەو دووڕووانە دەیان وت: خوا کەی پێویستی بە تۆزە خورمایە هەیە! سەبارەت بەوان ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ﴾ (التوبة) )[٨٥٠]. واتە: (ئەو دووڕووانە ڕەخنە لەو موسوڵمانانە دەگرن کە بە گیان و بە دڵ خێر و سەدەقە دەکەن گەر کەمیش بێت یان زۆر، ئەڵێن جائەوە چییە؟! کەی خوا پێویستی بەوە هەیە؟ گاڵتەیان پێ دەکرد! جا لەبەرامبەر ئەوە خوایش مەسخەرە بەوان دەکات وئەوانە سزایەکی بەئێشیشیان بۆ هەیە).

لە گێڕانەوەیەکی تردا ئەبومەسعودی ئەنصاری رضي الله عنه دەفەرموێت: [کاتێك فەرمانی بەخشینمان پێ کرا ئێمە بەکۆڵ شتمان دەبەخشی، پیاوێك ناوی (ئەبو عەقیل) بوو نیوساع خورمای هێناو پیاوێکی تریش زیاتر لەنیو ساعی بەخشی، دووڕووەکان

---

(٨٤٨) أخرجه: الطبري (التفسير) (١٩٥/١٠) وقال الحافظ (الفتح) (٣٣٢/٨) وهو الأصح، واسناده صحيح كما في (السيرة الصحيحة) (٥٢٥/٢)، و (مرويات غزوة تبوك) (١٤٥، ١٥٢).

(٨٤٩) أخرجه: أحمد (١٣٦/٤)، ومسلم (١٨٩٢)، وابن حبان (٤٦٤٩)، و (السلسلة الصحيحة) (٦٣٤).

(٨٥٠) أخرجه: الطبري (التفسير) (١٩٥/١٠) واسناده صحيح كما في (مرويات غزوة تبوك) (١٥١) و (السيرة الصحيحة) (٥٢٥/٢).

وتیان: خودا پێویستی بە بەخشینی ئەوە نییە ئەوی تریشیان ڕیابازە ئیتر خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ﴾ (التوبة)[٨٥١].

وە هەندێکی تر لە هەژارە موسوڵمانەکان گریان لەبەرئەوەی هیچیان نییە بیبەخشن و هاوکاری موسوڵمانانی پێ بکەن، ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [پیاوانێك لە موسوڵمانان هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە پێیان دەوترێت (گریاوەکان) ئەوانیش حەوت کەس بوون.... هەموویان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ تا بەشداربن و هەموویان هەژار بوون وە پێغەمبەری خوا ﷺ بەوانی فەرموو: ((هیچ ولاخێك شك نابەم کە ئێوە لەسەر پشتی سواربکەم)). ئەوانیش گەڕانەوە و بەخوڕ فرمێسك لەچاویان دەڕژا لەغەمباری ئەوەی کەهیچ سامانێکیان نییە تا لە ڕێی خوادا بیبەخشن. ﴿ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوۡكَ لِتَحۡمِلَهُمۡ قُلۡتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحۡمِلُكُمۡ عَلَيۡهِ تَوَلَّواْ وَّأَعۡيُنُهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾(التوبة).

لەوانە یامینی کوڕی عەمر و عەبدڵلای کوڕی موغەفەل هەردووکیان دەگریان و دەیان وت: چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ تا لەگەڵ خۆی بمانبات بەڵام ئەویش نەیتوانی ولاخمان بۆ دەستەبەر بکات، دواتر کەسێك وشترێکی بۆ دابین کردن لەگەڵ هەنێك شیردا وە بە هۆیەوە توانیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداربن، بەڵام پیاوێکی تر ناوی (عەلبەی کوڕی زەید) بوو شەو هەستا شەو نوێژی کرد تائەوەندەی توانی، پاشان گریاو وتی: خودایە تو فەرمانت بەتێکوشان کردووە و موسوڵمانانت بۆ هانداوە ئەوندەت پێنەداوم بۆ خۆم بتوانم بەشداربم وە پێغەمبەریش ﷺ پێداویستی وەهای لانیە تایارمەتیم بدات منیش لەبری ئەوە هەموو ئەو موسوڵمانانە دەبەخشم کە مافی منیان لابێت، دواتر ڕۆژبووە و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە کوێیە ئەوکەسەی ئەم شەو خێر و بەخشینی ئەنجام داوە)) بەڵام کەس هەڵنەستا، پاشان دووبارەی کردەوە دیسان کەس هەڵنەستا وسێ بارەی کردەوە پاشان ئەو هاوەڵە هەستاو بۆی گێڕایەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أبشر فو

---

(٨٥١) أخرجه: البخاري (٤٦٦٨)، ومسلم (١٠١٨)، والطبري (١٠/١٩٦).

الذی نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ كُتِبْتَ فِي الزَّكَاةِ الْمُتَقَبَّلَةِ))[٨٥٢] واتە: ((مژدەت لێ بێت سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە خودا بۆتی خستوتە ڕیزی زەکاتی قبوڵکراوەوە)).

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (ئەوانەی گریان خودا ئاگای لە ناو دڵیان بوو کە ئەوان تێکۆشان لە پێناو خودا دا لە لایان خۆشەویست بووە بۆیە عوزریان لای خودا وەرگیراوە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ ﴾ (التوبة))[٨٥٣]. واتە: (ئەوکەسانەی جیهادیان لەسەر نییە لەش و جەستەیان لاوازو بێ هێزە، یان نەخۆشن یان ئەوانەی هیچیان نییە بیبەخشن بۆ خۆ ئامادەکردن بۆچوونە جیهاد، ئەمانە هیچ گوناهێکیان لەسەر نییە دەتوانن دانیشن و نەچنە غەزا بەمەرجێ سوڵحاو و دڵسۆزبن بۆ ڕێبازی خودا و پێغەمبەرەکەی وە هانی خەڵکی تر بدەن بۆ تێکۆشان، وە موسوڵمانان لە خەبات کردن پەشیمان نەکەنەوە، خەڵکی پۆزشدارو خێرخواز گەر نەشچنە جیهاد، بەئەندازەی دەسەڵاتیان هەوڵدەدەن بۆ چاکە و خۆشیان نادزنەوە لە غەزا، خوا گوناحپۆش و لێبوردەیە، بەپێی دەسەڵات و توانا ئەرك دادەنێت).

ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ و خزمەکانی هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ تا وشتریان بۆ دابین بکات لەو غەزایەدا، خۆی دەفەرموێت: [هاوڕێیانم منیان ناردە لای پێغەمبەر ﷺ تا داوای لێ بکەم وشترمان بۆ ئامادە بکات بۆ غەزاکە و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان منیان ناردوتە لات تا وشتریان بۆ دابین بیکەیت [بەڵام لەوکاتەدا لای نەبوو دواجار لێمان دووبارە کردەوە سوێندی خوارد بۆمان دابین نەکات)[٨٥٤]. و فەرمووی: ((سوێند بەخوا هیچ وڵاخێکتان بۆ ئامادە ناکەم)) [لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ وشتری صەدەقەشی دابەش دەکرد][٨٥٥]، و زۆر توڕە بوو منیش هەستم بە توڕەبوونەکەی نەکرد دواجار گەڕامەوە بەهۆیەوە زۆر غەمبار

---

(٨٥٢) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢١٨/٥) وفي (الشعب) (٧٧٣٩) وقال محققه: سنده لابأس به، وقال الحافظ (الاصابة) (٥٦٥٧) له شاهد صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (٤٣٩).

(٨٥٣) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٩٤).

(٨٥٤) أخرجه: البخاري (٤٣٨٥).

(٨٥٥) أخرجه: البخاري (٥٥١٨).

بووم وە دەترسام لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لێم ڕەنجابێت، گەڕامەوە لای هاوڕێیانم هەواڵەکەم بۆ گێڕانەوە، کەمێکی بەسەرا چوو [بینیمان یەکێك بەدواماندا دەگەڕێت و دەڵێت: (پیاوە ئەشعەریەکان لە کوێن؟)][٨٥٦]. دواتر گوێم لێ بوو بیلال بانگی دەکرد و دەیوت: عەبدوڵڵای کوڕی قەیس لەکوێیە؟ منیش ڕۆیشتم و وەڵامم دایەوە، وتی: بڕۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو وڵاخانەی بۆ دابین کردون بۆ غەزاکەتان)، کاتێك ئێمە لێمان وەرگرت وتمان: ئێمە وامان کرد پێغەمبەری خوا سوێندەکەی خۆی بیرچێتەوە و [ئەمانەش بەرەکەتیان تێدا نابێت بۆمان][٨٥٧]. [من چوومە خزمەتی وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ سوێندت خوارد وشترمان بۆ دابین نەکەیت بەڵام دواجار بۆت دابین کردین][٨٥٨]، [ئێمە وامانزانی سوێندەکەت لەبیرچووە] فەرموی: ((إِنِّي وَاللَّهِ مَا نَسِيتهَا))[٨٥٩] [واتە: سوێند بەخوا بیرم نەچۆتەوە]، (لَسْتُ أَنَا حَمَلْتُكُمْ، وَلَكِنَّ اللهَ حَمَلَكُمْ، وَإِنِّي وَاللهِ إِنْ شَاءَ اللهُ، لاَ أَحْلِفُ)[٨٦٠] [واتە: من بۆم دابین نەکردوون بەڵکو خودا بۆی دابین کردوون، سوێند بەخودا گەر خودا ویستی لێبێت هەر سوێندێك بخۆم] (عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا إِلاَّ (كفرت عَنْ يَمِيني)[٨٦١] واتە: لە سەر هەر شتێك دوا جار پێچەوانەکەیم لا پەسەند تربێت [ئەو کات سوێندەکەم دەشکێنم] وَأَتَيْتُ الذي هُو خَيْرٌ منها)[٨٦٢] [واتە: ئەوەی لام پەسەند ترە ئەنجامی دەدەم].

(٨٥٦) أخرجه: البخاري (٦٦٤٩).
(٨٥٧) أخرجه: البخاري (٣١٣٣).
(٨٥٨) أخرجه: البخاري (٤٣٨٥).
(٨٥٩) أخرجه: مسلم (١٦٤٩).
(٨٦٠) أخرجه: البخاري (٣١٣٣).
(٨٦١) أخرجه: البخاري (٥٥١٨)، ومسلم (١٦٩١٠).
(٨٦٢) أخرجه: البخاري (٤٤١٥) بتمامه.

# هەڵوێستی دووڕوەکان

غەزای تەبوك دەرخەری ڕووی ڕاستەقینەی دووڕووەکان بوو وە ناسینی پیلانەکانیان دژ بە ئیسلام و موسوڵمانان، لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانانی هاندەدا بۆ ئەم غەزایە ئەوان هەوڵیان دەدا ترس و غەم لە دڵی موسوڵماناندا دروست بکەن.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [هەندێك لە دووڕووەکان لەوانە وەدیعەی کوڕی سابت وە کەسێکی تریان کەناوی جوحشنی کوڕی حومەیری بوو، پەنجەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی ڕادەکێشا کە دەیان ویست بەرەو غەزاکە بڕۆن هەندێکیان بەوانی تریان دەوت: ئێوە وادەزانن جەنگی ئەوان وەك جەنگی عەرەبەکانە لەناو خۆیان، سوێند بەخوا لامان ڕونە کەسبەینێ بە پەت هەموویان قۆڵ بەست دەکرێن. دووڕووەکان ئەوانەیان دەوت تەنها بۆ دڵە ڕاوکێ و ترس دروست کردن بوو لەدەرونی بڕواداران...][٨٦٣] وە دیسان دەیان ویست ورەی موسوڵمانان لاواز بکەن و دەیان وت: لەم گەرمایەدا لەشکر کێشی مەکەن.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (کەسانێك لە دووڕووەکان لە نێوان خۆیاندا دەیان وت: لەم گەرمایەدا لەشکرکێشی مەکەن، ئەو وتانەشیان تەنها بۆ نەویستنی جیهادو تێکوشان و گومان دروست کردن لە حەق و ترساندنی پێغەمبەر ﷺ بوو، دواجار خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُواْ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُواْ قَلِيلًا وَلْيَبْكُواْ كَثِيرًا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾ (التوبة))[٨٦٤]. واتە: (دووڕووەکان خۆشحاڵن بە مانەوەیان لەماڵەوە و لەگەڵ پەیامبەردا دەرنەچوون بۆ تەبووك! چونکە پیشەی هەموو مرۆڤێکی بێ هیمەت هەر ئاوایە دەبینی لەکاتی تەنگانەدا خۆی دەگرێتە دواوە و واشدەزانێ کارێکی باشیکردووە وە پێشیان خۆش نەبوو بە سەروەت و سامان

(٨٦٣) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٤١/٤)، والطبري (التفسير) (١٦٩٢٦).

(٨٦٤) أخرجه: الطبري (التفسير) (١٦٨٠٣) وفي (التاريخ) (١٠١/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٢١٤/٥) عن ابن هشام (السيرة) (١٣٣/٤).

و بەگیانی خۆیان لەڕێگەی خوادا بچنە غەزاو جیهاد بکەن و بە یەکتریان دەوت: لەم کاتی گەرمایەدا دەرمەکەون و مەچن بۆ جەنگ، ئەی موحەممەد ﷺ! پێیان بڵێ: ئاگری دۆزەخ گەرمترە لەگەرمای هاوین گەر ئەوان ژیرو و فامیدە بوونایە چاك تێدەگەیشتن، با زۆر بگرین و کەم پێ بکەنن لەبەر ئەو ئاگرەی کە بۆیان ئامادەکراوە لە پاداشتی کردەوەکانیان).

پێغەمبەر ﷺ داوای لە دووڕوویەکی ناودار کرد تا بەشداری ئەم غەزایە بێت، جابر ﷺ دەفەرموێت: (بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((ئەی جید ئایا دێیت بۆ جەنگی ڕۆمەکان؟)) ئەویش وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەم بدە تا بەشدار نەبم، چونکە من پیاوێکم ژنم خۆشدەوێت وە لەوە دەترسم گەر ئافرەتانی ئەوان ببینم توشی کێشەو گرفت ببم، پێغەمبەریش ﷺ ڕووی لێ وەرگێرا و فەرمووی: ئەوا ڕێگەم دایت)) لەو کاتەدا ئەم ئایەتە دابەزی:﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّيٓ ۚ أَلَا فِى ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾ (التوبة))[٨٦٥]. واتە: (لە نێو دووڕووەکاندا کەسی وایان هەیە بەپێغەمبەر دەڵێت: مۆڵەتم بدە! با بۆ خۆم دانیشم و نەچمە غەزا، نەوەك تووشی ناڕەحەتی و گوناح ببم! بێداربن! هەر بەو قسەیە ئەوانە کەوتنە ناوهەمان فیتنەو تاقیکردنەوەو گوناح و تاوان، چونکە هەربەو قسەیە ئەنجامی دووڕوویی و، ناپاکییان دەرکەوت کە مەبەست لەو قسەیە خۆدزینەوەیە لە پێغەمبەر ﷺ وە بێگومان دۆزەخ دەورەی بێ باوەڕەکانیداوە و قەت ڕزگاریان نابێ لێی).

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی لە مزگەوت دانیشتبوو، جیدی کوڕی قەیسی سولەمی هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگەم بدە تا دانیشم و بەشداری ئەم جەنگە نەبم، چونکە من زۆر حەزم لە ئافرەتە و نەخۆشیەکم لەگەڵدایە کە دەبێتە عوزر و پاساو بۆم پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خۆت ئامادە بکە تۆ کەسێکی خاوەن سامان و بەتوانایت، وە لەگەڕانەوەشدا بەڵکو یەکێك لە ئافرەتانی ئەوان لە دواوە لە پشتی وشترەکەت لەگەڵت سوار بێت؟)) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ڕێگەم بدە تووشی گرفتم مەکە، ئینجا ئەو ئایەتە دابەزی:

---

(٨٦٥) أخرجه: ابن ابي حاتم (التفسير) (٥١/٤) واسناده حسن كما قال الشيخ الالباني في (الصحيحة) رقم (٢٩٨٨).

﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ائْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّي ۚ أَلَا فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾ (التوبة)) [٨٦٦].

وە دووڕوویەکی تریان کە دواکەوت و ئامادەی غەزاکە نەبوو، ناوی غەنمەی کوڕی وەدیعە بوو، پێی وترا: تۆ کەسێکی خاوەن سامان بوویت چی دوای خستی و لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نەبوویت؟ وتی: یاری و گاڵتەو گەپ، دواجار خوای گەورە سەبارەت بەوکەسە ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾ (التوبة)[٨٦٧]. واتە: (ئەگەر لێیان بپرسیت: سەبارەت بە گاڵتە کردن بەخواو ئایەتەکانی و پێغەمبەری خوا ئەڵێن: بەڕاستمان نەبووە و بەڵکو تەنها گاڵتەو گەپمان دەکرد. پێیان بڵێ: ئایا گاڵتەتان بەخواو ئایەتەکانی و بەپێغەمبەرەکەی کردبوو؟ واتە: هەر وتەیەکی کوفرو ناشیرین و ناقۆڵاتان لەدەم دەرچێت، بێگومان مرۆڤی پێ کافر دەبێت).

دووڕووەکان بەوەوە نەوەستان بەڵکو لە هەوڵی دروست کردنی لانەیەکی ئارام بوون بۆ خۆیان دوور لەچاوی موسوڵمانان، وە ئەو لانەیەیان ناو لێ نابوو مزگەوت تا لەوێدا لەگەڵ یەکتر کۆببنەوە و پلانەکانی خۆیان دابڕێژن دژ بە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان ئەوان داوایان کرد تا پێغەمبەر ﷺ بێت و لەناویاندا نوێژ بکات و مزگەوتەکەیان بۆ بکاتەوە.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [ئەبو عامر سەرکردەیان بوو، مزگەوتێکیان بۆ دروست کرد... وە یەکێکیان کەناوی (موجەمەع) بوو لەدوای تەواو بوونی مزگەوتەکە وتی: ئەم مزگەوتەمان دروستکرد بۆ پاراستنی نهێنی و چیەکانمان و کەسی تر جگە لەخۆمان لەگەڵ نابێت و ئەوەی ویستمان لێ بێت باسی دەکەین وادەکەین کە هاوەڵانی موحەممەد وابزانن کە ئێمە تەنها بە مەبەستی چاکەکردن دروستمان کردوە....، ئەوان ئەو مزگەوتە زیان بەخشەیان دروست کرد لەوکاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ئامادە دەکرد بۆ غەزای تەبوك هاتنە لای وتیان: ئێمە مزگەوتێکمان دروست کردوە بۆ ئەوانەی خاوەن پێداویستی تایبەتن و نەخۆشن یان بۆ ئەو شەوانەی کەساردن و

(٨٦٦) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٩٥).
(٨٦٧) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٥٩/٥).

یاخود بۆ ئەوکاتانەی کە باران بە لێزمە دەبارێت، ئێمە پێمان خۆشە تۆش بێیتە سەردانمان و نویژمان بۆ تێدا بکەیت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئیستا ئێمە لەسەر سەفەرین، گەر لە گەڕانەوەماندا هاتینەوە بەویستی خودا دێین بۆ سەردانتان و نوێژی تێدا دەکەین...))][٨٦٨].

سەرکردەی دووڕووەکان خۆی و ئەوانەی لەگەڵی بوون وایان دەنواند کە ئەوانیش بەشدار دەبن لەگەڵ موسوڵمانان، بەڵام کاتێك سوپاکە بەڕێکەوت هەموو خۆیان دزییەوە و خۆیان دواخست، ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی سەرکردەی دووڕووەکان خۆی و دووڕووەکانی تر سەربازگەیەکیان بۆ خۆیان بەجیا دیاری کرد لە خواروی ناوچەی (زوباب)... بەڵام کاتێك پێغەمبەر ﷺ وسوپاکەی بەڕێکەوتن هەموو خۆیان لێ شاردەوە و دەرنەچوون لەمەدینە][٨٦٩].

بەم جۆرە زوربەی دووڕووەکان بەشدار نەبوون کەمێکیان بەشدار بوون ئەویش بەمەبەستی ئاشوب وئاژاوە نانەوە لە نێوان موسوڵماناندا.

## هەڵوێستی عەرەبە دەشتەکیەکان

پێغەمبەر ﷺ خۆ ئامادەکردنی سەرتاسەری موسوڵمانانی ڕاگەیاند بۆ خۆئامادەکرن و بەشداربوون لەم جەنگەدا نێردراوانی بۆ لای هەموو هۆزەکان نارد[٨٧٠]. وە زۆربەیان بەدەم ئەو بانگەوازەوە هاتن ئەوانیش هەندێك دووڕوویان لەناودا هەبوو وەك خوای کەورە دەفەرموێت: ﴿ وَجَآءَ ٱلۡمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ لِيُؤۡذَنَ لَهُمۡ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٩٠ ﴾ (التوبة) واتە: (وە عەرەبە دەشتەکی یە بیانوودارەکان هاتنە لات ئەی پێغەمبەر! هەتا مۆڵەت بدرێن و نەچنە جیهاد ئەو درۆزنانەشیان کە لەگەڵ خواو پەیامبەردا درۆیانکرد لەئیمان وباوەڕەکەیاندا، لێی دانیشتن و گوێی خۆیانیان کەڕکردو نەهاتن پۆزش و عوزر بۆ نەهاتنەکەیان بدۆزنەوە، چونکە ئیمانێکی سەر زارەکیان هەبوو سەرئەنجام سزایەکی قورس و ژان پێگەیەنەر، دووچاری بێ باوەڕەکانیان دەبێت).

(٨٦٨) أخرجه: الطبري (التفسير) (١٧١٨٦)، وإبن هشام (السيرة) (١٤٦/٤)، والبيهقي (الدلائل) (٢٥٩/٥).

(٨٦٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٣٦/٤)، والطبري (التأريخ) (١٠٤/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٢١٨/٥)، وابن كثير (البداية) (١٠/٥).

(٨٧٠) انظر: (المغازي) للواقدي (١٠٢/٣).

**وە پێویستە بزانین کە دووڕووەکانی ئەوان زیاتر لە هەمووان دووڕووتر بوون وەك خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ ٱلۡأَعۡرَابُ أَشَدُّ كُفۡرٗا وَنِفَاقٗا وَأَجۡدَرُ أَلَّا يَعۡلَمُواْ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٩٧﴾ ﴾(التوبة) **واتە: (عەرەبە دەشتەکییەکانی دەرەوەی مەدینە، لەمەڕ بێ باوەڕیی و دوو ڕووییەوە لەخەڵکی تر سەر سەختترن، شایستەو لەبار تریشن بە نەزانینی سنووری ئەو یاسایانەی خوا ناردوونی بۆ پەیامبەرەکەی وە خوا بە هەموو ئیش و کارێ زانایە).**

**خوای گەورە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانانی لە دووڕووەکان ئاگادارکردەوە تا بەوریاییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن وە دەفەرموێت:** ﴿ وَمِمَّنۡ حَوۡلَكُم مِّنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مُنَٰفِقُونَۖ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡمَدِينَةِ مَرَدُواْ عَلَى ٱلنِّفَاقِ لَا تَعۡلَمُهُمۡۖ نَحۡنُ نَعۡلَمُهُمۡۚ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيۡنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٖ ﴿١٠١﴾ ﴾(التوبة) **واتە: (لە عەرەبە دەشتەکییەکانی دەوروبەریشتاندا خەڵکێکی دووڕوو هەیە، وە لە خەڵکی (مەدینە)شدا هەندێکی دووڕوو هەن تۆ نایانناسی، ئێمە خۆمان زۆرباش دەیانناسین جا لەبەر ئەوە ئێمە لەدنیادا دووجار سزایان ئەدەین، جارێکیان بە سەرخستنتان بە سەر دوژمنەکانتاندا کە بەوە دڵگران دەبن، جارێکیشیان بە ئابڕو بردنیان لە دواییشدا ئەبرێنەوە بۆ سزایەکی هەرە گەورە).**

**بەڵام خوای گەورە زیاتر هانی موسوڵمانانی ناو شاری مەدینەی دا بۆ بەشداربوون و خۆ ئامادە کردن خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ ﴾ (التوبة) **واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! چیتانە کەپێتان دەگوترێ: بچنە جیهاد لە ڕێی خوادا لەشکران و تەمەڵن و بەزۆر خۆ دەنووسێنن بەزەوییدا و ئاخۆ لەبەر ئەوەبێ کە ژیانی ئەم دونیایەتان لە قیامەت پێ باشتربێ؟ جائەگەر لەبەر ئەوەبێت، خۆ ژیانی ئەم دونیایە لەچاو ژیان و گوزەرانی دوا ڕۆژدا، شتێکی زۆرکەم و بێ بایەخە).**

**وە فەرمانی پێدان هەموو بەشداربن فەرمووی:** ﴿ٱنفِرُواْ خِفَافٗا وَثِقَالٗا وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٤١﴾ ﴾(التوبة) **واتە: (خوای میهرەبان فەرماندەدا بەگشت موسوڵمانەکان کە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ڕێ بگرنەبەرو بچنە غەزا دژی (ڕۆم)ـە کافرەکان، ئەم فەرمانەشی فەرمانێکی حەتمی بوو وە**

خۆلادان نەبوو لێی! دەبێ گشتتان بەماڵ و سامان، بەدڵ و بەگیان لەرێی خوادا جیهاد بکەن گەر بشزانن دڵنیاتردەبن کەهەر ئەوە قازانجتانەو، بۆتان چاکترە تاپاڵکەوتن بە زەوییدا).

بەم جۆرە سەرجەم موسوڵمانان بەشداربوون جگە لە هەندێ لە دووڕوەکان و عەرەبە دەشتەکیەکان.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [ئەو عەرەبە دەشتەکیانەی ئامادەی غەزاکە نەبوون کەسانێك بوون لە بەنی غیفار.... لەگەڵ ئەوانیشدا چەند موسوڵمانێك دوا کەوتن لە بەشداریکردن لەم جەنگە، کە دووربوو لە هەموو گومان و دووڕوویيەك، لەوانە ئەبو خەمیسە لە تیرەی بەنی سالیم و کەعبی کوڕی مالیك و مەرارەی کوڕی رەبیع و هیلالی کوڕی ئومەیە، ئەمانە کەسانێکی راستگۆ بوون وە گومان لە موسوڵمان بوونیاندا نەبوو...][٨٧١].

## سەرەتای دەرچوونی سوپای موسوڵمانان

لەدوای تەواو بوونی ئامادەکارییەکانی ئەم جەنگە، پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا موسوڵمانان خۆیان ئامادە بکەن بۆ ڕۆیشتن، هەموو بەشداربووانی ئەو غەزایە ژمارەیان دەگەیشتە سی هەزار سەرباز دە هەزاریان ئەسپ سوار بوون[٨٧٢]، ئیبنو هیشام ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لەدوای خۆی (موحەمەدی کوڕی مەسلەمەی) کردە فەرمانڕەوای شاری مەدینە. لە گێڕانەوەیەکی تردا: کەسێکی تربوو بەناوی (سیباعی کوڕی عەرفەتە)][٨٧٣]. ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [هەروەها علی کوڕی ئەبوتالبی ﷺ لەدوای خۆی بەجێهێشت بۆ سەرپەرشتی خانەوادەو

(٨٧١) أخرجه: الطبري (التأريخ) (١٠٢/٣)، وإبن هشام (السيرة) (١٣٥/٤) رقم (١٠٦٢)، والبيهقي (الدلائل) (٢١٨/٥)، وأبن سعد (الطبقات) (١٦٥/٢).

(٨٧٢) أخرجه: الواقدي (١٠٢/٣)، وابن سعد (١٦٦/٢) ويؤيده قول كعب c (يزيدون على عشرة الآف) عند مسلم (٢٧٦٩). وقال ابو زرعة: (كانوا اكثر من أربعين الفاً) أخرجه: الحافظ (الفتح) (١١٨/٨)، والراجح عند جميع المؤرخين انهم كانوا ثلاثين الفاً. انظر (السيرة الصحيحة) (٥٣١/٢)، و (السيرة في ضوء المصادر الاصلية) (٦٢٣).

(٨٧٣) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٣٦/٤)، والطبري (التأريخ) (١٠٣/٣).

بنەماڵەی پیرۆزی][٨٧٤]. لە مانگی ڕەجەبدا ڕۆژی پێنج شەممە[٨٧٥]، سوپاکە لەشاری مەدینە دەرچوو سەربازگەیەکی لەناوچەی (سەنیەت وەداع) جێگیرکرد[٨٧٦].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ داوایکرد لە عەلی کوڕی ئەبوتالیب ﷺ بمێنێتەوە بۆ سەرپەرشتی کردنی خانەوادە و بنەماڵەکەی، لەوێدا دووڕوەکان بانگەشەی خراپیان بۆ بڵاوکردەوە دەیان وت: بێزاربووە و نەیویستووە ببێتە هاوڕێی][٨٧٧]، وە بۆتە بارگرانیی بەسەریەوە و ویستویەتی لێی دوور بکەوێتەوە. [دوا جار ئەو وتانە گەیشتەوە بە عەلی ﷺ] ئەویش چەکەکەی لەگەڵ خۆی بردو لەشار دەرچوو تاچووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ [لەناوچەی سنیەت وەداع][٨٧٨]ی نزیك ناوچەی (جورف) وتی: [ئەی پێغەمبەری خوا ئایا جێم دەهێڵیت لە دوای خۆت؟ تا ئیستا هەرگیز دوا نەکەوتووم لێت. ئیتر عەلی ﷺ ڕۆیشت هەردوو چاوی پربوو لە فرمێسك][٨٧٩] ئەو [دەگریاو دەیفەرموو: [ئایا تۆ لەمەدینە من جێدەهێڵیت][٨٨٠] لەگەڵ ئەوانەی جێماون][٨٨١] [بەجێم دەهێڵیت لە ناو ژن و منداڵەکاندا][٨٨٢]. ئەی پێغەمبەری خوا دووڕووەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە تۆ منت بەجێهێشتوە چونکە منت بە بارگرانیی زانیوە بەسەرتەوە و ویستوتە ڕزگارت بێت لێم [تا دەڵێن: لێی بێزاربووە و پێی خۆش نەبووە ببێتە هاوڕێی؟]. پێغەمبەری خوا ﷺ لەوکاتەدا زۆر تورِەیی پێوە دیاربوو][٨٨٣]، وە فەرمووی: ((كَذَبُوا، وَلَكِنِّي خَلَّفْتُكَ لِمَا تَرَكْتُ وَرَائِي، فَارْجِعْ

---

(٨٧٤) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٣٦/٤) رقم (١٠٦٥) وقال محققاه: اسناده حسن.

(٨٧٥) أخرجه: البخاري (٢٩٥٠) عن كعب بن مالك ﷺ.

(٨٧٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٣٥/٤)، والطبري (التأريخ) (١٠٢/٣) والبيهقي (الدلائل) (٢١٨/٥).

(٨٧٧) أخرجه: النسائي (الكبرى) (٨٤٢٩) وقال محققه: صحيح وفي (خصائص علي) (٤٢) وقال محققه: اسناده صحيح، وابويعلى (٧٣٨) وقال محققه: رجاله رجال الصحيح.

(٨٧٨) أخرجه: أحمد (١٧٠/١)، والنسائي (خصائص علي) (٥٤) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن ابي عاصم (السنة) (١٣٤٠)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٧٢٨).

(٨٧٩) أخرجه: النسائي (خصائص علي) (٤٤) وقال محققه: اسناده صحيح، وأبويعلى (٨٠٩)، وإبن ابي عاصم (السنة) (١٣٦٦) وقال محققه: حديث صحيح.

(٨٨٠) أخرجه: النسائي (الكبرى) (٨٤٢٩) وقال محققه: صحيح وفي (خصائص علي) (٤٢) وقال محققه: اسناده صحيح.

(٨٨١) أخرجه: أحمد (١٧٠/١)، والنسائي (خصائص علي) (٥٤) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٧٢٨).

(٨٨٢) أخرجه: البخاري (٤٤١٦)، ومسلم (٢٤٠٤)، والترمذي (٣٧٢٦)، وابن حبان (٦٩٢٧).

(٨٨٣) أخرجه: النسائي (خصائص علي) (٤٤) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن ابي عاصم (السنة) (١٣٦٦) وقال محققه:

فَاخْلُفْنِي فِي أَهْلِي وَأَهْلِكَ، أَفَلَا تَرْضَى يَا عَلِيُّ أَنْ تَكُونَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى؟ إِلَّا أَنَّهُ لَا نَبِيَّ بَعْدِي»)).

واتە: [ئەوان ڕاست ناکەن درۆ دەکەن، من تۆم تەنها بۆ ئەوان جێ هێشتووە بگەڕێوە ببە سەرپەرشتیاری خانەوادەی من و خانەوادەکەی خۆت... ئەی عەلی ڕازی دەبیت پێگەت بۆ من وەك هارون بێت بۆ موسا، بەڵام هیچ پێغەمبەرێکم لەدوا نایەت؟] [عەلی ﷛ وتی: بەڵی ڕازی دەبم و من ڕازیم][٨٨٤]. پاشان عەلی ﷛ گەڕایەوە مەدینە و پێغەمبەریش ﷺ بەرەو غەزاکە چوو][٨٨٥].

واقیدی ﷬ دەفەرموێت: [سوپاکە لە مەدینە بەڕێکەوت تاگەیشتە ناوچەی (زیل خوشوب) کە چل کیلۆمەتر لە مەدینەوە دوور بوو، پاشان لەوێوە بەرەو تەبوك بەڕێ کەوت و ڕێکە ناسەکەی (عەلقەمەی کوڕی ئەلفەغوائی خوزاعی بوو)][٨٨٦]. (دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ و سوپاکە بەشەو بوو وە داوایکرد تەنها ئەوکەسانە لەگەڵیدا بێت کە توانایان هەیە:

سەوبان ﷛ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕۆیشتنێکیدا فەرمووی بەهاوەڵانی: ((إِنَّا مُدْلِجُونَ اللَّيْلَةَ إِنْ شَاءَ اللهُ فَلَا يَرْحَلَنَّ مَعَنَا مُضْعِفٌ وَلَا مُصْعِبٌ)) ((ئێمە ئەم شەو لە ئیوارەوە ئەگەر خوا ویستی لێبێت بەڕێدەکەوین بۆیە ئەوانەی وشترەکانیان لاوازە یان شێتگیرە با لەگەڵمان نەیەن (واتە: دواتر لەسەر خۆبێن) لەوشەوەدا پیاوێکی لەگەڵدا بوو وشترەکەی شێتگیر بوو خستییە خوارەوە ملی شکاو مرد [پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد نوێژی لەسەر بکرێت] وە گۆڕی بۆ ئامادە بکرێت، پاشان ئاشتی و فەرمانی دا بە بیلال جاڕبدات بەناو سوپاکەداو بڵێت: سەرپێچیکار بەهەشتی بۆ نیەو [نا چێتە] بەهەشتەوە سێ جار دووبارە کرایەوە][٨٨٧]. وە موجاهیدیش ﷬ دەفەرموێت: [لەغەزای تەبوك دا پێغەمبەر ﷺ بە موسوڵمانانی فەرموو: ((تەنها با

---

حديث صحيح.

(٨٨٤) أخرجه: النسائي (خصائص علي) (٤٨) وقال محققه: اسناده صحيح.

(٨٨٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٣٧/٤) رقم (١٠٦٥) وقال محققه: اسناده حسن والحديث صحيح.

(٨٨٦) أخرجه: الواقدي (المغازي) (١٩٩/٢).

(٨٨٧) أخرجه: أحمد (٢٢٣٦٤) وقال محققه: اسناده ضعيف، والطبراني (الكبير) (١٤٣٦) و (٧٧٩٢) وفي (الشامين) (١٠٨٥)، والحاكم (١٤٥/٢) وصححه، وقال الهيثمي (المجمع) (٤١/٣): اسناده حسن.

پیاوی بەتوانامان لەگەڵ بەشدار بێت))، موسوڵمانێك سواری وشترێكی شێتگیر بوو بەری دایەوە و مرد، خەڵكی وتیان: ئەوە شەهیدە، ئەوە شەهیدە، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە بیلال جاڕ بدات و بڵێ: سەرپێچی كار ناچێتە بەهەشتەوە](٨٨٨).

## ڕووداوەكانی ڕێگەی تەبوك

لەو ڕێگە و ڕۆیشتنەدا چەندەها ڕووداو ڕوویاندا لەوانە:

**١- موسوڵمان بوونی واسیلەی كوڕی ئەسقەع ؓ:**

موسای كوڕی عوقبە ؒ دەفەرموێت: [واسیلەی كوڕی ئەسقەع دانیشتوی ناوچەیەكی نزیك شاری مەدینە بوو، جارێكیان هاتە ناوشار و هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی لەگەڵ كرد. پێغەمبەریش ﷺ لەدوای تەواو بوونی نوێژی بەیانی تەماشای ڕوخساری هاوەڵانی دەكرد، نزیك بوو وە لەواسیلە و نەیناسییەوە وە فەرمووی: ((تۆ كێیت؟)) ئەویش هەواڵی خۆی بۆ گێڕایەوە. پاشان پێی فەرموو: ((چی تۆی هیناوەتە ئێرە؟)) واسیلە دەڵێت: وتم هاتووم تا بەڵێنت پێ بدەم و موسوڵمانبم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڵێن بدە لەوەی لە تواناتدا هەیە))، ئەویش وتی: بەڵێ باشە. لەوێدا بەڵێنی دا لەو كاتەدا پێغەمبەر ﷺ خۆی ئامادە دەكرد بۆ دەرچوون بۆ غەزای تەبوك.

واسیلە بەرەو ناوچەی خۆی گەڕایەوە و بە خوشكەكەی وت: پێداویستی و كەلوپەلی جەنگ بۆ براكەت ئامادە بكە چونكە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆیشتندایە بۆ غەزاكەی. خوشكەكەشی مەنێ ئاردی پێدا.... لەگەڵ هەندێك خورمادا و لەگەڵ خۆی هێنای بۆ شاری مەدینە لەوێ زانی كە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان دوو ڕۆژ پێشتر بەرەو تەبوك بەڕێكەوتوون و چەند كەسێك لەوێ مابوون ئەوانیش لە خۆ ئامادەكردندا بوون، ئینجا چووە بازاڕی بنی قەینوقاع و دەیوت: كێ وشترێكم پێ دەدات دەسكەوتەكەی من لە جەنگدا بۆ ئەو [وشترەكەشی دوای گەڕانەوە بۆ دەگێڕمەوە]، كەعبی كوڕی عەجرە بانگی كردم وتی: من بەنۆرە لەگەڵ خۆم هەڵت دەگرم لە شەو ڕۆژدا و وەك یەك دەڕۆین و دەسكەوتەكەشت بۆ من دەبێت واسیلە

(٨٨٨) أخرجه: عبدالرزاق (٩٢٩٤)، وسعيد بن منصور (السنن) (٢٤٩٤،٢٤٨٠) وقال الحافظ (الفتح) (٨٥/٦): إسناده صحيح.

وتی: بەڵێ باشە. واسیلە دواتر دەی وت: خودا پاداشتی خێری کەعب بداتەوە و زیاتر لەبەشی خۆم سواری وشترەکەی دەکردم و لەنانەکەی خۆی بەشی دەدام وە زۆربەی دەبەخشییە من...][889].

**٢- گەیشتنەوەی ئەبو خەیسەمە ﷺ بەسوپاکەی موسوڵمانان:**

لەدوای دەرچوونی موسوڵمانان ئەبو خەیسەمە گەڕایەوەماڵەوە و پەشیمان بوو لە دواکەوتنەکەی و دواتر دوای سوپاکە کەوت و پێیان گەیشتەوە ئەو باسەش لە دوو گێرانەوەدا هاتووە:

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [لە دوای چەند ڕۆژ لە دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ و سوپاکەی لەمەدینە، ئەبوخەیسەمە لە ڕۆژێکی گەرمدا گەڕایەوە لای دوو ژنەکەی لە باخە خورماکەیدا، تەماشای کرد هەردوو هاوسەرەکەی هەریەکێکیان لە کەپرەکەی خۆیدایەو ئاو ڕشێنیان کردووە و خواردنی بەتامیان بۆ ئامادە کردووە لەگەڵ ئاوی سازگاردا، هاتەوە لایان وتەماشای کردن چیان بۆ ئامادە کردووە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر خۆر و گەرماو گەردەلول دایە ئەبو خەیسەمەش لەبەر سێبەری فێنك و خواردنی ئامادەکراوی لای هاوسەری ڕێك وپێك و لەماڵی خۆیدا؟ ئەمە هەرگیز دادپەروەری نییە، پاشان وتی: سوێند بەخوا نایەمە ناو کەپری هیچ یەکێکتان تا نەچم و خۆم نەگەیەنمە پێغەمبەری خوا ﷺ ئێوەش کەلوپەلم بۆ ئامادە بکەن، لەوێدا هەردوو هاوسەرەکەی خواردن و پێداویستی سەفەریان بۆ ئامادە کرد و وشترەکەی هێناو ئامادەی کرد و سواری پشتی بوو بەدوای پێغەمبەر و سوپاکەدا ڕۆیشت... لە ڕێگادا بە عومەیری کوڕی وەهبی جومەحی گەیشت وە هەردووکیان بەیەکەوە بەڕێکەوتن...][890].

موسای کوڕی عوقبە و عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: [ئەبو خەیسەمە ﷺ پیاوێکی ئەنساری بوو لە هۆزی بەنی سالمی کوڕی عەوف، دواکەوتبوو لە ڕۆیشتن

(٨٨٩) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٩٩). وابو داود (٢٦٧٦) بعضاً منه وضعفه الشيخ الالباني (ضعيف ابي داود) (٥٧٢).

(٨٩٠) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٣٨/٤) (١٠٦٦)، والطبري (التأريخ) (١٠٤/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٢٢٣/٥) واورده البرزنجي في (صحيح الطبري) (٣٧٥)، وله شاهد عند مسلم (٢٧٦٩).

بۆ غەزای تەبوك، ڕۆژێك گەڕایەوە ناو باخە خورماکەی و بینی لقی دارخورما هەمووی وا تەپیوە و شۆڕ بۆتەوە، کەپرەکەشی بۆ ئاوڕشێن کراوە و هاوسەرەکەشی خۆی بۆ ڕازاندۆتەوە و دەستیشی بۆ لەخەنە گرتووە! ئەبو خەیسەمە ﷺ تەماشای ئەوەی کردو فەرمووی: سوێند بەخودای کەعبە من تیاچووم گەر خودا تۆبەم لێوەرنەگرێت، ئەوەتا من لە ژێر سێبەری دارخورمادام وە پێغەمبەریش ﷺ شمشێری لە ملەو لەبەر خۆر و تینی گەرمادایە لەکاتێکدا خودا لە هەموو گوناهەکانی سەرەتا و کۆتایی خۆش بووە ئەوەتا ئەو لە بەر خوا و ڕۆژی دوایی دەرچووە و بەڕێکەوتووە بەرەو ئەو غەزایە.

پاشان ئەبو خەیسەمە ﷺ وشترەکەی خۆی ئامادەکرد و کەمێك خورمای کردە تێشوو بەرەیەك و مەشکۆڵەیەکی پڕکرد لە ئاو سوار بوو ڕۆیشت، هاوسەرەکەی بانگی کرد: ئەبو خەیسەمە بوەستە تا قسەت لەگەڵدا بکەم. ئەبو خەیسەمە ﷺ فەرمووی سوێند بەخوا ئاوڕ نادەمەوە بەرەو لای ژن و منداڵەکەم هەتا ئەگەمەوە بە پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی داوای لێخۆشبوونم بۆ بکات لە خوا... پێی وترا مەڕۆ شەتڵە خورماکانت وشك دەبن؟ فەرمووی: چوون بۆ غەزا چاکترە لە شەتڵە خورما و ڕۆیشت... لە ڕێگادا عومەیری کوڕی وەهبی جومەحی ﷺ بینی لە مەککەوە هاتبوو ئەویش بەرەو تەبوك دەچوو هەردوو بوونە هاوڕێ و بەڕێکەوتن...][891].

٣- بەڕێکەوتنی ئەبو زەڕ ﷺ:

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەر ﷺ لەو سەفەرەیدا بەڕێکەوت ناو بە ناو پێی دەوترا: ئەی پێغەمبەری خوا فلان کەس دوا کەوتوە و نەهاتووە، ئەویش دەیفەرموو: ((لێیگەڕێن ئەگەر خێری تێدابێت خودا دەیگەیەنێتەوە پێمان وە گەر واش نەبێت خودا ئاسودەی کردووین و لە ئێوەی دوور خستۆتەوە)) تا جارێکیان پێی وترا: ئەبوزەڕیش نەهاتووە ئەبوزەڕیش وشترەکەی وەك پێویست نەدەڕۆیشت و دوای خستبوو ئەویش ناچاربوو کەلوپەلەکەی بەکۆڵ هەڵگرێ وە بە پێ بەڕێبکەوێت بە شوێن پێی سوپاکەدا، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ سوپاکەدا لە یەکێك لە جێگاکاندا لایان دابوو، لەو کاتەدا یەکێك لە موسوڵمانان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە پیاوێکە

(٨٩١) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٩٥)، والبيهقي (الدلائل) (٢٢٥/٥).

هەر خۆی بەتەنها بەرەو ئێرەدێت. فەرمووی: ((دەی ئەوکەسە ئەبوزەڕبێ؟)) کاتێك نزیك بووەوە ناسیانەوە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە ئەبو زەڕە. ئەویش فەرمووی: ((رَحِمَ اللّهُ أَبا ذَرّ يَمْشِي وَحْدهُ وِيموتُ وَحدهُ وَيُبْعثُ وَحَدهُ))[٨٩٢] ((خودایە بەزەییت هەبێ بۆ ئەبوزەڕ بەتەنها هەرخۆی دەڕوات و بەتەنهاش هەر خۆی دەمرێت و بەتەنها هەرخۆی زیندوو دەکرێتەوە)).

**٤- فەرموودەکەی ئەبو ڕەهم ﷺ:**

هەرچەندە ئەم فەرموودەیە (لاوازە) بەڵام بۆ زیاتر زانیاری باسەکەی دەهێنین: ئەبورەهم ﷺ دەفەرموێت: [لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووم لە غەزای تەبووك، شەوێکیان لە ناوچەی (ئەخزەر) دەڕۆیشتین وە لە نزیك پێغەمبەرەوە ﷺ بووم، لەوکاتەدا هەموو تووشی وەنەوز دان (واتە: بێئاگایی پێش خەوتن) بووین، جار جار من بەئاگا دەهاتم و دەم بینی نزیك بوومەتەوە لە وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ و دەترسام لەوەی بەرقاچی بکەوم، بەردەوام وشترەکەم دوور دەخستەوە، تا لە نیوەی ڕێگا خەو بردمیەوە و وشترەکەم بەر وشترەکەی کەوت بەوە بەئاگا هاتم و گوێم لیی بوو فەرمووی: ((ئاخ)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە، فەرمووی: ((برۆ)) پاشان دواتر پرسیاری ئەوانەی لێ دەکردم کە لە بەنی غیفار دوا کەوتبوون منیش ئەو هەواڵانەم پێ دەگەیاند][٨٩٣].

**٥- باران بارین:**

عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەفەرموێت: [دەرچووین بەرەو تەبوك لە کاتی گەرمایەکی زۆر بەتیندا، لەناوچەیەك لامان داو دووچاری تینویەتیەکی زۆر هاتین تا وامانزانی گەرومان دەبڕێت، وە کەسێکیش بڕوا بەدوای ئاودا بگەڕێت وامان دەزانی

---

(٨٩٢) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٤٠/٤) رقم (١٠٧٣) وقال محققاه: سنده ضعيف، والطبري (التأريخ) (١٠٧/٣)، والحاكم (٥٠/٣) وصححه وقال الذهبي: فيه ارسال، وابن سعد (الطبقات) (٢٣٤/٤)، والبيهقي (الدلائل) (٢٢١/٥) وحسّن اسناده كل من ابن كثير (البداية) (٦٦١/٤)، والسندي (الذهب المسبوك) (٣٠٧)، وفي (صحيح الطبري) (٢٨٠).

(٨٩٣) أخرجه: أحمد (١٩٠٧٢) وقال محققوه: اسناده ضعيف، وعبدالرزاق (١٩٨٨٢)، والبخاري (الادب) (٧٥٤)، والطبراني (الكبير) (٤١٥،٤١٧)، وابن هشام (السيرة) (١٤٥/٤) رقم (١٠٨٣) وقال محققه: اسناده ضعيف، والحاكم (٥٩٣/٣) والبزار (١٨٤٢)، وضعف اسناده الشيخ الالباني في (ضعيف الادب المفرد) (١١٦)، وقال السندي (الذهب المسبوك) (ص:٢٤٥): حسنٌ لغيرة.

گەرووی دەبڕێت، پیاوی وا هەبوو وشترەکەی سەردەبڕی و کیسە ئاوەکەی ناوسکی دەگوشی و چی ئاوێکی تێدابوو دەیخواردەوە و پاشان سودی لە گوشتەکەی دەبینی. لەوکاتەدا ئەبو بەکری صدیق ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ دوعات لای خودا قبووڵە، بۆ دوعامان بۆ ناکەیت؟ فەرمووی: ((تۆ ئەومت پێ خوشە؟)) فەرمووی: بەڵێ، پێغەمبەریش ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە دوعای کردو هێشتا نزاکەی تەواو نەکردبوو، هەورێك لەو لایەوە هات و سێبەرێکی کرد بەسەرماندا و بارانێکی بەلێزمە باری تا هەموو تێر ئاو بووین و هەموو ئەوانەی پێیان بوو پڕیان کرد لە ئاو، پاشان ئێمە چووین سەیرمان کرد بارانەکە سەربازەکانی تێنەپەڕاندوە تەنها هەر لەسەر ئەوان باری بوو][٨٩٤].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەگێڕیتەوە: لە مەحمودی کوڕی لە بەیدەوە ﷺ دەفەرموێت: [پیاوانێك لە خزمانم بۆیان گێرامەوە وتیان: یەکێ لە دووڕووە بەناوبانگەکان لەگەڵماندا بوو لەوساتی باران بارینە ئێمە پێمان وت: ئەی هاوار لە تۆ ئایا هیچی ترت پێویستە لەدوای ئەمە؟ ئەو وتی: ئەوە تەنها هەورێك بوو بەم لایەدا تێپەڕی][٨٩٥].

### ٦- زۆرکردنی خواردنەکە:

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەفەرموێت: [لە غەزای تەبوك دا خەڵکی دوچاری برسێتی بوون [و هەندێکیان داوایان کرد ڕێگەیان پێبدرێت تا هەندێك لە وشترەکانیان سەر ببڕن] وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ڕێگەمان بدەیت تا هەندێك لە وشترەکانمان سەر ببڕین و بیخۆین و (گەرومانی) پێ چەور بکەین؟ پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموون: ((باشە وابکەن)) عومەریش هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ئەوان وابکەن وشترەکانیان کەم دەبنەوە [ ئەی حاڵمان چۆن دەبێت کاتێك ڕووبەڕووی دوژمن دەبینەوە ئێمە هەموو برسی و پیادەڕۆ بین]، بەڵام داوابکە تا ئەو

---

(٨٩٤) أخرجه: الطبراني (الاوسط) (٣٢٩٢)، والحاكم (١٥٩/١) وصححه ووافقه الذهبي، والبزار (١٨٤١)، والبيهقي (الدلائل) (٢٣١/٥)، وابن حبان (١٣٨٣) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وجود اسناده ابن كثير (البداية) (٦٦٢/٤) وقال ابراهيم العلي (صحيح السيرة) (٧٣٤): حديث حسن، وضعفه الشيخ الالباني في (ضعيف الموارد) (٢٠٧) بعد إن حسنه في (فقه السيرة) (ص:٤٤٠).

(٨٩٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٠٧١) وقال محققاه: اسناده حسن، والطبراني (الكبير) (١٠٥/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٢٣٢/٥) وانظر: (صحيح سيرة ابن هشام) (١٨٧٥)، و (صحيح الطبري) (٣٧٨).

خواردنانەی پێیان ماوە بیهێنن پاشان داوای بەرەکەتیان بۆ بکە لە خودا بەڵکو خودا پڕ [بەرەکەتی بکات].

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ باشە)) پاشان داواکرا سفرەیەکی چەرم داخرا و داوای لێکردن ئەو خواردنانەی پێیان ماوە بیهێنن، دواجار کەسی وا هەبوو مشتێك گەنمە شامی دەهێنا و هەیان بوو مشتێك خورمای دەهێناو هەیان بوو کەرتێك نانی دەهێنا [بەتواناکەیان ئەوە بوو کە مشتە خورمایەکی بهێنایە] تا دواجار لەسەر سفرەکە بڕێکی کەم خواردن کۆ بووەوە [پێغەمبەر ﷺ بەدەستی خۆی کۆی کردەوە] و هەستا داوای بەرەکەتی لەخوا کردو، پاشان پێی فەرموون: ((تورەکەکانی لێ پڕکەن)) ئەوانیش تورەکە نەمابوو پێیان پڕی نەکەن، تا دواجار تێریان خواردو هەندێکیش مابوویەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أشهَدُ أنْ لا إلهَ إلّا اللهُ، وأنّي رسولُ اللهِ، لا يَلْقى اللهَ بهما عبْدٌ غيرُ شاكٍّ فيهما إلّا دخَلَ الجنَّةَ))[٨٩٦] واتە: ((شایەتی ئەدەم هیچ خودایەك نییە جگە لە الله وە منیش پێغەمبەری خودام، هەرکەسێکیش بەم دوو شایەتیەی بگاتەوە بە خودا وە گومانی تێدا نەبوو بێت بەهەشتی لێ قەدەغە ناکرێت))].

## ٧- کێشەی نێوان دوو پیاوەکە:

یەعلا ﷺ دەگێڕێتەوەوە دەفەرموێت: [لە غەزای تەبوك لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، وشترێکم لە ڕێگەی خودا بەخشی بوو ئەویش چاکترین کارەچاکەکانم بوو لە دڵی خۆمدا، پیاوێکم بەکرێ گرتبوو [لە ڕێگەدا][٨٩٧] بەشەڕ هات لەگەڵ کەسێکی تردا، [یەکێکیان گازی لە قۆڵی ئەوی تریان گرت][٨٩٨] و ئەویش قۆڵی ڕاکێشاو بەهۆیەوە دانێکی خرێی کەوت و چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ [تا تۆڵەی دانە خرێکەی بۆ بکاتەوە] پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: [أردْت أن تَأْكُل لَحْمه] ((أَرَدْتَ

---

(٨٩٦) أخرجه: مسلم (٢٧، ٢٥)، وأحمد (١١٠٨٠) وقال محققوه: اسناده صحيح، وابويعلى (١١٩٩) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن حبان (٦٥٣٠) وقال محققه: اسناده صحيح والنسائي (عمل اليوم) (١١٣٨) وقال محققه: اسناده حسن، والطبراني (الطول) (٥٢) والحاكم (٦١٨/٢) وصححه ووافقه الذهبي. واللفظ المسلم والزيادة للحاكم والنسائي.

(٨٩٧) أخرجه: ابن ماجة (٣٦٥٦) وهو حديث صحيح.

(٨٩٨) أخرجه: النسائي (٤٧٥٩) وهو حديث صحيح.

گەرووی دەبڕێت، پیاوی وا هەبوو وشترەکەی سەردەبڕی و کیسە ئاوەکەی ناوسکی دەگوشی و چی ئاوێکی تێدابوو دەیخواردەوە و پاشان سودی لە گوشتەکەی دەبینی. لەوکاتەدا ئەبو بەکری صدیق ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ دوعات لای خودا قبوولە، بۆ دوعامان بۆ ناکەیت؟ فەرمووی: ((تۆ ئەومت پێ خوشە؟)) فەرمووی: بەڵێ، پێغەمبەریش ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە دوعای کردو هێشتا نزاکەی تەواو نەکردبوو، هەورێك لەو لایەوە هات و سێبەرێکی کرد بەسەرمانداو بارانێکی بەلێزمە باری تا هەموو تێر ئاو بووین و هەموو ئەوانەی پێیان‌بوو پڕیان کرد لە ئاو، پاشان ئێمە چووین سەیرمان کرد بارانەکە سەربازەکانی تێنەپەڕاندوە تەنها هەر لەسەر ئەوان باری بوو][٨٩٤].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەگێڕێتەوە: لە مەحمودی کوڕی لە بەیدەوە ﷺ دەفەرموێت: [پیاوانێك لە خزمانم بۆیان گێرامەوە وتیان: یەکێ لە دووڕووە بەناوبانگەکان لەگەڵماندا بوو لەوساتی باران بارینە ئێمە پێمان وت: ئەی هاوار لە تۆ ئایا هیچی ترت پێویستە لەدوای ئەمە؟ ئەو وتی: ئەوە تەنها هەورێك بوو بەم لایەدا تێپەڕی][٨٩٥].

## ٦- زۆرکردنی خواردنەکە:

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەفەرموێت: [لە غەزای تەبوك دا خەڵکی دوچاری برسێتی بوون [و هەندێکیان داوایان کرد ڕێگەیان پێبدرێت تا هەندێك لە وشترەکانیان سەر ببڕن] وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ڕێگەمان بدەیت تا هەندێك لە وشترەکانمان سەر ببڕین و بیخۆین و (گەرومانی) پێ چەور بکەین؟ پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموون: ((باشە وابکەن)) عومەریش هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ئەوان وابکەن وشترەکانیان کەم دەبنەوە [ ئەی حاڵمان چۆن دەبێت کاتێك ڕووبەڕووی دوژمن دەبینەوە ئێمە هەموو برسی و پیادەڕۆ بین]، بەڵام داوابکە تا ئەو

---

(٨٩٤) أخرجه: الطبراني (الاوسط) (٣٢٩٢)، والحاكم (١٥٩/١) وصححه ووافقه الذهبي، والبزار (١٨٤١)، والبيهقي (الدلائل) (٢٣١/٥)، وابن حبان (١٣٨٣) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وجود اسناده ابن كثير (البداية) (٦٦٢/٤) وقال ابراهيم العلي (صحيح السيرة) (٧٣٤): حديث حسن، وضعفه الشيخ الالباني في (ضعيف الموارد) (٢٠٧) بعد إن حسنه في (فقه السيرة) (ص:٤٤٠).

(٨٩٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٠٧١) وقال محققاه: اسناده حسن، والطبراني (الكبير) (١٠٥/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٢٣٢/٥) وانظر: (صحيح سيرة ابن هشام) (١٨٧٥)، و (صحيح الطبري) (٢٧٨).

خواردنانەی پێیان ماوە بیهێنن پاشان داوای بەرەکەتیان بۆ بکە لە خودا بەڵکو خودا پڕ [بەرەکەتی بکات].

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ باشە)) پاشان داواکرا سفرەیەکی چەرم داخرا و داوای لێکردن ئەو خواردنانەی پێیان ماوە بیهێنن، دواجار کەسی وا هەبوو مشتێك گەنمە شامی دەهێنا و هەیان بوو مشتێك خورمای دەهێناو هەیان بوو کەرتێك نانی دەهێنا [بەتواناکەیان ئەوە بوو کە مشتە خورمایەکی بهێنایە] تا دواجار لەسەر سفرەکە بڕێکی کەم خواردن کۆ بووەوە [پێغەمبەر ﷺ بەدەستی خۆی کۆی کردەوە] و هەستا داوای بەرەکەتی لەخوا کردو، پاشان پێی فەرموون: ((تورەکەکانی لێ پڕکەن)) ئەوانیش تورەکە نەمابوو پێیان پڕی نەکەن، تا دواجار تێریان خواردو هەندێکیش مابوویەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أشهَدُ أنْ لا إلهَ إلّا اللهُ، وأنِّي رسولُ اللهِ، لا يَلْقى اللهَ بهما عبْدٌ غيرُ شاكٍّ فيهما إلّا دخَلَ الجنَّةَ))[٨٩٦] واتە: ((شایەتی ئەدەم هیچ خودایەك نییە جگە لە الله وە منیش پێغەمبەری خودام، هەرکەسێکیش بەم دوو شایەتیەی بگاتەوە بە خودا وە گومانی تێدا نەبوو بێت بەهەشتی لێ قەدەغە ناکرێت))].

### ٧- کێشەی نێوان دوو پیاوەکە:

یەعلا ﷺ دەگێڕێتەوەوە دەفەرموێت: [لە غەزای تەبوك لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، وشترێکم لە رێگەی خودا بەخشی بوو ئەویش چاکترین کارەچاکەکانم بوو لە دڵی خۆمدا، پیاوێکم بەکرێ گرتبوو [لە رێگەدا][٨٩٧] بەشەڕ هات لەگەڵ کەسێکی تردا، [یەکێکیان گازی لە قۆڵی ئەوی تریان گرت][٨٩٨] و ئەویش قۆڵی ڕاکێشاو بەهۆیەوە دانێکی خرێی کەوت و چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ [تا تۆڵەی دانە خرێکەی بۆ بکاتەوە] پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: [أردْت أن تأْكُل لَحْمه] ((أَرَدْتَ

---

(٨٩٦) أخرجه: مسلم (٢٧، ٣٥)، وأحمد (١١٠٨٠) وقال محققوه: اسناده صحيح، وابويعلى (١١٩٩) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن حبان (٦٥٣٠) وقال محققه: اسناده صحيح والنسائي (عمل اليوم) (١١٣٨) وقال محققه: اسناده حسن، والطبراني (الطول) (٥٢) والحاكم (٦١٨/٢) وصححه ووافقه الذهبي. واللفظ المسلم والزيادة للحاكم والنسائي.

(٨٩٧) أخرجه: ابن ماجة (٢٦٥٦) وهو حديث صحيح.

(٨٩٨) أخرجه: النسائي (٤٧٥٩) وهو حديث صحيح.

أَنْ [تقضَمَ ذراعَ أَخِيْكَ] [٨٩٩] كَما يَقضَمُ الفحلُ[٩٠٠] [((مَا تَأْمُرنِي؟ تَأْمُرنِي أَن آمره أَن يدع يَده فِي فِيك تقضمها كَمَا يقضم الْفَحْل] [إِنْ شِئْتَ فَادْفَعْ إِليهِ يدَكَ حتّى يقضِمَها، ثمَّ انتزِعْها إن شئتَ] [لا دِيَة لَكَ] [٩٠١]))[٩٠٢]. واتە: [تۆ ویستت گۆشتەکەی بخۆیت؟] [تۆ ویستت قۆڵی براکەت داخرمێنی] وەك وشتر [دەتەوێت چیم پێ بڵێیت؟ دەتەوێت من فەرمانی پێ بکەم دەستی بخاتە دەمت تا وەك وشتر دایخرمێنی] [تۆش گەر دەتەوێت قۆڵی خۆتی بدەرێ تا ئەویش بۆت داخرمێنێ و گازی لێبگرێت دواجار تۆش گەر ویستت قۆڵت لە دەمی دەربکە] [وە گەرنا تۆ هیچ قەرەبوویەکت ناکەوێت]))

## ٨- پرسیارەکەی موعازی کوڕی جەبەل ؓ :

موعاز ؓ دەفەرموێت: [لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لە غەزای تەبوکدا و لە ڕێ ڕۆیشتنەکەماندا ساتێکم بۆ هاتە پێش، پێغەمبەری خوا ﷺ چواردەوری چۆڵبوو منیش وشترەکەم تاوداو چوومە خزمەتی و لەگەڵی دەرۆیشتم] وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کارێکم نیشان بدە تا بەهۆیەوە بچمە بەهەشت و لە دۆزەخ دوورم بخاتەوە.

فەرمووی: ((پرسیارت لێ کردووم دەربارەی شتێکی گەورە و ئەویش ئاسان دەبێت لەسەر ئەو کەسەی کە خودا لەسەری ئاسان بکات، پێویستە خودا بپەرستیت و هیچ شتێك نەکەیتە هاوتا بۆی و نوێژەکانت ئەنجام بدەیت و زەکات ببەخشیت و ڕەمەزان بەڕۆژوو ببیت و حەجی ماڵی خودا ئەنجام بدەیت، پاشان فەرمووی: ((أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى أَبْوَابِ الخَيْرِ: الصَّوْمُ جُنَّة، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِيءُ الخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِيءُ المَاءُ النَّارَ، وَصَلاَةُ الرَّجُلِ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ)) واتە: ئایا دەرگاکانی چاکەت نیشان بدەم؟ ڕۆژو قەڵغانە و خێرکردن هەڵە دەسڕێتەوە وە نوێژ کردن لە نیوەی شەودا، وە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ (السجدة) واتە: (کەلەکەو تەنیشتیان دووردەخەنەوە لەجێ نوێنەکانیان، لەبەر عیبادەت و شەونوێژ،

---

(٨٩٩) أخرجه: النسائي (٤٧٦٢) وهو حديث صحيح.

(٩٠٠) أخرجه: مسلم (١٦٣٧/٥).

(٩٠١) أخرجه: النسائي (٤٧٦١) وهو حديث صحيح.

(٩٠٢) أخرجه: البخاري (٢٩٧٣).

ئەوان سەرلەسەرین نانێن و خەویان نییە چونکە لە تاریکیدا شەو نوێژ دەکەن و وە دەترسن لە سزای خوا وبە ئومێدن لە رەحمەتی و بەزەیی خودا.)

پاشان فەرمووی: ئایا پێت ڕاگەیەنم سەری هەموو ئەوکارانە چییە و کرۆکی چییە؟ و سەر ترۆپەکەی چییە؟)) ((سەری هەموو کارەکان ئیسلام بوونە وە کرۆکەکەشی نوێژە و سەر تۆپەکەشی جیهادو تێکوشانە لە پێناوی خودا)). پاشان فەرمووی: ((ئایا هەواڵت پێبدەم کۆکەرەوەی ئەوانە هەموو لەچی دایە؟)) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. ئەویش زمانی خۆی گرت و پاشان فەرمووی: ((ئەمەت بگرە تا زیانت پێ نەگەیەنێت)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئێمە سزا دەدرێین لەسەر ئەو وتانەی کە دەیلێین؟ فەرمووی: ((ثَكِلَتْكَ أُمّكَ يَا مَعَاذُ وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ إِلاَّ حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ))[٩٠٣] واتە: ((دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات ئەی موعاز ئایا خەڵکی بەهۆی درۆینەی زمانیانەوە نییە کە بەسەر ڕوویاندا فڕێ دەدرینە ناو دۆزەخەوە؟!))].

## ٩- خەملاندنی خورماکەی ناوچەی (وادی قورا):

سوپای موسوڵمانان گەیشتنە ناوچەی (وادی قورا) و تێپەڕبوون بەلای باخە خورمایەکی ئافرەتێکدا و خورمایان لێ دەکرێ و بۆیان خەملاند، ئەبو حومەید ﷺ دەفەرموێت: [لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە غەزای تەبوك دا گەیشتینە ناوچەی (وادی قورا) بەلای باخە خورمایەکدا ڕۆیشتین و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خورماکەی بۆ بخەملێنن)). ئێمەش بۆمان خەملاند، پێغەمبەریش ﷺ خەملاندی بە (دە ویسق) بە ئافرەتەکەی فەرموو: (( أحصيها حَتَّى نَرْجِع إِلَيْك إِن شَاءَ الله)) فَانْطَلَقنا )[٩٠٤] واتە: ((بۆمان بژمێرە تا دواتر دەگەڕێینەوە لات گەر خودا ویستی لێ بێت))... و پاشان بەرەو مەبەستمان بەڕێکەوتین...].

---

(٩٠٣) أخرجه: أحمد (٢٢١٢٢) وقال محققوه: صحيح بطرقة، والتزمذي (٢٦١٦) واللفظ له، وابن ماجة (٣٩٧٣)، والطبراني (الكبير) (١١٨/٢٠) والزيادة له، وابن ابي شيبة (٧/١١)، والطيالسي (٥٦٠)، والحاكم (٧٦/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبزار (٢٦٧٠)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٢١١٠)، و (صحيح ابن ماجة) (٣٢٠٩)، و(الطحاوية) (٢٠٢/١)، و(الارواء) (٤١٣)، و (صحيح الجامع) (٥٠١٢)، وصححه الارناؤوط (رياض الصالحين) (٥٧).

(٩٠٤) أخرجه: أحمد رقم (٢٣٦٠٤) (٤٢٤/٥٠)، والبخاري (١٤٨١)، ومسلم (١٠١١) (١٧٨٦) والدارمي (٢٤٩٥) وابن حبان (٦٥٠١) وابن ابي شيبة (٣٨١٦١).

## ١٠- ون بوون و دوور کەوتنەوەی وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ:

ئیبنو ئیسحاق ﵀ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەسەفەرێکدا بەرێ کەوتبوو، گەیشتە ناوچەیەك لەوێدا وشترەکەی ون بوو، هەندێك لە هاوەڵان چوون بەدوایدا گەڕان، وە یەکێك لە دووڕووەکان لەوێدا نزیکبوو لە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی (زەیدی کوڕی لوسەیتی قەینوقاعی) بوو... زەیدی کوڕی لوسەیت لای کۆپان وکەلوپەلەکەی عەماردا بوو لەو کاتەدا عەماریش لای پێغەمبەری خوا بوو ﷺ، دووڕووەکە وتی: ئایا موحەممەد بانگەشەی ئەوە ناکات پێغەمبەرەو هەواڵی لە ئاسمانەوە بۆ دێت ئەی بۆ شوێنی وشترەکەی نازانێت؟ لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ عەماری لابوو فەرمووی: ((پیاوێك وتی: ئەوەتا موحەممەد پێتان رادەگەیەنێت کە ئەو پێغەمبەرە وە ئەو هەواڵی لە ئاسمانەوە بۆ دێت بەڵام ئەو نازانێت وشترەکەی لە کوێیە، سوێند بەخوا من هیچ نازانم مەگەر ئەوانە نەبێت کە خودا فێریکردووم، ئێستاش خودا شوێنی وشترەکەی بۆ دەست نیشان کردووم، ئەوەتا لەو دۆڵەدایە لە شیوی فلان و فلان و ڕەشمەکەی بەدارێکەوە ئاڵاوە پێوەی گیرۆدە بووە ئێوەش بڕۆن بۆمی بهێننەوە)).

هاوەڵان چوونە ئەوناوچەیە وشترەکەیان بۆ هێنایەوە، دواتر عەمار ﵁ گەڕایەوە لای کۆچ و کەلوپەلەکەی وتی: سوێند بەخوا سەیرم لە شتێك دێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی گێڕامەوە کەسێك ئاوهاو ئاوهای وتووە و خۆی بۆی باسکردووە، وە هەموو ئەوانەی وتەوە کە زەید پێشتر باسیکرد، پیاوێك لەوێدا بوو وتی: سوێند بەخوا زەید ئەو قسەیەی کرد پێش ئەوەی تۆ بیگێڕیتەوە لەلامان. عەماریش هەستاو دەستی خستە بینە قاقای و دەی وت: ئەی بەندەکانی خوا ومرن بەهانامەوە مەترسیەکی گەورە و خراپەکاریکی گەورەم لە لایە هەستم پێنەکردووە، ئەی دوژمنی خوا لێم دووربکەومرەوە و هاوڕێیەتیم مەکە...][٩٠٥].

لەوێدا هاوەڵان شوانێکی بەتواناو بەهێزیان بینی خۆزگەیان دەخواست ئەو هێز و توانایەی بۆ جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوادا بەگەڕ بخستایە، ئەبومەفاریق

---

(٩٠٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٤٠/٤) (١٠٧٢)، والطبري (التأريخ) (١٠٦/٣)، وابونعيم (الدلائل) (٤٤٣)، والبيهقي (الدلائل) (٢٣١/٥) وحسّن اسناده الحافظ في (التهذيب) (٦٥/١٠)، وقال السندي في (دراسه نقديه وتخريجية في غزوة تبوك) (ص:١٧٥): وهو حسن الاسناد، وصححه ابراهيم العلي في (صحيح السيرة) (٧٣٦)، وانظر: (صحيح الطبري) (٢٧٩).

ﷺ دەفەرموێت: [ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووین ﷺ لە غەزای تەبوکدا وشترێك ونبوو، بەهۆیەوە لەو ناوچەیە ماینەوە... عەرەبێکی دەشتەکی بەهێز و بە توانا هەندێك مەڕی خۆی دەلەوەڕاند) هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ چالاکی و بە توانایی ئەویان بینی (پێی سەرسام بوون وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا] ئەوگەنجە ئەگەر هێز و تواناکەی لە پێناوی خوادا بخستایەتە گەڕ باشتربوو. [پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إِنْ كَانَ خَرَجَ يَسْعَى عَلَى وَلَدِهِ صِغَارًا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَإِنْ كَانَ خَرَجَ يَسْعَى عَلَى أَبَوَيْنِ شَيْخَيْنِ كَبِيرَيْنِ فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَإِنْ كَانَ خَرَجَ يَسْعَى عَلَى نَفْسِهِ يَعُفُّهَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَإِنْ كَانَ خَرَجَ يَسْعَى رِيَاءً وَمُفَاخَرَةً فَهُوَ فِي سَبِيلِ الشَّيْطَانِ)) [٩٠٦] واتە: ((ئەگەر ئەو هاتبێتەدەرەوە تا منداڵە بچوکەکانی تێر بکات، ئەوە ئەو کارەی وەك جیهادە بۆی لە پێناوی خوادا، وە ئەگەر هاتبێتەدەرەوە بۆ ئەوەی باوك و دایکی بەساڵاچووی بەخێو بکات ئەوە ئەو کارە بۆی وەك جیهادە لە پێناوی خوادا، وە گەر هاتبێتەدەرەوە بۆ ئەوەی پێداویستی خۆی دابین بکات ئەوە ئەو کارەی وەك جیهادە بۆی لە پێناوی خودا، وە گەر هاتبێتەدەرەوە بۆ ڕووپامایی و ناوداری و شانازی ئەومیان لە پێناوی شەیتاندایە)).

### ١١- ماوەی مەسح کردنی خوف:

عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعی ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە مەسح کردن بەسەر خوفدا (واتە: جۆرە پێڵاوێکی چەرمە) فەرمووی: ((تا سێ ڕۆژ و سێ شەو بۆ ئەو کەسەی لەسەفەردایە دەبێت و تەنها شەو ڕۆژێکیش بۆ ئەوکەسەی لە ماڵی خۆیدایە))][٩٠٧].

### ١٢-بەڕۆژوو بوون لە سەفەردا:

جابر ﷺ دەفەرموێت: [لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لەغەزای تەبوکدا. ئەو غەزایە نازناوی غەزای (بارگرانی) بوو، بەڕێکەوتبووین لە دوای ئەوەی ڕۆژ

---

(٩٠٦) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٨٢/١٩)، وفي (الاوسط) (٦٨٣٥) وفي (الصغير) (٩٤٠)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الجامع) (١٤٢٨)، و (صحيح الترغيب والترهيب) (١٦٩٢).

(٩٠٧) أخرجه: أحمد (٢٣٩٩٥) وقال محققوه: اسناده حسن، وابن ابي شيبة (٣٨١٦٦) والبزار (٢٧٥٧)، والطبراني (الكبير) (٦٩/١٨)، وفي (الاوسط) (١١٦٧)، والبيهقي (الكبرى) (٢٧٥/١) وقال: قال البخاري: حديث حسن، وقال الشيخ الالباني في (الارواء) (١٠٣): سنده صحيح، وقال الشيخ مقبل (الصحيح المسند) (١٠٣٧): حديث حسن.

گەیشتبووە چێشتەنگاو، تەماشامان کرد چەند کەسێك لە ژێر سێبەری درەختێکدا بوون وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە پیاوێکە بەرۆژووە بە هۆیەوە زۆر پەریەشان و ماندووە، فەرمووی: ((لَيْسَ الْبِر أَن تَصُومُوا فِي السّفر))[٩٠٨] واتە: ((چاکە لەوەدانییە ئێوە لە سەرفەردا بەرۆژووبن))].

لە گێڕانەوەیەکی تردا: [پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی خەڵکی لێی کۆبوو بوونەوە سێبەریان بەسەرەوە دەکرد فەرمووی: ((ئەوە چیەتی؟)) وترا: ئەو پیاوە بەرۆژووە. فەرمووی: ((چاکە لەوەدا نییە ئێوە لە سەرەفەردا بەرۆژووبن))][٩٠٩].

**١٣- سوترە و بەربەستی نوێژخوێن:**

دایکی باوەڕداران عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [پرسیار لە پێغەمبەری خوا کرا ﷺ لە غەزای تەبوکدا سەبارەت بەسوترە و بەربەستی نوێژخوێن؟ فەرمووی: ((دەبێت وەك بەرزی داری پاڵدانەوەی ئەوکەسە بێت کە سواری وشتر بووە))][٩١٠].

**١٤-کۆکردنەوەی دوو نوێژ بەیەکەوە:**

موعازی کوڕی جەبەل ﵁ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای تەبووکدا گەر گەشتەکەی پێش نوێژی نیوەڕۆ دەستی پێ بکردایە ئەوکات نوێژی نیوەڕۆی دوا دەخست تا دواجار لەگەڵ نوێژی عەسر بەیەکەوە دەیکرد وە ئەگەر لە دوای نوێژی نیوەڕو بڕۆیشتایە ئەوکات عەسری دەهێنایە پێش وە لەگەڵ نیوەڕۆ بەیەکەوە دەیکرد و پاشان بەڕێدەکەوت، وە هەرکات بڕۆیشتایە پێش مەغریب ئەوکات مەغریبی دوا دەخست و دواتر لەگەڵ عیشا بەیەکەوە دەیکرد، وە هەرکات دوای مەغریب بەڕێبکەوتایە ئەوکات نوێژی عیشای دەهێنایە پێش و لەگەڵ مەغریب بەیەکەوە ئەنجامی دەدا))][٩١١].

---

(٩٠٨) أخرجه: ابن حبان (الصحيح) (٣٥٥٣) وقال محققه: رجاله ثقات.

(٩٠٩) أخرجه: أحمد (٢٩٩/٣)، والبخاري (١٩٤٦)، ومسلم (١١١٥)، والطيالسي (١٧٢١)، وابوداود (٢٤٠٧).

(٩١٠) أخرجه: مسلم (٥٠٠)، والنسائي (الصغرى) (٦٢/٢) وفي (الكبرى) (٨٢٠).

(٩١١) أخرجه: أحمد (٢٩٦/٤) والبخاري (١١١٢)، وابوداود (١٢٠٨، ١٢٢٠)، والترمذي (٥٥٣)، والبيهقي (الكبرى) (١٦٢/٣) وفي (الصغرى) (٥١٩)، وابن حبان (١٤٥٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، وصححه الشيخ الالباني في (الارواء) (٥٧٨) و (صحيح الترمذي) (٤٥٥)، و (صحيح ابي داود) (١٠٨٠).

# گەیشتنی سوپای موسوڵمانان بۆ ناوچەی تەبوك

موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەفەرموێت: [لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای تەبوك بەڕێکەوتبوون و نوێژەکانی بۆ (کورت) و کۆ دەکردینەوە ئێوارەیەکیان فەرمووی: ((إِنَّكُمْ سَتَأْتُونَ غَدًا، إِنْ شَاءَ اللَّهُ عَيْنَ تَبُوكَ، وَإِنَّكُمْ لَنْ تَأْتُوهَا حَتَّى يَضْحَى النَّهَارُ، فَمَنْ جَاءَهَا فَلَا يَمَسَّ مِنْ مَائِهَا شَيْئًا))[٩١٢] واتە: ((گەر خودا ویستی لێ بێت ئێوە سبەی دەگەنە کانیەکەی تەبوك لەکاتی چیشتەنگاودا، هەرکەسێك لە ئێوە پێشتر گەیشتە سەری با بەهیچ جۆرێك دەست لە ئاوەکەی نەدا تا خۆم دەگەمە سەری)).

ئەبو قەتادەش ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین و فەرمووی: ((إِنَّكُمْ تَسِيرُونَ عَشِيَّتَكُمْ وَلَيْلَتَكُمْ، وَتَأْتُونَ الْمَاءَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ غَدًا)) واتە: ((ئێوە ئەم ئێوارەیەو ئەم شەوتان بڕێوە و دەڕۆن، بەیانی گەر خودا ویستی لێ بێت دەگەنە ئاوەکە)). موسوڵمانان هەموو بەڕێکەوتن کەس لەسەر کەس نەدەوەستا، ڕۆیشتن تا گەیشتنە نیوەی شەو و من لە پەنایدا بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ وە نەوز بردیەوە وەخت بوو بەلادا بکەوێت... پاشان هەر ڕۆیشتین و بەردەوام بووین تا زۆربەی شەو تێپەڕبوو وە بەسەر وشترەکەیەوە دووبارە وەخت بوو بەلادا بکەوێت بەڵام من گرتم بێ ئەوەی لەخەوەکەی بەئاگای بهێنم، پاشان ڕۆیشتین لەکاتی کۆتایی پارشێودا بوو، ئەم جارەیان زیاتر لە دوو جارەکەی تر بەلادا کەوت و نزیك بوو بەربێتەوە، منیش چووم و بەدەستم گرتم تا نەکەوێت، لەو کاتەدا سەری بەرز کردەوە و فەرمووی: ((ئەوە تۆ کێیت؟)) وتم: منم ئەبو قەتادە. فەرمووی: ((لە کەیەوە ئاوها لەگەڵ مندا دەڕۆیت؟)) وتم: من ئەم شەو بەردەوام ئاوها لەگەڵتدا بووم. فەرمووی: ((حَفِظَكَ اللَّهُ بِمَا حَفِظْتَ بِهِ نَبِيَّهُ)) واتە: ((خودا بتپارێزی وەك چۆن پێغەمبەرەکەیت بەو جۆرە پاراستووە)).

پاشان فەرمووی: ((تۆ وادەبینیت خەڵکی ئێمەیان لێ دیار نەبێت؟)) یاخود فەرمووی: ((ئایا کەس لەوانە دەبینیت؟)) وتم: ئەوە سوارێك دیارە پاشان وتم: ئەوەش سوارێکی ترە، تا هەموو بووینە حەوت سوار، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ

(٩١٢) أخرجه: أحمد (٢٣٧/٥)، ومسلم (٧٠٦)، وعبدالرزاق (٤٣٩٩)، وابوداود (١١٩٤).

لە ڕێگە دابەزی و لە جێگەیەکدا پاڵ کەوت و فەرمووی: ((ئاگاداربن نوێژەکەمان بۆبپارێزن)) دواتر یەکەم کەس بە خەبەرهات خۆر لەپشتی دابوو، ئێمەش هەموو بەترسەوە بەخەبەر هاتین، پاشان فەرمووی: ((سواری وڵاخەکانتان بن)) ئێمەش سواربووین و بەڕێکەوتین تا بەتەواوەتی خۆر هەڵات و بەرز بووەوە، پاشان دابەزی و داوای مەتارەی دەستنوێژ گرتنەکەی کرد کەمێك ئاوی تێدا بوو دەست نوێژێکی سادەی گرتو هێشتا کەمێك ئاوی تێدا مابوو بە ئەبو قەتادەی فەرموو: ((ئاگات لە مەتارەکەت بێت و بیپارێزە چونکە لەمەودوا هەواڵێکی خۆی دەبێت)).

پاشان بیلال ﷺ بانگی دا پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی کرد و پاشان نوێژی بەیانی وەك ڕۆژانی تر [بۆ کردین] و دواتر ئێمەو پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو سواری وشترەکانمان بووین و هەندێکمان بە چپە لەگەڵ یەکتر دەدواین: ئایا کەفارەتی ئەو نوێژەمان کە دواکەوت ئەبێت چی بێت؟ پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئایا من سەرمەشق نیم بۆ ئێوە؟)) پاشان فەرمووی: ((أما إِنَّه لَيْسَ فِي النّوم تَفْرِيط إِنَّمَا التَّفْرِيط عَلَى مَنْ لَمْ يُصلِ الصَّلَاة حَتَّى يَجِيء وَقت الصَّلَاة الْأُخْرَى فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَلْيُصَلِّهَا حِينَ يَنْتَبِهُ لَهَا، فَإِذَا كَانَ الْغَدُ فَلْيُصَلِّهَا عِنْدَ وَقْتِهَا)) واتە: ((بزانن خەم ساردی لە خەودا نییە بەڵکو خەمساردی لەوەدایە یەکێك نوێژەکەی نەکات تا کاتی نوێژەکەی تر دێتە پێش، هەرکەسێك وای بەسەر هات کاتێك بەئاگاهات با نوێژەکەی خۆی بکات....)) پاشان فەرمووی: ((ئێوە دەڵێن دەبێ خەڵکی چییان کردبێت؟)) پاشان فەرمووی: ((خەڵکینە ڕۆژ بووەوە و پێغەمبەرەکەیان نەدۆزیەوە، لەو کاتەدا ئەبوبەکر ﷺ بە عومەری ﷺ وت: پێغەمبەری خوا ﷺ وا لە دواتانەوە دێت و بەجێی نەهێشتوون. خەڵکێکی تر وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێشەوە ڕۆیشتوە. ئەوان ئەگەر گوێڕایەڵی ئەبوبەکر و عومەر بکەن ڕێنمایی کراو دەبن و(ڕێی ڕاست بەرنادەن)).

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وا لە تینوێتی دا لە ناو چووین. فەرمووی: ((ئێوە لە ناوچونتان لەسەر نیە)) پاشان فەرمووی: جامە بچکۆلەکەی خۆمم بۆ دەربهێنن پاشان داوای مەتارە ئاوەکەی منی کرد، ئەبو قەتادە لەبەرەوە ئاوی دەکردە جامەکە و ئاوی پێدەدان، ئەوەندەی خەڵکی ئاوی ناو مەتارەکەیان بینی لێی

کۆبوونەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بە جوانی کۆ ببنەوە چونکە هەمووتان تێر ئاو دەبن)) ئەوانیش جوان وەستان ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی لەمەتارەکە ئاوی بۆ دەکردنە جامەکەوە و من پێم دەدان تا لە کۆتایدا من و پێغەمبەری خوا ﷺ ماینەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی بۆ تێکردم و فەرمووی: ((بیخۆرەوە)) منیش وتم: من ناخۆمەوە تا تۆ نەیخۆیتەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. ئەویش فەرمووی: ((ئەوەی ئاو بداتە خەڵکی خۆی دەبێت لە دوای هەموویان بیخواتەوە)) منیش ئاوەکەم خواردەوە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوەکەی خواردەوە، وە کاتێك گەیشتینەوە بە خەڵکی هەموو لایان دابوو تێر ئاویان خواردبووەوە و پشوویان دابوو][٩١٣].

لە فەرمودەکەی موعازدا ﷺ دەفەرموێت: [...پاشان هەموو گەیشتنە کانیەکەی تەبوك بینیمان دوو پیاو لە پێش ئێمەوە چونەتە سەر کانیەکە و ئاوێکی یەکجار کەمی تێدا مابوو بانگی کردن و پرسیاری لێکردن: ((ئایا دەستتان لە ئاوەکەی داوە؟)) وتیان: بەڵێ... پاشان بە مشت هەنێ ئاوی لێ هەڵێنجا و کردیە تەشتێکەوە ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەست و دەم و چاوی تێدا شۆرد و پاشان ڕژاندیە ناو کانیەکەوە دواتر ئاوی کانیەکە تەقی و زۆر زیادی کرد و بەخوڕ لەبەری دەڕۆیشت لەوێدا تێکرای موسوڵمانان لێیان خواردەوە لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە موعازی کوڕی جەبەلی فەرموو: ((موعاز گەر تەمەنت درێژ بێت نزیکە ئەم ناوە ببینیت پڕبووە لە باخ))][٩١٤].

لە دوای گەیشتنی سوپاکە بۆ ناوچەی تەبوك پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێدان کە ئەم شەو بایەکی بەهێزو زریان دەست پێدەکات، ئەبو جومەیدی ساعیدی ﷺ دەفەرموێت: [...ڕۆیشتین تا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتینە ناوچەی تەبوك و لەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ بەموسوڵمانانی فەرموو: ((إِنَّهَا سَتَهُبُّ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَةَ رِيحٌ شَدِيدَةٌ فَلَا [يَقُومَنَّ] فِيهَا رَجُلٌ، فَمَنْ كَانَ لَهُ بَعِيرٌ فَلْيُوثِقْ عِقَالَهُ)) واتە: ((ئەم شەو زریان و بایەکی بەهێز بەسەرتاندا هەڵدەکات، باهیچ پیاوێك لە ئێوە بە پێوە نەبێت

(٩١٣)أخرجه: أحمد (٢٢٦٠٩)، ومسلم (٦٨١) واللفظ له، والترمذي (١٨٩٤)، والنسائي (الكبرى) (١٥٨٣).

(٩١٤) أخرجه: أحمد (٢٣٧/٥)، ومسلم (٧٠٦).

هەموو یەکێکیش وشتری پێیە با زۆر باش بیبەستێتەوە)). ئێمە هەموو زۆر باش وشترەکانمان بەستەوە، و لەشەودا زریان و بایەکی بەهێز و توند هەڵیکرد، پیاوێك لەوکاتەدا هەستا بوو زریانەکە لەگەڵ خۆی هەڵیگرتبوو فرێیدابووە چیای تەی...][٩١٥].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [...لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((... لَا يُخْرِجَنَّ أَحْدُ مِنْكُم اللَّيْلَة إِلَّا وَمَعَهُ صَاحب لَهُ)) واتە: ((ئەم شەو کەس بەتەنها نەچێتەدەر و گەر پێویست بوو با هاوڕێیەکی لەگەڵدا بێت)). موسوڵمانان هەموو ئەو فەرمانەیان جێ بەجێ کرد، تەنها دوو پیاو لەبەنی سەعد نەبێت، یەکێکیان بۆ سەرئاو چووە دەرەوە ئەوی تریان بۆ دۆزینەوەی وشترەکەی، ئەوەی یەکەم توشی پەرکەم هات، ئەوەی دووەمیشیان زریانەکە لەگەڵ خۆی هەڵیگرتبوو دواجار لە چیای تەی فڕێی دابوو. دواتر ئەومیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێرایەوە فەرمووی: ((ئەی من داوام لێنەکردن کەس بەتەنها نەچێتە دەر و گەر ڕۆیشتیشن با هاوڕێیەکی لەگەڵ دا بێت)) پاشان دوعای بۆ یەکەمیان کرد چاکبووەوە، ئەوەی دووەمیشان دواتر هۆزی تەی هێنایانەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە...[٩١٦].

لەناوچەی تەبوك پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێك لە دوو ئاڵا گەورەکەی سوپاکەی دایە ئەبوبکرﷺ و ئەوی تری دایە زوبەیر ﷺ، و ئاڵای ئەوسیەکانی دایە ئوسەیدی کوڕی حوزەیر ﷺ، ئاڵای خەزرەجیەکانی دایە ئەبودوجانە ﷺ... و فەرمانی کرد هەموو تیرە و هۆزەکانی تر ئەنسار و عەرەبەکان هەموو یەکێك لەوانە ئاڵای تایبەت بەخۆیان هەبێت....[٩١٧].

هەر لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاری موسوڵمانانی کردو گەورەیی تێکۆشان لە پێناوی خودای بۆ ڕوونکردنەوە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەفەرموێت: (لەو ساتەی) غەزای تەبوکدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا وتاری بۆ موسوڵمانان دا و پاڵیدابوو بە دارخورمایەکەوە فەرمووی: (( أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ النَّاسِ وَشَرِّ النَّاسِ إِنَّ مِنْ خَيْرِ

---

(٩١٥) أخرجه: أحمد (٢٣٦٠٤) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما، وابن شيبة (٣٨١٦١)، والبخاري (١٤٨١)، ومسلم (١٧٨٦).

(٩١٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٣٨/٤) (١٠٦٨)، والطبراني (الكبير) (١٠٥/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٢٤٠/٥) واسناد الحديث حسن مرسل كما في (دراسة نقدية وتخريجيه في غزوة تبوك) (ص:٣٣٣)، و (صحيح الطبري ) (٢٧٦).

(٩١٧) أخرجه: الواقدي (٩١٦/٢)، وابن سعد (الطبقات) (١٦٩/٣)، وانظر (السيرة الصحيحة) (٥٣١).

النَّاسِ رَجُلاً عَمِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَلَى ظَهْرِ فَرَسِهِ أَوْ عَلَى ظَهْرِ بَعِيرِهِ أَوْ عَلَى قَدَمَيْهِ حَتَّى يَأْتِيَهُ الْمَوْتُ وَإِنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ رَجُلاً فَاجِرًا جَرِيئًا يَقْرَأُ كِتَابَ اللَّهِ وَلاَ يَرْعَوِي إِلَى شَيْءٍ مِنْهُ))[٩١٨]. ((ئایا پێتان ڕابگەیەنم چاکترین و خراپترین خەڵك کێیە؟ یەکێك لە چاکترینی خەڵك پیاوێکە کار دەکات لە پێناوی خوادا لەسەر پشتی ئەسپەکەی، یاخود لەسەر هەردوو قاچی تا بەو جۆرە مردنی پێدەگات، وە یەکێکیش لە خراپترینی خەڵك پیاوێکی تاوان باری بوێرە کە کتێبەکەی خودا دەخوێنێتەوە بەڵام نابێتە هۆکاری دەست هەڵگرتن لەتاوانەکان)).

لە گێرانەوەیەکی تردا ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لەوتارەکەی تەبوکدا فەرمووی: ((مَا فِي النَّاسِ مِثْلُ رَجُلٍ أَخَذَ بِعِنَانِ فَرَسِهِ فَيُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَيَجْتَنِبُ شُرُورَ النَّاسِ، وَمِثْلُ رجل نادى فِي غَنَمِهِ يُقْرِي ضَيْفَهُ وَيُؤَدِّي حَقَّهُ))[٩١٩] واتە: ((لە ناو خەڵکیدا کەسێك نییە، بەوێنەی ئەو کەسەی کە ڕەشمەی ئەسپەکەی لەدەستدایە و جیهادو تێکۆشان دەکات لە پێناوی خوادا، وە خۆی لە شەڕی خەڵکی بە دوور دەگرێت، یان وەك ئەو کەسەی لە لادێیەکدا لە ناو مەڕەکانیدا ژیان بەسەر دەبات و زەکاتەکەی دەدات و میوان بەڕێدەکات))].

لە گێرانەوەکەی عوقبەی کوڕی عامردا ﷺ دەفەرموێت: [لە غەزای تەبوك لەگەڵ پێغەمبەری خوا بووم ﷺ، ڕۆژێك لەناو هاوەڵانی دانیشتبوو قسەی لەگەڵ دەکردن و فەرمووی: ((مَنْ قَامَ إِذَا اسْتَقَلَّتِ الشَّمْسُ، (أي: ارْتَفَعَتْ وَيَعني صَلاةَ الضُحى) فَتَوَضَّأَ، فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، غُفِرَ لَهُ خَطَايَاهُ، فَكَانَ كَمَا وَلَدَتْهُ أُمُّهُ))[٩٢٠] واتە: ((هەرکەسێك لە کاتی چێشتەنگاو و ڕۆژ بەرز بوونەوەدا بڕوات جوان دەست نوێژ بشۆرێت پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات خودا لەگوناهەکانی خۆش دەبێت وەك ئەوکاتەی لێدێت کە تێیدا لەدایکبووە))].

---

(٩١٨) أخرجه: أحمد (١١٣١٩) وقال محققوه: حديث حسن، وعبد بن حميد (المنتخب) (٩٨٩)، والنسائي (الكبرى) (٤٣١٤)، والحاكم (٦٧/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الشعب) (١٨٨٨) وقال محققه فيه مجهول وبقية رجاله ثقات، وضعفه الشيخ الالباني في (ضعيف الجامع) (٢١٥٨).

(٩١٩) أخرجه: أحمد (٢٨٣٧) وقال محققه: اسناده صحيح، والحاكم (٦٧/٢) وصححه ووافقه الذهبي.

(٩٢٠) أخرجه: أحمد (١٢١) وقال محققوه: صحيح لغيره و (١٧٣١٤) وقالوا: اسناده قويّ، والدارمي (٧١٦)، وابوداود (١٧٠)، وابويعلى (١٨٠) وقال محققه: الحديث اسناده ضعيف ومتنه صحيح، والنسائي (عمل اليوم والليلة) (٨٤).

لە گێڕانەوەیەکی تردا عوقبە ﷺ دەفەرموێت: [ئێمە کاتێك لە خزمەت پێغەمبەری خوا بووین ﷺ هەموو خۆمان خزمەتکاری خۆمان بووین و شوانێتی و لەوەڕاندنی وشترەکانمان بەنۆرە بوو [جارێکیان نۆرەی من بوو] وشترەکانم دەلەوەڕاند پاشان لە ئێوارەدا گەڕامەوە گەیشتم بە موسوڵمانان، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێوە وتاری بۆ خەڵکەکە دەدا گوێم لێ بوو دەیفەرموو: ((هەر موسوڵمانێك جوان دەستنوێژەکەی بشوات، پاشان هەستێ دووڕکات نوێژ بکات بەدڵ ئاگای لە نوێژەکەی بێت [ئەو کەسە بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت]..]. منیش وتم: ئای ئای چەند شتێکی نایابە پیاوێك لە پێشمەوە بوو وتی: وتەکەی پێشوو تری نایابتربوو، تەماشام کرد ئەو کەسە عومەری کوڕی خەتاب بوو، وتم: ئەی باوکی حەفس وتەکەی پێشوو تری چی بوو؟ وتی: کەمێك پێش ئەوەی تۆ بێیت فەرمووی: ((مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ الْوُضُوءَ، ثُمَّ يَقُومُ حِينَ يَفْرُغُ مِنْ وَضُوئِهِ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا فُتحت أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةِ لَهُ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شاء))[٩٢١] واتە: ((هەرکەسێك لە ئێوە جوان دەست نوێژەکەی بشوات و لە دوای تەواوبوونی دەست نوێژەکەی بڵێت: ((أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)) ئەو کەسە هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ واڵا دەکرێت لەوەیانەوە دەڕواتە ژوورێ کە خۆی ویستی لێیەتی...))].

لە هەندێك گێڕانەوەی تردا هاتووە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ وتارێکی کاریگەری دوور و درێژی بۆ موسوڵمانان داوە و سەنەدەکانی ئەو فەرموودانە هەموویان (لاوازن)، بەڵام فەرموودەکە خۆی بە بەشی جیاجیا هاتووە زۆریان (صحیح)ن. لێرەدا ئەو فەرموودەیە دە هێنین بۆ ئاگاداربوون لێی:

عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەفەرموێت: [لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە غەزای تەبوك دا... و لەبەیانیەکدا کە لە تەبوك بووین، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و سوپاس و ستایشی خودای کرد بەوەی کە شایستەیە و پاشان فەرمووی: (( أَيُّهَا النَّاسُ! أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ وَأَوْثَقَ الْعُرَى كَلِمَةُ التَّقْوَى، وَخَيْرَ الْمِلَلِ مِلَّةُ إِبْرَاهِيمَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، وَخَيْرَ السَّنَنِ سُنَنُ مُحَمَّدٍ، وَأَشْرَفَ الْحَدِيثِ ذِكْرُ اللهِ، وَأَحْسَنَ الْقَصَصِ هَذَا الْقُرْآنُ، وَخَيْرَ

(٩٢١) أخرجه: مسلم (٢٣٤)، وابوداود (١٦٩).

الْأُمُورِ عَوَاقِبُهَا، وَشَرَّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَأَحْسَنَ الْهُدَى هُدَى الْأَنْبِيَاءِ، وَأَشْرَفَ الْقَتْلِ قَتْلُ الشُّهَدَاءِ، وَأَعْمَى الضَّلَالَةِ الضَّلَالَةُ بَعْدَ الْهُدَى، وَخَيْرَ الْأَعْمَالِ مَا نَفَعَ، وَخَيْرَ الْهُدَى مَا اُتبِعَ، وَشَرّ الْعَمَى عَمَى الْقَلْبِ، وَالْيَدَ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِن السّفْلَى، وَمَا قَلَّ وَكَفَى خَيْرٌ مِمَّا كَثُرَ وَأَلْهَى، وَشَرَّ الْأُمُورِ الْمَعْذِرَةُ حِينَ يحضرُ للموتِ، وَشَرَّ النَدامة يومَ القِيامةِ. وَمِنِ النَّاسِ ولا يَأْتِي الْجُمُعَةَ إِلَّا نَزْرًا، وَمِنْهُمْ مَنْ لَا يَذْكُرُ اللهَ إِلَّا هُجْرًا ، وَمِنْ أَعْظَمِ الْخَطَايَا اللّسَانُ الْكَذُوبُ، وَخَيْرَ الْغِنَى غِنَى النَفْسِ..... وَمَنْ يَكْظِمِ الْغَيْظَ يَأْجُرْهُ اللهُ، وَمَنْ يَصْبِرْ عَلَى الرَّزِيَّةِ يُعَوِّضْهُ اللهُ وَمَنْ يَتْبَعِ السُّمْعَةَ يُسَمِّعِ اللهُ بِهِ وَمَنْ يَصْبِرْ يُضَعِّفِ اللهُ لَهُ وَمَنْ يَعْصِ اللهَ يُعَذِّبْهُ اللهُ، اللهُمَّ اغْفِرْ لِي وَلِأُمَّتِي، اللهُمَّ اغْفِرْ لِي وَلِأُمَّتِي، قَالَهَا ثَلَاثًا ثُمَّ قَالَ: (أَسْتَغْفِرُ اللهَ لِي ولكم))[٩٢٢].

واتە: ((خەڵکینە ڕاستترین وتە کتێبەکەی خودایە و بەهێزترین ئەڵقە وشەی گوێڕایەڵ بوون و خۆپارێزییە، وە چاکترین ئاین ئاینەکەی ئیبراهیمەو وە چاکترین سونەت سونەتی موحەممەدە وە بەڕێزترین وتە یادی خودایە و باشترین چیرۆك ئەم قورئانەیە، وچاکترینی کارەکان ئەوانەیانن کە یەکلا کەرەوە بوون، وە خراپترین کارەکان ئاینە داهێنراوەکانن، وە چاکترین ڕێگا ڕێگای پێغەمبەرانە، وە بەرزترین مردن شەهیدبوونە، وە کوێرترین کوێربوون گومڕاییە لە دوای ڕێنوێنی وە چاکترین کارەکان ئەوانەن کە سود بەخش بوون، وە چاکترین ڕێنمایی ئەوانەیانن کە شوێنیان کەوتوون، وە خراپترین کوێربوون کوێربوونی دڵە، وە دەستی بڵند چاکترە لە دەستی نزم، و ئەوەی کەم بێت و بەش بکات باشترە لەوەی زۆر بێت و سەرقاڵت بکات، وە خراپترین پاساو هێنانەوە ئەوەیە لە کاتی سەرەمەرگدایە، وە خراپترین پەشیمان بوونەوە لە قیامەتدایە، وە گەورەترین هەڵە زمانێکی درۆزنە، وە باشترین دەوڵەمەندی ئەوەیە کە دڵت دەوڵەمەند بێت... هەرکەسێك تورەبوونی خۆی بخواتەوە خودا پاداشتی دەداتەوە، وە هەرکەسێ ئارامگر بێت خودا پاداشتی بۆ زیاد دەکات، وە هەرکەسێکیش سەرپێچی خودا بکات سزای دەدات، خودایە لە خۆم و ئومەتەکەم

(٩٢٢) الخطبة اسنادها ضعيف وجاء اكثر فقراته في احاديث صحيحة واخرجها: البيهقي (الدلائل) (٢٤٠/٥) وفي (المدخل) (٧٨٦) واللفظ له، وابن عساكر (التأريخ) (١٢٥/٣٩)، والخطيب (التأريخ) (٣٩٥/١)، والديلمي (الفردوس) (٢١٦/٢)، والقضاعي (الشهاب) (٥٥)، والدار قطني (السنن) (٤٥٦٤) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابو عبيد (الاموال) (٢٥٥)، وابونعيم (الحلية) (١٣٨/١)، وهناد (الزهد) (٤٩٥) وقال محققه: سنده ضعيف، وابن ابي شيبة (المصنف) (٣٥٦٩٤) موقوفاً عن ابن مسعود، وقال ابن كثير (البداية) (٦٦٩/٤): اسناده ضعيف، وضعفه الشيخ الالباني في (الضعيفة) (٢٠٥٩)، و (ضعيف الجامع) (١٢٣٩)، وانظر: (الاتحاف) (٩٥٠٤) و (المطالب العالية) (٣١٢٥)، و (كنز العمال) (٤٣٥٨٠).

خۆش ببە... ئەومیانی سێ جار دووبارە کردەوە پاشان فەرمووی: ((داوای لێخۆش بوون دەکەم بۆ خۆم و ئێوەش...))].

لەیەکێك لەشەوەکاندا لە ناوچەی تەبوك پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا بۆ شەو نوێژ پۆلێك لە هاوەڵان پاسەوانیان دەکرد، عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەفەرموێت: [لە تەبوکدا پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێکیان هەستاو شەو نوێژی دەکرد، هاوەڵان لێی کۆبوونەوە پاسەوانیان دەکرد تا نوێژەکەی تەواو کرد پاشان چووە لایان و فەرمووی: ((قَدْ أُعْطِيتُ اللَّيْلَةَ خَمْسًا مَا أُعْطِيَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي، أَمَّا أَنَا فَأُرْسِلْتُ إِلَى النَّاسِ كُلِّهِمْ عَامَّةً[الأحمر والأسود]، وَكَانَ مَنْ قَبْلِي إِنَّمَا يُرْسَلُ إِلَى قَوْمِهِ، وَنُصِرْتُ عَلَى الْعَدُوِّ بِالرُّعْبِ، وَلَوْ كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ مَسِيرَةُ شَهْرٍ، لَمُلِئَ مِنْهُ رُعْبًا، وَأُحِلَّتْ لِيَ الْغَنَائِمُ آكُلُهَا، وَكَانَ مَنْ قَبْلِي يُعَظِّمُونَ أَكْلَهَا كَانُوا يُحْرِقُونَهَا، وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسَاجِدَ وَطَهُورًا، أَيْنَمَا أَدْرَكَتْنِي الصَّلاَةُ تَمَسَّحْتُ وَصَلَّيْتُ، وَكَانَ مَنْ قَبْلِي يُعَظِّمُونَ ذَلِكَ، إِنَّمَا كَانُوا يُصَلُّونَ فِي كَنَائِسِهِمْ وَبِيَعِهِمْ، وَالْخَامِسَةُ هِيَ مَا هِيَ؟ قِيلَ لِي: سَلْ، فَإِنَّ كُلَّ نَبِيٍّ قَدْ سَأَلَ فَأَخَّرْتُ مَسْأَلَتِي إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، فَهِيَ لَكُمْ، وَلِمَنْ شَهِدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ [لا يُشرِكَ بِهِ شَيْئاً]))[٩٢٣] واتە: ((لەم شەودا پێنج شتم پێبەخشرا کە نەدراوەتە هیچ کەسێك لە پێش من: من نێردراوم بۆلای تێکڕای مرۆڤایەتی [سور و ڕەشیان]، بەڵام پێش من پێغەمبەر دەنێردرا تەنها بۆلای هۆز و قەومەکەی خۆی، خودا سەری خستووم بەسەر دوژمندا بەوەی کە لێم بتۆقێن گەر لەدووری یەك مانگ ڕێگەش هەبێت لە نێوانماندا ئەوان بەتەواوی لێم دەتۆقن و لێم دەترسن، وە دەستکەوتی جەنگم بۆ حەڵاڵکراوە، وە بۆ من زەوی تێکرا کراوەتە دەستنوێژ و جێی نوێژ و لەهەر شوێنێك کاتی نوێژم هات نوێژ [یان دەستنوێژ یان تەیەموم] دەکەم و نوێژ دەکەم بەڵام کەسانی پێش من ئەومیان لێ قەدەغە بوو، تەنها نوێژیان لە کەنیسەو بییەعەکانیان دەکرد، و لە پێنجەمدا پێم وترا: هەموو پێغەمبەرێك داوای خۆی کردووە، بەڵام من داواکاری خۆمم دوا خستووە بۆ ڕۆژی دوایی ئەوەش بۆ ئێوە دەبێت بۆ ئەوانەی کە شایەتی دەدەن کە هیچ خوایەك نییە جگە لە خودا و هیچ شتێکیش ناکەنە هاوەڵ و هاوتا بۆ خوا))].

(٩٢٣) أخرجه: أحمد (٧٠٦٨،٧٣٣٤) وقال محققوه: صحيح وهذا اسناده حسن، وصحح اسناده المنذري (الترغيب) (٣٣٢/٤)، وقال ابن كثير (التفسير) (١٠١/٤): اسناده جيّد قوي، وحسنه الشيخ الالباني في (الارواء) (٣١٧/١)، وفي (صحيح الترغيب) (٣٦٣٤).

لە گێڕانەوەیەکی لاوازدا هاتووە پیاوێکی هۆزی (خوسعوم) دەفەرمووێت: [ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە تەبوك، شەوێکیان هەستاو ئێمەش لێی کۆبووینەوە فەرمووی: ((خودا لەم شەوەدا هەردوو گەنجینەکانی فارس و ڕۆمی پێ بەخشیم لەگەڵ پاشاکانی حیمییەری ئەحمەرینی (ئەوان لە یەمەن بوون) هیچ پادشایەك نییە جگە لە خودا هەموو ئەوان دێن و لە پێناوی خودا دەجەنگن و لە سامان و دەست کەوت دەبەن)) ئەوەی سێ جار دووبارە کردەوە))][٩٢٤].

## ئەو ڕووداوانەی لەکاتی مانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە تەبوك ڕوویاندا

### ١- کۆچی دوایی عەبدوڵای زو لبیجادەین ﷺ:

یەکێك لە هاوەڵان نازناوی (زو لبیجادەین)ی هەبوو، خۆی ناوی (عەبدوڵڵا) بوو نازناوەکەشی لەوە وەرگیرا بوو: کاتێك بڕیاری موسوڵمانان بوونی دابوو خزمانی ڕێگریان لێکردبوو، وە هەموو جل و بەرگەکەیان لەبەر داکەندبوو بۆ ئەوەی نەتوانێ بڕوات و بچێتە ڕیزی موسوڵمانانەوە، تەنها یەك جەواڵی زبری خەت خەتیان بۆ جێهێشتبوو، ئەویش بە ڕووتی بەبێ جل وبەرگ بە ڕاکردن خۆی لێیان دەرباز کردو لە ڕێگا جەواڵە زبرەکەی کردە دوو کەرتەوە یەکێکیانی وەك پەشتەمال لەخویەوە ئاڵاند ئەوی تریانی دا بەسەر شانیدا بەو جۆرە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی وترا [زو لبەجادەین][٩٢٥]. واتە: خاوەنی دوو جەواڵەکە.

[عەبدوڵڵا کەسێك بوو قورئانی زۆر دەخوێندەوە و زیکرو یادی خوای زۆر دەکرد و دوعای زۆر دەکرد و دەنگی پێ بەرز دەکردەوە لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو نازناوەی لێنا][٩٢٦].

---

(٩٢٤) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (١٩٨٧٨)، وأحمد (٢٢٣٣٥) وقال محققه: اسناده ضعيف، وضعفه الشيخ الالباني في (الضعيفة) (٣٠٥٠)، و (ضعيف الجامع) (١٥٥٧).

(٩٢٥) انظر: (سيرة ابن هشام) (١٤٥/٤) (١٠٨٢)، و(حلية الاولياء) (٣٦٥/١)، و (اسد الغابة) (١٧٠/٢) والبيهقي (الشعب) (٢٣٦٨) وقال محققه: اسناده ضعيف.

(٩٢٦) أخرجه: أحمد (١٧٤٥٣) وقال محققوه: حسن لغيره، والطبري (التفسير) (١٧٤١٨)، والطبراني (الكبير) (٨١٣/٧) وقال الهيثمي (المجمع) (٣٦٩/٩): اسناده حسن.

لە گێڕانەوەکەی ئیبنو ئەدرەعدا ﷺ دەفەرموێت: [شەوێکیان من لە پاسەوانی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم و چوومە دەرەوە دەستی منی گرت و لەگەڵ خۆی بردمی.... ڕۆیشتین بەلای پیاوێکدا نوێژی دەکرد و قورئانی دەخوێندەوە... وتم: وادیارە ئەوە ڕیابازە؟ فەرمووی: ((نا ئەوە کەسێکی (ئەوابە) واتە: لە هەموو ساتەکاندا هەر بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە)) [یاخود کەسێکی زۆر نزاکارە][٩٢٧].

عەبدوڵلا ﷺ لە تەبوك وەفاتی کرد: عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ﷺ دەفەرموێت: [لە تەبوك بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نیوەی شەو هەستام ئاگر بەدەستێکم بینی لەو سەری سەربازگەکەوە، وەمنیش بەردەوام سەیرم دەکرد تەماشام کرد ئەوە تەرمی عەبدوڵلا زولبەجادەینە و پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو بەکری لەگەڵدایە، گۆڕیان بۆ ئامادە دەکرد چووم تەماشام کرد ئەبوبەکر و عومەر تەرمەکە شۆڕ دەکەنەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو گۆڕەکە لێیان دەگرێت و دەفەرموێت: ((ئەو برایەتانم لێ نزیك بکەنەوە و بیدەنە دەستم)) ئەو پیاوەش ئەوە بوو کە دەنگی بەرز دەکردەوە لە کاتی یاد کردنی خوا][٩٢٨]. [ئەوانیش دایانە دەستی و لەسەرلا لەگۆڕەکەی داینا بەدەستی خۆی. ئیبنو مەسعودیش ﷺ دەفەرموێت: خۆزگە من ئەو خاوەن گۆڕە دەبووم][٩٢٩].

لە گێڕانەوەیەکی تردا: جابر ﷺ دەفەرموێت: [پیاوێك هەبوو بە دەنگی بەرز یادو زکری خوای دەکرد، پیاوێك وتی خۆزگە ئەو دەنگی بەرز نەدەکردەوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەوە کەسێکی نزاکارە)) دواتر مردو پیاوێك ئاگرێکی بینی لە لای گۆڕێکدا لە شەودا هات و تەماشای کرد ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ لەناو

(٩٢٧) أخرجه: أحمد (١٨٩٧١) وقال محققوه: اسناده ضعيف، والطبراني (الكبير) (١٧٤٣) و (٢٥٤/١٧)، والبيهقي (الشعب) (٥٧٦) وقال محققه: رجاله ثقات، وقال الحافظ (المطالب) (٩٢٢٨): اسناده حسن، وقال البوصيري (الاتحاف) (١٤٦): رجاله ثقات على شرط مسلم، وحسّن اسناده الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٧٠٩) و (صحيح ابن ماجة) (١٢٣٤).

(٩٢٨) أخرجه: ابوداود (٣١٦٤)، والحاكم (٣٤٥/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الشعب) (٥٧٨) وقال محققه: اسناده حسن، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٢١٩): حديث حسن، وقال النووي (المجموع) (١٦٩/٥): على شرط البخاري.

(٩٢٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٤٥/٤) (١٠٨١) وقال محققاه: اسناده ضعيف، وابونعيم (الحلية) (١٣٩/٤)، وابن منده كما في (الاصابة) (٤٨٠) وسنده جيّد كما في (صحيح السيرة) (٧٤٥) وقال ابن كثير (البداية) (٢٣/٥) للحديث طرق اخرى يتقوى بها، والحديث حسن كما في (صحيح السيرة ابن هشام) (١٨٨٧).

گۆڕەکەدا دەفەرمویێت: ((تەرمی هاوەڵەکەتان بدەنە دەستم)) و تەماشای کرد تەرمی ئەو کەسەبوو کە بە دەنگی بەرز زیکرو یادی خودای دەکرد....][٩٣٠].

**٢- ڕوونکردنەوەی هەندێك لە نیشانەکانی ئاخرزەمان:**

عەبدوڵلای کوڕی مالیك ﷺ دەفەرمویێت: [لەتەبوك چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتا ساتەکانی پارشێو دا ئەو لە دەوارێکدا بوو لە پێستە دروست کرابوو چوومە خزمەتی و سڵاوم لێکرد پاشان وتم: بێمە ژوورەوە؟ فەرمووی: ((بەڵێ وەرە ژورەوە)) منیش تەنها سەرم بردە ژوورەوە وتم: هەندێك لاشەم بێتە ژوورەوە یان هەمووی؟ فەرمووی: ((هەمووی)).

ئینجا چوومە خزمەتی، لەوکاتەدا دەست نوێژی دەگرت بەشێنەیی. لەلای دانیشتم فەرمووی: (([یَا عَوْف بن مَالك] [أَعِدْ سِتَّ خِصَالٍ] بَيْنَ يَدِي السَّاعة أَوَلُهُنَّ مَوْتُ نَبِيِّكُمْ [قُلْ] إِحدى)) واتە: (([عەوفی کوڕی مالیك] [شەش شت بژمێرە] لە پێش هاتنی قیامەتدا: یەکەمیان مردنی پێغەمبەرەکەتە، بڵێ ئەمە یەك)) منیش وتم: ئەوە یەك و غەم و پەژارەیەکی زۆر گەورە توشم هات کەپێشتر لەژیاندا غەم و پەژارەی وەهام نەهاتۆتە ڕێ [ودەستم کردە گریان [تا هێمنی کردمەوە و بێ دەنگی کردم].

پاشان فەرمووی: ((وَالثَّانِيَةُ فَتْحُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ [قُل] اثْنَتَين)) واتە: ((وە دووەمیان: ئازاد کردنی شاری قودسە بڵێ: دووەم))؟ منیش وتم: دووەم، پاشان فەرمووی: ((وَالثَّالِثِةِ يَفِيضُ فِيْكُم المال حَتى يُعطي الرَّجل مِنْكُمْ مِائةَ دينار فَيَظَلُّ مُتسخطاً [قُلْ]: ثلاثاً)) واتە: ((پارە بە لێشاو لەناوتاندا زیاد دەبێت تا وای لێ دێت یەکێك لە ئێوە گەر سەد دیناری بدرێتی بەردەوام پێی ناڕازی دەبێت. بڵێ: سێهەم)) منیش وتم: سێیەم.

فەرمووی: ((والرابعة مُوتَان يَكُونُ فى أُمَّتِي [وَهو داءٌ ييَأْخُذُهُم] كَقُعَاصِ الْغَنَمِ [قل] أربعاً)) واتە: ((چوارهەمیان دەردێکتان لەناودا بڵاو دەبێتەوە وەك دەردی لەناوبەری مەڕ، بڵێ: چوارەم؟ منیش وتم: چوارهەم.

پاشان فەرمووی: ((وَالْخَامِسَةُ فِتْنَةٌ لا يَبْقى فِيكُمْ، [مِن العَربِ] بَيْتُ وَبَرٍ وَلَا مَدَرٍ إِلَّا دَخَلَتْهُ قُلْ: خَمْسًا . قُلْتُ: خَمْسًا))((ئاژاوەیەك لە ناوتاندا بڵاودەبێتەوە دەچێتە ناو هەموو ماڵێکی

(٩٣٠) أخرجه: الحاكم (٣٦٨/١) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي (الشعب) (٥٧٩) وقال محققه: اسناده حسن.

عەرەب ئەوەی لە خانوودایە و ئەوەی لەدەرەوەدایە، بڵێ: پێنجەم منیش وتم: پێنجەم)).

پاشان فەرمووی: ((وَالسَّادِسَةُ هُدْنَةٌ تَكُونُ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ بَنِي الْأَصْفَرِ فَيَجْتَمِعُونَ لَكُمْ قَدْرَ حَمْلِ امْرَأَةٍ، ثُمَّ يَغْدِرُونَ بِكُمْ فَيُقْبِلُونَ فِي ثَمَانِينَ رَايَةٍ تَحْتَ كُلُّ رَايَةٍ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا)) [٩٣١] واتە: ((شەشەمیان ئاگر بەستێکە لە نێوان ئێوە و ڕۆمەکاندا وە لە ماوەی سك پربوونی ئافرەتێکدا لە هەموو لایەکەوە ئەوان سەربازتان لێکۆدەکەنەوە، پاشان غەدرتان لێ دەکەن لە ژێر هەشتا ئاڵادا هێرش دێننە سەرتان و هەموو ئاڵایەك دوانزە هەزار سەربازی لەژێردا دەبێت))].

## ٣- ڕاکردن لە نەخۆشی تاعون:

عکریمە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: [لە غەزای تەبوکدا][٩٣٢] پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (([إِنَّ هَذَا الطَّاعُونَ رِجْزٌ وَبَقِيَّةُ عَذَابٍ][٩٣٣] واتە: (([ئەو نەخۆشی تاعونە چەپەڵی و پاشماوەی سزایەکە] [ عُذِّبَ بِهِ الْأُمَمُ قَبْلَكُمْ، فَإِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ فِي أَرْضٍ] [فَلا تَدْخُلُوهَا عَلَيْهِ وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا، فَلا تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ]))[٩٣٤] واتە: [گەلانی پێش ئێوە پێی سزا دراون گەر ئێوە لە جێگەیەکدا بوون هەواڵی ئەو نەخۆشیەتان پێ گەیشت] [ئێوە مەچنە ناو ئەو جێگەیەوە و گەر ئێوە لە جێگەیەك بوون تیایدا بڵاو بووەوە لەو جێگەیە دەر مەچن و لێی ڕامەکەن])).

## ٤- ئازاد کردنی کۆیلە:

واسیلەی کوڕی ئەسقەع ﷺ دەفەرموێت: [ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووین ﷺ لە غەزای تەبوك و لەوکاتەدا کەسانێك لە هۆزی سولەیم هاتنە خزمەتی وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاوڕێیەکمان مرد و بەهۆی تاوانەکانیانەوە تیاچووە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((أَعْتِقُوا عَنْهُ رَقَبَةً يُعْتِقِ اللهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْوًا مِنْهُ مِنَ

(٩٣١) أخرجه: ابن ابي شيبة (١٠٤/١٥)، والبخاري (٣١٧٦)، وابوداود (٥٠٠٠)، وأحمد (٢٣٩٧٩،٢٣٩٨٥) وقال محققوه اسناده صحيح على شرط مسلم، وابن ابي عاصم (السنة) (١٢٨٨)، والطبراني (الكبير) (١٨/(٧١،٧٢)٩٨٦)، وابوعمر والداني (الفتن) (٥٢٥) واللفظ له والزيادات للطبراني واحمد.

(٩٣٢) أخرجه: أحمد (١٥٤٣٦) وقال محققه: صحيح لغيره، وقال الهيثمي (المجمع) (٣٠٦/٤): رواه أحمد واسناده حسن.

(٩٣٣) أخرجه: أحمد (١٥٧٧) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

(٩٣٤) أخرجه: أحمد (١٦٧٨،١٦٧٩) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

النَّارِ))[٩٣٥] واتە: ((كۆیلەیەكی بۆ ئازاد بكەن و بە هەموو ئەندامێكی لاشەی كۆیلەكە خودا هەموو ئەندامی لاشەی مردوەكەتان ئازاد دەكات لە ئاگری دۆزەخ))].

### ٥- مامەڵەی بازرگانی:

عەبدوڵلای كوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ دەفەرموێت: [لە غەزای تەبوك] لە ناوچەی شام ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا بووین ﷺ، هەندێك لە خەڵكی ئەنباتی ناوچەی شام دەهاتن و ئێمە گەنم و [جۆ] و ڕۆنمان بەقەرز لێوەردەگرتن بە نرخێكی دیاری كراو و[كێشانەیەكی دیاری كراو] و بۆ ماوەیەكی دیاری كراو، پێی وترا: ئەوان لە كوێوە ئەوانەیان دەهێنا؟ فەرمووی: ئێمە پرسیارمان لەوبارەیەوە لێ نەدەكردن))][٩٣٦].وە عەبدوڵلای كوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: [پەنیرێكیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا لە تەبوك داوای چەقۆیەكی كرد پاشان ناوی خوای هێناو بەش بەشی كرد][٩٣٧].

## ناردنی خالید بۆ ناوچەی دومەتول جەندەل

عورەوە ﷺ و موسای كوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموون:

[پێغەمبەری خوا ﷺ خالیدی كوڕی وەلیدی ﷺ لە ناوچەی تەبوكەوە[٩٣٨] لەگەڵ چوار سەد و بیست سواردا نارد بۆ لای سەركردەیەك كەناوی ئوكەیدەری كوڕی عەبدولمەلیك بوو لە ناوچەی دومەتول جەندەل لەو كاتەدا ئوكەیدەری پاشای هۆزی كیندە گاور بوو پێغەمبەری خوا ﷺ [بە خالیدی ﷺ فەرمووی: ((گەر ئوكەیدەرت بەردەست كەوت مەیكوژەو بیهێنە بۆلام وە گەر قایل نەبوو ئەوكات بیكوژن))][٩٣٩]. خالید وتی: چۆن بگەمە لای لە كاتێكدا ئەو لە ناوەڕاستی هۆزەكانی كەلبە دایە [وە

---

(٩٣٥) أخرجه:أحمد (٢١٠٦١) وقال محققوه: حديث صحيح

(٩٣٦) أخرجه: البخاري (٢٢٤٤)، والحاكم (٤٥/٢) وصححه ووافقه الذهبي. واللفظ له وللبخاري.

(٩٣٧) أخرجه: ابوداود (٣٨١٩)، وقال الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٣٢٣٥): حسن الاسناد.

(٩٣٨) وهو الراجح وان كان في رواية عروة: (ولما توجه رسول الله ﷺ قافلًا الى المدينة وهذا يفيد ان ذلك وقع قبل مغادرة المسلمين تبوكاً: وهو قول ابن كثير البداية (٦٧٠/٤).

(٩٣٩) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٢٩٨).

منیش چەکداری زۆرم لەگەڵدا نییە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سَتَجِدهُ يَصِيدُ الْبَقَرَ فَتَأْخُذهُ، [لَعَلَّ اللهَ- عَزَّ وَجَلَّ- يُلَقِّيكَ أُكَيْدِرَ ... يَقْتَنِصُ فَتَقْتَنِصُ الْمِفْتَاحَ وَتَأْخُذهُ فَيَفْتَحُ اللهُ لَكَ دُومَةَ]))[٩٤٠] واتە: ((تۆ دەگەیتە ئەوێ و ئەو لەو کاتەدا ڕاوە مانگای بیابان دەکات [بەڵکو خوای گەورە لەو ساتەدا ئەو کلیلەت دەست بخات وە تۆش بەهۆیەوە هەموو ناوچەی دومە ئازاد بکەیت)).

لە گێڕانەوەیەکی تردا فەرمووی: [انْطَلِقُوا فَإِنَّكُمْ تَجِدُونَ أُكَيْدِرَ دُومَةَ خَارِجًا يَقْتَنِصُ الصَّيْدَ فَخُذُوهُ أَخْذًا][٩٤١] واتە: (([بڕۆن ئێوە لە کاتێکدا دەیبیننەوە ئەو لە قەڵاو ناوچەکەی چۆتە دەرەوە و سەرقاڵی ڕاو کردنە ئێوەش بە ئاسانی دەیگرن] [و لە پاشان ئەو بنێرنە لام و مەیکوژن و ئابلۆقەی قەڵاکەی بدەن][٩٤٢] [گەر نەتانتوانی دەست گیری بکەن بیکوژن]))[٩٤٣].

خالید و ئەسپ سوارەکان دەرچوون و بەڕێکەوتن [.... تا گەیشتنە ئەو ناوچەیە و لە پشتی قەڵاکەیانەوە خۆیان مەڵاسدا بۆی، تا بێتەدەر لەسەر مژدەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ وە دەست گیری بکەن] بە جوانی چاودێری قەڵاکەیان دەکرد لە شەوێکی هاوینی مانگە شەودا بوو. ئوکەیدیر لەو شەوەدا خۆی و دوو ژنەکەی لەسەر دیواری قەڵاکەیان بوون بە هۆی گەرماوە و کچێکیان لەگەڵ بوو گۆرانی بۆ دەوتن، پاشان داوای شەرابی کرد و خواردیەوە [لەو کاتەدا مانگا بەرەڵاکان شاخەکانیان لە دەرگای قەڵاکە دەخشاند و یەکێك لە ژنەکانی کەناوی ڕەبابی کچی ئونەیفی کچی عامر بوو تەماشای دەرەوەی قەڵاکەی کرد] مانگاکانی بینی لەبەر دەرگای قەڵاکەدا وتی: تا ئیستا گۆشتی زۆری ئاوهام نەدیوە [ئوکەیدەریش وتی: شتی وەها لە کوێیە؟ ئەویش وتی: [ئەوەتا مانگاکان شاخەکانیان دەخشێنن لە دیوارو دەرگای قەڵاکە] ئایا تۆ تا ئێستا شتی وەهات بینیوە؟ وتی: نەخێر.

پاشان هاوسەرەکەی وتی: کێ هەیە دەستبەرداری شتێکی ئاوها ببێت؟ وتی: هیچ کەسێك... سوێند بە خوا تا ئیستا بەشەو مانگای بەو جۆرە لێمان نزیك نەبوونەتەوە،

(٩٤٠) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٥٣/٥) من رواية عروة بن الزبير ﷺ.

(٩٤١) أخرجه: الحاكم (٥١٩/٤) وصححه ووافقه الذهبي.

(٩٤٢) اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٥٣/٥) من رواية غزوة.

(٩٤٣) أخرجه: النسائي (الكبرى) (٨٨٣٧).

من پێشتر یەك مانگ ئەسپم بۆ تەرخان دەکرد و مەشقم پێدەکرد. [ئوکەیدیر کاتێك ئەوەی بینی وروژا] داوای کرد چەندەها کەس لە بنەماڵەکەی و کەسانی تر بێن بە خۆیان و ڕایەڵەکانیانەوە تا بچنە دەر و ڕاویان بکەن، دواتر دەرگای قەڵاکە کرایەوە و هەموو شوێنی مانگاکان کەوتن و لە قەڵاکەیان دوور کەوتنەوە و سەرقاڵی ڕاو کردنیان بوون لەو ناوچەیەدا، خالید و سەربازەکانی بۆسەیەکی زۆر باشیان بۆ دانابوون وە هەرکە نزیك بوونەوە دەست بەجێ موسوڵمانان هەموویان دەست بەسەرکردن جگە لە حەسانی برای ئوکەیدیر خۆی بەدەستەوە نەداو شەڕی کرد و کوژرا وە چەند کەسێکی خزمی خۆی لەگەڵ دوو کۆیلەیان دەرباز بوون و هەڵاتن و گەڕانەوە ناو قەڵاکە.

بەڵام لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: [ئوکەیدیر و هەموو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون هەموو دەست بەسەرکران]. [دواتر خالید بە ئوکەیدیری وت: من پەنات دەدەم و ناتکوژم و دەت بەمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بەمەرجێك قەڵاکەتم بۆ بکەیتەوە؟ ئەویش بەو پێشنیارە قایل بوو، ئینجا خالید بە خۆی و دەست بەسەرکراوەکانیەوە چوونە نزیك دەرگای قەڵاکە و ئابڵوقەیان دان، دانیشتوانی قەڵاکە لەسەر دیواری قەڵاکەیانەوە تەماشای موسوڵمانانیان دەکرد و قسەیان لەگەڵ دەکردن][٩٤٤]. [لەوێدا ئەبو بەکر ﷺ پێی فەرموون: ئایا باسی موحەممەدتان نەبینیوە لە ئینجیلدا؟ وتیان: نەخێر باسی ئەوی تێدا نییە. فەرمووی: بەڵێ سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە باسی لەوێدا نوسراوە بەوێنەی قەرمشەت نەك قەرشمەت، دە ئێوە باشتر تەماشای ئینجیلەکەتان بکەن. ئەوانیش کە تەماشایان کرد وتیان: [لە کتێبەکەماندا هاتووە باسەکەی ئەو لە قوڕەیشیەکان دەچێت][٩٤٥].

لەوێدا ئوکەیدیر بانگی لە خزم و بنەماڵەکەی کرد وتی: دەرگای قەڵاکە بکەنەوە [خەڵکەکە شڵەژان و ویستیان دەرگاکەی بۆ بکەنەوە بەڵام برایەکی ئوکەیدیر ناوی (موزاد) بوو نەیهێشت دەرگاکە بکرێتەوە. ئوکەیدیر بە خالیدی وت [پیاوەکە] بزانە سوێند بەخوا ئەوان تا من ببینن بەدەستبەسراوی دەرگاکەت بۆ ناکەنەوە، لەبەر ئەوە دەستم بکەرەوە من بەڵێنت دەدەمێ بە خوا و ئەمانەت پارێزراوی

(٩٤٤) أخرجه: الحاكم (٥١٩/٤) وصححه ووافقه الذهبي.

(٩٤٥) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٥٣/٥).

خۆم دەرگاکەت بۆ دەکەمەوە، گەر تۆ بوارم بدەیتێ تا دەچمە ژوورەوە و لەگەڵیان ڕێك دەکەوم [چونکە براکەم تا من بە دەست بەسراوی ببینێت دەرگاکە ناکاتەوە، خالیدیش دەستی کردەوە و ئازادی کرد و چووە ژوورەوە و قایلی کردن و دەرگای قەڵاکەی بۆ موسوڵمانان کردەوە و خالید و هاوڕێکانی هەموو چوونە ژوورەوە، دواتر خالید وتەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆیان گێڕایەوە لەگەڵ فەرمانەکەیدا. ئوکەیدیر وتی: سوێند بە خوا ئەوان تا ئێستا لە قەڵاکەمان نزیك نەبوونەتەوە جگە لە دوێنێ، من پێشتر ئەسپی تیژڕەوی تایبەتم بۆ ڕاوکردنیان تەرخان دەکرد و ڕۆژ و دوو ڕۆژ بەدوایاندا دەگەڕام، بەڵام دیارە ئەمەش قەدەرێکی تایبەت بووە][٩٤٦]. خالید وتی: من لەگەڵت ڕێك دەکەوم. ئوکەیدیر وتی: گەر دەتەوێت یان تۆ بڕیار بدە یان خۆم بڕیار دەدەم؟ خالید وتی: ئێمە خۆت چیمان بدەیتێ پێی ڕازی دەبین. ئوکەیدیریش پێك هات لەگەڵیان کە دوو هەزار وشتریان بداتێ.

لە گێڕانەوەیەکی تردا: هەزار وشترو هەشت سەد کۆیلە و چوار سەد زرێ و چوار سەد ڕمیان بداتێ و خۆی و براکەی لەگەڵ خالیدیش دەڕۆن بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ تا بڕیاری خۆی بدات لەسەریان. خالیدیش بەو پێشنیارانە ڕازی بوو وە هەموو ئەو شتانەی لەگەڵ خۆی هێنا [ئوکەیدیر و موزادی براشی لەگەڵدا بوون] وە بە هاوڕێیەتی [یەحنەی کوڕی ڕوئبەی سەرکردەی ئیلە] ڕۆیشتن تا گەیشتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵیان ڕێکەوت لەسەر باجدان و ئازاد کردن [ئوکەیدیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم پێ گەیشتووە کە ئەسپ سوارانت دەرچوون بۆ هێرش بردن منیش لەسەر و خاك و ماڵم دەترسم، تۆ نوسراوێکم بۆ بنوسە تا دەست لە هیچ موڵك و سامانێکی منەوە نەدەن ومن قایل دەبم بە هەموو ئەوانەی کە لەسەری لەگەڵم پێك هاتوویت؟

پێغەمبەریش ﷺ فەرمانیدا ئەو نوسراوەی بۆ بنوسرێت. پاشان ئوکەیدیر پۆشاکێکی ئاوریشمی بە ئاڵتون چنراوی دەرهێنا لەوانەی کە پێشتر کیسرا کردبوویە دیاری بۆیان تا ئەویش بیکاتە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( ارْجِعْ بِقَبَائِكَ فَإِنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ يَلْبَسُ هَذَا فِي الدُّنْيَا إِلَّا حُرِمَهُ فِي الْآخِرَةِ))

---

(٩٤٦) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٥٢/٥) من رواية عروة بن الزبير ﷺ.

واتە: ((پۆشاکەکەت ببەرەوە، هەرکەسێك ئەوە لەبەر بکات لە دونیادا لێی بێ بەش دەکرێت لە قیامەتدا)). ئەویش زۆری لە دڵگران بوو دیاریەکەی بەسەردا بدرێتەوە بۆیە بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە بنەماڵەیەکین زۆرمان بەلاوە گرانە دیاریەکەمان بەسەردا بدرێتەوە، لەبەر ئەوە داوات لێدەکەم لێمان وەربگریت. ئوکەیدیر دیاریەکەی لێ وەرگیرا.

[ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: دواتر موسوڵمانان دەستیان لە پوشاکەکە دەداو سەرسام بوون پێی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((أَتَعْجَبُونَ مِنْ هَذَا؟ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَمَنَادِيلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فِي الْجَنَّةِ أَحْسَنُ مِنْ هَذَا))[٩٤٧] واتە: ((سەرسام بوون بەمە؟ سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە پۆشاك و دەستە سڕەکانی سەعدی کوڕی موعاز لەبەهەشتدا لەوە باشترە))].

لە گێڕانەوەیەکی تردا: [ئوکەیدیر پۆشاکێکی ئاوریشمی کردە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵان دەستیان لێ ئەداو سەرسام بوون بە نەرمیەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سەرسام بوون لە نەرمی ئەو پۆشاکە؟ سەعدی کوڕی مەعاز پۆشاکەکانی لەبەهەشتدا لەوە چاکتر و نەرم ترە))][٩٤٨]. دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئوکەیدیری فەرموو: ((بڕۆ ئەو پۆشاکە بدەرە عومەر)). دواتر عومەر هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی: ئایا هیچ لەمندا ڕووی داوە تۆ سەبارەت بەو پۆشاکە بەو جۆرەت فەرموو پاشان بۆ منت نارد؟ پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی تا دەستی بەدەمیەوە گرت و پاشان فەرمووی: ((ما بُعِثْتُ إِلَيْكَ لِتلبسَهُ، وَلَكِنْ تَبْيعه فَتَسْتَعِينَ بِثَمَنِهِ))[٩٤٩] واتە: ((من بۆ لاتم نەنارد تا لەبەری بکەیت، بەڵکو بۆ ئەوەی بیفرۆشیت و سود لە پارەکەی وەربگریت)). لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: [پاشان عومەر کردیە دیاری بۆ برا موشریکەکەی لە مەککە][٩٥٠].

---

(٩٤٧) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٤٣/٤) (١٠٧٨) وقال محققاه: اسناده حسن، وقال صاحب (صحيح سيرة ابن هشام) (١٨٨٤): اسناده صحيح.

(٩٤٨) أخرجه: البخاري (٣٨٠٢)، ومسلم (٢٤٦٨، ٢٤٦٩).

(٩٤٩) أخرجه: ابويعلى كما في المطالب (٢٣٦٢)، و(الاتحاف) (٥٤٣٦) وصحح اسناده كما في (مختصر الاتحاف) (٤٧٢٤)، وابن طولون (اعلام السائلين) ص:(١٣٦)، واسناد الحديث قويّ كما في (المغازي) للذهبي ص:٦٤٦، و (فتح الباري) عند الحديث (٣٦١٥)، و (السيرة في ضوء مصادرها الاصلية) (ص:١٢٨).

(٩٥٠) أخرجه: البخاري (٢٦١٢)، (٢٦١٩) واخوه اسمه: عثمان بن حكيم كما في (الفتح) (٤٥/١١).

عومەر ﷺ دەفەرموێت: (سەرکردەی ناوچەی ئیلە ناوی یەحنەی کوڕی ڕوئبە بوو، پێشتر پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوایدا نارد بوو. لەگەڵ ئوکەیدیردا هەردووکیان گەیشتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هەردووکیان ڕێکەوت و پێك هات لەسەر تەواوی ناوچەکانی تەبوك و دەومەتول جەندەل و ئیلە و تەیما و فەرمانیدا ڕێکەوتن لەگەڵیان بنوسرێت و مۆربکرێت](٩٥١).

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: (یەحنەی کوڕی ڕوئبەی خاوەنی ناوچەی ئیلە هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ [لەگەڵی پێك هات و باجی خۆی پێ بەخشی، هەروەها سەرکردەکانی ناوچەی جەبار و ئەزرەحیش هاتن و باجیاندا و بەهەمان شێوە لەگەڵی ڕێکەوتن و نوسراویان بۆ نوسرا و درایە دەستیان...](٩٥٢).

لە گێڕانەوەکەی ئەبو حەمەیدی ساعیدی دا ﷺ هاتووە: (نێرراوی ئیبنو عەلمای ناوچەی ئیلە گەیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و نامەیەکی بۆ هێنا لەگەڵ دیاریەکدا کە هێسترێکی سپی و چەند پۆشاکێك بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا نامەیەکی خاوەندارێتی ناوچە دەریاییەکەی خۆیانی بۆ بنوسرێت و پێیان درا...)(٩٥٣).

هۆکاری هاتنی سەرکردەکانی ناوچەی ئیلە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەبوو ئەوان ترسان لەوەی کە سوپایان بنێردرێتە سەر وەك چۆن نێردرایە سەر ئوکەیدیر. (پێغەمبەری خوا ﷺ پەیوەندی بە نێردراوانی هۆزە گاورەکانی ئەو ناوچەیەوە دەکرد و پەیمان و ڕێك کەوتنی لەگەڵ دەبەستن و لەو ڕێگەوە پەیوەندیەکانی ئەوانی لەگەڵ دەوڵەتی بێزەنتینیەکاندا دەپچڕاند، وە ئەوانەی دەکردە هاوڵاتی و هاوپەیمانی دەوڵەتی ئیسلامی و ئەوەش مەبەستی سەرەکی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ لە ململانێ کەیدا لەگەڵ ڕۆمەکان)(٩٥٤). بەو جۆرە هەموو ئەو ناوچانە کەوتنە ناو دەوڵەتی ئیسلامی و لە ژێر سایەی ئەواندا دەژیان.

---

(٩٥١) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص: ٢٩٨)، والبيهقي (الدلائل) (٢٥٢/٥) عن عروة بن الزبير.

(٩٥٢) أخرجه: موسى بن عقبة في (المغازي) (ص:٣٠٠)، ابن هشام (السيرة) (١٤٢/٤) (١٠٧٦)، والبيهقي (الدلائل) (٢٤٧/٥)، وابوداود (٣٠٣٧)، وحسن اسناده الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٦٢١)، والقصة كلها من رواية موسى بن عقبة والزيادات لعروة ﷺ والحاكم والنسائي والبيهقي وابي يعلى وابن هشام والطبري.

(٩٥٣) أخرجه: البخاري (١٤٨١)، ومسلم (١٣٩٢،٢٢٨١) (٥٩٠٧) واللفظ له، وأحمد (٢٣٦٦٥).

(٩٥٤) انظر: (دراسة في السيرة) (ص:٣٠٤).

## نامەبەری قەیسەر دەگاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەبوك

ئەم بەسەرهاتە بەچەندەها ئیسنادی لاواز گێڕراوەتەوە و ئێمەش تەنها بۆ زانیاری و ئاگاداربوون لێی دەهێنین:

سەعیدی کوڕی ڕاشیدی تەنوخی دەڵێت: (کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ غەزا گەیشتە ناوچەی تەبوك لەوێدا نامەیەکی نارد بۆ قەیسەر و نامە هەڵگرەکە ناوی (دحیەی کوڕی خەلیفە) بوو هیرقل نامەکەی خوێندەوە و پاشان لەسەر تەختی خۆی داینا و داوای کرد هەموو سەرکردەو ناوداران و قەشەکان بێن بۆ لای، ئەوانیش هەموو هاتن [دواتر فەرمانی دا دەرگای هۆڵەکەیان لەسەر دابخرێت) ئینجا پێی وتن: ئەو پیاوە (لای داوەتە ئەو ناوچەیەی کە خۆتان دەزانن) و نامەیەکی بۆ ناردوون و سەرپشکتان دەکات لە نێوان سێ شتدا: یان ئەوەتا شوین ئاینەکەی دەکەون، یان ئەوەتا باجێکی دیاری کراوی دەدەنێ و لەسەر ماڵ و سامانی خۆتان دەمێننەوە لە وڵاتەکەتاندا، یان ئەوەتا لەگەڵی بەجەنگ دێن.

ئەوان هەموو بە یەك دەنگ هاواریان لێ بەرز بووەوە... وتیان: (تۆ بانگمان دەکەیت بۆ ئەوەی واز لە گاورێتی بهێنین؟) نا ئێمە هەرگیز واز لە ئاینی باو باپیرانمان ناهێنین و ناچینە سەر ئاینەکەی ئەو، ئێمە هەرگیز باج و سەرانەش نادەین (بە پیاوێکی عەرەب بەهەردوو جل و نەعلەکانیەوە هاتۆتە ئێرە) بەڵام ئێمە لەگەڵی بە جەنگ دێین. (هەرقل بێ ئومێد بوو لێیان و گومانی وابوو ئەوان ئەگەر لەوێ بچنە دەرەوە ڕۆمەکانی لێ هەڵدەگێڕنەوە بۆیە بە کۆششێکی زۆر هێوری کردنەوە) و (پێی وتن: ئارام بن من ئەوەم وت تا بزانم چەندە ئێوە پابەندن بە ئاینەکەتانەوە و لەلاتان بەنرخە) بەڵام من پێم ناخۆش بوو بڕیار بدەم بێ پرس کردن بە ئێوە. (پاشان پیاوێکی عەرەبی گاوری ناوچەی تەجیبی بانك کردوو پێی وت: پیاوێکم بۆ لا بنێرە عەرەب بێت و وتەکان باش لەبەر بکات، تا بینێرم و وەڵامی من بگەیەنێتە ئەو پیاوە). دەڵێت: ئەویش گەنجێکی بۆ پەیداکرد و برا بۆ لای هەرقل و وەڵامی نامەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ پێدا نارد و پێی وت: هەرشتێکت لە یاد چووبێت هەرگیز ئەم سێ شتە لەیاد نەکەیت: کە چوویتە لای تەماشای

بکە ئایا باسی شەو ڕۆژ دەکات، ئایا باسی نامەکەی بۆ لای من دەکات، تەماشای پشتی بکە بزانە نیشانەیەکی پێوە دیارە. گەنجەکە دەڵێت: منیش بەڕێ کەوتم گەیشتمە ناوچەی تەبوك (چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەوکاتەدا لەگەڵ هاوەڵانی دانیشتبوو لە چواردەوری بیرەکەی تەبوك) (وتم: پێشەواکەتان لە کوێیە؟ وتیان: ئەوەتا لەوێ، منیش ڕۆیشتم، لەبەردەستیدا دانیشتم نامەکەم پێداو کردیە باوەشیەوە) (پاشان دایە دەست پیاوێك لە تەنیشتی دانیشتبوو. وتم: ئەوە کێیە؟ وتیان: ئەوە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانە و نامەکەی بۆ دەخوێندەوە)

هرقل تێیدا نوسیبووی: تۆ من بانگ دەکەیت بۆلای بەهەشتێك پانتاییەکەی بەقەد ئاسمانەکان و زەویەکانە ئەی دۆزەخ لە کوێیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سُبْحانَ اللّه) ئەگەر شەو هات ڕۆژ لە کوێیە؟... پێشتر من نامەم نارد بۆ نەجاشی (بەڵام ئەو نامەکەی منی سوتاند و خوداش دەیسوتێنێت نامەم نارد بۆ کیسرا گەورەی فارسەکان ئەویش نامەکەی منی دڕاند (خوداش خۆی و سامانەکەی پارچە پارچە دەکات) (وە نامەم نارد بۆ قەیسەر ئەو نامەکەی منی بەرز ڕاگرت و خەڵکیش (تا ژیان بەردەوام بێت بەرزی ئەوان دەبینن) پاشان بە منی فەرموو: ((تۆ خەڵکی کوێیت؟)) وتم: تەنوخ. فەرمووی: ((ئەی برای تەنوخ وەرە ناو ئیسلامەوە ئاینەکەی ئیراهیمی باوکتە)). وتم: من نێرراوی قەومێکم وە لەسەر ئاینی ئەوانم و لێی هەڵناگەڕێمەوە تا نەگەڕێمەوە ناویان. پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی و ئەو ئایەتەی خوێندەوە: (﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾ (القصص)) واتە: (بێگومان تۆ ناتوانی ئەی پێغەمبەر ﷺ کەسێ بخەیتە سەر ڕێی ڕاست و بڕوا هێنان کە بۆخۆت خۆشت بوێت هەرچەندە هەوڵ و تەقالای لەگەڵدا بدەیت بەڵام خوا ڕێنمایی هەرکەسێ دەکا کە خۆی بیەوێ خۆیشی زاناترە بەوانە کە ڕێبازی هیدایەت دەگرن)

پاشان فەرمووی: ((تۆ نێردراویت و مافت هەیە گەر شتی باشمان لابووایە دەمان کردە دیاری بۆت بەڵام ئەوەتا ئێمە لەسەفەرداین خواردنی وەهامان لانەماوە)) یەکێك لەهاوەڵان بانگی کردوو وتی: من دیاریەکی پێ دەبەخشم، چارۆکەکەی هێنا و کردیە وە پۆشاکێکی سەفوری تێدابوو بەدیاری پێی دام و کردیە باوەشمەوە. وتم:

ئەو پیاوە کێیە؟ پێم وترا: ئەوە عوسمانە. پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کێ لە ئێوە ئەم پیاوە دەکاتە میوانی خۆی)) گەنجێکی ئەنساری وتی: من. پاشان من و گەنجەکە هەستاین برۆین پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی لێکردم [و زانی کە من سەیری پشتی دەکەم ئەویش کەمێك پۆشاکەکەی لەسەر شانی لابرد منیش تەماشای مۆری پێغەمبەرایەتیەکەیم کرد لەناوشانیدا بوو وەك [ناسەواری کەڵە شاخ وابوو] منیش چووم و ماچم کرد]...][955].

## گەڕانەوە بۆ مەدینە

جابر ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ بیست ڕۆژ لەناوچەی تەبوك مایەوە و نوێژی کورت دەکردەوە][956]. لە دوای بەسەر بردنی ئەو ماوەیە لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ موسوڵمانانی ئاگادارکردەوە کە خودا بوواریداون بگەڕێنەوە، ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەبوك هەستاو وتارێکی بۆ داین سەرەتا سوپاس و ستایشی خوای کرد و پاشان فەرمووی: ((إِنَّ اللَّهَ أَذِنَ لَكُمْ بِهَذَا الْمَسِيرِ، وَقَدْ أَذِنَ لَكُمْ بِالرُّجُوعِ))[957] واتە: ((خودا ڕێگەیدان ئەم ڕێ ڕۆیشتنە ئەنجام بدەن هەر ئەویش ڕێگەی دان بگەڕێنەوە]. وە لە گێڕانەوەیەکدا: [خوای گەورە فەرمانی پێدان بگەڕێنەوە بۆ مەدینە و پێغەمبەر ﷺ پێی وترا: ژیان و مردن و زیندو بوونەوەت هەر لە مەدینەدا دەبێت][958].

(٩٥٥) أخرجه: (أحمد (١٦٦٩٤،١٦٦٩٣،١٥٦٥٥) وقال محققوه: اسناده ضعيف ورجاله رجال الصحيح غير التنوخي، وابو يعلى (١٥٩٧) وقال محققه: رجاله ثقات، و ابن زنجوية (الأموال) (١٠٤،٩٦١) وقال مدارهُ على سعيد بن أبي راشد و هو مقبول كما في (التغتريب) (٢٩٥/١) و انظر: (الثقات) ابن حبان (٢٩٠/٤) و الحديث ضعيف، و أوردهُ: ابو عبيد (الأموال) (٦٢٥)، و الفسوي (التاريخ) (٢٧٦/٣)، و البيهقي (الدلائل) (٢٦٦/١)، و قال ابن كثير (البداية) (٢٧٠/٤): هذا حديث غريب واسناده لابأس به، وقال السندي (الذهب المسبوك) (ص:٣٢٨): اسناده جيّد.

(٩٥٦) أخرجه: (١٤١٣٩) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط الشيخين، وعبد الرزاق (٤٣٣٥)، وأبوداود (١٢٣٥)، وابن حبان (٢٧٤٩) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط الشيخين و صححه الشيخ الالباني في (صحيح أبي داود) (١٠٩٤) و(الإرواء) (٥٧٤).

(٩٥٧) أخرجه: ابن أبي عاصم (السنة) (٤٠٥) وقال محققه: الشيخ الألباني: اسناده حسن.

(٩٥٨) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٥٤/٥).

# ڕووداوەکانی گەڕانەوە

## ١- هەڵقوڵانی ئاو:

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [...پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو شاری مەدینە گەڕایەوە، لە ڕێگەی گەڕانەوەدا ئاوێك هەبوو لە ژێر بەردی چیایەك هەڵ دەقوڵا و بەشی سێ سواری دەکرد لە شیوێکدا ناوی: (موشەق) بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەرکەسێك پێشمان کەوت بۆ چوونە سەر ئەو کانییە ئاوی لێنەخواتەوە تا ئەو کاتە ئێمە دەگەینە سەری)) پاشان گەیشتە سەر کانییەکەو دەستی خستە ژێر بەردێکی ئەو کانییەو ئاوەکەی ڕژایە ناو دەستی پاشان هەندی دوعای خوێند، ئینجا ئاوەکە بە خوڕ دەڕژاو دەنگی وەك هەورە بروسکە بوو بەردەوام زیادی دەکرد، هەتا هەموو خەڵکەکە لێیان خواردەوە و ئاویی پێویستیان لەگەڵ خۆیان برد و پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((گەر ئێوە یان کەسێکتان بژین و بمێنن دەبینن ئەم شیوە بە پیتترین شوێنی ئەم ناوچەیە دەبێت..))][٩٥٩].

## ٢- مەزەنەکردن و خەمڵاندنی خورماکە:

لەکاتی بەڕێکەوتنی موسوڵمانان بۆ تەبوك گەیشتنە ناوچەی (وادی قورا) لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ خورمای بەدارەکەیەوە کرِی و خەمڵاندی بە (دە) (ویسق) خورما. لەگەڕانەوە دا گەیشتنەوە ئەو ناوچەیە:

ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ دەفەرموێت: (...پاشان گەڕاینەوە لە (تەبوك) تا گەیشتینە ناوچەی (وادی قورا) و لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی خاوەن باخەکەی کرد کەئافرەتێك بوو لێی پرسی: ((خورماکەت چەند بوو، یاخود: [خورمای باخەکەت چەندبوو؟] وتی: (دە) ویسق بوو. هەمان خەمڵاندنەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو))[٩٦٠]. نرخەکەی پێداو پاشان داوای ئاوی خواردنەوەی لە ئافرەتەکە

---

(٩٥٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٤٤/٤) (١٠٨٠)، والطبري (التأريخ) (١٠٩/٣)، وأورده البرزنجي في (صحيح الطبري) (٢٨٤)، وقال مجدي السيّد في (صحيح سيرة ابن هشام) (١٨٨٦): حديث صحيح.

(٩٦٠) أخرجه: أحمد (٢٣٦٠٤) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط البخاري ومسلم، و البخاري (١٤٨١)، ومسلم (١٧٨٦) واللفظ لهما.

کرد، سەلەمەی کوڕی موحبیق ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای تەبوك چووە ماڵێك و لە گۆشەیەکدا بینی مەشکەیەك هەڵواسرابوو [داوای کرد لە ئافرەتی ماڵەکە تا ئاوی خواردنەوەی بۆ بهێنێت، ئەویش وتی: ئاوم لانییە تەنها ئەوە نەبێت کە لەمەشکەی پێستێکی مردارەوەبوودایە. فەرمووی: ((ئایا پێستەکەیت دەباغ نەکردووە (واتە: پاککردنەوەی لەموەکانی بە خۆشەکردنی بە خوێ و شتی تر) )). ئافرەتەکە وتی: بەڵێ. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دەباغ کردنی پاك بوونەوەیەتی))][961].

## ٣- تێپەڕبوونی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بە ناوچەی حیجری خاکی سەمود دا:

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ﷺ دەفەرموێت: (لە غەزای تەبوکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا سوپاکە لە ناوچەی [حیجردا] لابدات لە لای ماڵە کەلاوەکانی سەمود و موسوڵمانان چوون ئاویان هەڵێنجا لەو بیرانەی کە ئەوان پێشتر ئاویان لێ دەبرد و دەخواردەوە، پاشان بەو ئاوە هەویریان شێلا و گۆشتیان هێنا کردیانە ناو مەنجەڵەوە و ئاگریان لە ژێر کردەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا لە ئاوی ئەو بیرانە نەخۆنەوە خەڵکەکە وتیان: ئێمە ئاومان لێ هێناوە هەویرمان پێ شێلاوە فەرمووی: (([اكْفَؤُوا الْقُدُورَ، وَاعْلِفُوا الْعَجِينَ الْإِبِلَ][962] واتە: [((مەنجەڵەکانتان قلْپ بکەنەوەو بیرِێژن و هەویرەکانتان بدەنە وشترەکانتان))]. [وَلا تَتَوَضَّؤُوا مِنْهُ لِلصَّلاةِ]))[963] واتە: [لەو ئاوە دەست نوێژ مەگرن بۆ نوێژەکانتان]. [بەو جۆرە فەرمانی پێکردن هەویرەکانیان فڕێ بدەن (بۆ وشترەکان) و ئاوەکەش بڕێژن][964].

ئەوانیش مەنجەڵەکانیان ڕشت و هەویرەکانیاندا بەوشترەکانیان و پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێدان ئەو ناوچەیە بەجێ بهێڵن و ڕۆیشتن تا

---

(٩٦١) أخرجه: أبو داود (٤١٢٥)، و النسائي (٤٢٤٣)، وأحمد (٤٧٦/٣)، و الحاكم (١٤١/٤) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٤٥٢٢) وقال محققه: صحيح لغيره، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٣٤٧٣)، و(صحيح النسائي) (٣٩٥٧)، و(غاية المرام) (٢٦).

(٩٦٢) أخرجه: البخاري (٣٣٧٩)، وابن حبان (٦٢٠٣) وقال محققه: اسناده على شرطهما.

(٩٦٣) أخرجه: ابن هيشام (السيرة) (١٣٨/٤)، وابن كثير (البداية) (٦٦٣/٤)، والطبري (١٠٥/٣) واسناده حسن مرسل كما في (السيرة الصحيحة) (٥٣٥/٢)، و(صحيح تاريخ الطبري) (٢٧٦).

(٩٦٤) أخرجه: البخاري (٣٣٧٩).

گەیشتنە سەر ئەو بیرەی کە وشترەکەی پێغەمبەر (صالح) لێی دەخواردەوە [و فەرمانی پێدان تەنها ئاوی ئەو بیرە بخۆنەوە کە وشترەکەی پێغەمبەر (صالح) لێی دەخواردەوە][٩٦٥]. داوای لە موسوڵمانان کرد نەچنە ناو ماڵ و پەرد و کەلاوەی ئەو ناوچانەوە و فەرمووی: ((إِنِّي أَخْشَى أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَهُمْ، فَلَا تَدْخُلُوا عَلَيْهِمْ))[٩٦٦] واتە: ((من لەوە دەترسم ئەوەی توشی ئەوان هات توشی ئێوەش ببێت لەبەر ئەوە نەچنە ناو ماڵ و کەلاوەکانیانەوە)).

لە گێڕانەوەیەکی تردا پێی فەرموون: ((لَا تَدْخُلُوا مَسَاكِنَ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ [إلاّ أَنْ تَكُونُوا باكِيْنَ حَذِراً] أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلَ مَا أَصَابَهُمْ))[٩٦٧] واتە: ((نەچنە ناو ماڵەکانی ئەوانەی ستەمیان لە خۆیان کردووە [مەگەر بەگریانەوە بە ناویاندا تێ پەڕن] نەبادا ئەوەی تووشی ئەوان هاتووە توشی ئێوەش ببێت))]. فەرمووی: ((لَا تَدْخُلُوا عَلَى هَؤُلَاءِ الْمُعَذَّبِينَ إِلَّا أَنْ تَكُونُوا بَاكِينَ [فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا بَاكِينَ فَلَا تَدْخُلُوا عَلَيْهِمْ] أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلَ مَا أَصَابَهُمْ))[٩٦٨] واتە: ((نەچن بۆ ناو ئەو سزا دراوانە تەنها بەگریانەوە بۆتان هەیە بچنە ناویان [گەر بەگریانەوە نەبێت نابێت بچنە ناویانەوە] نەبادا ئەوەی توشیان هاتووە تووشی ئێوەش ببێت))].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا لەناویاندا و وتاری بۆدان و فەرمووی: ((يَا أيها الناس] لَا تَسْأَلُوا نَبِيَّكُمُ الْآيَاتِ، هَؤُلَاءِ قَوْمُ صَالِحٍ سَأَلُوا نَبِيَّهُمْ آيَةً فَكَانَتِ النَّاقَةُ تَرِدُ عَلَيْهِمْ مِنْ هَذَا الْفَجِّ، وَتَصْدُرُ مِنْ هَذَا الْفَجِّ [وَكَانَتْ تَشْرَبُ مِائَهُمْ يَوماً] فَيَشْرَبُونَ مِنْ لَبَنِهَا يَوْمَ وُرُودِهَا مِثْلَ مَا غَبَّهُمْ مِنْ مَائِهِمْ [فَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ]، فَعَقَرُوهَا فَوُعِدُوا ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، وَكَانَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ، فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ [أَهْمَدَ اللَّهُ مَنْ تَحْتَ أَدِيمِ السَّمَاءِ]، فَلَمْ يَبْقَ تَحْتَ أَدِيمِ السَّمَاءِ رَجُلٌ إِلَّا أَهْلَكَتْ إِلَّا رَجُلٌ فِي الْحَرَمِ [الاّ رجلاً واحداً في الحرم] مَنَعَهُ الْحَرَمُ مِنْ عَذَابِ اللَّهِ»)) واتە: (([ئەی خەڵکینە] داوای موعجیزە مەکەن لە پێغەمبەرەکەتان، ئەوەتا قەومی صالح داوای موعجیزەیان لە پێغەمبەرەکەیان کرد، (لە ئەنجامدا) وشترەکە لەم شیوەوە دەهات و لەو شیوەشەوە دەڕۆیشت [ڕۆژێك ئاوی کانیاوەکەیان

---

(٩٦٥) أخرجه: مسلم (٤٠/٢٩٨١)، وابن حبان (٦٢٠٢) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط البخاري.

(٩٦٦) أخرجه: مسلم (٣٩/٢٩٨١، ٤٠)، وأحمد (٥٩٨٤) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما، وابن حبان (٦٢٠٣) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما وكذا قال ابن كثير (البداية (٦٦٤/٤).

(٩٦٧) أخرجه: البخاري (٤٤١٩)، ومسلم (٣٩/٢٩٨٠) واللفظ للبخاري و الزيادة لمسلم.

(٩٦٨) أخرجه: البخاري (٤٤٢٠)، ومسلم (٣٩/٢٩٨٠). وللفظ للبخاري و الزيادة لمسلم.

بۆ وشترەکە بوو] لە ڕۆژدا ئەوان لە جیاتی قەدەغەکردنی ئەو ئاوە لێیان شیری وشترەکەیان دەخوارد [و لە دوایدا سەرکێشیان کرد لە فەرمانی خودای خاوەنیان] و وشترەکەیان کوشت و ماوەی سێ ڕۆژیان پێدرا بۆ تەوبەکردن وە بەڵێنی خوداش بە درۆ ناخرێتەوە، دواتر نەعرەتەو گرمەی گەورەیان بەسەردا هات [خودا هەموو ئەوانەی لە ژێر ئاسمان دابوون خاپوری کردن و لەناوی بردن] تەنها یەك پیاویان نەبێت ئەویش لەحەرەمی مەککەدا بوو] وە حەرەم لە سزای خوا پاراستی)) وتیان: ئەو کەسە کێ بوو ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((ئەوکەسە ئەبو ڕیغالی باوکی سەقیف بوو [کاتێك لە حەرەم چووە دەرەوە ئەویش هەمان سزای قەومەکەی خۆی بەرکەوت))][٩٦٩].

لە گێڕانەوەیەکی تردا ئەبو کەبشەی ئەنساری ﷺ دەفەرموێت: [لەغەزای تەبوکدا، موسوڵمانان پەلەیان کرد و چوونە ناو خانوو پەردووی ناوچەی حیجر ئەو هەواڵەش گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ و بانگ درا (الصلاة الجامعة) و موسوڵمانان هەموو خڕبوونەوە وە منیش چوومە خزمەتی ڕەشمەی وشترەکەی گرتبوو دەیفەرموو: ((مَا تَدْخُلُونَ عَلَى قَوْمٍ غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ؟)) واتە: ((بۆ دەچنە ناو ماڵی میللەتێك کە خودا غەزەبی لێگرتوون؟)) پیاوێك وتی: ئێمە سەرسامین بە ئەوان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. ئەویش فەرمووی: ((أَفَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِأَعْجَبَ مِنْ ذَلِكَ؟ رَجُلٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ يُنَبِّئُكُمْ بِمَا كَانَ قَبْلَكُمْ، وَمَا هُوَ كَائِنٌ بَعْدَكُمْ، فَاسْتَقِيمُوا وَسَدِّدُوا، فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَعْبَأُ بِعَذَابِكُمْ شَيْئًا، وَسَيَأْتِي قَوْمٌ لَا يَدْفَعُونَ عَنْ أَنْفُسِهِمْ بِشَيْءٍ))[٩٧٠] واتە: ((ئایا هەواڵێکتان بدەمێ ئێوە زیاتر لەوە پێی سەرسام بن؟ ئەوەتا پیاوێك لە خۆتان هەواڵی پێش خۆتان دەداتێ وە هەواڵی دوای خۆشتان دەداتێ، ئێوەش جێگیربن و لەسەر ڕێی ڕاست بڕۆن چونکە خودا هیچ باکێکی بەسزادانی ئێوە نییە کەسانێکیش دێن و ناتوانن هیچ لەخۆیان دوور بخەنەوە))].

---

(٩٦٩) أخرجه: أحمد (١٤١٦٠) وقال محققوه: حديث قوي اسناده على شرط مسلم، وابن حبان (٦١٩٧)، والبزار (١٨٤٤)، و الحاكم (٣٤٠/٢) وصححه ووافقه الذهبي، و قال الحافظ ابن كثر (البداية) (١٢٩/١) اسناده على شرط مسلم وقال (٦٦٤/٤): اسناده صحيح وقال الحافظ في (الفتح) (٣٨٠/٦): اسناده حسن وكذا قال الشيخ الألباني يرحمه الله في (فقه السيرة) (ص:٤٤١).

(٩٧٠)أخرجه: ابن أبي شيبة (المصنف) (٣٨١٦٧)، وأحمد (١٨٠٢٩) وقال محققوه: اسناده ضعيف، والبيهقي (الدلائل) (٢٣٥/٥)، وقال الهيثمي (المجمع) (٢٩١/١٠): رواه أحمد باسانيد واحدها حسن، وقال الحافظ ابن كثير (البداية (٦٦٤/٤): اسناده حسن.

## ٤- عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف دەبێتە پێش نوێژی موسوڵمانان لە نوێژی بەیانیدا:

لە گەڕانەوەدا لە جێگەیەك لایانداو پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ سەرئاو دوورکەوتەوە وپاشان گەڕایەوە دەست نوێژی گرت و دواکەوت لە هاتنی بۆلای موسوڵمانان: کاتێك هات تەماشای کردن وا نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ (جەماعەت) دەکەن و عەبدوڕەحمان پێش نوێژیان بۆ دەکات، موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەفەرموێت: [من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لەغەزای تەبوك [لە شەوێکدا][٩٧١] وە [لەکاتی پارشێودا][٩٧٢] بوو پێش نوێژی بەیانی فەرمووی: ((ئەوە کێیە؟)) وتم موغیرەی کوڕی شوعبەم. فەرمووی: ((ئەو وشترەم بۆ بگرە)) منیش وشترەکەم بۆ گرت[٩٧٣].

[فەرمووی: ((خەڵك هەموو پێش بکەون موغیرە تۆش بمێنەوە))][٩٧٤] [پێغەمبەری خوا ﷺ دواکەوت و منیش لەگەڵی دواکەوتم][٩٧٥] بەمنی فەرموو: ((ئاوت پێیە؟)) وتم: بەڵێ][٩٧٦] [ئەو وشترەکەی یەخداو (واتە: داینیشان) و لە وشترەکەی دابەزی] [فەرمووی: ((تۆش بە ئاوەکەوە بەدوامدا وەرە)). منیش ماوەیەك بە ئاوەکەوە بە دوایدا ڕۆیشتم][٩٧٧] [[ئەو وشترەکەی یەخداو (واتە: داینیشان) و لە وشترەکەی دابەزی] [فەرمووی: ((تۆش بە ئاوەکەوە بەدوامدا وەرە)). منیش ماوەیەك بە ئاوەکەوە بە دوایدا ڕۆیشتم]][٩٧٨] چوو بۆ سەر ئاو [پاشان گەڕایەوە لام] [و منیش ئاوەکەم بەرەو ڕووی برد][٩٧٩] [دەست نوێژی گرت] و ئاوی مەشکەکەم کرد بەدەستی دا سەرەتا هەردوو لەپی ناو دەستی شۆرد [پاشان ئاوی لە دەمی وەردا][٩٨٠] پاشان

(٩٧١) أخرجه: البخاري (٥٧٩٩)، ومسلم (٦٣٥).
(٩٧٢) أخرجه: الطبري (الكبير) (١٨/١٠٠٧).
(٩٧٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٨/٨٦٩).
(٩٧٤) أخرجه: عبدالرزاق (٧٤٩)، والنسائي (١٢٥)، و الطبراني (الكبير) (١٨/٨٨٩).
(٩٧٥) أخرجه: مسلم (٦٣٢).
(٩٧٦) أخرجه: البخاري (٥٧٩٩)، ومسلم (٦٣٥، ٢٧٤).
(٩٧٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٨/١٠٦٤).
(٩٧٨) أخرجه: البخاري (٥٧٩٩)، ومسلم (٦٣٥).
(٩٧٩) أخرجه: مسلم (٦٢٨).
(٩٨٠) أخرجه: البخاري (٥٧٩٨).

دەم و چاوی شۆرد و [جبەیەکی] [شامی] [خوری] [لە جبەکانی ڕۆمەکانی لەبەر بوو [ویستی هەر [دوو دەست و مەچەکی] لێوە دەربکات بەڵام جێی دەستەکەی زۆر تەسك بوون و نەیتوانی] بۆیە لەژێر جبەکەوە هەردوو دەستی دەرکرد و [جبەکەی کردە سەر شانی] و [هەردوو دەستی شۆرد] هەتا ئەنیشك [پاشان دەستی تەڕی بەسەری] و [جامانەکەیدا] هێنا و منیش دەستم برد تا هەردوو خوفەکەی (واتە: پێڵاوەکەی) لەپێ دابنێم. فەرمووی: ((لێیان گەڕێ من هەردووکیانم بە دەست نوێژ و پاکیەوە لە پێ کردووە)) پاشان دەستی تەڕی بەسەردا هێنان] و فەرمووی: ((چیت دەوێت؟)) وتم: هیچ پێویستیەکم نییە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ].

پاشان سواری وشترەکەی بوو [منیش سواری وشترەکەم بووم] و بەڕێکەوتین و گەیشتینە لای موسوڵمانان بینیمان هەموو لە نوێژدان و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفیان ﷺ پێش ختسووە پێش نوێژیان بۆ دەکات لە کاتی خۆیداو ڕکاتێکی نوێژی بەیانی بۆ کردبوون [خەڵکەکە کاتێ پێغەمبەری خوایان ﷺ بینی هەموو کەوتنە ئحم ئحم][981] [عەبدوڕەحمانیش بەوەی زانی ویستی لە نوێژەکەیدا بێتە دواوە پێغەمبەری خوا ﷺ هێمای بۆ کرد بەردەوام بێت][982] [پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ موسوڵمانان لە ڕیزەکەدا وەستا و لە دوای عەبدوڕەحمانەوە و ڕکاتی دووەمی کرد و عەبدوڕەحمان سەلامی دایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستایەوە [منیش لەگەڵی هەستامەوە ڕکاتی دووەممان کرد کە لێی دوا کەوتبووین][983]. موسوڵمانان ترسان و سبحان الله یان زۆر وت چونکە ڕکاتێکیان پێش پێغەمبەری خوا ﷺ کرد [کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکەی تەواو کرد] و سەلامی دایەوە و [چوو بۆ لایان و پێی فەرموون: ((چاکتان کرد و پێکاتان))[984] خۆشحاڵ بوو بەوەی نوێژەکەیان لە کاتی خۆیدا کردووە][985].

---

(٩٨١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٨/١٠٠٠).

(٩٨٢) أخرجه: أبو داود (١٥٢) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (١٣٨).

(٩٨٣) أخرجه: مسلم (٦٣٢)، وابن حبان (١٣٤٧).

(٩٨٤) أخرجه: ابو داود (١٤٩)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (١٣٥).

(٩٨٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٨/١٨٨٠). والحديث لفظه لأبي داود و الزيادات للبخاري ومسلم و النسائي و عبدالرزاق و الطبراني و غيرهم، وروى المغيرة ﷺ عن النبيّ ﷺ على أنه قال: ((لم يمت نبيٌّ حتى يؤمه رجلٌ من قومه)). أخرجه: الحاكم (٢٤٤/١) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي.

**٥- پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی شەفاعەت دەداتە هاوەڵانی:**

**عەوفی کوڕی مالیك ؓ دەفەرموێت: [لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە غەزایەکدا](٩٨٦) [بەرێکەوت خۆی و هاوەڵانی ئەو ڕۆژە سەرتاسەر و ئەو شەوەش سەرتاسەر بێ پشوودان بەردەوام بوو مەگەر لادانێکی کەم ئەویش بۆ نوێژ کردن تا لە نیوەی شەودا لە جێگەیەك لاماندا بۆ حەوانەوە](٩٨٧) و هەموو خەوتین [من خەوم لێتێك چوو نەم دەتوانی بخەوم و هەستام تەماشام کرد [هەمووان خۆیان و وڵاخەکانیان] خەوتوون، بەرزترین شت کەلەمنەوە دەرکەوت تەختەی پاڵ دانەوەی سەر کۆپانەکان بوو [لەدڵی خۆمدا وتم: دەچمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پاسەوانی دەکەم تا بەیانی](٩٨٨) [سەرم بڵندکرد و تەماشای جێی حەوانەوەگەی پێغەمبەری خوام ﷺ کرد لە جێی خۆی نەم بینی، منیش بەناو ئەو خەوتووانەدا ڕۆیشتم](٩٨٩) [تا گەیشتمە ئەو جێیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێدا لای دابوو بەڵام نەم بینی] [دەستم لەسەر ڕاخەرەکەیدا هێشتا هەر سارد بوو](٩٩٠) (وە تەماشای وشترەکەیم کرد کەسی لە پێشەوە نەبوو] [ڕۆیشتم بە دوایدا تا لە ئاگری سەربازگەکەش دەرچووم] [دەم وت: (إِنَّا لِله وإِنَّا إِلَيهِ راجِعونَ) پێغەمبەری خوا ﷺ براوە [پاشان هەر ڕۆیشتم لە تاریکایی شەودا زەنگێکم گوێ لێبوو] بەرەو ئەو دەنگە ڕۆیشتم تالێی نزیك بوومەوە] [و تارماییەکم بینی و بەرەو ڕووی ڕۆیشتم] [تەماشام کرد ئەوە موعازی کوڕی جەبەلە و عەبدوڵڵای کوڕی قەیسن و هەردووکیان بە پێوە وەستاون](٩٩١) [چووم تا گەیشتمە لایان](٩٩٢) [پێم وتن: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوێیە؟ وتیان: ئێمەش نازانین بەڵام گوێمان لە دەنگێك بوو لەو شیوەدا] [ئەوان بەمنیان وت: چی تۆی هێناوەتە دەر؟ منیش وتم: ئەی چی ئێوەی هێناوەتەدەر؟ پاشان گوێمان لە خوڕەی جۆگە ئاوێك بوو بەرەو ئاوەکە چووین، گوێمان لە دەنگێك بوو وەك پوڕەی**

---

(٩٨٦) أخرجه: ابن حبان (٧٢٠٧) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابن أبي عاصم (السنة) (٨١٩) وقال محققه: سنده صحيح على شرط مسلم.

(٩٨٧) أخرجه: أحمد (٢٣٩٧٧) وقال محققوه: حديث صحيح.

(٩٨٨) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٠٧/١٨) وصححه لغيره: الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٦٣٧).

(٩٨٩) أخرجه: أحمد (٢٣٩٧٧) وقال محققه: حديث صحيح.

(٩٩٠) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٢٦/١٨).

(٩٩١) أخرجه: أحمد (٢٤٠٠٢) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(٩٩٢) أخرجه: أحمد (٢٣٩٧٧) وقال محققه حديث صحيح.

هەنگ یاخود گفەی با][993] [وتم: پێ دەچێت پێغەمبەری خوا ﷺ نزیك بێت لەو دەنگە؟ وتیان: بێدەنگ بەو دانیشە].

[پاشان هەندێکمان بە هەندێکمان وت: ڕاوەستن چاوەڕێی بکەن تا ڕۆژ دەبێتەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەڕێتەوە لامان، پاش کەمێك چاوەڕوانی ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان] [و فەرمووی: ((ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح، یاخود عەبدوڵڵای کوڕی قەیس؟)) وتمان: بەڵێ. فەرمووی: ((وە موعازی کوڕی جەبەلیش؟)) وتمان: بەڵێ. فەرمووی: ((وە عەوفی کوڕی مالیکیش؟)) وتمان: بەڵێ. ئینجا چوینە خزمەتی [وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ [لێمان ون بوویت ئەم شەو][994] وە ئێمە زۆر ترساین و بەشوێن پێ گانت دا هاتین] [ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەر پێغەمبەرێك لەناو خاکی دوژمندا بێت پێویستە پاسەوانی هەبێت][995]، [ئینجا لەگەڵماندا گەڕایەوە نەئێمە پرسیارمان لێکرد و نە ئەویش پرسیاری لە ئێمە کرد تا گەڕایەوە سەر جێگەو ڕاخەرەکەی خۆی و دانیشت] و فەرمووی: ((ئایا دەزانن ئەم شەو خودا سەرپشکی کردم لە چیدا؟)) وتمان: خوداو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن][996] [فەرمووی: ((ئایا هەواڵتان بدەمێ لەم شەودا پێش کەمێك خودا سەر پشکی کردم لە چیدا؟)) وتمان: بەڵێ] فەرمووی: ((إِنَّهُ أَتَانِي آتٍ مِنْ رَبِّي فَخَيَّرَنِي بَيْنَ أَنْ يَدْخُلَ نِصْفُ أُمَّتِي الْجَنَّةَ، وَبَيْنَ الشَّفَاعَةِ)). واتە: ((یەکێك لە لایەن خودای خۆمەوە هاتە لام وە سەر پشکی کردم لە نێوان ئەوەی نیوەی ئومەتەکەم بچێتە بەهەشتەوە و لەنێوان شەفاعەتدا (واتە: تکاکردن))) [موعاز وتی: بەدایك و باوکمەوە فیدات بم ئەی پێغەمبەری خواﷺ خۆت پێگەی من دەزانیت داوا دەکەم من بخەیتە ناویان؟ فەرمووی: ((تۆ لەگەڵ ئەوانیت)).

پاشان عەوف و ئەبو موسایش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆت دەزانیت ئێمە هاوسەر و سامان و منداڵمان بەجێهێشتووە هاتووین بڕوامان بە خوداو پێغەمبەرەکەی هێناوە، ئێمەش بکەرە ناویان؟ فەرمووی: ((هەردووکتان لەوانن))]

(٩٩٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٠٧/١٨)، وقال الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٦٣٧) صحيح لغيره.

(٩٩٤) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٣٨/١٨).

(٩٩٥) أخرجه: ابن أبي عاصم (السنة) (٨١٩)، وابن حبان (٧٢٠٧) وقال محققا الكتابين: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(٩٩٦) أخرجه: ابن ماجة (٤٣١٧) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٣٤٥٦).

ئێمەش بەڕاکردنەوە گەڕاینەوە لای هاوڕێکانمان ئەوانیش لەخەو هەستان][٩٩٧] و [ترسابوون ئێمەش هەواڵەکەمان بۆ گێڕانەوە] [ئینجا پیاو و دوو پیاو دەچوونە خزمەتی و بۆی دەگێڕانەوە لەوەی کە پێشتر بۆ ئێمەی گێڕایەوە] و پێی فەرموون: [((یەکێك لە لای خودای خۆمەوە هاتە لام و سەر پشکی کردم لە نێوان ئەوەی نیوەی ئومەتەکەم بچێتە بەهەشتەوە وە لە نێوان شەفاعەتدا منیش شەفاعەتم هەڵبژارد)). ئەوانیش هەموو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر خوداو پاشان هاوڕییەتیمان بۆت ئێمەش بکەرە ناو ئەوانەی کە تکایان (واتە: شەفاعەتیان) بۆ دەکەیت فەرمووی: [((إِنَّ شَفَاعَتِي لِكُلِ مُسلِم))][٩٩٨] واتە: ((شەفاعەتی من بۆ هەموو موسوڵمانێکە))].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: [ئێمە هەموو وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوامان بۆ بکە لە خودا تا بمانخاتە ڕیزی ئەوانەی تۆ شەفاعەتیان بۆ دەکەیت][٩٩٩] و هەموویان لێی کۆبوونەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: ((بێدەنگبن)) هەموو بێدەنگ بوون وەك ئەوەی کەس قسەنەکات][١٠٠٠] پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((فَأَنَا أُشْهِدُكُمْ أَنَّ شَفَاعَتِي لِمَنْ [مات] لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا مِنْ أُمَّتِي))[١٠٠١] واتە: [((من ئێوە دەکەمە شایەت کە تکای من بۆ هەموو ئەوانەیە لە ئومەتەکەم کە مردوون و هیچ هاوتایەکیان بۆ خودا دانەناوە)).

### ٦- دووڕووەکان هەوڵی کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەن:

لە ڕێگەی گەڕانەوەدا کاتێك بە ناوچەیەکی شاخاویدا تێدەپەڕین هەندێك لە دووڕووەکان ویستیان پلانێك جێ بەجێ بکەن بۆ تیرۆر کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو باسەش لەچەند گێڕانەوەیەکدا هاتووە لەوانە:

---

(٩٩٧) أخرجه: عبدالرزاق (٢٠٨٦)، وابن خزيمة (التوحيد) (٦٣٨/٢)، والحاكم (١٤/١)، والآجري (الشريعة) (٣٤٣)، وابن حبان (٧٢٠٧) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وصحح اسناده كل من: الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٦٣٧/٦)، والشيخ الأرناؤوط في تحقيق (مسند أحمد) تحت الحديث (رقم:٢٣٩٧٧).

(٩٩٨) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١١٠٧/١٨)، وابن ماجة (٤٣١٧)، وابن أبي عاصم (السنة) (٨٢٠) وقال محققه: اسناده صحيح.

(٩٩٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٠٧/١٨، ١٢٦).

(١٠٠٠) أخرجه: ابن حبان (٧٢٠٧) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٠٠١) أخرجه: أحمد (٢٤٠٠٢) وقال محققوه: اسناده صحيح. والحديث لفظه لأحمد و الزيادات للطبراني وابن حبان وابن أبي عاصم وابن ماجة وغيرهم.

١-ئەبو توفەیل ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای تەبوك دەگەڕایەوە (لەناوچەیەکدا) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا ئاگاداریەك بڵاو بکەنەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەرباسکەکەدا دەڕوات هیچ کەسێك لەوێوە نەڕوات. لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ بەو سەر بەرزاییانەدا بەڕێ کەوتبوو ڕەشمەی حوشترەکەی بەدەست حوزەیفەوە بوو ﷺ ڕایدەکێشا و عەماریش لە دواوە لێی دەخوڕی. لەناکاودا چەند وشتر سوارێکی دەمامك دار نزیك بوونەوە لە عەمارو ئەویش بە شوڵەکەی لەسەرو چاوی وشترەکانی دان و بەرەنگاریان بووە وە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە حوزەیفەی فەرموو: ((ڕایگرە ڕایگرە)) (وشترەکان هەموو بەرەو دواوە ڕایان کرد و عەمار دوایان کەوت) دواتر کەوتنە ڕێ و لەو بەرزاییانە هاتنە خوارەوە، عەماریش گەڕایەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((یاعمّارُ هَلْ عَرَفْتَ القَومَ؟)) واتە: ((ئەی عەمار ئەوانت ناسیەوە؟)) وتی: زۆربەی وشترەکان دەناسمەوە بەڵام سوارەکان دەمامك داربوون. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( أَرَادُوا أَنْ يَنْفِرُوا بِرَسُولِ اللَّهِ فَيَطْرَحُوهُ)) واتە: ((ئەوان بەنیازبوون پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بەرزایەوە فڕێ بدەنە خوارەوە)) لەوێدا یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ عەمماری سوێنیدا وتی: داوات لێدەکەم لەبەر خوا پێم بڵێ ئەوانە ژمارەیان چەند کەس بوو؟ ئەویش وتی: ئەوان بیست و چوار کەس بوون بەڵام سێ کەسیان پێغەمبەری خوا ﷺ پاساوەکانی قبوڵکردن ئەوان وتیان: سوێند بە خوا ئێمە گوێمان لە بانگەوازەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبووە و نەماندەزانی ئەوان بەنیازی چی بوون، عەماریش دەڵێت من شایەتی دەدەم کە دوانزە کەس لەوانە دوژمنی خواو پێغەمبەرن ﷺ لە ژیانی دونیا و ڕۆژی دواییدا)[1002].

وە حوزەیفەش ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((في أصحابي (أمتي) اثنى عشر منافقاً، مِنهُمْ ثَمَانِيَةٌ لَايَدْخُلُونَ الجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ)) وفي رواية: [....ثمانية منهم تكفيكهم الدُّبَيلَةَ سراجٌ من النار يظهر بين أكتافهم حتى ينجُم مِن صدورهم]))[1003] واتە: ((دوانزە دووڕو هەن لەناو هاوەڵاندا، هەشت کەس لەوان ناچنە بەهەشتەوە

---

(١٠٠٢) أخرجه: أحمد (٢٣٧٩٢) وقال محققوه: اسناده قوي على شرط مسلم، وأشار ابن كثير إلى صحته في (التفسير) (١٣٣/٣)، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (٥٣٠): حديث حسن.

(١٠٠٣) أخرجه: مسلم (١٠/٩/٢٧٧٩).

تا وشتر بەناو کونەدەرزیدا گوزەر نەکات)) وە لە گێڕانەوەیەکی تردا: ((...هەشت کەس لەوان لەناو دەچن بەهۆی گەرمیی ئاگرەوە لە ناوشانیانەوە لێیان دەدرێت لە ناوسکیانەوە دەردەچێت)).

٢-عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەبوک بەرەو مەدینە دەگەڕایەوە، لەیەکێك لە ناوچەکاندا (دووڕوەکان) پلانێکیان لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ دارشت بریتی بوو لەوەی لەسەر بەرزاییەکەوە بیخەنە خوارەوە لە ڕێگەدا. کاتێك گەیشتنە ئەو بەرزاییە دیاریکراوە ویستیان بە دوای پێغەمبەری خوادا ﷺ بڕۆن و دواجار پێغەمبەری خوا ﷺ لێیان ئاگادار کرایەوە و فەرمووی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەوێت لەسەر بەرزایەکانەوە گوزەر بکات هیچ کەسێك لەوێوە گوزەر نەکات)). ئەو دووڕوانە ئەوەیان بیست خۆیان ئامادەکرد دەموچاویان داپۆشی بەنیازی کەتنێکی گەورە بوون. پێغەمبەری خوا ﷺ داوایکرد حوزەیفە و عەمار لەگەڵیدا بڕوات و داوای لە عەمار کرد ڕەشمەی وشترەکەی ڕابکێشێت وە حوزەیفەش وشترەکەی لە دواوە لێبخوڕێت لە کاتێکدا ئەوان دەڕۆیشتن. لەناکاو ئەو دووڕوانە بەدوایاندا هاتن پێغەمبەری خوا ﷺ توڕەبوو داوای لە حوزەیفە کرد تابیان گێڕێتەوە، حوزەیفەش گەڕایەوە بۆیان گۆچانێکی پێبوو ڕوو بە ڕوویان بووەوە بە گۆچانەکەی لە دەم و چاوی وشترەکانی دان و تەماشای کرد هەموویان دەم و چاویان داپۆشیوە وای دەزانی ئەوان وەك کاروانی دەمو چاویان داپۆشیوە بەڵام خودا ئەوانی تۆقاند وایانزانی پیلانەکەیان ئاشکرابووە بۆیە بە پەلە گەڕانەوە و تێکەڵی سوپاکە بوونەوە. پاشان حوزەیفە هاتەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی فەرموو: ((اضْرِبِ الرَّاحِلَةَ يَا حُذَيْفَةُ، وَامْشِ أَنْتَ يَا عَمَّارُ)) واتە: ((وڵاخەکە لێخوڕە و عەمار تۆش لە پێشەوە بڕۆ)) ئینجا بە خێرایی بەسەر ئەو دوو ناوچەیەدا ڕۆیشتن تا لە دەربەندەکە دوور کەوتنەوە و لەوێ وەستان و چاوەڕێی سوپاکەیان کرد. پێغەمبەری خوا ﷺ بە حوزەیفەی فەرموو: ((حوزەیفە ئایا لەو کۆمەڵە هیچ کەسێکتان ناسییەوە؟)) وە فەرمووی: ((ئایا دەزانی ئەو سوارانە بە نیازی چی بوون؟)) وتی: نا سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((فَإِنَّهُمْ مَكَرُوا لِيَسِيرُوا مَعِي حَتَّى إِذَا أَظْلَمَتْ فِي الْعَقَبَةِ طَرَحُونِي مِنْهَا)) واتە: ((ئەوان پلانیان وابوو لەگەڵمدا بێن تا کاتێك دونیا تاریك دەبێت ئەوجا لەبەرزاییەکەوە من فڕێ بدەنە خوارەوە)) وتی: کاتێك هەموو سوپاکە هاتن

فەرمان بکە تا لەگەردنیان بدەن. فەرمووی: ((پێم ناخۆشە خەڵکی دواتر بڵێن موحەممەد دەستی لەسەر پشتی هاوەڵانی بوو تا بەوان بەرز بووەوە و دواتریش ئەوان دەکوژێت))(١٠٠٤).

٣-ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەگێڕێتەوە لە حوزەیفەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (من رەشمەی وشترەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ ڕادەکێشا و عەماریش لە دواوە لێی دەخوڕی تا گەیشتینە بەندەرەکە، لەوێدا دوانزە سوارمان بینی و پێغەمبەرم ﷺ لێیان ئاگادار کردەوە. لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: [من لە دوای وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەڕۆیشتم و لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ خەوی لێ کەوت. گوێم لە هەندێ کەسی ئەوان بوو (واتە: دووڕووەکان) دەیان وت: گەر بمان توانیایە لە وشترەکەی بمان خستایەتە خوارەوە ملی بشکایە لەناو دەچوو و لێی ڕزگار دەبووین. منیش لە نێوان وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەواندا دەڕۆیشتم قورئانم دەخوێند و دەنگم بەرز دەکردەوە. تا پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاگا هات و فەرموی: ((ئەوە کێیە؟))(١٠٠٥). وتم: حوزەیفەم پاشان هاواری لەو سوارانە کرد و هەموو بەرەو دواوە ڕایانکرد. پاشان پێی وتین: ((ئایا ئەوانەتان ناسییەوە؟)) وتم: ئەوان دەم وچاویان داپۆشی بوو بەڵام وڵاخەکانیان دەناسمەوە. فەرمووی: ((هَؤُلَاءِ الْمُنَافِقُونَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ﷺ فِي الْعَقَبَةِ، فَيُلْقُوهُ مِنْهَا.)) واتە: ((ئەوانە دووڕوەکانن تا ڕۆژ دوایی.... دەیانویست بە وشترەکانیان پاڵ بە وشترەکەی پێغەمبەری خواوە بنێن و لە دەربەندەکە بیخەنە خوارەوە)) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی بۆ هۆزەکانیان لێ ئاگادارناکەیتەوە تا هەموو لایەك تاوانبارانی خۆیان قۆڵبەست بکەن و بیاندەن بەدەستەوە؟ فەرمووی: ((نا پێم ناخۆشە عەرەبەکان لەناو خۆیاندا بڵێن موحەممەد بەو پیاوانە بەجەنگ دەهات لەگەڵ خەڵکدا تا خوای گەورە بەوان سەری خست دواتر پەلاماریدان و لەناوی بردن (پاشان فەرمووی): خودایە بەلوو لەناویان ببە)) وترا: (لوو) چییە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((بڵێسەیەك ئاگرە دەچێتە

---

(١٠٠٤) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٥٦/٥). و أورده البيهقي في (الكبرى) (٣٢/٩) واسناده حسن إلى بن اسحاق كما في (مرويات غزوة تبوك) (ص:١٦٩).

(١٠٠٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣٠١٥).

ناو شادەماری دڵیان و لەناو دەچن))][١٠٠٦]. [حوزەیفە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((فَإِنَّ هَؤُلَاءِ فُلَانًا وَفُلَانًا - حَتَّى عَدَّ أَسْمَاءَهُمْ - مُنافِقُونَ، لَا تُخْبِرَنَّ أَحَدً))][١٠٠٧] واتە: ((لە ناو ئەوانەدا فڵانە کەس و فڵانە کەس هەن [تا هەموو ناوەکانیانی وت] ئەوان هەموو دووڕوون. (حوزەیفە) ئەمە لای کەس نەگێڕیتەوە)).

**٧- خوای گەورە پێغەمبەرەکەی ئاگادار دەکاتەوە لە وتەی یەکێك لە دووڕووەکان:**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنه دەفەرموێت: [پیاوێك لە دووڕوەکان بە عەوفی کوڕی مالیکی وت] لە غەزای تەبوك کاتێك لە دانیشتنێکدا لەگەڵ هاوەڵان بوو وتی: تا ئێستا کەسێکمان نەدیوە بە وێنەی ئەم قورئان خوینانەمان ورگ زل ترو درۆزنترو ترسنۆکتربن لە ڕووبەڕوو بوونەوەدا. عەوف وتی: درۆت کرد تۆ دووڕوویت ئەو وتەیەت دەگەیەنمە پێغەمبەری خوا ﷺ [دواتر عەوف چوو تا هەواڵەکە بگەیەنێتە پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام پێش هاتنی ئەو قورئان دابەزی و هەواڵەکەی پێڕاگەیاند].

عەبدوڵڵا رضي الله عنه دەڵێت: دواتر من ئەو دووڕوەم بینی دەستی گرتبوو بە توێشەبەرەکەی پێغەمبەری خواوە ﷺ بە ناو ئەو بەردانەدا دەڕۆیشت و دەی وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە تەنها گاڵتەو سوعبەتمان دەکرد و بەڕاستمان نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بەو ئایەتە وەڵامی دەدایەوە: ﴿......أَبِاللَّهِ وَءَايَـٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾﴾ (التوبة) [تەنها ئەوەی بۆ دووبارە دەکردنەوە][١٠٠٨]. واتە: (ئایا ئێوە گاڵتە بە خوا و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی دەکەن هیچ پاساو مەهێننەوە ئێوە بێ باوەڕبوون...).

لە گێڕانەوەیەکی تردا کەعبی کوڕی مالیك رضي الله عنه دەفەرموێت: [پیاوێك کەناوی موخشینی کوڕی حومەیر بوو وتی: حەز دەکەم هەر یەك لە ئێوە سەد داری لێبدرێت و ڕزگارمان ببێت و ئایەتمان لەبارەوە دانەبەزێت. پێغەمبەری خوا ﷺ بەعەماری فەرموو: ((أَدْرِكْ الْقَوْمَ فَإِنَّهُمْ قَدْ احْتَرَقُوا، فَسَلْهُمْ عَمَّا قَالُوا، فَإِنْ أَنْكَرُوا فَقُلْ: بَلَى، قَدْ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا!)) واتە: ((بڕۆ فریای ئەوانە بکەوە ئەوان وا دەسوتێن پرسیاریان

---

(١٠٠٦) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٥/٢٦٠).

(١٠٠٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣٠١٥).

(١٠٠٨) أخرجه: الطبري (التفسير) (١٦٩١١،١٦٩١٢) وقال محققه الشيخ أحمد شاكر: اسناده صحيح، وابن أبي حاتم (التفسير) (١٠٠٤٧).

لێبکە چیان وتووە، گەر ئەوان نکۆڵیان لێکرد و شاردیانەوە پێیان بڵێ: بەڵێ ئێوە ئاوها و ئاوهاتان وتووە)). عەمار ڕۆیشت و فەرمانەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ جێ بەجێ کرد، ئەوان دواتر هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پاساویان بۆ دەهێنایەوە. بەڵام موخشینی کوڕی حومەیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە هۆی ناوی خۆم و بابمەوە لە ئیسلام دواکەوتم [واتە: ناوی (زبری کوڕی جاشولکە) بوو] خوای گەورەش ئەو ئایەتەی لە بارەی ئەوانەوە دابەزاند: ﴿ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾ (التوبة) واتە: (بڵێ: بڕوبیانووی بێجێ مەهێننەوە، پاش ئەوە باوەڕتان هێنا، کافربوونەوە گەر لە بڕێکتان خۆش ببین لەبەر ئەوەی کە پەشیمان بوونەوە لە وتەکەتان ئەوا جەزرەبەی بڕێکتان دەدەین بەهۆی ئەوەی تاوانکاربوون). دواتر خوا لە موخشین ؓ خۆشبوو وە ناوی خۆی گۆڕی بۆ عەبدوڕەحمان و داوای شەهید بوونی لە خوا دەکرد و کەسیش لاشەکەی نەدۆزێتەوە. دوا جار لە جەنگی یەمامەدا کوژرا و نەزانرا کێ کوشتوویەتی وە لاشەکەی ون بوو کەس نەیزانی چی لێهات[١٠٠٩].

## ٨- ماندووبوونی وشترەکان لەڕێگادا:

خوزاعەی کوڕی عوبەید ؓ دەفەرموێت: [لە غەزای تەبوك لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، وشترەکان زۆر ماندوو و شەکەت بوون. چونکە ماوە نەبوو تا پشوویان پێ بدەن و بیان حەوێننەوە، هاوەڵان ئەومیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ چاوەڕێی کرد تا گەیشتە نێوان دووچیاو لەوێ [لە پێشەوە چووە سەر جێگەیەکی بەرز وەستا و سوپاکەش بەوشترەکانیانەوە بەلایدا تێدەپەڕین و پێی فەرموون: ((بڕۆن بەناوی خودا)) و فووی ڕووەو وشترەکان دەکرد و دوعای بۆ دەکردن دەیفەرموو: ((اللَّهُمَّ احْمِلْ عَلَيْهَا فِي سَبِيلِكَ [إِنَّكَ] تَحْمِلُ عَلَى الْقَوِيِّ وَالضَّعِيفِ، وَعَلَى الرَّطْبِ وَالْيَابِسِ، فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ))[١٠١٠] واتە: ((خودایە ئەوان لەسەر پشتی

---

(١٠٠٩) أخرجه: (ابن أبي حاتم) (التفسير) (١٠٤٠٣) مسنداً، وابن هشام (السيرة) (١٤٢/٤) برقم (١٠٧٥) بغير اسناد وقال الشيخ مقبل (الصحيح المسند من اسباب النزول) (ص:١٢٢): اسناده حسن عند أبن أبي حاتم، وقال ابراهيم العلي في (صحيح السيرة) (٧٥١): سنده حسن وقال صاحب (السيرة في مصادرها الأصلية) (ص:٦٣٣): اسناده حسن.

(١٠١٠) أخرجه: أحمد (٢٣٩٥٥) وقال محققوه: حديث صحيح واسناده قويّ، والطبراني (الكبير) (٧٧١/١٨) وفي (مسند الشاميين) (٩٣١)، وابن حبان (٤٦٨١) وقال محققه: رواته ثقات وأخرجه أحمد بسند صحيح، والبزار (١٨٤٠) وقال

وشترەکانیان هەڵبگرە لەم غەزایەدا چونکە تۆ توانات هەیە هەڵیان بگریت لەسەر بەهێز و بێ هێز لە سەر وشك و تەڕ لە وشکانی و لە دەریادا)) [دواتر وشترەکان لە ڕۆیشتندا زۆر چالاك بوون...].

لە ماوەی ڕێگەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاری دەکردن کە لە سەر ڕێگاکاندا دانەنیشن و ڕێی موسوڵمانان نەگرن و پێی فەرموون: ((أَنَّ مَنْ ضَيَّقَ مَنْزِلًا أَوْ قَطَعَ طَرِيقًا فَلَا جِهَادَ لَهُ))[1011] واتە: [((هەرکەسێك جێی دانیشتنێك تەنگ بکات و ڕێگەیەك بگرێت ئەو کەسە پاداشتی جیهادی دەست ناکەوێت))].

### ٩- سوتانی مزگەوتی دووڕووەکان:

لە ڕێگادا پێغەمبەری خوا ﷺ بە پەلە بوو بۆ گەڕانەوە بۆ مەدینە و بە هاوەڵانی فەرموو: ((إِنِّي مُتَعَجِّلٌ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يَتَعَجَّلَ فَلْيَفْعَلْ...)) واتە: ((من بە پەلەم لە گەڕانەوەمدا و هەرکەسێکیش لە ئێوە پێی خۆشە پەلە بکات لە گەڕانەوەدا با وابکات)).

پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕێکەوت تا گەیشتە ناوچەی (زی ئەوان) کە ماوەیەکی کەم دوورە لە مەدینەوە، لەوێدا فەرمانی کرد پیاوانێك لە هاوەڵانی لە پێشەوە بڕۆن و مزگەوتی دووڕووەکان بسوتێنن و خاپوری بکەن. چونکە ئەو مزگەوتە بەمەبەستی پیلانگێڕیی دژی موسوڵمانان بوونیاد نرابوو، ئەو بەسەرهاتەش لە دوو گێڕانەوەدا هاتووە:

١-ئیبنو عەباس ؓ دەفەرموێت: (ئەوان کەسانێکی دووڕوبوون، لە ئەنصارەکان ئەبو عامر پێی وتبوون: مزگەوتەکەتان دروست بکەن و هەموو هێزو چەکێکتان ئامادە بکەن منیش دەڕۆم بۆ لای قەیسەری پاشای ڕۆم و لەوێ وە سەربازانێکی ڕۆمەکان لەگەڵ خۆم دەهێنم و موحەممەد و هاوەڵانی لە مەدینە دەردەکەم. دووڕوەکان مزگەوتەکەیان تەواو کرد و پاشان چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ

---

الشيخ الألباني يرحمه الله في (صحيح موارد الضمآن) (١٤٢٦): صحيح لغيره، واللفظ لأحمد و الزيادة للطبراني وابن حبان.

(١٠١١) أخرجه: ابو داود (٢٦٢٩)، وأحمد (١٥٦٤٨) وقال محققوه: اسناده حسن، والطبراني (الكبير) (١٤٣٥/٢٠)، وابو يعلى (١٤٨٣)، وسعيد بن منصور (٢٤٦٨) (وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٢٨٩).

وتیان: ئێمە مزگەوتەکەمان دروستکرد پێمان خۆشە بێیت نوێژی تێدا بکەیت و داوای بەرەکەتمان بۆ بکەیت، خودای گەورەش ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ (التوبة)[1012] واتە: (هەرگیز تۆش ئەی پێغەمبەر! لە مزگەوتی ئەواندا ڕامەوەستەو نوێژ مەکە، دڵنیابە تەنها مزگەوتی قوبا کە هەر یەکەم ڕۆژ لەسەر بناغەی تەقوا دامەزراوە بەهەقترە تۆ نوێژی تیادا بکەیت، هەتا مزگەوتی (ضیرار) لەم مزگەوتەدا کۆمەڵە پیاوێکی تێدایە لە پشتیوانان زۆر حەزدەکەن لە هەموو تاوان و گوناهێك پاك ببنەوە دیارە خواش بۆ خۆی پاکانی خۆش دەوێ).

لە گێڕانەوەکەی عروەدا ﷺ دەفەرموێت: ((...دووڕووەکان لەناو خۆیاندا وتیان: ئێمە مزگەوتێك بۆ خۆمان دروست دەکەین و نوێژی تێدا دەکەین تا ئەبو عامر دەگەڕێتەوە و پێش نوێژیمان بۆ دەکات. خوای گەورەش ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ مِن قَبْلُ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا الْحُسْنَىٰ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ (التوبة)[1013] واتە: (لە دووڕووەکاندا کەسانێ وا هەن کە لەمەدینەدا مزگەوتی (ضیرار) بوونیاد دەنێن دژ بە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان وە بۆ بەهێز کردنی کوفر و بێ باوەڕیی خۆیان و بۆ پەرتکردنی ڕیزەکانی کۆمەڵی باوەڕداران و دوور خستنەوەیان لە پێغەمبەر ﷺ و بۆ ئەوە بیکەنە (کەمین) و ڕوانگە بۆ ئەو کەسانە کە پێشتر بەر لە دروسکردنییدا دژی خواو پێغەمبەرەکەی دەجەنگان. کەچی پڕ بە دەمیان سوێند دەخۆن کە: تەنها چاکە و خێرمان لەکردنەوەی ئەو مزگەوتەدا مەبەست بووە، خوداش بۆخۆی چاك بەئاگایەکە درۆزنن و دڵیشیان چی تێدایە و مەبەستیشیان چی بووە؟).

٢-ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەگێڕێتەوە لە زوهریەوە ئەویش لە یەزیدی کوڕی یەمانەوە ﷺ و کەسانێکی دیکە فەرموویانە: (...کاتێك لە گەڕانەوەدا پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە ناوچەی (زی ئەوان) لەوێدا هەواڵی مزگەوتەکەی بۆ هات و پێغەمبەری

---

(١٠١٢) أخرجه: الطبراني (التفسير) (١٧١٨٧)، وابن أبي حاتم (التفسير) (١٠٠٧٢)، والبيهقي (الدلائل) (٢٦٣/٥)، وقال ابراهيم العلي في (صحيح اسباب النزول) (٢١٢): صحيح لغيره، وصححه السندي (الذهب المسبوك) (٣١٦).

(١٠١٣) أخرجه: ابن ابي حاتم (التفسير) (١٠٠٧٠)، وعمر بن شبة في اخبار مكة بسند صحيح إلى عروة كما قال الحافظ في (الإصابة) (١١٧٣٦).

خوا ﷺ مالیکی کوڕی دوخشوم.. و مەعنی کوڕی عادی و عاسمی برای ناردو پێیانی فەرموو: ((انْطَلِقَا إِلَى هَذَا الْمَسْجِدِ الظَّالِمِ أهله فَاهْدِمَاهُ وَحَرِّقَاهُ)) واتە: ((بڕۆن بۆ لای ئەو مزگەوتەی کە ستەمکاران (دروستایان کردووە) بیسوتێنن و بیڕوخێنن)) ئەوانیش مالیك و مەعەن بە خێرایی ڕۆیشتن تا گەیشتنە لای ماڵەکانی خۆیان لەوێدا مالیك بە مەعەنی وت: چاوەڕێم بکە تا لە ماڵەوە ئاگرێك دەهێنم پاشان چووە ماڵەوە و پەلە دارخورمایەکی گڕ تێ بەرداو پاشان چووە دەرەوە و هەردووکیان ڕۆیشتنە ناو مزگەوتەکەوە ئەو دووڕووانەیان لە ناودابوو ئەوان سوتاندیان و ڕووخاندیان دووڕووەکانیش بە هەموو لایەکدا بڵاوەیان کرد بە هۆی ئەوانەوە ئەو ئایەتە دابەزی کە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبْلُ ۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّا ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٠٧﴾﴾ (التوبة)[١٠١٤].

## گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ناو شاری مەدینە

ئەنەس رضي الله عنه دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای تەبوك گەڕایەوە و نزیکبووەوە لە شاری مەدینە و فەرمووی: ((إِنَّ بِالْمَدِينَةِ أَقْوَاماً مَا سِرْتُمْ مَسِيراً، وَلاَ قَطَعْتُمْ وَادِياً إِلاَّ كانُوا مَعكُم)) واتە: ((چەندەها کەس لە ناو شاری مەدینەدا هەن هەر پیادە ڕۆیەکتان کردبێت یاخود هەر شیو و دۆڵێکتان بڕیبێت ئەوان لەگەڵتان بوون)) وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان هەر لە ناو شاری مەدینەش بوون، فەرمووی: ((وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ حَبَسَهُمْ الْعُذْرُ))[١٠١٥] واتە: ((ئەوان لە ناو شاری مەدینە بوون بەڵام پاساوی خۆیان هەبوو)).

لە گێڕانەوەیەکی تردا: ((لَقَدْ تَرَكْتُمْ بِالْمَدِينَةِ أَقْوَاماً ، مَا سِرْتُمْ مَسِيراً، وَلَا أَنْفَقْتُمْ مِنْ نَفَقَةٍ، وَلَا قَطَعْتُمْ مِنْ وَادٍ، إِلَّا وَهُمْ مَعَكُمْ فِيهِ، وفي رواية [إلاّ شَرَكُوكُمْ فِي الأَجْرِ[١٠١٦])) واتە: [((ئێوە کەسانێکتان لە شاری مەدینە جێهێشتووە بە هەر ڕێگەیەکدا ڕۆیشتبن وە هەر خەرجیەکتان خەرج کردبێت وە هەر دۆڵێکتان بڕی بێت ئەوان لەگەڵتان

---

(١٠١٤) أخرجه: الطبراني (التفسير) (١٧١٨٦) وفي (التأريخ) (١١٠/٣)، وابن هشام (السيرة) (١٤٦/٤) رقم (١٠٨٤)، والبيهقي (الدلائل) (٢٦٠/٥) وضعفه الشيخ الألباني يرحمه الله في (الإرواء) (١٥٣١) و (فقه السيرة) (ص:٤٤٨).

(١٠١٥) أخرجه: البخاري (٤٤٢٣).

(١٠١٦) أخرجه: ابن ماجة (٢٧٦٥) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٢٣٣).

بوون [هاوشێوەی پاداشتتان بوون]))) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان چۆن لەگەڵ ئێمە بوون خۆ ئەوان هەر لە مەدینە بوون؟ فەرمووی: ((ئەوان بەهۆی پاساوەکانیانەوە نەیان توانی لەگەڵتان بەشداربن))][1017].

کاتێك زیاتر لە مەدینە نزیکبووە وە و چیای ئوحودی لێ دەرکەوت فەرمووی: ((ئەوە ئوحودە ئێمەی خۆش دەوێت ئێمەش خۆشمان دەوێت)). ئەبو حومەید رضي الله عنه دەفەرموێت: [گەڕانەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای تەبوك تا شاری مەدینەمان لێ دەرکەوت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هَذهِ طَابةَ، وَهَذا أُحُدٌ جَبَلٌ يُحِبُنا وَ نُحِبُهُ))[1018] واتە: ((ئەوە شارە شیرینەکەیەو ئەوەش ئوحودە چیایەکە ئێمەی خۆش دەوێت و ئێمەش ئەومان خۆش دەوێت)). پاشان خەڵکی بۆ پێشوازی کردنی هاتبوونەدەرەوە بۆ ناوچەی (سەنیەت وەداع)، هەموو بە منداڵەکانیشەوە هاتبوون)][1019].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: [سائیبی کوڕی یەزید رضي الله عنه دەفەرموێت: [کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی لە غەزای تەبوك گەڕانەوە خەڵکی ناو شار هەموو چونە پێشوازیان منیش لەگەڵ منداڵاندا لەناوچەی (سەنیات وەداع) هەموو پێشوازیمان لێ کردن][1020]. لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: (ئیستاش لە بیرمە من لەگەڵ منداڵان چووین بەرەو پیری پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك لە غەزای تەبوك گەڕایەوە)[1021] لە گێڕانەومیەکی تردا هاتووە کە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو مەدینە گەڕایەوە لە غەزای تەبوك لەوێدا ژنان و منداڵان دەیان وت:

طَلَع البَـدْرُ علينـا     مـن ثَنِيَّـاتِ الـوَدَاعِ
وَجَبَ الشُّكْرُ عَلَيْنَا     مَا دَعَا لِلَّهِ دَاعْ][1022].

---

(١٠١٧) أخرجه: ابوداود (٢٥٠٨) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢١٨٩).

(١٠١٨) أخرجه: البخاري (٤٤٢٢) ومسلم (١٣٩٢).

(١٠١٩) أخرجه: البخاري (٤٤٢٧).

(١٠٢٠) أخرجه: البخاري (٣٠٨٢).

(١٠٢١) أخرجه: البخاري (٤٤٢٧).

(١٠٢٢) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٦٦/٥) وهو الراجح كما ذهب إليه ابن القيم في (زاد المعاد) (٤٨١/٣) و الفيروزابادي في (المغانم المطابة في معالم طابة) (ص:٨٠).

کەعبی کوڕی مالیك ؓ دەفەرموێت: [...پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە ناو شارو وەك هەموو کاتی گەڕانەوەکانی سەرەتا دەچووە ناو مزگەوت و دوو ڕکات نوێژی تیادەکرد و پاشان لەوێ دادەنیشت و خەڵکی دەهاتن بە خێرهاتنەوەیان لێدەکرد...][١٠٢٣].

## ئەوانەی لە غەزاکە دوا کەوتبوون دەهاتن و پاساوی خۆیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسدەکرد

پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتەکەی خۆی دانیشت و ئەوانەی لە غەزاکە دواکەوتبوون هەموو دەهاتن و پاساوی خۆیان لا باس دەکرد و زۆربەیان دووڕووبوون بەڵام چەند بڕوا دارێکیان لە ناودابوو. کەعبی کوڕی مالیك ؓ دەفەرموێت: (..پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت دانیشت و ئەوانەی لە غەزاکە دواکەوتبوون دەهاتن و پاساوی خۆیان دەهێنایەوە بۆی و سوێندیان بۆ دەخوارد ژمارەیان هەشتاو سێ کەس زیاتربوو، پێغەمبەریش ﷺ بەڕووکەشیان وتەکانیانی لێوەرگرتن و بەڵێنی پێدان داوای لێخۆش بوونی بۆ دەکرن و نهێنیەکانیانی دەگێڕایەوە بۆلای خوای گەورە))][١٠٢٤].

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: [لەپاشان پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی گەڕانەوە و لە نزیکی مەدینە زۆرێك لەوانەی بەشداری غەزاکە نەبووبوون هاتبوونە پێشوازی، پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو بوو: ((ئێوە لەگەڵ هیچ یەکێك لەو پیاوانە مەدوێن و لەگەڵیان دامەنیشن تا خۆم ڕێگەتان دەدەم)).

بەم جۆرە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی ڕوویان تێ نەدەکردن و پشت گوێیان دەخستن تا پیاوی وا هەبوو پشتی لە باوك و برای خۆی دەکرد تا ژنی وا هەبوو مێردەکەی فەرامۆش کردبوو، بەم جۆرە چەند ڕۆژێك مانەوە تا دواکەوتوان زۆر ناڕەحەت بوون و دەهاتن و نەخۆشی و هەژارییان دەکردە پاساو بۆ خۆیان و سوێندیان بۆ دەخوارد. تا دواجار پێغەمبەری خوا ﷺ بە بەزەیی بوو بۆیان و بەڵێنی

(١٠٢٣) أخرجه: البخاري (٤٤١٨).
(١٠٢٤) أخرجه: البخاري (٤٤١٨).

لێ وەرگرتن و داوای لێخۆش بوونی بۆ کردن][١٠٢٥].

دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە ناو ماڵی خۆی تەماشای کرد عائیشە ﵂ پەردەیەکی بە دیوارەکەدا هەڵواسی بوو: عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای تەبوك گەڕایەوە و من عەباکەم بە دەرگای ژوورەکەمدا هەڵواسی بوو و لەگەڵ پەردەیەکی ئەرمەنی][١٠٢٦].

لە گێڕانەوەیەکی تردا: [پەردەیەکم بەسەر ڕەفەی ژوورەکەمدا هەڵواسی بوو. کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بەرەو ڕووی چووم و وتم: (اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يا رَسُولَ اللهِ، وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ) سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە سەربەرزو ڕێزداری کردیت، ئەویش تەماشای ناوماڵەکەی کرد و پەردەکەی بینی وەڵامی نەدامەوە و توڕەبوون بە ڕووخساریەوە دیاربوو تا چوو پەردەکەی داگرت و دڕانی و فەرمووی: ((لەوەی کەڕزقی داوین خودا فەرمانی پێ نەکردووین بەردوو قوڕ پەردە پۆش بکەین)). دواتر من کردم بەدوو کەرتەوە و دوو بەرگە دۆشەکم لێدروست کردن و ناوەکانیانم پڕکرد لە لیفی دار خورما و پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ ڕەخنەیەکی نەبوو بەرامبەری...][١٠٢٧].

## تەوبەکەی ئەبولوبابە

ئەبو لوبابە ﵁ یەکێك بوو لەو هاوەڵە چاکانەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دواکەوتبوون لە غەزای تەبوکدا. خۆی بەستەوە بە یەکێك لە کۆڵەکەکانی مزگەوت و دواجار خودا تەوبەکەی لێوەرگرت، بەسەر هاتەکەشی بە دوو گێڕانەوە هاتووە:

١-ئیبنو عەباس ﵁ دەفەرموێت: [ئایەتەکەی خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٠٢ ﴾ (التوبة) واتە: (موسوڵمانە بەجێماوەکان لەجیهاد و هەندێ خەڵکی تریش هەبوو دانیان بە گوناهو هەڵەکانی خۆیاندا نا، کە لە غەزای تەبووك لەبەر سستی خۆیان دواکەوتن پاشان تەوبەیان کردو پەشیمان بوونەوە هەندێ کارو کردەوەی چاکیان ئەنجامداو

(١٠٢٥) خرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٣٠٠).

(١٠٢٦) أخرجه: البيهقي (الكبرى) (٢١٠٢٣).

(١٠٢٧) أخرجه: مسلم (٢١٠٧)، وابوداود (٤١٥٣) واللفظ له، وابن حبان (٥٤٦٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

خراپیان تێکەڵکرد، بێگومان خوا لێیان خۆش دەبێت و تەوبەیان لێوەردەگرێت بە ڕاستی خوا بۆ گوناه زۆر لێبوردەیە، زۆریش میهرەبان و دلۆڤانە).

ئەوانە دەکەس بوون لەوانەی لە غەزای تەبوک دواکەوتبوون، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە حەوت کەسیان خۆیان بەستەوە بە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەلایاندا تێپەری و فەرمووی: ((ئەوانە کێن کە خۆیان بەستۆتەوە؟)) وترا: ئەوە ئەبو لوبابەو چەند هاوڕێیەکێتی دواکەوتبوون لە بەشداریکردن لە غەزای تەبوك و سوێندیان خواردوە کە کەس نابێت بیان کاتەوە تا خۆت بڕیار نەدەیت بیان کەیتەوە و پاساویان قبوڵ بکەیت. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( وَأَنَا أُقْسِمُ بِاللهِ لَا أُطْلِقُهُمْ وَلَا أَعْذِرُهُمْ حَتَّى يَكُونَ اللهُ هُوَ الَّذِي يُطْلِقُهُمْ: رَغِبُوا عَنِّي، وَتَخَلَّفُوا عَنِ الْغَزْوِ مَعَ الْمُسْلِمِينَ)) واتە: ((منیش سوێند دەخۆم بەخوا نابێت بیان کەمەوە و پاساویان قبوڵ ناکەم تا خوای گەورە خۆی بڕیار دەدات بیان کەمەوە، ئەوان پەیڕەوی نەریتی منیان نەکرد دواش کەوتن لە غەزای موسوڵماناندا)). ئەوانیش ئەو هەواڵەیان پێ گەیشت وتیان: ئێمەش خۆمان لەو کۆڵەکانە ناکەینەوە تا خوا بڕیارمان لەبارەوە دەدات. خوای گەورەش دواتر ئەم ئایەتەی دابەزند: ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾ ﴾ (التوبة) لە دوای دابەزینی تەوبەکەیان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت و ئازادی کردن و پاساوی قبوڵکردن [ئەوانیش دواتر سامانەکەیان هێنا بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان: ئەوە سامانەکانمانە لە بری ئێمە بیبەخشە لە ڕێی خوادا و داوای لێخۆش بوونمان بۆ بکە. فەرمووی: ((من فەرمانم پێ نەکراوە سامانەکانتان لێوەرگرم)) تا دواتر ئەم ئایەتە دابەری: ﴿ خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٞ لَّهُمۡۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾ (التوبة)[١٠٢٨] واتە: (لە سامان و داراییدا زەکات وەرگرە دڵ و دەروونیانی پێ پاك بکەرەوە، هەتا لە گوناهەکانیان پاك ببنەوە، چاکەکانیان فراوان ببێ بگەنە پلەی هەرە بەرز و دوعای چاکیان بۆبکە، چونکە دوعا و نزای تۆ، دڵئارامیی و ئۆقرە بەخشە بۆیان و خواش زۆر بیسەر و زانایە).

(١٠٢٨) أخرجه: الطبري (التفسير) (١٧١٣٦)، والبيهقي (الدلائل) (٢٧١/٥)، وقال السيوطي (لباب النقول) (ص:١٢٤): اسناده قوي، وقال ابراهيم العلي (صحيح اسباب النزول) (رقم:٢١٢): الحديث صحيح بشواهده.

٢-ئیمامی زوهری ﷺ دەفەرموێت: [ئەبو لوبابە دوا کەوتبوو لە بەشداریکردنی لە غەزای تەبوك. دواتر خۆی بەستەوە بەیەکێك لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە و وتی: سوێند بە خوا خۆم ناکەمەوە نان و ئاویش ناخۆم تا دەمرم یان ئەوەتا خوا تەوبەکەم لێوەردەگرێت. بەو جۆرە حەوت ڕۆژ مایەوە و هیچی نەخوارد تا وای لێ دەهات دەبوورایەوە پاشان خوا تەوبەکەی لێ وەرگرتوو پێی وترا: ئەوەتا خوا تەوبەکەی لێ وەرگرتیت!؟ وتی: سوێند بە خوا من بەدەستی خۆم خۆم ناکەمەوە تا پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی خۆی من دەکاتەوە. پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی خۆی کردیەوە و ئەبو لوبابەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەواوی تەوبەکردنەکەم لەوەدا دەبێت دوور دەکەومەوە لەو خانووە تیایدا توشی ئەو گوناهە بووم هەموو ماڵەکەشم دەبەخشم لەڕێگەی خوادا؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((تەنها دەتوانیت یەك لەسەر سێی بکەیتە خێر ئەبو لوبابە))][1029].

٣-سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو غەزای تەبوك چوو ئەبو لوبابەش دواکەوت و نەچوو، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە ئەبو لوبابە هات و سەلامی لێکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ رووی لێوەرگێڕا، ئەبو لوبابە زۆر ترساو خۆی بە کۆڵەکەی ناو مزگەوتەکەوە بەستەوە حەوت شەو و حەوت ڕۆژ بەو گەرمایە دڵۆپێك ئاویشی نەخواردەوە وتی: هەردەبێت ئەمە جێگام بێت تادەمرم یان خودا تەوبەکەم لێوەردەگرێت، بەو جۆرە هەموو بەیانی و ئێوارەیەك پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای دەکرد، پاشان خوا تەوبەکەی وەرگرت و جاڕ درا خوا تەوبەکەی لێوەرگرتووە و دواجار پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەدوایدا و ئەو وتی: دەبێت تەنها پێغەمبەری خوا ﷺ بمکاتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ چوو کردیەوە بە دەستی خۆی. ئەوە بوو ئەبولوبابەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دەبێت ئەو خانوەی لای خزمەکانم بەجێ بهێڵم کەتیایدا تووشی ئەوتاوانە هاتم و لە تۆ نزیك دەبمەوە و سامانەکەم دەبەخشم لەڕێی خوداو پێغەمبەردا. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((یەك لەسەر سێی سامانەکەت بەسە بیبەخشیت)) دواتر ئەبو

---

(١٠٢٩) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٩٧٤٦) وفي (التفسير) (١١٢٣) واسناده حسن كما في (صحيح اسباب النزول) (ص:١٣٥)، والطبري (التفسير) (١٧١٤٩) واسناده صحيح مرسل كما في (مرويات غزوة تبوك) (ص:٦٩)، وأخر الحديث: أخرجه: ابو داود (٣٣١٩) وقال الشيخ الألباني (صحيح ابي داود) (٢٨٤١) و (المشكاة) (٣٤٣٩): اسناده صحيح.

لوبابە بەڵێنەکەی خۆی بردە سەر وە هیچ تاوانێکی لێ نەبینرا تا دونیای بەجێ هێشت...][١٠٣٠].

٤-جابر ﷺ دەفەرمویێت: [ئەوان شەش کەس بوون: ئەبو لوبابە و ئەوسی کوڕی خوزام و سەعلەبی کوڕی وەدیعە و کەعبی کوڕی مالیك و مەرارەی کوڕی رەبیع و هیلالی کوڕی ئومەیە. ئەبو لوبابە و ئەوس و سەعلەبە خۆیان بەکۆڵەکەکانی ناو مزگەوتەوە بەستەوە دواتریش سامانەکانیان هێناو وتیان: بەهۆیەوە ئێمە لێت دواکەوتین... و خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾ ﴾ (التوبة).

وە قەتادەش ﷺ دەفەرمویێت: [ئەوان حەوت کەس بوون چواریان لەوانە بوون کاری چاکەیان تێکەڵ بەخراپە کردبوو ئەوانیش جیدی قەیس و ئەبو لوبابە و حەرام و میرداس... هەموویان لە ئەنساریەکان بوون][١٠٣١].

لە گێڕانەوەیەکی تردا لە جابرەوە ﷺ دەفەرمویێت: (ئەوانەی دواکەوتن لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەبوکدا شەش کەس بوون: ئەبو لوبابە و ئەوسی کوڕی خوزام و سەعلەبەی کوڕی وەدیعە و کەعبی کوڕی مالیك و مورارەی کوڕی ڕەبیعە و هیلالی کوڕی ئومەیە، ئەبو لوبابەو ئەوس و سەعلەبە خویان بەستەوە بە کوڵەکەکانەوە وە سەروەت و ماڵەکەیان هێناو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەمان لێوەربگرە کە لە تۆی دوورخستین، پێغەمبەری خوا فەرمووی: ((لا أَحلّهم حَتى يَكُونَ قِتالٌ)) واتە: خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾ ﴾(التوبة))[١٠٣٢]. واتە: موسوڵمانە بەجێماوەکان لەجیهاد بڕێ خەڵکی تریش هەیە دانیان بە گوناە و هەڵەکانی خۆیاندا نا، تەوبەیان کردوو پەشیمان بوونەوە هەندێ کارو کردەوەی چاکیان ئەنجامدا و بڕێکی خراپیان تێکەڵکرد بێگومان خوا لێیان خۆش دەبێ و تەوبەیان لێوەردەگرێت بە ڕاستی خوا بۆ گوناە زۆر لێبوردەیە، زۆریش میهرەبان و دلۆڤانە.

(١٠٣٠) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٧٠/٥) ومراسيل سعيد بن المسيب صحيحة عند أهل العلم.

(١٠٣١) أخرجه: ابن أبي حاتم (التفسير) (١٠٣٠٦)، و الطبري (التفسير) (١٧١٤٠) واسناده صحيح مرسل كما في: (مرويات غزوة تبوك) (ص:٦٦)، و (صحيح اسبابه النزول) (تحت الرقم: ٢١٢) (ص:١٣٤).

(١٠٣٢) أخرجه: ابو الشيخ وابن منده واسناده قويّ كما قال الحافظ في (الإصابة) (برقم: ٣٣٣).

## تەوبەکردنی کەعبی کوڕی مالیك ﷺ و هاوەڵانی

کەعب و هیلال و مراره دواکەتن لە بەشداربوون لە غەزای تەبوك هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و ڕاستیان کرد دواتریش بە هۆی ڕاستگۆییانەوە خوا تۆبەی لێقبوڵ کردن و بەسەرهاتەکەشمان لە چەندەها گێڕانەوە وە وەرگرتووە و دوای کۆکردنەوە و ڕێکخستنی بەم جۆرەیە:

[کەعب ﷺ دەفەرموێت: لە هیچ غەزایەکی پێغەمبەردا ﷺ دوانەکەوتوم جگە لە غەزای تەبوك، پێش تریش لە غەزای بەدر دواکەوتم و گلەیی لە هیچ کەسێك نەکرا لەوانەی لەو غەزایەدا دواکەوتبوون، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دەست بەسەراگرتنی کاروانەکەی قوڕەیش ڕۆیشتبوو [وە قوڕەیشیش بۆ بەهاناوە چوونی کاروانەکەیان هاتبوون] تا ئەوە بوو خودا هەردوو لایانی بەیەك گەیاند بێ ئەوەی هیچ لایەکیان چاوەڕوانی ئەوی تریان کردبێت. بەڵام من لەشەوی پەیمانی عەقەبەدا ئامادە بووم کاتێك بەڵێنی موسوڵمان بوونمان دایە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەم لە لا گرنگترە لە ئامادە بوونی غەزای بەدر، هەرچەندە غەزای بەدر لای خەڵکی دیارترە [دواتر من لە هیچ غەزایەکی تر دوانەکەوتم جگە لە تەبوك کە دواهەمین غەزای پێغەمبەری خوا ﷺ بوو][١٠٣٣].[ هۆکاری دواکەوتنیشم لەو غەزایە][١٠٣٤] ئەوە بوو هیچ کاتێك لە ژیانمدا وەك ئەو جارە دەوڵەمەندتر و بەتواناتر نەبووم کاتێك کە دواکەوتم و بەشداریم نەکرد، سوێند بەخوا پێشتر هەرگیز دوو وشترم بەیەکەوە نەبوو، بەڵام لەو کاتەدا هەم بوو [وە لەو کاتەشدا من زۆر بێ ئەرك و بەتوانا بووم بۆ جیهاد و خۆم دەخستە ژێر سێبەری درەخت و لەبەروبومی شیرینم دەخوارد و بەو جۆرە ژیانم دەڕۆیشت][١٠٣٥] پێشتر پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو غەزایەك بڕۆیشتایە ناوی نەدەهێنا [دەیفەرموو: ((الحَرْبُ خِدْعَة)) واتە: ((جەنگ فێڵ و پیلان گێڕانە))] بەڵام لە غەزای تەبوك دا (ناوی هێنا) چونکە لە کاتێکی زۆر گەرمدا بوو وە ڕووبەڕووی ناوچەیەکی بیابان و دوور دەڕۆیشت و [ڕوو بە] ڕووی دوژمنێکی

---

(١٠٣٣) أخرجه: أحمد (٢٧١٧٥) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(١٠٣٤) أخرجه: أحمد (١٥٧٨٩) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٠٣٥) أخرجه: أحمد (٢٧١٧٥) وقال محققوه: اسناده صحيح رجاله ثقات.

ژمارە زۆر دەبووەوە. لەبەر ئەوە هەموو شتێکی بۆ موسوڵمانان ڕوونکردەوە تا خۆیانی زۆر باش بۆ ئامادەبکەن، موسوڵمانانیش ژمارەیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بوو کە پەرتوکێك جێی ناوەکانیانی تیا نەدەبووەوە. هەرکەسێکیش بیوستایە بەشدار نەبێت گومانی وادەبوو کە ئاشکرا نەبێت مەگەر لە بارەیەوە نیگای خودا دابەزێت، لەو کاتەشدا بەروبووم تازە پێ دەگەیشت و ژێر سێبەریش زۆر خۆش بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ و موسوڵمانان خۆیان ئامادەکرد، [ڕۆژی پێنج شەممە بەڕێکەوتن چونکە سەفەرکردنی لە ڕۆژی پێنج شەممەدا پێخۆش بوو][1036].

بەڵام من هێشتا کەلوپەلی خۆمم ئامادە نەکردبوو، [وتم: بەیانی دەچمە بازاڕ و کەلوپەلی پێویست دەکڕم پاشان بەدوایاندا دەڕۆم، بەیانی ڕۆیشتم بۆ بازاڕو هەندێك کارم لەسەر گران بوو گەڕامەوە و [لە دڵی خۆمدا وتم: هەرکات من بمەوێت دەتوانم خۆم ئامادە بکەم][1037] وتم: بەیانی بە پشتیوانی و ویستی خودا پێیان دەگەمەوە بەڵام هەندی کارم بۆ جێ بەجێ نەکرا، بەو جۆرە بەردەوام بووم تا کەوتمە ناو تاوانەکەوە] و موسوڵمانان خێرا بەڕێکەوتن و ڕۆیشتن و ئەوکاتە ویستم بڕۆم پێیان بگەمەوە خۆزگە وامدەکرد، بەڵام بۆم جێ بەجێ نەکرا، لە دوای دەرچوونی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسوڵمانان (دەگەڕام بەشاردا) ئەوە دلگرانی کرد بووم تەنها دووڕوویەکم دەبینی یاخود یەکێك لەوانەی هەژار و بێتوانابوون. پێغەمبەریش ﷺ ناوی منی نەهێنابوو تا گەیشتبووە تەبوك، کاتێك لەوێ لەناو هاوەڵانیدا بوو [فەرمووبووی: ((کەعبی کوڕی مالیك چیکرد؟)) یەکێك لە خزمانم] لەبەنی سەلەمە وتبووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو بایەخدانی بە جوانی و پاکی جل و بەرگەکانی دوایخست و نەهات. موعازی کوڕی جەبەلیش وەڵامی دابووە وە وتبووی: زۆر خراپت وت، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بە خوا تەنها هەر خێر و چاکەمان لێبینیوە. پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو [لەو کاتەدا ئەوان پیاوێکیان لە دوورەوە بەرچاوکەوتبوو وە نەیان دەزانی کێیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەبو خەیسەمەبە)) دواتر کە گەیشتبووە لایان ئەو بوو].

کاتێك هەواڵی گەڕانەوەی موسوڵمانانم پێ گەیشت کە [لە مەدینە نزیك بوونەتەوە]

(١٠٣٦) أخرجه: البخاري: (٢٩٥٠).

(١٠٣٧) أخرجه: أحمد (١٥٧٨٩) وقال محققوه: اسناده على شرط مسلم.

لەوکاتەدا بیرم لە درۆکردن دەکردەوە و دەم وت: بەچی من خۆم لە توڕەبوونی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕزگاربکەم و پرسم بە هەموو دانایەکی خزمانم دەکرد، کاتێك پێم وترا، وا پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت ئەوکاتە من هەموو نارەواییەکم لێدوور کەوتەوە و زانیم کە من هەرگیز ڕزگارم نابێت بەشتێك درۆی تێدا بێت [بەڵکو تەنها بە ڕاستگۆیی من ڕزگارم دەبێت] [بۆیە بڕیارمدا ڕاستگۆبم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانی پێغەمبەری خوا ﷺ [لە کاتی چێشت تەنگاو گەڕایەوە ناو شار و هەموو جارێك سەرەتا دەچووە مزگەوت] و دووڕکات نوێژی دەکرد و پاشان لەوێ دادەنیشت بۆ ئەوەی پێشوازیکاران بێن بۆ لای. لەوێدا ئەوانەی دواکەوتبوون هەموو دەهاتن و پاساوی خۆیان بۆ دەهێنایەوە و سوێندیان بۆ دەخوارد و ئەویش ڕووی ئاشکرایانی لێوەردەگرتن و بەڵێنی لێ وەردەگرتن و ناخی دڵیانی بۆ لای خوا دەگێڕایەوە. ژمارەیان لە هەشتاو سێ کەس زیاتر بوون. [پاشان منیش چوومە ناو مزگەوت و پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو] چوومە خزمەتی سەلامم لێکرد [تەماشام کرد بە زەردەخەنەیەکی توڕەبوونەوە سەیریکردم].

پاشان فەرمووی: ((وەرە)) منیش چووم و لەبەردەمیدا دانیشتم پێی وتم: ((ئایا تۆ وشترت بۆ خۆت نەکڕیبوو؟)) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەی چی دوای خستیت لە من؟))] [وتم]: من سوێند بەخوا ئەگەر جگە لە تۆ لای کەسێکی تری خەڵکی دونیا دانیشم دەتوانم پاساوی وای بۆ بهێنمەوە کە لە توڕەبوونی دەرچم، چونکە من قسەزانم، بەڵام سوێند بە خوا دەزانم گەر ئەمڕۆ قسەیەکت لەگەڵدا بکەم و درۆی تێدا بکەم بۆ ئەوەی لێم ڕازی بیت دەزانم نزیکە ئەو کارەم خودا توڕە بکات لە من، وە گەر من قسەی ڕاستت لەگەڵدا بکەم بەهۆیەوە لێم دڵ گران بیت من بە ئومێدی لێبووردنی خودام، نا سوێند بەخوا هیچ عوزر و پاساوێکم نییە، سوێند بە خوا هیچ کاتێك نەبووە من بەهێزتر و ساماندارتر [و بێ کێشەتر بم] لەوکاتەی کەتێیدا دواکەوتم لەم غەزایە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئائەمە ڕاستیکرد هەستە (وچاوەڕێبە) تاخودا بڕیارت لە بارەوە دەدات)).

ئیتر لەوێ هەستام و پیاوێکی خزمم لە بەنو سەلەمە لەگەڵم هات [و سەرزەنشتی دەکردم] دواتریش هەندێك لە خزمانم دوام کەوتن و پێیان وتم: سوێند بەخوا ئێمە

نەمان زانیوە (وە نەمان بینیوە) پێش ئەمە تۆ هیچ تاوانێکت ئەنجامدا بێت، ئەی بۆ پاساوێکی وەهات نەهێنایەوە تا پێغەمبەرت ﷺ لێ ڕازی بێت] بۆ نەت دەتوانی تۆش وەك و ئەوانیتر کە دواکەوتبوون پاساوی خۆت بهێنیتەوە، ئەوکات تەنها لێخۆش بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بەس بوو بۆ سڕینەوەی تاوانەکەت [و خۆت نەدەخستە ئەم قەیرانەوە و نازانی خوا دواتر چ بڕیارێکت لە بارەوە دەدات]. سوێند بە خوا خزمانم بەردەوام بەو جۆرە سەرزەنشتیان دەکردم تا نزیك بوو لەوەی بگەڕێمەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتەکانی پێشوو تری خۆم بە درۆ بخەمەوە، پاشان پێم وتن: [ئایا هیچ کەسێکیتر وتەکانی وەك و من بووە؟] ئایا کەسی تر هەیە وەك و من توشی بووبێت؟ وتیان: بەڵێ دوو پیاوی تریش وەك و تۆیان وت و وەك و تۆشیان پێ وترا. وتم: ئەو دووانە کێن؟ وتیان: مەرارەی کوڕی ڕەبیعی عەمری وە هیلالی کوڕی ئومەیە. خزمانم باسی دوو پیاوی [چاکیان] بۆ کردم کە هەردووکیان بەشداری جەنگی بەدریان کردبوو. ئەوان سەرمەشقێك بوون بۆم. کە ئەومیان بۆ گێڕامەوە و ڕۆشتم [وتم: سوێند بەخوا ناگەڕێمەوە لای و خۆم بە درۆ ناخەمەوە].

دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریدا تێکڕای موسوڵمانان قسە لەگەڵ ئەوسێ کەسەمان نەکەن و بەتەنها ئێمەی جیاکردەوە لە هەموو ئەوانەی لەو غەزایەدا دوا کەوتبوون] ئیتر خەڵکی هیچ قسەیەکیان لەگەڵ نەدەکردین و تەواو لەگەڵمان گۆڕان تا وام لێهاتبوو خۆم بە کەسێکی نامۆ دەزانی لەو ناوە [ئەو بارو دۆخە درێژەی خایاند و نیگەرانی هەرە گەورەم لەوەدابوو دەترسام لەو ماوەیەدا بمرم و پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژم لەسەر نەکات یاخود لەو ماوەیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ وەفات بکات و من لەو پلەیەدا بمێنمەوە و کەس قسەم لەگەڵ نەکات و کەس نوێژم لەسەر نەکات][١٠٣٨].

[لەوماوەیەدا دەچوومە بازاڕو کەس قسەی لەگەڵ نەدەکردم من و هاوڕێیانم واماندەزانی ئەوانە هیچ یەکێکیان ناناسین] هەردوو هاوڕێکەی ترم لەماڵەکانیان مانەوە و دانیشتبوون هەر دەگریان [بەشەو و بەڕۆژ سەریان لە ماڵەکانیان نەدەهێنایە دەرەوە] بەڵام من لەهەردووکیان گەنجتر و بەتواناتر بووم و لە کاتی نوێژەکاندا

(١٠٣٨) أخرجه: البخاري (٤٦٧٧).

دەچووم لەگەڵ موسوڵمانانندا نوێژەکەم دەکردو بە بازاڕدا هاتوچۆم دەکرد وە کەسیش قسەی لەگەڵ نەدەکردم، دەچوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە دانیشتنی دوای نوێژەکانیدا سەلامم لێدەکرد و لە دڵی خۆمدا دەم وت: ئایا هەردوو لێوی جوڵاند بۆ وەڵام دانەوەی سەلامەکەم یان نا؟ پاشان [لای پایەیەکی] نزیکیەوە نوێژم دەکرد و بە تیلەی چاو سەیرم دەکرد، هەرکات من نوێژم بکردایە ئەو ڕووی تێدەکردم، وە هەر من ڕووم تێ بکردایە ئەو ڕووی لێ وەردەگێڕام. ئەو دۆخەم زۆر درێژەی خایاند و خەڵکی ئاوها بوون لەگەڵماندا تا ڕۆژێکیان بەسەر دیواری باخە خورماکەی ئەبو قەتادەی ئامۆزامدا چوومە ئەو دیو باخەکە. ئەبو قەتادەم لە خەڵکی لەلا خۆشەویستتر بوو چوومە لای و سەلامم لێکرد، سوێند بەخودا وەڵامی سەلامەکەی نەدامەوە، وتم: ئەبو قەتادە لەبەر خودا پێم بڵێ ئایا تۆ دەزانیت کە من خوا و پێغەمبەرم خۆش دەوێت؟ ئەو بێدەنگ بوو، دووبارە داوام لێ کردەوە هەر بێ دەنگ بوو وە سێ بارەم لێکردەوە وتی: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن. منیش هەردوو چاوم پڕبوو لە فرمێسك و بەجێم هێشت و بەسەر دیوارەکەدا چوومە دەرەوە.

کاتێ من لە بازاڕی مەدینەدا هاتوچۆم دەکرد [پیاوێکی گاوری ناوچەی ئەنباتی شام لەوانەی کە ئازوقەیان بۆ مەدینە دەهێناو دەیان فرۆشت دەی وت: کێ دەم بات بۆلای کەعبی کوڕی مالیك؟ خەڵکی لەوێدا دەستیان بۆ من ڕاکێشا، تا ئەو پیاوە هات بۆلام و نامەیەکی پاشای غەسانی بۆ هێنابووم کردمەوە و تەماشا دەکەم نوسیویەتی: هەواڵم پێگەیشتوە کە (موحەممەدی) هاوەڵت فەرامۆشی کردوویت و لێت دوورە پەرێزە، خوا تۆی نەکردۆتە جێیەکەوە ڕسوا و ون ببیت تیایدا خۆت بگەیەنەوە لامان خزمەت و هاوکاریت دەکەین. منیش لە دوای خوێندنەوەی نامەکە وتم: ئەمەش بەڵایەکی ترە (إنا للّهِ وَإنا إليهِ راجِعونَ) کافرەکانیش چاویان تێبڕیووم و دەیانەوێت بم قۆزنەوە][١٠٣٩].

لەوێدا نامەکەم هەڵدایە ناو تەنورێکەوە و سوتاندم. بەم جۆرە مامەوە تا چل شەوە لە پەنجا شەو کە بەڕێم کرد. پاشان نێردراوی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لام و پێی وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانت پێ دەکات دووربکەویتەوە لە ژنەکەت.

---

(١٠٣٩) أخرجه: ابن أبي شيبة (المنصف) (٣٨١٦٢)، والطبراني (الكبير) (١٩٥/١٩).

وتم: تەلاقی بدەم یان چی بکەم؟ وتی: نا بەڵکو خۆتی لێ دوور بگرە وە نزیکی نەکەویتەوە، وە هەمان فەرمانیش بۆ دوو هاوەڵەکەی ترم چوو بوو. منیش بە ژنەکەمم وت: بچۆرەوە بۆ ماڵی باوکت و لەوێ ببە تا خوای گەورە ئەم کارە یەك لا دەکاتەوە. بەلاّم ژنەکەی هیلالی کوڕی ئومەیە چووبووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پێی وتبوو: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیلالی کوڕی ئومەیە پیرێکی بێکەسە و هیچ کەسێکی نییە خزمەتی بکات ئایا پێت ناخۆش نییە من خزمەتی بکەم؟ فەرمووی: ((نا بەلاّم با لێت نزیك نەبێتەوە)). ژنەکەی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەخوا جوڵەی تیا نەماوە بۆ هیچ شتێك سوێند بەخودا ئەو بەردەوام [شەو و ڕۆژ پاڵکەوتووە و هەر دەگری] لەو ڕۆژەوەی ئەمەی بەسەر هاتووە تا ئەمڕۆ. کەعب دەڵێت: منیش هەندێك لە خزمانم پێیان وتم: با تۆش خێزانەکەت بڕوا ئیزن بخوازێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەك خێزانی هیلالی کوڕی ئومەیە ئیزنی خواست خزمەتی مێردەکەی بکات. وتم: سوێند بەخودا کاری واناکەم و نازانم گەر من ئەو داوایەم کرد چیم توش دەبێت من پیاوێکی گەنجم.

دوای ئەوە دە شەوی تریشم بەسەردا ڕۆیشت وە بەتەواوی بووە پەنجا شەو لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ قسەکردنی قەدەغە کرد لەگەڵماندا [ ئینجا خوای گەورە تۆبەی ئێمەی وەرگرت وە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وەحی دابەزاند لەکاتی کۆتایی شەودا، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵی ئوم سەلەمە بوو. ئوم سەلەمەش لەگەڵم چاکەکاربوو بایەخی بەم کێشەیەم دەدا. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( ئوم سەلەمە کەعب تۆبەکەی لێوەرگیرا)). ئەویش وتی: ئایا کەسێك نەنێرم بۆلای مژدەی پێ بدەم. فەرمووی: (( گەر وابکەی خەڵکێکی زۆرت لێکۆدەبنەوە و خەوی ئەمشەوت لێتێك دەدەن))][١٠٤٠]. منیش لەبەیانی پەنجا هەمین شەودا لەسەربانی یەکێك لەماڵەکانم دانیشت بووم بەو حاڵەی کە خودا لە ئایەتەکە باسیکردووە: خۆم لە خۆم بێزار بووم وە هەموو زەویم لەبەردەمدا لێ تەسك ببووەوە. لەو کاتەدا گوێم لە هاواری پیاوێك بوو چووە سەر چیای سەلەع وە بە هەموو هێزی هاواری دەکرد: (ئەی کەعبی کوڕی مالیك مژدەت لێ بێت. منیش یەکسەر سوجدەم بۆ خوابردوو

(١٠٤٠) أخرجه: البخاري (٤٦٧٧).

زانیم [کەخوا دەرووی خێری لێکردووینەتەوە] لە دوای نوێژی بەیانیش پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی لێ ئاگادار کردبووەوە کە خوا تەوبەکەی لێ قبوڵ کردووین. ئینجا خەڵکی بڵاوبوونەوە بۆ ئەوەی مژدەمان بدەنێ و هەندێکان بەرەو دوو هاوەڵەکەی ترم ڕۆیشتن پیاوێك بە سواری ئەسپەکەیەوە بەرەو لای من دەهات و یەکێکی تریش چووە سەر بەرزایەکەو مژدەی پێدام وە دەنگەکەی پێش سوارەکە گەیشتە لام و دواتر پیاوەکەی سەر بەرزاییەکە هاتە لام و منیش دوو جلی جوانم لەبەردابوو بۆم دانا لەڕاستی دا من هەر ئەو دوو جلەم هەبوو کردمە دیاری بۆی، دوو جلی ترم لە یەکێك خواست و لەبەرم کردو بەرەو لای پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتم و خەڵکی پۆل پۆل دەهاتنە لام و پیرۆز بابیان لێ دەکردم و دەیان وت: وەرگرتنی تەوبەکەت لەلای خواوە لێ پیرۆز بێت. ڕۆیشتم تا چوومە ناو مزگەوت. پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو خەڵکیش لە چوار دەوری بوون. لەوێدا تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا خێرا بەرەو لای من هات و تەوقەی لەگەڵ کردم و پیرۆزبایی لێکردم، سوێند بە خوا لە ناو هەموو موهاجیرەکاندا تەنها ئەو هەستاو پیرۆزبای لێکردم و ئەو چاکەیەی ئەوم هەگیز لەیاد ناچێت.

ئینجا چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامم لێکرد ئەویش ڕووی تەواو گەش بوو بوو لە خۆشیدا و فەرمووی: ((أَبْشِرْ بِخَيْرِ يَوْمٍ مرَّ عَلَيْكَ مُنْذُ وَلَدَتْكَ أُمَكَ. قُلْتُ: أَمَنْ عِنْدكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمْ مِنْ عِنْدَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((لا بَلْ مِنْ عِنْدَ اللّهِ [أَنْكُمْ صَدَقْتُمْ اللّه فَصَدَقَكُمْ)))][١٠٤١] واتە: ((مژدەت لێ بێت بە باشترین ڕۆژێك بەسەرتا تێپەڕیوە لەوکاتەوە کە تێیدا لەدایك بوویت)). وتم: ئایا مژدەکە لەلایەن تۆومیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ یان لە لایەن خوداومیە؟ فەرمووی: ((نا بەڵکو لە لایەن خوداومیە [ئێوە ڕاست بوون لەگەڵ خوادا خوداش ئێوەی بەڕاست دەست نیشان کرد])). [پاشان ئەو ئایەتەی خودای بەسەردا خوێندینەوە ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ

(١٠٤١) أخرجه: ابن أبي شيبة (المصنف) (٣٨١٦٢)، والطبراني (الكبير) (٢٩٥/١٩).

ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾ (التوبة).

واتە: (چوون بۆ جیهاد فەرمان و کارێکی براوەی خوایە، بۆیە هەر جۆرە دواکەوتنێك بێ بیانووی شەرعیی وەرناگیرێ و تۆڵەی هەیە.. بۆیە خوا لەوکارەی پێغەمبەریش خۆش بوو کە مۆڵەتی دەستەیەك لەدووڕووەکانیدا کە لەگەڵی نەچن بۆ جەنگی تەبوك وە لە کۆچکەران و پشتیوانانیش خۆشبوو کەهەندێکیان چوونە جیهاد و هەندێکیشیان خۆیان بە زەوییدا جێگیر کرد ئەوانەیان کە لە جەنگە سەختەکەی (تەبوك)دا دوای پێغەمبەر کەوتن و پەیڕەوییان لێکردو چوونە تەبوك پاش ئەوە خەریکبوو هێندێکیان دڵیان لاڕێ بگرێت و نەچنە جیهادەکەوە! پاشان دووبارە خوا تەوبەی لێوەرگرتن چونکە بەڕاستیی خوا بەرامبەر بەوانە زۆر بەلوتفە، و سەر گزوشتەی سێ هاوەڵە جێماوەکان خوا تەوبەی لەو سێ کەسەش وەرگرت کەخۆیان لە غەزاکە دواخست، تا لەخەفەتدا وایان لێهات ئەم زەوییە فراوانەیان لاتەنگ بوو، وە لەخەم و خەفەتا لە گیانی خۆیان بێزاربوون، لەپاشاندا خوا ڕێنمایی تەوبەی کردن، بۆئەوە تەوبە بکەن، ئیتر ئەوانیش تەوبەیان کردو خوا بەخشینی، بە ڕاستی لێیان خۆشبوو تەنها هەر خودا قەبووڵکاری تەوبەیە و لێبوردەیە).

وە پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکات دڵخۆش بووایە ڕووخساری وەکو مانگ دەدرەوشایەوە ئێمەش پێمان دەزانی. کاتێك من چووم لەبەردەمیدا دانیشتم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەواوی تەوبەکەم لەوەدایە کەمن هەموو سامانەکەم دەبەخشم بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی فەرمووی: ((أَمْسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مَالِكَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ)) واتە: ((هەندێکی سامانەکەت بهێڵەرەوە لات ئەوە باشترە بۆت)) وتم: باشە من بەشەکەی خەیبەرم دەهێڵمەوە، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من خوا بەڕاستگۆیی ڕزگاریکردم. هەر لەم تەوبەیەمەوە دەبێت هەتا لە دونیادا ماوم هەر ڕاستگۆبم.

کەعب ﷺ دەفەرموێت: سوێند بەخوا بڕواناکەم هیچ یەکێك لە موسوڵمانان ئەوها خوا بە جوانی تاقی کردبێتەوە لە ڕاستگۆییدا بە وێنەی من. ئا لەو ڕۆژەوە کە ئەوەم بە پێغەمبەری خوا ﷺ وتوە من هیچ درۆیەکم نەکردووە و ئومێدەوارم هەتا لە ژیاندا ماوم خودا بم پارێزێت. سوێند بە خوا لە دوای موسوڵمان بوونمەوە خودا هیچ نیعمەتێکی پێ نەداوم لەدڵمدا گەورەتر بێت لەوەی کەمن ڕاستگۆ بووم لەگەڵ

پێغەمبەری خوا ﷺ وە درۆم لەگەڵ نەکرد نەبادا لەناو بچم وەك ئەوانەی تر کەلەناو چوون، خوای گەورە توند ترین هەڕەشەی فەرمووە بەوانەی کە درۆیان کرد لە گەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ﴿ سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ ﴾ (التوبة) واتە: (دووڕووەکان هەر کە لەتەبوك هاتنەوە لایان، خێرا سوێندتان بەخوا بۆ دەخۆن کە توانای هاتنمان نەبوو لەگەڵتاندا بێینە غەزاکە بۆیە نەهاتیین هەتا وازیان لێبهێنن و ناویان نەبەن دەسا وازیان لێبهێنن و وێڵیان بکەن و مەیاندوێنن و نرخیان بۆ دامەنێن چونکە خۆیان و کارو کردەومیان پیس و ناپاکە و جێ و شوێنیان ئاگری دۆزەخە، ئەمە تۆڵەیانە لەبەر ئەوکارو کردەوەی کردوویانە).

تەنها سێ کەسەکەی ئێمە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ کارەکەی دواخستین تا خوای گەورە خۆی بڕیاری لە بارەوە دا وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَعَلَى الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّىٰ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوا أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ اللَّهِ إِلَّا إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ (التوبة) واتە: (خوا تەوبەی لەو سێ کەسەش وەرگرت کەخۆیان لە غەزاکە دواخست و مانەوەو نەچوونە جەنگی تەبوك تا لەخەفەتدا وایان لێهات ئەم زەوییە فراوانەیان لاتەنگ بوو لە گیانی خۆیان بێزار بوون، ئیتر زانییان کە هیچ پەنایەکیان نەماوە، مەگەر هەر پەنا بۆ خوا بەرن بە ڕاستی تەنها ئەو خوایە قەبووڵکاری تەوبەیە و لێبوردەیە، زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە) بەڵام ئەوانیتر سوێندی (درۆیان) بۆ خوارد و لێیان قایل بوو بەڵێنی لێ وەرگرتن و داوای لێخۆش بوونی بۆ کردن...][١٠٤٢].

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەبوك گەڕایەوە پرسیاری هاتنی ڕۆژی دواییان لێکرد و فەرمووی: (لَا تَأْتِي مِائَةُ سَنَةٍ وَعَلَى الْأَرْضِ نَفْسٌ مَنْفُوسَةٌ الْيَوْمَ)) واتە: ((ئەوانەی ئەمڕۆ لەسەر زەویدان سەد ساڵیتر هیچیان نامێنن))][١٠٤٣].

---

(١٠٤٢) أخرجه: البخاري (٤٤١٨) واللفظ له و الزيادات، للبخاري (٤٦٧٧،٢٩٥٠)، ومسلم (٢٧٦٩)، وأحمد (١٥٧٨٩،٢٧١٧٥) وابن أبي شيبة (المصنف) (٣٨١٦٢) والطبراني (الكبير) (١٩٥/١٩).

(١٠٤٣) أخرجه: مسلم (٢٥٣٩).

## دەرەنجامەکانی غەزای تەبوک

ئەم غەزایە سەروەریی و دەسەڵاتی موسوڵمانانی جێگیرکرد لەسەر بەشی سەرووی دورگەی عەرەبی و سەرەتایەك بوو بۆ گەیاندنی ئیسلام بۆ دەرەوەی دورگەی عەرەب و بۆ ئازادکردنی عێراق و شام. وەشکۆی ڕۆمەکانی لە دڵی عەرەبەکاندا شکاند و سەلماندی موسوڵمانان چەند بە تواناو بەهێزن بۆ بەرەنگاربوونەوەی ڕۆمەکان و ئازادکردنی ئەو ناوچانە. وە ئەم غەزایە توانی هۆزە عەرەبەکان والێبکات ئیسلام قبوڵ بکەن و نوێنەرانیان بنێرن و موسوڵمان ببن. ئەم غەزایە پاکسازیی بوو بۆ ڕیزەکانی موسوڵمانان لەو دووڕووانەی کە هێشتا لە مەدینە و دەرەوەی مەدینەدا مابوون وە کۆتایی هێنا بەرکە بەرایەتی ڕۆمەکان و دژایەتی ئاشکرایان دژ بەموسوڵمانان، ئیتر لەوە بەدواوە نەخۆی و نەگاورە عەرەبەکان نەیانتوانی ڕووبەڕووی موسوڵمان و بانگەوازەکەیان ببنەوە لە دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ هێڵێکی بەرگری بە هێزی بۆ موسوڵمانان هێنایە ئاراوە لەڕێگەی هاوپەیمانێتی لەگەڵ هەموو ئەو هۆز و لایەنانە و ئەوانیش بۆیان ڕوون بووەوە کە هاوپەیمانیان لەگەڵ ڕۆمەکان هیچ سودێکیان پێ ناگەیەنێت بۆیە دواجار لەگەڵ موسوڵمانان پێکهاتن و سەرانەیان پێدان.

## هاتنی وەفدی سەقیف

لە دوای ئازادکردنی مەککە و گەمارۆدانی شاری تائیف پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری گەڕانەوەی دا و گەمارۆکەی لەسەریان هەڵگرت و دوعای هیدایەت و هاتنە ناو ئیسلامی بۆ کردن.

لە دوای موسوڵمان بوونی مالکی کوڕی عەوف نەسر رضي الله عنه پێغەمبەری خوا ﷺ کردیە فەرماندەی ئەوانەی موسوڵمان ببوون لە قەومەکەی و ئەویش لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی توندی خستبووە سەر تائیف و لەگەڵیاندا دەجەنگی، تاناچاریکردن خۆیان بدەن بەدەستەوە. لە پێش هەموویانەوە عروەی کوڕی مەسعود هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ موسوڵمان بوو پاشان گەڕایەوە ناو سەقیف و شەهیدیان کرد، ئەم باسەشمان لە پێشتردا باسکرد پێویستە لێرەشدا باس بکرێت بۆ بیرهێنانەوە:

موسای کوڕی عوقبە رضي الله عنه و عروەی کوڕی زوبەیر رضي الله عنه دەفەرموون: [عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و موسوڵمان بوو. پاشان داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد تا ڕێگەی بدات بگەڕێتەوە ناو قەومەکەی خۆی و پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((من دەترسم بتکوژن)). عروە وتی: ئەوان ببینن من لە خەودام هەڵم ناسێنن، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی داو لە شەودا گەڕایەوە شاری تائیف و هۆزی سەقیف هاتن بۆلای و بەخێر هاتنەوەیان لێ کرد. ئەویش بانگیکردن بۆ لای ئیسلام و ئامۆژگاری کردن بەڵام ئەوان تۆمەت باریان کرد و سەرپێچیان کرد و هەندێك وتەی نابەجێیان پێ وت و دانیشتنەکەیان بەجێ هێشت. دوای پارشێو و کاتێك نوێژی بەیانی هات عروە چووە سەربانی ماڵەکەی و بانگیدا و گەیشتە شایەتوومان لەوکاتەدا پیاوێك تیرێکی تێگرت و کوشتی. دەڵێن دواتر ئەو هەواڵە گەیشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووبووی: ((نمونەی عروە وەك نمونەی پیاوەکەی قەومی یاسینە کە خزمانی بۆ لای خودا بانگکرد و ئەوانیش کوشتیان))[(١٠٤٤)].

ئیبنو ئیسحاق رحمه الله دەفەرموێت: [...هۆزی سەقیف چەند مانگێك لە دوای کوشتنی عوروە لەگەڵ یەکتردا ڕاوێژیان دەکرد و دەیانزانی توانای بەرەنگاربوونەوەی هەموو عەرەبەکانی چواردەوریان نییە دواتر هاتن و موسوڵمان بوون... عەمری کوڕی ئومەیەی زەمری چووە لای ناوداری سەقیف کە ناوی (عبد یالیل) بوو پێی وت: دۆخێکی وەهامان بەسەردا سەپاوە کە ڕزگاربوونمان لێی ئەستەمە و خۆتان بینیتان و عەرەبەکانیش هەموو موسوڵمان بوون، دواتر بەتەنها ناتوانن بەرەنگاری هەموو عەرەبەکان ببنەوە بۆیە بەزوویی پێویستە ڕاوێژی خۆتان بکەن. ئیتر سەقیف کەوتنە ڕاوێژکردن لەناو خۆیاندا و هەندێکیان بەوانی تریان دەوت: ئەوەتا نابینن هیچ ڕێگەیەکی دەرباز بوونتان بێ ترس نییە وە هەرکەسێکتان بچێتە دەرەوە دە گیرێت. دواتر بڕیاریاندا پیاوێك وەك عوروە بە نوێنەر بنێرن. هەموو داوایان لە (عبد یالیل) کرد کە هاوتەمەنی عوروە بووە ئەو بڕوات بەڵام ئەو قایل نەبوو دەترسا ئەویش لە دوای گەڕانەوەی وەك و عروەی لێبکەن بۆیە پێی وتن: من ئەوکارە

(١٠٤٤) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣٧٥/١٧،٣٧٤)، والحاكم (٦١٥/٣)، وموسى بن عقبة (المغازي) (ص:٣٠٨)، و البيهقي (الدلائل) (٢٩٩/٥)، وقال الهيثمي (المجمع) (٣٨٦/٩): اسناده حسن وضعفه الشيخ الألباني في (الضعيفة) (٦٢٨٠).

ناکەم تا پیاوانێکی ترم لەگەڵدا نەنێرن. دواتر بڕیاریدا دوو پیاوی هاوپەیمان و سێ پیاویش لەبەنی مالیك بنێرن تا ژمارەیان شەش کەس بێت...].

لە گێڕانەوەکەی موسای کوڕی عوقبەدا هاتووە: [...لە دوای کوشتنی عوروە هەندێك لە پیاوە ناوداراکانی سەقیف کە کینانەی کوڕی عەبد یالیل سەرکردەیان بوو وە عوسمانی کوڕی ئەبو عاصیشیان لەگەڵدا بوو کە لە هەموویان تەمەنی کەم تربوو. هەموو چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەدینە بە مەبەستی رێکەوتن لە دوای ئازاد کردنی شاری مەککە و موسوڵمانان بوونی هەموو هۆزەکانی عەرەب..][1045].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: ((... کاتێك ئەو وەفدە لەمەدینە نزیکبوونەوە و لای چەمەکە لایاندا لەوێ موغیرەی کوڕی شوعبەیان پێ گەیشت کەنۆبەی لەوەڕاندنی وشترەکانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو... کاتێك موغیرە ئەوانی بینی وشترەکانی لایان بەجێ هێشت و زۆر بەخێرایی هات تا مژدەی هاتنیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ بگەیەنێت، سەرەتا بە ئەبوبەکر گەیشت و هەواڵەکەی پێدا کەئەوان هاتوون تا موسوڵمان ببن و بەڵێن بدەن بە پێغەمبەری خوا ﷺ وە لەسەر چەند مەرجێك رێکبکەون. لەوێدا ئەبوبەکر بە موغیرەی فەرموو: سوێندت لێدەخۆم نابێت پێشم بکەویت لەگەیاندنی ئەم هەواڵەدا. موغیرەش قایل بوو. ئەبوبەکر چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی هاتنی ئەوانی پێ گەیاند، پاشان موغیرە گەڕایەوە لایان و وشترەکانی بۆ پشووی نیوەڕوان لەگەڵیاندا هێنایەوە و فێریکردن دەبێت چۆن سەلام لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن... بەڵام ئەوان هەر سووربوون لەسەر سڵاوی زەمانی نەفامیان.

کاتێك هاتن پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەشماڵێکی بۆ هەڵدان لەگۆشەیەکی ناو مزگەوتدا..) وە لەگێڕانەوەیەکی تردا (... چەند ڕەشماڵێکی لەناو مزگەوتدا بۆ هەڵدان تا موسوڵمانان ببینن لەکاتی نوێژەکانیانداو قورئان ببیستن][1046]. عوسمانی

---

(١٠٤٥) انظر: (المغازي) لموسى بن عقبة (ص:٣٠٨) وعنده ان وفد ثقيف اتى بعد حج ابابكر ﷺ، والصحيح أن الوفد اتوا قبل حجة أبا بكر ﷺ كما قال ابن كثير (البداية) (٦٨٥/٤).

(١٠٤٦) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨٣٥٦)، وقال الهيثمي (المجمع) (٣٧١/٩): رجاله رجال الصحيح غير حكيم بن حكيم

کوڕی ئەبوعاس ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: [من لەگەڵ وەفدەکەی سەقیف بووم لەوکاتەدا چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ. کاتێك نزیك بووینەوە جل و بەرگە جوانەکانمان لەبەرکرد و وتیان: کێ لای وشترەکانمان دەمێنێتەوە؟ چونکە ئەوان هەموو حەزیان دەکرد بچنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و بەجێ نەمێنن. بەڵام من تەمەنم لە هەموویان کەمتر بوو پێم وتن: گەر دەتانەوێت من لە لایان دەمێنمەوە بەڵام دەبێت بەڵێنم بدەنێ بە خوا دواتر یەکێکتان بێتە جێگەکەم؟ وتیان: باشە، هەموویان چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وپاشان بۆ پشوو گەڕانەوە و دواتر من بەتەنها چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوابکە لە خوای گەورە زانام بکات لەم ئاینەدا و لێی تێبگەم. فەرمووی: ((ئەوە چیت وت؟)) منیش وتەکەم بۆ دووبارە کردەوە.فەرمووی: (( تۆ داوای شتێکت لێکردم هیچ یەکێك لەهاوەڵەکانت ئەوەیان لێ داوا نەکردووم))...][١٠٤٧].

ئەوان هەموو ڕۆژێك دەچوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و عوسمانی کوڕی ئەبو عاسیان ﷺ لای وشترەکانیان بەجێ دەهێشت چونکە لەهەموویان بچوك تر بوو کاتێك وەفدەکە دەگەڕایەوە دوای نیوەڕۆ. عوسمان دەچووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری ئاینی لێدەکردو قورئانی لەبەر دەکرد تازۆر شارەزاو زانا بوو، وەهەر کات بهاتایەو پێغەمبەری خوا ﷺ خەوتبایە دەچووە لای ئەبوبەکر ولێی فێر دەبوو وەلای هاوەڵانی باسی نەدەکرد.... تالە ئەنجامدا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی سەرسام بوو وەخۆشی دەویست...]. بەو جۆرە وەفدەکە لەناو ڕەشماڵەکانیان دەمانەوەو پێغەمبەری خوا ﷺ دەچووە سەردانیان و لەگەڵیان دەدوا، ئەوسی کوڕی ئەوسی سەقەفی کەیەکێك بوو لە ئەندامەکانی وەفدەکە لە دوو گێڕانەوەدا هاتووە دەفەرموێت :

١-(لەگەڵ وەفدی سەقیفدا بووم چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ [لە دەوارێکدا بووین ئەوەی لەوێ بوون هەموو ڕۆیشتن وە من لە خواری دەوارەکەوە دانیشتبووم و کەسی لێ نەما تەنها پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ خەوتبوو، پیاوێك هات بۆ لای و

---

وقد وثق.

(١٠٤٧) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٣٠٩).

بەئاگا هاتەوە و شتێکی بە نهێنی پێ وت [ئەویش دەستی بەشوێنێکی دەوارەکەوە گرت] وە فەرمووی: [((برۆ بۆ لایان و پێیان بڵێ با بیکوژن))] [پیاوەکە ویستی بڕوات دووبارە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردەوە] و پێی فەرموو: ((ئایا شایەتی نەداوە کە هیچ خودایەك نییە جگە لە الله [منیش پێغەمبەری خودام؟]))] وتی: بەڵێ [سوێند بەخوا] بەڵام ئەو لەترسدا دەیڵێت. فەرمووی: (([اذْهَبُوا فَخَلُّوا سَبِيلَهُ،] [لا تَقْتُلُوهُ] وَإِنَّمَا أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَإِذَا قالُوها حَرُمَتْ عَلَيَّ دِماؤُهُمْ و أَمْوالَهُمْ إلاّ بِحَقِها وَحِسابُهُمْ عَلى اللّهِ))[١٠٤٨] واتە: (([دەبچن ئازادی بکەن] [وە نەی کوژن] •من تەنها فەرمانم پێ کراوە لەگەڵ خەڵك دا بەجەنگ بێم تا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) وە ئەگەر ئەوەیان وت خوێن وماڵیان لەمن حەرام دەبێت مەگەر مافەکانی (ئیسلام) و لێپێچینەوەشیان لەلای خودایە))].

٢-لە گێڕانەوەیەکی (لاواز) دا: ئەوس ﷺ دەفەرموویت: [لەگەڵ وەفدی سەقیف چوینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوانەی هاوپەیمانمان بوون چوونە ماڵی موغیرەی کوڕی شوعبە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەشماڵێکی لە دەوارێکی سەربەخۆدا دانابوو [جارجار دەهاتە لامان چونکە لە نێوان مزگەوت و ماڵەکەیدا بووین، هەرکات نوێژی عیشای بکردایە دەهاتە لامان] لە هەموو شەوێکدا بە پێوە لەگەڵمان دەدوا تا بە هۆی زۆر وەستانەوە قاچەکانی ماندوو دەبوو، وە زۆر ترین وتەکانی باسی هەڵویستەکانی قوڕەیش بوو پاشان دەی فەرموو: ((لَا سَوَاءَ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ مُسْتَذَلِّينَ فَلَمَّا خَرَجْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ كَانَتْ سِجَالُ الْحَرْبِ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ، نُدَالُ عَلَيْهِمْ وَيُدَالُونَ عَلَيْنَا)) واتە: ((وەك یەك نییە پێشتر ئێمە لە مەککە چەوساوە و بێ دەستەڵات بووین کاتێکیش هاتینە مەدینە جەنگ لە نێوانمان نۆرەبوو بەسەریاندا سەردەکەوتین و ئەوانیش هەروەها)). شەوێکیان لە کاتی دیاری کراوی سەردان کردنەکەیدا دواکەوت دوا جار هات بۆ لامان و فەرمووی: ((سەرقاڵ بووم بە خوێندنی بەشە قورئانەکەمەوە وە پێم ناخۆش بوو بەجێی بهێڵم و تەواوی نەکەم تا تەواوم کرد و پاشان هاتم))...][١٠٤٩].

(١٠٤٨) أخرجه: عبدالرزاق (١٨٦٩٨)، وأحمد (١٦١٦٠) وقال محققه: حديث صحيح، و الدارمي (٢٤٥٠)، و الطيالسي (١١٠٩)، و النسائي (٨٠/٧)، وابن ماجة (٣٩٢٩)، وابويعلى (٦٨٦٢) وقال محققه: اسناده حسن، وصححه كل من الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٤١٠) و الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (١٣٦) و اللفظ لأحمد و الزيادات للنسائي و الدارمي وابو يعلى.

(١٠٤٩) أخرجه: أحمد (١٦١٦٦) وقال محققوه: اسناده ضعيف، و الطيالسي (١١٠٨)، والطبراني (الكبير) (١٥٩٩/١)، وابن

لە ماوەی مانەوەی وەفدەکەی سەقیفدا هەموو موسوڵمان بوون و پەیمانیان دایە پێغەمبەری خوا ﷺ وە پیاوێکی (گولیان) لەگەڵ بوو وەك عەمروی کوڕی شورەید ﷺ دەفەرموێت: [وەفدی سەقیف پیاوێکی گەڕ و (گول) یان لەگەڵ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەدوایدا و پێی فەرموو: ((بگەڕێرەوە بەڵێنمان لێ وەرگرتیت))][1050].

لە دوای چەندەها مشتومڕ و لێکۆڵینەوە پاشان وەفدی سەقیف چەند بەڵێنێکیان دایە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانیش لەچەندەها گێڕانەوەدا هاتووە لەوانە:

١-عوسمانی کوڕی ئەبو عاص ﷺ دەفەرموێت: [وەفدەکەی سەقیف هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و نیشتەجێی مزگەوتی کردن بۆ زیاتر دڵ نەرم بوونیان بەڵام ئەوان مەرجی ئەوەیان هەبوو کە: جیهاد و نوێژ و زەکاتیان لەسەر فەرز نەکات و کەسێکی بیانی جگە لە خۆیان نەکاتە سەرکردەیان. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لَكُمْ أَنْ لَا تُحْشَرُوا وَ لَا تعْشُروا وَلَا يُسْتَعْمَل عَلَيْكُمْ غَيْرَكُمْ وَلَاْ خَيْرَ فِي دِيْنٍ لا رُكُوعَ فِيْهِ))[1051] واتە: (بەوە لێتان قایل دەبین کە جیهاد نەکەن و زەکاتیش نەدەن و کەسێکی تریش جگە لە خۆتان ناکەینە سەرکردەتان بەڵام هیچ خێرێك لە دینێکدا نییە گەر نوێژی تیانەبێت...].

٢-یەکێك لە پیاوانی سەقیف دەڵێت: [داوای سێ شتمان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و هەرسێ داواکاریەکەمانی ڕەتکردەوە: وتمان: ئەو ناوچەیەی ئێمەی لێ دەژین ساردە، بمان بەخشە لە دەست نوێژ و نوێژ بەڵام ڕێگەی نەداین و داوامان کرد ڕێگەی شەراب خواردنەوەمان بدات ڕەتیکردەوە بۆ ساتێکیش داوامان کرد ئەبو بکرەمان ڕادەست بکاتەوە، قایل نەبوو وە فەرمووی: ((هُوَ طَلِيْقُ اللّه وَ رَسُولِهِ))[1052] واتە: ((ئەو ئازاد کراوی خوداو پێغەمبەرەکەیەتی))....].

---

ماجة (١٣٤٥) و أبوداود (١٣٩٣) وحسنه ابن كثير (فضائل القرآن) (ص:٤٢) والحافظ العراقي (الأحياء) (٢٧٧/١)، وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف أبي داود) (٢٩٧)، و (الضعيفة) (١٦٤٢).

(١٠٥٠) أخرجه: مسلم (٢٢٣١)، وأحمد (١٩٤٨٥)، والنسائي (٤١٩٣)، وابن ماجة (٣٥٤٤)، و (الصحيحة) (١٩٦٨).

(١٠٥١) أخرجه: احمد (١٧١٩٣) وقال محققه: رجاله ثقات، وابن أبي شيبة (١٦٧/٣)، وابو داود(٣٠٢٦)، وابن خزيمة (١٣٢٨)، والطيالسي (٩٢٩) وضعفة الشيخ الألباني في (الضعيفة) (٤٣١٩)، و(ضعيف الجامع) (٤٧١١) و (الثمر المستطاب) (٧٧٥/٢).

(١٠٥٢) أخرجه: أحمد (١٨٧٧٧،١٧٥٣٠) وقال محققوه: حديث صحيح اسناده صحيح.

٣-جابر ﷺ دەفەرمویت: [سەقیف مەرجی لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ دانا کە زەکات نەدات و جیهاد نەکات، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سَيَتَصَدَّقُونَ، وَيُجَاهِدُونَ إِذَا أَسْلَمُوا))[١٠٥٣] واتە: ((ئەوان گەر موسوڵمان ببن جیهاد دەکەن و زەکاتیش دەدەن))].

٤-موسای کوڕی عوقبە ﷺ و عورەوەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموون: [..وەفدەکە بەردەوام هاتوچۆی پێغەمبەری خوا ﷺ یان دەکرد و بانگی دەکردن بۆ ئیسلام تا دواجار موسوڵمان بوون، کینانەی کوڕی عبدویالیل وتی: ئایا تۆ لەگەڵمان پێك دێیت تا دەگەڕێینەوە ناو خزم و کەس و کارمان؟ فەرمووی: ((بەڵێ گەر دان بنێن بە ئیسلامدا لەگەڵتان پێکدێم گەر واش نەکەن هیچ ڕێکەوتن و پێکهاتنێك نییە لە نێوانماندا)). وتیان: ئایا ڕێگەمان دەدەیت تا زینا بکەین چونکە ئێمە زۆر جار دوور لە وڵات دەبین پێویستمان پێی دەبێت. فەرمووی: ((ئەوەتان لەسەر حەرام و قەدەغەیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾(الإسراء)

واتە: (لە زیناو داوێن پیسی دووربن وە بەهیچ شێوەیەك توخنی ئەوانەش مەکەون کەپێشەکین بۆی، چونکە بەڕاستی زینا و داوێن پیسی تاوان و کردەوەیەکی زۆر خراپ و ڕێگایەکی زۆر ناپەسەندە) وتیان: ئەی سوخۆری؟ فەرمووی: ((سوخۆریش حەرام و قەدەغەیە)) وتیان: خۆ ئەوە ماڵ و سامانی خۆمانە؟ فەرمووی: ((تەنها دەست مایەکەتان بۆ هەیە، نەستەم بکەن و نەستەمیشتان لێبکرێت)) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَذَرُوا۟ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ ﴾ (البقرة) واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە! دەبێ بە تەواوی ملکەچی فەرمانەکانی خوا ببن و لە گشت سنوورەکانی پارێز بکەن و لە پاشماوەی سوودەکەشتان کە بەلای ئەم و ئەوەوەیە واز بێنن و داوای مەکەن ئەگەر ئێوە باوەڕداری ڕاستەقینەن) وتیان: ئەی شەراب خواردنەوە خۆ ئەوە گوشراوی ترێکانمانە و پێویستمان پێیەتی؟ فەرمووی: ((خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ

(١٠٥٣) أخرجه: أحمد (١٤٦٥٤) وقال محققوه: حديث صحيح، وابو داود (٣٠٢٥)، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (١٨٨٨)، و (صحيح الجامع) (٣٦٥٧)، و (صحيح أبي داود) (٢٦١٤).

رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ (المائدة) واتە: (ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! بێگومانبن کەعارەق خۆریی (مەشرووبات) و قوماربازیی و کاغەزی (یانسیب) و ئەو بەردەی حەیوانی بتەکانی لەسەر سەر دەبڕێت بۆ بتەکان و فالگرتنەوە بۆ دەرکەوتنی بارێکی چاك یان خراپ یان بۆ تاقیکردنەوەی بەخت، ئەمانە گشت پیسن و لەکاری شەیتانن ئێوە خۆتانی لێ دووربگرن، تا بەڵکو لە دنیاو لەقیامەتدا ڕزگارو بەختەوەربن).

دواتر وەفدەکە لەگەڵ یەکتر کۆبوونەوە، سوفیانی کوڕی عەبدوڵلا وتی: هاوارتان لێبێت ئێمە دەترسین گەر سەرپێچیمان کرد ڕۆژێکمان بەسەر بێت وەك گرتنی مەککە. لەبەر ئەوە بڕۆن با لەگەڵی ڕێبکەوین. دوا جار هاتنەوە وتیان: لەسەر هەموو ئەوانە لەگەڵت ڕێدەکەوین. بەڵام ئەی بتە گەورەکەمان؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بیڕوخێنن)) وتیان چۆن ئەو کارە ئەنجام دەدەین خۆ ئەو گەر بزانێت تۆ دەتەوێت بیڕوخێنیت ئەو کات هەموو خزمانمان دەکوژێت. عومەری کوڕی خەتاب ﷺ وتی: هاوار بۆ تۆ ئەی کوڕەکەی عبدویالیل چەندە نەفامیت بتەکان بەردێکن نازانن کێ دەیپەرستێت و کێ نای پەرستێت. وتی: خۆ ئێمە بۆ لای تۆ نەهاتووین ئەی کوڕەکەی خەتاب. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆت کەسانێك بنێرە تا بیڕوخێنێت چونکە ئێمە هەرگیز نای ڕوخێنین فەرمووی: ((فَسَأَبْعَثُ إِلَيْكُمْ مَنْ يَكْفِيكُمْ هَدْمَهَا)) فَكَاتَبُوهُ )[١٠٥٤] واتە: ((باشە کەسانێك دەنێرم لە جیاتی ئێوە بیڕوخێنێت)) پاشان لەگەڵی پێکهاتن].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاس دەهات و دەچوو لە نێوان پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەواندا. هەرکات خواردنی بۆ لای وەفدەکە بهێنایە ئەوان نەیان دەخوارد تا خالیدی کوڕی سەعد لێی دەخوارد پێش ئەوان، وە هەر ئەو بوو ڕێکەوتنەکەی نێوانیانی بۆ نوسین، ئەوان سەرەتا مەرجیان وابوو کە بتەکەیان نەڕوخێنیت و بۆیانی بهێڵێتەوە تا سی ساڵ ئەوان جار لە دوای جار ماوەی ساڵ بە ساڵ کەمیان دەکردەوە تا دواجار داوای مانگێکیان کرد لە دوای گەڕانەوەیان بۆ ئەوەی خەڵکەکەیان لە سەر نەمانی ڕابهێنن. بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ قایل

(١٠٥٤) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (٢/٣١٠)، و البيهقي (الدلائل) (٥/٣٠٤).

نەبوو ماوەیان بدات و پێویست بوو ئەبوسفیان وموغیرە لەگەڵیان بگەڕێنەوە و بیان ڕوخێنن. دواتر داوایان کرد نوێژ نەکەن و بتەکانیان بەدەستی خۆیان نەشکێنن پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: ((سەبارەت بەشکاندنی بتەکان ئەوە خۆمان بۆتان دەشکێنین وە سەبارەت بە نوێژیش بزانن کەهیچ خێرێك لە دیندا نییە گەر نوێژ کردنی تێدا نەبێت)) لە کۆتایدا وتیان: هەرچەندە سووکی ئێمەشی تێدا بێت ئێمە هەر لەگەڵت ڕێدەکەوین](١٠٥٥).

٥-لە گێڕانەوەیەکی (لاواز) دا هاتووە لە عوسمانی کوڕی ئەبو عاس ﷺ [کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووە لە جێگەی بتەکەیاندا مزگەوتێك دروست بکات](١٠٥٦).

لە وەفدەکەیاندا عوسمانی کوڕی ئەبو عاسیان لەگەڵدابوو دەچووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و سەبارەت بە ئیسلام و قورئان پرساری لێدەکرد وە گەر پێغەمبەری خوا ﷺ بخەوتایە دەچووە لای ئەبوبەکر تا قورئانی بۆ بخوێنێتەوە و سووربوو لەسەر ئەوەی زیاتر لە ئاین تێبگات تا وای لێهات پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشی دەویست(١٠٥٧). وەفدەکەی سەقیف وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێك بکەرە پێش نوێژمان؟ پێغەمبەری خواش ﷺ عوسمانی کوڕی ئەبوعاسی کردە پێش نوێژیان چونکە سووربوو لەسەر ئەوەی لە ئیسلام شارەزابێت و چەندەها سورەتی دەزانی پێش ئەوەی بگەڕێتەوە تائیف].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [وەفدی سەقیف موسوڵمان بوون و نوسراوێکی بۆ نوسین و عوسمانی کوڕی ئەبوعاسی کردە پێش نوێژیان هەرچەندە لە هەموویان تەمەنی کەمتربوو چونکە ئەبوبەکر ﷺ وتبووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دەبینم ئەو گەنجە لە هەموویان سوورترە لە سەر ئەوەی لە ئیسلام شارەزابێت و قورئان بزانێت](١٠٥٨). [عوسمان خۆی دەڵێت: چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ

(١٠٥٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٥٤/٤) (رقم: ١٠٨٧)، و الطبري (التاريخ) (٩٧/٣).

(١٠٥٦) أخرجه: ابوداود (٤٤٦)، وابن ماجة (٧٤٣)، والطبراني (الكبير) (٨٣٥٥) وضعفه الشيخ الألباني (ضعيف ابي داود) (رقم:٦٧).

(١٠٥٧) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٣٠٩)، والبيهقي (الدلائل) (١/٥).

(١٠٥٨) أخرجه: ابن هيشام (السيرة) (١٥٦/٤) (رقم:١٠٨٧)، و الطبري (التاريخ) (٩٨/٣).

زانی کە من لە هەموویان باشترم بۆ قورئان فێربوون و سورەتی بەقەرەم لە بەرکرد بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((قَدْ أَمَّرْتُكَ عَلَى أَصْحَابِكَ، وَأَنْتَ أَصْغَرُهُمْ))[١٠٥٩] واتە: (([ئەوا تۆ دەکەمە پێش نوێژخوێن بەسەر هاوەڵەکانتەوە هەرچەندە تۆ لە هەموویان تەمەنت بچوکترە])).

وە دەفەرموێت: [خۆم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من بکەرە پێش نوێژی خزمەکانم فەرمووی: ((أَنْتَ إِمَامُهُمْ وَاقْتَدِ بِأَضْعَفِهِمْ، وَاتَّخِذْ مُؤَذِّنًا لَا يَأْخُذُ عَلَى أَذَانِهِ أَجْرًا))[١٠٦٠] واتە: ((تۆ ببەرە پێش نوێژیان وەك بێ تواناترینیان نوێژیان بۆ بکە وە بانگ بێژێکیش دیاری بکە کە پارە لەسەر بانگدانەکەی وەرنەگرێت))]. وە چەندەها ئامۆژکاری تری کرد لەوانە: [عوسمان دەڵێت: دواهەمین ئامۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ من][١٠٦١] و دواهەمین وتەی لەگەڵ من کاتێك منی کردە پێش نوێژی شاری تائیف فەرمووی: ((خَفِّفِ الصَّلَاةَ عَلَى النَّاسِ [يا عثمانُ تجاوز في الصَّلاةِ واقدرِ النَّاسَ بأضعفِهم فإنَّ فيهمُ الْكبيرَ والصَّغيرَ والضَّعِيفَ، وذا الحاجَة][١٠٦٢] [وَالمَرِيْض][١٠٦٣] [وَالحَامِل و المُرْضِع][١٠٦٤] حَتَّى وَقَّتَ لِي سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى، وَاقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ وَأَشْبَاهَهَا مِنَ الْقُرْآنِ)[١٠٦٥] واتە: ((نوێژ بەئاسانی بکە بۆ خەڵکی [ئەی عوسمان لە نوێژەکەتدا بە ئەندازەی بێ تواناکان تیایدا بمێنەوە، چونکە ئەوان گەورە و بچوك و بێ تواناو خاوەن پێداویستی] [و نەخۆش] [و شیردەر و سك پڕیان] تێدایە، تا بۆی دیاری کردم کە سورەتی (الاعلى) و سورەتی (إقرأ) و هاوشیوەکانیان لە قورئان بخوێنم لە نوێژەکانمدا].

---

(١٠٥٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨٣٣٦)، وقال الهيثمي (المجمع) (٧٤/٣) فيه هشام بن سليمان وثقه البخاري وضعيف جماعة.

(١٠٦٠) أخرجه: (١٦٢٧٠) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابوداود (٥٣٠)، وابن ماجة (٧١٤)، و النسائي (٢٣/٢)، و الطبراني (٨٣٥٦)، وابن خزيمة (٤٢٣)، والحاكم (١٩٩/١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (١٣٨٠)، و (صحيح أبي داود) (٥٤١) و (الارواء) (٣١٦/٥).

(١٠٦١) أخرجه: (١٦٢٧٣) وقال محققوه: اسناده حسن، و الطبراني (الكبير) (٨٣٧٨).

(١٠٦٢) أخرجه: (١٦٢٧٣) وقال محققوه: حديث صحيح، و الطبراني (الكبير) (٨٣٦١)، والنسائي (١٧٤/٤)، وابن خزيمة (١٨٩١).

(١٠٦٣) أخرجه: أحمد (١٦٢٧٥) وقال محققوه: حديث صحيح.

(١٠٦٤) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨٧٩).

(١٠٦٥) أخرجه: أحمد (١٧١٩٦) وقال محققوه: اسناده قوي، و الطبراني (الكبير) (٨٣٥٣) وصحح اسناده الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢٩١٩).

لە گێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((أُمَّ قَوْمَكَ، وَإِذَا أَمَمْتَ قَوْمَكَ فَأَخِفَّ بِهِمُ الصَّلَاةَ، فَإِنَّهُ يَقُومُ فِيهَا الصَّغِيرُ وَالْكَبِيرُ وَالضَّعِيفُ وَالْمَرِيضُ، وَذُو الْحَاجَةِ))(١٠٦٦) [وَإِذَا صَلَّيْتَ لِنَفْسِكَ فَصَلِّ كَيْفَ شِئْتَ](١٠٦٧) واتە: ((پێش نوێژی بۆ خزمانت بکە و گەر پێش نوێژیت بۆ کردن لە نوێژەکەدا کار ئاسانیان بۆ بکە چونکە بچوك و گەورە و لاواز و نەخۆش و خاوەن پێداویستی تایبەت لەگەڵت نوێژدەکەن)) [وە گەر نوێژت بۆ خۆت کرد ئەوجار بەویستی خۆت نوێژ بکە].

## گەڕانەوەی وەفدی سەقیف

بەم جۆرە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ سەقیف ڕێکەوتن و نامەیەکی نوسی کە ئەمە دەقەکەیەتی: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَانِ الرَّحِيمِ: لە موحەممەد پێغەمبەرەوە نێردراوی خوا بۆ بڕواداران: درەختەکانی شیوی ئەوج بڕینەوەیان قەدەغەیە و ڕاوکردن تیایاندا قەدەغەیە هەرکەسێك شتێك لەوانە ئەنجام بدات جەڵدی لێ دەدرێت و جل و بەرگەکەی لێ دەسێنرێت گەر زیاتر سنوری بەزاند دەستگیر دەکرێت و دەدریتە دەست موحەممەد، ئەوەش فەرمانی پێغەمبەر موحەممەدە ﷺ وە ئەمەش خالیدی کوڕی سەعید بە فەرمانی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا نوسیویەتی و کەس ئەو بڕیارە نەبەزێنێت و ستەم لە خۆی نەکات و فەرمانی موحەممەد پێغەمبەری خوا ﷺ نەشکێنێت...](١٠٦٨).

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ بە وەفدەکەی سەقیفی فەرموو: ((کەسانێك دەنێرمە لاتان بتەکانتان بۆ بشکێنێت. ئەوانیش لەگەڵی ڕێکەوتن، کینانەی کوڕی عەبدویالیل وتی: ڕێگەمان بدە بگەڕێینەوە لە پێشدا، پاشان ئەوان بەدواماندا بنێرە چونکە من باشتر خزمانی خۆم دەناسم پێغەمبەری خوا ﷺ بەوە قایل بوو وە ڕێزی لێگرتن و دیاری پێ بەخشین وڕێگەی دان و... وڕۆیشتن... کینانە بە وەفدەکەی وت: من لە هەمووتان باشتر سەقیف دەناسم سەرەتا ڕێکەوتن نامەیان لا باس مەکەن و بەجەنگ و لەناوچوون بیان

(١٠٦٦) أخرجه: أحمد (١٦٢٧٥) وقال محققوه: حديث صحيح.

(١٠٦٧) أخرجه: أحمد (١٦٢٧٦) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

(١٠٦٨) أخرجه: ابن هيشام (السيرة) (١٥٨/٤) (رقم:١٠٩١).

ترسێنن و پێیان ڕابگەیەنن کە موحەممەد داوای چەند شتێکی لێکردووین و ئێمەش قایل نەبووین و داوای لێکردووین لات و عوزا بڕوخێنین و سامانەکانمان لە ڕێی سووەوە لە ناوبەرین و شەراب خواردن قەدەغە بکەین و زینا کردن قەدەغە بکەین. کاتێك وەفدەکە نزیك بوونەوە لە تائیف خەڵکەکە هەموو چوونە پێشوازیان، کاتێك ئەوانیان بینی مامناوەند دەڕۆیشتن و وشترەکانیان یەك بەدوای یەکدا لێدەخوڕی و سەریان داپۆشی بوو وەك کەسانێکی غەمبار و مەینەتبار ومایە پووچ. کاتێك سەقیف ڕوخساری وەفدەکەیان بینی بەیەکتریان وت: وەفدەکەتان بەخێر نەگەڕاوەتەوە، پاشان وەفدەکە گەڕانەوە چوونە لای لاتماڵێکی هەبوو لە تائیف پەرستگا بوو داپۆشرابوو قوربانیان بۆ لادەبرا وەك کەعبە لایان پیرۆزبوو وە دەیان پەرست. هەندێك لە خەڵکەکە وتیان: تەماشایان بکەن دەڵێی یەکەم جارە دەی بینن، پاشان هەموو یەکێك لەوانە چوونەوە لای ماڵ و خێزانی خۆیان و ژنەکانیان دەهاتن بۆ لایان و پرسیاریان لێدەکردن بە چیەوە گەڕاونەتەوە و چیتان لەگەڵ خۆتان هێناوەتەوە؟ وتیان: چووینە لای پیاوێکی وشکی زبر هەموو کارێك بە ویستی خۆی دەکات بە شمشێر سەرکەوتووە و هەموو عەرەبی ماندوو کردووە و هەموو خەڵکیش بۆی مل کەچ بوون وە مەرجی قورس و گرانی لێداواکردووین لەوانە ڕووخانی لات و عوزا و وازهێنان لە زینا و سوخۆری و شەراب.

هۆزی سەقیف وتیان: سوێند بەخوا ئێمە ئەوە قبوڵ ناکەین هەرگیز. وەفدەکەش وتیان: کەواتە چەك ئامادە بکەن و خۆتان ئامادە بکەن بۆ جەنگ و قەڵاکەتان نۆژەن بکەنەوە.

سەقیف دوو تا سێ ڕۆژ بەو جۆرە مانەوە، پاشان خودا ترسی خستە ناو دڵیان وتیان: سوێند بە خوا ئێمە توانای بەرەنگار بوونەوەی ئەوانمان نییە ئەو توانیویەتی بەسەر هەموو عەرەبدا زاڵبێت بۆیە هاتن و داوایان لە وەفدەکەیان کرد تا بگەڕێنەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و قایلبن بەمەرجەکانی وە لەگەڵی ڕێبکەون. کاتێك وەفدەکە ترس و توقینی هۆزەکەی خۆیان بینی و نەرمی هەڵویستیان کە ئێستا ڕازیبوون بە ڕێکەوتن نەك جەنگ کردن.

ئەوکات وەفدەکە پێیان وتن: ئێمە ڕێکەوتنی خۆمان لەگەڵی تەواوکردووە و موسوڵمان بووین و بە مەرجەکانی ئەو ڕازی بووین و ئەویش بەمەرجەکانی ئێمە

ڕازی بووە، لەڕاستیدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەهەموو خەڵکی وەفادارترو بەبەزەییتر و ڕاستگۆتر و لەخواترسترە. ئەم ڕۆیشتنەشمان بووە خێر و بەرەکەت بۆ خۆشمان و بۆ ئەوەشی کەلەسەری ڕێکەوتووین ئێوەش بەسەلامەتی خودا بۆ خۆتان قایلبن وە لەمەرجەکانی ڕێکەوتن نامەکەش بەئاگابن؟!

هۆزی سەقیف وتیان: ئەی بۆ ئێوە ئەمەتان لێ شاردینەوە و توشی خەم و خەفەتتان کردین وەفدەکە پێیان وتن: ئێمە ویستمان خودا فیز و خۆبەزل زانینی شەیتان لەدڵتاندا دەربکات. ئینجا لەوێدا هەموو هۆزی سەقیف تێکڕا موسوڵمان بوون وەچەند ڕۆژێك بەو جۆرە مانەوە. پاشان وەفدەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە لایان وە سەرکردەکەیان خالیدی کوڕی وەلید و موغیرەی کوڕی شوعبە بوو. کاتێك گەیشتنە ئەوێ یەکەم جار چوون تا بتی (لات) بڕوخێنن، لەوکاتەدا هەموو هۆزی سەقیف بەژن و منداڵ و خزمەت کارەکانیانەوە هەموو هاتن و تەماشایان دەکرد، وایان دەزانی کە (لات) بەرگری لە خۆی دەکات.

موغیرە تەورەکەی بەدەست گرت چوو بۆ ڕوخاندنی و بەهاوەڵانی وت: ئیستا واتان لێدەکەم. پێکەنین بە هۆزی سەقیف، ئینجا ڕۆیشت و تەورێکی لە بتەکەداو لەرزی لەخۆی هێنا و خۆی بەردایەوە، هۆزی سەقیف هەموو بەیەك جار هاواریان کرد وتیان: خودا موغیرە لەناوببات خوداوەندەکەمان کوشتی وە هەموو بەوە دڵخۆش بوون وتیان: کەس ناتوانێت بیڕوخێنێت کێ دەتوانێت بالێی نزیك بێتەوە موغیرەش وتی: ئەی خودا هەموتان قێزەون بکات ئەی هۆزی سەقیف قوڕە بەردێکی دروست کراوە ئیتر لێرە بەدواوە هەر خوا بپەرستن، ئینجا خۆی و هاوەڵانی دەرگاو دارو پەردوەکانی لاتیان خاپور کرد و تەختی زەویان کرد.

زێوانی بتەکەیش وتی: ئێستا بناغەکەی لەناویان دەبات و دەینکات بەناخی زەویدا. موغیرەیش بە خالیدی وت: ڕێگەم بدە با بناغەکەشی لەزەوی بێنمەدەرەوە. خالیدیش ڕێگەیدا موغیرە و هاوەڵانی بناغەکەشیان تێکدا و خۆڵی ژێرەکەشیان فرێدا هەموو پەردەو و جوانکاریەکانیان لێکردەوە و هۆزی سەقیفیش هەموو دەم کوت بوون.

پاشان خالید و هاوەڵانی بەو دەست کەوتانەوە گەڕانەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ

و دابەشیکرد بەسەر موسوڵماناندا.

لە گێڕانەوەکەی ئیبنو ئیسحاقدا دەفەرمووێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا لەو دەستکەوتانە قەرزی عروە و ئەسوەدی لێبدەنەوە، بۆیان جێ بەجێ کرد). بەو جۆرەش خوا سەربەرز و شکۆمەندیکردن[١٠٦٩].

بەم جۆرە ئیسلام بڵاوبوویەوە لە تائیف و چوار دەوری و مزگەوتیان دروست کرد و عوسمان بووە پێش نوێژخوێنیان و پاش ماوەیەك تووشی نەخۆشی و ئازار و وەسوەسەیەك هات وە دواتر گەڕایەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وە ئەوانەی لا باس کردو و دوعای بەسەردا خوێند و فێری چەند دوعایەکی تری کرد ئەویش لەچەندەها گێڕانەوەدا هاتووە:

عوسمان ﷺ سکاڵای توشبوونی وەسوەسەی لە نوێژدا لای پێغەمبەری خوا ﷺ کرد[١٠٧٠] وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شەیتان بۆتە بەربەست لەنێوان من و نوێژ و قورئان خوێندنمداو لێم تێك دەدات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ذَاكَ شَيْطَانٌ يُقَالُ لَهُ خِنْزَبٌ، فَإِذَا حَسَسْتَ بِهِ فَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، وَاتْفُلْ مِنْ عَنْ يَسَارِكَ ثَلَاثًا))[١٠٧١] واتە: ((ئەوە شەیتانێکە ناوی (خەنزەبە) هەرکات هەستت پێ کرد بڵێ (أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ) و سێ پف (پف: وەك تفکردنە بەڵام بەوشکی) بکە بەلای چەپدا)) عوسمان دەڵێت: ئەوکارەم کرد دواتر خوای گەورە شەیتانی لێدوورخستمەوە)].

لە گێڕانەوەیەکی تردا عوسمان ﷺ دەفەرمویت: [کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ منی کردە پێش نوێژخوێنی شاری تائیف بارودۆخێکم تووش هات تا وام لێهات لە نوێژدا نەم دەزانی ئەمە چ نوێژێکە. ناچار سەفەرم کرد و چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ منی بینی فەرمووی: ((کوڕەکەی عاسی؟)) وتم: بەڵێ. فەرمووی: ((چی تۆی هێناوەتە ئێرە؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بارودۆخێکم بەسەردا هاتووە لە نوێژدا وام لێدێت نازانم چ نوێژێکە و چەند ڕکاتم کردووە. فەرمووی: ((ذَاكَ

---

(١٠٦٩) أخرجه: موسى بن عوقبة (المغازي) (٣١٢) ولفظ له و زيادة لان اسحاق (السيرة) (١٥٧/٤)، وابن شيبة (تأريخ المدينة) (٤٦٩/٢).

(١٠٧٠) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨٣٦٨).

(١٠٧١) أخرجه: مسلم (٢٢٠٣)، وأحمد (٢١٦/٤)، وعبدالرزاق (٢٥٨٢)، و الطبراني (الكبير) (٨٣٦٦).

شَيْطَانٌ أدنه)) واتە: ((ئەوە لە شەیتانەوەیە نزیك بەرەوە)) منیش لێی نزیك بوومەوە هەردوو قاچی لەسەر پەنجەکانی قاچم دانا بە دەستی ڕاستی کێشای بەسنگمدا و تفی کردە ناو دەمم و فەرمووی: ((بڕۆ دەرەوە ئەی دوژمنی خوا)) و سێ جار ئەوەی دووبارەکردەوە وپاشان فەرمووی: ((بڕۆ بگەرەوە بۆ سەر کارەکەت)) عوسمان دەڵێت: ئیتر دوای ئەوە هەرگیز توشم نەهاتەوە][١٠٧٢].

لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: [سکاڵای قورئان لە بیرچوونم کرد لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش دەستی کێشا بەسەر سنگم دا و فەرمووی: ((ئەی شەیتان وەرە دەرەوە لە سنگی عوسمان)) ئیتر دوای ئەوە هیچ ئایەتێکی قورئانم لە بیر نەدەچووە][١٠٧٣].

عوسمان ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئازاریکم لەگەڵدابوو نزیکبوو لەناوم بەرێت][١٠٧٤] دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە سەردانم و پێی فەرمووم: ((دەستی ڕاستت حەوت جار بهێنە بەسەر ئەوجێگای ئازارەکەت دا و بڵێ (بسم الله) وە پەنا دەگرم بە عیزەت و توڕەیی خوا لە زیانی ئەم ئازارەم و ئەوەی لێی دەترسم)). ئەوەم جێ بەجێکرد خوای گەورە ئەو ئازارەی لەسەر لابردم و دواتر منیش هەموو خزمانم فێری ئەوە کرد][١٠٧٥].

لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: [سکاڵای ئازارێکم کرد لە جەستەمدا هەبوو لەوکاتەوە موسوڵمان بووم. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ضَعْ يَدَكَ عَلَى [الْمَكَانِ][١٠٧٦] الَّذِي تَأْلَمُ مِنْ جَسَدِكَ، وَقُلْ: بِسْمِ اللَّهِ ثَلَاثًا، [فَامْسَحْ بِهِ] وَقُلْ سَبْعَ مَرَّاتٍ: أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللَّهِ وَقُدْرَتِهِ

---

(١٠٧٢) أخرجه: ابن ماجة (٣٥٤٨)، و الروياني (المسند) (١٤٨/١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٨٥٨) و (الصحيحة) (١٠٠٢/٦).

(١٠٧٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨٣٤٧) وقال الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢٩١٨) اسناده حسن.

(١٠٧٤) أخرجه: ابن ماجة (٣٥٢٢)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٨٣٩).

(١٠٧٥) أخرجه: أحمد (١٦٢٦٨،١٦٢٧٤) وقال محققوه: اسناده صحيح، وأبوداود (٣٨٩١) والترمذي (٢٠٨٠)، وابن ماجة (٣٥٢٢)، والنسائي (الكبرى) (٧٥٤٦) وفي (عمل اليوم و الليلة) (٩٩٩)، وابن حبان (٢٩٦٥)، و الحاكم (٣٤٣/١)، والطبراني (الكبير) (٨٣٤٠) وفي (الدعاء) (١١٣٠)، وابن السني (عمل اليوم) (٥٤٥) وصححه الشيخ الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٣٢٩٣) و (صحيح ابن ماجة) (٢٨٣٩) و(الصحيحة) (٤٠٤/٣).

(١٠٧٦) أخرجه: الطبراني (الدعاء) (١١٣٣١) وقال محققه: اسناده حسن.

مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ وَأُحَاذِرُ))[١٠٧٧] واتە: ((دەستت بخەرە سەر ئەو [جێگەیەی] کە ئازاری هەیە لە جەستەتدا و سێ جار دەستی بەسەردا ب‌هێنە و بڵێ (بِسمِ الله) و حەوت جاریش بڵێ: پەنا دەگرم بە عیزەت و قودرەتی خوا لەم ئازارەی لێی دەترسم))].

## ئەبوبەکر ﷺ حەج بەخەڵکی دەکات

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [لە دوای گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە تائیف مانگی ڕەمەزان و شەوال و زولقەعدە بەسەردا تێپەڕی، پاشان ئەبوبەکری ﷺ کردە پێشەوای حاجیان لە ساڵی نۆی کۆچیدا بۆ ئەوەی ڕابەرایەتی حەجی موسوڵمانان بکات، هەرچەندە موشریکەکانیش ئامادەی ئەو مەراسیمە دەبوون. ئەبوبەکر ﷺ و ئەوانەی لەگەڵیدابوون بەڕێکەوتن بەرەو مەککە، لەوکاتەدا سورەتی (تەوبە) هاتە خوارەوە و هەموو ڕێکەوتنەکانی نێوان پێغەمبەری خوا ﷺ و موشریکەکانی هەڵوەشاندەوە بڕیاردرا هیچ کەسێك ڕێگری لێنەکرێت بۆ هاتن بۆ حەج و عەمرە و کەس نەترسیت لە مانگە حەرام و قەدەغەکراوەکاندا، ئەوەش بەڵێن نامەیەکی گشتی بوو لە نێوان پێغەمبەری خوا ﷺ و موشریکەکاندا....][١٠٧٨].

لەم ساڵە دا پێغەمبەری خوا ﷺ نەهات بۆ حەج چونکە [قورەیشیەکان بە ڕووتی تەوافیان بەدەوری کەعبەدا دەکرد][١٠٧٩].

موجاهید ﷺ دەفەرموێت: [سەرەتا پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی بچێت بۆ حەج پاشان فەرمووی: ((أنَّه يحضرُ المُشْرِكُونَ فَيُطَوَفُونَ عُراة فلا أحبُ أَنْ أَحَجُ حَتى لا يَكُونَ ذلك))[١٠٨٠] ((موشریکەکانیش دێن بۆ حەج و بەڕووتی تەواف دەکەن و کاتێك حەز دەکەم حەج بکەم کە ئەوانی لێ نەبێت)) بۆیە ئەبو بەکری ﷺ نارد لەگەڵ عەلی ﷺ بۆ ئەم مەبەستە].

---

(١٠٧٧) أخرجه: مسلم (٢٢٠٢) وابن حبان (٢٩٦٧) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٠٧٨) انظر: (السير) لابن هيشام (١٥٨/٤)، و البيهقي (الدلائل) (٢٩٣/٥).وقال الحافظ في (فتح) (٨١/٨): روى سعد وغيره باسناد صحيح عن مجاهد: ان حجة أبي بكر وقعت في ذي القعدة... وهو ظاهر في أن بعث ابابكر كان بعد ذي القعدة فيكون حجة في ذي الحجة على هذا والله أعلم.

(١٠٧٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٢٣٢٤)، وقال الهيثمي (المجمع) (٢٣/٧) فيه ضعيف.

(١٠٨٠) أخرجه: الطبري (التفسير) (برقم) (١٦٣٦٥،١٦٣٦٤).

موحەممەدی کوڕی عەلی ﷺ دەفەرموێت: کاتێك سورەتی (تەوبە) بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی، ئەبوبەکری ﷺ نارد تا حەج بۆ خەڵکی بەڕێوە بەرێت [سەرەتای سورەتی (تەوبە)ی لەگەڵ ئەبوبەکر نارد][١٠٨١]. [و فەرمانی پێکرد جاڕیدات و هەمووان لەوشتانە ئاگاداربکاتەوە][١٠٨٢]. پێغەمبەری خوا ﷺ پاشان فەرمووی: [((لا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ أَنْ يُبَلِّغَ هَذا إلاّ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي)) واتە: [((نابێت پێویستە تەنها یەکێك لە پیاوانی بنەماڵەی خۆم ئەو پەیامە بگەیەنێت))]. دواتر عەلی کوڕی ئەبو تالبی بانگ کرد و پێی فەرموو: ((سەرەتا پێوستە تۆ ئەو سورەتە لەگەڵ خۆت ببەیت و بە خەڵکی ڕابگەیەنیت)) [عەلی ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئەوەندە وتار بێژو زمان زان نیم؟ فەرمووی: ((چار نییە یان دەبێت من بچم وپێیان ڕابگەیەنم یان دەبێت تۆ بچیت پێیان ڕابگەیەنیت)). عەلیش ﷺ وتی: لەبەر ئەوەی هیچ ڕێگە چارەیەکیتر نییە من هەڵدەستم بەم کارە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (انْطَلِقْ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُثَبِّتُ لِسَانَكَ، وَيَهْدِي قَلْبَكَ ، قَالَ: ثُمَّ وَضَعَ يَدهُ عَلَى فَمِهِ))[١٠٨٣] واتە: ((برۆ خودا زمانت جێگیر و پاراو دەکات ڕینموێنی دڵت دەکات پاشان دەستی خستە سەر دەمی عەلی))].

لە گێڕانەیەکی تردا هاتووە: [عەلی ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چل ئایەتی سەرەتای سورەتی (تەوبە)ی بەمن دا نارد لەگەڵ ئەبوبکر][١٠٨٤]. [عەلی ﷺ بەسواری وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ (قسواء یان عزباء) بەرەو کارەکەی چوو تا گەیشتەوە بە ئەبوبەکر][١٠٨٥]. [ئەبوبەکر ﷺ لە ڕێگەدابوو دەنگی وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ قەسوائی بەرگوێ کەوت، ئەبوبەکر زۆر ترسا وای زانی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە تەماشای کرد وا عەلی لەسەر پشتی سواربووە][١٠٨٦].

---

(١٠٨١) أخرجه: الترمذي (٣٠٩٠) وحسن اسناده الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٤٦٧).

(١٠٨٢) أخرجه: الترمذي (٣٠٩١) وصحيح اسناده الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٤٦٨).

(١٠٨٣) أخرجه: الترمذي (٣٠٩٠) وأحمد (الفضائل) (١٢٠١) وقال محققه: اسناده حسن و اللفظ الول للترمذي و الثاني لأحمد، وكان هذا تمشياً مع عادة العرب في عهود الدعاء و الأموال.

(١٠٨٤) أخرجه: الطبري (التفسير) (١٦٣٨٢) وقال محققه أحمد شاكر: اسناده صحيح.

(١٠٨٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٦٠/٤) برقم (١٠٩٣)، والطبري (التفسير) (١٦٧٧)، والبيهقي (الدلائل) (١٩٣/٥) وحسنه الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (٤٥٢، ٤٥٣) وحسنه ايضاً لشواهد محقق (دلائل النبوة) للبيهقي (برقم:٢٠٢٩).

(١٠٨٦) أخرجه: الترمذي (٣٠٩١).

کاتێك ئەبوبەکر عەلی بینی پێی وت: فەرمانداریت یان فەرمان پێکراو؟ عەلی ﷺ وتی: فەرمان پێکراوم [و نامەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ پێدا] پاشان هەردووکیان بەڕێکەوتن و دواتر گەیشتنە ئەوێ و ئەبوبەکر ڕابەرایەتی حەجەکەی بۆ کردن، عەرەبەکان مەراسیمی زەمانی نەفامیان پیادە دەکرد لە حەج کردندا [تا ڕۆژی عەرەفە هاتە پێش، لەوێدا ئەبوبەکر ﷺ وتارێکی بۆ خەڵکەکە داو پاشان ڕووی کردە عەلی ﷺ پێی وت: هەستە عەلی پەیامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بگەیەنە. ئەویش هەستاو چل ئایەتی سەرەتای سورەتی تەوبەی بۆ خوێندنەوە و هەمووانی ئاگادار کردەوە. پاشان گەیشتە مینا، عەلی ﷺ دەفەموێت: [لەوێدا ڕەجمی شەیتانم کردو قوربانیەکەم سەر بڕی و سەرم تاشی و زانیم کە هەموو خەڵکی ئامادەی وتارەکەی ئەبوبەکر نەبوون لە عەرەفە. بۆیە من بەردەوام بەسەر خەڵکیدا دەگەڕام وتار و ئایەتەکانم بۆ دەخوێندنەوە][١٠٨٧].

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: [عەلی لە ڕۆژانی جەژندا لە مینادا بانگی دەکرد: خوداو پێغەمبەرەکەی بێبەرین لە هەموو موشرکێك و تاچوار مانگ بۆیان هەیە بە ئازادی هاتوچۆ بکەن، لەم ساڵ بەدواوە هیچ موشرکێك نەیەت بۆ حەج کردن وە هیچ کەسێك بەڕووتی بەدەوری کەعبەدا تەواف نەکات و تەنها بڕوادار دەچێتە بەهەشتەوە][١٠٨٨]. لە گێڕانەوەیەکی تردا: [دەیان وت: هەرکەسێك پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە ئەوە تا تەواو بوونی وادەکەی کاری پێدەکرێت وە ئەوانەی پەیمانیشیان لەگەڵدا نییە تەنها تا چوار مانگ وادەیان هەیە، وە کەسێك بڕوادار (موسوڵمان) نەبێت ناچێتە بەهەشتەوە، موسوڵمانەکان و موشریکەکان لەم ساڵ بەدواوە نابێت لێرە کۆببنەوە] [وە نابێت موسوڵمانان و بێ باوەڕان لە مەسجدولحەڕامدا بەیەکەوە بن لەم ساڵ بەدواوە][١٠٨٩].

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: [عەلی جاڕی دەدا و بانگەوازی دەکرد هەرکات

---

(١٠٨٧) أخرجه: الطبري (التفسير) (١٦٣٨٢) وقال محققه أحمد شاكر: اسناده صحيح.

(١٠٨٨) أخرجه: الترمذي (٣٠٩١) وصحح اسناده الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٤٦٨).

(١٠٨٩) أخرجه: أحمد (٥٩٤) وقال محققوه: حديث صحيح، ومسلم (١٣٤٧)، وابوداود (١٩٤٦)، و النسائي (٥/٢٣٤)، والترمذي (٣٠٩٢).

ماندوو بووایە ئەبوبەکری هەڵدەستاند لەجێی ئەو بانگەوازی دەکرد][١٠٩٠].
ئەبوهورەیرە ﷺ دەفەرموێت: [عەلی هەرکات دەنگی بنوسایە من لە جێی ئەو بانگەوازم دەکرد][١٠٩١]. [وە ئەبوبەکری صدیق ﷺ لەو حەجەدا چەندان کەسی بڵاو کردبووەوە تا ئەو بانگەوازە بگەیەنێتە سەرجەم خەڵکی لە مینا. [عەلیش لەگەڵیان دا بوو سورەتی تەوبەی بۆ دەخوێندنەوە][١٠٩٢]. و پێیان ڕاگەیەنرا: لەم ساڵ بەدواوە کەسی موشریك نەیەت بۆ حەج کردن وە کەس بەڕووتی بەدەوری کەعبەدا تەواف نەکات][١٠٩٣]. ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: منیش لەوێ ئەوەندە جارمدا تا دەنگم نوسا][١٠٩٤].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [عەلی کوڕی ئەبوتالیب ﷺ بانگەوازەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ گەیاند وە ماوەی چوار مانگ مۆڵەتی دایە خەڵکی لەو ڕۆژەوە تا هەموو یەکێك بە ئارامی بگاتەوە ناوچەی خۆی وە پێی ڕاگەیاندن کە کەسی موشریك هیچ بەڵێن و پەیمانێکی نامێنێت لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ وە ئەوانەش کە ماوەی دیاری کراویان بۆ هەیە ئەوانیش تا ئەو ماوەیە پەیمانەکانیان بۆ دەبرێتە سەر. ئیتر بەو جۆرە لەو ساڵە بەدواوە هیچ موشرکێك نەهاتە حەج وە هیچ کەسێکیش بە ڕووتی بەدەوری کەعبەدا تەوافی نەکرد. پاشان هەردووکیان گەڕانەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ][١٠٩٥].

(١٠٩٠) أخرجه: الترمذي (٣٠٩١).
(١٠٩١) أخرجه: الطبراني (التفسير) (برقم: ١٦٣٦٨).
(١٠٩٢) أخرجه: البخاري (٣١٧٧).
(١٠٩٣) أخرجه: البخاري (٤٦٥٦).
(١٠٩٤) أخرجه: أحمد (٧٩٧٧) وقال محققوه: اسناده حسن، وقال ابن كثير (البداية) (٤/٦٩٦): اسناده جيّد.
(١٠٩٥) أخرجه: ابن هيشام (السيرة) (٤/١٦٠) (١٠٩٣)، والطبري (التفسير) (١٦٣٧٧) وحسنّه الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (ص:٤٥٢، ٤٥٣).

## ساڵی وەفدەکان

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [عەرەب هەموو چاوەڕوانی قوڕەیشیان دەکرد بۆ موسوڵمان بوون چونکە قوڕەیش پێشەوا و ڕێنمایی کاری هەموو عەرەب بوون، وە خاوەنی کەعبە و حەرەم و تەختی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم بوون، پێشەواکانی عەرەب هەموویان هیچ نکوڵیان لەو سەروەریانەی قوڕەیش نەدەکرد. قوڕەیشیش خۆی سەرەتا تەرخان کردبوو بۆ جەنگ و دژایەتی کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسوڵمانان، بەڵام لە دوای ئازاد کردنی شاری مەککە وملکەچ بوونی قوڕەیش بۆ ئیسلام، ئەوکات عەرەبەکان هەموو دڵنیابوون کە توانای بەرەنگاربوونەوە و جەنگیان نییە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ وە هەرگیز دوژمنایەتیان بۆ ناکرێت لەگەڵیدا. لەبەر ئەوە دواجار هەموو ناچاربوون لە هەموو لایەکەوە کۆمەڵ کومەڵ بێنە ناو ئیسلامەوە][١٠٩٦]. جاڕ دانەکەی ئەوساڵەی حەج و بڕیاردان کە ئیتر لەو ساڵە بەدواوە هیچ کەسێکی موشریك بۆی نییە بێتە حەج و تەنها چوار مانگ مۆڵەتیان لەبەردەمدا هەیە بۆ خۆیەکلاکردنەوە. هەموو ئەوانە زۆر کاریگەری گەورەیان هەبوو لە سەر ئیسلام بوونی عەرەبەکان.

جیاوازی هەیە لە نێوان زانایان سەبارەت بە ژمارەی ڕاستەقینەی وەفدەکان و کاتی هاتنیان بۆ مەدینە لای هەندێکیان شەست وەفد وە لای هەندێکی تریان سەد وەفدە:

هەندێك لەو وەفدانە باسیان لای فەرموودە نوسان هەیە و هەندێکی تریان تەنها لای ژیان نامەنوسان: [هەموو وەفدەکان زیاتر لە ساڵی نۆی کۆچیدا هاتن بۆیە ئەو ساڵە ناوی لێنرا ساڵی وەفدەکان][١٠٩٧].

لە ساڵی نۆی کۆچیدا دەوڵەتی ئیسلامی لە پایتەختەکەیدا مەدینە کەشێکی پەروەردەیی گونجاو ئامادەبوو بۆ پێشوازیان و جێگەی تایبەت ئامادەکرا بوو بۆ حەوانەوەیان و میوانداری کردنیان، مزگەوتیش گۆڕەپانی پێشوازی کردنیان بوو وە پێشبڕکێ هەبوو لای هاوەڵان بۆ میوانداری کردنیان.

(١٠٩٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٧٢/٤) برقم: (١١٠٧).

(١٠٩٧) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٧٢/٤) برقم: (١١٠٦)، وانظر: كتاب (محمد رسول الله) (٥٢٠/٤).

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بایەخی بە پەروەردەکردن و فێرکردنیان دەدا، ئاداب و یاساکانی ئیسلام و حەلاڵ و حەرامی فێردەکردن، وەڵامی پرسیارەکانی دەدانەوە و زانستخوازانی لە خۆی نزیك دەکردەوە وە لە کاتی گەڕانەوەیاندا دیاری و خەڵاتی پێ دەبەخشین، ئامۆژگاری دەکردن پابەندبن بە حەق و ڕاستییەوە و ئارامگرو بە بەزەیی و ڕەوشت بەرزبن و ئیسلام بگەیەننە تێکڕای قەوم و خزمانیان. وەفدەکانیش کاتێك دەگەڕانەوە کەسانێکی هیدایەتدراو ڕێنوێنی کراو دەبوون و چاك و چاکەکار دەبوون بۆ خزمانیان و هەواڵی پێغەمبەری خوا ﷺ و ڕەوشتە جوانەکانی و شکۆی هاوەڵانی و سۆز و بەزەیی و ڕێز و خۆشەوستیان لە ناو یەکدا هەموو ئەوانەیان بۆ دەگێڕانەوە و داوایان لێدەکردن کە خێرا بێنە ناو ئاینی ئیسلامەوە و تامەزرۆبوون زووتر بگەنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی. هەواڵی وەفدەکانیش بەم جۆرە دەبێت:

### ١- هاتنی وەفدی بنی تمیم:

لەسەرەتای ساڵی نۆیی کۆچیدا وەفدی بەنی تەمیم هاتن، لە شاندەکەیاندا عەتارید و ئەقرەع و زەبەرقان و عوویینە و قەیسی کوڕی عاسمیان لە ناودابوو:

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [...وەفدی بەنی تەمیم هاتن و (عوینەی کوڕی حوسن و ئەقرەعی کوڕی حابسیان) لەگەڵدا بوو، کاتێك وەفدەکە چوونە ناو مزگەوتەوە لە پشتی ژوورەکانی ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ وەستان و هاواریان کرد: ئەی موحەممەد وەرەدەرەوە بۆ لامان. ئەو هاوارەیان پێغەمبەری خوای ﷺ نیگەران کرد و دواتر هاتە دەرەوە بۆلایان][١٠٩٨].

بەرائی کوڕی عازب ﷺ دەفەرموێت: [یەکێك (لەوانە) چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی موحەممەد سوپاس کردنم جوان نییە و زەمکردنم ناشیاویە فەرمووی: ((ئەوە (تەنها) بۆ خوای گەورەیە))[١٠٩٩]. لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە ئەو کەسە ئەقرەع بووە: (..ئەقرەع بانگی لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد و دەی وت:

(١٠٩٨) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٧٣/٤)، و الطبري (التاريخ) (١١٧/٣).

(١٠٩٩) أخرجه: الترمذي (٣٢٦٧)، و النسائي (الكبرى) (١١٥١١)، و الطبري (التفسير) (١٢١/٣٦)، وقال ابن كثير (البداية) (١٥/٥): اسناده جيده جيد متصل، وصححه الشيخ الألباني في (صحح الترمذي) (٣٦٠٥).

ئەی موحەممەد وەرە [بۆ لامان] پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی نەدایەوە دواتر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من سوپاس کردنم جوان نییە و زەم کردنم نەشیاویە. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: [((هاوار بۆ تۆ ئەوە تەنها بۆ خودایە))][١١٠٠].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: (ئەوان لە ناو خۆیاندا وتیان: با هەموو بڕۆین بۆ لای ئەو پیاوە گەر پێغەمبەر بێت ئێمە بە هۆیەوە بەختەوەرترین کەس دەبین وە گەر پاشا بێت ئەوا ئێمە لە ژێر باڵ و سایەیدا دەبین).

زەید دەڵێت: من ئەوەندەم لێیان بیست و چوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتەکانیم پێ گەیاندن. پاشان خۆیان هاتنە لای ژووری ماڵەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتنە هاوارکردن: ئەی موحەممەد. تا بەو هۆیەوە خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ ﴾ (الحجرات)[١١٠١] واتە: (ئەوانەی لە دوورەوە بانگ لە پێغەمبەر دەکەن بەڕاستی زۆربەیان تێناگەن و ڕێزو پلەی تۆ نازانن، ئەگەرنا وایان نەدەکرد).

دواجار وەفدەکە موسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند و ئاشکرا کرد، لە نێوانیاندا قەیسی کوڕی عاسم هەبوو [هەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوی بینی فەرمووی: ((ئەو سەروەری خاوەن وشترەکانە))[١١٠٢]. خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمانی پێکردم خۆم بشۆم و پاشان بچمە لای ئەبوبەکر و عومەر تا ئیسلامم فێر بکەن)، [دواتر من پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد من لە کاتی نەفامیدا هەشت کچی خۆمم زیندە بەچاڵ کردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((اعْتِقْ عَنْ كُلِ وَاحِدةٍ مِنْهُنَّ رَقَبَة..)) [١١٠٣]][١١٠٤] واتە: ((کۆیلەیەك ئازاد بکە لە

(١١٠٠) أخرجه: أحمد (١٥٩٩) وقال محققوه: اسناده ضعيف، والطبراني (الكبير) (٨٧٨) و(٥/٢٣) وموسى بن عقبة (المغازي) (:٣١٣)، وصح اسناده السيوطي في (الدر) (٨٩/٦) وحسنه في (لبلب النقول) (ص:٣٣٠) وقال محققه: اسناه حسن، وهو حديث صحيح بشواهد كما في (صحيح اسبا النزول) (رقم:٢٨٠).

(١١٠١) أخرجه: الطبري (التفسير) (١٢١/٢٦)، و الواحدي (أسباب النزول) (٧٥٧)، و الطبراني (الكبير) (٥١٢٣)، و ابن ابي حاتم (التفسير) (١٨٦٠٧) وهو حديث حسن لشواهد كما في (صحيح اسباب النزول) (٢٨١).

(١١٠٢) أخرجه: البخاري (الأدب المفرد) (٩٥٣)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحح الأدب) (٧٣٠) وحسنه ايضاً الحافظ في (الاصابة) (رقم:٧٣٠٩).

(١١٠٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣٣٧/١٨)، والبزار (٢٣٨) وسنده حسن كما قال محقق (الاصابة) (٧٣٠٩).

(١١٠٤) أخرجه: ابو داود (٣٥٥)، والنسائي (١١٨)، و الترمذي (٦٠٥)، و ابن خزيمة (٢٢٤)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح

بری هەریەکێك لەوان...)).

ئەقرەعی کوڕی حابیس یەکێکبوو لە سەرکردە وشکەکانیان عیمرانی کوڕی حوسەین ﷺ دەفەرموێت: [چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکەمم لە بەردەرگا بەستبووەوە، کەسانێکی بەنو تەمیم هاتنە خزمەتی فەرمووی: ((ئەی بەنی تەمیم مژدەکەتان وەربگرن)). ئەقەرع وتی: پێشتر مژدەت پێ داوین لە جیاتی ئەوە پارەمان بدەرێ. دووجار دووبارەی کردەوە، دواتر وتیان: [ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووین شارەزامان بکەیت لە ئایندا و تا پرسیاری سەرەتای دروست بوونی بوونەوەرت لێبکەین؟ فەرمووی: ((كَانَ اللَّهُ وَلَيْسَ شَيْءٌ غَيْرُهُ، وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ، ثُمَّ كَتَبَ فِي الذِّكْرِ كُلَّ شَيْءٍ، ثُمَّ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ))[(١١٠٥)] واتە: ((سەرەتا هەر خودا هەبوو و هیچی تر جگە لەو نەبووەوە، تەختی فەرمانڕەوایی لە سەر ئاو بووە، پاشان لە (لوح المحفوظ) دا هەموو شتێکی نوسیوە و( بڕیاری لەسەر داوە) پاشان ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە].

وەفدەکەی بنو تەمیم داوایانکرد ڕێگە بدرێت شاعیر و وتاربێژیان وتەی خۆیان پێشکەش بکەن. وەك ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: [..وتیان: ئەی موحەممەد ئێمە هاتوین بۆلات شانازی و کێبرکێت لەگەڵدا بکەین، ڕێگەبدە شاعیرو وتار بێژەکانمان قسە بکەن، فەرمووی: ((ئەوا ڕێگەم دا بە وتار بێژەکەتان با بڵێت)). عەتاریدی کوڕی حاجیب لەوێدا هەستاو وتارێکی دا، پاشان وتار بێژی پێغەمبەری خوا ﷺ سابتی کوڕی قەیس ﷺ هەستاو بە وتارێك وەڵامی دایەوە. پاشان شاعیرەکەیان زەبەرقانی کوڕی بەدر هەستا و شیعری خۆی وت و حەسانیش ﷺ بە شیعر وەڵامی دایەوە... دواتر ئەقەرع وتی: ئەو پیاوە (پشتیوانی لێدەکرێت) وە هەر سەردەکەوێت ئەوەتا وتار بێژەکەی بەتواناترە لە وتار بێژەکەمان وە شاعیرەکەشی بەتواناترە لە شاعیرەکەمان وە دەنگیان بەسەرماندا بەرزترە... لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین خەڵات و دیاری پێشکەش کردن][(١١٠٦)].

---

أبي داود) (٣٤٢)، و (المشكاة) (٥٤٣).

(١١٠٥) أخرجه: البخاري (٣١٩٠،٤٣٦٥)، والترمذي (٣٩٥) واللفظ للبخاري و الزيادة لابن حبان (٦١٤٠) وقال محققه اسناده صحيح، الطبراني (الكبير) (٤٩٧/١٨).

(١١٠٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٧٨/٤)، و الطبري (التاريخ) (١١٨/٣)، و البيهقي (الدلائل) (٣١٦/٥).

لە گێڕانەوەیەکی تردا: [دووان لەو پیاوانەی ڕۆژهەڵات هەستان و خەڵکیان سەرسام کرد بە ڕەوانبێژییان پاشان دانیشتن، ئینجا سابتی کوڕی قەیس هەستا و بە وتارێك وەڵامی دایەوە وە خەڵکی سەرسام کرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاو وتارێکی داو فەرمووی: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ قُولُوا بِقَوْلِكُمْ، فَإِنَّمَا تَشْقِيقُ الْكَلَامِ مِنَ الشَّيْطَانِ إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْرًا))[١١٠٧] واتە: ((ئەی خەڵکینە بە وتەی ئاسایی خۆتان بدوێن چونکە بەش بەش کردنی وتەکان لە شەیتانەوەیە و بزانن هەندێك ڕەوانبێژیی وەك سیحرە (واتە: کاریگەرە))).

لەوکاتەدا مشت ومڕێك لە نێوان ئەبوبەکر ﷺ و عومەر ﷺ ڕوویدا سەبارەت بەوەی کێ ببێتە پێشەوایان. عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: [چەند سوارێکی بەنی تەمیم هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبەکر ﷺ فەرمووی: قەعقاع کوڕی مەعبەدی کوڕی زورارە بکەرە پێشەوایان، عومەریش ﷺ فەرمووی: نا بەڵکو ئەقرەعی کوڕی حابیس بکەرە پێشەوایان. ئەبوبەکر ﷺ وتی: تەنها مەبەستت ئەوە بوو پێچەوانەی من بکەیت. عومەر ﷺ وتی: نا مەبەستم پێچەوانەی تۆ نەبوو ئیتر بووە دەمە قاڵەیان تا دەنگیان بەرزبووە وە و ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ١﴾(الحجرات)][١١٠٨]. واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە! لە هیچ بڕیارێکدا پێشی بڕیاری خواو پێغەمبەری خوا مەکەون وە لەخوا بترسن و لەسنوورەکانی لامەدەن چونکە بەڕاستی خوا بیسەرە بەوتەکانتان وە زاناشە بە ئیش و کارەکانتان) [لە دوای دابەزینی ئەو ئایەتەوە عومەر هەر شتێکی ببیستایە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ پرسیاری لەبارەوە دەکرد...].

لەگێڕانەوەیەکی تردا: [عومەر ﷺ دواتر گەر لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ بدوایە ئەوەندە بە دەنگی نزم قسەی دەکرد [هەندێك جار داوای لێدەکرا دەنگ بەرز بکاتەوە... ئەویش وەك ڕێز بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ][١١٠٩]. بەهۆی سەرقاڵبوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بەم وەفدەوە نەی توانی دوو ڕکات نوێژەکەی دوای نوێژی نیوەڕۆ ئەنجام بدات.

---

(١١٠٧) أخرجه: أحمد (٩٤/٢)، والبخاري (٥٧٦٧)، وفي (الأدب المفرد) (٨٧٥)، وابن حبان (٥٧١٨) وقال محققه: اسناده صحح على شرطهما و اللفظ له وللبخاري زصححه الشيخ الألباني في (صحيح الأدب) (٦٧) و (الصحيحة) (١٧٣١).

(١١٠٨) أخرجه: البخاري (٤٣٦٧)، والنسائي (٥٣٨٦)، و الترمذي (٣٢٦٦).

(١١٠٩) أخرجه: البخاري (٤٨٤٥)، و(صحيح الترمذي) (٣٦٠٤).

ئوم سەلەمە ﵂ دەفەرموێت: [ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لام لەدوای عەسر و لە ژوورەکەی من دوورکات نوێژی کرد من پێشتر نەم دیبوو هەرگیز لەوکاتەدا ئەو نوێژە ئەنجام بدات لەو بارەیەوە پرسیارم لێکرد؟] فەرمووی: ((إِنِّي كُنْتُ أُصَلِّي الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ، وَإِنَّهُ قَدِمَ عَلَيَّ وَفْدُ بَنِي تَمِيمٍ أَوْ صَدَقَةٌ فَشَغَلُونِي عَنْهُمَا، فَهُمَا هَاتَانِ الرَّكْعَتَانِ)) واتە: ((من پێشتر لە دوای نوێژی نیوەڕۆ ئەو دوو ڕکاتەم دەکرد بەڵام وەفدی بەنی تەمیم هاتنە لام... سەرقاڵیان کردم ئێستاش ئەو دوو ڕکاتەیە...))][1110].

پێغەمبەری خوا ﷺ ستاشی بەنی تەمیمی کرد، ئەبو هورەیرە ﵁ دەفەرموێت: [بەردەوام بەنی تەمیمم خۆش دەوێت لە دوای بیستنی سێ شت لە بارەیانەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرمووی: ((هُمْ أَشَدُّ أُمَّتِي عَلَى الدَّجَّالِ)) واتە: ((ئەوان توند ترین کەسی ئومەتی منن بەرامبەر بە دەجال)) وە کەنیزەیەکیان لای عائیشە بوو فەرمووی: ((ئازادی بکە ئەوە لە منداڵەکانی ئیسماعیلە)) وە کاتێك زەکاتەکەیان هات فەرمووی: ((وَهذِهِ صَدَقاتُ قَوْمٍ أَو قَوْمِي))[1111] واتە: ((ئەوە زەکاتی خزمەکانمە))].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە هەردووکیان واتە: (ئەقەرەع و عویینە) داوای شتیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە و ئەویش ئامۆژگاری کردوون سەهلی حەنزەلی ﵁ دەفەرموێت: [عویینەی کوڕی حوسین و ئەقەرەعی کوڕی حابیس داوای شتیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش فەرمانیدا پێیان ببەخشن و بیان دەنێ] و [فەرمانی بە موعاویە کرد کە ئەوەی داوایان کردووە بۆیان بنوسێت و بکرێت بەناویانەوە] [پاشان نوسراو مۆر کراو ئامادە کراو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بڕیارەکانیان بۆ بهێنرێت].

موعاویە دوو نوسراوی پێ بوو یەکێکیانی دایە دەست عویینە کە لەسەر خۆتربوو [وتی: چی تێدا نوسراوە؟ فەرمووی: ((ئەوەی داوات کردووە)) ئەویش نامەکەی ماچ کردوو بە کڵاو جامانەکەیەوە بەستی] [و ڕۆیشت] وە نوسراوەکەی تری دایە دەست ئەقرەع ئەویش وتی: چی تێدا نوسراوە؟ فەرمووی: ((ئەوەی داوات کرد)) وتی: من

---

(١١١٠) أخرجه: عبد الرزاق (المصنف) (٣٩٧١)، و الحميدي (المسند) (٢٩٥)، واسناده صحيح، كما في (صحيح الفقيه و المتفقه) (١٥٤).

(١١١١) أخرجه: البخاري (٤٣٦٦)، ومسلم (٢٥٢٥).

خراپترین وەفدی کەسانێکم گەر نامەیەکیان بۆ بەرم و نەزانم چی تیا نوسراوە وەك نامەکەی موتەلمیس. [دواتر موعاویە وتەکەی هەردوکیانی گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ... و ئەویش نامەکەی بۆ هەڵبچڕی... و تەماشای کرد]، [دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺبۆ پێویستی خۆی ڕۆیشت [و بەلای وشترێکدا تێپەڕی کە بەسترابووە وە] لە بەردەم دەرگای مزگەوت دا و لەسەرەتای بەیانیەوە، دواتر بەلایدا تێپەڕی لە ئێوارەدا تەماشای کرد هەر لەشوێنی خۆی بەستراوەتەوە فەرمووی: ((خاوەنی ئەم وشترە کێیە؟)) بەدوایدا گەڕان نەیان دۆزیەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((اتَّقُوا اللَّهَ فِي هَذِهِ الْبَهَائِمِ ارْكَبُوهَا صِحَاحًا وَكُلُوهَا سِمَانًا)) واتە: ((لە خودا بترسن لە هەڵسوکەوتتان بەرامبەر ئەم ئاژەڵانە، گەر بەتواناو لەشساغبوون سواری پشتیان ببن وە گەر قەڵەو بوون سەریان ببڕن و بیان خۆن] دواتر بەرەو ماڵی خۆی ڕۆیشتەوە و من لەگەڵی بووم وەك نارەزایی بوونێك لە (ئەقرەع و عویینە) فەرمووی: [((هەر کەسێك ئەوەندەی هەبێت کاری خۆی بۆ بچێت بە ڕێوە داوای پارە (لە خەڵکی بکات) ئەوە پشکۆی دۆزەخ بۆ خۆی زیاد دەکات)) وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چەندی هەبێت؟ فەرمووی: [أَنْ يَكُونَ لَهُ شِبْعُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، أَوْ لَيْلَةٍ وَيَوْمٍ]))[١١١٢]. واتە: ((خواردنی بەیانی و ئێوارەی هەبێت یاخود [شەو ڕۆژێك تێر بێت]))].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: عەمری کوڕی عەبسەی سولەمی ﷺ دەفەرموێت: [ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ عویینەی کوڕی حوسەنی لەگەڵ بوو تەماشای ئەسپی دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بە عویینەی فەرموو: ((من ئەسپ باشتر دەناسم لە تۆ)) و عیینەیش وتی: منیش پیاوان باشتر دەناسم. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((چۆن؟)) وتی: باشترین پیاوان پیاوانێکی خەڵکی ناوچەی نەجدن، شمشیرەکانیان لەسەر شانیانەوەیە وە ڕمەکانیشیان بەسەر کۆپانی ئەسپەکانیانەوەیە و پۆشاك و بوردەیان لەبەردایە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((كَذَبْتَ بَلْ خَيْرُ الرِّجَالِ رِجَالُ أَهْلِ الْيَمَنِ، وَالْإِيمَانُ يَمَانٌ إِلَى لَخْمٍ، وَجُذَامَ، وَعَامِلَةَ.... ثُمَّ قَالَ: لَأَسْلَمُ، وَغِفَارُ، وَمُزَيْنَةُ، وَأَخْلَاطُهُمْ مِنْ جُهَيْنَةَ خَيْرٌ مِنْ بَنِي

---

(١١١٢) أخرجه: أحمد (١٧٦٢٥) وقال محققوه: اسناده صحيح، وابن حبان (٥٤٥) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط البخاري، وابوداود (١٦٢٩)، وابن خزيمة (٢٣٩١)، والبيهقي والزيادات لأحمد وبن حبان وأبوداود.

أَسَدٍ، وَتَمِيمٌ، وَغَطَفَانُ، وَهَوَازِنُ، عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ....وَأَكْثَرُ الْقَبَائِلِ فِي الْجَنَّةِ مِذْحَجٌ))[١١١٣] واتە: ((درۆت کرد بەڵکو باشترین پیاوان پیاوانی خەڵکی یەمەنن و بڕواو ئیمان هەر لەوێیە تا هۆزەکانی لەخم و جوزام و عامیلە... هۆزەکانی ئەسلەم و غیفار و موزینە و هاوشێوەکانیان لە جوهەینە باشترن لە لای خوای گەورە لە ڕۆژی دوایدا لەبەنی ئەسەدو تەمیم و غەتەفان و هەوازن... وە زۆرترین هۆزەکان لە بەهەشتدا هۆزەکانی میزحەجن))].

**٢- وەفدی بەنی عامری سەعسەعە:**

ئەم وەفدە پێش ئازادکردنی شاری مەککە هاتن: عامری کوڕی نوفەیل و ئیربیدی کوڕی قەیسیان لەگەڵ بووە، هاتبوون بە مەبەستی ناپاکی کردن بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام خوای گەورە پێغەمبەرەکەی پاراست، دواجار عەمری کوڕی قەیس مەرجی موسوڵمان بوونی ئەوە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ بیکاتە سەرۆکی ناوچەی خۆیان وە هەروەها ببێتە جێنشین لەدوای پێغەمبەری خوا ﷺ. ئەوانەی پێ نەدرا دواتر هەڕەشەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە بە هەموو خەڵکی ناوچەی غەتەفانەوە هێرش دەهێنێتە سەر موسوڵمانان. پاشان هەردووکیان شاری مەدینەیان جێ هێشت و گەڕانەوە لە ڕێگادا خودای گەورە هەردووکیانی لەناوبرد[١١١٤].

وادیارە کۆمەڵێکیان لە دوای ئازادکردنی شاری مەککە هاتوونەتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بیروباوەڕی پوخت و ئاداب فێربوون. موتەریفی کوڕی عەبدوڵلا لە باوکیەوە دەفەرموێت: [لەگەڵ کۆمەڵێکی بەنی عامردا چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ [لە گێڕانەوەیەکدا: لەگەڵ وەفدی بەنی عامر بووم] [چووینە خزمەتی و سڵاومان لێکرد و وتمان: تۆ پشتیوانمانیت][١١١٥]، هەر تۆ باوکمانیت وە تۆ [چاکترین و کوڕی چاکترینیت، وە سەروەرمانیت و کوڕی سەروەرمانیت][١١١٦]. پێغەمبەری خوا

(١١١٣) أخرجه: أحمد (١٩٤٤٥) وقال محققوه: اسناده صحيح وفي (الفضائل) (١٦٥٠) وقال محققه: اسناده صحيح، و الطبراني (الشامين) (٩٦٩)، والبخاري (التاريخ) (١/٣٢٧)، وابن أبي عاصم (٢٢٧٠) واسناده صحيح كما في تخريج (مسند أحمد) (١٩٢/٣٢)، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣٦٠٦) و العدوي (صحيح فضائل) (٥١٧).

(١١١٤) أخرجه: القصة مطولًا: ابن هيشام (السيرة) (١٧٩/٤)، و الحاكم (٨٢/٤)، و الطبراني (الكبير) (١٠٧٦٠) و (الاوسط) (٩١٢٧) و (الطوال) (٣٧) وفي اسنادهم ضعيف، و أخرجه: البخاري مختصراً (٤٠٩١).

(١١١٥) أخرجه: أحمد (١٦٣١١) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(١١١٦) أخرجه: أحمد (١٥٣/٣) وقال الشيخ الالباني في (غاية المرام) (١٢٧): اسناده صحيح على شرط مسلم.

ﷺ فەرمووی: ((السيدُ اللّه تَبَارَكَ وَتَعالى)) واتە: ((سەروەری ڕاستەقینە خوای گەورەیە)) وتمان: تۆ لە هەموومان چاکتری و لە هەموومان بالادەست تریت، بەڕێزمان و خانە خۆیمانی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (([يَا أَيُّهَا النَّاسُ، لَا تَرْفَعُونِي فَوْقَ قِدْرِي، فَإِنَّ اللَّهَ اتَّخَذَنِي عَبْدًا قَبْلَ أَنْ يَتَّخِذَنِي نَبِيًّا][١١١٧] قُولُوا بِقَولِكُمْ وَ [لا يَسْتَجِرَّنَكُمْ] الشَّيْطان))[١١١٨] [أَنَا مُحَمَّدُ عَبْدُ اللَّهِ [أنا عَبْدُ اللَّهِ]، مَا أُحِبُّ أَنْ تَرْفَعُونِي فَوْقَ مَنْزِلَتِي الَّتِي أَنْزَلَنِي اللَّهُ))][١١١٩] واتە: (([ئەی خەڵکینە بەرزم مەکەنەوە لەسەر و پلەی خۆم، خودا منی بە بەندە هەڵبژاردوە پێش ئەوەی من بە پێغەمبەر هەڵبژێریت] و هەر وتەی ئاسای خۆتان بڵێن و [شەیتان هەڵتان نەخلیسکێنێت] [من موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلام [وەمن بەندەی خودام] وە پێغەمبەری خودام، پێم خۆش نییە لەو پێگەیەی کە خودا منی تێدا داناوە بەرزترم بکەنەوە].

لەیەکێك لە ڕۆژەکاندا پیاوێکی بەنی عامر ویستی سەردانی پێغەمبەری خوا ﷺ بکات بەڵام مۆڵەت وەرگرتن و چوونە سەردان کردنی نەدەزانی بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دواجار فێری کرد.

پیاوێکی بەنی عامر دەڵێت: [لە دەرگای ماڵی پێغەمبەری خوام ﷺ داو وتم: خۆمی پیابکەم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ بە خزمەت کارەکەی فەرمووو: ((برۆ دەرەوە بۆ لای ئەو ئیزن خواستن نازانێت پێی بڵێ: بابڵێت: السلام علیکم، ئایا بێمە ژوورەوە؟)) منیش لەدەرەوە ئەو قسانەیم بیست و وتم: السلام علیکم، ئایا بێمە ژوورەوە؟ فەرمووی: [((علیك السلام وەرە ژوورەوە))] منیش چوومە ژوورەوە و وتم: پەیامت چییە بۆ ئێمە؟ فەرمووی: ((لَمْ آتِكُمْ إِلَّا بِخَيْرٍ، أَتَيْتُكُمْ أَنْ تَعْبُدُوا اللَّهَ وَحْدهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنْ تَدَعُوا [عبادة] اللَّاتَ وَالْعُزَّى، وَأَنْ تُصَلُّوا بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ خَمْسَ صَلَوَاتٍ، وَأَنْ تَصُومُوا مِنَ السَّنَةِ شَهْرًا، وَأَنْ تَحُجُّوا الْبَيْتَ، وَأَنْ تَأْخُذُوا مِنْ أَمْوَالِ أَغْنِيَائِكُمْ فَتَرُدُّوهَا عَلَى فُقَرَائِكُمْ)) واتە: ((من تەنها

(١١١٧) أخرجه: الحاكم (١٧٩/٣) وصححه ووافقه، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢٥٥٠).

(١١١٨) أخرجه: البخاري (الادب) (٢١١)، ومسلم (٢٦٩)، وابوداود (٤٨٠٦)، و النسائي (الكبرى) (١٠٧٥) وفي (عمل اليوم) (١٤٧)، وأحمد (١٦٠٧) وقال محققوه: اسناده صحح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الألباني في (المشكاة) (٤٩٠١)، و (صحيح الادب المفرد) (١٥٥)، و(صحيح أبي داود) (٤٠٢١).

(١١١٩) أخرجه: أحمد (١٥٣/٣) واسناده صحيح على شرط مسلم كما قال الشيخ الألباني في (غاية المرام) (١٢٧) (و الصحيحة) (١٠٩٧، ١٥٧٢).

خێرم بۆتان هێناوە، پێویستە تەنها خودای تاك و تەنها بپەرستن و هاوتای بۆبڕیار نەدەن ودووربکەونەوە لە پەرستنی لات و عوزا، وە لەشەو و ڕۆژدا پێنج جار نوێژ بکەن و لەساڵێکدا یەك مانگ بەڕۆژوو بن و حەجی ماڵی خودا بکەن وە هەندێك سامان لە دەوڵەمەندەکانتان وەرگرن بیدەنە هەژارەکانتان)). وتم: لە زانستەکاندا هیچ ماوە تۆ نەیزانیت؟ فەرمووی: (([لَقَدْ] عَلِمَ اللَّهُ خَيْرًا، وَإِنَّ مِنَ الْعِلْمِ مَا لَا يَعْلَمُهُ إِلَّا اللَّهُ الْخَمْسُ [لا يُعلَّمُهُنَّ إلاّ الله])) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾﴾ (لقمان)[١١٢٠] واتە: ((خودا چاکەی زۆری فێرکردوین، وە هەندێك زانست هەیە تەنها خودا دەیزانێت و [کەسی تر نایزانێت] پێنج لەوانەی تەنها خودا دەیزانێت قیامەت کەی پێش دێت وە کەی باران دەبارێت وە چی هەیە لە (ڕەحمی) ئافرەتی سکپڕدا وە هیچ کەس جگە لە خودا نازانێت بەیانی چی بەسەردێت وە لە چ زەویەك دەمرێت)).

وە عەبدوڵڵای کوڕی شوفەیر ﷺ دەفەرموێت: [کۆمەڵێك خەڵکی بەنی عامر هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و وتیان: ئێمە لە ڕێگادا وشتری وێل و بێ خاوەنمان دێتەڕێ؟ واتە: ئایا دروستە دەستی بەسەردا بگرین)) فەرمووی: ((ضَالَّةُ الْمُسْلِمِ حَرَقُ النَّارِ))[١١٢١] واتە: ((ونبووی موسوڵمانان سوتانی ئاگرە)).

### ٢- وەفدی بەنی سەعدی کوڕی بەکر:

هاتنی وەفدی بەنی سەعد لە ساڵی نۆی کۆچیدا وەکو ئیبنو حەجەر ﷺ دەڵێت: وادیارە ئەوان دووجار هاتونەتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ عەبدوڵڵای کوڕی وافیدی سەعدی ﷺ دەگێڕێتەوە: کە خۆی و هەندێك لە هاوەڵانی بە وەفد چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و دەفەرموێت: [من لەگەڵ وەفدەکەی بەنی سەعد چوینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و [هەر کەسێکیان داوایەکیان هەبوو] [منیش لە هەموویان کەم تەمەنتربووم][١١٢٢] ئەوان بە منیان وت: تۆ بمێنەرەوە لای وشترەکانمان

(١١٢٠) أخرجه: البخاري (الأدب) (١٠٨٤)، وابوداود (٥١٧٧)، وأحمد (٢٣١٢٧) وقال محققوه: صحيح لغيره، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٨١٨) و(صحيح الادب المفرد) (٨٢٦).

(١١٢١) أخرجه: أحمد (٢٥/٤)، والنسائي (٣٦٠/٤)، وابن ماجة (٢٥٠٢)، وابن حبان (٤٨٨٨) وقال محققه: اسناده على شرط البخاري، وصححه: الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٦٢٠)

(١١٢٢) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٤٤٢/١٧)، و الحاكم (٣٢٧/٤) وصححه ووافقه الذهبي.

[ومنیان لەلایان بەجێ هێشت] هەموو چوونە خزمەتی و پێداویستیەکانی بۆ جێبەجێ کردن [دواجار فەرمووی: ((کەسی ترتان ماوە نەهاتبێتە لام؟)) وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ][١١٢٣] [گەنجێکمان ماوە لای وشترەکانمان بە جێمان هێشتووە. فەرمووی: ((بنێرن بە دوایدا)) [و منیش دواهەمین کەس بووم کە چوومە خزمەتی] و پێغەمبەری خوا ﷺ پێشوازی لێکردم و فەرمووی: (([إِنَّ الْيَدَ الْمُنْطِيَةُ هِيَ الْعُلْيَا، وَإِنَّ السَّائِلَةَ هِيَ السُّفْلَى، وَمَا اسْتَغْنَيْتَ فَلَا تَسْأَلْ][١١٢٤] [وَأَنَّ اللهَ هُوَ الْمَسْئُولُ وَالْمُنْطِي][١١٢٥] فَكَلَّمْنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ بِلُغَتِنَا))واتە: ((دەستی بەخشندە دەستی بڵندە دەستی وەرگر نزم ترین دەستە وەگەر پێویستی ناچارت نەکات هەرگیز داوا لە کەس نەکەیت] [وە تەنها داوا لە خودا دەکرێت و هەر تەنها ئەویش دەبەخشێت)) بەو جۆرە پێغەمبەری خوا ﷺ بەزمانی ئێمە دەدوا] [منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی پرسیارێکم بدەرەوە، فەرمووی: ((پرسیارو پێویستیەکەت چییە؟))][١١٢٦] وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەی ڕەووکۆچ کۆتایی پێدێت؟][١١٢٧] [چونکە من بە پیاوانێك گەیشتم کە دەیان وت: کۆچکردن لە پێناوی خودا کۆتایی پێ هاتووە؟][١١٢٨] [پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((پێویستی تۆ لە هەموویان باشترە][١١٢٩] کۆچکردن لە پێناوی خودا بەردەوام دەبێت هەتا جەنگی بێ باوەڕان بەردەوام بێت))][١١٣٠].

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: [بەنی سەعد پیاوێکیان بە وەفد ناردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی زەمامی کوڕی سەعلەبە بوو [ئەو هۆزە پێشتر ببوونە دایانگاکاری پێغەمبەری خوا ﷺ لەمناڵیدا][١١٣١]. زەمام هاتە مەدینە و وشترەکەی لە بەردەم مزگەوتدا پاڵخست و پاشان چووە ناو مزگەوت و پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١١٢٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٤٤٧/١٧).

(١١٢٤) أخرجه: عبدالرزاق (٢٠٠٥٥)، البزار (٩١٦)، الطبراني (الكبير) (٤٤٢/١٧)، والحاكم (٣٢٧/٤) وصححه ووافقه الذهبي.

(١١٢٥) أخرجه: عبدالرزاق (٢٠٠٥٥)، البزار (٩١٦)، الطبراني (الكبير) (٤٤٢/١٧)، والحاكم (٣٢٧/٤) وصححه ووافقه الذهبي.

(١١٢٦) أخرجه: الطحاوي (مشكل الاثار) (٢٦٣٢) وقال محققه: اسناده على شرط البخاري.

(١١٢٧) أخرجه: النسائي (٤١٧٣)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٨٨٩).

(١١٢٨) أخرجه: النسائي (٤١٧٢) وصححه السيخ الألباني في (صحيح النسائي) (٣٨٩٠).

(١١٢٩) أخرجه: الطحاوي (مشكل الاثار) (٢٦٣١) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١١٣٠) أخرجه: أحمد (٢٢٣٢٤) وقال محققوه: حديث صحيح، والبخاري (التاريخ الكبير) (٢٧/٥)، البيهقي (١٧/٩)، النسائي (الكبرى) (٨٧٠٧).

(١١٣١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨١٥١).

لەوێدا لای هاوەڵان دانیشتبوو زەمامیش پیاوێکی کەتە و توکن و خاوەن دوو پلکە قژی درێژ بوو. ڕۆیشتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ [لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو هاوەڵان دانیشتبوو][1132]. زەمام وتی: کوا کینانە کوڕی عەبدولموتەلیبە [وتیان: ئەو پیاوە سپی پێستە کە پاڵی داوە بەو دیوارەوە] [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((منم کوڕەکەی عەبدوموتەلیب)) وتی: تۆ موحەممەدیت؟ فەرمووی: بەڵێ [وەڵامم دایەوە])) وتی: السلام علیکم ئەی کوڕەکەی عەبدولموتەلیب. پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((وعلیکم السلام)) وتی: من یەکێکم لە خاڵۆیانت لە هۆزی بەنی سەعدی کوڕی بەکر وە من نێرراوی ئەوانم بۆ لای تۆ][1133]. ئەی کوڕەکەی عەبدولموتەلیب من پرسیارت لێدەکەم من زبر و توندم لە پرسیار کردندا وە لێم دڵگران و زویر مەبە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لێت زویر نابم چ پرسیارێکت هەیە بیکە)) [وتی: ئەی کوڕەکەی عەبدولموتەلیب نێردراوەکەت هاتە لامان و دەیوت: خودا تۆی ناردووە، فەرمووی: ((ڕاست دەکات)) وتی: کێ ئاسمانی دروستکردووە؟ فەرمووی: ((الله)) وتی: کێ زەوی دروستکردووە؟ فەرمووی: ((الله)) کێ ئەم چیایانەی دروستکردووە بە هەموو ئەوانەی کە تێیدایەتی؟ فەرمووی: ((الله))][1134] [وتی: کێ تۆی دروستکردووە و ئەوانەی لە پێشتر بوون و ئەوانەی لە دواتر دێن؟ فەرمووی: ((الله))][1135]. وتی: تکات لێدەکەم بەو خودایەی [کە ئاسمان و زەوی و چیاکانی داناوە][1136] کە خودای تۆیە وە خودای ئەوانەی پێش تۆ و وە خودای ئەوانەش پێش تۆ هەبوون و ئەوانەش کە دواتر دێن [ئایا خودا تۆی ناردووە بۆلای هەموو خەڵکی][1137].

فەرمووی: ((بەڵێ خوا ئاگای لێیە ئەوە ڕاستە)). وتی: تکات لێدەکەم بەو زاتەی کە خودای تۆیە و ئەوانەی لە پێش تۆ بوون و ئەوانەی لە دوای تۆ دێن ئایا خودا فەرمانی پێ کردوویت کە تەنها خودا بپەرستیت و هاوتای بۆ بڕیار نەدەیت و

(١١٣٢) أخرجه: البخاري (١٢،٦٣).

(١١٣٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨١٥١) وفي (الأوسط) (٢٧٠٧)، والدارمي (٦٧٧) وقال محققه: حديث صحح، وابن أبي شيبة (الايمان) (٤) وقال محققه:حديث صحيح.

(١١٣٤) أخرجه: مسلم (١٢).

(١١٣٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨١٥١) وفي (الأوسط) (٢٧٠٧). وهوصحيح.

(١١٣٦) أخرجه: مسلم (١٢).

(١١٣٧) أخرجه: البخاري (١٢، ٦٣).

خۆمان بە دوور بگرین لەو بتانەی باوباپیرانمان دەیان پەرستن لەگەڵ خودادا؟ فەرمووی: ((بەڵێ خودا ئاگای لێیە ئەوە ڕاستە)) وتی: تکات لێدەکەم بەو زاتەی کە خودای تۆیە و ئەوانەی پێش تۆ هەبوون و ئەوانەی دوای تۆش دێن ئایا خوای گەورە فەرمانی پێ کردوویت [لە شەو ڕۆژێکدا] ئەو پێنج نوێژە ئەنجام بدەیت؟ فەرمووی: ((بەڵێ خودا ئاگای لێیە هەروەهایە)) ئینجا وتی: تکات لێدەکەم بەو زاتەی کە خودای تۆیە و ئەوانەی پێش تۆ هەبوون و ئەوانەی دوای تۆش دێن ئایا خوای گەورە فەرمانی پێ کردویت ئەو زەکاتە لە دەوڵەمەندەکانمان وەربگرین و بەسەر هەژارەکانماندا دابەشی بکەین؟ فەرمووی: ((بەڵێ خودا ئاگای لێیە ئەوە ڕاستە))(١١٣٨). پاشان هەموو فەرزەکان و پێویستیەکانی ئیسلامی لا باسکرد سوێندی لەسەر هەمووی دا وەك ئەوانەی پێشتر [پاشان هەموو قەدەغەکراوەکانی فێرکرا](١١٣٩) لە دوای تەواو بوونی پرسیارەکانی ئینجا وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ) وە وتی: [من هەموو ئەوانە بەڕاست دەزانم و بڕوام پێیانە](١١٤٠) هەموو ئەو فەرزانەش جێبەجێ دەکەم وە دوور دەکەومەوە لە هەموو ئەوانەی کە تۆ داوات لێکردووم من خۆمیان لێ بەدوور بگرم [و لەوانە زیاتر و کەمتر ناکەم] [سوێند بەو زاتەی کە تۆی بەڕاست ناردووە هەموو ئەوانە دەگەیەنمە ئەوانەی گوێ ڕایەڵیم دەکەن لە خزمەکانمدا](١١٤١) [وە منیش ناوم زیمامی کوڕی سەعلەبەی بەنی سەعدی کوڕی بەنی بەکرە](١١٤٢) پاشان چوو سواری وشترەکەی بوو گەڕایەوە [پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی تا دانە خرێکانی دەرکەوت](١١٤٣) و فەرمووی: ((ئەو خاوەن دوو پرچە گەر ڕاست بکات دەچێتە بەهەشتەوە)).

زیمام گەڕایەوە ناو هۆزەکەی و هەموو لێی کۆبوونەوە، یەکەم قسەو گفتوگۆی ئەوە بوو وتی: لات و عوزا ڕسوابێت. ئەوانیش وتیان: بەسە زیمام گەڕ دەبیت شێت

---

(١١٣٨) أخرجه: البخاري (١٢، ٦٣).

(١١٣٩) أخرجه: أحمد (٢٢٥٤)، وقال محققه: حديث حسن.

(١١٤٠) أخرجه: النسائي (٢٠٩٤).

(١١٤١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨١٥١) وفي (الأوسط) (٢٧٠٧).

(١١٤٢) أخرجه: البخاري (١٢، ٦٣).

(١١٤٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨١٥١) وفي (الاوسط) (٢٧٠٧) و ابن أبي شيبة (الايمان (٤) وقال محققه: حديث صحيح، والدارمي (٦٧٧) وقال محققه: حديث صحيح.

دەبێت گول دەبێت. ئەویش وتی: هاوار لە ئێوە سوێند بەخوا ئەو دووانە نەسوودیان هەیە و نەزیان. خوای گەورە پێغەمبەرێکی ناردووە و کتێبێکی بۆ دابەزاندووە تا ئێوەی پێ ڕزگار بکات لەو گورمڕاییەی کە تیایدان. من شایەتی دەدەم کە هیچ خودایەك نییە جگە لە ((الله)) و تاك وتەنهایە و هاوتای نییە و موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە. منیش لەلایەن ئەوەوە هاتوومەتە لاتان وە فەرمان و قەدەغراوەکانتان پێ ڕادەگەیەنم... دەڵێت: سوێند بەخوا ئێوارەیان بەسەردا نەهات هەموو پیاو و ئافرەتێکی هۆزەکەی موسوڵمان بوون.

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: تا ئیستا نەمان بیستوە وەفد و نوێنەری قەومێك باشتربووبێت لە زیمامی کوڕی سەعلەبە][١١٤٤].

**٤- هاتنی وەفدی هۆزی عەبدولقەیس:**

ئەو هۆزە نیشتەجێی ناوچەکانی بەحرەین بوون، دوو جار هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ جارێکیان ساڵی پێنجی کۆچی و دواتریش ساڵی وەفدەکان. هاتنی یەکەم جاریان بۆ مەبەستی موسوڵمان بوون و فێربوونی ئیسلام بوو، ژمارەیان سیانزە پیاو بوون[١١٤٥]، ئەوان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشحاڵبوو بە هاتنیان و ڕێزی لێگرتن و ئاینی فێرکردن.

ئەم باسەش لە چەندەها فەرموودەدا هاتووە لەوانە:

عەسری لە باپیریەوە ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو هاوەڵاندا دانیشتبوولە ناکاو پێی فەرموون: ((ئالەم لایەوە چەند وشتر سوارێك دێنە لاتان ئەوان چاکترین خەڵکی ڕۆژهەڵاتن)) عومەری کوڕی خەتابیش ﷺ بەرەو ئەولایە ڕۆیشت و سیانزە وشتر سوارەکەی پێ گەیشت پێشوازی لێکردن و وتی: ئێوە کێن؟ وتیان: خەڵکێکین لە هۆزی عەبدلقیس وتی: ئایا ئێوە بۆ بازرگانی هاتوونەتە ئەم ناوە؟ وتیان: نەخێر. وتی: کەواتە هاتوون بۆ لای ئەو پیاوە؟ وتیان:

---

(١١٤٤) أخرجه: أحمد (٢٣٨٠) وقال محققوه: حديث حسن، و الدارمي (٦٧٨) وقال محققه: الحديث صحيح، وابن حبان (١٥٥) وقال محققه: اسناده صحيح، ابن هيشام (السيرة) (١٨٥/٤) (١١٥): اسناده حسن، وصححه ايضاً مخفف، (دلائل النبوة) (٢١٠٢).

(١١٤٥) أخرجه: الحافظ (الفتح) (١٣١/١): وكانوا (١٣) رجلا من الرؤساء الراكبين و (٣٧) مشاة و كانوا بجواثي البحرين.

بەڵێ [وتی: کەمێك پێش ئێستا پێغەمبەری خوا ﷺ بە باشە باسی کردن][١١٤٦] ئینجا عومەر ﷺ لەگەڵیاندا گەڕایەوە و قسەی لەگەڵ دەکردن تا نزیك بوونە وە پێی وتن: ئەوە ئەو پیاوەیە کە ئێوە بۆلای هاتوون، ئەوانیش هەموو لە وشترەکان خۆیان هەڵدایە خوارەوە وە هەندێکیان بە پیاسە و هەندێکیان بە هەڵە داوان و هەندێکیان بە ڕاکردن چوون و خۆیان گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ [دەستیان ماچ کرد] و لە خزمەتیدا دانیشتن. [پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرموو: ((مَرْحَبًا بِالْوَفْدِ [أَوْ بِالقَومِ] غَيْرِ الْخَزَايَا وَلَا النَّدَامَى) واتە: ((مەرحەباو پێشوازی لە وەفدی ئەو قەومەی کە سەرشۆڕو پەشیمان نین))][١١٤٧].

پیاوێکیان ناوی (ئەشەج) بوو لە هەموویان بچوکتربوو پەلەی نەکرد [وشتری خۆی و هاوەڵانی هەموو برد و پشووی دان و بەستنیەیەوە][١١٤٨] وە کەل و پەلی هاوەڵانی هەموو لە جێگەیەك کۆکردەوە [وە لە تۆشەبەرەکەیدا دوو جلی سپی دەرهێناو لەبەری کردن][١١٤٩] وە چەکەکەی داناو هەندێك ڕۆنی لەڕیشی دا][١١٥٠] [وە پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای دەکرد] پاشان لەسەر خۆهات تاگەیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ [وسلاوی لێکرد][١١٥١] وە دەستی گرت و ماچی کرد [پێغەمبەریش پێی فەرموو: ((ئەشەج ئەلێرە دانیشە)) ئەویش لای ڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت. پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ پێشوازی لێکرد و بەنەرمی لەگەڵی دوا و پرسیاری ناوچەکەیانی لێدەکرد ناوی لادێکانی یەك بەیەك دەهێنا][١١٥٢] پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەشەجی فەرموو: (([إِنَّ] فِيكَ خَصْلَتَانِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ)) واتە: ((تۆ دوو ڕەوشتت تێدایە کە خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێت)) وتی: ئەو دوانە چین ئەی پێغەمبەری خوا

---

(١١٤٦) أخرجه: البخاري (خلق أفعال العباد) (٦٠/١)، و الطبراني (الكبير) (٣٤٥/٢٠)، و البيهقي (الدلائل) (برقم:٢٠٥٨) وقال محققه: اسناده حسن.

(١١٤٧) أخرجه: البخاري (٦٠٦٨) و (٤١١٠)، ومسلم (١٧)، وابن حبان (٧٢٩٥).

(١١٤٨) أخرجه: أبو يعلى (٦٨٤٩) وقال محققه: اسناده جيد.

(١١٤٩) أخرجه: أحمد (٢٤٠٠٩/٥٤) وقال محققوه: اسناده ضعيف، والبخاري (الأدب المفرد) (٧٥) وضعفة الشيخ الألباني في (ضعيف الأدب المفرد) (١٥٤).

(١١٥٠) أخرجه: اسحاق بن راهوية كما في (الاصابة) (١٨٦٥٤/٣).

(١١٥١) أخرجه: ابو يعلى (٦٨٤٩) وقال محققه: اسناده جيّد.

(١١٥٢) أخرجه: أحمد (١٥٥٥٩) وقال محققوه: اسناده ضعيف، والبخاري (الادب المفرد) (١١١) وضعفه الشيخ الألباني في ضعيف) (الادب) (١٩٢).

ﷺ؟ فەرمووی: ((تورەنەبوون و پەلە نەکردنە))[١١٥٣].

لە گێڕانەوەیەکی تردا ((شەرم کردن و تورە نەبوونە))[١١٥٤]. وتی: ئەو دووانە ئایا خودا تیایدا دروست کردووم یان خۆم فێربووم؟ فەرمووی: ((خودا لە تۆدا دروستی کردووە)) وتی: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە ئەو دوو ڕەوشتەی پێ بەخشیوم کە خۆشەویستە لای خوداو پێغەمبەرەکەی. [ئینجا وەفدەکە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە لەناوچەیەکی دوورەوە دێینە لات هۆزە بێ باوەڕەکانی موزەر لە نێوان ئێمەو ئێوەدایە][١١٥٥] [ئێمە تەنها لە مانگە حەرام کراوەکاندا دەتوانین بێینە لاتان. بۆیە فرسەتە چەندەها کاری چاکەو [پاداشتمان فێربکە][١١٥٦] گەر ئێمە ئەنجامیان بدەین بە هۆیانەوە بچینە بەهەشت وە لە گەڕانەوەماندا خزمان و هۆزەکەمانی لێ ئاگاداربکەینەوە. فەرمووی: ((آمُرُكُمْ بِأَرْبَعٍ، وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ: الْإِيمَانُ بِاللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: وَهَلْ تَدْرُونَ مَا الْإِيمَانُ بِاللَّهِ؟ « قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ: [شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ]، وفي رواية [آمُرُكُمْ أَنْ تَعْبُدُوا اللَّهَ، وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً][١١٥٧] وَإِقَامُ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَصَوْمُ رَمَضَانَ، وَتُعْطُوا الْخُمُسَ مِنَ الْمَغَانِمِ، وَأَنْهَاكُمْ عَنِ النَّبِيذِ فِي الدُّبَّاءِ، وَالنَّقِيرِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالْمُزَفَّتِ[١١٥٨] [وَالْمَزَادَةِ الْمَجْبُوبَةِ][١١٥٩] [فَاحْفَظُوهُنَّ، وَادْعُوا إِلَيْهِنَّ مَنْ وَرَاءَكُمْ][١١٦٠])) واتە: ((داواتان لێدەکەم چوار شت ئەنجام بدەن و چوار شتی تریش خۆتانی لێ بەدوور بگرن. داواتان لێدەکەم باوەڕتان بە خودا هەبێت، ئایا دەزانن بڕوا بوون بە خودا چۆنە؟ وتیان: خوداو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانێت، فەرمووی: ((ئەوەیە کە شایەتی بدەیت کە خودا تاکو تەنهایە و [موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە] وە لە گێڕانەوەیەکدا: [فەرمانتان پێ دەکەم تەنها خودا بپەرستن و هیچ هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەن] وە نوێژ بکەن و زەکات بدەن و مانگی ڕەمەزان بەڕۆژووبن و پێنج یەکی دەست کەوتەکان ببەخشن. وە خۆتان بەدوور بگرن لە شەراب و خواردنەوەکانی ناو کولەکە گەورەکان وە قەدی خورما

(١١٥٣) أخرجه: مسلم (١٧).

(١١٥٤) أخرجه: أحمد (١٧٨٢٨) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(١١٥٥) أخرجه: مسلم (٢٣/١٧).

(١١٥٦) أخرجه: البخاري (٤٣٦٨).

(١١٥٧) أخرجه: ابن حبان (١٣٩١) (موارد)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الموارد) (١١٦٦).

(١١٥٨) أخرجه: ابن حبان (٧٢٩٥) وقال محققه: اسناده صحح على شرطهما وهو في الصحيحين.

(١١٥٩) أخرجه: ابوداود (٣٦٩٣) وهو صحيح.

(١١٦٠) أخرجه: البخاري (٤١١٠)، ومسلم (١٠٧)، والطيالسي (٢٨٧٠) وقال محققه: صحيح.

کون کراوەکان وە مەشکۆڵەکان و کوپەڵە قەپاتکراوەکان بە قیر [وە ناو پێستەی تێشە بەرە بڕاوەکان] (واتە: ئەوانە هەموو شەرابیان تێدا دروست دەکرا) [ئەوانە هەموو لە یاد نەکەن وەخزم و خەڵکەکانتانیان لێ ئاگاداربکەنەوە].

لە گێڕانەوەیەکی تردا [وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خودا بمانکاتە فیدات، کام لە خواردنەوەکان بۆ ئێمە شیاون؟ فەرمووی: ((لە قەدی خورما کون کراوەکان مەخۆنەوە)) وتیان: خودا بمان کاتە فیدات ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا دەزانیت ئەوە چییە؟ فەرمووی: ((بەڵێ قەدە خورمایەك دەهێنن و لە جێگەیەکەوە کونی دەکەن وە چەندەها جۆر خورما دەهێنن و تێی دەهاون و پاشماوەیەك لێی دەکەنەوە و ئاوی بەسەردا دەکەن و دەیکوڵێنن تا قوڵپە قوڵپی نامێنێت پاشان سارد بووەوە دەی هێنن و دەی خۆنەوە و [وسەرخۆشتان دەکات] تا واتان لێدەکات یەکێکتان بە شمشێر لە ئامۆزاکەی خۆی بدات)).

[لەوێدا یەکێکی ئەو وەفدە هەبوو کە بەو جۆرەی بەسەر هاتبوو دەڵێت: من جێگەی لێدانی شمشێرەکەم دەشاردەوە لە شەرمدا لە پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: ئەی لە چیدا بخۆینەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ][١١٦١] [فەرمووی: ((...بیخۆنەوە لە حەلاڵێکی سەر بەستراو][١١٦٢] [ئەویش ئەو مەشکانەیە کە سەرەکەی دەبەستن][١١٦٣] [فَإِنِ اشْتَدَّ فَاكْسِرُوهُ بِالْمَاءِ فَإِنْ أَعْيَاكُمْ فَأَهْرِيقُوهُ][١١٦٤] واتە: گەر خەست بووەوە ئێوە بە ئاو ڕونی بکەنەوە گەر نەشتان توانی بیڕێژن [خوای گەورە شەراب و قومار و تەپڵ... و هەموو سەر خۆشکەرێکی حەرام کردووە)][١١٦٥] [وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو زەویەی ئێمە لێی دەژین جرجی زۆرە و مەشکەکانمان دەخۆن. فەرمووی:

---

(١١٦١) أخرجه: مسلم (٢٨/١٧،١٨،٢٧).

(١١٦٢) أخرجه: أحمد (١٧٨٢٩) وقال محققوه: اسناده صحح، وابن حبان (٧٢٨٤) وقال محققه (حديث صحيح)، والطبراني (الكبير) (١٢٩٧٠)، والبزار (٢٨٢١) وقال الشيخ الألباني في (الصحيحة) (١٨٤٣) باسناده صحيح.

(١١٦٣) أخرجه: ابوداود (٣٦٩٤) وصححه الشيخ الألباني (صحيح أبي داود) (٢٤٢٤). أخرجه: ابوداود (٣٦٩٥) وصححه الشيخالأباني في (الصحيحة) (٢٤٢٥).

(١١٦٤) أخرجه: ابوداود (٣٦٩٥) وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢٤٢٥). أخرجه: ابوداود (٣٦٩٦) وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (١٨٠٦) و (صحيح الموارد) (١١٦٣).

(١١٦٥) أخرجه: ابوداود (٣٦٩٦) وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (١٨٠٦) و (صحيح الموارد) (١١٦٣).

((هەرچەندە جرجیش بیخوات... سێ جار دووبارەی کردەوە...][١١٦٦].

لە گێڕانەوەیەکدا: [یەکێك لە ئێمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ کولەکە گەورەکان... و کۆپەڵە بە قیر داخراوەکان چۆن دەزانیت؟ فەرمووی: ((ئایا من نازانم ئەوانە چین ئایا کام جێگە لە ناوچەی (هەجەر) قایم و تۆکمەترە؟)) وتمان: قەڵای (موشەقەر) فەرمووی: ((سوێند بە خوا چوومەتە ناویەوە و دەسکی دەرگاکەیم بە دەست گرتووە... و لای کانیاوی (زارەش) وەستاوم))][١١٦٧].

لە گێڕانەوەیەکی (لاواز)دا هاتووە: [پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی دێ بە دێی ئەوناوە و سەفاو موشەقیر و هەموو ناوچەکانی تری هەجەری بە ئەشەج وت، ئەویش وتی: بە دایکم و باوکمەوە بە قوربانتبم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ لەئێمە باشتر ئەو ناوانە دەزانیت. فەرمووی: ((من هاتوومەتە ناوچەکەتان و بوارم پێ دراوە)) پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەنساریەکانی فەرموو: ((يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ، أَكْرِمُوا إِخْوَانَكُمْ، فَإِنَّهُمْ أَشْبَاهُكُمْ فِي الْإِسْلَامِ أَشْبَهُ شَيْءٍ بِكُمْ أَشْعَارًا، وَأَبْشَارًا أَسْلَمُوا طَائِعِينَ غَيْرَ مُكْرَهِينَ، وَلَا مَوْتُورِينَ إِذْ أَبَى قَوْمٌ أَنْ يُسْلِمُوا حَتَّى قُتِلُوا)) واتە: ((ئەی کۆمەڵانی ئەنصار ڕێز لەم برایانەتان بگرن ئەوان لە ئیسلام بووندا لە ئێوە دەچن وە لە ڕەنگ و پێستتدا لە ئێوە دەچن. خەڵکیتر تا لێیان نەکوژرێت موسوڵمان نابن بەڵام ئەمان بەبێ ئەوەی لێیان بکوژرێت و زۆریان لێبکرێت بەئارەزووی خۆیان هاتوون موسوڵمان بوون]. لە ڕۆژی دواتردا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لایان و پێی فەرموون: ((ڕێز و میوانداری براکانتان بۆ ئێوە چۆن بوو؟)) وتیان: ئەوان باشترین برا بوون بۆ ئێمە ڕاخەر و پێخەفی نەرمیان بۆ دابین کردین و نان و خۆراکی باشیان پێشکەش کردین و لە شەویشدا کتێبەکەی خودا و سونەتەکانی پێغەمبەرەکەیان فێردەکردین.

پێغەمبەری خوا ﷺ سەرسامبوو دڵخۆشبوو [بەو هەواڵە و ئینجا یەکە بە یەکەمان پرسیاری لێدەکردین چی فێربووین، هەندێکمان تەحیات و فاتیحە و سورەتێك یان دوو سورەت و سونەتەکانی تر فێرببووین، پاشان ڕووی تێکردین و فەرمووی: ((هَلْ

---

(١١٦٦) أخرجه: مسلم (١٧، ٢٧، ٢٨).

(١١٦٧) أخرجه: أحمد (١٧٨٣٩) وقال محققوه: اسناده صحيح، وابن حبان (٧٢٩٤) وقال محققه: اسناده صحيح، والطبراني (الكبير) (١٢٧٠)، و البزار (٢٨٢١) وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٨٤٣).

مَعَكُمْ مِنْ أَزْوَادِكُمْ شَيْءٌ؟)) واتە: ((ئایا هەندێك لە خورماکانی لای خۆتان پێماوە؟)) ئێمەش دڵخۆشبووین و هەر یەکەمان ڕۆیشتین هەندێك خورمامان هێنا لە سەر پارچە پێستێك دامان نا. پێغەمبەری خوا ﷺ پەلە خورمایەکی بەدەستەوە بوو لە گەز درێژتر بوو بەوە هەندێك لە خورماکەی بۆ دیاری کردین و فەرمووی: ((ئایا ئەو جۆرە پێی دەڵێن: تەعزوز؟)) وتمان بەڵێ، پاشان بە هەندێکی تری فەرموو: ((ئایا بەو جۆرەش دەڵێن سەرفان)) وتمان: بەڵێ. پاشان بە هەندێکی تری فەرموو: ((ئایا بەو جۆرەش دەڵێن بەرنی؟)) وتمان: بەڵێ. فەرمووی: ((ئەوەیان باشترین جۆری خورماتانە و بەسودترین یانە بۆتان))][١١٦٨].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: [...ئینجا ئەو وەفدە کە هەندێك خورمای خۆیان پێبوو دەیانخواردو پێغەمبەری خوا ﷺ یەك بە یەك ناوەکانی پێ دەوتن. ئەوانیش وتیان: بەڵێ ئێمە لە تۆ باشتر ناوەکانی نازانین؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) ئەوانیش بە یەکێك لە پیاوەکانی خۆیانیان وت: هەندێك لەو خورمایانەمان بدەرێ کە لە تێشوە بەرەکەتدا ماوە. ئەویش هەستا و هەندێك خورمای بەرنی لەگەڵ خۆی هێنا و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەم جۆرەیان بەرنیە و باشترین جۆرە لە خورماکانتان و دەرمانەو هیچ دەردێکی تێدا نییە))[١١٦٩] [ئینجا ئێمەش تورەکەیەك یان گۆزەیەك خورمای تعزوز یان بەرنیمان پێ بەخشی. فەرمووی: ((ئەوە چییە؟)) وتمان: دیاریە. گرتی و تەماشای خورماکەی کرد و گەڕاندیەوە جێگەی خۆی و فەرمووی: ((خودایە خۆشبە لە هۆزی عەبدولقەیس ئەوان پێش ئەوەی لێیان بکوژرێت و سەرشۆڕ بکرێن خۆیان ئازادانە و بێ زۆرلێکردن هاتن و موسوڵمان بوون لە کاتێکدا هەندێك لە خزمانمان تا لێیان نەکوژرێت و سەرشۆڕ نەکرێن نایەن موسوڵمان ببن)) دواتریش ڕووی کردە قیبلە و پاڕایەوە و فەرمووی: ((إِنَّ خَيْرَ أَهْلِ الْمَشْرِقِ عَبْدُ الْقَيْسِ؛ [أَسْلَمَ النَّاسُ كَرْهًا وَأَسْلَمُوا طَائِعِينَ))][١١٧٠] واتە: ((چاکترینی خەڵکی

---

(١١٦٨) أخرجه: البخاري (الأدب المفرد) (١١٩٨)، وأحمد (١٥٥٥٩) وقال محققوه: اسناده ضعيف، وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الأدب المفرد) (١٩٢)، و (ضعيف الترغيب) (١٥٤١) له شواهد في أحادث صحيحة.

(١١٦٩) أخرج: أبو يعلى (٦٨٥٠) وقال محققه: اسناده حسن، والطبراني (الكبير) (١٨١٢/٢٠) وحسن اسناده الشيخ الألباني في (الصحيحة) تحت الحديث (رقم:١٨٤٤).

(١١٧٠) أخرجه: (١٧٨٢٩) وقال محققه: اسناده صحيح، وفي (الفضائل) (١٥١٤) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن حبان (٧٢٩٤) وقال محققه: صحيح، و الطبراني (الكبير) (١٢٩٧٠)، و البزار (٢٨٢١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح

ڕۆژهەڵات عەبدولقەیسن [خەڵك بە زۆر موسوڵمان دەبوون ئەمانیش بێ زۆر لێکردن موسوڵمان بوون])). هاتنی وەفدی هۆزی عەبدولقەیسیش (دووەم جار) لە ساڵی نۆی کۆچیدابوو وە ژمارەیان چل کەس دەبوو: ئەبو خەیرەی سەباحی ﷺ دەفەرموێت: [من لەو وەفدەدا بەشداربووم کە چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ژمارەمان چل پیاو بوو](1171).

ئەم جارەیان ورگیان گەورە ببوو وە ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕابوو کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەوجۆرە ئەوانی بینی فەرمووی: [((ئەی هۆزی عەبدولقەیس بۆ دەبینم ڕەنگتان ئاوها گۆڕاوە؟)) لە گێڕانەوەیەکی تردا: ((بۆچی ڕەنگتان ئاوها زەرد هەڵگەڕاوە ورگتان ئاوساوە و دەمارەکانتان دەرکەوتووە؟)) وتیان: سەرۆك و گەورەکەمان پێشتر هاتە لات و پرسیاری خواردنەوەیەکی لێکردبوویت کە بۆ ئێمە زۆر گونجاوبوو تۆش لێت قەدەغە کردبوو](1172) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە لە ناوچەیەکدا دەژین نەخۆشی تێدا باوە [وە تەنها ئەو خواردنەوانە بۆ ئێمە باشە](1173) ئەوە گۆشتی زیادە لە سکماندا ناهێڵێت [و هەرکات ئێمە ئەوە نەخۆینەوە ئاوها ورگمان دەئاوسێت و ڕەنگمان دەگۆڕێت](1174) وە کاتێکیش لێت قەدەغە کردین ئەوەتا ڕەنگ و ڕوومان دەبینی چی لێهاتووە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((إنَّ الظُّروفَ أو مَابكفية؟ فَقالَ: ((يا أَشَجّ إِنِّي إِنَ رَفَعَتَ لَكَ فِي مِثلِ هِذهِ لَا تَحِلُّ وَلَا تُحَرِّمُ وَلَكِنْ كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ [ولْيَشرَبْ أحدُكم على سِقاءٍ يُلاثُ على فيهِ])) واتە: ((ئەوانەی تێیدا دروستدەکرێن هیچ شتێك حەڵاڵ ناکەن و حەرام ناکەن بەڵام هەموو سەرخۆشکەرێك حەرام و قەدەغەیە [با یەکێك لە ئێوە خورماکەی بکاتە مەشکەکەیەوە و سەری ببەستێت و شەربەتاوێکی پاك و شیرین بخواتەوە](1175).

---

الجامع (٣٣٠٢) و الصحيحة (١٨٤٣).

(١١٧١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٩٢٣،٩٢٤/٢٢)، وابن سعد (٨٧/٧)، و البخاري (الكنى) (٢٨)، ابن أبي عاصم (الأحاد) (١٦٢٥)، وابو نعيم (الصحابة) (٦٧٦٥).

(١١٧٢) أخرجه: ابن أبي شيبة (المصنف) (٢٤٣٦٨) وقال محققه: اسناده حسن، و الطبراني (الكبير) (٨٢٥٦/٨).

(١١٧٣) أخرجه: ابن أبي شيبة (المصنف) (٢٤٢٦٠) وقال محققه: اسناده حسن، والطبراني (الكبير) (١٢٢/١٧)، وابن أبي حاتم (الآحاد) (١٦٥٧)، وأبويعلى (٦٨٥١) وقال محققه: اسناده ضعيف، وقال الحافظ (الأصابة) (٦٠٢٥): اسناده حسن.

(١١٧٤) أخرجه: أحمد (١٥٥٥٩) وقال محققوه: اسناده ضعيف، وضعفه الشيخ الألباني (ضعيف الترغيب) (١٥٤١) و (ضعيف الأدب المفرد) (١٩٢).

(١١٧٥) أخرجه: ابن حبان (١٣٩٢) (موارد)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الموارد) (١١٦٧).

[ئەشەج وتی: بە دایك و باوکمەوە بە فیداتبم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەندازەی هەردوو مشتت لەوە ڕێگەمان پێ بدە؟ فەرمووی: ((ئەی ئەشەج ئەگەر من بە ئەندازەی هەردوو لەپی دەستت ڕێگەت بدەم تۆش بە ئەندازەی ئەوەندە (هەردوو دەستی زۆر بڵاو کردەوە) دەیخۆیتەوە](١١٧٦) نەك بەو جۆرەش دادەنیشن و دەیخۆنەوە تا دەمارەکانتان سڕ دەبێت و سەرخۆش دەبن و شانازی بەسەریەکدا دەکەن لە ئەنجامدا پیاوێك پەلاماری ئامۆزاکەی خۆی بەشمشیر دەدات و شەلی دەکات [تا دوا ڕۆژی ژیانی](١١٧٧) ئەوان هەموو پێکەنین. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەچی پێ دەکەنن؟)) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بە وەی تۆی ناردووە بەڕاستی [جارێکیان] خواردمانەوە... و لەئەنجامدا کردمانە شەڕ لەگەڵ یەکتردا وە یەکێکمان شمشێرێکی لەوەی درداو تا ئێستا بەهۆیەوە هەر شەلە...](١١٧٨).

لەم وەفدەدا پیاوێکی گاوریان لەگەڵ بوو کەناوی (جاردوی کوڕی بەشیر) بوو بەسەر هاتەکەی لای ئیبنو ئیسحاق ﷺ هاتووە بەسەنەدێکی (لاواز) دەڵێت: [کاتێك جاردو گەیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و قسەی لەگەڵ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ ئیسلامی پێ ڕاگەیاندو بانگی کرد تا موسوڵمان ببێت. ئەویش وتی: ئەی موحەممەد من لەسەر ئاینێك بووم بەڵام من واز لە ئاینەکەم دەهێنم و دێمە ناو ئاینەکەی تۆ ئایا بەڵێنم پێ دەدەیت [خودا لە ڕۆژی دواییدا سزام نەدات؟] پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ من بەڵێنت پێ دەدەم خوا ڕێنوینی کردوویت بۆ ئاینێکی باشتر)) ئەویش موسوڵمان بوو لەگەڵ هاوەڵەکانیدا، پاشان داوای وشتری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد تا سواری پشتی بێت و پێی بگەڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەخودا ئێستا هیچم لا نییە)). ئینجا پرسیاری کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان ئێرە و خاکی وڵاتی ئێمەدا چەندەها وشتری بەرەڵاو وون بوو

---

(١١٧٦) أخرجه: أحمد (١٥٥٥٩) وقال محققوه: اسناده ضعيف وهذه القطعة من الحديث أوردها: ابن حبان (١٣٩٢) (موارد) (وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الموارد) (١١٦٧).

(١١٧٧) أخرجه: أبو يعلى (٦٨٤٩) وقال محققه: اسناده جيد، وابن حبان (٧٢٠٣) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الموارد) (١١٦٨)، و(المشكاة) (٥٠٥٤).

(١١٧٨) أخرجه: البخاري (التأريخ) (١٨١)، وابن أبي شيبة (المصنف) (٢٤٢٦٠) وقال محققه: اسناده حسن، و الطبراني (الكبير) (١١٢٢/١٧) و أبويعلى (٦٨٥١) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابن أبي عاصم (الأحاد) (١٦٥٧) وحسن اسناده الحافظ في (الأصابة (٣٠/٣) (رقم: ٦٠٢٥).

دێتە ڕێگەمان، ئایا دروستە بیان گرین و سواری پشتیان ببین تا پێی دەگەڕێینەوە وڵاتەکەمان؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نەخێر خۆتی لێ بەدوور بگرە ئەو کارە (سوتان بە ئاگری لە دوایە) لە گێڕانەوەیەکی تردا: (([ضَالَّةُ الْمُسْلِمِ حَرَقُ النَّارِ فَلَا تَقْرَبَنَّهَا))](١١٧٩) واتە: [دۆزراوەی موسوڵمانان (سوتان بە ئاگری لە دوایە) لێی نزیك مەبەرەوە] پاشان جارود گەڕایەوە خاکی وڵاتەکەی خۆی وە زۆر دامەزراو بوو لە سەر ئیسلام تا وەفاتی کرد.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەڵێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ عەلائی کوڕی حەزرەمی پێش ئازادکردنی مەککە ناردبووە لای مونزیری کوڕی ساوای گەورەی بەحرەین ئەویش زۆر بە باشی موسوڵمان ببوو](١١٨٠). هەر لەو وەفدەشدا پیاوێکیان لەگەڵ بوو جنۆکەی لەلاشەدابوو پاشان خوای گەورە شیفای دا. ئەویش لە فەرمودەیەکی (لاوازدا) هاتووە بۆ ئاگادار بوون دەیهێنین: ئەبو وازیع ﷺ دەڵێت: [وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خاڵۆیەکم لەگەڵدایە نەخۆشە و پەرکەمی لەگەڵدایە دوعای بۆ بکە، فەرمووی: ((لە کوێیە بیهێنەرە لام؟)) دەڵێت: منیش چووم دوو پۆشاکی باشم لەبەر کرد و هێنامە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و دوعای بۆ کرد و دەستی بەرزکردەوە تا ژێر باڵیمان بینی، پاشان لەسەر سنگی داو فەرمووی: ((أَخْرِجْ عَدُو اللهَ)) واتە: ((برۆ دەرەوە ئەی دوژمنی خودا)) ئیتر ئەو پیاوە ئەو ڕووەی گۆڕاو بووە ڕووی پیاوێکی لەشساغ و ئاسایی](١١٨١).

پێغەمبەری خوا ﷺ بەهۆی ئەو وەفدەوە دوو ڕکات نوێژە سونەتەکەی دوای نوێژی نیوەڕۆی بیرچوو لە دوای نوێژی عەسر کردیەوە. ئوم سەلەمە ﷺ دەفەرموێت: [لە دوای نوێژی عەسر پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەماڵەوە دوو ڕکات نوێژی کرد و لێم پرسی ئەویش فەرمووی: ((کەسانێکی هۆزی عەبدلقەیس بە نوێنەرایەتی قەومەکەی خۆیان هاتبوون وە سەرقاڵیان کردم لە دوو ڕکات نوێژەکەی دوای نوێژی نیوەڕۆ وە

(١١٧٩) أخرجه: أحمد (٨٠/٥)، و الترمذي (١٨٨١)، وابن ماجة (٢٥٠٢)، وابن حبان (٤٨٨٧)، والنسائي (٥٤/١)، وصحح اسناده الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٦٢٠) و (صحيح ابن ماجة) (٢٠٢٩).

(١١٨٠) أخرجه: ابن هيشام (السيرة (رقم: ١١١٧) وقال محققاه: اسناده ضعيف، و الطبري (التاريخ) (١٣٦/٣)، وابو يعلى (٩١٨) وقال محققه: رجاله رجال الصحيح، والبيهقي (الدلائل) (برقم (٢٠٦١) وقال محققه: حسن لغيره.

(١١٨١) أخرجه: أحمد (٢٤٠٠٩/٥٤) وقال محققوه: اسناده ضعيف، والبخاري (الأدب المفرد) (٩٧٥) والطبراني (الكبير) (٥٣١٣)، وابو داود (٥٢٢٥)، وقال المنذري (مختصر سنن أبي داود) (٥٠٦٢): حديث حسن، وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الأدب) (١٥٤).

ئەم دووانەش ئەو دوو ڕکات نوێژە بوو][١١٨٢].

وەفدەکە پێش گەڕانەوەیان پێغەمبەری خوا ﷺ بڕێك دارسیواکی ئاراکی پێدان و داوای لێکردن دەم و ددانیان پێ خاوێن بکەنەوە بەڵام فەرموودەکە (لاوازە)[١١٨٣]. لە گێڕانەوەیەکی (لاوازی) تردا هاتووە [کە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری وتار بێژی قەیسی کوڕی ساعیدی و وتەکانی لێکردووە][١١٨٤]. وە لە گێڕانەوەیەکی (لاواز)ی تردا هاتووە کە پاڕاوەتەوە و وتویەتی: ((خودایە بمانکەرە بەندە هەڵبژێردراوەکانی خۆت))[١١٨٥]. ئەو وەفدە گەڕانەوە وڵاتەکەی خۆیان و مزگەوتیان دروست کرد و نوێژی جەماعەتیشیان تێدا دەکرد. ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: [یەکەم نوێژی هەینی کرابێت لە دوای مزگەوتەکەی پێغەمبەر لە مزگەوتەکەی عەبدولقەیس بوو لە ناوچەی (جەواسی) لە بەحرەین][١١٨٦].

پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی بۆ مونزیری کوڕی ساوا گەورەی عەبدولقەیس نوسی ئەویش بڕوای هێنا و موسوڵمانێکی زۆر باشی لێ دەرچوو، وەڵامی نامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دایەوە. موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی بۆ مونزیری کوڕی ساوا نوسی و ئەمەش دەقەکەیەتی: ((مِنْ مُحمدِ النبيّ إلى مُنْذرِ بن ساوى، سِلْمٌ أَنْتَ ، فَإِنِّي أَحْمَدُ اللَّهَ إِلَيْكَ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ ، أَمَّا بَعْدُ فإنَّ كِتابَكَ جَاءَنِي وَسَمِعْتُ مَا فِيهِ فَمَنْ صَلى صَلاتُنا واسْتَقْبَلَ قِبَلَتنا وَأكلَ ذَبِيْحَتَنا فَذلِكَ المُسلم وَمنْ أَبِي ذَلِكِ فَعَلِيهِ الجزية))[١١٨٧] واتە: (لە موحەممەد پێغەمبەرەوە بۆ مونزیری کوڕی ساوا تۆ موسوڵمان ببە من لای تۆ سوپاسی خودای تاك و تەنها دەکەم دواتر: نامەکەتم پێگەیشت و هەموو ئەوەی تێیدا نوسرابوو بیستم، هەرکەسێك وەك ئێمە نوێژ

(١١٨٢) أخرجه: البخاري (٤٧٠)، ومسلم (٨٣٤)، وأبوداود (١٢٧)، وابن حبان (١٥٧٦).

(١١٨٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٩٢٣،٩٢٤/٢٢)، وابن سعد (٨٧/٧)، والبخاري (الكني) (٢٨)، وابن أبي عاصم (الأحاد) (١٦٢٥) وهد ضعيف كما في (أنيس الساري) (٢٨٢٥).

(١١٨٤) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٢٥٦١)، والبيهقي (الدلائل) (٤٣٢، ٤٣٣) وهو ضعيف كما في (اللالي الصنوعة) (١١٤/١)، و(الفوائد المجموعة) (٤٩٩).

(١١٨٥) أخرجه: أحمد (١٥٥٥٤،١٨٧٣٢) وقال محققوه: اسناده ضعيف.

(١١٨٦) أخرجه: البخاري (٤٣٧١).

(١١٨٧) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٣٢٤) وقال محققه: اسناده حسن، والسهيلي (الروض الانف) (٥١٩/٧)، وابن طولون (أعلام السائلين) (٦١،٦٣)، والبلاذري (فتوح البلدان) (ص:٨٩،٩١)، وابن سيد الناس (عيون الأثر) (٢٣٩/٢)، وابو عبيد) (الأموال) (ص:٢٨).

بکات و ڕووبکاتە ڕووگەو قیبلەمان وە لەسەربڕاوەکانمان بخوات ئەوە بە موسوڵمان دادەنرێت وە هەریەکێکیش ئەوانە ئەنجام نەدات دەبێت سەرانە بدات].

دواتر مونزیر سەرانەی ناوچەی بەحرەینی لەگەڵ ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح دا ناردە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ: عەمری کوڕی عەوف ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراحی ناردە ناوچەی بەحرەین و لەگەڵ خۆی سەرانەی ئەو ناوچەیەی گەیاندە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك ئەبو عوبەیدە ﷺ پارەکەی هێنا [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەمووی هەڵبڕێژن لە مزگەوت)) تا ئەو کاتە پارەی زۆری بەو جۆرە نەهاتبووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مزگەوت بۆ نوێژ و تەماشای نەکرد و ئاوڕی بەلادا نەدایەوە][١١٨٨].

ئەنصاریەکان ئەو هەواڵەیان زانی هەموو بۆ نوێژی بەیانی هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای تەواو بوونی نوێژەکە هەموو خۆیان نیشانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەدا، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەو جۆرە بینینی خەندە و بزە کەوتە سەر لێوی و پێی فەرموون: ((أَظُنُّكُمْ قَدْ سَمِعْتُمْ أَنَّ أَبَا عُبَيْدَةَ قَدْ جَاءَ بِشَيْءٍ؟)) واتە: ((وا دەزانم کە بیستوتانە ئەبو عوبەیدە شتێکی لەگەڵ خۆی هێناوە؟)) وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

فەرمووی: ((فَأَبْشِرُوا وَأَمِّلُوا مَا يَسُرُّكُمْ، فَوَاللَّهِ لاَ الفَقْرَ أَخْشَى عَلَيْكُمْ، وَلَكِنْ أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَنْ تُبْسَطَ عَلَيْكُمُ الدُّنْيَا كَمَا بُسِطَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَتَنَافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا وَتُهْلِكَكُمْ كَمَا أَهْلَكَتْهُمْ)) واتە: ((مژدە بێت و ئومێدی دڵخۆشبوونتان هەبێت سوێند بە خوا ناترسم ئێوە تووشی هەژاری ببن، بەڵکو دەترسم لەوەی کە دونیاتان بەڕوودا بکرێتەوە، وەك چۆن بەڕووی کەسانی پێش ئێوەدا کرایەوە دواتر ئێوەش وەکو ئەوان ململانێی یەکتری لەسەر بکەن و دواتر ببێتە هۆکاری لەناوچوونتان وەك چۆن بووە هۆکاری لەناوچوونی ئەوان)).

---

(١١٨٨) أخرجه: البخاري (٤٢١)، وكان المال (ثمانين ألفاً) كما في رواية: الحاكم (٣/٣٣٠) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي.

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لای پارەکە دانیشت هەرکەسێکی بەرچاو بکەوتایە بەشی دەدا. لەو کاتەدا عەباسی مامی هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەشم بدە چونکە [لە غەزای بەدر] من پارەی ئازاد بوونی خۆم و عەقیلی برازام دا، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((دەی ببە)). ئەویش پۆشاکەکەی دانا و بەمشت تێی دەکرد، پاشان ویستی بەرزی بکاتەوە و بیدات بە کۆڵیدا بەڵام نەی توانی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەکەسێ بڵێ تا یارمەتیم بدات، فەرمووی: ((نا)) وتی: دە خۆت یارمەتیم بدە؟ فەرمووی: ((نا)).

ئینجا هەندێکی لێ کەم کردەوە ویستی بەرزی بکاتەوە بەڵام هەر نەیتوانی.... ئینجا هەندێکی تری لێ کەم کردەوە و پاشان دای بەکۆڵیدا و هەڵی گرت و ڕۆیشت، بەردەوام پێغەمبەری خوا ﷺ بەدوایدا دەیڕوانی و تەماشای دەکرد تا لەبەرچاو نەما وەك سەرسامیەك بۆ سووربوونی لەسەر کۆکردنەوەی پارە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ هەڵنەستا تا هەمووی دابەشکرد[١١٨٩].

**٥- هاتنی وەفدی بەنی حەنیفە:**

وەفدی بەنی حەنیفە هاتن ژمارەیان زۆر بوو موسەیلەمەشیان لەگەڵدا بوو و چوونە ماڵی [بینتو حاریس] کە ماڵێك بوو ئامادەکرا بوو بۆ دەست بەسەر وە کرابووە جێی حەوانەوەی وەفدەکان. موسەیلەمە دەیویست پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری بکات لە پێغەمبەرایەتیەکەیدا وە ئەوەشی بەمەرجی موسوڵمان بوونی دانابوو. خوای گەورە پێغەمبەرەکەی لەوە ئاگادارکردەوە دواتر چوو قسەی لەگەڵ موسەیلەمەدا کرد و بە سزای خودا هەڕەشەی لێکرد.

ئیبنو عەباس ﵄ دەفەرموێت: [لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ موسەیلەمەی درۆزن هاتە مەدینە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و دەی وت: گەر موحەممەد من بکاتە جێنشینی لە دوای خۆی ئەو کاتە منیش شوێنی دەکەوم. ئەو لەگەڵ خزمانێکی زۆری خۆی هاتبووە شاری مەدینە و [لە خانوەکەی کچەکەی حارس] لایان دابوو. پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها خۆی و سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماسی (وتار بێژی)

(١١٨٩) أخرجه: البخاري (٤٢١،٣٥٨)، ومسلم (٢٩٦١)، النسائي (٥٤/١) وابن ماجة (٣٩٩٧).

لەگەڵدا بوو وە تووڵی دارخورمایەکی بەدەستەوە بوو هات و لای موسەیلەمە و هاوەڵانی وەستا [موسەیلەمە قسەی لەگەڵ دەکرد و وتی: گەر دەتەوێت دەبینە شوێن کەوتووت بەڵام لە دوای خۆت دەبێت بمانکەیتە جێنشینت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ ] فەرمووی: (([لَوْ] سَأَلْتَنِي وفي رواية [هَذِا القَضِيب] مَا أَعْطَيْتُكَهَا، وَلَنْ تَعْدُوَ أَمْرَ اللَّهِ فِيكَ، وَلَئِنْ أَدْبَرْتَ لَيَعْقِرَنَّكَ اللَّهُ، وَإِنِّي [لأحسبُكَ] الَّذِي أُرِيتُ فِيه مَا رَأَيْتُ وَهَذا ثَابْت بْن قَيْسٍ يُحبيبُك عَنِّي)) واتە: (([گەر] داوای ئەم [تووڵە دارەم لێ بکەیت] پێت نادەم، و تۆ ناتوانیت لە سایەو فەرمانی خودا دەربچیت، وە گەر پشت بکەیتە ئەم ئاینە خودا بە کوشتنت دەدات [وە من وادەزانم] تۆ بوویت ئەوەی لە خەوەکەمدا بینیم، وە ئەمەش سابتی کوڕی قەیسە وە لە جیاتی من وەڵامت دەداتەوە)).

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت. دواتر من پرسیارم لە ئەبو هورەیرە کرد دەربارەی خەوەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو بۆی گێڕامەوە وتی: [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە خەومدا بینیم [گەنجینەکانی زەویم پێ بەخشرا و دوو بازنی ئاڵتوون کرایە هەردوو دەستم منیش ئەوەم بەلاوە زۆرناخۆش و گەورە بوو] لە گێڕانەوەیەکی تردا [نیگام بۆ کرا پێم وترا فوویان لێ بکە، منیش فووم لێ کردن ولە دەستم دانران و بەئاسماندا فڕێدران و لەناوچوون [منیش ئەوەم بە دوو درۆزنەکە زانی] کە لە دوام پەیدا دەبن یەکێکیان عەنسی خەڵکی سەنعایە ئەوی تریشیان موسەیلەمەی خەڵکی یەمامەیە][1190].

پاشگەز بوونەوەی ئەو دوانە یەکەم شت بوو ڕوویدا لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ. سوهەیلی دەڵێت: [پیاوێك ناوی نەهاری کوڕی عەنقوە بوو ناسرابوو بە (ڕەجال) موسوڵمان بوو وە هەندێك قورئان فێربوو وە ماوەیەکیش لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو دواتر لەگەڵ موسەیلەمە پاشگەز بووە وە و بوختانی بە ناوی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد و دەی وت: کردوویەتیە هاوبەشی خۆی. دواتر هەندی ئایەتی قورئانی لەبەر بوو دەیوت ئەمانە بۆ موسەیلەمە هاتوونەتە خوار. ئەمەش بووە گرفتێکی گەورە بۆ بەنی حەنیفە و هۆکاری پاشگەز بوونەوەیان بوو][1191].

---

(١١٩٠) أخرجه: البخاري (٤٣٧٨، ٤٣٧٣، ٣٦٢٠)، ومسلم (٢٢٧٤،٢٢٧٣) واللفظ لهما.

(١١٩١) أخرجه: الطبري (التاريخ) (٣٠٠/٣)، و السهيلي (الروض الانف) (٣٤٠/٢) و الحافظفي (الاصابة) (٥٣٩/١).

موسەیلەمە دەیویست لاسایی پێغەمبەری خوا ﷺ بکاتەوە، شەعبی ﷺ دەفەرموێت: [هەواڵ گەیشت بووە موسەیلەمە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تفی بکردایەتە هەر بیرێك ئاوەکەی شیرینتر دەبوو، ئەویش تفێکی کردە بیرێکەوە بەڵام ئاوەکەی وەك زەقنەبووت تاڵبوو، وە لای باسکرابوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ مەلاشووی منداڵی بە خورما شیرین دەکرد، ئەویش مەلاشوی منداڵێکی بە خورما شیرین کرد بەڵام منداڵەکە لاڵبوو. وە لای باسکرابوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دەهێنا بەسەر ئەو منداڵانەی کە دەهێنرایە لای. ئەویش دەستی بەسەر منداڵێکدا هێنا بەڵام کەچەڵ بوو][1192].

موسەیلەمە لاسایی سورەتەکانی قورئانی دەکردەوە و دەی وت ئەمانە بۆ من هاتۆتە خوارەوە: (والمُبَذِراتِ زَرْعَاً وَالحَاصِداتِ حَصْداً وَالزارياتِ قمْحاً وَالطاحناتِ طَحْناً وَالعاجِناتِ عَجناً وَالخابزاتِ خُبزاً والثارداتِ ثرداً و اللاقمات لقما)[1193] وە لە هەندێ درۆی تریدا دەی وت: (لَقَدْ أَنْعمَ اللهَ على الحبلى أَخْرَجَ مِنْهَا نَسَمَةً تَسْعَى، مِنْ بَيْنِ صِفَاقٍ وَحَشَا...) ومیان دەی وت: (الفيلُ وَمَا أَدْراكَ ما الفيلُ ولَهُ خُرْطُومٌ طَوِيلٌ وذنبٌ قصيرٌ. يا ضفدعْ بنت ضفدعين نقيٌ لَكُمْ تنقينَ أعلاكَ فِي الماءِ وَأَسْفَكُ فِي الطينِ لا الماءُ تكدريْنَ وَ لا الشاربُ تَمْنَعِينَ) ومەدەی وت: (و الليل الدامس و الذئب الهامس ما قطعت أسداً من رطب و لايابس)[1194].

عەمری کوڕی عاص ﷺ پێش موسوڵمان بوونی چووبوود لای موسەیلەمە و گوێی لێ بووبوو دەیوت: (يَا وَبْر يَا وَبْر، إِنَّمَا أَنْتِ إِيْرادُ وَصَدْر، وَسَائِرُكِ حَفْزُ نَقْز) ئینجا موسەیلەمە پێی وت: ئەو وتانە چۆنن؟ وتی: سوێند بە خوا دەزانیت من باش دەزانم کە تۆ درۆزنیت][1195].

ئەم وتە بێ نرخانە بوونە هۆی گومڕابوونی کەسانێکی زۆر دواتر ئەبوبکری صدیق ﷺ بە پاشماوەی خزمەکانی دەوت: [ئەی هاوار بۆ ئێوە چۆن ئێوەی بێ ئەقل

---

(١١٩٢) أخرجه: الطبري (التاريخ) (٢٨٤/٣)، وابن أبي الدنيا (الاشراف) (٤٨٩)، والديوري (المجالسة) (١٩٣٠)

(١١٩٣) أخرجه الطبراني (الكبير) (٨٩٥٦)، وعبدالرزاق (المصنف) (١٠١٦٩)، ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٢٧٤)، والبيهقي (الدلائل) (٢٠٦٥) وقال محققه: اسناده صحيح، والدارمي (٢٤٠٨)، والحاكم(٥٣/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٤٨٧٩) وقال محققه: اسناده صحح.

(١١٩٤) أخرجه: الباقلاني (إعجاز القرآن) (٢٣٨،٢٣٩) طبعه دار المعارف، وابن كثير البداية) (٢٤/٥)

(١١٩٥) أخرجه: ابن كثير (البداية) (٣٧/٧).

کردبوو خۆ وتەکانی هەموو بەس ئەل ئەل بوون][١١٩٦].

دواتر موسەیلەمە نامەیەکی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نارد تێیدا هاتبوو: [لە موسەیلەمەی پێغەمبەری خواداوە بۆ موحەممەدی پێغەمبەری خوا: سڵاوت لێبێت من ئێستا کراومەتە هاوبەشت و نیوەی زەوی بۆ ئێمەیە و نیوەکەی تری بۆ قورەیشە بەڵام ئەوان کەسانێکی دەست درێژکەرن][١١٩٧].

ئەم نامەیە دووکەس هێنابوویان: نوعەیمی کوڕی مەسعەودی ئەشجەعی دەڵێت: (دوو نێردراوەکەی موسەیلەمە نامەیەکی موسەیلەمەیان پێ بوو [یەکێکیان ناوی ئیبنو نەواحە و ئەوی تریان ناوی ئیبنو ئاسال] بوو. پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: ((ئایا شایەتی دەدەن کە من پێغەمبەری خوام؟)) ئەوانیش دەیان وت: ئێمە شایەتی دەدەین کە تەنها موسەیلمە پێغەمبەری خوایە. پێی فەرموون: ((ئێوەش وەکو ئەو وتەکانی دەڵێنەوە؟)). وتیان: بەڵێ. فەرمووی: ((آمَنَتِ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ] [أَمَّا وَاللَّهِ لِوْ لَا أَنْ الرُّسُلَ لَاْ تَقْتل لضَربتُ أَعْنَاقَكُمْا [وَلَوْ كُنْتُ قَتِلاً رَسُولاً لَقَتَلْتُكُما]) واتە: ((من باوەڕم بە خوداو پێغەمبەرەکەی هەیە] [سوێند بەخوا گەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە نێردراو ناکوژرێت ئەگینا ئێستا من لە گەردنم دەدان [وە گەر من نێردراوم بکوشتایە ئێوەم دەکوشت]][١١٩٨]. پاشان بەنامەیەك پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی دایەوە کە ئەمە دەقەکەیەتی: [بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان لە موحەممەد پێغەمبەری خواوە بۆ موسیلەمەی درۆزن، سڵاو لەوەی دوای ڕێنوێنی ڕاست دەکەوێت دواتر، بزانە کە زەوی هەموو هی خودایە و دەیداتە ئەو بەندانەی کەخۆی دەیەوێت، چارەنوس لە کۆتایدا هەر بۆ خۆپارێز و ملکەچەکانە][١١٩٩]. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا پێنج پیاویان لێ موسوڵمان بوون وەك نوێنەری قەومی خۆیان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ.

(١١٩٦) أخرجه: ابن الاثير (النهاية) (٦١/١).

(١١٩٧) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢١/٤) رقم: (١١٤٣)، والطبري (التاريخ) (١٤٦/٣)، و البيهقي (الدلائل) (٣٣١/٥).

(١١٩٨) أخرجه: ابو داود (٢٧٦١)، والطيالسي (٢٤٨) وقال محققه: حدپث حيح، وأحمد (٣٦٤٢،٣٧٠٨) وقال محققوه: حديث صحيح، والنسائي (الكبرى) (٨٦٧٦)، و البزار (١٧٣٣)، وابن حبان (٤٨٧٩) وقال محققه: اسناده صحيح، وابو يعلى (٥٠٩٧) وقال محققه: اسناده حسن، والحاكم (١٥٥/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (٢٠٦٣،٢٠٦٤) وقال محققه: اسناده حسن، وكذا قال الهيثمي (المجمع) (١٤/٥) وحسنه ايضاً الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (١٣٣٩) وصححه في (صحيح أبي داود) (٢٣٩٩،٢٤٠٠).

(١١٩٩) أخرجه: ابن هيشام (السيرة) (٢١١/٤) رقم: (١١٤٥).

عەلی کوڕی شەیبان کە یەکێکبوو لەو پێنج پیاوە دەڵێت: [ئێمە لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژمان دەکرد بە تیلەی چاوی تەماشای پیاوێکی کرد کە بە باشی پشتی ڕاست نەدەکردەوە لە نێوان ڕکوع و سجوددا، لە دوای تەواوبوونی نوێژەکەی فەرمووی: ((يا معشرَ المسلمينَ إنَّهُ لا صلاةَ لمن لا يقيمُ صلبَهُ في الرُّكوعِ والسُّجودِ)) واتە: ((ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان بزانن نوێژی ئەو کەسە قبوڵ نییە کە پشتی باش ڕاست نەکاتەوە لە نێوان ڕکوع و سجوددا)).

هەروەها پیاوێکی بینی لە دوای ڕیزی نوێژەکەوە بەتەنها نوێژی دەکرد هات و لەلای وەستا تا لە نوێژەکەی بووە وە ئینجا پێی فەرموو: [((هَكَذا صَلَّيْتَ؟)). قَالَ: نَعم فَقَالَ رَسُولُ اللَهَ ﷺ ((فَأَعِدْ صَلَاتَكَ، فَإِنَّهُ لَا صَلَاةَ] لرجُلٍ لِفَرْدٍ خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدهُ]))[١٢٠٠] واتە: (([ئاوا بە تەنها تۆ نوێژت کرد؟)) وتی: بەڵێ. پێی فەرموو: ((نوێژەکەت دووبارە بکەرەوە] چونکە نوێژی پیاوێك بە [تەنها] لە دوای ڕیزێکەوە قبوڵ نییە].

ئەو وەفدە پەیمانیان دایە پێغەمبەری خوا ﷺ پاشان ویستیان بگەڕێنەوە و داوای ئاوی دەست نوێژەکەیان لێکرد: قەیسی کوڕی تەڵقی کوڕی عەلی لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە وتیوویەتی: [چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە پێنج کەس بووین لە بەنوحەنیفە لەگەڵ پیاوێك لە زەبیعەی کوڕی ڕەبیعە. پەیمانمان پێ دا لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژمان کرد و پێمان ڕاگەیاند کە لە ناوچەکەماندا پەرستگایەکی تێدایە ئێمە داوای ئاوی دەست نوێژەکەیمان لێکرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کرد ئاوێکیان بۆ هێنا و دەست نوێژی شۆرد وە ئاوی دەست نوێژەکەی بۆ کردینە مەشکۆلەیەکەوە و پاشان فەرمووی: ((اذْهَبُوا بِهَذَا الْمَاءِ فَإِذَا قَدِمْتُمْ بَلَدَكُمْ، فَاكْسِرُوا بِيعَتَكُمْ، ثُمَّ انْضَحُوا مَكَانَهَا مِنْ هَذَا الْمَاءِ، وَاتَّخِذُوا مَكَانَهَا مَسْجِدًا)) واتە: ((ئەم ئاوە لەگەڵ خۆتان ببەنەوە، گەر گەیشتنە ناوچەکەتان ئەو پەرستگایە بڕوخێنن و ئەم ئاوی دەست نوێژە بە جێگەکەیدا بپرژێنن وە ئەو جێگەیە بکەنە

---

(١٢٠٠) أخرجه: أحمد (١٦٢٩٧) وقال محققوه: اسناده صحيح، وابن سعد (٥٥١/٥)، وابن أبي شيبة (المصنف) (١٩٣/٣)، وابن ماجة (٨٧١،١٠٠٣)، وابن أبي عاصم (الآحاد) (١٦٧٨)، وابن خزيمة (١٥٦٩) وقال محققه: صحيح، وابن حبان (٢٢٠٣) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (الارواء) (٥٤١)، و (الصحيحة) (٢٥٣٦) واللفظ لأحمد و الزيادة لابن حبان.

مزگەوت)). ئێمەش وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ [ئێمە لە کاتی گڕەو گەرمادا دەگەڕێینەوە] و ناوچەکەمان دووره ئاویش کەم دەکات و دەبێتە هەڵم، فەرمووی: ((فَأَمِدُّوهُ مِنَ الْمَاءِ، فَإِنَّهُ لَا يَزِيدُهُ إِلَّا طِيبًا (فَما) (يَبْقَى مِنْهُ شَدِيدٌ كَثِيرٌ رَطْبٌ])) واتە: ((گەر کەمی کرد ئێوە ئاوی تری تێکەڵ بکەن باشتری دەکات [و ئەوەش لێی دەمێنێتەوە زۆرە و هەر چاکە])) ئێمە لەوێ لەناو خۆماندا بووە هەرامان کێ دەبێت هەڵی بگرێت. دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ کردیە سەرەو نۆبە لە نێوانماندا هەموو یەکێکمان دەبێت شەو ڕۆژێك هەڵی بگرێت. دواتر گەڕاینەوە ناوچەکەمان، ئەوەی داوامان لێ کرابوو ئەنجامماندا و یەکێکمان بانگماندا و ڕەبەنی پەرستگاکە پیاوێکی هۆزی (تەی) بوو کە گوێی لە بانگە کە بوو وتی: بانگەوازێکی حەق و ڕاستیە و پاشان هەڵات و ڕایکرد و ئیتر نەبینرایەوە][١٢٠١].

دواتر قسەو باس زۆربوو سەبارەت بە موسەیلەمە و دەجال و بە درۆزن ناسرا، ئەوەش لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە ئیسنادەکەی لاوازە، ئەبوبەکرە ﷺ دەفەرموێت: [خەڵکی قسەو باسی زۆریان وت سەبارەت بە موسەیلەمە دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاو وتارێکی دا، سوپاس و ستایشی خودای کرد، پاشان فەرمووی: ((أَمَّا بَعْد [أَمَّا بَعْدُ فَقَدْ أَكْثَرْتُمْ فِي شَأْنِ مُسَيْلَمَةَ فَإِنَّهُ كَذَّابٌ مَنْ جُمْلَةِ] ثَلَاثِينَ كَذَّابًا يَخْرُجُونَ قَبْلَ الدَّجَّالِ...))[١٢٠٢] واتە: ((زۆر قسەو باستان کرد سەبارەت بە موسەیلەمە، ئەویش یەکێکە [لە سی درۆزنەکەی پەیدا دەبن پێش هاتنی دەجال...].

لە گێڕانەوەیەکی تردا فەرمووی: ((إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ كَذَّابِينَ، مِنْهُمْ صَاحِبُ الْيَمَامَةِ، وَمِنْهُمْ صَاحِبُ صَنْعَاءَ الْعَنْسِيُّ، وَمِنْهُمْ صَاحِبُ حِمْيَرَ)) [..مِنْهُمْ مُسَيْلَمَة وَ العَنْسِيُّ وَالْمُخْتار][١٢٠٣]

---

(١٢٠١) أخرجه: أحمد (٢٤٠٠٩/٢٦) وقال محققوه: اسناده حسن، والنسائي (الصغرى) (٣٨/٢) وفي (الكبرى) (٧٠٨)، والطبراني (الكبير) (٨٢٤١)، وابن سعد (٥٥٢/٥)، و البيهقي (الدلائل) (٥٤٢/٢)، وابن حبان (١٦٠٢) وقال محققه: اسناده قوي، وقال الشيخ الألباني في (الصحيحة) (١٤٣٠)، (صحيح الجامع) (٨٦٣):اسناده صحيح وقال في (المشكاة) (٧١٦): اسناده حسن. واللفظ لابن حبان.

(١٢٠٢) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٢٠٨٢٣)، وأحمد (٢٠٤٦٤) وقال محققوه اسناده ضعيف، والحاكم (٥٤١/٤) وضعفه الذهبي، والطحاوي (شرح مشكل الآثار) (٢٩٥٣) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابن حبان (٦٦٥٢) وقال محققه: اسناده ضعيف، و الجملة الاخيرة من الحديث صحيح لغيره كما في (صحيح الموارد) (١٥٨٨).

(١٢٠٣) أخرجه: ابو يعلى (٦٨٢٠) وقال محققه: اسناده ضعيف، وقال البوصيري (الاتحاف) (٩٨٦٥): اسناده حسن.

ومنهم الدجال وهو اعظمهم فتة...))[١٣٠٤] واتە: [((پێش هاتنی قیامەت چەندەها درۆزن پەیدادەبن لەوانە ئەوەی کە لە ناوچەی یەمامەدایە وە ئەوەش کە لە ناوچەی سنعادایە وە ئەوەش کە لە ناوچەی حیمیەردایە. لەگێڕانەوەیەکی تردا: [...لەوانە موسەیلەمە وعەنسی و موختار...]. وە لە دواییاندا دەجال کە لەهەموویان گرفتی گەورەترە))]. لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: ((لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَخْرُجَ ثَلَاثُونَ دَجَّالُونَ، كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ...))[١٣٠٥] واتە: ((قیامەت هەڵناسێ و نایەتە پێش تا سی دەجال پەیدا دەبن، هەموویان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە پێغەمبەری خوان...)).

**٦- وەفدی بەنی سوداء:**

دە یان دوانزە کەس لە هۆزی بەنی (سوداء) دێنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و موسوڵمان دەبن، یەکێك لە پیاوانی ئەو هۆزە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: [ئێمە دوانزە کەس بووین چوینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و بەڵێنی موسوڵمان بوونمان پێدا بەڵام بەڵێنی لە یەکێکی ئێمە وەرنەگرت، ئێمەش وتمان: بەڵێنی لێوەرگرە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((لَنْ أُبَايِعَهُ حَتَّى يَنْزِعَ الَّذِي عَلَيْهِ ، إِنَّهُ مَنْ كَانَ مِنَّا ، مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِ ، كَانَ مُشْرِكًا مَا كَانَتْ عَلَيْهِ)) واتە: ((من بەڵێنی لێوەرناگرم هەتا ئەوەی کە پێوەیەتی لێی نەکاتەوە چونکە هەر کەسێکی ناو ئێمە گەر ئەوەی پێوە بێتو لێی نەکاتەوە هەر بە هاوتا دانەر بۆ خوا دەمێنێتەوە)). ئێمەش تەماشامان کرد توێکلە دارێك لە ناو پارچە پێستێکدایە وە بە قۆڵیەوە بەستوویەتی لەگەڵ تۆزێك گەڵای درەخت][١٣٠٦].

لە گێڕانەوەی عوقبەی کوڕی عامردا ﷺ دەفەرموێت: [کۆمەڵێك کە دە کەس دەبوون هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و بەڵێنی موسوڵمان بوونی لە نۆ کەسیان وەرگرت وە یەکێکیانی فەرامۆشکرد، پێیان وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١٣٠٤) أخرجه: أحمد (٣٤٥/٣)، و البزار (٣٣٧٥)، و ابن حبان (٦٦٥٠) وقال محققه: اسناده قوي، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الموارد) (١٥٨٩) والعدوي (الصحيح المسند من اشراط الساعة) (ص:٤١٤).

(١٣٠٥) أخرجه: البخاري (٣٦٠٩) (٧١٢١)، ومسلم (٢٩٢٣)، والترمذي (٢٣١٨)، وابن حبان (٦٦٥١) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم وللفظ لابن حبان.

(١٣٠٦) أخرجه: الطحاوي (شرح معاني الاثار) (٣٢٥/٤) واسناده حسن كما قال الأرناؤوط في تعليقه على ابن حبان تحت الحديث (٦٠٨٦).

بەڵێنت لە نۆ کەسمان وەرگرت و جگە لە یەکێکمان؟ فەرمووی: ((ئەوە چاوەزارێکی لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە)) ئینجا دەستی گرت و چاوەزارەکەی پچڕاند و (فڕێی دا) پاشان فەرمووی: ((مَنْ عَلَّقَ تَمِيمَةً فَقَدْ أَشْرَكَ))[١٢٠٧] واتە: ((هەر کەسێك چاوەزارێك هەڵبواسێت هاوتای بۆ خودا بڕیار داوە))].

باسی وەفدی (سوداء) بە دوور و درێژی هاتووە لە فەرموودەیەکی (لاوازدا) دەیهێنین بۆ زیاتر ئاشنابوون:

زیادی کوڕی حاریسی سەودائی ﷺ دەفەرموێت: [هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و بەڵێنی موسوڵمان بوونم پێدا و هەواڵم زانی کە سوپایەکی بەرەو ناوچەی خزمەکانم ناردووە، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوپاکە بگێڕەوە من بەڵێنی موسوڵمان بوون و گوێڕایەڵی هۆزەکەمت پێ دەدەم، پێی فەرمووم: ((تۆ بڕۆ و بیان گێڕەوە)). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکەم پەکی کەوتووە. ئینجا یەکێکی نارد سوپاکەی گێڕایەوە، منیش نامەیەکم نارد بۆ قەومەکەم، داوام لێکردن وەفدێکیان بێت و موسوڵمان ببن، ئەوە بوو دواتر وەفدێکیان هات و موسوڵمان بوون، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ((ئایا بتکەمە سەرکردەیان؟)) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. ئەویش فەرمانیدا و نوسراوێکی پێدام و بوومە سەرکردەیان. وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمان بکە هەندێك لە بەخشیشەکان بدەنە من؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) نامەیەکی ترم پێ درا.

ئینجا من لە خزمەتیدا مامەوە، لە یەکێك لە سەفەرەکاندا پێغەمبەری خوا ﷺ و ئێمە لە جێگەیەك دابەزی بووین و خەڵکی ئەو ناوچەیە هاتن و سکاڵایان لە بەرپرسەکەیان دەکرد و دەیان وت: ئەو سزای داوین بەهۆی گرفت و کۆنەقینێکی سەردەمی نەفامی. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لەبەر ئەوە وای کردووە؟)) وتیان: بەڵێ. پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی دایەوە بەلای هاوەڵانیدا و منیشیان لە ناودابووم فەرمووی: ((بەرپرسیارێتی باش نییە بۆ کەسێکی بڕوادار)). ئیتر منیش ئەو وتەیەی کاری تێکردم لەدەروونمدا. پاشان یەکێکی تر هاتە خزمەتی وتی: ئەی

(١٢٠٧) أخرجه: أحمد (١٧٤٢٢) وقال محققوه: اسناده قوي والطبراني (الكبير) (٨٨٥/١٧)، والحاكم (٢١٩/٤) وصححه، وقال الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٤٩٢)، و(غاية المرام) (٢٩٤): اسناده صحيح. وكذا قال الأرناؤوط في تعليقه على (ابن حبان) (٤٥١/١٣) عند الحديث رقم: (٦٠٨٦).

پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێك پارەم بدەرێ. ئەویش فەرمووی: ((هەر کەسێك خاوەن سامان بێت و داوا لە خەڵکی بکات بۆی دەبێتە ژانە سەر و دەردە سك)) ئەو کەسە وتی: دە لە پارەی زەکات بمدەرێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خودا خۆی بڕیاری دابەشکردنی زەکاتی داوە و لە وەدا ڕازی نەبوو بە بڕیاری هیچ پێغەمبەر و کەسێکی تر تاخۆی کردوویەتیە هەشت بەشەوە، گەر تۆش یەکێکیت لەو بەشانە ئێمە بەشی خۆت پێدەدەین)).

ئینجا ئەمەش کاری لە دەروونم کرد وەك وتەکەی پێشووتری چونکە منیش سامانداربووم و داوای پارەی زەکاتم لێکردبوو. لەو ئێوارەدا هەر لە سەرەتای شەوە وە پێغەمبەری خوا ﷺ نانی ئێوارەی خوارد وە لە خزمەتیدا بووم خۆمم لێ نزیك کردەوە... دواتر هەر خۆم و خۆی بەتەنها ماینەوە. کاتێ نوێژی بەیانی هات فەرمانی پێکردم من بانگمدا و وتم: قامەت بکەم؟ پێغەمبەری خواش ﷺ تەماشای ڕۆژهەڵاتی کرد و فەرمووی: ((نەخێر))... ئینجا چووە سەر ئاو و هاتەوە لام و هاوەڵانی لە هەموو لایەکەوە دەهاتن و فەرمووی: ((ئایا ئاوت لە لایە ئەی برای سوداء؟)) وتم: نەخێر کەمێکم لا ماوە بەشت ناکات فەرمووی: ((بچۆ بیکەرە ناو تەشتێکەوە بۆمی بهێنە)) منیش دواتر بۆم هێنا و لەپی دەستی تێکرد و بینیم لە نێوان دوو پەنجەیەوە ئاو بە خوڕ دەهاتە دەرەوە ئینجا پێمی فەرموو: ((گەر لەبەر ئەوە نەبێت کە من شەرم لە خودای خۆم دەکەم ئاوی پێ دەداین و لێمان دەخواردەوە و دەمان بەخشیە کەسانی تریش. ئێستاش بانگی هاوەڵانم بکە کێ پێویستی بە ئاو هەیە با بێتە ئێرە)). منیش بانگم کردن و ئەوەی ویستی هات و لێی برد.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا بۆ نوێژکردن و بیلال ویستی قامەتی بۆ بکات، پێی فەرموو: ((ئەم برایەمان لە هۆزی سەوداء بانگی داوە دەبێت هەر ئەویش قامەت بکات)). منیش قامەتم کرد، لە دوای تەواو بوونی نوێژەکەی چومە خزمەتی و هەردوو نامە نوسراوەکەیم بۆ لا هێنا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم دوو نوسراوە ڕزگارم بکە و بمبەخشە. فەرمووی: ((بۆ چی ڕووی داوە لێت؟)) وتم: من گوێم لێت بوو ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەت فەرموو: ((بەرپرسیارێتی بۆ پیاوێکی بڕوادار باش نییە)) وەمنیش بڕوام بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوەوە، دواتریش

گوێم لێت بوو دەت فەرموو: ((هەر کەسێك خاوەن سامان بێت داوا لە خەڵکی بکات بۆی دەبێتە ژانە سك و دەردەسەر)). وەمنیش خاوەن سامانم و داوام لە تۆ کرد فەرمووی: ((ئەوە بەوجۆرەیە، گەر دەتەوێت وەری بگرە وە گەر دەتەوێت وازی لێبهێنە؟)) وتم: من وازی لێدەهێنم. فەرمووی: ((تۆ پیاوێکم نیشان بدە تا بیکەمە سەرکردەتان)) منیش یەکێکی ئەو وەفدەی پێشووم بۆ دەستنیشان کرد و ئەو کەسەی کردە سەرکردەیان...][1208].

## ٧- وەفدی موزەینە:

هاتنی ئەم وەفدە لە مانگی ڕەجەبی ساڵی پێنجی کۆچیدا بوو[1209]. وە ژمارەیان چوارسەد سواربوو، کاتێك ویستیان بگەڕێنەوە خواردنیان پێ نەما، بۆیە داوای خواردنیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، دوکینی کوڕی سەعدی موزەنی ﷺ دەفەرموێت: [ئێمە چوارسەد سواربووین[1210] [لە هۆزی موزەینە] داوای خۆراکمان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((يَا عُمَرُ اذْهَبْ فَأَطْعِمْهُمْ وأَعْطِهِمْ)) واتە: ((عومەر بڕۆ نانیان بدەرێ و خواردنیان پێبدە)) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چەند ڕبە خورمایەکم لاماوە [وا دەزانم بەشی وەرزی هاوینمان نەکات] [بۆ خۆم و خێزانەکەم]. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بڕۆ بیان دەرێ)). ئەبوبەکر ﷺ وتی: گوێ بگرە و گوێڕایەڵبە. عومەریش ﷺ وتی: دەیبیستم و گوێڕایەڵم. [پاشان عومەر هەستاو ئێمەش لەگەڵی هەستاین و چوینە ژوورێکی سەرەوەیان] و کلیلێکی لە پشتوێنەکەی

---

(١٢٠٨) أخرجه: البيهقي (الدلائل) رقم: (٢٠٨٩) وقال محققه: اسناده ضعيف، والبيهقي ايضاً في (الكبرى) (١٨١٠) وفي (المعرفة) (٥٦٤)، وابن شاهين (ناسخ الحديث) (١٧٠)، والأصفهاني (دلائل النبوة) (٣٣/١) وفي (الحلية) (١١٤/٧)، و الحارث بن أبي اسامة (المسند) (٥٨٩)، والطبراني (الكبير) (٥٢٨٥)، وابن سعد (٣٢٦/١)، والطحاوي (شرح معاني الأثار) (١٤٢/١) مطولاً، وأخرج الحديث مختصراً عبدالرزاق (١٨٣٣)، وابن أبي شيبة (٢١٦/١)، ابوداود (١٦٣٠،٥١٤)، والترمذي (١٩٩)، وأحمد (١٧٥٣٨،١٧٥٣٧) وقال محققوه: اسناده ضعيف، وابن ماجة (٧١٧)، واورده الدار قطني (١٣٧/٢) وضعفه، والبغوي (شرح السنة) (٩٠/٦) وهو ضعيف، والسيوطي (الجامع الكبير) (٤٩٧٥) وفي (كنز العمال) (٣٨/٧) واشار إلى تضعيف الحديث كل من: النووي (المجموع) (١٢١/٣) و الحافظ (الإصابة) (٥٥٧/١) (رقم:٢٨٥٠)، وفي (المطالب العالية) (١٣/٤)، والهيثمي (المجمع) (٢١٤/٥)، وابن كثير (التفسير) (٤٦٣/٢) و الشيخ الألباني في (الأرواء) (٣٢٧، ٨٥٩)، و (المشكاة) (٦٤٨) و (ضعيف أبي داود) (٨٢)، و (الضعيفة) (١٣٢٠) (٣٥)، و(مشكلة الفقر) (٧٥).

(١٢٠٩) أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٣٨/١).

(١٢١٠) أخرجه: احمدد (١٧٥٧٦) بلفظ (ونحن اربعون وأربعمائة).

دەرهێنا و دەرگاکەی کردەوە [بە ئەندازەی قەبارەی بەچکە وشترێك خورمای لێبوو. وتی: وەرنە ژوورەوە ئێمەش چووینە ژوورەوە، وتی: ئەوە خۆتان و خورماکەتان. ئێمەش هەریەکێکمان بە ئەندازەی پێویستی خۆی لێی برد] [من دوا هەمین کەسی هاوەڵانم بووم ئاوڕم دایەوە] [بۆ ئەوەی کە مابووەوە دەت وت ئێمە هیچمان لێکەم نەکردۆتەوە][١٢١١].

## ٨- وەفدی بەنو مونتەفیق:

لوقەیتی کوڕی عامر ﷺ دەفەرموێت: [من نوێنەری وەفدی بەنی مونتەفیق بووم چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و لە ماڵ نەبوو، دایکی بڕواداران فەرمانی کرد و شۆرباو و خواردنێکمان بۆ ساز کرا و هەندێك خورمامان بۆ هات، ئێمەش خواردمان، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە و فەرمووی: ((ئایا هیچتان دەست کەوت یاخود هیچتان بۆ داوا کرا؟)) وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. لە کاتێکدا ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین شوانەکە مەڕەکانی بەرەو لەوەڕگا لێدەخوڕی و کاریلەیەکی لەگەڵدا بوو دەیباعان. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (([ئەی فلانە کەس] چی لە دایك بووە)) وتی: کاریلەیەك. فەرمووی: ((لە جێگەی ئەو شەکێکمان بۆ سەر بڕە)) پاشان ڕووی کردە من و فەرمووی: (( لَا تحسَبَنَّ- أَنَّا مِنْ أَجَلِكَ ذَبَحْنَاهَا، إِنَّ لَنَا غَنَمًا مِائَةً [لَا تَزِيدُ أَنْ تَزِيدَ عَلَيْهَا] [وَكُلَّمَا وَلَّدَ الرَّاعِي بَهْمَةً أَمَرْنَاهُ فَذَبَحَ [مَكَانَهَا شَاةً])) واتە: ((وانەزانیت ئێمە تەنها لەبەر تۆ سەری دەبڕین، ئێمە سەد سەر مەڕمان هەیە [نامانەوێت زیاد بکات] [و هەر کات شوانەکەی کاریلەیەکی هێنایەوە لە جێی ئەو [شەکێك سەر دەبڕین])) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ژنێکم هەیە [و تۆزێك] زمانی باش نییە. فەرمووی: ((کەواتە وازی لێبهێنە)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەیەکی زۆرە بەیەکەوەین و منداڵم لێی هەیە؟ فەرمووی: ((عِظها فَإِنْ يَكُ فِيهَا خَيْرٌ فَسَتَفْعَلْ، وَلَا تَضْرِبْ ظَعِينَتَكَ ضَرْبَكَ أُمَتَكَ)) واتە: ((ئامۆژگاری بکە گەر خێری تێدا

---

(١٢١١) أخرجه: أحمد (١٧٥٧٦، ١٧٥٧٧) وقال محققوه: اسناده صحيح، و الحميدي (٨٩٣)، و البخاري (التاريخ الكبير)، ابوداود (٥٢٨) مختصراً، و الطبراني (الكبير) (٤٢٠٧)، و ابن حبان (٦٥٢٨) وقال محققه: اسناده صحيح، والبيهقي (الدلائل) (٢٠٩٥،٢٠٩٨). واللفظ للطبراني و الزيادات لأحمد وابن حبان. و الحديث صححه كل من: الحافظ العراقي (الأحياء) (٣٨٥/٢)، و الشيخ الألباني (صحيح ابي داود) (٤٣٦٣)، والشيخ مقبل (الصحيح المسند) (٣٣٤) و الساعاتي (الفتح الرباني) (٥٨/٢٢).

بێت گوێڕایەڵت دەبێت وەك كەنیزەكەكەت (مامەڵە) لەگەڵ هاوسەرەكەت مەكە)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێم بڵێ دەستنوێژ چۆنە؟ فەرمووی: ((هەر كات [دەست نوێژت گرت ئاو لە دەمت وەر بدە] و جوان دەستنوێژ بشۆ دەست بخەرە نێوان پەنجەكانتەوە و باش ئاو لە لوتت وەربدە مەگەر بەڕۆژوو بیت](١٢١٢).

لە فەرموودەیەكی (لاوازدا) هاتووە: لوقیتی كوڕی عامر ﷺ دەفەرموێت: [ئێمە لەگەڵ وەفدەكەماندا چووینە شاری مەدینە لە كۆتاdی مانگی ڕەجەبدا و نوێژی بەیانیمان لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ كرد و پاشان وتارێكیدا و فەرمووی: ((ئەی خەڵكینە چوار ڕۆژە بە نزمی دەدوێم تا بتوانم دەنگی خۆمتان پێ بگەیەنم خەڵكێك هەن یەكێك لە خزمەكانی خۆیان دەنێرن و پێی دەڵێن: بزانە پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەڵێت، ئەو كەسەش باخەیاڵاتی دەرونی بێ ئاگای نەكات، با وتەكانی هاوڕێكەی بێ ئاگای نەكات، با گومرایی بێ ئاگای نەكات: من بەرپرسیارم لە گەیاندنی پەیامەكەم گوێم لێبگرن تا لەژیاندان...))](١٢١٣).

## ٩- وەفدی كیندە:

ئیمامی زوهری ﷺ دەفەرموێت: [ئەشعەسی كوڕی قەیس بە یاوەری هەشتا سوار لە هۆزی كیندە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بو ناو مزگەوتەكەی و هەموویان قژیاندا هێنابوو وە چاویان ڕشتبوو وە جبەی سپیان لەبەردا بوو كە سەر قۆڵەكەی ئاوریشم بوو، كاتێك چوونە بەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ [سەلامیان لێكرد]. و فەرمووی: ((ئایا ئێوە موسوڵمان بوون؟)) وتیان: بەڵێ. فەرمووی: ((ئەی

(١٢١٢) أخرجه: أحمد (١٧٨٤٦) وقال محققوه: اسناده صحيح والبخاري (الأدب المفرد) (١٦٦)، وأبي داود (١٤٢)، وعبد الرزاق (٨٠)، الترمذي (٧٨٨/٣٨)، وابن خزيمة (١٠٥) وقال محققه: صحيح، و النسائي (٦٦/١)، و الطبراني (الكبير) (٤٧٩،٤٠٠/١٩)، و الدارمي (٧١١)، وابن حبان (١١٠٥٤) وقال محققه: اسناده جيده و اللفظ، وصححه كل من: الحافظ (الإصابة) (٧٥٥٤)، و الشيخ الألباني (صحيح الأدب) (١٢٣) و(صحيح أبي داود) (١٣٠)، و الشيخ مقبل (الصحيح المسند) (١١٠٢).

(١٢١٣) أخرجه: أحمد (١٦٢٠٦) وقال محققوه: اسناده ضعيف، عبدالله بن أحمد في (السنة) (١١٢٠) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابن أبي عاصم (السنة) (٥٢٤، ٦٣٦) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابن خزيمة (التوحيد) (٤١٧) وقال محققه: ضعيف، و الحاكم (٥٦٠/٤) وصححه وضعفه الذهبي وقال محققه: (٨٧٢٦): ضعيف، و الطبراني (الكبير) (٤٧٧/١٩)، ابوداود (٣٢٦٦) مختصراً، وضعيف الحديث ابن كثير (البداية) (٧١/٥)، وقال الحافظ (الاصابة) (٢٩٤/٣): سنده حسن، ومال إليه ابن القيم (الزاد) (٦٧٧/٣) وفي (حادي الارواح) (٢٤١).

ئەو ئاوریشمانە چییە لەبەرتاندا؟)). ئەوانیش سەر قۆڵ و گیرفانەکانیان لێ کردەوە کە ئاوریشم بوو.

پاشان ئەشعەس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە جەرگ خۆرەکانین و تۆش کوڕی جەرگ خۆرەکانیت. پێغەمبەری خوا ﷺ بە زەردەخەنەیەکەوە فەرمووی: ((بەم ڕەچەڵەکە دەگەنەوە ڕەچەڵەکی ئەشعەسی کوڕی عبدولموتەلیب و ڕەبیعەی کوڕی حاریس)) لە گێڕانەوەیەکدا: ((بڕۆن بولای عباس و ئەبو سوفیان تا هاوشێوەتان بن)) وتیان: نا بەڵکو تۆ هاوشێوەمانیت. پێشتر عەباس و ڕەبیعە بازرگان بوون گەر بەناوچەیەکدا دوور بکەوتنایەتەوە و پرسیاریان لێبکرایە دەیان وت: ئێمە جگەر خۆرەکانین بەوەش لای پاشاکانی کیندە خۆیان ناساند][١٢١٤].

لە گێڕانەوەیەکدا ئەشعەسی کوڕی قەیس ﷛ دەفەرموێت: [من لەگەڵ وەفدەکەی کیندە چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان منیان لە هەموویان بە باشتر دەزانی وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئێوەش لە ئێمە نین؟ [ئێمە دەڵێین کە تۆ لە ئێمەیت] فەرمووی: ((نا] ئێمە لە کوڕانی بەنو نەزیری کوڕی کینانەین ئێمە لە ڕەچەڵەکی دایکمان نین لە باوکیشمان خۆمان بێ بەری ناکەین)) ئەشعەس دواتر دەی وت: سوێند بە خوا گوێم لێبێت هەر کەسێك قورەیش دووربخاتەوە لە نەزیری کوڕی کینانە بە بوختانچی دەزانین و جەڵدی دەکەین][١٢١٥].

هەروەها ئەشعەس دەفەرموێت: [ئێمە لەگەڵ وەفدەکەی کیندە دا چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و بەمنی فەرموو: ((ئایا منداڵت هەیە؟)) وتم: منداڵێکم لەدایك بووە لەو کاتەدا کە بەرێکەوتین بۆ لای جەنابت وە خۆزگەم دەخواست لە جێی ئەوە نانم ببوایە بمدایەتە خەڵکی. فەرمووی: ((لَا تَقُولَنَّ ذَلِكَ، فَإِنَّ فِيهِمْ قُرَّةَ عَيْنٍ وَأَجْرًا إِذَا قُبِضُوا، ثُمَّ

---

(١٢١٤) أخرجه: عبدالرزاق (١٩٩٥٢)، وابن هشام (السيرة) (١١٣٠)، والطبري (التأريخ) (١٣٨/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٣٧٠/٥)، وابن سعد (الطبقات) (٤٨/١).

(١٢١٥) أخرجه: أحمد (٢١٨٣٩) وقال محققوه: اسناده حسن، وابن المبارك (المسند) (١٦١)، و الطيالسي (١١٤٥) وقال محققه: حديث صحيح، وابن ماجة (٢١٦٢)، و الطبراني (الكبير) (٦٤٥)، والبيهقي (الدلائل) (٣٧٠/٥) وصححه البوصيري (الزوائد) (١١٦٢) و الشيخ الألباني في (الأرواء) (٢٣٦٨) و (الصحيحة) (٢٣٧٥) و (صحيح ابن ماجة) (٢١١٥).

لَئِنْ قُلْتَ ذَاكَ، إِنَّهُمْ لَمَجْبَنَةٌ مَحْزَنَةٌ، إِنَّهُمْ مَجْبَنَةٌ [ومبخلة]))[١٢١٦] واتە: ((وامەڵێ منداڵان سومای چاون خۆشەویستن و بە مردنیشیان دەبنە پاداشت، لەسەر قسەی تۆش ئەوان ڕاستە دەبنە ترسنۆکی و غەمباری و بێ ئاگایی و چروکی (بۆ خاوەنەکانیان) )).

**١٠- وەفدی بەنی ئەسەد:**

واقدی باسی ئەم وەفدەی هێناوە و ئەوانە دە کەس بوون وە سەرکردەکەشیان حەزرەمی کوڕی عامر بوو بەڵام فەرموودەکە (لاوازە):

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: [وەفدەکەی بەنی ئەسەد چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ قسەیان بە ڕوون و ئاشکرا کردو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ناوچەی موزەینە هەموو لەگەڵت بەشەڕ هاتن، بەڵام ئێمە هەرچەندە ژمارەو هێزو توانامان لەوان کەمتر نییە لەگەڵت بەشەڕ نەهاتین و چاکەو پەیوەندی خزمایەتیمان لەگەڵت گەیاند. پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك ئەوەی گوێ لێبوو بە ئەبوبەکر و عومەری فەرموو: ((ئەوان ئاوها قسە دەکەن))؟ وتیان: [نەخێر] ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. فەرمووی: ((إِنَّ فِقْهَ هَؤُلَاءِ قَلِيلٌ، أو [قليل] وَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْطِقُ عَلَى أَلْسِنَتِهِمْ)) واتە: ((ئەوان تێگەیشتنیان لە ئاین کەمە و شەیتان لە سەر زمانیان دەدوێت)) دواتر خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ (الحجرات) واتە: (ئەوانە بە ئیسلام بوونیان منەت دەکەن بەسەر تۆدا تۆش پێیان بڵێ: منەت مەکەن بەسەرمدا لەسەر موسوڵمان بوونتان بەڵکو خوا منەت دەکات بەسەرتاندا کە ئێوەی ڕێنمایی کردووە بۆ ئیمان و بڕوا گەر ئێوە لەبانگەشەی بڕوا هێنانتاندا ڕاستگۆبن). لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: [بەنو ئەسەد هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە موسوڵمان بووین و شەڕمان لەگەڵ نەکردیت لە کاتێکدا هەموو عەرەب موسوڵمان نەبوون و لەگەڵت بەشەڕ هاتن. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەوانە کەم تێگەیشتوون و شەیتان لەسەر زمانیان دەدوێت و ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ

(١٢١٦) أخرجه: أحمد (٢١٨٤٠) وقال محققوه: حديث صحيح، والطبراني (الكبير) (٦٤٦)، و الحاكم (٢٣٩/٤) وصححه ووافقه الذهبي، وقال ابن كثير (البداية) (٥٧/٥): حديث حسن.

أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ (الحجرات)[(١٢١٧)].

**لە ناویاندا هۆزێك هەبوو ناوی (بەنو زینە) بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ناوەکەیانی گۆڕی: ئەبو وائیل ﷺ دەفەرموێت: [ئێمەی وەفدی بەنو ئەسەد چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیاری لێکردین: [ئێوە کێن؟] وتمان: ئێمە بەنوزینەین ئەسپ سوارین. فەرمووی: ((بَلْ أَنْتُمْ بَنُو الرُّشْدَةِ))[(١٢١٨)] واتە: ((بەڵکو ئێوە بەنو ڕەشدەن (واتە: ڕێنموێنی کراون) )). لە گێڕانەوەیەکی (لاوازدا) هاتووە: [پێغەمبەری خوا ﷺ دیاریەکی پێشکەش کرا لە لایەن یەکێك لە وەفدەکانەوە کە ناوی (نوقادی کوڕی عەبدوڵڵا) بوو، ئەویش وشترێك بوو بۆ سواربوون و دۆشین دەشیا و بەچکە نەبوو، کاتێك هێنرایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و چاوی پێکەوت فەرمووی: ((اللَّهُمَّ بَارِكْ فِيْهَا وَفِيِمَنْ بَعَثَ بِهَا)) واتە: ((خودایە بەرەکەتی تێ بکەیت وە بەرە کەت بکەیتە ئەوەشی کە ناردوویەتی)) نوقاد وتی: من لەوێدا وتم: وە بەرەکەتیش بکەوێتە ئەوەی هێناویەتی. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەروەها بەرەکەتیش بکەوێتە ئەوەی هێناویەتی))][(١٢١٩)].**

## ١١- وەفدی بەنی بوجەیلە:

**ئەم وەفدە لە سەد کەس پێکهاتبوون وە جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی سەرکردەیان بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ پێش هاتنیان مژدەی بە موسوڵمانان دا:**

**جەریر ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك نزیك بوومەوە لە شارەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکەم پشوودا و تورەکەکەم کردەوە و پۆشاکێکی جوانم دەرهێنا و لەبەرم کرد**

---

(١٢١٧) أخرجه: ابو يعلى (٢٣٦٣) وقال محققه: رجاله رجال الصحيح، والنسائي (الكبرى) (١١٤٥٥) وفي (التفسير) (٥٣٩) وقال محققه: اسناده ضعيف، والطبراني (الصغير) (٢٢٢/١) وفي (الأوسط) (٨٠١٦) وقال محققه: اسناده ضعيف وأخرجه: الطبري (التفسير) (٩٢/٢٦) بسند صحيح مرسلاً، وأورده السيوطي (باب النقول) (ص:٣٣٦) عن الطبراني وقال: اسناده صحيح وقال ايضاً في (الدر المنثور) (١٠٠/٦): رواه ابن مردوية باسناد حسن: و أخرجه: ايضاً: ابن سعد (٢٩٢) وابن عساكر (التاريخ) (١٢٣/٢٥) وهو في (صحيح اسباب النزول) (رقم:٢٨٤) وقال محققه: الحديث صحيح لغيره، واسناده صحيح كما قال صاحب (السيرة في ضوء المصادر الأصلية) (ص:٦٦٤)، وقال محقق (تفسير ابن كثير) (٧٢٨/٦): سنده حسن.

(١٢١٨) أخرجه: ابن شيبة باسناد صحيح مرسل كما قال الحافظ (الإصابة) (٣٤١/١) رقم (١٧٦٤).

(١٢١٩) أخرجه: احمد (٢٠٧٣٥) وقال محققوه: اسناده ضعيف، و البخاري (التاريخ) (١٢٦/٨)، وابن ماجة (٤١٣٤)، وابن أبي عاصم (الآحاد) (١٠٦٠)، وابن سعد (٢٩٣/١)، وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيفة) (٤٩٦٩).

وە کاتێك چوومە ناو مزگەوتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەرەکەی وتاری دەدا و سەلامی لێکردم وە لە هەموو لایەکەوە خەڵکی چاویان تێ دەبڕیم و تەماشایان دەکردم. منیش دانیشتم، دواتر بەو کەسەم وت کە لە تەنیشتم دانیشتبوو ئەی بەندەی خودا ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ باسی منی بۆ کردوون؟ وتی: بە باشترین شێوە باسی کردوویت، لەکاتی وتارداندا بوو لە ناکاو وەستا و فەرمووی: ((ئا لەو ناوچەیەو ئالەو دەرگایەوە کەسێك دێتە ژوورەوە بۆ لاتان چاکترین کەسی زیبەمەنە و سەرو شێوەی لە پاشا دەچێت)). ئیتر منیش سوپاسی خودام کرد لە سەر ئەو بەهرەو خەڵاتە][1220].

دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە دوایدا، جەریر ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەدوامدا من [چوومە خزمەتی تا بەڵێنی موسوڵمان بوونی بدەمێ]. فەرمووی: ((ئەی جەریر بۆچی تۆ هاتوویتەتە ئێرە؟)) وتم: هاتووم تا لەسەر هەردوو دەستت موسوڵمان ببم و بەڵێنت بدەمێ. پاشان پۆشاکێکی پێ بەخشیم و ڕووی کردە هاوەڵان و پێی فەرموون: ((إِذَا أَتَاكُمْ كَرِيمُ قَوْمٍ فَأَكْرِمُوهُ)) واتە: ((گەر ڕێزداری قەومێك هاتە لاتان ئێوەش ڕێزی لێبگرن)) ئینجا فەرمووی: ((يا جَرير، أَدْعُوكَ إِلى شَهادةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلا اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ، وَأَنْ تُؤْمِنُ بَاللهِ، وَاليَومَ الآخرِ، وَالقَدرِ خَيْرِهِ وَشَرِه، وَتُصَلِّي الصَّلاة المَكْتُوبَةَ، وَتُؤَدِي الزَّكَاةَ المَفْرُوضَةَ)) واتە: ((ئەی جەریر بانگت دەکەم بۆ ئەوەی شایەتی بدەیت کە هیچ خودایەك نییە جگە لە الله وە منیش پێغەمبەری خوام وە پێویستە بڕوات هەبێت بە خواو و ڕۆژی دوایی و قەدەر خێر و شەڕی هەروەها نوێژە فەرزەکان ئەنجام بدەیت وە زەکاتی فەرزیش ببەخشیت)) جەریر ﷺ دەفەرموێت: من بەڵێنی جێ بەجێ کردنی هەموو ئەوانەم پێ دا. ئیتر دواتر هەرکات منی ببینیایە بە بزەو زەردەخەنەوە تەماشای دەکردم][1221].

---

(١٢٢٠) أخرجه: أحمد (١٩١٨٠) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما، والبخاري (الأدب) (٢٥٠)، والنسائي (الكبرى) (٨٣٠٤)، وابن خزيمة (١٧٩٧) وقال محققه: صحيح، وابن حبان (٧١٩٩) وقال محقق: اسناده صحيح، والبيهقي (الدلائل) (٢٠٧٩) وقال محققه: اسناه صحيح، و الحاكم (٢٩٥/١) وصححه على شرطهما و وافقه الذهبي، وصححه الحافظ في (البداية) (٧٨/٥) والشيخ مقبل (الصحيح المسند) (٢٧١) والشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣١٩٣) و(صحيح الموارد) (١٩٣٥،٧١٥٥) و(صحيح الادب المفرد) (١٨٨). وقد ورد قصة اسلامه في حديث طويل ولكنه ضعيف أورده الطبراني (الأحاديث الطوال) (٣).

(١٢٢١) أخرجه: الطبراني (الكبر) (٢٢٦٦) وفي (الطوال) (١٤)، وفي الأوسط) (٦٢٩٠) وقال محققه: اسناده ضعيف جداً وفي (الصغير) (١٢/٢، والحاكم (٢٩١/٤) وصححه، والبيهقي (الشعب) (٨٧/١٠) وقال محققه: اسناده ضعيف، وحسنه

تاریقی کوڕی شیهابیش ﷺ دەفەرموێت: [وەفدەکەی بەجەیلە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی: ((پۆشاك بدەنە بەجەلیەکان وە لە پێشدا بە ئەحموسەکانیان (واتە: چاکە کارانیان)... دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ کردین پێنج جار فەرمووی: ((...خودایە بەرەکەتیان بەسەردا بڕێژە))][١٢٢٢].

جەریر ﷺ چەندەها بەڵێنی بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا لەوانە: خۆی دەفەرموێت: [چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵێنی لە خەڵك وەردەگرت. منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستت بکەرەوە تا دەستم بخەمە ناو دەستت و بەڵێنت پێ بدەم و چ مەرجێکت لەسەرم هەیە خۆت باشتر دەزانیت پێم بڵێ، فەرمووی: (( أُبَايِعُكَ عَلَى أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ، [وَلَا تُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً] وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتُنَاصِحَ الْمُسْلِمِينَ، وَتُفَارِقَ الْمُشْرِكِينَ))[١٢٢٣] واتە: ((بەڵێنت لێوەردەگرم کە تەنها هەر خودا بپەرستیت [هیچ نەکەیتە هاوبەشی] وە نوێژەکانت ئەنجام بدەیت و زەکات ببەخشیت و دڵسوز بیت بۆ هەموو موسوڵمانەکان وە خۆت لە موشریکەکان بە دوور بگریت)).

لە گێڕانەوەیەکی تردا: ((وَتَنْصَحَ الْمُسْلِمَ، وَتَبْرَأَ مِنَ الْمُشْرِكِ))[١٢٢٤] واتە: ((دڵسۆزبە بۆ موسوڵمان و ئامۆژگاریی بکە وە خۆت بێبەریی بکە لە هاوتا بۆ خودا دانان)). لە گێڕانەوەیەکی تردا پێی فەرموو: ((أبا يعك عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِيْما أَحْبَبْتَ وَفِيْما كَرِهْتَ)) واتە: ((بەڵێنت لێوەردەگرم ببیستیت و گوێڕایەڵ بیت لە هەموو ئەوانەی کە پێت خۆشن وە لە هەموو ئەوانەی کە پێت ناخۆشن)). و دواتر فەرمووی: ((ئایا دەتوانیت ئەوە جێ بەجێ بکەیت؟))... (وتم: بەڵێ) فەرمووی: ((بڵێ ئەوەی لە توانامدا بێت جێ بەجێی دەکەم))[١٢٢٥]. وە من پرسیاری نەزەر و سەیر کردنی ئافرەتم لێکرد فەرمووی: ((اصْرِفْ بَصَرَكَ)) واتە: ((یەکسەر چاوت لەسەری لاببە)) دەڵێت: لەو ڕۆژەوە

---

الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٢٦٦) وفي (الصحيحة) (١٢٠٥).

(١٢٢٢) أخرجه: أحمد (١٨٨٣٣) وقال محققوه: اسناده صحيح، والطيالسي (١٣٧٧) وقال محققه: حديث صحيح، والطبراني (الكبير) (٨٢١١) وصححه الحافظ في (الإصابة) (٤١٢٦) و البوصيري (مختصر الاتحاف) (٧٨٣٢)، الشيخ المقبل في (الصحيح المسند) (٥١٤).

(١٢٢٣) أخرجه: أحمد (٣٦٤/٤) (١٩١٥٣) وقال محققوه: حديث صحيح، و النسائي (١٤٨/٧) وفي (الكبرى) (٧٨٠٠)، والطبراني (الكبر) (٢٣٠٩،٢٣٠٧،٢٣١٨).

(١٢٢٤) أخرجه: أحمد (١٩٢٣٣) وقال محققوه: حديث صحيح، و الطبراني (الكبير) (٢٣٠٦)

(١٢٢٥) أخرجه: النسائي (٤١٧٤)، و الطبراني (الكبير) (٢٣٥٦)، وأحمد (١٩٢٢٨) وقال محققوه: حديث صحيح.

کە موسوڵمان بووم منی لە خۆی دوورنە خستۆتەوە وە هەرکاتێکیش منی ببینیایە بە زەردەخەنەوە تەماشای دەکردم][١٢٣٦].

دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ جەریر دەنێرێت بۆ ڕوخاندنی بتەکەی (زیل خەلەسە) جەریر ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئایا دەتوانیت من ئاسوودە بکەیت وە زیل خەلەسە لەناو ببەیت؟)). وتم: بەڵێ. دواتر من لەگەڵ سەدو پەنجا][١٢٣٧] سواری ئەحموسی کە ئەوان سوارچاك بوون وە من نەم دەتوانی لەسەر پشتی ئەسپ بەباشی خۆم بگرم چووین لەناومان برد. [دواتر بە پێغەمبەری خوام ﷺ وت: من پیاوێکم ناتوانم (بە باشی) لەسەر ئەسپ خۆم ڕابگرم][١٢٣٨] ئەویش دەستی بەسەر سنگمدا هێنا وە جێ پەنجەکانی پێوە دیار بوو پاشان [دەستی بە دەم و چاوم دا هێنا وە هەستم بە ساردی دەستی دەکرد] و فەرمووی: ((اللَّهُمَّ ثَبِّتْهُ، وَاجْعَلْهُ هَادِيًا مَهْدِيًّا)) واتە: ((خودایە جێگیری بکە و ڕێنموێنی بکەو بیکەرە ڕێنموینی کار بۆ کەسانی تریش)). ئیتر لەوە بە دواوە لەسەر پشتی هیچ ئەسپێك نەکەوتوومەتە خوارەوە. بتی (زیل خەلەسە) [خانویەك] لە یەمەن و بتی هۆزی خەسعەم و بوجیلە بوو پێیان دەوت: کەعبەی یەمانی یان شامی][١٢٣٩]. ئێمە چووینە لای بتەکە [شکاندمان و ئەوەی لەو ناوە دابوو کوژرا][١٢٣٠].

[جەریر کاتێك گەیشتە یەمەن پیاوێکی لێبوو فاڵی بۆ خەڵك دەگرتەوە پێی وترا: نێردراوی پێغەمبەری خوا ﷺ لێرەیە گەر بەر دەستی بکەویت لە گەردنت دەدات. کاتێك فاڵ گرەوەکە سەرقاڵی فاڵ گرتنەوە بوو جەریر گەیشتە سەری و پێی وت: یان ئەوەتا دەی شکێنیت و شایەتی دەدەیت کە خودا تاك و تەنهایەو هیچ خودایەك نییە جگە لەو یان ئەوەتا لە گەردنت دەدەم. ئەویش شکاندی وشایەتمانی هێنا. پاشان جەریر پیاوێکی نارد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی (ئەبو ئەرتەئە) بوو

---

(١٢٣٦) أخرجه: مسلم (٢١٥٩)، وأبوداود (٢١٤٨)، و الترمذي (٢٩٢٦)، والطبراني (الكبير) (٢٤٠٧).

(١٢٣٧) أخرجه: البخاري (٣٨٢٢)، ومسلم(٢٤٧٥)، و الترمذي (٣٨٢٠)، وابن ماجة (١٥٩).

(١٢٣٨) وفي رواية: (وندب معه ثلاثمائة من الأنصار وأمره ان يسير إلى صنمهم فيدعوهم ثلاثة ايام فان اجابوا إلى الاسلام قبل منهم وهدم صنمهم ذا الخلصة والاوضع فيهم السيف). وجاء في رواية ضعيفة للطبراني (الكبير) (٢٢٩٦) (وبعث مهم (٧٠٠) رجل والرواية الأولى أوردهُ (الحاكم) في (الأكيل) كما في (الفتح) (٩٠/٨).

(١٢٣٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٢٥٣).

(١٢٣٠) أخرجه: البخاري (٤٣٥٥)، (٤٣٥٦). أخرجه: البخاري (٤٣٥٥).

تا مژدەی پێ بدات.

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو مژدەیەی پێ گەشت [لە نێردراوەکەی جەریرەوە][١٢٣١] هات و پێی ڕاگەیاند وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەوەی کە تۆی بەڕاستی ناردۆتە ناومان ئەوێم بەجێ نەهێشت تا بە چاوی خۆم بینیم وەك وشتری گەڕیان لێکردبوو (وە کەس لێی نزیك نەدەبووەوە)[١٢٣٢] پێغەمبەری خواش ﷺ پێنج جار داوای بەرەکەتی کرد لە خوا بۆ ئەسپ سوارەکانی ئەحموس و پیاوەکانیان[١٢٣٣]. و دەیفەرموو: ((اللَّهُمَّ بَارِكْ فِي أَحْمَسَ، وَخَيْلِهَا وَرِجَالِهَا))][١٢٣٤] واتە: [((خودایە بەرەکەت بکەرە ئەحموس و ئەسپەکانیان و سوارەکانیان))].

جەریر ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ مەفرەزیەکی نارد بۆ ناوچەی خەسعەم [کاتێك ئەسپ سوارەکان] چواردەوریان لێ گرتن کەسانێکیان دەستیان کرد بە نوێژ کردن و [یەکێکیان لێ کوژرا] و ئەو هەواڵە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی: ((أَنا بَرِيء مِنْ كُلِ مُسلمٍ يُقيم بَيْنَ ظَهراني الْمُشْركِينَ)) واتە: ((من بێ بەریم لە هەموو موسوڵمانێك کەژیان بەسەر دەبات لە نێو موشریکەکاندا)) وتیان: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((نابێت ئاگریان لە یەکتر دیار بێت))][١٢٣٥].

وە هەروەها جەریر ﷺ دەفەرموێت: [لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە سەرەتای ڕۆژدا، کەسانێك هاتنە خزمەتی ڕووت و پێ پەتی و پێستەی پڵنگیان لەبەردابوو، هەندێکیان تەنها عابایەکی لەبەردابوو وە شمشێریان لە ملدا بوو زۆربەیان خەڵکی ناوچەی موزەر بوون، بە بینینی ئەوان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووگرژ بوو، سەرەتا خەڵکی زۆر بە سادەییەوە هاوکاری کەمیان دەکردن [تا

---

(١٢٣١) أخرجه: البخاري (٣٠٢٠، ٤٣٥٦) وفي رواية (ثم اتيت رسول الله ﷺ) أخرجه: البخاري (٦٣٣٣). في رواية اخرى: (فاتيناه فاخبرناه) البخاري (٣٨٢٣).

(١٢٣٢) أخرجه: البخاري (٣٠٢٠) بلفظ (اجوف) وعند الطبراني (الطبراني) (االكبر) (٢٢٥٣) بلفظ (أجرد).

(١٢٣٣) أخرجه: البخاري (٤٣٥٧)، ومسلم (٢٤٧٦)، ابو داود (٢٧٧٢)، أحمد (١٩٢٤٩) وقال محققوه: اسناده صحح على شرطهما.

(١٢٣٤) أخرجه: أحمد (١٨٨٣٤) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(١٢٣٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٢٦٤،٢٢٦٥) و اللفظ له، وابوداود (٢٦٤٥)، والنسائي (٣٥/٨)، والترمذي (١٦٠٤).واسناده صحيح كما قال الشيخ الألباني في (الإرواء) (١٢٠٧) و (صحيح أبي داود) (٢٣٧٧).

ڕووخساری پێغەمبەری خوا ﷺ تورەبوونی پێوە دیار بوو][١٢٣٦]. پاشان چووەماڵەوە، دواتر بیلال بانگیدا و نوێژ کرا، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ وتارێکیدا و فەرمووی: ((پیاوێك ئەوەی هەیەتی ببەخشێ لە دینارەکەی لە درهەمەکەی لەڕبە خورماکەی لەڕبە گەنمەکەی... (تا فەرمووی)... هەتا بە کەرتە خورمایەکیش بێت...)). ئینجا پیاوێکی ئەنصاری چاڕۆکەیەکی خواردن و کەل و پەلی بۆ هێنان نزیکبوو لەوەی بۆی هەڵ نەگیرێت لە قورسیدا، لە دوای ئەو هەموو خەڵکی کەوتنە یارمەتیدانیان تا دوو کۆمەڵ خواردن و جلوبەرگیان بۆ کۆکرایەوە، تا بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووخساری دەت وت ئاڵتونە دەدرەوشایەوە، فەرمووی: ((مَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَلَهُ أَجْرُهَا، وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ، وَمَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً سَيِّئَةً، كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ))[١٢٣٧] واتە: ((هەرکەسێك دەست پێشخەری بکات لە ئەنجامدانی چاکەیەك ئەوە پاداشتی خۆی بۆ دەنوسرێت لەگەڵ پاداشتی هەموو ئەوانەی کاری پێ دەکەن لە دوای ئەو بەبێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوان هیچ کەم بکات. وە هەرکەسێکیش دەست پێشخەری بکات لە ئەنجامدانی کارێکی خراپدا ئەوە تاوانی خۆی بۆ دەنوسرێت لەگەڵ تاوانی هەموو ئەوانەی کاری پێ دەکەن لە دوای خۆی بێ ئەوەی لە تاوانی ئەوان کەم بکاتەوە)).

وە دواجار پێغەمبەری خوا ﷺ جەریری نارد بۆ یەمەن لە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە مەدینە جەریر دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ منی نارد بۆ یەمەن و لەوێ بە دوو پیاو گەیشتم ناویان (زاکولاع و زاعەمر) بوو. هەندێك لە هەواڵی پێغەمبەری خوام ﷺ بۆ باسکردن. لە دواییدا من و ئەوان هاتین بەرەو شاری مەدینە و پرسیارمان لێکردن هەواڵ چییە؟ وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردووە و ئەبوبەکر بۆتە جێنشین و خەڵکی هەموویان باشن...][١٢٣٨].

(١٢٣٦) أخرجه: أحمد (١٩٢٠٢) وقال محققوه: اسناده صحيح على شروط مسلم.

(١٢٣٧) أخرجه: مسلم (١٠١٧) وأحمد (١٩١٧٤) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والنسائي (الكبرى) (٢٣٣٥) و(الصغرى) (٧٥/٥).

(١٢٣٨) أخرجه: البخاري (٢٢٥٩)، وأحمد (١٩٢٢٤) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما، و الطبراي (الكبير) (٢٣٩٢)

**١٢-وەفدی مەزحیج:**

ئەم وەفدە هاتنە مەدینە و بەڵێنی موسوڵمان بوونیاندا و بوونە موسوڵمان: عەبدولڕەحمانی جوهەنی ﷺ دەفەرمووێت: [کاتێك ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، دوو سوار لە دوورەوە دەرکەوتن کاتێك لە دوورەوە ئەوانی بینی فەرمووی: ((هەردووکیان لە کیندەن لەتیرەی موزحیجن)). تا هاتنە پێش تەماشا دەکەین دوو پیاون لە هۆزی موزحیج، یەکێکیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ نزیك بووەوە تا بەڵێنی موسوڵمان بوونی پێ بدات کاتێك دەستی پێغەمبەری خوای ﷺ گرت وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باشە ئەگەر یەکێك تۆ ببینێت و بە تۆ گەیشتبێت و تۆی بەڕاست زانیبێت و شوێنت کەوتبێت پاداشتی چی دەبێت؟ فەرمووی: ((پاداشتی توبا (واتە: بەهەشت) دەبێت)). ئەو کەسە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بەسەر دەستیدا هێناو و ڕۆیشت، پاشان ئەوی تریان هات دەستی پێغەمبەری خوای ﷺ گرت بۆ ئەوەی بەڵێنی پێ بدات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەر یەکێك بڕوات پێ بهێنێت و بەڕاستت بزانێت و شوێنت بکەوێت و تۆی نەبینیبێت ئایا چی بۆ هەیە؟ فەرمووی: ((توبا بۆ ئەومیە (واتە: مژدەی بەهەشت) پاشان توبا بۆ ئەوە پاشانیش توبا بۆ ئەوە)) ئینجا دەستی بەسەر دەستیدا هێناو ئەویش ڕۆیشت][١٢٣٩].

لە وەفدەکەدا پیاوێکی تێدابوو ناوی هانی کوڕی یەزیدی مەزحەجی بوو وە بە ئەبو حەکەم ناسرابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ناوەکەی گۆڕی: هانی کوڕی مەزحەجی ﷺ دەفەرمووێت: [لەگەڵ خزمەکانم چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وە خزمانم بە ناوی ئەبولحەکەمەوە بانگیان لێدەکردم، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بیست بانگی کردم و فەرمووی: ((إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَكَمُ، وَإِلَيْهِ الْحُكْمُ، فَلِمَ تُكْنَى أَبَا الْحَكَمِ؟)) واتە: ((خودا حەکەمەو بڕیاردەرە هەموو بڕیارەکانیش هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە ئایا بۆچی تۆ بەوناوەوە بانگ دەکرێیت؟)) وتم: خزمانم گەر ناکۆکیەکیان لەناودا ڕوویدایە [دەهاتنە لام] [وە منیش دادوەریم بۆ دەکردن و بڕیارم بۆ دەدان وە هەردوو لاش بە بڕیارەکەم ڕازی دەبوون. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئای ئەوە چەند باشە، ئایا تۆ منداڵت هەیە؟)) وتم: بەڵێ سێ کوڕم هەیە شورەیح و عەبدوڵڵا و

(١٢٣٩) أخرجه: أحمد (١٧٣٨٨) وقال محققوه: اسناده حسن، وابن أبي عاصم (الآحاد) (٢٥٧٨)، والبزار (٢٧٦٩) (الكشف)، و الطبراني (الكبير) (٢٧٤٢/٢٢) وقال الهيثمي في (المجمع) (١٨/١٠): اسناده حسن.

موسلیم. فەرمووی: ((کامیان گەورەیە؟)) وتم: شورەیح. فەرمووی: ((تۆ ناوت باوکی شورەیحە))، ئینجا دوعای بۆ خۆی و کوڕەکانی کرد. هەروەها گوێی لێ بوو پیاوێکی تریان بانگ دەکرد بە ناوی (عەبدول حەجەر) بانگی کرد و پێی فەرموو: ((تۆ ناوت چییە؟)) وتی عەبدولحەجەر. فەرمووی: ((نا تۆ ناوت عەبدوڵڵایە)). کاتێك وەفدەکە بەنیاز بوون بگەڕێنەوە وڵات و ناوچەکەیان، پێغەمبەری خوا ﷺ زەوییەکی پێدان لە ناوچەکەی خۆیاندا، ئەبو شورەیح وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکم پێ ڕابگەیەنە کە بە هۆیەوە بەهەشتم بۆ مسۆگەر ببێت، فەرمووی: ((عَلَيْكَ بِحُسْنِ الكَلَامِ] وَبَذْلِ السّلامِ وَإِطْعَامُ الطَعامِ))[١٢٤٠] واتە: (([قسەت با شیرین بێت] سڵاو لە هەمووان بکە و خواردن ببەخشە)).

## ١٣- هاتنی وەفدی بەنی موحاریب:

تاریقی کوڕی عەبدوڵڵا ؓ دەفەرموێت: [...[کاتێك ئیسلام شکۆمەند بوو] زۆربەی خەڵکی موسوڵمان بوون و کۆچیان کرد. ئێمە لە ناوچەی ڕەبزە چوینەدەر تا بچین شاری مەدینە لەوێ خورما بکڕین [و ئافرەتێکمان] لەگەڵ بوو [کاتێك گەیشتینە نزیك شاری مەدینە] و لە باخە خورماکانی نزیك بووینەوە وتمان: با کۆچ و بارەکەمان لە نزیك مەدینە بخەین و جلەکانمان بگۆڕین. ئیتر لەو نزیکانە لاماندا و دانیشتبووین، پیاوێك دوو جلی سپی لەبەردابوو هاتە لامان و سڵاوی لێکردین و وتی: ((ئێوە لە کوێوە هاتونەتە ئێرە؟)) وتمان: لە ناوچەی ڕەبزەوە] وتی: ((ئەی بۆ چی هاتوون؟)) وتمان دەمانەوێت بچینە ناو شاری مەدینە. وتی: ((چ پێویستیەکتان بەم شارەیە؟)).

وتمان: دەمانەوێت هەندێك خورما بکڕین. ئێمە ئافرەتێکمان لەگەڵ بوو خاوەنی وشترە سورێکی لغاوکراو بوو ئەو پیاوە وتی: ((ئەو وشترەتان دەفرۆشن؟)) [وتمان: بەڵێ. وتی: ((بەچەند؟)) وتمان بە ئەوەندەو ئەوەندە ڕبە خورما] وتی: ((باشە بەو نرخە دەمەوێت)) ئەو پیاوە هیچ نرخی وشترەکەی پێ نەشکاندین و لغاوی

---

(١٢٤٠) أخرجه: البخاري (الأدب المفرد) (٨١)، وأبوداود (٤٩٥٥)، والنسائي (٢٦٦/٨) (رقم ٥٣٨٧)، والحاكم (١٧٩/٤)، والطبراني (الكبير) (٤٦٤/٢٢)، وابن حبان (٥٠٤) وقال محققه: اسناده حيّد، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الأدب المفرد) (٦٢٣)، و (الصحيحة) (١٩٣٩٩)، و (الارواء) (٢٦١٥)، و(المشكاة) (٤٧٦٦) وحسنه الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (١١٩٧).

وشترەکەی گرت و لەگەڵ خۆی بردی. کاتێك بەهۆی باخە خورماکانەوە لێمان دیارنەما [لە نێوان خۆماندا لۆمە و سەرزەنشتی خۆمان دەکرد] وتمان: ئەوە چیمان کرد؟ سوێند بە خوا وشترەکەمان فرۆشت بە کەسێك کە نایناسین و نرخەکەشیمان وەرنەگرت [ئافرەتەکەی کە] لەگەڵماندا بوو وتی: [لۆمەی یەکتری مەکەن ئەو پیاوە ڕوخساری لەیەکێك ناچێت [کە غەدرتان لێبکات] وبە فێڵ سامانەکەتان بەرێت] سوێند بە خوا ئەو پیاوە رووخساری سپی بوو وەك مانگ لەشەوی چواردە، من دڵنیاتان دەکەم کە نرخەکەتان دەست دەکەوێت. [کاتێك ئێوارەمان بەسەرهات، پیاوێك هاتە لامان و سەلامی لێکردین و وتی: من نێرراوی پێغەمبەری خوام ﷺ پێتان دەفەرموێت: ئەو خورمایە لێی بخۆن تا تێر دەبن وە لێی بپێون بە زیادەوە، ئێمەش خورمامان خوارد تا تەواو تێر بووین وە بە زیادەوە پێوامان [لە جیاتی نرخی وشترەکەمان].

پاشان سبەی چووینە ناو شاری مەدینە، وە چووینە ناو مزگەوتەکەیەوە و تەماشامان کرد ئەو پیاوەی وشترەکەی لێکڕین [ئەوە پێغەمبەری خودایە ﷺ] و لەسەر مینبەر وەستاوە وتار دەدات بۆ خەڵکی، بە بەشێکی وتارەکەیدا ڕاگەیشتین کە دەی فەرموو: ((تَصَدَّقُوا فَإِنَّ الصَّدَقَةَ خَيْرٌ لَكُمْ، الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، [يَدُ الْمُعْطِي يَدُ الْعُلْيا] [أُمَّكَ وَأَبَاكَ وَأُخْتَكَ وَأَخَاكَ وَأَدْنَاكَ أَدْنَاكَ)) واتە: ((ببەخشن چونکە بەخشین چاکە بۆ ئێوە، دەستی بەخشندە باشترە لە دەستی وەرگرو نزم [سەرەتا لە خێزانەکەتەوە دەست پێ بکە].

پاشان دایك و باوکت و خوشك و برات و نزیك بەنزیکت)) ئینجا پیاوێك لەناو کەسانی بەنی یەربوع دا هاتە ژوورەوە [پیاوێکی ئەنساری] هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ [ئەوانە بەنو سەعلەبەی کوڕی یەربوعن فلأنە کەسیان لە ئێمە کوشتووە لە سەردەمی نەفامی پێش ئیسلامدا تۆڵەمان بۆ بکەرەوە لێی، پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی ئەوەندە بەرز کردەوە تا ژێر باڵیم بینی و فەرمووی: ((أَلَا لَا تَجْنِي أُمٌّ عَلَى وَلَدٍ. أَلَا لَا تَجْنِي أُمٌّ عَلَى وَلَدٍ))[١٢٤١] واتە: ((ئاگاداربن تاوانی دایك لە ئەستۆی

(١٢٤١) أخرجه: ابن أبي شيبة (المصنف) (٣٧٧٢٠)، والبخاري (خلق افعال العباد) (١٤٩)، والنسائي (٢٣١١)، وابن خزيمة (١٥٩)، وابن ماجة (٢٦٧٠)، وابن حبان (٦٥٦٢) وقال محققه: اسناده صحيح، والبيهقي (الكبرى) (٧٦/١) وفي (الدلائل) رقم: (٢١٠٤) وقال محققه: اسناده صحيح، واللالكاني (١٤١٣)، والطبراني (الكبير) (٨١٧٥) وصححه البوصيري في (مختصر الاتحاف) (٤٧٨٨)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الموارد) (١٤٠١، ١٦٨٣)، و (الارواء) (٨٣٤) و(مشكلة

منداڵ نییە و هەڵی ناگرێت، ئاگاداربن تاوانی دایك لە ئەستۆی منداڵ نییە و هەڵی ناگرێت)).

**١٤-هاتنی وەفدی دەوس:**

**توفەیلەی کوڕی عمروی دەوسی لە مەککە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و موسوڵمان بوو پاشان گەڕایەوە ناو هۆزەکەی خۆی و بانگی کردن بۆ ئیسلام بەڵام ئەوان موسوڵمان نەبوون. دواتر لە مەدینە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای موسوڵمان بوونی بۆ کردن و هەموو موسوڵمان بوون و هاتنە شاری مەدینە لە کاتی غەزای خەیبەر ئەبو هورەیرەشیان لەناودا بوو: توفیل ﷺ دەڵێت: [...پاشان هۆزی دەوسم بانگکرد بۆ ئیسلام، لە بەدەنگەوە هاتنم دواکەوتن. منیش چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ زیناکاریی زاڵبووە بەسەر دەوسدا و بەهۆیەوە موسوڵمان نابن دوعایان لێ بکە. لە گێڕانەوەیەکی تردا: [وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هۆزی دەوس سەرپێچی دەکەن و موسوڵمان نابن دوعایان لێ بکە، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕووی کردە قیبلە و هەردوو دەستی بەرزکردەوە و فەرمووی: (([اللَّهُمَّ اهْدِ دَوْسًا وَائْتِ بِهِمْ] ثَلَاثًا))[١٢٤٢] واتە: ((خودایە دەوس هیدایەت بدەو بیان هێنەرە ئێرە (ئەوەی سێ جار دووبارە کردەوە)])). پاشان بە منی فەرموو: ((ارْجِعْ إِلَى قَوْمِكَ فَادْعُهُمْ إِلَى اللهِ وَارْفُقْ بِهِمْ)) واتە: ((بگەڕێوە بۆ ناو قەومەکەت بانگیان بکە بۆ لای خودا و نەرمبە لەگەڵیاندا)) منیش گەڕامەوە ناویان و بەردەوام بانگم دەکردن بۆ لای خودا. دواتر خۆم و ئەوانەی لە قەومەکەم موسوڵمان بوون هەموومان بەیەکەوە چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەوکاتەدا ئەو لە غەزای خەیبەر بوو. ئێمە حەفتا یان هەشتا ماڵ دەبووین لە مەدینە لاماندا و پاشان خۆمان گەیاندە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەیبەر وە ئێمەشی لەگەڵ موسوڵمانان بەشدار کرد لەو دەست کەوتانەی ئەوێ...][١٢٤٣]. یەکێك لەوانەی لەگەڵماندا هاتبوو لە شاری مەدینە نەخۆش کەوت و بێ ئارام بوو شادەماری دەستی خۆی بڕی و خوێنەکەی نەگیرسایەوە و مرد.**

---

الفقر) (٤٤).

(١٢٤٢) أخرجه: البخاري (٦٠٣٤).

(١٢٤٣) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٠٩٣)، و الأصفهاني في (الدلائل) (٢١٢/١).

جابیر ﷺ دەفەرموێت: [...یەکێك لەوانەی لەگەڵ توفەیل کۆچی کردبوو بۆ شاری مەدینە پیاوێکی خزمیان بوو. لە دوای نیشتەجیبوونیان لە مەدینە ئەو پیاوە نەخۆش کەوت و بێ ئارام بوو چەقۆیەکی هەڵگرت و شادەماری دەستی خۆی بڕی و خوێنەکەی بەربوو نەوەستایەوە بە هۆیەوە مرد. دواتر توفەیل لەخەویدا بینی سەرو شێوەی زۆر باش بوو بەڵام هەردوو دەستی داپۆشی بوو، پێی وت: ئەوە بۆ دەبینم هەردوو دەستت داپۆشیوە؟ وتی: پێم وتراوە! ئەو جێگەیەی خۆت تێکت داوە چاکی ناکەینەوە؟ توفەیل ﷺ ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە ئەویش (دوعای کرد) و فەرمووی: ((خودایە بۆ هەردوو دەستیشی خۆش ببە))[١٢٤٤]. ئەبو هورەیرە ﷺ کۆیلەیەکی هەبوو ڕای کردبوو لەوێ دۆزیەوە و ئازادی کرد: ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: [... کویلەیەکم هەبوو لە ڕێگادا لێم یاخی بوو ڕای کرد، کاتێك هاتمە شاری مەدینە و بەڵێنی موسوڵمان بوونم پێ دا، تەماشا دەکەم ئەو لەوێیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەبو هورەیرە ئەوە کۆیلەکەتە)) منیش وتم: ئەوم لە پێناوی خوادا ئازاد کردووە][١٢٤٥].

### ١٥- وەفدی داریەکان:

ئەوان (دە) کەس بوون و تەمیمی داریان لەگەڵ دا بوو[١٢٤٦]. چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و موسوڵمان بوون و بەسەرهاتێکیان هەبوو بۆیان گێڕایەوە. فاتمەی کچی قەیس ﷺ دەفەرموێت: [گوێم لێبوو بانگکارەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی بانگ دەکرد بۆ کۆبوونەوە، منیش دەرچووم بەرەو مزگەوت وە لە ڕیزی ژناندا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژمان کرد[١٢٤٧] لە دوای پیاوانەوە کاتێك نوێژەکە تەواو بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر مینبەر و پێ دەکەنی [بەڵام خەڵکی تۆقی بوون هەندێکیان بە پێوە بوون وە هەندێکیان دانیشتبوون چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها بۆ وتاری جومعە دەچووە سەر مینبەرەکەی، پێغەمبەری خوا ﷺ

(١٢٤٤) أخرجه: مسلم (٦١٦)، وأحمد (٣٧٠/١٣)، والحاكم (٧٦/٤) وصححه ووافقه الذهبي.

(١٢٤٥) أخرجه: البخاري (٤١٣٢) و (٤٣٩٣).

(١٢٤٦) أورده: الواقدي (المغازي) (٣٧٦/١) وابن سعد (الطبقات) (٣٤٣/١).

(١٢٤٧) في رواية: [صلاة العشاء] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٩٢٢/٢٤) وفي رواية: (صلاة الهاجرة) أخرجه: أحمد (٢٧١٠١) وقال محققوه: حديث صحيح.

بەدەستی ئیشارەتی بۆ کردن: دانیشن] و فەرمووی: ((هەموو یەکێك با لە شوێنی نوێژەکەی خۆی بمێنێتەوە)) پاشان سوپاس و ستایش خودای کردو فەرمووی: ((أُنْذِرُكُمُ الدَّجَّالَ، فَإِنَّهُ لَمْ يَكُنْ نَبِيٌّ قَبْلِي إِلَّا وَقَدْ أَنْذَرَهُ أُمَّتَهُ، وَهُوَ كَائِنٌ فِيكُمْ أَيَّتُهَا الْأُمَّةُ، إِنَّهُ لَا نَبِيَّ بَعْدِي وَلَا أُمَّةَ بَعْدَكُمْ))(١٢٤٨) واتە: ((ئاگادارتان دەکەمەوە لە دەجال چونکە هەموو یەکێك لە پێغەمبەرانی پێش من ئوممەتەکەیان لێ ئاگادار کردۆتەوە، وە دەجالیش لە ئێوەدا پەیدا دەبێت ئەی ئوممەت چونکە هیچ پێغەمبەرێك لە دوای منەوە نایەت و هیچ ئوممەتێکیش لە دوای ئێوە وە نییە))]. پاشان فەرمووی: ((ئایا دەزانن بۆ ئێوەم کۆکردۆتەوە؟)) وتیان: خودا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن. فەرمووی: ((سوێند بە خوا من ئێوەم بۆ خۆشی و ناخۆشییەك کۆنەکردۆتەوە، بەڵام ئێوەم کۆکردۆتەوە چونکە تەمیمی داری پیاوێکی گاوربوو هات و بەڵێنیدا موسوڵمان بوو وە بەسەرهاتێکی بۆ گێڕامەوە هاوشێوەیە لەگەڵ ئەوەی من بۆم باسدەکردن سەبارەت بە مەسیحی دەجال [بە هۆیەوە دڵخۆش بووم و پێم خۆشبوو بۆتانی بگێڕمەوە] بۆی گێڕامەوە ئەو لەگەڵ سی پیاوی [ئامۆزای خۆی] لەکەشتیەکدا بوون لە [دەریای شام](١٢٤٩) هەموو لە هۆزی لەخم و جوزام بوون [لە خەڵکی فەلەستین](١٢٥٠) [ئەوان هەموو بازرگان بوون](١٢٥١) لە دەریادا [زریانێکی توندیان تووش هات] وە یەك مانگ شەپۆلی دەریا بەم لاو لادا بردنی تا دواجار لە کاتی [ڕۆژ ئاوابووندا] نزیك بوونەوە لە دوورگەیەك [ناسراو بوو لە لای ئەوان] وە کەشتیەکەمان شکاو هەریەکە بە تەختەیەکی کەشتیەکەوە خۆیان گرتبوو](١٢٥٢).

دواتر ئەوان دابەزینە دوورگەکە [بۆ پەیداکردنی ئاوی خواردنەوە](١٢٥٣) [و بە دوورگەکەدا دەڕۆیشتن تا پرسیاری ڕێگەش بکەن] (لەوێدا) گیانلەبەرێکیان پێ گەیشت. لە گێڕانەوەیەکدا [مرۆڤێکیان پێ گەیشت](١٢٥٤). لە گێڕانەوەیەکی تردا:

(١٢٤٨) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٩٥٩/٢٤)، وابن حبان (٦٧٨٨) وقال محققه: حديث صحيح.

(١٢٤٩) أخرجه: ابن حبان (٦٧٨٨) وقال محققه: حديث صحيح.

(١٢٥٠) أخرجه: ابن حبان (٦٧٨٩) وقال محققه: حديث صحيح.

(١٢٥١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٩٦٧/٢٤).

(١٢٥٢) أخرجه: مسلم (١٢٢/٢٩٤٢).

(١٢٥٣) أخرجه: مسلم (١٢١/٢٩٤٢)، والبيهقي (الدلائل) (٢١٣٥).

(١٢٥٤) أخرجه: الطبراني (١٩٦٧/٢٤).

[ئافرەتێکی ڕەش پێستی قژبژی ناشرینیان پێ گەیشت][١٢٥٥] قژی زۆر بوو [بە هەموو لایەکدا] بڵاوی کردبووە وە [وە قژی بە دوای خۆیدا دەخشا][١٢٥٦] پێش و دوای دیار نەبوو [نەت دەزانی ئایا ئەوە (لە ڕاستیدا) پیاوە یاخود ئافرەتە بە هۆی ئەو هەموو توك و قژە زۆرەیەوە][١٢٥٧] [پێشتر شتی وایان لەوە گەورەتر نەبینی بوو وە هیچ جل وبەرگێکی مرۆڤی لەبەردا نەبوو وە هەموو لاشەی بە قژ داپۆشرا بوو] [ئەوان سڵاویان لێکرد و ئەویش وەڵامی دانەوە][١٢٥٨]. پێیان وت: ئەی هاوار تۆ کێیت؟ [ئەی گیانلەبەر؟ ئەویش بە ویستی خودا بە زمانێکی پاراو و تەواو][١٢٥٩] وتی: من جەساسەم؟ وتیان: جەساسە کێیە؟ [و پرسیاری ڕێگەیان لێکرد [ئەو وتی: پرسیارتان لێناکەم و پێشتان ناڵێم] [گەر ئێوە پێتان خۆشە پرسیاری ڕێگە لە کەسێك بکەن وەڵامتان بداتەوە و قسەکردنی لەگەڵتان بەلاوە خۆشبێت، بڕۆن بۆ ئەو کۆشکە][١٢٦٠] چونکە لەو کۆشك و خانەقایە پیاوێك هەیە ئیتر [خانەقایەکی بۆ دەست نیشان کرد لە دوورەوە] [لە ئەوسەری دورگەکە] وتی: ئەو تامەزرۆی هەواڵی ئێوەیە [پێی خۆشە وەڵامتان بداتەوە و پرسیارتان لێبکات][١٢٦١].

دەڵێن: کاتێك ئەو ناوی پیاوێکی باسکرد هەموو ترساین کە ئەم توکنە شەیتان بێت... ئیتر بە پەلە ڕۆیشتین [تاگەیشتینە] [ئەوپەڕی دوورگەکە] و چوینە ناو ئەو کۆشك و خانەقایەوە، تەماشادەکەین [پیاوێکی][١٢٦٢] [بەساڵاچووی][١٢٦٣] لێیە [قژی بە دوایدا دەخشا] [چاوی ڕاستی نەبوو، دەت وت پەڵەیەکە یان بەڵغەمێکە بە دیوارێکی گەجدا][١٢٦٤]، مرۆڤی گەورەی بەو جۆرەمان نەدیبوو [بە زنجیرێکی بە هێز زۆرباش بەسترابووەوە] [بە کۆڵەکەیەکەوە] [بازی دەدا لە نێوان ئەرزو ئاسماندا][١٢٦٥] هەردوو

(١٢٥٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٩٦٢/٢٤).

(١٢٥٦) أخرجه: ابوداود (٤٣٢٥).

(١٢٥٧) أخرجه: أحمد (٢٧١٠٢) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٢٥٨) أخرجه: أحمد (٢٧٣٤٩) وقال محققوه: حديث صحيح.

(١٢٥٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٩٥٧/٢٤).

(١٢٦٠) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٩٦٦/٢٤).

(١٢٦١) أخرجه: أحمد (٢٧١٠٢) وقال محققوه: اسناده على شرط مسلم.

(١٢٦٢) أخرجه: ابو داود (٤٣٢٥) وهو حديث صحيح.

(١٢٦٣) أخرجه: الترمذي (٢٢٥٣) وهو حديث صحيح.

(١٢٦٤) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٩٥٧/٢٤)، وابن حبان (٦٧٨٨) وقال محققه: حديث صحيح.

(١٢٦٥) أخرجه: ابوداود (٤٣٢٥).

دەستی بە گەردنیەوە بەسترابوو [هەردوو قاچی] لە نێوان قولەپێی و ئەژنۆیدا [بەسرابووەوە بە ئاسنێکی گەورە و قورسەوە...][١٢٦٦] وتمان: ئەی هاوار تۆ کێیت؟ [سەلاممان لێکرد و وەڵامی داینەوە] [وپرسیاری ڕێگەمان لێکرد، ئەویش وتی: من وەڵامتان نادەمەوە هەتا ئێوە وەڵامی پرسیارەکانم نەدەنەوە، وتمان: پرسیارەکانت چیە؟][١٢٦٧] (وتی): پێم بڵێن [ئێوە کێن؟ و لە کوێوە هاتوون؟ وتمان: خەڵکی شامین [...لە فەلەستین]...][١٢٦٨]. ئێمە کەسانێکی عەرەبین [وتی: ئەی چی ئێوەی هێناوەتە ئەم دوورگەیە؟ لەوکاتەی من هاتوومەتە ئێرە هیچ مرۆڤێك نەگەیشتۆتە ئەم دوورگەیە][١٢٦٩] [وتمان: سواری کەشتییەك بووین لەو کاتەدا دەریا بووە تاریك و لێڵاو زریان یەك مانگ شەپۆلی دەریا بەملاولادا بردینی پاشان لەم دوورگەیەی تۆ گیرساینەوەو سواری بەلەم بووین [یان تەختە] وە هاتینە ناو دوورگەکەوە گیان لەبەرێکی توکنی قژزۆرمان بینی پێش و پاشی نەدەزانرا بەهۆی زۆری مووەکانیەوە وتمان: ئەی هاوار، تۆ کێیت؟ وتی: من جەساسەم، وتمان: جەساسە کێیە؟ وتی: بڕۆن پیاوێك لەو کۆشك و خانەقایەدایە تامەزرۆی هەواڵەکانی ئێوەیە. زۆر تۆقین و لەوە ترساین کە شەیتان بێت. وتی: هەواڵی دارخورماکانی بێستانی [نێوان ئوردن و فەلەستینم پێ بدەن][١٢٧٠].

وتمان: لەبارەی چییەوە دەتەوێت هەواڵت بدەینێ؟ وتی: پرسیاری دار خورماکانتان لێدەکەم ئایا خورما دەگرن؟ وتمان: بەڵێ [هەموو ساڵێك خورما دەگرێت][١٢٧١] وتی: نزیکە هیچ نەگرن. وتی: پێم بڵێن هەواڵی دەریاچەکەی تەبریە چییە؟ وتمان: پرسیار لە چ ڕوویەکەوە دەکەیت؟ وتی: ئایا ئاوی تێدایە؟ وتمان: ئاوی زۆرە [لێوارەکانی پڕ دەبن لە ئاو] وتی: نزیکە هیچ ئاوێکی تێدا نەمێنێت. وتی: پێم بڵێن کانیاوەکانی زوعەر؟ وتمان: پرسیار لە چ بارمیەکەوە دەکەیت؟ وتی: ئایا ئەو کانیاوە ئاوی تێدایە و خەڵکی بەو ئاوە کشتوکاڵ دەکەن؟ وتمان: بەڵێ ئاوی

(١٢٦٦) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٩٥٦/٢٤).
(١٢٦٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٩٦٦/٢٤).
(١٢٦٨) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٩٦٠/٢٤).
(١٢٦٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٩٥٧/٢٤).
(١٢٧٠) أخرجه: الترمذي (٢٢٥٣) وهو حديث صحيح.
(١٢٧١) أخرجه: أحمد (٢٧١٠١) وقال محققوه: حديث صحيح.

زۆری تێدایە [خەڵکی لێی دەخۆنەوە و کشتوکاڵەکانیانی پێ ئاو دەدەن] وتی: پێم بڵێن پێغەمبەری نەخوێندەوار چی کرد؟ [ئایا ئەو پێغەمبەرە پەیدا بووە لە خاکی تەیماء؟][١٢٧٢]. وتمان: مەککەی جێهێشتووە لە (یثرب) (واتە: مەدینە) جێنشین بووە.

وتی: ئایا عەرەب لەگەڵی بەشەڕ هاتووە؟ وتمان: بەڵێ. وتی: ئەی ئەو چ کاردانەوەیەکی هەبوو لە بەرامبەریان؟ (وتمان): سەرکەوتووە بەسەر عەرەبەکانی چواردەوریدا و ئەوان گوێڕایەڵی بوون [و ئێستا هەموو یەك خوداو یەك ئاینیان هەیە][١٢٧٣]. وتی: بۆ ئەوە ڕووی داوە؟! وتمان: بەڵێ. [وتی: پێم بڵێن خەڵکی چۆن بەدەم بانگەوازەکەیەوە دەچن؟ وتمان: هەموو بە پەلەن بۆ چوونە ناو ئاینەکەیەوە][١٢٧٤] [وتی: ئایا ئەمڕۆ عەرەبەکان یەکڕیزن و یەك خوا دەپەرستن و پەیڕەوی یەك ئاین دەکەن؟ وتمان: بەڵێ][١٢٧٥] [وتی: ئەو ڕاستگۆیە شوێنی بکەون[١٢٧٦]] [گەر ئەوان بیانزانیایە] شوێنکەوتن و مل کەچ بوونیان بۆ ئەو باشترە بۆ ئەوان. [وتی: ئایا ئەو بەسەر فارسەکاندا زاڵبووە؟ وتمان: نەخێر هێشتا بەسەریاندا زاڵ نەبووە. وتی: لەمەو دوا بەسەریاندا زاڵ دەبێت][١٢٧٧] [وتی: ئێوە ماڵەکانتان لە چی دروست دەکەن؟ وتمان لە خوری و موو دروستیان دەکەین و ژنە کانمان دەیڕێسن. ئینجا بە دەستی کێشای بە ڕانیدا وتی: ئای دووره ڕابردوو بگەڕێتەوە][١٢٧٨] [یەك بازدی دا [نزیکبوو دەرباز بێت][١٢٧٩] هەتا وا گومانمان برد[١٢٨٠] [دەرچێت لە کۆتەکان] وتی: من مەسیحی [دەجالم] من نزیکە ڕێگەم بدرێت و بچمەدەر و بەزەویدا بگەڕێم هیچ لادێیەك نامێنێت من [بەم دوو قاچەمەوە دەچمە ناویەوە][١٢٨١].

لە چل ڕۆژدا جگە لە شاری مەککە و تەیبە(مەدینە) [من توانام بەسەر ئەوێدا

(١٢٧٢) أخرجه: ابن حبان (٦٧٨٨) وقال محققه: حديث صحيح.

(١٢٧٣) أخرجه: ابن ماجة (٤٠٧٤) وهو حديث صحيح.

(١٢٧٤) أخرجه: الترمذي (٢٢٥٣).

(١٢٧٥) أخرجه: أحمد (٢٧١٠١) وقال محققوه: حديث صحيح.

(١٢٧٦) أخرجه: ابن حبان (٦٧٨٧).

(١٢٧٧) أخرجه: أحمد (٢٧١٠٢) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٢٧٨) أخرجه: ابن حبان (٦٧٨٨) وقال محققه: حديث صحيح.

(١٢٧٩) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢١٣٥) وقال محققه: صحيح.

(١٢٨٠) أخرجه: أحمد (٢٧١٠٢) وقال محققوه: اسناده على شرط مسلم.

(١٢٨١) أخرجه: ابن ماجة (١٤٠٧٤) وهو حديث صحيح.

نییە، هەرکات بمەوێت لە هەر ڕێگەیەکەوە بچمە ناو یەکێك لەو دوو شارەوە دەبینم فریشتەیەك بە شمشێرێکی ئامادەوە لە ڕوومدا وەستاوە و منی لێ دوور دەخاتەوە وە لەسەر هەموو ڕێگاو بەرزایەکانی فریشتە هەن دەیان پارێزن.

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بەدارەکەی دەستی دای بە مینبەرەکەیدا و فەرمووی: ((ابْشِرُوا يا مَعْشَرَ المُسْلِمِيْنَ [تِلكَ مَكة وَهَذهِ طَيْبَةٌ حَرَّمَهَا اللهُ كَمَا حَرَّمَ إِبْرَاهِيمُ مَكَّةَ][١٢٨٢]لَا يَدْخُلُهَا الدَّجَّالُ[١٢٨٣])) واتە: (مژدەتان لێبێت ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان [ئەوێ شاری مەککەیە و ئێرەش تەیبەیە و خودا بە حەرەم دایناوە وەك چۆن لە سەر داوای ئیبراهیم مەککەی بە حەرەم داناوە]. [وە هەرگیز دەجال نایەتە ئێرە]. ئێرە تەیبەیە، ئێرە تەیبەیە (واتە: مەدینە) خەڵکینە ئایا من پێشتر ئەوەم بۆ باس کردن؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: ((ئەم بەسەرهاتەم بەلاوە باشبوو چونکە هاوشێوەی ئەوە بوو کەمن پێشتر بۆم باسکردبوون سەبارەت بە مەککە و مەدینە. و ئێستا... ئەو لەلای دەریای شام یان یەمەن یان ڕۆژ هەڵاتەوەیە][١٢٨٤] و [...(نزیك) عێراق لە شارێك پەیدا دەبێت ناوی ئەسفەهانەو لەیەکێك لە لادێکانی کەناوی ڕستقەبازە کاتێك پەیدادەبێت حەفتا هەزار لە پێشی لەشکرەکەیەوە دەڕۆن...)[١٢٨٥].

لە گێڕانەوەیەکدا: [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((تا ئێرە دڵخۆشم، سێ جار دووبارەی کردەوە کە خودا حەرەمەکەم (واتە: مەدینە)ی قەدەغە کردووە لە دەجال بچێتە ناویەوە... سوێند بەو خودایەی کە هیچ خودایەکی تر نییە جگە لەو لە هەموو ڕێگەیەکی تەسك و فراوانی چیا و دەشتەکانی مەدینە [دوو فریشتە بە شمشێری ئامادەوە][١٢٨٦] وەستاون تا ڕۆژی کۆتایی (دەی پارێزن) و دەجال ناتوانێت بدات بەسەر خەڵکی ناو ئەو شارەداو بچێتە ناویەوە....][١٢٨٧].

---

(١٢٨٢) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٩٥٩/٢٤).

(١٢٨٣) أخرجه: أحمد (٢٧١٠٢) وقال محققوه: اسناه صحيح على شرط مسلم.

(١٢٨٤) أخرجه: مسلم (١١٩/٢٩٤٢)، وأبو داود (٤٣٢٥)، والترمذي (٢٢٥٣)، وأحمد (٢٧١٠١،٢٧١٠٢) وقال محققوه صحيح، وابن ماجة (٤٠٧٤)، و الطيالسي (١٦٤٦)، وابن منده (الايمان) (٥٨)، النسائي (الكبرى) (٤٢٥٨)، والطبراني (الكبير) (١٩٥٨/٢٤) و (الطوال) (٤٧)، وابن حبان (٦٧٨٨)، واللفظ لمسلم و الزيادات لأحمد وابوداود و الترمذي وابن ماجة و ابن حبان.

(١٢٨٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٩٥٧/٢٤).

(١٢٨٦) أخرجه: ابن حبان (٦٧٨٨) وقال محققه: حديث صحيح.

(١٢٨٧) أخرجه: أحمد (٢٧١٠) وقال محققوه: صحيح.

## ١٦- وەفدی دەیلەم:

فەیروزی دەیلەمی ﷺ دەفەرموێت: [ئێمە هەندێکمان موسوڵمان بووین وە بە وەفدێك چوینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ... وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە ئەوانەین کە دەمانناسیت وە لەو جێگەیەوە هاتووین کە زانیوتە ئێمە موسوڵمان بووین ئایا کێ پشتیوانمانە؟ فەرمووی: ((خوداو پێغەمبەرەکەی)) وتمان: ئەوەمان بەسەو ئێمە ڕازین][1288]. وە فەیروز دەفەرموێت: [من موسوڵمان بووم و دوو ژنم هەبوو خوشکی یەکتر بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردم یەکێکیان تەڵاق بدەم و فەرمووی: ((طَلِّقْ أَيَّتَهُما شِئتَ))[1289] واتە: ((بە ویستی خۆت یەکێکیان تەڵاق بدە))]. هەروەها فەیروز ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە خاوەن ڕەزو مێوین و مەی قەدەغە کراوە ئایا ئێمە چی بکەین؟ فەرمووی: ((بیکەنە مێوژ)) وتم: ئەی چی لە مێوژەکە بکەین؟ فەرمووی: ((لە بەیانیاندا بیکەنە ناو ئاو و بیخوسێنن و لەگەڵ نانی ئێوارەدا بیخۆنەوە، یاخود ئێوارە بیکەنە ناو ئاو و بیخوسێنن لەگەڵ نانی بەیانیدا بیخۆنەوە)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا بیخوسێنین و لێی بگەڕێین تا خەست دەبێتەوە؟ فەرمووی: ((نەیکەنە ناو گۆزەو کولەکەوە بەڵکو بیکەنە ناو مەشکەوە و گەر گوشینەکەی دوا بکەوێت دەبێتە سرکە))][1290].

## ١٧- وەفدی بەنی کەلەفە:

بەنی کەلەفە تیرەیەکی بەنی تەمیمن[1291] هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و موسوڵمان بوون حەکەمی کوڕی حەزنی کەلەفی ﷺ دەفەرموێت: [ئێمە حەوت یان نۆ کەس بووین بە وەفد چوینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ... وتمان: ئەی

---

(١٢٨٨) أخرجه: أحمد (١٨٠٣٧) وقال محققوه: حديث صحيح، والدارمي (٢١٠٨)، وابو يعلى (٦٨٢٥) وقال محققه: اسناده صحيح، والطبراني (الكبير) (١٨٥١/١٨)، وصححه الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (١٠٧٥).

(١٢٨٩) أخرجه: أحمد (١٨٠٤١،١٨٠٤٠) وقال محققوه: اسناده محتمل التحسن، والترمذي (١١٢٩)، وابن ماجة (١٩٥١)، والدارقطني (١٧٤/٢)، الطبراني (الكبير) (١٨٤٣/١٨). وحسنه الشيخ الألباني في (الأرواء) (٣٣٤/٦) و (صحيح ابي داود) (١٩٤٠).

(١٢٩٠) أخرجه: أحمد (١٨٠٤٢) وقال محققوه: حديث صحيح، وابو داود (٣٧١٠)، والنسائي (٣٣٢/٨)، والدارمي (٢١٠٨)، والطبراني (الكبير) (٨٤٦/١٨) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٣١٥٤).

(١٢٩١) قاله البخاري كما نقله الحافظ في (الإصابة) (١٧٧٠).

پێغەمبەری خوا ﷺ هاتوینەتە سەردانت دوعای خێرمان بۆ بکە. [ئەویش دوعای خێری بۆ کردین و فەرمانی کرد جێگەی حەوانەوەمان بۆ دابین کرا لەگەڵ هەندێك خورمادا] ئەو کاتە خورما کەم بوو چەند ڕۆژێك لە [خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ماینەوە و جومعەمان لە خزمەتیدا کرد لەو ڕۆژەدا هەستا بە پێوە وتاری دا گۆچانێك یان کەوانێکی بە دەستەوە بوو، سوپاس و ستایشی خودای گەورەی کرد و چەند وشەیەکی کورت و شیرین و پیرۆزی فەرموو پاشان فەرمووی: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ لَنْ تَفْعَلُوا، وَلَنْ تُطِيقُوا كُلَّ مَا أُمِرْتُمْ بِهِ، وَلَكِنْ سَدِّدُوا وَأَبْشِرُوا))[١٢٩٢] واتە: ((ئەی خەڵکینە ئێوە ناتوانن هەموو ئەوانەی فەرمانتان پێکراوە جێ بەجێی بکەن، بەڵام کارەکانتان بارێك بێت لەگەڵ ئاینەکەتاندا و دڵخۆش بن)).

## ١٨- وەفدی بەنی حاریسی کوڕی کەعب:

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [لە ساڵی دەی کۆچیدا لە مانگی ڕەبیعول ئاخردا یان جەمادی یەکەمدا پێغەمبەری خوا ﷺ خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ لای بەنوحاریسی کوڕی کەعب لە نەجران و فەرمانی پێکرد سی ڕۆژ بانگیان بکات بۆ هاتنە ناو ئیسلام گەر قایل نەبوون ئەو کاتە لەگەڵیاندا بە جەنگ بێت. خالید بەڕێکەوت تا گەیشتە ناوچەکەیان و چەکدارانی بە هەموو لایەکدا بڵاوکردەوە بۆ بانگەواز کردنیان بۆ ئیسلام و پێیان دەوتن: ئەی خەڵکینە موسوڵمان ببن سەلامەت دەبن. خەڵکیش هەموو هاتنە ناو ئیسلام و موسوڵمان بوون، خالید لەوێ لە ناویاندا مایەوە وە کتێبەکەی خوداو سونەتەکانی پێغەمبەری خوای ﷺ پێ ڕادەگەیاندن... دواتر خالید لەگەڵ وەفدێکی بەنی حاریس گەڕانەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ][١٢٩٣].

عیسامی کوڕی بەشیر لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: [من لە وەفدەکەی بەنی حاریسدا بووم، چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سڵاوم لێکرد و فەرمووی: ((علیکم سەلام و پێشوازیت لێبێت تۆ لە کوێوە هاتوویت؟)) وتم: بە دایك و باوکمە

---

(١٢٩٢) أخرجه: أحمد (١٧٨٥٦) وقال محققوه: اسناده قوي، وابودود (١٠٩٦)، وابو يعلى (٦٨٢٦) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن خزيمة (١٤٥٢)، وحسن اسناده الحافظ في (التلخص) (٦٥/٢)، والشيخ الألباني في (الارواء) (٦١٦)، و (صحيح أبي داود) (٩٧١) والشيخ مقبل (الصحيح المسند) (٣٢٣). واللفظ لابي داود و الزيادة لأحمد.

(١٢٩٣) أخرجه: ابن هيشام (السيرة (١١٠٧)، والطبري (التاريخ (١٢٦/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٤١١/٥).

فیدات بین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من بەنی حاریس بە وەفد ناردوومیانەتە خزمەتت و موسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاندووە. فەرمووی: ((...ناوت چییە؟)) وتم: ناوم ئەکبەرە. فەرمووی: ((تۆ ناوت بەشیرە (واتە: مژدەدەر). ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی گۆڕیم بۆ بەشیر][١٢٩٤].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [لە دوای گەڕانەوەی وەفدەکەیان پێغەمبەری خوا ﷺ عەمری کوڕی حەزمی نارد تا ئاینیان تێ بگەیەنێت و سونەتەکانیان فێربکات لەگەڵ دروشمە کانی ئیسلام و زەکاتەکانیان لێ کۆبکاتەوە هەروەها هەندێ فەرمان و ئامۆژگاریشی بۆ نوسی بوو...][١٢٩٥].

عەمری کوڕی حەزم ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی بۆ خەڵکی یەمەن نوسی فەرزەکان و میراتەکان و سونەتەکان و ڕادەی پارەی خوێن و بریندار کردنەکانی تیا نوسیبوو عەمر نامەکەی لەگەڵ خۆی برد و خوێندیەوە بۆ خەڵکی یەمەن و ئەمەش دەقەکەی بوو: بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

لە موحەممەدی پێغەمبەری خوادا وە بۆ شورحبیلی کوڕی عەبدکولال وە حاریسی کوڕی عەبدکولال و نوعەیمی کوڕی عەبدکولال وە قیلی زوروعەین و مەعافیرو هەمەدان. نێردراوەکەتان گەڕایەوە. پێویستە پێنج یەکی دەستکەوتەکانتان بدەن لەگەڵ دەیەکی کوشتوکاڵەکانتان کە بە ئاوی ئاسمان ئاو دەدرێت... وە لە هەموو چل دینارێك پێویستە دینارێك بدەن، زەکات بە موحەممەد و بنەماڵەکەی دروست نییە و ناشێت بەڵکو زەکات خاوەن پارەکان بەهۆیانەوە پارەکانیان خاوێن دەکەنەوە دەیبەخشنە هەژارە بڕوادارەکان یاخود لە پێناوی خودادا (واتە: جیهاد و غەزا). هەر کێڵگەیەك دەیەکی بەرهەمەکەی بدرێت بە زەکات ئەوکات زەکات نییە لە کۆیلەو کەلوپەلەکانی کێڵگەکەدا یان کرێکارەکانی.

(١٢٩٤) أخرجه: النسائي (الكبرى) (١٠١٤٥)، وفي (عمل اليوم) (٣١٣) وقال محققه:حسن، والحاكم (٣٠٦/٤) وصححه ووافقه الذهبي، وابن السني (عمل اليوم والليلة) (١٨٩) وقال محققه: صحيح.

(١٢٩٥) أخرجه: ابن هيشام (السيرة) (١١٣٧) بدون اسنادٍ، ونقله عنه: ابن طولون في (اعلام السائلين) (ص:١٣٨)، السيهلي (الروض (٤٢١/٧)، وابن القيم (الزاد) (١١٨/١) وقال محققاه: اسناده ضعيف، وابن كثير (البداية) (٦١/٥)، والبيهقي (الدلائل) (٤١١/٥)، والبلاذري (الفتوح) (٨٣/١)، والمقريزي في (الامتاع) (٥٠١/١).

وە هەروەها زەکات نییە لە ئەسپ و کۆیلەی موسوڵماندا. وە گەورەترینی تاوانەکان لەلای خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا: هاوتا بۆ خوادانان و کوشتنی بڕوادارێك بە ناهەق و ڕاکردن لە گۆڕەپانی جەنگ و ئازار دانی دایك و باوك و بوختان کردن بۆ ئافرەتێکی داوێن پاك و فێربوونی سحر و جادوو وە خواردنی سامانی بێ باوکە.

عومرە حەجی بچووکە. قورئان هەر پاك دەبێت دەستی لێبدات، تەڵاق ناکەوێت پێش مارەکردن و وە کۆیلەش ئازاد ناکرێت پێش کڕین نابێت یەکێکتان نوێژ بکات و یەك پۆشاکی لەبەردا بێت و ناوکی بەرەو ژوور ڕووت بێت، نابێت خۆی کوڕەڵە بکات وە لە ژێرەوە هیچی لەبەردا نەبێت... وە نابێت پیاوێك نوێژ بکات و قژی بەسترابێت. وە هەرکەسێك بڕوادارێك بکوژێت وە بەڵگەی ئاشکرای لەسەر هەبێت پێویستە بکوژرێتەوە مەگەر خاوەن کوژراوەکە ڕازی ببن و نەیکوژنەوە... وە هەر پیاوێك ئافرەتێك بکوژێت دەکوژرێتەوە...][١٢٩٦].

### ١٩- وەفدی بەنی شەیبان:

ئەم وەفدە لەساڵی هەشتەمی کۆچیدا لە مانگی جمادی دووەم[١٢٩٧] هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وە حاریسی کوڕی حەسان و قیلەی کچی مەخزەمەیان لەگەڵ بوو، حاریس هاتبوو تا سکاڵا بکات لە عەلائی کوڕی حەزرەمی بە هۆی کێشەیەکی نێوانیانەوە[١٢٩٨].

حاریسی کوڕی حەسانی بەکری ﷺ دەفەرموێت: [چووم تا سکاڵا بکەم لە عەلائی

(١٢٩٦) أخرجه: مالك (٨٤٩/٢)، النسائي (٦٠/٨)، والدارقطني (١٢١/١)، والدارمي (١٦٦١) وقال محققه: اسناده ضعيف، والحاكم (٣٩٥/١)، والبيهقي (الكبرى) (٧٣٣٦)، وابن خزيمة (٢٢٦٩) وقال محققه: اسناده ضعيف له شواهد صحيحة، وعبدالرزاق (٦٧٩٣)، ابن حبان (٦٥٥٩) وقال محققه: اسناده ضعيف وقال (٥٠١/١٤-٥١٤): وله شواهد صحيحة، والطبراني (الطوال) (وقال محققه: سنده ضعيف له شواهد صحيحة يصل بها إلى الصحة، وقال البيهقي (الكبرى) (٧٣٣٧): قال استحسنه ابو حاتم الرازي و الدارمي وجماعة من الحافظ (أن اسناد الحديث حسن وصححه الامام أحمد و استنخة عمر بن عبدالعزيز وعمل به. و أخرجه: البيهقي في (الصغرى) (١٠٩٨) وقال محققه:روى هذا الحديث من طرق عن انس من وجوه صحيحة، ومال إلى صحته كل من الحاكم وابن حبان وابن خزيمة والبيهقي و الطحاوي وابن العربي (أحكام القرآن) (١٧٢٨/٤)، والحافظ في (الفتح) (١٨/٤)، وضعف الحديث الشيخ الألباني في (ضعيف الجامع) (٢٣٣٣)، ورجع عنه وقال الحديث صحيح لغيره: كما في (صحيح موارد الضمأن) (٦٦٢)، و(المشكاة) (٤٦٥) التحقيق الثاني، و(الارواء) (٢٢١٢،٢٦٨،١٢٢،١٥٨)، وانظر نص الرسالة مختصراً في (الصحيحة) (١٤٢).

(١٢٩٧) أخرجه: ابن سعد (الطبقات) واسناده حسن كما في (السيرة على ضوء المصادر الأصلية) (ص:٦٦١).

(١٢٩٨) أخرجه: أحمد (١٥٩٥٤)، وقال محققوه: اسناده حسن.

کوڕی حەزرەمی لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناوچەی رەبزە پیرەژنێکی بەنی تەمیم بەتەنها لەوێ بوو وتی: ئەی بەندەی خوا] بۆ کوێ دەچن؟ وتم: دەمانەوێت بچینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ. وتی: منیش لەگەڵ خۆتان سوار بکەن و بمبەن [چونکە من کارێکم بە پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە، ئایا تا ئەوێ من دەگەیەنیت؟ وتم: باشە و من لەگەڵ خۆم هەڵمگرت تا هاتینە ناو شاری مەدینە و مزگەوتەکە پڕبوو لە خەڵك] ئەو ئافرەتە ناوی قیلە بوو دەڵێت: منی لەگەڵ خۆیان برد هاوەڵێکی زۆر باش بوون گەیشتینە ناو شاری مەدینە پێغەمبەری خوا ﷺ پێش نوێژی بەیانی بۆ خەڵك دەکرد... دونیا هێشتا تاریك بوو پیاوان باش یەکتریان نەدەبینی، منیش چووم لە ڕیزی پیاوان وەستام من کەسێك بووم تازە موسوڵمان ببووم، پاوێکی نزیك لەو ڕیزەدا پێی وتم: تۆ پیاویت یان ئافرەت؟ وتم: من ئافرەتم. وتی وەخت بوو توشی کێشەم بکەیت بڕۆ لە ڕیزی ئافرەتان بوەستە (لە دواوە). منیش چوومە ڕیزی ئافرەتەکان یەکەم جار لەبەر تاریکی ئەوانم نەبینی... و نوێژەکەمان ئەنجامدا و ڕۆژهەڵات و خۆم نزیککردەوە و هەر پیاوێکی جلوپۆشاك جوانم بەرچاو بکەوتایە چاوم تێ دەبڕی بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ببینم... ڕۆژ بەتەواوی هەڵات و پیاوێك هات و وتی: السلام علیکم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((عَلَيْكُمْ السَّلامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ))... تەماشام کرد پێغەمبەری خوا ﷺ بەچیچکانەوە دانیشتووە بێ فیز. کاتێك بەو جۆرە بینیم زۆر ترسام، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئافرەتە هەژارەت ترساند فەرمووی: ((ئەی بۆ ئەو تەماشا دەکات خۆ من پشتم لەوە)) و پێی فەرمووم: ((ئەی ئافرەتە هەژارەکە ئارام بە)). کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فەرموو خودای گەورە ئەو هەموو ترسەی لە دڵمدا لابرد. هاوەڵەکەم حاریسی کوڕی حەسان چووە خزمەتی و موسوڵمان بوو بەڵێنی خۆی و قەومەکەی پێدا][١٢٩٩].

[حاریس ﷺ دەڵێت: ... پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکردم و فەرمووی: ((ئایا هیچ شتێك ڕوویداوە لە نێوان ئێوە و بەنی تەمیمدا)) وتم: بەڵێ ئێمە هەڵمان کوتایە سەریان و ڕاومانان. لە ناوچەی ئەلڕەبزە پیرێژنێکی ئەوانم بینی بەتەنها بوو

---

(١٢٩٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٥/١)، قال الحافظ (الفتح) (١٩٩/٣): اسناده حسن وقال الهيثمي (المجمع) (١٢/٦) رجاله ثقات، وابوداود (٤٨٤٧) والترمذي (٢٨١٥) مختصراً، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٤٠٥٧).

داوایکرد تا لەگەڵ خۆمی بهێنمە مەدینە و ئەوەتا لێرەیە و ڕێگەی بدە. ئیتر ڕێگەی پێدراو چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ. حاریسیش ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەر پێت باشە سنورێك لە نێوان ئێمە و بەنی تەمیمدا دابنێیت با ناوچەی (دەهنا) بێت. لە گێڕانەوەیەکدا: [وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ناوچەی دەهنا بکەرە سنوری نێوان ئێمە و بەنی تەمیم بۆ ئەوەی لەوێوە لێمان نزیك نەبنەوە مەگەر کەسێکی ڕێبوار وگەشتکار. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەی گەنجەکە ناوچەی دەهنای بۆ بنوسە))] [قیلە کە ئەوەی بیست توڕەبوو چونکە ناوچە و نیشتیمانی خۆی بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ [ئەی خەڵکی ناوچەی مزمر بۆ کوێ ناچار دەکەیت] ئەو خاکێکی ئاسایی لێ داوانەکردوویت ئەو ناوچەیە شوینی بەستنەوەی وشتر و لەوەڕگای مەڕە و هەموو ئافرەتانی بەنی تەمیم و منداڵەکانیان لەنزیك ئەوجێگایەوەن؟ فەرمووی: ((گەنجەکە ڕاوەستە ئەوە ڕاست دەکات موسوڵمان برای موسوڵمانە لە لەوەڕو درەخت و ئاودا هاوبەشن...)). کاتێك کە حاریس ئەمەی بینی کە نوسراوەکەی بۆ ڕاگیرا هەردوو دەستی بەیەکداداو وتی: من و تۆ [وەك پێشینان وتویانە: بزنەکە بەرەو مەرگی خۆی هەڵگیرا. من ئەم پیرژنەم هەڵگرت و هەستم نەکرد کە ئەمە ڕکابەرمە، پەنا دەگرم بە خوا وەك نێراوەکەی عادبم...].

[دواتر قیلە دەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی تایبەتم بۆ بنوسە بۆ خۆم و سێ کچەکەم][١٣٠٠]. پاشان نامەکەی لە پارچە پێستەیەکی سووردا بۆی نوسی ئەمەش دەقەکەیەتی: ((لە موحەممەد پێغەمبەری خواوە بۆ قیلە و سێ کچەکەی]: نابێت ستەمیان لێبکرێت وە نابێت لە شوکردندا زۆریان لێبکرێت وە هەموو موسوڵمان و بڕوادارێك سەرخەرو پشتیوانیانەو پێویستە ئەوان چاکەکاربن و خراپەکار نەبن))][١٣٠١].

(١٣٠٠) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٥/٢).

(١٣٠١) أخرجه: أحمد (١٥٩٥٣،١٥٩٥٤) وقال محققوه: اسناده حسن، والنسائي (الكبرى) (٨٦٠٧)، وابوداود (٣٠٧٠)، وابن سعد (الطبقات) (١٧/١)، والطبراني (الكبير) (٣٣٢٥) مطولاً، و الترمذي (٣٢٧٣)، وابن أبي عاصم (الآحاد) (١٦٦٧) و الطبراني (الكبير) (٣٣٢٦) مختصراً. وأورد رواية قيلة: الطبراني (الكبير) (٢٥/١)، وابن أبي شيبة (٣٥٧/١٢)، و البخاري (الأدب) (١١٧٨) وفي (التاريخ الكبير) (٢٦١/٢) وقال الشيخ الألباني في (صحيح الأدب المفرد) (٨٩٧): اسناده حسن وفي (المشكاة) (٤٧١٤)، وبعد أن قال في (ضعيف أبي داود) (٦٧١): ضعيف الاسناد.

**٢٠-وەفدی بەنی لەیس:**

ئەم وەفدە نۆ پیاوی هاوتەمەن بوون پێش غەزای تەبوك هاتنە شاری مەدینە[١٣٠٢].

مالیکی کوڕی حوەیرس ﷺ دەفەرموێت: [هاتینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو گەنج و هاوتەمەن و خوێندەوار بووین[١٣٠٣]، بیست شەو لە لای ماینەوە. زانیی کە ئێمە غەریبی خزمانمان دەکەین و تامەزرۆی گەڕانەوەین بۆ لایان. پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری ئەو خزمانەی لێکردین کە بەجێمان هێشتوون، و ئەو کەسێکی بەبەزەیی و نەرم و نیان و [دڵ نەرم] بوو [کاتێك بینی ئێمە تامەزرۆی گەڕانەوەین] فەرمووی: ((ارْجِعُوا إِلَى أَهْلِيكُمْ، فَأَقِيمُوا فِيهِمْ، وَعَلِّمُوهُمْ، وَمُرُوهُمْ [فَلْيُصَلُّوا صَلاَةَ كَذَا فِي حِينِ كَذَا، وَصَلاَةَ كَذَا فِي حِينِ كَذَا][١٣٠٤]. وَصَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ))[١٣٠٥] واتە: ((بڕۆنەوە ناو خزمانتان لەناویان بمێننەوە ئاینیان فێر بکەن و ئاگاداریان بکەنەوە [کە ئەو نوێژە لەو کاتەدا بکەن وە ئەو نوێژەش لەو کاتەدا بکەن] وەك چۆن منتان بینی نوێژ دەکەم ئێوەش بەوجۆرە نوێژ بکەن. گەر کاتی نوێژ هات با یەکێکتان بانگ بدات و بە تەمەنترینتان پێش نوێژیتان بۆ بکات)).

**٢١-هاتنی عەبدو ڕەحمانی کوڕی ئەبو عەقیل لەگەڵ قەومەکەی:**

عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبو عەقیل ﷺ دەفەرموێت: [من لەگەڵ وەفدێك هەموو چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و بەبەردەم دەرگاکەیدا لاماندا و هیچ کەسێك نەبوو بە وێنەی ئەو ئێمە ڕق و قینمان هەبێت بەرامبەری، بەڵام دواتر هیچ کەسێك نەبوو بە وێنەی ئەو ئێمە خۆشمان بوێت، یەکێکمان پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بۆ داوات نەکرد تا موڵکێکت هەبێت وەك موڵکی سولەیمان؟ پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی و فەرمووی: ((فَلَعَلَّ لِصَاحِبِكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَفْضَلَ مِنْ مُلْكِ سُلَيْمَانَ، وَإِنَّ اللَّهَ لَمْ يَبْعَثْ نَبِيًّا إِلَّا أَعْطَاهُ دَعْوَةً فَمِنْهُمْ مَنِ اتَّخَذَ بِهَا دُنْيَاهُ فَأُعْطِيَهَا، وَمِنْهُمْ مَنْ دَعَا بِهَا عَلَى قَوْمِهِ

---

(١٣٠٢) انظر: (فتح الباري) (٢/١١٠).

(١٣٠٣) أخرجه: مسلم (٦٧٤)/(١٥٣٧).

(١٣٠٤) أخرجه: البخاري (٦٨٥).

(١٣٠٥) أخرجه: البخاري (٦٣١،٧٢٤٦)، ومسلم (٦٧٤)، والنسائي (٢/٩)، ابن حبان (١٦٥٨).

إِذَا عَصَوهُ فَأُهْلِكُوا، وَإِنَّ اللَّهَ أَعْطَانِي دَعْوَةً فَاخْتَبَأْتُهَا عِنْدَ رَبِّي، شَفَاعَتِي لِأُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ))[١٣٠٦].

واتە: ((بەڵکو ئەم هاوەڵەتان لەلای خودا باشتری هەبێت لە موڵکی سولەیمان. چونکە خوای گەورە هەر پێغەمبەرێکی ناردبێت داوایەکی پێ بەخشیوە، هەندێکیان داوای شتێکی دونیاییان پێکرد و پێیان درا وە هەندێکی تریان دوعای لەناوچوونیان لە قەومەکەیان پێکرد کاتێك ئەوان سەرپێچیان کردن وە بە هۆیەوە هەموو لە ناوچوون، وە منیش خودا دوعایەکی پێ بەخشیم من لەلای خودا بە پەنهانی هێشتمەوە تا بیکەمە تکاکردن بۆ ئومەتەکەم لە ڕۆژی زیندوبوونەوەدا)).

## ٢٢- هاتنی فەروەی کوڕی موسەیەکی موڕادی:

ئیبنو ئیسحاق ﷬ دەفەرموێت: [دوو لە پاشاکانی کیندە، فەروەی کوڕی موسەیەکی موڕادی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و کردیە بەرپرسی هۆزەکانی موراد و زوبەید و موزحیج و خالید کوڕی سەعیدی کوڕی عاسی لەگەڵی نارد تا زەکاتەکانیان لێ کۆبکاتەوە][١٣٠٧].

فەروە ﷺ دەفەرموێت: [چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەوانەی موسوڵمان بوون لە هۆزەکەم بجەنگێم دژ بەوانەی موسوڵمان نەبوون لە هۆزەکەم، ڕێگەم بدە و فەرمانم پێ بکە؟ کاتێك ئەوێم بە جێهێشت، پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی من پرسیاری کردبوو فەرموو بووی: ((غوتەیفیەکە چی کرد؟)) پێی وترا بوو کە من بەرێکەوتووم و لە گەڕانەوەدام، یەکێکی بەدوامدا نارد و گەڕاندمیەوە و چوومە خزمەتی لە ناو هاوەڵانیدا بوو و فەرمووی: ((ادْعُ الْقَوْمَ، فَمَنْ أَسْلَمَ مِنْهُمْ فَاقْبَلْ مِنْهُ، وَمَنْ لَمْ يُسْلِمْ فَلاَ تَعْجَلْ حَتَّى أُحْدِثَ إِلَيْكَ)) واتە: ((بڕۆ بانگەوازی قەومەکەت بکە و ئەوەی موسوڵمان بوو لەلای خۆت وەریبگرە و ئەویش کە موسوڵمان نەبوو پەلە مەکە تا خۆم هەواڵت بۆ دەنێرم)). وە خودا سەبارەت بە (سەبەء) ئایەتی دابەزاندبوو. پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ

(١٣٠٦) أخرجه: الحاكم (١/٨٣١) ، ابن أبي شيبة (المصنف) (٣١٧٤٠)، وابن أبي عاصم (السنة) (٨٢٤) وقال محققه: صحيح، والبخاري (التاريخ الكبير) (٨١١)، والبيهقي (الدلائل) (٢٠٩٠) وقال محققه: صحيح، ابن خزيمة (١٧٥)، قال الهيثمي (المجمع) (٢٧١/١٠)، رواه البزار و ابو يعلى وأحمد واسناده حسن.

(١٣٠٧) أخرجه: ابن هيشام (السيرة) (١٩١/٤) (١١٢٥)، والطبري (التاريخ) (١٣٤/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٣٦٨/٥)، والبداية (٨٣/٥).

سەبەء چییە ناوی زەوییە یان ناوی ئافرەتە؟ فەرمووی: ((نا ئەوە ناوی زەوی نییە ناوی ئافرەتیش نییە بەڵکو ناوی پیاوێکە دە کوڕی عەرەبی هەبوو، شەشیان گەشبین بوون و چواریان ڕەشبین بوون، ئەوانیش هۆزەکانی لەخم و جوزام و غەسان و عامیلە بوون، وە ئەوانەی گەشبین بوون هۆزەکانی ئەزد و ئەشعەریەکان و حومیە و موزحیج و ئەنمارو کیندە بوون)) پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنمار کێیە؟ فەرمووی: ((ئەوانەن کە لە هۆزەکانی خوسعەم و بوجەیلە بوون))(١٣٠٨).

### ٢٣- هاتنی وەفدی حەزرەمەوت:

وائیلی کوڕی حەجەر ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك سەرکەوتنی پێغەمبەرمان ﷺ بیست من وەك وەفدو نوێنەری قەومەکەم چوومە شاری مەدینە و سەرەتا بە هەندێك لە هاوەڵانی گەیشتم وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی هاتنی تۆی پێداین لە پێش سێ ڕۆژ لە هاتنت و فەرمووی: ((وائیلی کوڕی حەجەر دێتە لاتان)). دواتر چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پێشوازی لێکردم و لە خۆی نزیك کردمەوە و عەباکەی خۆی بۆ داخستم و لەسەری دانیشتم و بانگی خەڵکی کرد و هەموو هاتن و کۆبوونەوە، پاشان چووە سەر مینبەر و منی لەگەڵ خۆی بردو لە پلەیەکی نزم تر لەگەڵی وەستام، پاشان سوپاسی خودای کرد و فەرمووی: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ ، هَذَا وَائِلُ بْنُ حُجْرٍ ، أَتَاكُمْ مِنْ بِلَادٍ بَعِيدَةٍ مِنْ بِلَادِ حَضْرَمَوْتَ [لم يجئكم رغبة ولارهبة جاء حُباً لله ولرسوله] طَائِعًا غَيْرَ مُكْرِهٍ ، بَقِيَّةُ أَبْنَاءِ الْمُلُوكِ ، بَارَكَ اللَّهُ فِيكَ يَا وَائِلُ ، وَفِي وَلَدِكَ)).

واتە: ((ئەی خەڵکینە ئەوە وائیلی کوڕی حەجەرە لە وڵاتی دووری حەزرەمەوتەوە هاتۆتە لاتان [ئەو لە ترس و تەماعدا نەهاتووە بەڵکو لەبەر خۆشەویستی بۆ خودا و پێغەمبەرەکەی هاتووە] تا ملکەچ بێت بێ ئەوەی زۆری لێبکرێت، ئەو لە نەوەی پاشماوەی پاشاکانە، ئەی وائیل خودا بەرەکەت (بڕێژێت) بەسەر خۆت و منداڵ و منداڵی منداڵەکەت)) پاشان لە مینبەرەکە هاتە خوارەوە و منی لەگەڵ خۆی هێنایە خوارەوە [و بە هاوەڵانی فەرموو: ((بە نەرمی لەگەڵی هەڵسوکەوت بکەن چونکە ئەو ماوەیەکی زۆر نییە لە پاشایەتیەکەی دوورخراوەتەوە)). وتم: خزمانم ئەو

---

(١٣٠٨) أخرجه: الترمذي (٣٢٢٢)، والطبراني (الكبر) (٨٣٦/١٨) وقال الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٥٧٤) حسن صحيح.

پلەو پێگەیەیان لێ زەوتکردم. فەرمووی: ((من هاوشیوەی ئەوە و لەوە زیاترت پێ دەبەخشم))][١٣٠٩]. وائیل ﷺ دەڵێت: کاتێك چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ قژێکی زۆر و بژم هەبوو. فەرمووی: ((مێشو مەگەزە)) منیش چووم قژم کورت کردەوە و پاشان هاتمەوە خزمەتی فەرمووی: ((بۆ قژت کورت کردەوە؟)). وتم: گوێم لێ بوو فەرمووت: ((مێشو مەگەزە)) وامزانی لەگەڵ منتە. فەرمووی: ((لەگەڵ تۆم نەبوو بەڵام ئاوا باشترە))[١٣١٠]. [ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ زەوییەکی فراوانی لە مەدینە پێدام وە فەرمانی کرد موعاویەی کوڕی ئەبوسفیان لەگەڵم بێت و نیشانم بدات، هەردووکمان ڕۆیشتین [موعاویە وتی: لەدوای خۆتەوە سوارم بکە؟ وتم: نابێت لە دوای پاشاوە سوار ببیت. وتی: دەباشە نەعلەکانتم بدەرێ. وتم: نا قاچت لە سێبەری وشترەکە دابنێ. دواتر موعاویە بووە خەلیفە و چوومە لای لەگەڵ خۆی لەسەر تەختەکەی منی دانیشاند [وتی: ئایا ئەم تەختەی من باشتر نییە لە پشتی وشترەکەت؟ وتم: خەلیفەی بڕواداران لێم گەڕێ چونکە من تازە لە نەفامی و بێ باوەڕی ڕزگارم ببوو ئەوەش نەریتی ئەو ساتانە بوو، بەڵام ئەمڕۆ نەریتی ئیسلاممان هەیە و تۆش ئەو نەریتەت جێ بەجێ کرد][١٣١١]. وائیل ﷺ دەڵێت: [خۆزگەم دەخواست منیش ئەو ڕۆژە لە دوامەوە لەسەر پشتی وشترەکەم سوارم بکردایە][١٣١٢]. هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ پارچە زەوییەکی دایە وائیل ﷺ لە ناوچەی حەزرەمەوت[١٣١٣].

وائیل ﷺ دەڵێت: [...کاتێك ویستم بگەڕێمەوە ناو قەومەکەی خۆم پێغەمبەری خوا ﷺ سێ نوسراوی پێدام یەکێکیان تەنها بۆ خۆم بوو وە دووەمیان بۆ خۆم و بنەماڵەکەم بوو وە سێ هەمیان بۆ خۆم و قەومەکەم بوو][١٣١٤].

---

(١٣٠٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١١٧،١٢٨/٢٢)، وفي (الصغير) (رقم:١١٧٦) (١٤٣/٢) وقال محققه فيه ضعيف و جهالة، وقال الهيثمي (المجمع) (٣٧٦/٩): فيه ضعيف.

(١٣١٠) أخرجه: أبوداود (٤١٩٠)، وابن ماجة (٣٦٣٦)، والنسائي (١١/٨) وصححه الشيخ الألباني (صحيح أبي داود) (٣٥٣٠) و (صحيح ابن ماجة) (٢٩١).

(١٣١١) أخرجه: الطبراني (الطبراني) (الكبير) (١١٧/٢٢).

(١٣١٢) أخرجه: أحمد (٣٩٩/٦)، والطبراني (١١٣/٢٣)، والوداود (٣٠٥٨)، وابن حبان (٧٢٠٥) وقال محققه: اسناده صحيح شرط مسلم.

(١٣١٣) أخرجه: أبو داود (٣٠٥٨) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داو) (٢٦٣١).

(١٣١٤) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١١٧/٢٢)، وقال الهيثمي (المجمع) (٣٧٦/٩): فيه ضعيف، وله شواهد صحيحة انظرها في:

**٢٤- وەفدی بەنی قوشەیر کە ناویان (بەنی عامری کوڕی سەعسەعە) بوو:**

ئەم وەفدە پێش حەجیماڵئاوایی هاتن و موسوڵمان بوون و قورەی کوڕی هوبەیرەیان لەگەڵ بوو. پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوی کردە بەرپرسی کۆکردنەوەی زەکاتی قەومەکەی و پۆشاکێك و دیارییەکی پێ بەخشی. وە هەروەها (سەوری کوڕی عروەیان) لەگەڵ بوو ئەویش پێغەمبەری خوا ﷺ پارچە زەوییەکی ناوچەکەیانی پێ بەخشی وە نوسراوێکی لەبارەیەوە پێدابوو[١٣١٥]. وە موعاویەی کوڕی حەیدەی قوشەیریشیان لەگەڵ بوو.

موعاویەی کوڕی حەیدە ﷺ دەفەرموێت: [چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بردمیانە بەردەمی و فەرمووی: ((أَمَا أَنِي سَأَلْتُ اللَّهَ عَزَوَجَل أَنْ يُعِينَنِي عَلَيْكُمْ بِالسَّنَةِ تُخِيفكُم وَبِالرعْبِ أَنْ يَجْعَلَهُ فِي قُلوبِكُمْ))[١٣١٦] واتە: (( من داوام کرد لە خودا سەرم بخات بەسەرتاندا و بە وشکە ساڵی بتان ترسێنێت وە تۆقین بخاتە ناو دڵتانەوە))].

[وتم: [ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ] سوێند بە خوا من پێشتر نەم دەویست بێمە لات و زیاتر لەپەنجەکانی [ئەو دوو دەستەم] سوێندم خوارد کە نەیەم بۆ لات و [بۆ لای ئاینەکەشت] [بەڵام بەردەوام وشکەساڵی دەیترسانم وە بەردەوام تۆقین کرابووە ناو دڵمەوە تا ئەوەتا هاتمە خزمەتت، لەبەر ئەوە تو ئەو خودایەی کە تۆی ناردووە ئایا بە ڕاستی ئەو تۆی ناردووە بەمانەی کە دەیڵێیت؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) وە هەر ئەو خۆی ئەو فەرمانەی پێ کردوویت؟ فەرمووی: ((بەڵێ))] [من هاتووم هیچ تێناگەم و نازانم مەگەر ئەو شتانەی کە خوداو پێغەمبەر ﷺ فێرم بکەن، وە من بە خودا داوات لێدەکەم ئایا خودا تۆی بەچی ناردۆتە لامان؟][١٣١٧]. فەرمووی: (([بە ئیسلام))] [وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پایەکانی ئیسلام و هێماکانی چین؟] [فەرمووی: ((شایەتیدان بەوەی هیچ خودایەك نییە جگە لە الله وە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خوایە][١٣١٨].

---

(الصحيحة) (٩٩١،٢٩٦٣،١٣٨٠)، و(صحيح الجامع) (٧١٦٨)، (٤٥٥٠،١٠٣٥).

(١٣١٥) أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٣٠٣/١) باسناد منقطع.

(١٣١٦) أخرجه: الطبراني (الأوسط) (١٦٥٨)، والبيهقي (الدلائل) (٢١٠٣) وقال محققه: اسناده حسن، واللفظ له.

(١٣١٧) أخرجه: أحمد (٢٠٠٣٧) وقال محققوه: اسناده حسن، وعبدالرزاق (٢٠١١٥)، ابن أبي شيبة (٢٥٧/١٣)، وابن ماجة (٢٣٤)، والنسائي (٤/٥)، وفي (الكبرى) (١١٤٦٩).

(١٣١٨) أخرجه: النسائي (الكبرى) (١١٤٣١)، والطبراني (الكبير) (١٠٣٨/١٩)، وأحمد (٢٠٠١١) وقال محققوه: اسناده حسن

[وە پێویستە بڵێیت: خۆم تەسلیمی خودا دەکەم وە لە هەموو شتانی تر دووردەکەومەوە] وە پێویستە دڵت تەسلیمی خودا بێت وە ڕووت بکەیتە خودا وە نوێژە فەرزەکان بەجێ بگەیەنیت و زەکاتی فەرزیش ببەخشیت [وە خوێن و سامان و ناموسی هەموو موسوڵمانێك لەسەر موسوڵمانێك حەرام و قەدەغەیە] و هەموو براو پشتیوانی یەکترین [خودا هیچ کارێکی چاکە لە موشریك و هاوتا بۆ خودا دانەر وەرناگرێت، لە دوای موسوڵمان بوونی دەبێت ناو موشریکەکان جێ بهێڵێت و بێیتە ناو موسوڵمانان ئەوجا لێی وەردەگیرێت، بەردەوام من ئێوە دەگرم تا لە ئاگر دوورتان بخەمەوە، خودا بانگم دەکات و لێپرسینەوەم لەگەڵ دەکات و پێم دەفەرموێت: (ئایا بەندەکانی منت ئاگادارکردووە؟) وە من پێی دەفەرمووم: خودایە [من] پەیامەکەم بەوان گەیاند. ئیتر با ئەوەی لێرە ئامادەیە ئەوانە ئاگاداربکاتەوە کە لێرە ئامادە نین][1319] [وتم: ئەی ئافرەتەکانمان چییان بۆ ئێمە دروستە وە چیان بۆ ئێمە دروست نییە؟ فەرمووی: ((تۆوەکەت بڕژێنە جێی ڕواندنی دانەوێڵەکەت هەرکات ویستت لێی بوو))][1320]. وتم: یەکێك لە ئێمە هاوسەرەکەی چ مافێکی لەسەری هەیە؟ فەرمووی: ((تُطْعِمُهَا إِذَا طَعِمْتَ، وَتَكْسُوهَا إِذَا اكْتَسَيْتَ، وَلَا تَضْرِبِ الْوَجْهَ، وَلَا تُقَبِّحْ، وَلَا تَهْجُرْ إِلَّا فِي الْبَيْتِ [كَيْفَ وَقَدْ أَفْضَى بَعْضُكُمْ إِلَى بَعْضٍ إِلَّا بِمَا حَلَّ عَلَيْهَا][1321] (و): ((تُحْشَرُونَ هَاهُنَا وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ إِلَى نَحْوِ الشَّامِ مُشَاةً وَرُكْبَانًا [وتُجَرُّون][1322] عَلى وُجُوهِكُمْ [أَنْتُمْ] [تُوفُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ سَبْعِينَ أُمَّةً أَنْتُمْ آخِرُ الْأُمَمِ [خَيْرِها] وَأَكْرَمِها على اللّهِ][1323] [إِنَّكُمْ مُدعَونَ] [تَجِيئُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ] تُعْرِضُونَ عَلى اللّهِ وَعَلَى أَفْوَاهِكُمُ الْفِدَامُ وَأَوَل [مَا يَتَكَلَّمُ] عَنْ أَحَدِكُمْ فَخْذهُ [وَكَفُّهُ])[1324]. [مَا بَيْنَ مِصْرَاعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الْجَنَّةِ مَسِيرَةُ أَرْبَعِينَ سَنَةً، وَلَيَأْتِيَنَّ عَلَيْهَا يَوْمٌ وَهُوَ كَظِيظٌ وَإِنَّ فِي الْجَنَّةِ بَحْرَ الْمَاءِ وَبَحْرَ الْخَمْرِ وَبَحْرَ

---

(١٣١٩) أخرجه: عبدالرزاق (٢٠١١٥)، وأحمد (٢٠٠٧) وقال محققوه: اسناده حسن.

(١٣٢٠) أخرجه: ابو داود (٢١٤٣)، والنسائي (الكبرى) (٩١٦٠)، أحمد (٢٠٠٤٥) وقال محققوه: اسناده حسن وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (١٨٧٦).

(١٣٢١) أخرجه: الطبري (التفسير) (٦٦/٥)، الطبراني (الكبير) (١١٠٠٠/١٩)، وأحمد (٢٠٠٣٠) وقال محققوه: اسناده حسن.

(١٣٢٢) أخرجه: الترمذي (٢٤٢٤)، الطبراني (الكبير) (١٩٧٦/١٩)، والحاكم (٥٦٤/٤)، وأحمد (٢٠٠٣١) وقال محققه: اسناده حسن.

(١٣٢٣) أخرجه: النسائي (الكبرى) (١١٤٣١)، والطبراني (الكبير) (١٠٣٨/١٩)، وأحمد (٢٠٠١١، ٢٠٠١٥) وقال محققوه: اسناده حسن.

(١٣٢٤) أخرجه: ابن أبي شيبة (١٢١/١٤)، وابو داود (٢١٤٢)، وأحمد (٢٠٠٢٦،٢٠٠٢٢) وقال محققوه: اسناده حسن، وابن حبان (١٦٠) وقال محققه: اسناده صحيح.

اللَّبَنِ وَبَحْرَ الْعَسَلِ ثُمَّ تُشَقَّقُ مِنْهُ بَعْدُ الْأَنْهَارُ))][١٣٢٥]

واتە: ((گەر پێویستی بە خۆراك بوو بیدەرێ وە گەر پێویستی بە پۆشاك بوو بیدەرێ وە گەر تەمێت کرد نابێت لە ڕووخساری بدەیت وە نابێت بڵێیت: خوا ڕووت ڕەش بکات (یان دێز و ناشرین) وە دەبێت تەنها لە ماڵدا جێگەی لەگەڵ جیا بکەیتەوە، [ئەوە چوون دەبێت (واتە: ئازاری بدەیت) لە کاتێکدا بە ڕووتی چوونەتە لای یەکتری... بۆ یەکتر حەڵاڵ کراون] [وە ئێوە لێرەوە [پەنجەی ڕاکێشا بەرەو شام] حەشر دەکرێن بەپێ و سواری [و هەندێکتان لەسەر ڕوو ڕادەکێشرێن] [ئێوە تەواوکەری حەفتا ئومەتن ئێوە کۆتا ئومەتن [ئێوە لە هەموویان چاکترن] و ڕێزدارترن لەلای خودا] [ئێوە بانگ دەکرێن] [وەدەهێنرێن لە ڕۆژی قیامەتدا] و دەبرێنە بەردەم خوداو دەمتان پێچراوە و [یەکەم] ئەندام کە دەهێنرێتە قسە ڕان و [دەستتانە] [وە نێوان ئەم لاو ئەولای دەرگایەکی بەهەشت ڕێ ڕۆیشتنی چل ساڵە و ڕۆژێکی بەسەر دێت ئەو دەرگایە پڕ دەبێت لە خەڵکی، وە لە بەهەشتدا ڕوبارو ئاوی سازگار هەیە، ڕوباری شەرابی پاك و بۆن خۆش، ڕوباری شیر و ڕوباری هەنگوین وە لە پاشان ڕوبارەکانی تر لەوانە جیادەبنەوە))].

[وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی پێش وپاشمان لە کێ دیاربێت وە لەکێ بیشارینەوە؟ فەرمووی: ((احْفَظْ عَوْرَتَكَ إِلَّا مِنْ زَوْجَتِكَ أَوْ مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ)) واتە: ((نا بێت پێش و پاشت کەس ببینێت جگە لە هاوسەرەکەت و کەنیزەکەکەت)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی گەر لە فەرمبالەغیدا بووین؟ فەرمووی: ((گەر دەتوانیت نەهێڵیت کەس ببینێت وابکە)). وتم: گەر یەکێکمان بەتەنها خۆی بوو؟ فەرمووی: ((فَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ يُستَحيا مِنْهُ][١٣٢٦] [مِن النّاسِ])) واتە: ((خودا [لە خەڵکی] شایستەترە تۆ شەرمی لێ بکەیت))][١٣٢٧]. [پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی لەسەر ڕانی دانا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە ئاینەکەمانە؟ فەرمووی: ((ئەوە ئاینەکەتانە و لە هەر

---

(١٣٢٥) أخرجه: ابن أبي عاصم (الآحاد) (١٤٧٥)، ابن أبي داود (البعث) (٦٠) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن حبان (٧٣٨٨) وقال محققه: اسناده صحيح، وأحمد (٢٠٠٥٢،٢٠٠٢٥) وقال محققوه: اسناده حسن.

(١٣٢٦) أخرجه: ابو داود (٤٠١٧)، والترمذي (٢٧٦٩)، والنسائي (الكبرى) (٨٩٧٢)، وأحمد (٢٠٠٣٤) وقال محققوه: اسناده حسن، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٣٣٩١).

(١٣٢٧) أخرجه: عبدالرزاق (١١٠٦)، والطبراني (١٩٨٩/١٩)، وأحمد (٢٠٠٣٥) وقال محققوه: اسناده حسن.

جێگەیەك بیت بەشت دەکات))][١٣٢٨].

دواتر مالیکی کوڕی حەیدەی برای موعاویە هاتە لای، داوایکرد هەردووکیان بچنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ تا داوای لێبکەن دراوسێکانی بۆ بەربدات: موعاویەی کوڕی حەیدە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ کەسانێکی خزمانی بە تۆمەتێك دەستگیر کردبوو وە لای خۆی بەندی کردبوون][١٣٢٩]. مالیك بە معاویەی برای وت: (موحەممەد دراوسێکانی دەستگیر کردووم بڕۆ با بچینە لای تۆ پێشتر قسەت لەگەڵ کردووە و دەتناسێت، ئەویش وتی: باشە، بەدوو قۆڵی ڕۆیشتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ [...ئەو لەو کاتەدا وتاری دەدا... مالیك وتی: (ئەی موحەممەد لەسەر چی دراوسێکانم دەست بەسەر دەکەیت؟) پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو] مالیك وتی: دراوسێکانم بەرەڵا بکە ئەوان موسوڵمان بوون. پێغەمبەری خوا ﷺ بایەخی پێ نەدا [مالیك وتی: دراوسێکانم بە چ تاوانێك گیراون؟ بۆ سێیەم جار هەر بایەخی پێ نەدا [مالیك بە توڕەییەوە هەستا وتی][١٣٣٠]: گەر وایە بۆ خەڵکی دەیان وت: موحەممەد گومڕایی قەدەغە کردووە...][١٣٣١]. لە گێڕانەوەیەکی تردا: سوێند بە خوا گەر وابکەیت خەڵکی دەڵێن موحەممەد فەرمان دەکات و خۆی جێ بەجێی ناکات. [موعاویە دەڵێت]: من مالیکم ڕادەکێشا و هەر قسەی دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەوە چی دەڵێیت؟)) [موعاویە ﷺ دەڵێت: منیش هەر لەو نێوانەدا قسەم دەکرد نەبادا پێغەمبەری خوا ﷺ قسەکانی ببیستێت و بەهۆیەوە دوعا لە قەومەکەم بکات و بۆ هەتا هەتایە سەرفراز نەبین [وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو] بەو جۆرەی وت تا پێغەمبەری خوا ﷺ تێ گەیشت ئینجا فەرمووی: ((...دراوسێکانی بۆ بەردەن))][١٣٣٢].

---

(١٣٢٨) أخرجه: عبدالرزاق (٢٠١١٥)، ابن أبي شيبة (٢٥٧/١٣)، وابن ماجة (٢٣٤)، والنسائي (الكبرى) (١١٤٦٩)، وأحمد (٢٠٠٣٧) وقال محققوه: اسناده حسن.

(١٣٢٩) أخرجه: عبدالرزاق (١٨٨٩١)، وابوداود (٣٦٣٠)، والحاكم (١٠٢/٤)، وأحمد (٢٠٠١٩) وقال محققوه: اسناده حسن واللفظ له، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٣٠٨٧).

(١٣٣٠) أخرجه: الحاكم (٦٤٢/٣)، وأحمد (٢٠٠١٤) وقال محققوه: اسناده حسن.

(١٣٣١) أخرجه: ابو داود (٣٦٣١)، ابو الشيخ (أخلاق النبيّ ﷺ) (٧١) وقال محققه: اسناده حسن، وأحمد (٢٠٠٤٢)، وقال محققوه: اسناده حسن، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٣٠٨٨).

(١٣٣٢) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٩٩٧/١٩)، ابو داود (٣٦٣١)، والحاكم (٦٤٢/٣)، أحمد (٢٠٠٤٢،٢٠٠١٩،٢٠٠١٤) وقال محققوه: اسناده حسن.

### ٢٥- وەفدی جوزام:

ڕیفاعەی کوڕی زەیدی جوزامی لەگەڵ دە کەس لە خزمانی لەساڵی حودەیبیەدا چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ڕیفاعە موسوڵمان بوو کۆیلەیەکی وەك دیاری بەخشیە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی (مودعیم) بوو(١٣٣٣). وە پێغەمبەری خوا ﷺ نوسراوێکی پێداو ناردی بۆ ناو قەومەکەی و بانگیکردن بۆ ئیسلام و هەموو موسوڵمان بوون(١٣٣٤).

### ٢٦- هاتنی وەفدی فەروەی کوڕی عەمر خاوەنی وڵاتی مەعان:

فەروەی کوڕی عەمری جوزامی پیاوێکی بەوەفد نارد بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ کە ناوی مەسعودی کوڕی سەعد بوو. فەروە کاربەدەستێکی ڕۆمەکان بوو لەناوچەی مەعان. فەروە چەند دیارییەکی لەگەڵ وەفدەکە ناردبوو بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ لەوانە ئەسپێك و گوێدرێژێکی لەناودابوو. دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی بۆ نارد و تیایدا هەواڵی گەیشتنی نێردراوەکەی و موسوڵمان بوونی خۆی و قەومەکەی پێ ڕاگەیاند و چەند دیارییەکیشی بۆ نارد.

دواتر پاشای ڕۆمەکان بەو کارەیان زانی وە فەروەیان بانگکرد تا لە ئیسلام پاشگەز بێتەوە بەڵام فەروە قایل نەبوو دواتر بەندیان کرد و کوشتیان(١٣٣٥).

### ٢٧- هاتنی وەفدی نەجران:

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [موحەممەدی کوڕی جەعفەری کوڕی زوبەیر(١٣٣٦). بۆی گێڕاومەتەوە وتی: وەفدی نەجران هاتنە شاری مەدینە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ](١٣٣٧). چوونە مزگەوتەکەی لە دوای نوێژی عەسر، ئەوان هەموویان پۆشاکی

---

(١٣٣٣) أخرجه: البخاري (٦٧٠٧)، ومسلم (١١٥)، وابوداود (٢٧١١).

(١٣٣٤) أخرجه: هشام (السيرة) (٢٠٦/٤)، وابن سعد (٣٥٤/١)، الحافظ (الإصابة) (٤٤١/٣)، والطبراني (الكبير) (٤٥٦٢)، وقال الهيثمي (المجمع) (٣١٣/٥) الاسناده إلى ابن سحاق جيد.

(١٣٣٥) أخرجه: ابن هيشام (السيرة) (٢٠٢/٤)، والبيهقي (الدلائل) (٤٠٩/٥)، وابن الاثير (اسد الغابة) (٣٤٠/٤)، والحافظ (البداية) (١٠١/٥).

(١٣٣٦) وقدروى الحديث: ابن مردوية باسناد متصل عن ابن اسحاق عن عاصم بن عمر عن محمود بن لبيد عن رافع بن خديج كما في (تفسير ابن كثير) (٣٥٥/٢).

(١٣٣٧) في رواية ابن سعد (٣٥٧/١): ان النبيّ ﷺ كتب اليهم فخرج إليه وفدهم في أربعة وعشرون رجلًا.

سپی و جوانیان لەبەردابوو بە وێنەی پیاوانی بەنی حاریسی کوڕی کەعب، هەندێك لە هاوەڵان ئەوانیان بینی وتیان: (تا ئێستا وەفدی بەو جۆرەمان نەدیوە). کاتی نوێژ کردنیان هات لە مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو ڕۆژهەڵات نوێژیان کرد و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لێیان گەڕێن)) دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی کرد لەگەڵ ئەبو حاریسی کوڕی عەلقەمە و عاقیبی عەبدولمەسیح و و سەیدولئەلهەم ئەوان هەموو گاوربوون لەسەر ئاینی پاشاکەیان، هەرچەندە لەناو خۆشیاندا جیاواز بوون هەیان بوو دەیوت: عیسا خودایە و هەندێکیان دەیان وت: ئەو کوڕی خوایە. وە هەندێکیان دەیان وت: ئەو سێی سێهەمە...

ئەوانەی دەیان وت خودایە بەڵگەیان ئەوە بوو دەیان وت: ئەو مردووی زیندو کردۆتەوە و نەخۆشی چاك کردۆتەوە و غەیب و پەنهانیەکانی باسکردووە وە بە وێنە باڵداری لە قوڕ دروست کردووە و فوی پێدا کردووە بۆتە باڵندە. لە ڕاستیدا هەموو ئەوانە بە فەرمانی خودا بوون تا بیکاتە نیشانەیەك بۆ خەڵکی.

وە ئەوانەی دەیان وت: ئەو کوڕی خودایە بەڵگەیان ئەوەبوو کە دەیان وت: باوکی نەبووە و هەر لەدایکی بووە قسەی کردووە و هیچ مرۆڤێك ئەوەی لەوەو پێش نەبیستووە. وە ئەوانەی دەیان وت: ئەو سێی سێهەمە بەڵگەیان ئەوە بوو دەیان وت: خودا دەڵێت ئەنجامماندا و فەرمانماندا و دروستمان کرد و بەجێمان گەیاند. دەیان وت: گەر یەك خودا بووایە دەی وت: ئەنجامم دا وە فەرمانمدا و دروستمکرد و بەجێم گەیاند.

سەبارەت بە وتەکانیان قورئان دابەزی. پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ دووان لە گەورەکانیان قسەی کرد و فەرمووی: ((موسوڵمان بن سەلامەت دەبن)) وتیان: ئێمە موسوڵمان بووین. فەرمووی: ((هەردووکتان موسوڵمان نەبوون لەبەر ئەوە موسوڵمان بن)) وتیان: بەڵکو ئێمە لە پێش تۆ موسوڵمان بووین. فەرمووی: ((هەردووکتان درۆ دەکەن [گەر پێتان خۆشە پێتان دەڵێم چی ڕێگریتان دەکات موسوڵمان نەبن؟)) وتیان: دەی پێمان بڵێ. فەرمووی: ((ئەوەی ڕێگریتان دەکات لە هاتنە ناو ئیسلام ئەوەیە کە دەڵێن خودا کوڕی هەیە و خاچ دەپەرستن[١٣٣٨] و گۆشتی بەراز دەخۆن

(١٣٣٨) في رواية: الواقدي (٩٠)، وأحمد (الفضائل) (١٣٧٤٠): (سجودكما للصيب) وفي رواية (حب الصلب)، وانظر: رواية ابن أبي شيبة (المصنف) (٣٨١٧٥).

[و مەی دەخۆنەوە])) وتیان: چی دەڵێیت سەبارەت بە عیسا ﷺ [تۆ وا ڕادەگەیەنیت کە ئەو بەندەی خودایە؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) وتیان: ئایا بە وێنەی عیسات بینیوە و بیستووتە؟] باشە ئەو باوکی کێیە؟ ئەی موحەممەد؟ پێغەمبەری خوا ﷺ بێ دەنگ بوو وەڵامی نەدانەوە(١٣٣٩). بە هۆی ئەو جیاوازیانەوە خوای گەورە سەرەتای سورەتی (آل عمران)ی دابەزاند هەتا هەشتاو ئەوەندە ئایەت...

لە دواییدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی لە خواوە بۆ هات بۆ یەکلاکەرەوەی وتەکانیان فەرمانی پێ کرا گەر ئەوان ئەو ڕاستیانەیان قبوڵ نەکرد هەردوولا دوعا بکەن و نەفرەتی خوا بەر ناڕەوایان بکەوێت... بەڵام ئەوان وتیان: ئەی باوکی قاسم ماوەمان بدەرێ تا ڕاوێژی خۆمان بکەین و دواتر دێینەوە لات بۆ داواکاریەکەت، ڕۆیشتن و بەتەنها لەگەڵ عاقب کە خاوەن بۆچوون و ژیری ناویان بوو وتیان: ئەی عەبدلمەسیح دەڵێیت چی؟ وتی: سوێند بەخوا ئەی کۆمەڵی گاوران خۆتان دەزانن کە موحەممەد پێغەمبەرێکی نێردراوە وە هەواڵی ڕاستی پێیە سەبارەت بە مەسیح، وە خۆتان دەزانن هەر قەومێك ئەو کارە بەرامبەر بە پێغەمبەران بکەن ئەوکات گەورەیان نامێنێت و بچوکیان گەورە نابێت، گەر ئێوە ئەو کارە بکات لەبن دێن، گەر ئێوە هۆگری ئاینەکەتانن و دەتانەوێت لەسەر وتەکانی خۆتان بمێننەوە ئەوە باشە کە ئێوە لەگەڵی ڕێبکەون و بگەڕێنەوە ناوچەکەتان. [جابر ﷺ دەفەرموێت: لە بەیانیدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی عەلی و فاتمەو حەسەن و حوسەینی گرت و داوای کرد ئەوانیش دوو سەرکردەکەیان بێت. بەڵام ئەوان نەهاتن](١٣٤٠)، [دواتر هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان: ئەی باوکی قاسم ڕاوبۆچوونمان وەهایە کە ئێمە ئەو کارە نەکەین وە خۆت لەسەر ئاینی خۆت بمێنەرەوە وە ئێمەش لەسەر ئاینەکەی

---

(١٣٣٩) أخرجه: ابن أبي حاتم (التفسير) (٣٦٠٦)، والطبراني (التفسير) (٧١٦١) واسناده ضعيف كما في (لباب النقول) (٧٥)، في رواية: ان الرسول ﷺ كره جدالهم، فعن عبدالله بن الحارث ﷺ مرفوعاً: ((لوددت ان بيني وبين أهل نجران حجاباً)) قال عبدالله: (أي) (من شدة ما يجادلونه).

(١٣٤٠) أخرجه: أبو نعيم (الدلائل) (٢٤٤) وهو من مرسل الشعبي ومراسيلهُ صحيحة، وقدجاء الحديث مطولًا عند: البيهقي (الدلائل) (٣٨٥/٥) عن سلمة بن شيوع وهو مجهول و الرواية ضعيفة.

خۆمان دەمێنینەوە][1341] [وە ڕێکەوتین کە سەرانە بدەین][1342]. لە گێڕانەوەیەکی تردا: [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی کە بەڕاستی منی ناردووە گەر ئەو دوانە بەو دوعای (موباهەلەیە) (واتە: داوای سزا و توڕەبوونی خودا بۆ ئەوەی ناڕەوایە) ڕازی بوونایە ئاگر بەسەر ناوچەکەیاندا دەباری][1343].

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرمویێت: گەر ئەوان وەهایان بکردایە کاتێك دەگەڕانەوە هیچ ماڵ و منداڵی خۆیان نەئەدی][1344]. لە گێڕانەوەیەکی تردا: [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لَقَدْ أَتَانِي الْبَشِيرُ بِهَلَكَةِ أَهْلِ نَجْرَانَ لَوْ تَمُّوا عَلَى الْمُلَاعَنَةِ حَتَّى الطَّيْرِ عَلَى الشَّجَرِ أَوِ الْعُصْفُورِ عَلَى الشَّجَرِ))][1345] واتە: ((مژدەم پێ گەیشت بە لەناوچوونی خەڵکی نەجران، گەر ئەوان پێداگریان بکردایە باڵندەی سەر درەختەکانیشیان لەناو دەچوو]. [دواتر عاقیب و سەید هاتن و وتیان: ئێمە هەموو ئەوانەت بۆ جێ بەجێ دەکەین کە داوات کردووە، بەڵام تۆ پیاوێکی متمانە پێکراومان لەگەڵ بنێرە [لە هاوەڵانت کێیان خۆت بەباشی دەزانیت تا دادوەریمان بکات لەو شتانەی کە جیاوازیمان لە نێواندا دەبێت لە سامانەکانمان چونکە ئێمە لە ئێوە ڕازین][1346] تەنها کەسێکی بە متمانەو بڕواپێ کراومان لەگەڵ بنێرە. پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((لَأَبْعَثَنَّ مَعَكُمْ رَجُلًا أَمِينًا، حَقَّ أَمِينٍ، حَقَّ أَمِينٍ)) واتە: ((کەسێکتان لەگەڵ دەنێرم متمانە و بڕوا پێکراو سەرڕاستی تەواو تەواو بێت)): ((هاوەڵان لەوێدا هەموویان سەریان بۆ بەرز کردەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((قُمْ يَا أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ)) واتە: ((هەستە ئەی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح)) کاتێك کە هەستا فەرمووی: ((هَذَا أَمِينُ هذهِ الأُمَّة))[1347] واتە: ((ئەمە

---

(١٣٤١) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٧٠/٢)، وأحمد (الفضائل) (٣٧٤) وقال محققه مرسل رجاله ثقات، والطبراني (٧١٨١)، وابن أبي حاتم (التفسير) (٣٦١٧)، والواحيدي (اسباب النزول) (٩٠)، وابو نعيم (الدلائل) (٢٤٤)، والحاكم (٥٩٣/٢) و (٢٦٧/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي حديث مرسل صحيح الاسناد: كما في (صحيح اسباب النزول) (٧٢) وضعفه الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (٤٥٩).

(١٣٤٢) أخرجه: أبو نعيم (الدلائل) (٢٤٥)، وابن أبي شيبة (التاريخ) (٥٨٤/٢) وفيه الكلبي متهم وابوصالح ضعيف.

(١٣٤٣) أخرجه: أبو نعيم (الدلائل) (٢٤٤)، وعبدالرزاق (التفسير) (ص:٩٩)، والقرطبي(التفسير) (١٧٠٢) وهو مرسل صحح الاسناد.

(١٣٤٤) أخرجه: ابن أبي حاتم (التفسير) (٣٦٢٠)، وأحمد (٢٢٢٥) وقال محققه: سنده صحيح، و الترمذي (٣٣٤٨).

(١٣٤٥) أخرجه: ابن أبي شيبة (المصنف) (٣٢٨٤٨،٣٨١٦٩) وقال محققه: مرسل رجاله ثقات وهو من مراسيل الشعبي وهي صحيحة.

(١٣٤٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٧٠/٢)، وأحمد (الفضائل) (١٧٤) وقال محققه: مرسل رجاله ثقات.

(١٣٤٧) أخرجه: البخاري (٤٣٨٠)، ومسلم (٢٤٢٠)، وأحمد (٣٩٣٠) وقال محققوه: اسناده صحح على شرطهما، والنسائي

**متمانە پێکراوی ئەم ئومەتەیە))].**

**لە گێڕانەوەیەکی تردا: ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: [خەڵکی یەمەن هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان: پیاوێکمان لەگەڵدا بنێرە کتێبەکەی خوداو سونەت و ئیسلامان فێربکات، پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی ئەبو عوبەیدەی گرت و فەرمووی: ((ئەمە متمانە پێکراوی ئەم ئومەتەیە)) [و لەگەڵی ناردن]][1348].**

**لە گێڕانەوەیەکی (لاوازدا) هاتووە وەك شەعبی ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی نوسی بۆ گاورەکانی ناوچەی نەجران و تێیدا هاتبوو: ((أَنْ مَنْ بَايَعَ مِنْكَ بِالرِّبا فَلا ذِمَّةَ لَهُ))[1349] واتە: ((هەر کەسێك لە ئێوە مامەڵە بە ڕیبا (سوو) بکات پەیمانی لەگەڵدا هەڵدەوەشێنرێتەوە))]. وە ئەبو مولەیح ﷺ دەفەرموێت: [وە تێیدا هاتبوو: ((نابێت ریبا واتە: (سوو) بخۆن گەر ئەوەیان ئەنجامدا من بێبەریم لە هەموو پەیمانەکانیان))][1350].**

**وەفدەکەی نەجران خاڵێکی ڕەشیان بە قاچی عومەرەوە ﷺ بینی وتیان: ئەمە ئەو کەسەیە کە ڕامان دەگوێزێت لە ناوچەکەمان: ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: [عومەر سواری ئەسپێك بوو [لە زەمانی پێغەمبەری خوا ﷺ] و غاری داو ڕانی و قاچی دەرکەوت کە خاڵێکی ڕەشی پێوە بوو وتیان: ئەمە ئەو پیاوەیە کە لەکتێبەکەماندا هاتووە کە دەرمان دەکات لە ناوچەکەی خۆمان][1351]. وە موغەیرەش ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ منی نارد بۆ ناوچەی نەجران، ئەوان بە منیان وت: ئێوە لە قورئانەکەتاندا ئەمەی تێدایە (يَا أُختَ هَارُونَ)، بەڵام لە نێوان عیسا و موسادا [خودا دەزانێت چەندەها ساڵ هەیە؟] دەڵێت: من نەم دەزانی چیان وەڵام بدەمەوە، تا دواتر گەڕامەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وە بەمنی فەرموو: ((أَلَّا**

---

(الكبرى) (٨١٩٦)، وابن ماجة (١٣٦).

(١٣٤٨) أخرجه: أحمد (١٢٤٨١،١٤٠٤٨،١٣٢١٧) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم. أخرجه: ابن أبي شيبة (المصنف) (٣٨١٧٠) وقال محققه: مرسل واسناده ضعيف.

(١٣٤٩) أخرجه: ابن أبي شيبة (المصنف) (٣٨١٧٠) وقال محققه: مرسل واسناده ضعيف.

(١٣٥٠) أخرجه: ابي عبيد (الأموال) (٥٠٢)، وابن زنجوية (الأموال) (٧٣٢) وقال محققه: مرسل واسناده ضعيف وفيه متروك.

(١٣٥١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٣)، وابو نعيم (معرفة الصحابة) (١٧٢٥) واسناده صحيح كما قال السيوطي انظر (منتخب كنز العمال) (٣٦٩/٥) وقال الهيثمي (المجمع) (٦١/٩): اسناده حسن.

أَخْبَرْتَهُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا يُسَمَّوْنَ بِأَنْبِيَائِهِمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ))(١٣٥٢) واتە: ((ئەی بۆ پێت نەوتن ئەوان بەناوی پێغەمبەران و پیاو چاکانی پێش خۆیان ناویان دەبردن))]. بەڵام لە زەمانی عومەردا پەیمان نامەکەیان شکاند و کەوتنە ڕیباو سوو خۆریی وە ئەوەش هۆکاری گواستنەوەیان بوو(١٣٥٣).

سالم ﷺ دەفەرموێت: [خەڵکی نەجران ژمارەیان گەیشتە چل هەزار کەس، عومەر ﷺ دەترسا لە پشتەوە ناپاکیی لە موسوڵمانان بکەن، دواتر خۆیان ئیرەیی کەوتە نێوانیان، هاتنە خزمەت عومەر ﷺ وتیان: ئێمە ئیرەییمان کەوتۆتە نێوان لەبەر ئەوە رامان بگوێزە. پێشتریش نامەی پێغەمبەری خوایان ﷺ لابوو کە نابێت کەس ڕایان بگوێزێت. عومەر ﷺ ئەم ئیرەییەی بەهەلێکی گونجاو زانی بۆ ڕاگواستنیان. ئەوان دواتر پەشیمان بوونەوە و هاتن و وتیان: ئێمە لە بڕیارەکەمان پاشگەز دەبینەوە. عومەر ﷺ ئەوەی لێقبوڵ نەکردن و ڕای گواستن. لە سەردەمی عەلی ﷺ هاتنەوە و پێیان وت: گەورەی بڕواداران نوسراوت بەدەست خۆتەو تکاکردن لە زمانی خۆتدایە، عومەر پێشتر ئێمەی لە ناوچەکەمان ڕاگواستین. تۆ ئێمە بگێڕەوە. عەلی ﷺ ڕازی نەبوو وە فەرمووی: ئەی هاوار لە ئێوە عومەر فەرمانەکانی ڕێك و ڕاست بوون وە من هیچ فەرمانێکی ئەو ناگۆڕم](١٣٥٤).

ناوی چەندەها وەفد هاتووە بەڵام هەموویان ئیسنادیان لاوازە و ناکرێنە بەڵگە و ئێمەش لێرەدا نەمان هێناون. تێکڕای وەفدەکانیش ژمارەیان دەگاتە سەد وەفد هەندێك لەوانە وەفدی حەزرەمەوت، بەنی عەبس، بەنی مورە، بەنی سوعلبە، بەنی کیلاب، بەنی عەقیل، بەنی سحیم، بەنی هیلال، بەنی بکاء و ئەشجەع و باهیلە و بەنی سولیم و تەغلیب و تەجی و خەوەلان و جەعف و زوبەید و ئەلسەدەف و خوشبین و بەنی عەزرە و بەهدا و جوزام و غەسان و عەمیش و موزحیج و غامود و نەفەع و ئەزد و غافیق و سومالە و ئەسلەم و مەهرە و جیشان و بەنی نومەیر و بەنی سیباع و ڕەبیعە.... هتد(١٣٥٥).

---

(١٣٥٢) أخرجه: مسلم (٢١٣٥)، (١٦٨٥)، والترمذي (٣١٥٥)، وابن حبان (٦٢٥٠)، والطبراني (الكبير) (٩٨٦/٢٠).

(١٣٥٣) أخرجه: ابو يوسف القاضي (الخراج) (ص:٧٢)، وابي عبيد (الأموال) (٥٠٤).

(١٣٥٤) أخرجه: ابن أبي شيبة (المصنف) (٣٨١٧٢،٣٣٦٦٧) في اسناده سالم وهو لم يدرك عمر ﷺ.

(١٣٥٥) أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٣٢٠،٣٦٠/١)، وابن كثير في (البداية) (٨٠،٩١/٥)، انظر (جمهرة انساب العرب)

## ناردنی موعازی کوڕی جەبەل ﷺ و ئەبوموسای ئەشعەری ﷺ بۆ یەمەن

پێغەمبەری خوا ﷺ بایەخێکی تایبەتی بە یەمەن دەدا چونکە ئەوان عەرەبی ڕەسەنن وە سەرچاوەی عەرەبن و بە کەسانێکی ژیر و زاناو دانا ناسرابوون ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەفەرمویێت: [کاتێك ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥ...... ﴿٥٤﴾ ﴾ (المائدة) واتە: (ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە! هەرکەسێکتان لەئایینی خۆی، (واتە: لەدینی ئیسلام) پاشگەز بێتەوەو وەرگەڕێ ئەوا خوا لەمەولا کەسانێك دێنێت، ئەوەندە گوێڕایەڵی دەبن خۆشی دەوێن و ئەوانیش ئەویان خۆشدەوێ و لەئاستی خاوەن باوەڕاندا، خۆ بەکەمزان و بەسۆزن و بەرامبەر بە بێ باوەڕان و خۆ بەگەورەزان و سەربڵندو دەروون بەرز و توندوتیژو بەهەڵمەتن، وە بۆ ڕەزامەندی خواش تێدەکۆشن و جەنگ دەکەن و لە تەشەرو لۆمەی لۆمەکەرانیش ناترسن و باکیان نابێ، ئەو خۆشەویستی و تێکۆشانە فەزڵ و بەخششی خوایە بەهەرکەسێك خۆی بییەوێ دەیدا و خواش فەزڵ و میهرەبانی فراوانە، زۆریش زانایە، دەزانێ کێ شایستەی ئەو بەخشینەیە) پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی بەدەستەوە بوو بەوە دەستی ڕاکێشا بۆ ئەبو موسا[١٣٥٦] و فەرمووی: ((ئەوانە قەومی ئەبو موسان))[١٣٥٧].

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرمویێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((إذا جاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالفَتح وَجَاءَ أَهلُ اليَمن رقيقة أَفْئِدَتهُمْ، لَيِّنةٌ طباعهُمْ، سَخيَةٌ قُلُوبهُمْ عَظِيمةٌ خَشِيتهُمْ فَدَخَلوا فِي دِينِ اللهِ أَفْوَاجًا))[١٣٥٨]. واتە: ((هەرکات سەرکەوتنی خودا هاتە دی و خەڵکی یەمەن هاتن ئەوان هەموو دڵیان نەرمە و بەخشندەو لە خوا ترسن و خوڕەوشت نەرم و

---

(٤٨٠،٤٢٠)، و(السيرة في ضوء مصادرها الأصلية) (ص: ٦٦٨،٦٧١).

(١٣٥٦) أخرجه: البخاري (الادب المفرد) (٣٧)، الترمذي) (٣٧٩٥)، والحاكم (٢٣٣/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وصححه كل من: الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٨٧٥) و (صحيح الأدب) (٢٥٧)، والشيخ مقبل (الصحيح المسند) (١٣٠٩).

(١٣٥٧) أخرجه: الحاكم (٣١٣/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، و الطبراني (الكبير) (٧١/٧)، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣٣٦٨).

(١٣٥٨) أخرجه: النسائي (الكبرى) (١١٦٤٨)، ابن حبان (٧٢٩٨) وقال محققه: صحيح لغيره، و الطبري (٣٨٢٣٠) وقال محققه: حديث حسن، واللفظ له.

جوانن)) وە دواتر هەموویان بە کۆمەڵ هاتنە ناو ئیسلامەوە]. پێغەمبەری خوا ﷺ لە هاوەڵانیدا موعازی هەڵبژارد چونکە ئەو خاوەنی چەندەها سەروەری بوو لەوانە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ أَعْلَمُ النَّاسِ بِحَلاَلِ الله وَحَرَامِهِ))[(١٣٥٩)] واتە: ((موعازی کوڕی جەبەل لە هەموو خەڵکی زاناترە بە حەڵاڵ و حەرامی خودا)). وە دەیفەرموو: ((إنَّ العُلَماءَ إذا حَضَرُوا رَبَّهُمْ عَزَوَجَل يَومَ القِيامَةِ كَانَ مُعاذُ بَيْنَ أَيْدِيِهم رتَوةً (أي: رميةً) بِحَجرٍ)) واتە: ((زانایان کاتێك دەچنە خزمەتی خودا لەقیامەتدا موعاز لە پێش هەموویانەوە دەبێت بە ماوەی بەرد هەڵدانێك)) موعاز سەخی تەبیعەت بوو بەهۆیەوە توشی قەرزاریی هاتبوو، بۆیە نێردرا بۆ یەمەن تا بتوانێت قەرزەکانی پڕبکاتەوە. کەعبی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: [موعازی کوڕی جەبەل ﷺ گەنجێکی چاو لێپۆشەر و لەسەرخۆ بوو، لەناو هەموو گەنجانی خزمانی خۆی باشتر بوو، لە ساڵی ئازاد کردنی مەککەدا پێغەمبەری خوا ﷺ کردیە بەرپرسی کۆمەڵێك و ناردیە یەمەن][(١٣٦٠)].

وە هەروەها دەفەرموێت: [موعازی کوڕی جەبەل گەنجێکی جوان و لەسەرخۆ و چاو لێپۆشەر بوو باشترینی گەنجانی خزمانی خۆی بوو، [پارەی لای خۆی نەدەهێشتەوە، بەو جۆرە بەردەوام بوو تا بەتەواویی قەرزارییەکی قورسی بەسەر خۆی هێنا] پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی لەگەڵ خاوەن قەرزەکاندا کرد و ئەوان نەیان توانی بۆی کەم بکەنەوە، لەڕاستیدا ئەوان بۆ هەرکەسێکیان کەم نەکردایەتەوە لەبەر تکاکاری پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ معازیان کەم دەکردەوە، بۆیە ناچارانە هەموو ماڵەکەی موعاز فرۆشراو دابەشی خاوەن قەرزەکان کرا بەو هۆیەوە موعاز بێ پارە و مایەپوچ بوو... پێغەمبەری خواش ﷺ ناردی بۆ یەمەن تا قەرەبوویەکی بۆ بکاتەوە...][(١٣٦١)].

پێشتر ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دوو کەس لە خزمانی لەگەڵی چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ داوای بەر پرسیارێتیان لێکرد، بەوان ڕازی نەبوو لە جێ ئەوان بە

---

(١٣٥٩) أخرجه: ابو نعيم (الحلية) (٢٢٨/١)، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (١٤٣٦).

(١٣٦٠) أخرجه: ابن سعد (٣٤٧،٣٤٨/٢)، وابو نعيم (الحلية) (٢٢٩/١) وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (١٠٩١) و (صحيح الجامع) (٤٨٩).

(١٣٦١) أخرجه: الحاكم (٣٠٦/٣) وصححه على شرطهما، و البيهقي (الدلائل) (٢١٢٧) وقال محققه: اسناده صحيح.

ئەبو موسای ﷺ فەرموو: ((...بەڵام ئەبو موسا تۆ لە جێی ئەوان بڕۆ بۆ یەمەن)) ئیتر بەو جۆرە ناردی بۆ یەمەن و بەدوایدا موعازیشی نارد[١٣٦٢]. پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك ئەوانی نارد بوو [فەرمانی پێکرد بوون خەڵکی فێری قورئان بکەن][١٣٦٣].

ئیبنو عەباس ﷺ و ئەبو بوردە ﷺ دەفەرموون: [پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو موسا و مەعازی ﷺ نارد بۆ یەمەن و پێی فەرموون: ((يَسِّرَا وَلَا تُعَسِّرَا، وَبَشِّرَا وَلَا تُنَفِّرَا وَتَطَاوَعَا [وَلَا تَخْتَلِفا -وفي رواية- وَلَا تَفْتَرِقَا]))[١٣٦٤] واتە: ((کار ئاسانی بکەن و کارگرانی مەکەن وە دڵیان خۆش بکەن و ڕاویان مەنێن وە تەبابن و [جیاواز و ناکۆك مەبن]))]. وە فەرمووی: ((عِلّموا ويسرّوَلا تُعَسّرُوا وَإذا غَضِبَ أَحَدُكُمْ فَلْيُسكِت))[١٣٦٥] واتە: ((فێرکاربن و کار ئاسانی بکەن و بارگرانی مەکەن وە گەر یەکێکتان توڕەبوو با بێدەنگ بێت)). وە فەرمووی: ((سكنُوا ولاتُنفرِوا))[١٣٦٦]. واتە: ((ئارامیان بکەن و (ئەو خەڵکە لە ئاینەکەیان) ڕاو مەنێن)). وە بە هەردووکیانی فەرموو: ((لَا تأخذا الصَّدَقَة إلَّا من هَذهِ الْأَرْبَعَة: الشّعِير، وَالْحِنْطَة، وَالزَّبِيب، وَالتَّمْر ))[١٣٦٧] واتە: ((زەکات تەنها لە گەنم و جۆ و مێوژ و خورما وەربگرن)).

ئەبو موسا ﷺ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و وتی: [ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناوچەکەماندا شەرابێکیان هەیە پێی دەڵێن (ئەلمیزەر) لە جۆ دروستی دەکەن وە شەرابێکی تریان هەیە ناوی (ئەلبیتەع) لە هەنگوین دروستی دەکەن. (ئایا دروستە خواردنەوەیان؟). فەرمووی: ((كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ))[١٣٦٨] واتە: ((هەموو سەرخۆشکەرێك حەرام و قەدەغەیە)). لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: [وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان شەرابێکیان هەیە لە ترێ دروستی دەکەن دەی کوڵێنن

(١٣٦٢) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٤٤/٢٠)، وعبدالرزاق (١٥١٧٧)، والحاكم (١٦٩،٢٧٣/٣) وصححه غلى شرطهما ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (٢١٢٨)، وقال الحافظ في (المطالب) (٦٩/١): اسناده صحيح.

(١٣٦٣) أخرجه: البخاري (٦٥٢٥)، ومسلم (١٧٣٣).

(١٣٦٤) أخرجه: الحاكم (٥٦٧/١) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي.

(١٣٦٥) أخرجه: البخاري (١٠٨٨)، ومسلم (١٧٣٣)، وأحمد (٢١٣٦).

(١٣٦٦) أخرجه: البخاري (الأدب المفرد) (٤٧٣٩)، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (١٣٧٥) و (صحيح الأدب المفرد) (١٨٤).

(١٣٦٧) أخرجه: الحكم (٤٠١/١) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (١١٨/٤) وصححه الشيخ الألباني في (تمام المنة) (٣٦٩) و (الارواء) (٨٠١).

(١٣٦٨) أخرجه: البخاري (٤٣٤٤،٤٣٤٥).

تا خەست دەبێتەوە و (ئەلمیزەر) یان هەیە لە جۆ و گەنمە شامی دروستی دەکەن (ئایا دروستە؟) فەرمووی: ((كُلُّ مَا أَسْكَرَ عَنِ الصَّلَاةِ فَهُوَ حَرَامٌ))(١٣٦٩) واتە ((هەموو شتێك خاوەنەکەی لە نوێژ سەرخۆش بکات حەرام و قەدەغەیە))].

## ئامۆژکاریەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ موعازی کوڕی جەبەل

١- ئیبنو عەباس ﷺ دەیگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك موعازی نارد بۆ یەمەن ئامۆژگاری کرد و فەرمووی: ((تۆ دەچیتە ناوچەیەکەوە جولەکەو گاورو خاوەن کتێبی لێیە. گەر چویتە لایان بانگیان بکە تا شایەتی بدەن کە هیچ خوایەك نییە جگە لە الله وە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خودایە، گەر ئەوان لەوەدا گوێڕایەڵت بوون پاشان پێیان ڕابگەیەنە کە خودا پێنج نوێژی بە پێویست داناوە لەسەریان لە شەو ڕۆژێکدا، وە گەر لەوەشدا گوێڕایەڵت بوون، پێیان ڕابگەیەنە خودا بە پێوستی داناوە لە سەریان زەکات لە دەوڵەمەندەکانیان وەربگیرێت و بدرێتە هەژارەکانیان، گەر ئەوان لەوەشدا گوێڕایەڵت بوون وریابە چاکترینی سامانەکانیان لە زەکاتدا وەرمەگرە، وە خۆت بپارێزە لە دوعای ستەم لێکراو چونکە هیچ بەربەستێك لە نێوان ئەو وخوادا نییە))](١٣٧٠).

٢- موعاز ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاری کردم و فەرمووی: ((يَا مُعَاذُ [اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُما كُنْتَ وَ] أَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ))(١٣٧١) واتە ((ئەی موعاز [لە هەر جێگەیەك بوویت لە خودا بترسەو گوێڕایەڵی ببە] وە چاکە ئەنجام بدە لە دوای خراپە دەیسڕێتەوە وە بە ڕەوشتی جوان ڕەفتار لەگەڵ خەڵکی بکە))].

٣- موعاز ﷺ دەفەرموێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: ((أَفْشِ السَّلَامَ، وَابْذُلِ الطَّعَامَ، وَاسْتَحِي اللهَ إِسْتِحياءَكَ رَجُلاً مِنْ أَهلِكَ، وَإِذَا أَسَأْتَ

---

(١٣٦٩) أخرجه: أحمد (٤١٧/٤)، والطيالسي (٤٧٩) ،ابن حبان (٥٣٧٣) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

(١٣٧٠) أخرجه: البخاري (٤٣٤٧).

(١٣٧١) أخرجه: أحمد (٢٩٨٨) وقال محققوه: حديث حسن، والترمذي (١٩٨٧)، والطبراني (الكبير) (١٢٩٨/٢٠)، والبيهقي (الشعب) (٧٦٦٠) وقال محققه: اسناده حسن، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣١٦٠).

فَأَحْسِنْ وَلتحُسَنِ خُلقكَ مَا اسْتَطَعْتَ))[١٣٧٢] واته: ((سڵاو لەخەڵك بکە و خواردن ببەخشە بە وێنەی پیاوێکی خزمانی خۆت، شەرم لە خودا بکە، وە گەر خراپەت ئەنجامدا چاکە بەدوایدا بکە  و تادەتوانیت با ڕەوشتت جوان بێت)).

٤- موعاز ﷺ دەفەرموێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: ((اعْبُدِ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، وَاعْدُدْ نَفْسَكَ فِي الْمَوْتَى، [(و) عَلَيْكَ بِتقوى اللهَ مَا استَطَعْتَ] وَاذْكُرِ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ عِنْدَ كُلِّ حَجَرٍ وَعِنْدَ كُلِّ شَجَرٍ، وَإِذَا عَمِلْتَ سَيِّئَةً [فاحدث عندها تَوْبَةً] (و) اعْمَلْ بِجَنْبِهَا حَسَنَةً: السِّرُّ بِالسِّرِّ، وَالْعَلَانِيَةُ بِالْعَلَانِيَةِ ))[١٣٧٣] واته: ((خوا بپەرستە وەك ببیبنیت (و چاوت لێی بێت) وە خۆت بە مردووەکان بژمێرە و [تا دەتوانیت گوێڕایەڵ و فەرمان بەرداری خوا ببە] وە یادی خودا بکە لای هەموو بەردێك و لای هەموو درەختێك، وە گەر خراپەت ئەنجامدا [تۆبەی بۆ تازە بکەرەوە] وە لەگەڵیدا چاکە ئەنجام بدە نهێنی بەنهێنی و ئاشکرا بەئاشکرا)). وە لە گێڕانەوەیەکی تردا فەرمووی: ((اعْبُدِ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ وَاعْدُدْ نَفْسَكَ فِي الْمَوْتَى وَإِنْ شِئْتَ أَنْبَأْتُكَ بِما هُوَ أَمْلَكُ لِكَ مِنْ هَذا كُله قَالَ مَا هُو قَالَ هَذا وَأَشارَ بِيَدِهِ إِلى لِسانِهِ))[١٣٧٤] واته: ((خودا بپەرستە وەك ئەیبینیت. وە گەر دەتەوێت پێت ڕادەگەیەنم شتێك کە پێویستە ئاگات لێی بێت ئەمەیە)). دەستی ڕاکێشا بۆ زمانی].

٥- موعاز ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ((إِيَّاكَ وَالتَّنَعُّمَ؛ فَإِنَّ عِبَادَ اللَّهِ لَيْسُوا بِالْمُتَنَعِّمِينَ))[١٣٧٥] واته: ((خۆت دووربگرە لە ژیانی پڕ ناز و نیعمەت چونکە بەندەکانی خودا بەو جۆرە نین)).

٦- موعاز دەفەرموێت: [وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: ((أَعْبُدُ اللَّهَ وَلاَ تُشْرِكْ بَهِ شَيْئاً قَالَ: يا نَبـيَ اللَّهَ زِدْنِي؟ قَالَ: إذا أَسَأتَ فَأَحِسنْ)) واته: ((خوا بپەرستە وە هیچ شتێك مەکەرە هاوتای... وە گەر خراپەت کرد چاکە بەدوایدا

---

(١٣٧٢) أخرجه: المروزي (الايمان) (٢٢٦/١)، والبزار (٢١٧٢)، وحسنه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣٥٥٩).

(١٣٧٣) أخرجه: ابن أبي شيبة (المصنف) (٣٥٤٦٦)، الطبراني (الكبير) (٣١٣،٣٧٤/٢٠)، وأحمد (الزهد) (ص:٢٦)، والحديث حسنه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣١٥٩) و (الصحيحة) (١٤٧٥،٣٣٢٠).

(١٣٧٤) أخرجه: ابن أبي الدنيا (الصمت) (٢٧٠) وقال محققه: اسناده ضعيف، والشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٢٨٧٠): حسن لغيره.

(١٣٧٥) أخرجه: أحمد (٢٢١٠٥) وقال محققوه: اسناده ضعيف، والطبراني (الشاميين) (١٣٩٥)، وابو نعيم (الحلية) (١٥٥/٥)، وحسنه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣٥٣)، وفي (المشكاة) (٥٢٦٢).

بکە... ((استَقِمْ وَلْيُحسِنْ خُلقَكَ))[١٣٧٦] واتە: ((دامەزراوبە و با ڕەوشتت جوان بێت)).

٧- موعاز ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ دە ئامۆژگاری کردم و فەرمووی: ((لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ شَيْئًا وَإِنْ قُتِلْتَ وَحُرِّقْتَ، وَلَا تَعُقَّنَّ وَالِدَيْكَ، وَإِنْ أَمَرَاكَ أَنْ تَخْرُجَ مِنْ أَهْلِكَ وَمَالِكَ، وَلَا تَتْرُكَنَّ صَلَاةً مَكْتُوبَةً مُتَعَمِّدًا؛ فَإِنَّ مَنْ تَرَكَ صَلَاةً مَكْتُوبَةً مُتَعَمِّدًا فَقَدْ بَرِئَتْ مِنْهُ ذِمَّةُ اللَّهِ، وَلَا تَشْرَبَنَّ خَمْرًا؛ فَإِنَّهُ رَأْسُ كُلِّ فَاحِشَةٍ، [(و) شرّ] وَإِيَّاكَ وَالْمَعْصِيَةَ؛ فَإِنَّ بِالْمَعْصِيَةِ حَلَّ سَخَطُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَإِيَّاكَ وَالْفِرَارَ مِنَ الزَّحْفِ [وَلَا تَنازَعَنَّ وُلاةَ الأَمرِ وَإِنْ رَأَيْتَ أَنَّكَ أَنْتَ] وَإِيّاكَ وَالفِرارَ مِن الزَّحفِ وَإِنْ [فَرَّ أَصْحَابَكَ] (و) إِنْ هَلَكَ النَّاسُ، وَإِذَا أَصَابَ النَّاسَ مُوتَانٌ وَأَنْتَ فِيهِمْ فَاثْبُتْ، وَأَنْفِقْ عَلَى عِيَالِكَ مِنْ طَوْلِكَ، وَلَا تَرْفَعْ عَنْهُمْ [عَصَاكَ على أَهْلِكَ] أَدَبًا وَأَخِفْهُمْ فِي اللَّهِ))[١٣٧٧]

واتە: ((هیچ شتێك مەكەرە هاوتا بۆ خوا گەر كوژرايت و سوتێنرايت وە ئازاری باوك و دايكت مەدە و بێ فەرمانييان مەكەو گەر داواشيان لێكرديت واز لە ماڵ و منداڵ و هاوسەرت بهێنيت، وە واز لە نوێژێكی فەرز نەهێنيت هەرگيز، چونكە هەركەسێك نوێژێكی فەرز واز لێبهێنێت پەنادان و پەيوەندی بەخوداوە نامێنێت، وە هەرگيز مەی نەخۆيتەوە چونكە ئەوە سەری هەموو خراپەيەكە، وە خۆت دوور بگرە لە تاوان چونكە بە هۆی تاوانەوە ڕق و قينی خوا دێتە خوار [وە ململانێی فەرمانڕەواكان نەكەيت هەرچەندە خۆت بەشياو بزانيت] وە خۆت دووربگرە لە ڕاكردن لە گۆڕەپانی جەنگ گەر [هەموو هاوڕێكانت ڕايان كرد] يان لە ناوچوون، وە گەر خەڵكی لە شوێنێكدا توشی نەخۆشی و مەرگەسات هاتن و تۆ لەناويان بوويت لەوی بمێنەرەوە و دەرمەچۆ، وە لە گوێرەی توانا پارە خەرج بكە بۆ خێزانەكەت [وە هەرگيز گۆچانەكەت لە هاوسەرەكەت بەرز نەكەيتەوە] وەك نەريتی جوان و تەنها بە خودا بيان ترسێنە)).

٨- موعاز ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ منی نارد بۆ يەمەن و فەرمانی پێ

(١٣٧٦) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٧١٤/٤) وفي (مكارم الاخلاق) (٨٥)، والطيالسي (٧٩٤)، والحاكم (٤٥/١) و (٤٤٢/٤) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٤٢٥) وقال محققه: اسناده حسن، والبيهقي (الشعب) (٤٦٦٧) وقال محققه: اسناده لاباس به، وحسنّ الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣١٥٨).

(١٣٧٧) أخرجه: أحمد (٢٢٠٧٥) وقال محققوه: اسناده ضعيف، والطبراني (الكبير) (١٥٦/٢٠)، و البخاري (الأدب المفرد) (١٨)، و ابن ماجة (٣٣٧١) وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الأدب المفرد) (١٤)، وفي (الاوراء) (٢٠٨٦)، وفي (صحيح الجامع) (٤٠٣٤) واللفظ لأحمد و الزيادات للبخاري في (الادب المفرد).

کردم لە هەموو سی سەر مانگایەك گوێرەکەیەکی نێر یان مێ وەربگرم، وە لە هەموو چل سەرێك چوار ساڵێك وەربگرم وە لە هەموو مرۆڤێکی باڵغ دینارێك وەربگرم یان هاوشیوەکەی لە پۆشاکی موعافیر][١٣٧٨].

٩- موعاز ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ منی نارد بۆ یەمەن فەرمووی: ((أَيُّمَا رَجُلٍ ارْتَدَّ عَنِ الْإِسْلَامِ فَادْعُهُ، فَإِنْ عَادَ وَإِلاَّ فَاضْرِبْ عُنُقَهُ، وَأَيُّمَا إِمْرَاةٍ ارْتَدَّتْ عَنِ الْإِسْلَامِ فَادْعُهَا فَإِنْ عَادَتْ وَإِلاَّ فَاضِرِبْ عُنُقَهَا))[١٣٧٩] واتە: ((هەر پیاوێك لە ئیسلام پاشگەز بووەوە بانگی بکەرەوە بۆ ئیسلام گەر گەڕایەوە باشە ئەگەر نەگەڕایەوە لە گەردنی بدە. وە هەر ژنێك لە ئیسلام پاشگەزبووەوە بانگی بکەوە بۆ ئیسلام وە ئەگەر نەگەڕایەوە لە گەردنی بدە].

١٠- موعاز ﷺ دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی من بنێرێت بۆ یەمەن پرسیاری لێکردم و فەرمووی: ((گەر کارێکت بەرەو ڕووکرایەوە چۆن دادوەری دەکەیت؟)) وتم: بە کتێبەکەی خودا. فەرمووی: ((گەر لە کتێبەکەی خودایا نەبوو؟)) وتم: بە سونەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ. فەرمووی: ((فَإِنْ لَمْ تَجِدْ فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ، وَلَا فِي كِتَابِ اللَّهِ؟)) واتە: ((گەر لە کتێبەکەی خودا و سونەتەکانی پێغەمبەردا نەبوو؟)) وتم: بە گوێرەی ڕاوبۆچوونی خۆم کۆششی بۆ دەکەم. ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کێشا بەسەر سنگی موعازدا و فەرمووی: ((الحَمْدُ للّه الذي وَفقَّ رَسُول رَسولِ اللّه لما يُرضي رسول الله))[١٣٨٠] واتە: ((سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە نیردراوی پێغەمبەری خوای ﷺ

(١٣٧٨) أخرجه: ابو داود (١٥٧٨)، والترمذي (٦٢٣)، والنسائي (٣٣٩/١)، وابن ماجة (١٨٠٣)، والحاكم (٣٠٩/١) وصححه ووافقه الذهبي، وقال الشيخ الألباني في (الارواء) (٢٦٩/٣): صحيح على شرطهما.

(١٣٧٩) أورده: الحافظ في (الفتح الباري) (٣٣٧/١٢) كتاب (استنابة المرتدين) وقال: اسناده حسن.

(١٣٨٠) أخرجه: أحمد (٢٢٠٠٧) وقال محققوه: اسناده ضعيف، ابو داود (٣٥٩٣) واللفظ له، و الترمذي (١٣٢٨)، وابن سعد (٣٤٧/٢)، الدارمي (١٧٠) وقال محققه: اسناده ضعيف، والطيالسي (٥٦٠) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابن أبي شيبة (المصنف) (٢٣٤٤٢) وقال محققه: حديث قويّ ثابت، والبيهقي (الكبرى) (١١٤/١)، وقد صحح الحديث كلّ من ابن العربي (أحكام القرآن) (٤٥٣/١)، وابن تيمية (مجموع) (الفتاوى) (٦٤/١٣) و (دقائق التفسير) (١١٠/١)، ابن القيم (أعلام الموقعين) (١٥٤/١)، ابن عبد البر (جامع بيان العلم) (٩٤/٢) (قم:١٥٩٢)، وابن كثير (التفسير) (٧/١)، الخطيب البغدادي (الفقيه و المتفقه) (٢٥٢) وقال محققه: اسناده ضعيف، وضعّف الحديث كلّ من: الترمذي و البخاري، والعقيلي و الدارقطني وابن حزم وابن طاهر و عبدالحق الاشبلي، والجوزقاني وابن الجوزي و الذهبي و السبكي و الحافظ العراقي ابن الملقن و الشيخ الألباني: انظر: (الضعيفة) (٨٨١) و (المشكاة) (٣٧٣٧) و(تلخيص الحبير) (١٨٢/٤) و(خلاصة البدر المنير) (٢٨٣٧) و (المعتبر في تخريج أحاديث المناهج و المختصر) للزركشي (ص:٦٨)، والدارمي (٢٦٨/١) حاشية.

(ڕینمونی) کرد بۆ ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕازییە)).

پێغەمبەری خوا ﷺماڵئاوایی لە موعاز کرد و بەڕێیکرد! موعاز ﷺ دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ منی نارد بۆ یەمەن بۆ ماڵئاواییم لەگەڵم هات من سوار ببووم و ئەو بە پێ دەهات هەر ئامۆژگاری دەکردم و کاتێك تەواو بوو فەرمووی: ((يَا مُعَاذُ إِنَّكَ عَسَى أَنْ لَا تَلْقَانِي بَعْدَ عَامِي هَذَا وَلَعَلَّكَ أَنْ تَمُرَّ بِمَسْجِدِي هَذَا، وَقَبْرِي)) واتە: ((ئەی موعاز تۆ پێ دەچێت لە دوای ئەم ساڵ و ساتەوە جارێکیتر بە من نەگەیت، وە پێ دەچێت بەلای ئەم مزگەوتە و گۆڕەکەمدا بگەڕێیتەوە)) ئیتر منیش زۆر گریام بۆ دوور کەوتنەوەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لا تَبْكِ يا مُعَاذُ لِلبكاءِ أَوَانٌ إِنَّ البُكاءَ مِن الشَّيْطانِ))][١٣٨١] واتە: ((موعاز مەگری گریان کاتی خۆی هەیە وە گریان لە شەیتانەوەیە (واتە: گریانی زۆری بێهۆ))]. پاشان ڕووی کردە شاری مەدینە و فەرمووی: (([إِنَّ أَهْلَ بَيْتِي هَؤُلَاءِ يَرَوْنَ أَنَّهُمْ أَوْلَى النَّاسِ بِي، وَلَيْسَ كَذَلِكَ. إِنَّ أَوْلِيَائِي] (و) أَوْلَى النَّاسِ بِي الْمُتَّقُونَ مَنْ كَانُوا وَحَيْثُ كَانُوا [١٣٨٢] [اللَّهُمَّ إِنِّي لَا أُحِلُّ لَهُمْ فَسَادَ مَا أَصْلَحْتُ، وَايْمُ اللَّهِ لَتُكْفَأَنَّ أُمَّتِي عَنْ دِينِهَا كَمَا تُكْفَأُ الْإِنَاءُ فِي الْبَطْحَاءِ]))[١٣٨٣]] واتە: ((بنەماڵەکەم وا دەزانن ئەوان نزیکترینن بۆ من بەڵام وانییە] نزیکترین کەس بە من گوێڕایەڵانە و فەرمان بەجێکارانن هەر کەسێك بن ولە هەر شوێنێك بن. [خودایە من بە ڕەوای دانانێم بۆیان ئەوەی تۆ چاکتکردووە ئەوان خراپی بکەن، سوێند بە خوا ئومەتەکەم لە ئاینەکەیان دەردەکەن وەك چۆن ئاو قلْپ دەکرێتەوە بە سەر زەویدا].

موعاز ﷺ دەفەرموێت: [کۆتاهەمین قسە کەمن پێغەمبەری خوام ﷺ بەجێ هێشت لەسەری ئەوە بوو وتم: لە کارەکاندا کامەیان خۆشەویستترینە لەلای خوا؟ یاخود وتم: [پێم ڕابگەیەنە چاکترینی کارەباشەکان و نزیکترینیان لە خودا کامانەن؟]

---

(١٣٨١) أخرجه: أحمد (٢٢٠٥٤) وقال محققوه: اسناده صحيح، والطبراني (الكبير) (١٢٤٢/٢٠) وفي (الشامين) (٩٩١)،البيهقي (الدلائل)٤/٤٠٥(٤) وفي (الكبرى) (١٠٨٦)، والبزار (٢٩٤٧)، وابن أبي عاصم (الآحاد) (١٨٣٧) وصححه الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (١١١٨).

(١٣٨٢) أخرجه: أحمد (٢٢٠٥٢) وقال محققوه: اسناده صحيح، والطبراني (الكبير) (١٢٤١/٢٠)، والبزار (٣٦٤٧)، وابن حبان (٦٤٧) وقال محققه: سنده قوي، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢٤٩٧) والشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (١١٢٠).

(١٣٨٣) أخرجه: الطبراني (الكبر) (١٢٤١/٢٠)، وابن عاصم (السنة) (٢١٢٠) وقال محققه: اسناده صحيح، وقال الهيثمي (المجمع) (٢٣٢/١): سنده جيّد.

فەرمووی: ((أَنْ تَمُوتَ وَلِسَانُكَ رَطْبٌ مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ))[(١٣٨٤)] واتە: ((ئەوەیانە کە تا مردن زمانت پاراو بێت بە یادی خوا)).

موعاز ﷺ بەرەو یەمەن ڕۆیشت و گەیشتنە ئەو ناوچەیە و لەوێ قازی و دادوەری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بۆ یەمەن، وە هەروەها فەرمانڕەوای جەنگیش بوو، وە زەکات کۆکەرەوەیان بوو وە پێش نوێژ خوێنیان بوو عەمروی کوڕی مەیمونی ئەودی ﷺ دەفەرموێت: [موعازی کوڕی جەبەل هات بۆ لامان بۆیەمەن نێردراوی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە پارشێودا گەیشتە لامان و دەنگی بە (الله أكبر) بەرزبووەوە و دەنگی زوڵالبوو ئیتر لەوساتەوە من خۆشم ویست...][(١٣٨٥)].

عەبدولڕەحمانی کوڕی سابت ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ موعازی نارده یەمەن وە کاتێك گەیشتە لامان وتی: [ئەی خەڵکینە [ئەی کوڕانی ئەود] من نێردراوی پێغەمبەری خوام ﷺ بۆ لای ئێوە [پێتان ڕادەگەیەنم] [خودا بپەرستن و هیچ شتێك مەکەنە هاوەڵ و هاوتای، وە گوێڕایەڵیم بکەن تابتوانم لە خێر و بەرژەوەندیتان کارتان بۆ بکەم، چارەنووس و گەڕانەوەمان هەر بۆ لای خودایە] [پاشان یان بۆ بەهەشت یان بۆ ئاگر مانەوەیەکە هەتا هەتاییە و مەرگ نامێنێت و جەستەیەکیش هەرگیز نامرێت][(١٣٨٦)]. وە هەرخۆی دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ منی نارد بۆ لای هەندێك لادێی عەرەبنشین و فەرمانی پێکردم زەکاتی زەوییەکانیان لێوەربگرم][(١٣٨٧)].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووە زەکاتی خورماکان و جۆ و مێوژ... وە ئەوەی بە ئاوی باران و کانیاوەکانیان ئاو دەدرێت

---

(١٣٨٤) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٢٠٨/٢٠) واللفظ له وفي (الدعاء) (١٨٥٢) وقال محققه: اسناده صحيح وفي (الشامين) (١٩١)، والبيهقي (الشعب) (٥١٦)، وابن حبان (٢٣١٨)، وابن السُني (٢) وقال الهيثمي (المجمع) (٧٤/١٠): سنده حسن، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (١٤٩٢).

(١٣٨٥) أخرجه: أحمد (٢٢٠٢٠) وقال محققه: اسناده على شرط مسلم.

(١٣٨٦) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٣٧٥/٢٠)، البزار (٣٦٨٨)، والحاكم (٨٣/١) وصححه ووافقه الذهبي، ابن أبي شيبة (المصنف) (٣٥٥٠٦)، وصحح اسناده الحافظ في (المطالب) (٢٨٨١) والبوصيري (اتحاف الخيرة المهرة) (٩٧)، والشيخ الألباني في (الصحيحة) (١٦٦٨) واللفظ للحاكم والطبراني.

(١٣٨٧) أخرجه: أحمد (٢٢١١٧) وقال محققوه: اسناده صحيح، والترمذي (١٦٥٤)، والحاكم (٧٧/٢)، والبيهقي (الشعب) (٤٢٤٩).

دەیەکی تێدایە بەڵام کاڵەك و ترۆزی و پاقلە و سەوزە و هەنار و قامیش هەموو ئەوانە پێغەمبەری خوا ﷺ چاو پۆشی لە زەکاتەکانیان کردووە زەکاتیان نییە](١٣٨٨).

موعاز رضي الله عنه پێشنوێژی بۆ دەکردن وە ئاینەکەی فێردەکردن: عەلی کوڕی مودریك رضي الله عنه دەفەرموێت: [کاتێك موعاز رضي الله عنه هاتە یەمەن هۆزی (ئەلنەخەعی) فێردەکرد و پێی وتن: من لە نوێژدا چیم کرد ئێوەش ئەوە دووبارە بکەنەوە وەك من بکەن، کاتێك موعاز رضي الله عنه لە نوێژەکەیدا ویستی سوجدە ببات پەلکە درەختێك بە چاویدا دەچوو لەبەر ئەوە پەلکەکەی شکاند ئەوانیش لە دواوە هەموو یەکێکیان پەلکە درەختێکیان شکاند، کاتێك نوێژەکە تەواو بوو وتی: من ئەو پەلکەم شکاند چونکە دەچوو بەچاومدا و ئێوەش بەباشی گوێڕایەڵ بوون](١٣٨٩).

عەمروی کوڕی مەیمون رضي الله عنه دەفەرموێت: [موعاز رضي الله عنه جارێکیان لە نوێژی بەیانیدا ئەو ئایەتەی خوێند: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾ ﴾ (النساء) واتە: (خودا ئیبراهیمی کردە خۆشەویستترین بەندەی خۆی). لەو کاتەدا پیاوێك لە نوێژەکەیدا ئەمەی گوێ لێبوو وتی: ئەی مژدەبێت لە دایکی ئیبراهیم](١٣٩٠).

ناشیرەی کوڕی سەمی ئەلیزەنی رضي الله عنه دەڵێت: [من دوای موعازی کوڕی جەبەل رضي الله عنه کەوتبووم و قورئانی لێفێردەبووم لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوی نارد بوو بۆ یەمەن](١٣٩١).

جارێکیان ئافرەتێك هاتە خزمەت موعاز رضي الله عنه و پرسیاری لێکرد:

عائیزوڵڵای کوڕی عەبدوڵلا دەڵێت: [موعازی کوڕی جەبەل هات بۆ یەمەن. ئافرەتێك لە هۆزی خەوەلان دوانزە کوڕی هەبوو بچوکەکەیان تازە مووی ڕیشی دەرهاتبوو باوکی منداڵەکانی لە ماڵ بەجێ هێشتبوو. ئەو ئافرەتە دوو کوڕی ئەم

---

(١٣٨٨) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣١٣،٣١٤/٢٠)، والحاكم (٤٠١/١) وصححه الذهبي، والدارقطني (٩٧/٢) وهو ضعيف.

(١٣٨٩) أخرجه: ابن أبي شيبة في (المصنف) (٧٢٣٦).

(١٣٩٠) أخرجه: البخاري (٤٣٤٨)، والطبراني (الكبير) (١٢٥٢/٢٠).

(١٣٩١) أخرجه: الحافظ (الاصابة) (٨٨٦٨) عن ابن يونس.

لاولایان گرتبوو هاتە خزمەت موعاز ﷛ و سەلامی لێکرد و وتی: کێ تۆی ناردوە ئەی پیاو؟ موعاز ﷛ فەرمووی: [پێغەمبەری خوا ﷺ منی ناردوە و گوێڕایەڵی فەرمانەکانیم تا بتوانم، وە دەبێت تۆش گوێگرو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بیت. وتی: سوێندت دەدەم دەبێت پێم بڵێیت مافی پیاو بەسەر هاوسەرەکەیەوە چییە؟ موعاز ﷛ فەرمووی: باشە تۆ ڕازی نەبوویت کە گوێ بگریت و گوێڕایەڵ بیت و فەرمان بەرداری خودا بیت؟ وتی: بەڵێ ڕاست دەکەیت بەڵام من باوکی ئەوانم لە ماڵەوە بەتەنها جێ هێشتووە و بەساڵاچووە. موعاز ﷛ فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی موعازی بەدەستە گەر تۆ بگەڕێیتەوە بۆ لای چاوت پێ بکەوێت ئەو تووشی گەڕ و گولی هاتووە و گۆشتەکەی شەق شەق کردووە و هەردوو لوتی خوێن و کێمی لێدێت وە تۆ بە دەمت هەمووی بۆ پاك بکەیتەوە و بەوەش بتەوێ مافی بەجێ بگەیەنیت هێشتا بەجێت نەگەیاندوە هەرگیز](١٣٩٢).

ئەبو بوردە ﷛ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو موسا و موعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن وە هەردووکیان بەرپرسی ناوچەیەك بوون و سەرقاڵ بوون بە بەڕێوەبردنی کارو بارەکان، وە هەرکات بە هۆی کارەکانیانەوە لەیەك نزیك بکەوتنایەتەوە سەردانی یەکتریان دەکرد... جارێکیان موعاز ﷛ بەسەر هێسترەکەیەوە هات تا گەیشتە ئەبو موسا و بینی لەوێ دانیشتووە و خەڵکی لێی کۆبوونەتەوە وە پیاوێکی لەلایە دەستی بە پشت ملیەوە بەستراوەتەوە. موعاز ﷛ فەرمووی: ئەبو موسا (عەبدوڵڵای کوڕی قەیس) ئەوە کێیە؟ وتی ئەوە پیاوێکە کافر بۆتەوە لە دوای موسوڵمان بوونی. موعاز ﷛ فەرمووی: من دانابەزم تا نەیکوژێت. وتی: ئەو بۆ ئەو مەبەستە هێنراوەتە ئێرە... دواتر موعاز ﷛ وتی: ئەی عەبدوڵڵا (واتە: ئەبو موسا) قورئان چۆن دەخوێنیت؟ وتی: لەسەرخۆ وردە وردە دەیخوێنم. وتی: ئەی تۆ چۆن دەی خوێنیتەوە ئەی موعاز؟ وتی: سەرەتای شەو دەخەوم پاشان هەڵدەسم دوای ئەوەی بەشی پێویست خەوتم ئینجا ئەوەی خودا پێم ببەخشێت

---

(١٣٩٢) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٦٦/٢٠) واللفظ له، وابن هشام (السرة) (٢٠٠/٤) (رقم: ١١٣٥)، وله شواهد عن أبي شيبة (٣٠٤/٤)، والبزار (١٤٦٥)، والنسائي (الكبرى) (٥٣٦٥)، وابن حبان (٤١٦٤) وقال محققه: اسناده حسن، و الحاكم (١٨٨/٢) وصححه، و البيهقي (الكبرى) (٢٩١/٧)، ويشهد له ايضاً: رواية: أحمد (١٢٦١٤) وقال محققوه: صحيح لغيره، والبزار (٢٤٥٤)، ابي نعيم (الدلائل) (٢٨٧).

دەیخوێنمەوە، وە من چاوەڕوانی دەستکەوتنی پاداشتی خەوتنەکەمم وەك چۆن چاوەڕوانی دەستکەوتنی پاداشتی شەونوێژەکەمم][١٣٩٣].

لە گێڕانەوەیەکی تردا: ئەبو بوردە ﷺ دەڵێت: [جارێکیان موعاز هات بۆلای ئەبو موسا و پیاوێکی لەلا بوو. وتی: ئەوە کێیە؟ وتی: پیاوێکی جولەکەیە موسوڵمان بووە و پاشان گەڕاوەتەوە و بۆتەوە بە جولەکە و ئێمە دوو مانگە لە گەڵی خەریکین و داوای لێدەکەین بگەڕێتەوە سەر ئیسلام بەڵام قایل نابێت. موعاز ﷺ فەرمووی: سوێند بە خوا من دانانیشم هەتا لەگەردنی نەدەن، ئینجا لەگەردنیاندا و موعاز ﷺ فەرمووی: ئەوە بڕیاری خوداو پێغەمبەرەکەیەتی: هەرکەسێك لە ئاینەکەی پاشگەز بووە وە بیکوژن][١٣٩٤]. بەو جۆرە موعاز و ئەبو موسا ماندو نەناسانە تێدەکۆشان بۆ گەیاندنی پەیامی ئیسلام بەتێکڕای ناوچەکانی یەمەن، تا ژمارەیان زۆربوون و هەندێکیان چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ: ئوم حەبیبە ﷺ دەفەرموێت: [خەڵکێکی ناوچەی یەمەن هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و نوێژو سونەتەکان و پێوستیەکانی فێرکردن وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە شەرابێکمان هەیە لە گەنم و جۆ دروستی دەکەین پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مەبەستتان (ئەلغوبرائە)؟)) وتیان: بەڵێ. فەرمووی: ((نەیخۆنەوە))][١٣٩٥].

زەید کوڕی عیسای خوزاعی ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژکاری کردین و فەرمووی: ((گەر مزگەوتەکەی سنعاتان دروست کرد بالەلای ڕاستی چیایەك بێت کە پێی دەڵێن: (زین))][١٣٩٦].

موعاز دواجار دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە مەدینە و ئەبوبەکر ﷺ هەموو دیاریەکانی موعازی بەخشیەوە پێی:

عەبدوڵڵا ﷺ دەفەرموێت: [لە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبەکر ﷺ

(١٣٩٣) أخرجه: البخاري (٤٣٤١).

(١٣٩٤) أخرجه: أحمد (٢٢٠١٥) وقال محققه: اسناده صحيح، والنسائي (٤٠٦٦): وهوصحيح صححه الشيخ الألباني في (الارواء) (١٢٥/٨).

(١٣٩٥) أخرجه: أحمد (٤٢٧/٦)، الطبراني (الكبير) (٤٨٣/٢٣)، ابن حبان (٥٣٦٧) وقال محققه: اسناده حسن.

(١٣٩٦) أخرجه: الطبراني (الأوسط) (٨٣١) وقال محققه: اسناده حسن، وقال الهيثمي (المجمع) (١٢/٢): اسناده حسن.

کرایە جێنشین. پێشتر پێغەمبەری خوا ﷺ موعازی ناردبوو بۆ یەمەن. ئەبوبەکریش ﷺ عومەری ﷺ کرد بووە پێشەوای حاجیانی ئەو ساڵە. بە موعاز ﷺ گەیشت و هەندێك کۆیلەی لەگەڵ بوون وتی: ئەوانە چین؟ موعاز ﷺ وتی: ئەوانە دیارین پێشکەش بە من کراون؟ ئەوانیتریشی هی ئەبوبەکرن. عومەر ﷺ فەرمووی: [وای بەباش دەزانم بچیتەوە لای ئەبوبەکرﷺ . بەیانی دووبارە موعاز ﷺ بە عومەر ﷺ گەیشتەوە وتی: ئەی کوڕەکەی خەتاب ئەم شەو لە خەومدا بینیم من دەم ویست باز بدەمە ناو ئاگر و تۆش بە جلەکانم منت ڕادەکێشا لەبەر ئەوە من گوێڕایەڵیت دەکەم. دواتر موعاز ﷺ گەڕایەوە مەدینە و چووە لای ئەبوبەکر ﷺ وتی: ئەمانە بەدیاری دراونەتە من و ئەوانەش هی تۆیە. ئەبوبەکر ﷺ فەرمووی: (بەشە دیاریەکانت بابۆ خۆت بن). موعاز ﷺ چوو بۆ مزگەوت بۆ نوێژ و کۆیلەکانیش بەدوایەوە بوون و نوێژیان لە دوای ئەوەوە دەکرد، پێی وتن: ئێوە نوێژ بۆ کێ دەکەن؟ وتیان: بۆ خوا. موعاز ﷺ فەرمووی: ئێوەش ئیتر ئازادکران لەبەر خودا][١٣٩٧].

لە گێڕانەوەیەکی تردا[١٣٩٨] هاتووە کە لە ژیانی پێغەمبەری خوادا ﷺ وەفدی ناردووە بۆ لای تاڕوونکردنەوەی زیاتریان بداتێ. دەیلیمەی حیمیەری ﷺ دەفەرموێت: [هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیارم لێکرد و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە لە ناوچەیەکدا دەژین زۆر ساردەو کارەکانیشمان زۆر گرانە، ئێمە شەرابێکمان لە گەنم دروستکردووە تا بە هۆیەوە بتوانین لەو سەرمایەدا کارەکانمان ڕاپەڕێنین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئایا سەرخۆشتان دەکات؟)) وتیان: بەڵێ. فەرمووی: ((لێی دووربکەونەوە)) پاشان هاتمەوە خزمەتی دووبارە لێم پرسییەوە و فەرمووی: ((ئایا سەرخۆشتان دەکات؟)) وتم: بەڵێ. فەرمووی: ((لێی دووربکەونەوە)). وتم: خەڵکی لێی دوور ناکەونەوە، فەرمووی: ((گەر لێی دوورنەکەوتنەوە بیان کوژن))][١٣٩٩].

---

(١٣٩٧) أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٦٩٥٤)، و الحاكم (٣٠٥/٣) وصححه على شرط الشيخين، وابو نعيم (الحلية) (٢٣٢/١)، وابن سعد (الطبقات) (٥٨٥/٣)، والبيهقي (الدلائل) (برقم: ٢١٢٩) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٣٩٨) انظر: (مسند الامام أحمد) (٥٦٧/٢٩) الحاشية.

(١٣٩٩) أخرجه: أحمد (١٨٠٣٥،١٨٠٣٤) وقال محققوه: حديث صحيح، وابن أبي شيبة (المصنف) (٤٥٩/٧)، وابن أبي عاصم (الآحاد) (٢٦٨٣) والطبراني (الكبير) (٤٢٠٥)، ابوداود (٣٦٨)، ابن سعد (الطبقات) (٥٣٣/٥)، صحح اسناده الشيخ الألباني في (المشكاة) (٣٦٥).

## ناردنی عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ بۆ یەمەن

پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەرەتادا خالیدی ﷺ نارد بۆ ناوچەی هەمەدان لەوێ مایەوە و ماوەی شەش مانگ بانگی دەکردن بۆ ئیسلام، بەڵام موسوڵمان نەدەبوون دواتر نامەیەکی بە عەلیدا ﷺ نارد بۆیان و کردیە پێشەوای سوپای موسوڵمانان. ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە، وە عەلی ﷺ نامەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ خوێندنەوە وە هەموو موسوڵمان بوون، وا پێ دەچێت ئەوان سەرەتا تاك تاکیان موسوڵمان بوو بێت، بەڵام دواجار بە کۆمەڵ هەموویان لەسەر دەستی ئیمامی عەلی ﷺ موسوڵمان بوون:

بەراء ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ خالیدی کوڕی وەلیدی ﷺ نارد بۆ لای خەڵکی یەمەن تا بانگەوازیان بکات بۆ ئیسلام وە منیش لەگەڵیدا بووم و شەش مانگ بانگمان کردن بۆ ئیسلام بەڵام موسوڵمان نەبوون، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی کوڕی ئەبو تاڵبی ﷺ نارد و فەرمانی کرد جێی خالید بگرێتەوە...](١٤٠٠).

بورەیدە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ دوو سوپای نارد بۆ یەمەن یەکێکیان عەلی ﷺ پێشەوایەتی دەکردن وە ئەوی تریش خالیدی کوڕی وەلید ﷺ، و فەرمووی: ((گەر بووە پێکدادان عەلی سەرۆکی هەردوو سوپاکە دەبێت، وە ئەگەر واش نەبوو هەر یەکێکیان سەرکردەی سوپاکەی خۆی دەبێت...](١٤٠١).

وا دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتا سوپاکەی خالیدی ناردووە پاشان سوپاکەی عەلی ﷺ ناردووە بۆ پشتگیریان. لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی نارد تا ببێتە دادوەر و بڕیاردەر بۆ خەڵکی یەمەن وە بۆ دابەش کردنی دەستکەوتەکان وە وەرگرتنی پێنج یەك. لەبەر کەم تەمەنیەکەی و قورسی قەزاوەت و دادوەری کردنی کێشەکانی خەڵکی.

ئیمامی عەلی ﷺ هاتەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیاری لێکرد،

---

(١٤٠٠) أخرجه: البخاري (٤٠٩٢،٤٣٤٩)، البيهقي (الكبرى) (٣٩٨٩).

(١٤٠١) أخرجه: أحمد (٢٠١٢) وقال محققوه: اسناده ضعيف وفي (فضائل الصحابة) (١١٧٥) وقال محققه: اسناده حسن و الترمذي (١٧٠٤،٣٧٢٥)، النسائي (الخصائص) (٨٥) وقال محققه: اسناده حسن، وقال العدوي (صحيح فضائل الصحابة) (١٠٧): صحيح لشواهده.

خۆی دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ منی نارد بۆ یەمەن وە من تەمەنم کەم بوو بە پێغەمبەری خوام ﷺ وت: من دەنێریت بۆلای کەسانێك ڕووداو و کێشەی زۆر لە ناویان دا ڕوودەدات و منیش شارەزایی دادوەری و قەزاوەتم نییە. فەرمووی: ((إِذْهَبْ فإِنَّ اللَّهِ سَيهدِي لِسانَكَ وَيُثَبِّتَ قَلْبَكَ))](١٤٠٢) واتە: (([برِۆ خودا ڕێنموێنی زمانت دەکات و دڵت جێگیر دەکات))]. [وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان هەموو لە من بەتەمەنترن [منیش گەنجێکم چۆن دادوەرییان بکەم؟] بەرچاو ڕوون نیم لە قەزاوەتدا [من دەترسم (حەق و ڕاستی) نەپێکم]. ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی لەسەر سنگم دانا و فەرمووی: ((اللَّهُمَّ ثَبِّتْ لِسَانَهُ، وَاهْدِ قَلْبَهُ، يَا عَلِيُّ، إِذَا جَلَسَ إِلَيْكَ الْخَصْمَانِ فَلَا تَقْضِ بَيْنَهُمَا حَتَّى تَسْمَعَ مِنَ الْآخَرِ مَا سَمِعْتَ مِنَ الْأَوَّلِ، فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ تَبَيَّنَ لَكَ الْقَضَاءُ]))(١٤٠٣) واتە: ((خودایە زمانی جێگیر بکە (لەسەر حەق) و ڕێنمونی دڵی بکە. ئەی عەلی ئەگەر دوو سکاڵاکار لات دانیشتن بڕیار مەدە تاکو وەك چۆن گۆێبیستی یەکەم بوویت ئاوهاش گوێبیستی دووەمیان ببە، گەر تۆ وابکەیت تۆ بڕیاری دادوەریت لا ڕوونتر دەبێتەوە...].

وادیارە ئەو نامەیەی عەلی ﷺ لە لایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ هێنابووی بۆ هەمدان ئەمە دەقەکەی بێت: [بەناوی خوادی بەخشندەو میهرەبان. لە موحەممەدی پێغەمبەری خوا بۆ عەمری زی مەڕان وە هەموو ئەوانەی موسوڵمان بوون لە هەمدان: السلام علیکم من سوپاسی ئەو خودایە دەکەم لەلاتان کەتاك و تەنهایە... ئێوە گەر شایەتی بدەن هیچ خودایەك نییە جگە لە (الله) وە موحەممەد پێغەمبەری خوایە وە زەکات بدەن ئێوە سەروماڵتان پارێزراو دەبێت لە لایەن خواو لە لایەن موحەممەد پێغەمبەری خواوە...](١٤٠٤).

ئیمامی عەلی ﷺ بەونامەو ئەرکەوە بەڕێکەوت بۆ یەمەن و سەرکردایەتی سوپاکەی دەکرد و نامەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ خوێندنەوە و هەموو موسوڵمان

(١٤٠٢) أخرجه: أحمد (٦٣٦) وقال محققوه: حديث صحيح، وابن اسعد (٣٣٧/٢)، وابن ماجة (٢٣١٠)، والبزار (٩٩١٢).

(١٤٠٣) أخرجه: أحمد (٩٦٠، ٨٨٢) وقال محققوه: حسن لغيره وفي (الفضائل) (١٢٢٧،١١٩٥،٩٨٤) وقال محققه: اسناده صحيح، والنسائي (الخصائص) (٣٤،٣٥،٣٦) وقال محققه: اسنده صحيح، وصححه العدوي (صحيح فضائل الصحابة) (١١٧) وصححه الشيخ الألباني في (الصحية) (١٣٠٠) و (الارواء) (٢٦٠٠)، (صحح الجامع) (٤٧٨) و (صحح أبي داود) (٣٠٥٧).

(١٤٠٤) أخرجه: الحافظ (الإصابة) (١٢١/٣) عن الطبراني، وابن الاثير (أسد الغاية) (٢٩٧/٤)، و(أعلام السائلين) (٩١).

بوون: بەراء ﷺ دەفەرمویێت: [...کاتێك سوپاکەمان لەو ناوچەیە نزیکبوومەوە ئەوان هەموو بەرەو ڕوومان هاتن و عەلی ﷺ نوێژی بۆ دەکردین و پاشان ڕیزەکانی سوپاکەی ڕێکخستین یەك بە دوای یەکدا و لەبەردەممانەوە لێیان چووە پێش و نامەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ خوێندنەوە و لە ئەنجامدا هەموو سەرتاسەر موسوڵمان بوون. دواتر عەلی ﷺ نامەیەکی نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وە هەواڵی موسوڵمان بوونی ئەوانی پێ ڕاگەیاند، کاتێك نامەکە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندرایەوە سوجدەی شوکری برد بۆ خودا پاشان سەری بەرزکردەوە و فەرمووی: ((سڵاو لە هەمدان سڵاو لە هەمدان))][1405]. دواتر وەفدێکی هەمدان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وە بەڵێن نامەی پێدان[1406].

ئیمامی عەلی ﷺ هەر لە یەمەن مایەوە وەك قازی و دادوەرێك: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەفەرمویێت: [سێ کەس لە خەڵکی یەمەن هاتن بۆ لای عەلی دەمە قاڵەیان بوو لەسەر منداڵێك چونکە هەرسێکیان لە یەك پاکیدا چووبوونە لای ئافرەتێك (واتە: پێش موسوڵمان بوونیان). عەلی ﷺ بە دووانیانی وت: با منداڵەکە بۆ ئەو پیاوەی تر بێت، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون، پاشان بە دووانی تریانی وت: دە ئێوە ڕازیبن با منداڵەکە بۆ ئەو پیاوەی تر بێت، بەڵام ڕازی نەبوون، پاشان بە دووانەکەی تریانی وت: دە ئێوە ڕازیبن با منداڵەکە بۆ ئەو پیاوەی تر بێت، بەڵام هەر ڕازی نەبوون. دواجار فەرمووی: ئێوە کەسانێکی هاوبەش نارێکن منیش تیرو پشك لە نێوانتانا دەکەم [هەر کەسێك منداڵەکەی بە تیروپشك بەرکەوت] ئەوە بۆ ئەو دەبێت وە پێویستە دوو لەسەر سێی پارە بدات بە دوانەکەی تر. ئیتر بەو جۆرە تیرو پشکەکەی بۆ کردن و دادوەری بۆ کردن [دواتر ئەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرا ئەو پێکەنی تا خرێکانی دەرکەوت] [وفەرمووی: ((منیش هەر بڕیارەکەی عەلی بە گونجاو دەزانم))][1407].

---

(١٤٠٥) أخرجه: البخاري (٤٠٩٢، ٤٣٤٩)، البيهقي (الكبرى) (٣٩٨٩).

(١٤٠٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٠٧/٤) (رقم: ١١٣٩)، والصالحين (السبل) (٤٢٧/٦).

(١٤٠٧) أخرجه: أحمد (٣٧٤/٤)، ابوداود (٢٢٧٠،٢٢٦٩) واللفظ له، وابن ماجة (٢٣٤٨)، والنسائي (١٨٣/٦)، والحاكم (١٣٥/٣) وصححه، وأحمد (الفضائل) (١٠٥٩) وقال محققه: اسناده حسن، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (١٩٠١)، وصحيح ابي داود) (١٩٨٦).

وە لەو ناوچەیە ئیمامی عەلی ﷺ گۆڕە بەرزەکانی تەخت کرد وە پەیکەرو وێنەکانی سڕییەوە: ئەبو هەیاجی ئەسەدی ﷺ دەڵێت: [عەلی ﷺ منی بانگ کرد و پێی وتم: ئایا بتنێرم بۆ ئەو کارەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ منی بۆ نارد ئەوەیە: ((أَنْ لَا تَدَعَ قَبْرًا مُشْرِفًا إِلا سَوَّيْتَهُ، وَلا تِمْثَالًا إِلا طَمَسْتَهُ))[١٤٠٨] واتە: هەر گۆڕێکی بەرزت بینی تەختی زەوی بکەو هەر پەیکەرێکت بینی سەرو شێوەکەی بسڕەرەوە].

وە جارێکیان کێشەیەکی سەیری هاتە لا: ئیمامی عەلی ﷺ دەفەرمویت: [کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ منی نارد بۆ یەمەن، چەند کەسێك بیرێکیان هەڵکەند بوو بۆ ڕاو کردنی شێر، لە دوایدا شێرێکی تێکەوت و خەڵکی لێی کۆبوونەوە پیاوێك کەوتە ناوبیرەکەو بە یەکێکی تر خۆی گرتەوە و ئەویش بە یەکێکی تر، هەتا هەر چواریان کەوتنە ناو چاڵەکە وە شێرەکە بە خەستی هەر چواریانی بریدار کردو گیانیان لە دەست دا [پاشان پیاوێك بە ڕمێك شێرەکەی کوشت][١٤٠٩] وە خەڵکەکە دژبەیەکتر چەکیان هەڵ گرت نزیك بوو بەشەڕ بێن منیش چوومە لایان و وتم: [دەتانەوێت لەگەڵ یەکتری بەشەڕ بێن و هێشتا پێغەمبەری خوا ﷺ زیندووە] ئایا دووسەد پیاو دەکوژن لەسەر چوارکەس، وەرن من دادوەریەکتان بۆ دەکەم گەر پێی ڕازی بوون پیادەی بکەن وەگەر پێی ڕازی نەبوون [دەست درێژ مەکەنە سەر یەکتری] تا کێشەکەتان بەرەو لای پێغەمبەری خوا ﷺ ببەنەوە و ئەو شیاو ترە دادوەریتان بکات [وە هەرکەسێك لە مافی خۆی زیاتر دەست درێژی کرد مافی دەفەوتێت].

[وتیان: باشە، ئیمامی عەلی ﷺ یەکەمیان چواری یەکی (بژاردنی خوێنەکەی) بۆ دانا چونکە ئەو هۆکاری لە ناوچوونی هەموویان بووە وە دووەمیان سێ یەکی بۆ دانا وە سێ هەمیان نیوەی بۆ دانا وە چوار هەمیان مافی تەواوی (بژاردنی خوێنەکەی) بۆ دانا و هەموو بژاردنەکەی خستنە سەر ئەوانەی ئامادەی ڕووداوەکە بوون لە هەر چوار هۆزەکە، هەندێکیان پێی ڕازی بوون وە هەندێکیا ناڕازی بوون، دواتر لە (حەجی ماڵ ئاوایدا) چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ [لەو کاتەدا لای مقامی ئیبراهیم بوو] وە بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە و فەرمووی: ((من

(١٤٠٨) أخرجه: مسلم (٩٦٩)، ابوداود (٣٢١٨) واللفظ له، والترمذي (١٠٤٩)، و النسائي (٤٤/٨)، أحمد (الفضائل) (١١٩٧) وصححه الشيخ الألباني في (الأرواء) (٧٥٩) و (تحذير الساجد) (١٣٠).

(١٤٠٩) أخرجه: أحمد (٧٣٥) وفي (الفضائل) (١٢٣٩) وقال محققه: اسناده حسن.

دادوەریتان دەکەم)) یەکێك لەوانە وتی: عەلی ﷺ دادوەری کردین...و هەواڵەکەیان بۆ گێڕایەوە وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دادوەریتان هەر بەو جۆرە دەبێت کە عەلی بۆی کردون))][(١٤١٠)].

ئیمامی عەلی ﷺ هەندێك ئاڵتونی نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وە دابەشی کرد لە نێوان چوار سەرکردەدا: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەفەرموێت: [عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ لە یەمەنەوە لە پێستەیەکی خۆشکراودا هەنێك خۆڵی ئاڵتونی نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش دابەشی کرد لە نێوان چوار کەسدا: عیینەی کوڕی بەدرو ئەقرەعی کوڕی حابیس و زەید لخەیل وە چوارەمیان یان عەلقەمەی کوڕی عولاسەیە یان عامیری کوڕی توفەیلە. یەکێك... وتی: ئێمە شایستەتر بووین بەوە، ئەو قسەیەش گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی: ((أَلَا تَأْمَنُونِي وأَنَا أَمِينُ مَن فِي السَّمَاءِ، يَأْتِينِي خَبَرُ السَّمَاءِ صَبَاحًا ومَسَاءً)) واتە: ((ئایا ئێوە متمانەتان بە من نییە لەکاتێکدا من متمانە پێکراوی ئەو خودایەم کە لە ئاسماندایە و هەواڵی ئاسمانم بۆ دێت بەیانیان و ئێواران)). لەوێدا پیاوێك هەستا هەردوو چاوی بەقوڵا چووبوو ناوچەوانی و هەردوو سەر ڕوومەتی بەرز دیار بوو ڕیشی پڕبوو سەری سفر کرابوو وە پشتەماڵەکەی هەڵ گرتبوو. هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خوا بترسە! فەرمووی: ((وَيْلَكَ، أَوَلَسْتُ أَحَقَّ أَهْلِ الأرْضِ أَنْ يَتَّقِيَ اللَّهَ)) واتە: ((ئەی هاوار ئایا من شایستە ترین کەس نیم کە لە خوا بترسم و گوێڕایەڵی ببم)).

پاشان پیاوەکە ڕۆیشت. خالید کوڕی وەلید ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لە گەردنی بدەم؟ فەرمووی: ((نا پێ دەچێت ئەو نوێژ بکات)). خالید وتی: ئەی چەند نوێژخوێن هەیە ئەوەی بە زمانی دەیڵێت جیاوازە لەوەی کە لەدڵیدایە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (إنِّي لم أُوْمَرْ أنْ أُنَقِّبَ عن قُلوبِ الناسِ، ولا أشُقَّ بُطونَهم)) واتە: ((من فەرمانم پێ نەکراوە سکی خەڵکی هەڵبدڕم و دڵیان لەتبکەم)). پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای پیاوەکەی پێشووی کرد دەڕۆیشت و پشتی لەوان بوو فەرمووی: ((إِنَّهُ يَخْرُجُ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْمٌ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ رَطْبًا، لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ

---

(١٤١٠) أخرجه: أحمد (٥٧٣) وقال محققوه: اسناده ضعيف وفي (الفضائل) (١٢٣٩) وقال محققه: اسناده حسن، و الطيالسي (١١٦) وقال محققه: سنده حسن، و البزار (٧٣٢)، البيهقي (الكبري) (١/١١) واللفظ للطيالسي و الزيادات لأحمد.

مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ...لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لَأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ ثَمُودَ))[١٤١١] واتە: ((لە کۆمەڵ و پەیڕەوکارانی ئەو کەسانێك پەیدا دەبن کتێبەکەی خودا پاراو دەخوێنن و لە قوڕگیانەوە ناگاتە ناو دڵیان لە ئاین دەردەچن وەکو چۆن تیر لە نیشان دەردەچێت... گەر من پێیان بگەم بە کوشتنەکەی قەومی عادیان دەبەم].

لەم گێرانەوەیەدا وا دەردەکەوێت کە گەڕانەوەی خالید لە یەمەن پێش گەڕانەوەی عەلی یە ﷺ. ئەویش دواتر بە خێرایی خۆی گەیاندەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ و حەجی ماڵ ئاوایی لە خزمەتی بەجێ گەیاند و پاشان دووبارە گەڕایەوە یەمەن.

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەفەرموێت: [...عەلی ﷺ حەجی بە ئەنجام گەیاند وە گەڕایەوە بەرەو یەمەن چونکە پێشتر یەکێکی کردبووە بەر پرسیارو سەرکردەی موسوڵمانان لە جێی خۆی تا دەگەڕێتەوە وە گەڕانەوەشی لەسەر فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو و پێی فەرموو: ((بگەڕێوە لای هاوەڵانت))][١٤١٢].

ئیمامی عەلی ﷺ کاتێك گەڕایەوە یەمەن تەماشای کرد جێگرەکەی هەموو یەکێك پۆشاکێکی پێداوە ئەویش بەڕەوای نەزانی هەمووی لێوەرگرتنەوە و ئەوان داوایان کرد بوو سواری پشتی وشترەکانی زەکات ببن ئەویش لێی قەدەغە کردن هەربەو هۆیەوە لێی زویر بوون ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەفەرموێت: [ئێمە داوامان لە عەلی کرد ڕێگەمان بدات سواری پشتی وشترەکانی زەکات ببین و پشوو بە وشترەکانی خۆمان بدەین چونکە دەمانزانی کە شەکەت بوون، بەڵام عەلی ﷺ ڕێگەی نەداین وتی: ئێوە لەوەدا بەشداری موسوڵمانانن و (بەتەنها مافی خۆتان نییە)... بەڵام ئێمە پێشتر داوامان لە جێگرەکەی کرد بوو کە خۆی لەوێ نەبوو ئەو [پۆشاکی پێ داین] و بواری داین سواری پشتی وشترەکانی زەکات ببین بەڵام کاتێك عەلی ﷺ گەڕایەوە تەماشای وشترەکانی زەکاتی کرد ماندوو و عەیبدار بوون لە هەمووانی سەندەوە و ڕەخنەی توندیشی هەبوو لە جێگرەکەی و لۆمەی دەکرد][١٤١٣].

---

(١٤١١) أخرجه: البخاري (٤٣٥١).

(١٤١٢) أخرجه: الحاكم (١٢٤/٣) وصححه، والبيهقي (الدلائل) (٢١١٩) وقال محققه: اسناده حسن، وقال الحافظ في (البداية) (١٠٩/٤): اسناده جيّد على شرط النسائي، وحسنه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢٤٧٩).

(١٤١٣) أخرجه: الحاكم (١٢٤/٣) وصححه، والبيهقي (الدلائل) (٢١١٩) وقال محققه: اسناده حسن، وقال الحافظ في (البداية) (١٠٩/٤): اسناده جيّد على شرط النسائي، وحسنه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢٤٧٩).

بەو هۆیەوە زۆر دڵگرابوون لە عەلی ﷺ: زەیدی کوڕی تەلحە ﷺ دەفەرموێت: [عەلی ﷺ کاتێك سوپاکەی لە یەمەن بەجێهێشت پیاوێکی کردە جێگرو سەرکردەیان... ئەویش بەهەموو یەکێك پۆشاکێکی دەست کەوتەکانی پێ بەخشی، کاتێك عەلی ﷺ گەڕایەوە یەمەن و سوپاکەی چوونە پێشوازی و بەو شێوەیە ئەوانی بینی فەرمووی: ئەوانە چین؟ وتیان: فلانە کەسی (جێگرت) ئەمەی پێداین، ئەویش بانگیکرد و پرسیاری لێکرد تۆ کاری وەهات چۆن ئەنجامدا پێش ئەوەی دەستکەوتەکان هەموو بچنەوە لای پێغەمبەری خواو ﷺ تا ئەوەی خودا ویستی لێیەتی ئەو بەو جۆرەی لێبکات؟ لەوێدا عەلی هەموو پۆشاکەکانی لێوەرگرتنەوە، کاتێك ئەوان گەڕانەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵایان هەبوو بەرامبەری][1414].

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەفەرموێت: [...من لە ناویاندا وتم: گەر بە ویستی خودا گەڕاینەوە شاری مەدینە ئەوانە لای پێغەمبەری خوا ﷺ باس دەکەم کە چەند توندبووە بەرامبەرمان و بارگرانی کردووین، کاتێك گەڕاینەوە مەدینە بەیانی چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ تا ئەوەی سوێندم خواردبوو لەسەری بۆی بگێڕمەوە، سەرەتا ئەبوبەکرم دی لە مزگەوت دەهاتە دەرەوە لەگەڵم وەستا و پێشوازی لێکردم و پرسیاری لێکردم: کەی گەڕایتەوە؟ وتم: دوێنێ گەڕامەوە، ئەویش لەگەڵم گەڕایەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ [موسوڵمانان هەرکات لەسەفەر بگەڕانایەتەوە سەرەتا دەچوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ. سەلامیان لێدەکرد [هەواڵی گەشتەکەیان بۆ دەگێڕایەوە] پاشان دەگەڕانەوەماڵەکانی خۆیان][1415]. لەوێدا پێش من ئەبوبەکر ﷺ چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە سەعیدی کوڕی مالیکی کوڕی شەهیدە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ڕێگەی بدە با بێت)) منیش چووم و سڵاوم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی دامەوە و پێشوازی لێ کردم و پرسیاری گەشتەکەی لێکردم... و پرسیاری زۆری کرد منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی توند و زبربوو لەگەڵمان باش نەبوو... پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بەولاوە و بە تێڕامان تەماشای دەکردم وە منیش بەردەوام بووم لەو قسانەمدا، پێغەمبەری

(١٤١٤) أورده: ابن كثير (البداية) (١٠٩/٥) عن يونس بن بكير.

(١٤١٥) أخرجه: أحمد (١١٧٥) وقال محققه: سند حسن، والنسائي (الخصائص) (٨٥) وقال: محققه: سنده حسن، وقال العدوي (صحيح فضائل الصحابة) (ص:١٠٧): صحيح لشواهده.

خواش ﷺ دەستی خستە سەر ڕانم و لێم نزیکبووەوە و فەرمووی: ((سەعیدی کوڕی مالیکی کوڕی شەهید بێدەنگ بە و بەسە قسە مەڵێ بە عەلی برات سوێند بەخوا خۆت دەزانی کە چەند زبر دەژی لە پێناوی خودا)). ئیتر منیش لە دڵی خۆمدا وتم: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات ئەی سەعیدی کوڕی مالیك لە بەیانیەوە تۆ ئازاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەیت بەڵام نازانی، بەڵێن بێت هەتا لە دونیادا ماوم بەخراپە باسی نەکەم نە بەنهێنی و نە بەئاشکرا][1416].

وە (بورەیدەش) یەکێك بوو لەوانەی سکاڵای هەبوو لە عەلی ﷺ خۆی دەفەرموێت: [...کاتێك گەڕاینەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکردین و فەرمووی: ((ئەو هاوڕێیەتان چۆن بوو لەگەڵتان؟)) [منیش بە خراپی باسی عەلیم کرد [و سکاڵام لێکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕووخساری تێکچوو][1417]. وە سور هەڵگەڕاو فەرمووی: ((هەرکەسێك من پشتیوانیبم عەلیش پشتیوانی دەبێت))][1418]. [وە فەرمووی: ((بورەیدە ئایا نابێت بڕواداران من لە خۆیان بە پێشترو (خۆشەویستتر) بزانن؟)) وتم: بەڵێ][1419] فەرمووی: [((لا تَبْغَضْ يَا بُرَيْدَةَ عَلياً فَإِنَّ عَلياً مِنِّي وَأَنا مِنْهُ][1420]. واتە: [((بورەیدە ڕقت لە عەلی نەبێت چونکە عەلی لە منە وە منیش لە عەلیم))] ((مَا تَرَى فِي رَجُلٍ يُحِبُّ اللهَ وَرَسُولَهُ، وَيُحِبُّهُ اللهُ وَرَسُولُهُ؟))[1421] واتە: [((ئایا چی دەڵێیت سەبارەت بە پیاوێك خودا و پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت وە خوداو پێغەمبەرەکەشی ئەویان خۆش دەوێت))]. ((مَنْ كُنْتُ مَوْلَاهُ فَعَلِيٌّ مَوْلَاهُ))[1422] واتە: [هەر کەسێك من

---

(١٤١٦) أخرجه: الحاكم (١٢٤/٣) وصححه، والبيهقي (الدلائل) (٢١١٩) وقال محققه: اسناده حسن وقال ابن كثير (البداية ١٠٩/٤): اسناده جيد، حسنه الشخ الألباني في (الصحيحة) (٢٤٧٩).

(١٤١٧) أخرجه: أحمد (٢٢٩٤٥) وقالو محققوه: اسناده صحيح على شرطهما، وفي (الفضائل) لأحمد (٩٨٩) وقال محققه: اسناده صحيح، و النسائي (الكبرى) (٨١٤٥) وفي (الخصائص) (٧٧) وقال محققه: اسناده صحيح، والحاكم (١١٠/٣) وصححه.

(١٤١٨) أخرجه: أحمد (٢٢٩٦١) وقال محققوه: اسناده صحيح وفي (الفضائل) (١١٧٧) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن أبي عاصم (السنة) (١٣٥٤)، وابن حبان (٢٢٠٤)، النسائي (الكبرى) (٨١٤٤) وفي (الخصائص) (٧٥) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه العدوي (صحيح الفضائل) (١٢٧).

(١٤١٩) أخرجه: أحمد (٢٢٩٤٥) وقال محققوه: صحح على شرطهما وفي (الفضائل) (٩٨٩) وقال محققه: اسناده على شرطهما.

(١٤٢٠) أخرجه: أحمد (الفضائل) (١١٧٥) وقال محققه: سنده حسن، والنسائي (الخصائص) (٨٥) وقال محققه: سنده حسن، وصححه العدوي في (صحيح الفضائل) (ص: ١٠٧).

(١٤٢١) أخرجه: الترمذي (٣٧١٥، ١٧٠٤)وهو ضعيف.

(١٤٢٢) أخرجه: أحمد (٢٢٩٤٥) وقال محققوه: صحيح على شرطهما وفي (الفضائل) (٩٨٩) وقال محققه: اسناده على

هاوکارو سەرپەرشتیکاری بم عەلیش هاوکارو سەرپەرشتیکاری دەبێت))].

لە گێڕانەوەیەکی تردا بورەیدە ﷺ نامەیەکی سکاڵای هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و بۆ دەخوێندەوە و دەفەرموێت: [...کاتێك نامەی (سکاڵاکەم) بۆ دەخوێندەوو و دەم وت: ئەوە ڕاستە. لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو دەستەی گرتم کە نامەکەم پێ گرتبوو وە فەرمووی: ((تۆ ڕقت لە عەلی یە؟)) وتم: بەڵێ. فەرمووی: ((فلا تُبغِضْه، وإنْ كُنتَ تُحِبُّه فازْدَدْ له حُبًّا [فو الذي نَفسُ مُحمَّدٍ بيَده لَنَصيبُ آلِ عليٍّ في الخُمُسِ أكثرُ [من ذلك]))[١٤٢٣] واتە: ((هەرگیز ڕقت لێی نەبێت وە گەر خۆشت دەوێت لێرە بەدواوە زیاتر خۆشتبووێت [سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بە دەستە پشکی بنەماڵەی عەلی لە پێنج یەکدا] [لە هەموو ئەوانە زیاترە]))).

لە گێڕانەوەیەکی تردا: عیمران ﷺ دەفەرموێت: [...چوار لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریاندا کە گەڕانەوە هەموو بەسەر هاتەکەی عەلی ﷺ لە گەشتەکەدا بگەیەنن بە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك گەڕانەوە چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و سڵاویان لێکرد، پاشان یەکێك لە چوار کەسەکە هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا دەزانیت عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ (لەم گەشتەی دا) ئاوها بوو لەگەڵماندا...؟ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی لێوەرگێڕاو پاشان دووهەم تا چوار هەم هەستان و هەمان وتەیان دووبارەکردەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی تێ کردن و توڕەبوون بە ڕووخساریەوە دیاربوو وە فەرمووی: ((ئێوە چیتان دەوێت لە عەلی؟ عەلی لە منە و منیش لە ئەوم و ئەو پشتیوانی هەموو بڕوادارێکە لە دوای من))][١٤٢٤].

---

شرطهما، والنسائي (الخصائص) (٧٧) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٤٢٣) أخرجه: أحمد (٩٦٧٢٢، ٢٣٠٦) وقال محققوه: اسناده صحيح، وفي (الفضائل) (٩٨٩، ٩٤٧، ١١٧٧، ١١٨٠) وقال محققه: اسناده حسن، والنسائي (الخصائص) (٩٧) وقال محققه: اسناه حسن، و الطحاوي (مشكل الآثار) (٣٠٥١) وقال محققه: اسناده حسن. وصححه العدوي في (صحيح الفضائل) (١٢٧).

(١٤٢٤) أخرجه: أحمد (١٩٩٢٨) وقال محققوه: اسناده ضعيف وفي (الفضائل الصحابة) (١٠٣٥) وقال محققه: اسناده حسن، وعبدالرزاق (٢٣٨٨)، والترمذي (٣٧١٢)، الطيالسي (٨٦٨) وقال محققه: حديث حسن، والنسائي (الكبرى) (٨١٤٦)، وفي (الخصائص) ٠٨٤) وقال محققه: اسناده صحيح، وابو يعلى (٣٥٥) وقال محققه: رجاله رجال الصحيح، والبزار (٣٥٥٨)، وابن حبان (٦٩٢٩) وقال محققه: اسناده قوي، والطبراني (الكبير) (٢٦٥/١٨)، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢٢٢٣).

# حەجی ماڵئاوایی

ئەم حەجە ناونرا حەجی ماڵئاوایی چونکە پێغەمبەر ﷺ تیایدا ماڵئاوایی لە هاوەڵانی کرد، هەروەها دواهەمین حەجیش بوو، وە ناسرا بوو بە حەجی ئیسلام و حەجی گەیاندن چونکە تێیدا مەراسیمی حەجکردنی بۆ موسوڵمانان ڕوون کردەوە.
بەرواری بەئەنجام گەیاندنی ئەم حەجە وەك جابر ﷺ دەفەرموێت: [لەساڵی دەی کۆچیدا جاڕ درا کە پێغەمبەر ﷺ دەچێت بۆ حەج کردن. ئیتر لە هەموو لایەکەوە خەڵکێکی زۆر ڕژانە ناو شاری مەدینە [ئەوەی بە پێ یان بە سواری توانای هەبوو] [هەموو خۆیان گەیاندە مەدینە تا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بچن بۆ حەج] هەموو دەیان ویست کارەکانیان وەك ئەو بێت و هەنگاو و بە هەنگاو لە دوایەوە دووبارەی بکەنەوە و بەئەنجامی بگەیەنن][١٤٢٥].

ئیبنو عەباس دەفەرموێت: [لە ڕۆژی [شەممەی][١٤٢٦] بیست و پێنجی مانگی زولقەعیدەدا بوو]. ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: [ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین] لە مەدینە نوێژی [نیوەڕۆی] بۆ کردین بە چوار ڕکات][١٤٢٧]. پاشان [..پێغەمبەر ﷺ قژی داهێناو زەیتی لە قژی داو دوو پۆشاکەکەی ئیحرامی لەبەر کرد خۆی و هاوەڵانی][١٤٢٨] [ئینجا وتاری بۆ موسوڵماناندا وە سنوری ئەو جێگایانەی کە پێویستە موسوڵمانان لەوێوە ئیحرام لەبەر بکەن هەموو ئەوانەی بۆ ڕوون کردنەوە و فەرمووی: ((جێگەی تایبەتی (ئیحرام پۆشین وتنی (لَبَيكَ اللّهمُ لَبَيكَ) وە نیەت هێنان)ی خەڵکی مەدینە ناوچەی (زول حەلیفەیە) وە ئەوانی تر لەولاوەدێن ناوچەی (ئەلجوحفەیە) وە ئەوانەی لە عیراقەوەدێن ناوچەی (زاتولعرقە)، وە ئەوانەی لە نەجدەوە دێن ناوچەی (قەرنول مەنازیلە) وە ئەوانەی لە یەمەنەوە دین ناوچەی (یەلملەمە))][١٤٢٩].
[پاشان ئەو وشترانەی ئامادە کرد کە بۆ قوربانی کردن دەیان باتە ماڵی خوا][١٤٣٠]. [وە ڕێگری نەکرد لە پۆشینی هەرجۆرە جل و بەرگێکی کە تایبەتە بە پیاوانەوە تەنها

(١٤٢٥) أخرجه: مسلم (١٢١٨) مع الزيادات.
(١٤٢٦) أخرجه: البخاري (١٥٤٥).
(١٤٢٧) أخرجه: البخاري (١٥٤٦، ١٥٧١).
(١٤٢٨) أخرجه: البخاري (١٥٤٥).
(١٤٢٩) نفس المصدر وانظر: (حجة النبي) (٤٦،٤٨).
(١٤٣٠) انظر: حجة انبي ﷺ (ص:٤٩).

ئەو پۆشاکانەی کە زەعفەرانیان پێوەیەو ئاسەواری بەسەر پێستەوە دەمێنێتەوە][١٤٣١]
[وە لە دوای خۆی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی شاری مەدینەی سپارد بەئەبودوجانە یاخود بە سیباعی کوڕی عەرفەتەی ئەلغیفاری][١٤٣٢] [و ژنان و منالآن ئامادە بوون بۆ چوون بۆ حەج][١٤٣٣]، [پاشان پێغەمبەر ﷺ خۆی ئامادەکرد بۆ چوونەدەر لە مەدینە لە ڕێگەی ناسراو بە (ئەلشەجەرە) لە زولحەلیفە و هەرکات بەرەو مەککە بڕۆیشتایە لە مزگەوتەکەی ئەوێدا نوێژی دەکرد][١٤٣٤] [خۆی و هاوەڵانی بەڕێکەوتن تاگەیشتنە ناوچەی (زول حەلیفە) وە لەوێدا نوێژی عەسری بۆ کردن بە دوو ڕکات ئەو ئێوارەیەو شەوەکەشی خۆی و هاوەڵانی لەوێدا مانەوە][١٤٣٥].

لەو شەوەدا فەرمانی خودا بۆ پێغەمبەر ﷺ دابەزی و داوای لێکرا لەوێدا نوێژ بکات پاشان بۆ هاوەڵانی گێڕایەوە و پێی فەرموون: ((لەم شەوەدا یەکێك لەلایەن خودای خۆمەوە بۆ لام هات و پێی وتم: لەم شیوە پیرۆزەدا نوێژ بکەو بڵێ عومرەیەك لەگەڵ حەجدا بۆ خوا ئەنجام دەدەم))[١٤٣٦]. [وە پێی وترا: ((تۆ لە ناوچەو خاکی پیرۆزدایت))[١٤٣٧]. واتە: ئەو ناوچەیەی خوار مزگەوتەکەی نێوان ئەوێ و سەر ڕێگا سەرەکیەکە.

لەو شەوەدا ئەسمائی کچی عومەیس هاوسەری ئەبوبەکری سدیق ﷺ منداڵی بوو وە ناونرا موحەممەد. جابر ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك لە ناوچەی زولحەلیفە بووین ئەسمائی کچی عومەیس هاوسەری ئەبوبەکری سدیق ﷺ موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری بوو، وە یەکێکی بۆلای پێغەمبەر ﷺ ناردو وەڵامەکەی ئەوە بوو کە فەرمووی: ((با خۆی بشوات و..... و جل وبەرگی تایبەتی خۆی لەبەربکات و نیەتی حەج و عومرە بهێنێت و (خۆی ئامادە بکات))][١٤٣٨].

---

(١٤٣١) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (٣١٤)، وقد فتل قلائد بدنه a زوجته عائشة بصوف كان عندها قبل ان يحرم. أخرجه: البخاري (١٦٩٦،١٧٠٤).

(١٤٣٢) أخرجه: مسلم (٦٩٠) وابن هشام (السيرة) (٢١١/٤).

(١٤٣٣) انظر: حجة النبي ﷺ (ص:٥٠).

(١٤٣٤) أخرجه: البخاري (١٥٣٣).

(١٤٣٥) أخرجه: البخاري (١٥٤٦،١٥٥١)، ومسلم (٦٩٠،٦٦٠).

(١٤٣٦) أخرجه: البخاري (١٥٣٤،١٥٣٦) وابوداود (١٨٠٠).

(١٤٣٧) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص: ٣١٥).

(١٤٣٨) أخرجه: مسلم (١٢١٨) و (١٢٠٩) وابوداود (١٧٤٣).

پاشان پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لەوێدا مانەوە تاکاتی نوێژی نیوەڕۆ[(١٤٣٩)] ئینجا [خۆی شۆرد][(١٤٤٠)] وە خۆی بۆنخۆش کرد. دایکی بڕواداران عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [خۆم پێغەمبەرم بۆنخۆش دەکرد پێش ئیحرام لەبەرکردنی بە بۆنێکی گران بەها کە بریتی بوو لە [زەنبەری تێکەڵ بەمیسك][(١٤٤١)] ئەو بۆنە دەمایەوە من [سێ ڕۆژ لەوەودوا][(١٤٤٢)] [سپیایی میسکەکەم بەناوەڕاستی سەری پێغەمبەرەوە ﷺ دەبینی][(١٤٤٣)]. پاشان پێغەمبەر ﷺ وشترەکانی قوربانی نیشانە کرد، وە قژە سەری خۆی داهێنا (واتە: شلەیەکی لینج بووە کردوویەتی بە قژسەریا تا مووەکانی تەخت بێت و تەپوتۆزی ڕێگا نەگرێت و بژی نەکات) وە پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانانی ئاگادارکردەوە فەرمووی: ((إِنِّي لَبَّدْتُ رَأْسِي، وَقَلَّدْتُ هَدْيِي))[(١٤٤٤)] واتە: قژسەرم داهێنا و پەتم کردە ملی وشترە قوربانیەکانم.

ئیبنو عەباس ﵄ ئەوە ڕووندەکاتەوە و دەفەرموێت: [پێغەمبەر ﷺ کاتێك گەیشتە ناوچەی (زولحەلیفە) وشترەکەی بۆ هێنرا وە سەرکۆپاری وشترەکەی کەمێك بریندارکرد وە خوێنەکەی بەدەستی بڵاوکردەوە بەسەر پشتی کۆپارەکەیدا وە دوو نەعلی بەم لاولای وشترەکەیدا هەڵواسی][(١٤٤٥)] [وە کەسێکی تر لە جیاتی پێغەمبەر ﷺ وشترەکانی تری بەو جۆرە دیاری کرد][(١٤٤٦)].

پاشان سواری وشترەکەی خۆی بوو، کۆپانی وشترەکەی کۆن بوو پۆشاکێکی بەسەردا ڕاخستبوو [نرخ و بەهای چوار درهەمی نەبوو][(١٤٤٧)]. جارێکیان ئیبنو عومەر ﵄ کاروانێکی یەمەنی بینی کۆپانی وشترەکانیان پارچە پێست بوو وە ڕەشمەکانیشیان گوریس بوو فەرمووی: [هەرکەسێك پێی خۆشە تەماشای کاروانێك بکات هاوشیوەی کاروانەکەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بێت لە حەجیماڵئاوایدا با

---

(١٤٣٩) انظر: (حجة النبي ﷺ للشيخ الالباني (ص:٥١).

(١٤٤٠) أخرجه: الترمذي (٨٣٠).

(١٤٤١) أخرجه: مسلم (١١٨٩،١١٩١) والبيهقي (الكبرى) (٣٥/٥).

(١٤٤٢) أخرجه: الحميدي (٢٤٧٢).

(١٤٤٣) أخرجه: مسلم (١١٩٠).

(١٤٤٤) أخرجه: مالك (٣٩٤/١).

(١٤٤٥) أخرجه: مسلم (١٢٤٣).

(١٤٤٦) انظر: (البداية) (١٢٩/٥).

(١٤٤٧) أخرجه: ابن ماجة (٢٨٩٠)، وصححه الشيخ الالباني يرحمه الله في (صحيح ابن ماجة) (٢٣٣٧).

تەماشای ئەم کاروانە بکات][١٤٤٨].

لەوێدا پێغەمبەر ﷺ سواری پشتی وشترەکەی خۆی (ئەلقەسواء) بوو فەرمووی: ((اللَّهُمَّ حَجَّةٌ لَا رِيَاءَ فِيهَا وَلَا سُمْعَةَ))[١٤٤٩] واتە: ((خودایە ئەم حەجە تەنها بۆ تۆیە بۆ هیچ ڕووپامایی و ناو وشورەتێك نییە)) لە [زولحەلیفە] [لای مزگەوتەکە][١٤٥٠] وە نزیك [لە درەختەکەی] ئەو جێگەیە [ڕووەو قیبلە وەستاو][١٤٥١] (اللّه أكْبر) ی کرد و سوپاس وستایشی خوای کرد و نیەتی حەج و عەمرەکردنی لێهێنا و فەرمووی: ((لَبَيكَ اللّهُمْ حَجًا وَ عُمْرةً)) واتە: خودایە ئەوا هاتم بەنیازی حەج کردن و عومرە، لەوێدا خەڵکی سەرجەم بە دەنگی بەرز ئەومیان دووبارە کردەوە][١٤٥٢] پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ((لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ)) واتە: واهاتم خودایە وا هاتم ئەی ئەو خودایەی کە هاوتات نی یە واهاتم، هەموو سوپاس و نیعمەت و سامانەکان هی تۆیە هیچ هاوتات نییە. پێغەمبەر ﷺ هەر ئەو وشانەی دووبارە دەکردەوە هیچی لێ زیاد نەدەکرد))][١٤٥٣]. [بەڵام خەڵکی وشەی تریان لەگەڵ دەوت وەك: (لَبَّيْكَ ذَا الْمَعَارِجِ ، وَلَبَّيْكَ ذَا الْفَوَاضِلِ) واتە: واهاتم ئەی خودای خاوەن ڕێگەکانی ئاسمان و ئەوانەی تێیدایە، واهاتم ئەی خودای خاوەن هەموو سەروەریەکان][١٤٥٤]. [وە دەیان وت: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ إِلَهَ الْحَقِّ) واتە: واهاتم ئەی خودای خاوەنی هەموو ڕاستەقینەکان][١٤٥٥] [وە دەیان وت: (لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ، لَبَّيْكَ، وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ)[١٤٥٦] واتە: واهاتم واهاتم ئەی ئەو خودایەی کە هەموو خێر و بەرەکەتێکت بەدەستە، وا هاتم هەموو داواو کارەکانمان هەر بۆلای تۆیە]. جابر ﷺ دەفەرموێت: (ئێمەش [بەهاوار و دەنگی بەرز دەمان وت بەنیازی حەج کردن واهاتم خودایە][١٤٥٧] و هەموومان [تەنها نیازی حەج کردنمان هەبوو وە عومرەکردنمان لەگەڵ تێکەڵ

(١٤٤٨) أخرجه: أحمد (١٢٠/٢)، وقال محقق (البداية) (١٢١/٥): اسناده صحيح.

(١٤٤٩) أخرجه: ابن ماجة (٢٨٩٠)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٣٣٧) و (الصحيحة) (٢٦١٧).

(١٤٥٠) أخرجه: مسلم (١١٨٦،١١٨٤).

(١٤٥١) أخرجه: البخاري (١٥٥٣).

(١٤٥٢) أخرجه: مسلم (١٢٣٤).

(١٤٥٣) أخرجه: مسلم (١٤٧/١٢١٨).

(١٤٥٤) أخرجه: ابوداود (١٥٩٠).

(١٤٥٥) أخرجه: النسائي (٢١١/٢) وانظر: صحيح النسائي (٢٥٧٩).

(١٤٥٦) أخرجه: البخاري (١٥٤٦) ومسلم (١١٨٤/١٩،٢٠).

(١٤٥٧) أخرجه: البخاري (١٥٤٦) ومسلم (١١٨٤/١٩،٢٠)

نەدەکرد][١٤٥٨]. [پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی هەموو بەو جۆرەیان دەکرد][١٤٥٩] [بەڵام دایکی باوەڕداران عائیشە بەنیازی عومرەکردنی بەتەنها دەیفەرموو][١٤٦٠].

پاشان پێغەمبەر ﷺ و تێکڕای موسوڵمانان بەرەو شاری مەککە بەڕێکەوتن ئەو دروشمانەی پێشوویان دەوتەوە، جابر ﷺ دەفەرموێت: (من لەوێدا تەماشای هەر چوارلای پێغەمبەرم ﷺ دەکرد، سوار و پیادەم لە چواردەوری دەبینی، و پێغەمبەرمان ﷺ لە ناودا بوو، قورئانی بۆ دادەبەزی بە جوانی لێی تێدەگەیشت ئەوەشی ئەو ئەنجامی بدایە ئێمەش لەگەڵی ئەنجامان دەدا][١٤٦١] [وا مەزەندە دەکری کە ژمارەیان زیاتر بووبیت لە چل هەزار کەس][١٤٦٢].

## ئەو ڕووداوانەی کە لەڕێگادارویاندا

لەم ڕێ ڕۆیشتنەدا چەندەها پێشهات و ڕووداو ڕوویانداوە کە فەرموودەناسان و ژیاننامەنوسان ئاماژەیان پێکردووە لێرەدا هەندێکیان باسدەکەین:

### ١- ئافرەت و دوومنداڵەکە و دوو درەختەکە:

ئەم بەسەرهاتە لەچەندەها گێڕانەوەدا هاتووە هەندێك لە فەرموودەناسان بەراستی دەزانن وە ئەوانی تریان بە لاوازی دەزانن، بەڵام بە تێکڕای ئەو گێڕانەوانە وا دەردەکەوێت کە بنەمایەکی هەبێت، لە دوای کۆکردنەوە و ڕێکخستنیان بەم جۆرەی لای خوارەوە دەبێت:

یەعلای کوڕی مورە لە باوکیەوە ئەویش لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: [من بە چاوی خۆم چەند شتێکم لە پێغەمبەر ﷺ بینیوە.... من لەگەڵی بووم لە ڕێگای مەککە [لەو جارەدا کە هەموو خزمان تێیدا بووین دەچووین بۆ حەج کردن... بەڕێکەوتبووین کاتێك گەیشتینە ناوچەی (ئەلڕەحاء)، پێغەمبەر ﷺ تەماشای کرد

(١٤٥٨) أخرجه: مسلم (١٤٧/١٢١٨).

(١٤٥٩) أخرجه: مسلم (١٤٧/١٢١٨).

(١٤٦٠) وعن ام سلمة رضي الله عنها قالت: سمعت رسول الله ﷺ يقول: ((اهلوا يا آل محمد بعمرة في حج)) أخرجه: أحمد (٢٦٥٩٠)، وابن حبان (٣٩٢٢) وقال محققه: سنده صحيح. وقد خرج معه في هذا الحج جميع زوجاته التسع. انظر: ابو داود (١٧٢٣) وصححه الالباني في (صحيح ابي داود) (١٥١٥) و الارناؤط في (زاد المعاد) (١٠٦/٢)، السيرة النبوية (ابن كثير) (٢٢٢/٤).

(١٤٦١) أخرجه: مسلم (١٤٧/١٢١٨).

(١٤٦٢) انظر: (البداية) لابن كثير (١٣٧/٥).

ئافرەتێك وا بەرەو لای دێت، وشترەکەی ڕاگرت تا لێی نزیك بووە وە][١٤٦٣] ئەو ئافرەتە هاتە خزمەتی و کوڕێکی خۆی لەگەڵ بوو فێ و پەرکەمێکی زۆر توندی لەگەڵدابوو، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم کوڕەم کە دەبینیت [حەوت ساڵە تووشی پەرکەم بووە، وە ڕۆژی دووجار توشی دەبێت][١٤٦٤] پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((گەر دەتەوێت دوعای بۆ دەکەم [منداڵەکەم لێ نزیك بکەرەوە)). ئافرەتەکەش منداڵەکەی لێنزیك کردەوە، پێغەمبەر ﷺ تفی کردە دەمیەوە و فەرمووی: ((بڕۆ دەرەوە ئەی دوژمنی خوا من پێغەمبەری خوام)) پاشان بە ئافرەتەکەی فەرموو: ((هەرکات ئێمە گەڕاینەوە و هاتینە ئەم ناوچەیە لە هەواڵ و بەسەرهاتی ئاگادارمان بکەرەوە)).

پاشان هەموو بەڕێکەوتن گەیشتنە ناوچەیەکیتر، لەوێدا وشترێکمان بەرچاو کەوت دوور لە خێڵەکەی بوو هەر دەی بۆڕاند [کاتێك وشترەکە پێغەمبەری ﷺ بینی بغەبغی کرد] هەردوو چاوی فرمێسکی لێدەرژا، پێغەمبەر ﷺ هەندێك لە هاوەڵانی نارد بۆلای خێڵەکە و فەرمووی: ((خاوەنی ئەم وشترە بدۆزنەوە)) دواتر دۆزیانەوە و هێنایانە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پێی فەرموو: (([ئەم وشترە بۆ سکاڵات لێدەکات؟]، ئەو دەڵێت من لای ئەمان لە دایکبووم هەموو کارێکیان پێدەکردم تا لەلایان پیر بووم ئێستاش دەیانەوێت سەرم ببڕن)) [خاوەنەکەی وتی: ئێمە کارمان پێدەکرد، بەڵام ئێستا پیربووە و توانای کارکردنی جارانی نەماوە، ئێمەش بڕیارماندا سبەی سەری ببڕین. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لَا تَنْحَرُوهُ وَاجْعَلُوهُ فِي الْإِبِلِ يَكُونُ مَعَهَا)) واتە: سەری مەبڕن وازی لێبێنن با لەگەڵ وشترەکانی تردا بمێنێتەوە))].

پاشان بەڕێکەوتن لەو جێگەیە و دوو درەختی جیای بینی وە بە منی فەرموو: ((بڕۆ پێیان ڕابگەیەنە با هەردووکیان بۆمن ببنەوە پەنایەك)). چووم پێم ڕگەیاندن دوودرەختەکە بوونە پەنایەك و دەسی بە ئاو گەیاند... پاشان بەڕێکەوتین و ئەو ناوچەیەشمان بەجێ هێشت][١٤٦٥].

---

(١٤٦٣) أخرجه: ابونعيم (الدلائل) (٢٨٧)، وابن السني (عمل) رقم: (٤١٠) والبيهقي (الدلائل) (٢٢٩٣) وقال محققوه: اسناده ضعيف.

(١٤٦٤) اخرجه الحاكم (٦١٧/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وقال الشيخ الألباني: حديث جيد انظر: (الصحيحة) (٤٨٧)

(١٤٦٥) الحديث بطوله رواه أحمد (١٧٥٦٥) وقال محققوه: اسناده ضعيف. والطبراني (الكبير) (١٣٠/١٦) و (٦٧٢/٢٢،

### ٢- ئەنجەشە وشترەکەی لێدەخوڕێت:

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: [ئوم سولەیم لەگەڵ هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ بوو [لەو سەفەرەدا پیاوێکی دەنگخۆشی لەگەڵدا بوو ناوی ئەنجەشە بوو[١٤٦٦] هۆرەی بۆ وشترەکان دەکرد][١٤٦٧] [هەموویان چالاك بوون و کەوتنە لوقەو غاردان][١٤٦٨]، پێغەمبەر ﷺ هاتە لایان و فەرمووی: ((ارْفُقْ أَنْجَشَةُ وَيحَكَ[١٤٦٩] روَيْدَكَ [سَوْقَاً] بِالْقَوَارِيرِ))][١٤٧٠] واتە: ئەی هاوار بۆ تۆ ئەنجەشە نەرمو نیان بە لەسەرخۆ و شوشەکان لێبخورە.

### ٣- ئافرەتێك پرسیار دەکات:

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دابووین بەناوچەی ئەلڕەوحائدا دەڕۆیشتین، لەناکاو کۆمەڵێك خەڵکمان بینی بەرەو لای ئێمە دەهاتن و گەیشتنە لامان، یەکێك پرسیاری لێکردن: (ئێوە کێن؟) یەکێك لەوانە لە وەڵامدا وتی: ((ئێمە موسوڵمانین. پاشان ئافرەتێکیان پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد و وتی: (تۆ کێیت؟) وتی: ((من پێغەمبەری خودام)) ئافرەتەکە منداڵێکی بەرزکردەوە و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئایا حەج بۆ ئەمە دەنوسرێت؟ فەرمووی: ((بەڵێ بەڵام پاداشتەکەی بۆ تۆیە))][١٤٧١].

### ٤- بایەخدان بە دەستنوێژ:

ئیبنو عومەر ﷺ دەفەرموێت: [لە یەکێك لە سەفەرەکانماندا (واتە: حەجی ماڵئاوایی)[١٤٧٢] پێغەمبەر ﷺ دواکەوت، کاتێك گەیشتەوە بە ئێمە ماندوبووین[١٤٧٣]

---

٦٧٩، ٦٨٠)، وعبد بن حميد (١٠٥٤) وقال محققه: سنده ضعيف، وقال الحافظ في (المطالب) (٣٨١٦): اسناده حسن، والبيهقي (الدلائل) (٢٢٦١) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢٩١٨).

(١٤٦٦) أخرجه: أحمد (١٢٠٩٠) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما، والحميدي (١٢٩٠) وفي رواية: أحمد (٢٦٨٦٦): (ان النبي ﷺ حج بنسائه......).

(١٤٦٧)أخرجه: أحمد (٢٥٤/٣).

(١٤٦٨) أخرجه: أحمد (١٢٠٤١) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

(١٤٦٩) أخرجه: البخاري (الادب) (٨٨٣) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الادب المفرد) (٦٧٨).

(١٤٧٠) أخرجه: البخاري (٦١٤٩) ومسلم (٢٣٢٣)، وأحمد (١٢٧٩٩)، وابويعلى (٤٠٧٥).

(١٤٧١) أخرجه: أحمد (٢١٩/١)، ومسلم (١٣٣٦)، وابوداود (١٧٣٦) والطياسي (٣٧٠٧)، والحميدي (٥٠٤) وابن حبان (٣٧٩٨) وقال محققه: اسناده صحيح. واللفظ له.

(١٤٧٢) قال الحافظ (الفتح) (٢٦٥/١) وقع في رواية مسلم (٢٤١): انها كانت من مكة الى المدينة ولم يقع ذلك لعبدالله بن عمر محققاً الا في حجة الوداع).

(١٤٧٣) قال الحافظ (الفتح) (٢٦٦/١): اي: ادركهم وكانوا اخروا العصر فارهقهم ضيق الوقت.

دەستنوێژمان دەگرت و قاچمان جوان نەدەشۆرد بەڵکو هەردەستی تەڕمان پێدا دەهێنا، پێغەمبەر ﷺ ئێمەی بەوجۆرە بینی بە دەنگی بەرز هاواری کرد و فەرمووی: ((وَيلٌ لِلأعقابِ مِن النّارِ))[١٤٧٤] واتە: ئەی هاوار بەحاڵی پاژنەکانتان لە ئاگری دۆزەخ. ئەمەی دوو سێ جار دووبارەکردەوە.

### ٥- ئەوە وشتری قوربانییە:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی وشترێکی قوربانی پێش خۆی دابوو لێی دەخوڕی، پێی فەرموو: ((سواری پشتیبە؟)) پیاوەکە وتی: (ئەوە وشتری قوربانییە) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سواری پشتیبە)) وتی: ئەوە وشتری قوربانییە. فەرموی: ((ئەی هاوار لە تۆ سواری پشتیبە))[١٤٧٥].

### ٦- سەرەتا حەج بۆ خۆت بکە:

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەر ﷺ گوێی لە دەنگی پیاوێك بوو دەیوت: خودایە نیازمە حەج بکەم لە جیاتی شەبورمە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((شەبورمە کێیە؟)) وتی: برای منە یاخود خزمێکی منە. پێغەمبەر ﷺ فەرموی ئایا تۆ پێشتر حەجت بۆ خۆت کردووە؟)) وتی: نەخێر فەرمووی: ((حُجَّ عَنْ نَفْسِكَ ثُمَّ حُجَّ عَنْ شُبْرُمَةَ))[١٤٧٦] واتە: سەرەتا حەج بۆ خۆت بکە پاشان حەج لەجیاتی شەبورمە بکە))].

### ٧- غەیبەت کردن گۆشت خواردنە:

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: [عەرەبەکان لە گەشت و سەفەرەکانیاندا خزمەتی یەکتریان دەکرد، لەو سەفەرەشدا ئەبوبەکرو عومەر پیاوێکیان بەکرێ گرتبوو تا خزمەتیان بکات، هەردووکیان خەوتبوون، دواتر هەستان و تەماشایان کرد ئەو خزمەتکارە خواردنی ئامادە نەکردووە، یەکێك لەو دوانە بەوی تریانی وت: ئەوە خەوەکەی [لە خەوی ماڵەوە دەچێت]. دواتر هەڵیانساند و پێیان وت: برۆ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پێی بڵێ: ئەبوبەکر و عومەر سەلامت لێدەکەن داوای نانی بەیانیت لێدەکەن.

---

(١٤٧٤) أخرجه: البخاري (١٦٣).

(١٤٧٥) أخرجه: البخاري (١٧٠٦) ومسلم (١٣٢٢)، وابوداود (١٧٦٠) وابن ماجة (١٩٥٤).

(١٤٧٦) أخرجه: ابوداود (١٨١١) وابن ماجة (٢٩٠٣)، والدار قطني (٢٦٧/٢) وصححه، والبيهقي (١٧٩/٥) وصححه، وصححه الحافظ في (الاصابة) (٣٨٣١) وفي (تلخيص الحبير) (٢٢٣/٢).

ئەو خزمەتکارە چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتەکەی ئەوانی پێ گەیاند و پێغەمبەریش ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: ((اقْرَئِيهما السّلام وَأَخْبِرِهما إِنَّها قَدْ ايتدمتما)) واتە: سلاوی منیش بگەیەنە بە هەردووکیان و هەواڵیان بدەرێ ئەوان ئەم بەیانییە نانیان خواردووە)). دواتر ئەبوبەکر و عومەر تۆقین و هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پیان وت: ئەی پێغەمبەر ﷺ یەکێکمان ناردە خزمەتت بۆ نان تۆش فەرموو بووت: ئەوان نانیان خواردووە، ئایا ئێمە چ جۆرە نانێکمان خواردووە؟ فەرموی: ((بِلَحْم أَخِيكُمَا وَالَّذِي نَفسِي بِيَدِهِ إِنِّي لأَرَى لَحْمه بَين أَنْيابِكُمْ)) واتە: نانی ئەم بەیانیەتان گۆشتی ئەو برایەتان بوو کە خواردتان سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە گۆشتی ئەو برایەتان دەبینم کە لە نێوان کەڵبەی ددانەکانتان جێماوە)) وتیان: داوای لێخۆشبوونمان بۆ بکە فەرمووی: ((با ئەو برایەتان داوای لێخۆشبونتان بۆ بکات (وبتان بەخشێت)))][١٤٧٧].

٨- ون بوونی وشترەکەی ئەبو بەکر ﷺ:

ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﷺ دەفەرموێت: [چووین بۆ حەج لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە ناوچەی (ئەلعەرەج) لاماندا بۆ حەوانەوە، پێغەمبەر ﷺ دابەزی و لە جێگەیەکدا دانیشت و عائیشەش هات لە تەنیشتی دانیشت، منیش چووم لە تەنیشتی باوکم دانیشتم، وشترەکەی پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکرد لەگەڵ یەکدا بوون، وشترەکەی ئەبوبەکر ﷺ سپێردرابوو بە گەنجێك، ئەبوبەکر ﷺ دانیشت و چاوەڕێی دەکرد، بەڵام گەنجەکە هات و وشترەکەی پێنەبوو ئەبوبەکر وتی: وشترەکە لە کوێیە؟ وتی: دوێنێ لێم ون بوو. ئەبوبەکر وتی: یەك وشترت پێ بوو ئەویشت ونکرد... پێغەمبەریش ﷺ لەوێدا بە خەندەو پێکەنینەوە دەیفەرموو: ((انْظُرُوا إلى هَذا المُحْرِمِ وَما يَصْنَعُ))[١٤٧٨]. واتە: تەماشای ئەو پیاوە بکەن بە جل وبەرگی ئیحرامەوە چی دەکات!؟.

(١٤٧٧) أخرجه: الضياء (المختارة) (٣٣/٢)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٦٠٨).

(١٤٧٨) أخرجه: أحمد (٢٦٩١٦) وقال محققوه: اسناده ضعيف، وابوداود (١٨١٨) وابن ماجة (٢٩٣٣)، والطبراني (الكبير) (٢٣٩/٢٢)، والحاكم (٤٥٣/١) وصححح و وافقه الذهبي، وحسنه الشيخ الالباني في (صحح ابي داود) (١٥٩٥) وضعفه في (الضعيفة) (٤٠٣٩).

### ٩- بە ڕۆژوبوون و کورت کردنەوەی نوێژەکان:

ئەم ڕووداوە لە کاتی عومرەکردنی پێغەمبەر ﷺ دا ڕوویدا وە دەکرێ لە حەجی ماڵئاواییشدا ڕوویدابێت وەك زانای فەرموودەناس ئیبنو حەجەر ئاماژەی پێ کردووە: دایکی باوەڕداران عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ عەمرەکردن منیش لەگەڵیدا بووم کاتێك لە مەککە نزیك بووینەوە وتم: بەدایك و باوکمەوە فیداتبم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ نوێژت کورت کردەوە بەڵام من کورتم نەکردەوە وە تۆ بەڕۆژو نەبوویت من بەڕۆژوبووم. فەرمووی: ئافەرین باشت کرد عائیشە][١٤٧٩]. پێغەمبەریش ﷺ ڕەخنەی لێنەگرتم.

### ١٠- ئەو جێیانەی پێغەمبەر ﷺ تیایدا دابەزی:

ئیبنو عومەر ﵄ دەفەرموێت: [پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەو مزگەوتە بچوکەدا کرد کە لەخوار ئەو مزگەوتەوەیە کە بەرزە و دەڕوانێت بەسەر ناوچەی ئەلحەروائدا کە حەفتاو سێ کیلۆمەتر لە مەدینەوە دوورە]... دواتر لای دارەگەورەکەی ناوچەی (ئەلرەویسە) کە هەشتاو پێنج کیلۆمەتر لە مەدینەوە دوورە]... لای ڕاستی ڕێگەکە لایدا... پاشان دواتر لایدا لەلای چەپی ڕێگەکە خوار چەمی هەرشی نزیك ناوچەی (ئەلجوحفە).... دواتر لای چەمەکەی نزیك ناوچەی (مەڕولزەهران) کە بیست کیلۆمەتر نزیکە لە مەککە وەلەوێدا ماوەی بەرد هەڵدانێك دوور لە ڕێگەکە لایدا... هەروەها پێغەمبەر ﷺ شەویش لای دەداو دەمایەوە لە ناوچەی (توا) و نوێژی بەیانی دەکرد پاشان دەچووە ناو شاری مەککە...][١٤٨٠].

### ١١- لادان لە ناوچەی سەرەف:

دایکی باوەڕداران عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ چووین بۆ حەج لە مانگی حەج کردن و قەدەغراوەکاندا بوو... تا دابەزینە ناوچەی (سەرەف) کە یانزە کیلۆمەتر دوورە لە شاری مەککەوە لەوێدا پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: ((مَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ، فَأَحَبَّ أَنْ يَجْعَلَهَا عُمْرَةً فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلاَ)) واتە:

---

(١٤٧٩) أخرجه: الدارقطني (١٨٨/٢) وقال محققه: اسناده حسن، والبيهقي (الكبرى) (١٤٢/٣)، وحسنه الحافظ في (الكاف الشاف) (٥٥٨/١) وقال الارناؤوط (زاد المعاد) (٤٧٢/١): اسناده صحيح.

(١٤٨٠) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (٣١٩).

هەرکەسێك لە ئێوە ئاژەڵی قوربانی پێ نییە و حەز دەکات سەرەتا بیکات بە عومرە با وابکات، وە ئەوانەش کە ئاژەڵی قوربانی کردنیان پێیە بۆیان نییە وا بکەن. ئیتر ئەوانەی ئاژەڵیان پێنەبوو کردیانە عومرە وە ئەوانەی کە ئاژەڵیان پێ بوو وایان نەکرد، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئاژەڵی قوربانی کردنی پێ بوو لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵە بەتواناکانی. لەوێدا پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لام وە من دەگریام. فەرمووی: ((بۆچی دەگریت؟)) وتم: قسەکەتم بیست کە بۆ هاوەڵانت دەفەرموو، بەڵام من عومرەکردنم لێ قەدەغە کرا فەرمووی: ((تۆ چیت بەسەر هات؟)) وتم: من نوێژ ناکەم. فەرمووی: ((فَلَا يَضُرُّكِ، فَكُونِي فِي حَجِّكِ، فَعَسَى اللهُ أَنْ يَرْزُقَكِيهَا، وَإِنَّمَا أَنْتِ مِنْ بَنَاتِ آدَمَ، كَتَبَ اللهُ عَلَيْكِ مَا كَتَبَ عَلَيْهِنَّ))[١٤٨١] واتە: ئەوە زیانی نییە بۆت تۆ لەسەر حەج کردنەکەت بەردەوامبە بەڵکو خودا پێتی ببەخشێت، وە تۆش لە کچانی ئادەمیت ئەوەی خودا پێویستی کردووە لە سەر ئەوان لە سەر تۆشی بە پێویست داناوە] ((انْقُضِي رَأْسَكِ، وَامْتَشِطِي، وَذَرِي عُمْرَتَكِ وَأَهِلِّي بِالْحَجِّ))[١٤٨٢] واتە: [پەلکەکانت هەڵبووە شێنەرەوە و قژت دابینە و دەست لە عومرە هەڵبگرە و نیەتی حەج کردن بهێنە].

**١٢- دابەزین لە ناوچەی (ذو توا):**

ئیبنو عومەر ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەر ﷺ لە ناوچەی (ذوتوا) شەو مایەوە تا ڕۆژ بووەوە پاشان چووە شاری مەککە][١٤٨٣] لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ شەو لای ئەدا تا ڕۆژ دەبووە وە نوێژی بەیانی لەوێدا دەکرد][١٤٨٤] پاشان خۆی دەشۆرد و بەڕۆژی ڕووناك دەچووە شاری مەککە و دەیفەرموو پێغەمبەریش ﷺ وەهای دەکرد][١٤٨٥].

---

(١٤٨١) أخرجه: البخاري (١٥١٨) ومسلم (١٢١١).

(١٤٨٢) أخرجه: أحمد (٢٦٠٨٦) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

(١٤٨٣) أخرجه: البخاري (١٥٧٤).

(١٤٨٤) أخرجه: البخاري (١٥٧٣).

(١٤٨٥) أخرجه: مسلم (١٢٥٩/٢٢٦).

## چوونە شاری مەککە

ئیبنو عومەر ﷺ دەیفەرموو: [پێغەمبەر ﷺ چووە ناو شاری مەککەوە لە ڕێگەی بەرزاییەکەی سەرو شاری مەککە لە ناوچەی (عەزمائەوە)[١٤٨٦]. جابریش ﷺ دەفەرموێت: [...لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین لە بەرەبەیانی [ڕۆژی چوارەم [یان پێنجەمی][١٤٨٧] مانگی زول حجە][١٤٨٨] لە کاتی چێشتەنگاودا چووینە ناو شاری مەککەوە، پێغەمبەر ﷺ لە دەرگای [بەنی شیبەوە][١٤٨٩] چووە ناو مزگەوت و وشترەکەی یەخداو دابەزی][١٤٩٠]. [و پۆشاکێکی سەوزی [ناوچەی حەزرەمی لەبەردابوو][١٤٩١]. و شانی ڕاستی ڕووت کرد [...موسوڵمانانیش هەموو شانی ڕاستیان ڕووت کرد پۆشاکی ئیحرامەکانیان لە ژێر باڵیانەوە دابەسەر شانی چەپیاندا][١٤٩٢] سەرەتا پێغەمبەر ﷺ چوو دەستی لەبەردەڕەشەکەدا و ماچی کرد [و هەردوو چاوەکانی پڕبوو لە فرمێسك و لێیان ڕژا][١٤٩٣].

پاشان بەلای ڕاستتدا دەستی بە تەواف و سوڕانەوە کرد گەڕایەوە لای بەردەڕەشەکە بەو جۆرە تا سێیەم تەوافی بە هەروەلە (واتە: ڕۆیشتنی هەڵقونەو خێرا) ئەنجامدا چوار تەوافەکەی تری [لەسەرخۆ و هێواش ئەنجامدا] [لە هەموو تەوافێکدا دەستی دەدا لە ڕوکنی یەمانی و بەردە ڕەشەکە][١٤٩٤] [لە نێوانیاندا دەیفەرموو: ((رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)) واتە: خودایە هەموو چاکەیەکی دنیاو قیامەتمان پێ ببەخشە و بمانپارێزە لە سزای ئاگر][١٤٩٥]. لە دوای تەواو بوونی تەواف

---

(١٤٨٦) أخرجه: البخاري (١٥٧٦)، ومسلم (١٢٥٧).

(١٤٨٧) أخرجه: البخاري (١٥٤٥).

(١٤٨٨) أخرجه: البخاري (١٥٤٠).

(١٤٨٩) أخرجه: البيهقي (الكبرى) (٨٩٩١).

(١٤٩٠) أخرجه: البخاري (١٥٤٠) وانظر: حجة النبي ﷺ (ص:٥٦).

(١٤٩١) أخرجه: أحمد (١٧٩٥٦) وقال محققوه: حديث صحيح، وابوداود (١٨٨٣).

(١٤٩٢) أخرجه: ابوداود (١٨٨٤)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (١٦٥٩).

(١٤٩٣) أخرجه: الحاكم (٤٥٥/١) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (٧٤/٥) وقال ابن كثير في (البداية) (٢٠٤/٥): اسناده جيّد.

(١٤٩٤) أخرجه: ابوداود (١٨٧٦).

(١٤٩٥) أخرجه: النسائي (الكبرى) (٣٩٣٤).

چووە لای مەقامی ئیبراهیم و فەرمووی: (وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِيمَ مُصَلًّى) واتە: جێی ئیبراهیم بکەنە جێی نوێژکردن. لە دوای مەقامی ئیبراهیمەوە دووڕکات نوێژی کرد [سورەتی:﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ١﴾ (الكافرون) لە ڕکاتی یەکەمدا خوێند و سورەتی: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١﴾ (الإخلاص)ی لە ڕکاتی دووەمدا خوێند][١٤٩٦] [پاشان لە دوای تەواو بوونی نوێژەکە چووە لای بیری زەمزەم و ئاوی لێ خواردەوە و کەمێکی بە پێشەسەریدا ڕژاند][١٤٩٧]. پاشان گەڕایەوە لای بەردە ڕەشەکە [دەستی لێدا [بەردە ڕەشەکەی ماچ کرد [پاشان دەستی خۆی ماچ کرد][١٤٩٨] و دواتر دەستی بەسەردا هێناو ئینجا هەردوو دەستی بە دەموچاویدا هێنا][١٤٩٩].

پاشان لە دەرگای [سەفاوە] چووەدەر تا نزیك بووە وە لە تەپۆڵکەی سەفاو ئەو ئایەتەی خوێند: ﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ...١٥٨﴾ (البقرة) (واتە: سوڕانەوە لە نێوان سەفاو مەڕوە لە دروشمەکانی خودایە) ئینجا فەرمووی: ئەوەی سەرەتا خودا دەستی پێکردووە ناوی هێناوە منیش بەوە دەست پێدەکەم، سەرەتا چووە سەر تەپۆڵکەی سەفا تا کەعبەی لێدەرکەوت و ڕووی تێکرد [و سێ جار (الله أكبر)ی کرد و پاشان فەرمووی: ((لَا إِلَهَ وَحْدَهُ [لَا شَرِيكَ لَهُ]، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، [يُحِي وَيُمِيت وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ] وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ)) پاشان دوعای کرد و دووبارەی کردەوە پاشان دوعای کردو سێبارە وتیەوە پاشان لە تەپۆڵکەی سەفا دابەزی بەرەو تەپۆڵکەی مەڕوە ڕۆیشت][١٥٠٠] هەموو خەڵکی لەگەڵ ڕۆیشت و ئەو لە دوای خەڵکەکە [لە جێ ڕاکردنەکەی ئەبتوح] خێراو تیژ ڕای دەکرد [هەردوو ئەژنۆی دەرکەوتبوو][١٥٠١] بە هۆی تیژ ڕۆیشتنەکەیەوە بە [هاوەڵانی] دەفەرموو: ((اسْعَوا فَإِنَّ اللَّهَ كَتَبَ عَلَيْكُمْ السَّعي)) واتە: خێراو هەڵە داوان بڕۆن خودا ئەوەی لەسەر

---

(١٤٩٦) أخرجه: مسلم (١٢١٨).

(١٤٩٧) انظر: (حجة النبي ﷺ) للشيخ الالباني (ص:٥٨).

(١٤٩٨) أخرجه: مسلم (١٢٦٨).

(١٤٩٩) أخرجه: الحاكم (٤٥٥/١) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (٧٤/٥) وقال ابن كثير (البداية) (٢٠٤/٥): اسناده جيّد.

(١٥٠٠) أخرجه: مسلم (١٤٧/١٢١٨).

(١٥٠١) أخرجه: النسائي (الصغرى) (٢٤٢/٥ (٢٩٨٠) وفي (الكبرى) (٣٩٧٤) وأحمد (٢٧٢٨) وقال محققوه: اسناده حسن.

پێویست کردووون] [چونکە ناوچەی ئەبتوح پێویستە بە خێرای پێیدا تێپەڕبیت] لە دوای ئەو ناوچەیەوە ئینجا بە ئاسایی دەڕۆیشت تاگەیشتە سەر تەپۆڵکەی مەڕوە لەوێوە تەماشای کەعبەی کرد و ڕووی تێکرد و ئەوانەی لە سەر سەفا فەرمووی هەمووی لە سەر مەڕوەش دووبارەکردەووە بەو جۆرە لە نێوان سەفا و مەڕوە دەهات و دەچوو [لە دواهەمین تەوافی حەوتەمدا لەسەر مەڕوە وە فەرمووی: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنِّي لَو اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ، لَمْ أَسُقِ الْهَدْيَ، وَلَجَعَلْتُهَا عُمْرَةً، فَمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ فَلْيَحِلَّ وَلْيَجْعَلْهَا عُمْرَةً [...أَحِلُّوا مِنْ إِحْرَامِكُمْ... وَقَصِّرُوا، وَأَقِيمُوا حَلَالًا حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ فَأَهِلُّوا بِالْحَجِّ، وَاجْعَلُوا الَّتِي قَدِمْتُمْ بِهَا مُتْعَةً])) واتە: ئەی خەڵکینە گەر من پێشتر ئەوەی ئیستام بزانیایە وشتری قوربانیەکانم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا، سەرەتا دەمکردە عومرە لە جێی حەج، ئێستاش ئەوەی قوربانی لەگەڵ خۆی نەهێناوە با پۆشاکی ئیحرام دابنێت و بیکاتە عومرە... ئێوەش ئیحرامەکانتان لابەن... سەرتان کورت بکەنەوە و قەدەغەکراوەکانی ئیحرامەکەتان لەسەر لادەچێت بەو جۆرە بمێننەوە تا ڕۆژی (٨) زولحجە (واتە: ڕۆژی دەرچوون بۆ مینا بۆ حەج کرد) ئەو کاتە دووبارە ئیحرام لەبەربکەنەوە و نیەتی حەج کردن بهێنن و ئەو (مەڕەی) لەگەڵ خۆتان هێناوتانە بیکەنە (فدیە)]]).

جابر ﷺ دەفەرموێت: لەوێدا ورتە ورت بە ناو خەڵکدا بڵاوبووەوە ئەو هەواڵەش گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ [لەو کاتەدا لەبەشی لای خوارەوەی تەپۆڵکەی مەڕوە بوو][١٥٠٢] فەرمووی: ((بَلَغَنِي أَنَّ قَوْمًا يَقُولُونَ كَذَا وَكَذَا. وَاللَّهِ لَأَنَا أَبَرُّ وَأَتْقَى لِلَّهِ مِنْهُمْ، وَلَوْ أَنِّي اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا أَهْدَيْتُ، وَلَوْلَا أَنَّ مَعِيَ الْهَدْيَ لَأَحْلَلْتُ)). واتە: هەواڵم پێگەیشتووە کەسانێك ئاوهاو ئاوها دەڵێن سوێند بەخوا من لەوانە چاکترو گوێڕایەڵترم بۆ خوا وە ئەگەر من ئەوەی ئێستام دەزانی وشتری قوربانیم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا وە ئێستا گەر لەبەر ئەوانە نەبووایە من پۆشاکی ئیحرامم لادەبرد و لێی دەردەچووم)).

لەوێدا سوراقەی کوڕی جوعشم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە تەنها بۆ

---

(١٥٠٢) انظر (حجة النبي ﷺ) للشيخ الالباني (ص:٦٠).

ئێمەیە یاخود بۆ هەتا هەتایە؟ فەرمووی: ((بەڵکو بۆ هەتا هەتایە))[١٥٠٣]. پاشان سوراقە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاینەکەمان زیاتر بۆ ڕوونبکەرەوە دەڵێیت ئێستا ئێمە دروستبووین و هاتوینەتە دونیاوە، ئایا ئەو کارانەی ئەمڕۆ ئەنجامیان دەدەین ئایا پێشتر خودا بڕیاری لەسەرداوە مەرەکەبی بڕیارە کە وشك بۆتەوە و گۆڕانی بەدوادا نایەت یان شتانێکن خۆمان بە تەنها بڕیاری لەسەر دەدەین؟ فەرمووی: ((لَا، بَلْ فِيمَا جَفَّتْ بِهِ الْأَقْلَامُ، وَجَرَتْ بِهِ الْمَقَادِيرُ)) واتە: نا بەڵکو بەو بڕیارانەی خودا کە مەرەکەبی نوسراوەکانی وشك بۆتەوە و گۆڕانکاری بەدوایدا نایەت)). وتی: کەواتە ئێمە ئەو کارانە بۆ ئەنجام دەدەین. فەرمووی: ((اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ)) واتە: ئێوە ئەو کارانە بکەن کە داواتان لێکراوە وە بزانن هەموو یەکێك ئەو کارانەی لەسەر ئاسانکراوە کە بۆی دروستکراوە.

[دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردن گەر پۆشاکی ئیحرامیان لابرد پێویستە (هەدی) (واتە: کەفارەتی لابردنی ئیحرام) بدەن ئەویش [بەحەوت کەس دەتوانین وشترێك سەربڕین] [ئەوانەش توانای ئەومیان نییە دەتوانن سێ ڕۆژ لە مەککە بەڕۆژوبن و حەوت ڕۆژیش لە دوای گەڕانەوەیان بۆ وڵات و نیشتیمانی خۆیان] [بەڵام هەندێکمان ئەوەمان لەسەر گران بوو پێمان ناخۆش بوو][١٥٠٤] [بەدەم قسەکردنەوە ڕۆیشتین تا ڕۆژهەڵاتی مەککە] [لەوێ ئەو باسەمان لە نێوان خۆماندا دووبارەکردەوە وتمان: ئێمە تەنها بۆ حەج کردن هاتووین نەك بۆ هیچ شتێکی تر، ئەوەتا ئێستا تەنها چوار ڕۆژ ماوە لە نێوان ئێمە و عەرەفە] [یان پێنج ڕۆژ، داوامان لێکراوە بچینە لای هاوسەرەکانمان...] [دواتر هەموو ئەو دەنگوباسانە ئایا لە ڕێگەی ئێمە وە یان کەسانی ترەوە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ] [ئەویش هەستا] [وتاری فەرموو سەرەتا سوپاس و ستایشی شیاو و پێویستی خوای کرد] پاشان فەرمووی: (([أباللهِ تُعلموني أيها الناسُ ! ؟] قد علمتُم أني أتقاكُم للهِ وأصدَقُكم وأبرُّكم ، [ افعلوا ما آمُرُكم به فإني] لولا هَدْيِي لحللتُ لكم كما تُحِلُّونَ[ ولكن لا يحلُّ مني حرامٌ حتى يبلغَ الهَدْيُ مَحِلَّهُ ] ولو استقبلتُ من أمري ما استدبرتُ لم أَسُقِ الهَدْيَ، فحُلُّوا ])), واتە: ئەی خەڵکینە ئایا ئێوە خودا بە من دەناسێنن، خۆتان زانیوتانە کەمن لە هەمووتان گوێڕایەڵتر و چاکە

(١٥٠٣) أخرجه: البخاري (٢٣٧١،٢٥٠٥).

(١٥٠٤) انظر (حجة النبي ﷺ) للشيخ الالباني (ص:٦٣،٦١).

کارترم، ئەوەی فەرمانم پێکردوون جێبەجێی بکەن، گەر من ئەو وشترانەم لەگەڵ خۆم نەهێنایە ئەوکاتە منیش وەك ئێوە ئیحرامم لادەبرد بەڵام قەدەغەکراو بەمن تەنها حەڵاڵ ناکرێت دەبێت وشترەکان لەگەڵ خۆم ببەم تا جێی سەر بڕینەکەی لە مینا (لە ڕۆژانی حەج کردندا) ئێوەش ئیحرامەکانتان لا ببەن.

[ئێمەش گوێگرو و گوێڕایەڵ بووین] [ئیتر خەڵکی هەموو ئیحرامیان لابرد جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوانەی وشتری قوربانی کردنیان پێ بوو] [وەك تەلحە] [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە هاوسەرەکانی کرد ئیحرامەکانیان تەواو (واتە: لەدوای عومرە کردنەوە) وە یەکێکیان فەرمووی: (بۆچی خەڵکی ئیحرامیان لابرد بەڵام تۆ لات نەبرد؟) فەرمووی: ((من سەرم ماڵیەوە وشترەکانی قوربانیم نیشانە کردووە لەبەر ئەوە ئیحرام لانابەم تا کاتێك وشترەکان دەکەمە قوربانی))][١٥٠٥].

پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای کەعبەی کردو فەرمووی: ((مَرْحَبًا بِكِ مِنْ بَيْتٍ مَا أَعْظَمَكِ، وَأَعْظَمَ حُرْمَتَكِ، وَلَلْمُؤْمِنِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللهِ حُرْمَةً مِنْكِ،إِنَّ اللهَ حَرَّمَ مِنْكِ وَاحِدَةً وَحَرَّمَ مِنَ الْمُؤْمِنِ ثَلَاثًا: دَمَهُ، وَمَالَهُ، وَأَنَ يُظَنَّ بِهِ ظَنَّ السَّوْءِ))[١٥٠٦] واتە: پێشوازیت لێبێ ئەی کەعبە چەند مەزنیت و چەندە ڕێز و حورمەتت گەورەیە بەڵام بڕوادار لای خودا ڕێزی لە تۆ گەورەترە خودا تەنها یەك شتی لە بەرامبەر تۆ قەدەغە کردووە بەڵام بڕوادار سێ شتی قەدەغەیە: خوێن و سامانەکەی و نابێت گومانی خراپی پێ ببرێت.

جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لای سێبەری کەعبە دانیشتبوو ئەبوڕەمسە هات، دەفەرموێت: من چووم بۆ حەج لای سێبەری کەعبەدا کاتێك پێش نوێژی نیوەڕۆ بوو[١٥٠٧] باوکم وتی: [ئایا دەزانی ئەو پیاوە کێیە؟ وتم: نەخێر. وتی: ئەوە موحەممەدە پێغەمبەری خوا ﷺ. ئیتر منیش موچوڕکێکم پێداهات وە کەوتمە لەرزین، چونکە من وامدەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مرۆڤەکان ناچێت بەڵام تەماشام کرد مرۆڤێکی ڕووخۆش و جوان بوو و قژی زۆر بوو وە ڕەنگی خەنەی پێوە دیار بوو، وە دوو پۆشاکی سەوزی لەبەردابوو، باوکم سەلامی لێکرد، پاشان دانیشتین و ماوەیەك

---

(١٥٠٥) أخرجه: مالك (٣٩٤/١)، والبخاري (١٥٦٦) ومسلم (١٧٦/١٢٢٩).

(١٥٠٦) أخرجه: البيهقي (الشعب) (٦٧٠٦)، وقال الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٣٤٢٠): حسن.

(١٥٠٧) أخرجه: أحمد (١٧٤٩٦).

بەیەکەوە قسەمان کرد][١٥٠٨]، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بە باوکمی فەرموو: ((ئەوە کوڕی تۆیە؟)) باوکم وتی: بەڵێ بە خودای کەعبە. فەرمووی: ((بەڕاست)) باوکم وتی: من شایەتم لەسەر ئەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد لەوەی کە من لە بابم دەچم وە باوکیشم سوێندی لەسەر خواردم، پاشان فەرمووی: ((ئەو لە تاوانی تۆ بەرپرس نییە تۆش لە تاوانی ئەو بەر پرس نیت، پاشان ئەو ئایەتەی خویند: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ.... ﴿١٨﴾﴾ (فاطر) ئینجا باوکم تەماشای کرد بە وێنەی لویەك لە نێوان هەردوو شانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەبوو، [باوکم وتی: من پیاوێکی پزیشکم ئەو لوە دەبینم کە بە پشتتەومیە هەیە] ئایا بۆت چارەسەربکەم. [فەرمووی: ((جا چی لێدەکەیت؟)) وتی بۆت دەبڕم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((تۆ پزیشك نیت تۆ هاوڕێیت بەڵام پزیشکی ڕاستەقینە ئەو خودایەیە کە دروستی کردووە))][١٥٠٩].

پیاوێك ناوی کوردوم بوو هات پرسیاری نەزرێکی زەمانی نەفامی کرد: مەیمونەی کچی کوردوم ﵂ دەڵێت: [من لەگەڵ باوکم بووم لەو حەجەی کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامیدا، بینیم باوکم لە پێغەمبەری خوا ﷺ نزیکبووە وە] وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من پێشتر نەزرم کردووە [سێ لە وشترەکانم] لە ناوچەی (بوانە)ی (خوار شاری مەککە) سەرببڕم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: [((ئایا بۆ بت و پەرستراوێکی جگە لە خوای ئەنجام دەدەیت؟)) وتی: نا تەنها بۆ خوای ئەنجام دەدەم][١٥١٠] فەرمووی: ((ئایا پێشتر بت و پەیکەری تێدا پەرستراوە [ئایا لەوێدا ئاهەنگێك لە ئاهەنگەکانی بێ باوەڕانی تێدا بەڕێوە چووە؟))] وتی: نەخێر. فەرمووی: ((نەزرەکەت بە جێ بهێنە تەنها ئەو نەزرە جێبەجێ ناکرێت کە سەرپێچی خودا بێت یاخود لە توانای مرۆڤدا نەبێت))[١٥١١]. جابر ﵁ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەککە بەلای پیاوێکدا ڕۆیشت لەسەر بەردێك نوێژی دەکرد، ئینجا

(١٥٠٨) أخرجه: أحمد (٧١١٦) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(١٥٠٩) أخرجه: أحمد (٧١١٠) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(١٥١٠) أخرجه: أحمد (٤٥٦٥١) وقال محققوه: اسناده صحيح، وانظر (الاصابة) (٤٢٣١).

(١٥١١) أخرجه: أحمد (٢٧٠٦٦) وقال محققوه: اسناده حسن، وابن ماجة (٢١٣٠) (٢١٣١)، وابوداود (٣٣١١٣)، والطبراني (الكبير) (٤٢٦/١٩) و (٦٨/٢) واسناده صحيح كما في (بلوغ الحرام) (ص:٢١٣)، وصحح اسناده ابن تيمة في (الاقتضاء) (ص:١٨٦)، والشيخ الالباني في (المشكاة) (٣٤٣٧)، و (صحيح ابن ماجة) (١٧٣٣).

بەرەو ناوچەیەکی تری شاری مەککە ڕۆیشت زۆری پێ چوو پاشان گەڕایەوە تەماشای کرد پیاوەکە هەر لەجێی خۆی لەسەر بەردەکە نوێژ دەکات، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاو دەستەکانی بەیەکدا دا و فەرمووی: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ عَلَيْكُمْ بِالْقَصْدِ (ثَلَاثًا) فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا))(١٥١٢) واتە: ((ئەی خەڵکینە کارەکانتان لە گوێرەی پێویست جێبەجێ بکەن. سێ جار ئەوەی دووبارە کردەوە. پاشان فەرمووی: چونکە خودا بێزار نابێت (واتە: لە پاداشت دانەوە) تا ئێوە بێزار دەبن (واتە: لە ئەنجامدانی کارە باشەکاندا)).

ئەبو ئوسەید ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا فەرمووی: ((اسْتَمْتِعُوا مِنْ هَذِهِ النِّساءِ))(١٥١٣) واتە: دەتوانن هاوسەرگیری کاتی لەگەڵ ئافرەتان بکەن. [بەڵام پاش کەمێك پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریداو قەدەغەی کرد هەتا ڕۆژی قیامەت](١٥١٤). [پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لەناوچەی (ئەلئەبتەحی) ڕۆژهەڵاتی مەککە دابەزی ڕۆژانی یەك شەممەو دوو شەممەو سێ شەممە و چوار شەممە لەوێ مایەوە.... وە هەر لەوێ پێش نوێژی بۆ هاوەڵانی دەکردو لەو ڕۆژانە دا نەگەڕایەوە لای کەعبە](١٥١٥). ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لەدوای تەوافی یەکەمجاری عومرەکەی جارێکیتر نزیکی کەعبە نەکەوتەوە تا ئەو کاتەی لە عەرەفە گەڕایەوە](١٥١٦). لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ بوو عەلی ﷺ لە یەمەن گەڕایەوە. پێشتر پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی کوڕی ئەبو تالبی وەك پێشەوایەك ناردبوو بۆ ناوچەی یەمەن دواتریش خالیدی کوڕی وەلیدی وەك پێشەوای دووەم نارد بوو.

جابر ﷺ دەفەرموێت: [عەلی لەو [گەشتە گەڕایەوە] لەیەمەن و هەندێك وشتری قوربانی کردنی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا بوو لەگەڵ خۆی، هات و تەماشای کرد، فاتیمەی خێزانی پۆشاکی ئیحرامی وەك خەڵکیتر لابردووە [و قژی داهێناوە] وە

---

(١٥١٢) أخرجه: أحمد (٣٤١٩) وقال محققوه: صحيح، والحاكم (٣١٢/١)، وابن ماجة (٤٢٤١) وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٧٦٠).

(١٥١٣) أخرجه: ابويعلى (٩٢٩/٢) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٥١٤) أخرجه: مسلم (١٤٠٦) وابوداود (٢٠٧٣)، والنسائي (١٢٦/٦)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٨٢٤).

(١٥١٥) انظر: (البداية) لابن كثير (٢١٨/٥)

(١٥١٦) أخرجه: البخاري (١٦٢٥).

پۆشاکی ڕەنگکراوی لەبەرکردووە و چاوی بە کل ڕشتووە. عەلی بەوە قایل نەبوو پرسیاری لێکرد: کێ پێی وتی [ئاوها بکەیت؟] وتی: باوکم پێی وتم ئاوها بکەم. [عەلی دەڵێت: منیش چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ تا تورەی بکەم لە فاتیمە بە هۆی ئەو کارەیەوە، وە گفتوگۆی هەردووکمانم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە و فەرمووی: ((ڕاست دەکات ڕاست دەکات [ڕاست دەکات] [من فەرمانم پێکرد ئاوها بکات] پاشان پرسیاری لە عەلی کردو فەرمووی: ((کاتێك نیازی حەج کردنت هەبوو چیت وت؟))] فەرمووی: وتم بەو نیەتە دەچم کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی چووە[١٥١٧]. فەرمووی: ((فَإِنَّ مَعِي الْهَدْيَ فَلَا تَحِلَّ [فاهْدِ، وامْكُثْ حرامًا كَما أَنْتَ وَلَوْلَا أَنَّ مَعِي الهَدْيَ لأَحْلَلْتُ])) [١٥١٨] واتە: من وشتری قوربانیم لەگەڵ خۆم هێناوە تۆش وشترەکانت بهێنەو بە ئیحرامەوە بمێنەرەوە، من گەر ئەو وشترانەم لەگەڵ خۆم نەهێنابووایە ئێستا منیش ئیحرامم لادەبرد.

ئیتر بەو جۆرە تێکڕای ئەو وشترانەی پێغەمبەری خوا ﷺ [لە مەدینەوە] لەگەڵ خۆی هێنابووی لەگەڵ ئەوانەی عەلی ژمارەیان گەیشتە سەد وشتر][١٥١٩].

لەو کاتەدا ئەبوموسای ئەشعەریش لەیەمەنەوە گەڕایەوە و چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو موسای ئەشعەری رضي الله عنه دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ منی نارد بۆ یەمەن و دواتر (واتە: لەکاتی حەجی ماڵئاواییدا) گەڕامەوە مەککەو چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو لە (ئەلبەتحای) شاری مەککە دابەزی بوو پرسیاری لێکردم وفەرمووی: ((بەچی نیەتت هێنا؟)) وتم: بەو جۆرەی پێغەمبەری خوا ﷺ نیەتی هەبووە. فەرمووی: ((وشتری قوربانیت لەگەڵ خۆت هێناوە؟)) وتم: نەخێر، ئینجا فەرمانی پێکردم لەدوای تەوافی سەفاو مەروە ئیحرامەکەم دابنێم... وە منیش ئیحرامەکەم لابرد...))][١٥٢٠]. لەو ماوەیەدا یەکێك لە موهاجیرەکان وەفاتی کرد: سەبیعەی کچی ئەلحاریس رضي الله عنها دەگێڕێتەوە: [مێردەکەی کە ناوی سەعدی کوڕی

---

(١٥١٧) أخرجه: مسلم (١٢١٨،١٤٨).

(١٥١٨) أخرجه: البخاري (١٥٥٨،٢٥٠٦)، ومسلم (١٢٥٠).

(١٥١٩) انظر (حجة النبي ﷺ) للشيخ الالباني (ص:٦٦،٦٧).

(١٥٢٠) أخرجه: البخاري (١٥٥٩) ومسلم (١٢٢١).

خەولە بوو لە ماوەی حەجیماڵئاوایدا وەفاتی کردووە لە مەککە][1521].

وە هەروەها لەو ماوەیەشدا سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس رضي الله عنه نەخۆشکەوت و پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەردانی، ئەو بەسەرهاتەش لەچەندین ڕێگاوە هاتووە لەدوای ڕێکخستنی بەم جۆرە دەبێت:

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس رضي الله عنه دەفەرموێت: [من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لە حەجی ماڵئاواییدا][1522] تووشی نەخۆشییەك بووم بەهۆیەوە نزیك بوومەوە لە مردن [ئەو هەواڵەم نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش سەردانی کردم [کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لام][1523] [من تەماشای پێغەمبەری خوام ﷺ دەکرد و گریام][1524] [فەرمووی: ((بۆچی دەگریت؟))] وتم: [ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ] ترساوم لەوەی بمرم لەو خاکەی کۆچم لێکردووە لەبەر خودا وەك چۆن سەعدی کوڕی خەولە تێیدا مرد [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نا ئەوە ڕوونادات (إِنْ شَاءَ اللّٰه)))][1525]. [وتم: ئەی پێغەمبەری خوا دوعام بۆ بکە تا خودا شیفام بدات][1526] فەرمووی: ((خودایە شیفای سەعد بدە، خودایە شیفای سەعد بدە، خودایە شیفای سەعد بدە)) [وتم: ئەی پێغەمبەری خوا: دەبینیت من تووشی چ ئیش و ئازارێك بووم][1527] [خاوەنی سامانێکی زۆرم][1528] [و یەك کچی میرات گرم هەیە][1529] [ئایا دەبێت وەسیەت بکەم] [و هەموو ماڵەکەم ببەخشم؟] فەرمووی: ((نەخێر)) وتم: ئایا وەسیەت بکەم دوو لەسەر سێی ماڵەکەم ببەخشم [لەڕێی خوادا؟] فەرمووی: ((نەخێر)) وتم: ئایا وەسیەت بکەم نیوەی ببەخشم؟ فەرمووی: ((نەخێر)) وتم: ئایا وەسەیەت بکەم یەك لەسەر سێی ماڵەکەم ببەخشم؟] فەرمووی: [((سێیەك بەڵێ

---

(١٥٢١) أخرجه: البخاري (٣٧٧٠)، ومسلم (١٤٨٤).

(١٥٢٢) أخرجه: مسلم (١٦٢٨) وأحمد (١٥٢٤).

(١٥٢٣) أخرجه: مسلم (٤١٩١) والبخاري (الادب) (٥٤٠) وانظر: (صحيح الادب المفرد) (٤٠٥).

(١٥٢٤) أخرجه: النسائي (٣٦٣٠).

(١٥٢٥) أخرجه: النسائي (٤/٥٠) رقم (٣٦٣٠).

(١٥٢٦) أخرجه: أحمد (١٤٤٠) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(١٥٢٧) أخرجه: مسلم (٤١٨٨).

(١٥٢٨) أخرجه: النسائي (٣٦٢٦).

(١٥٢٩) أخرجه: مسلم (٤١٩١) وابويعلى (٧١٨١) وقال محققه: اسناده صحيح.

بەڵام سێیەکیش هەر زۆرە تۆ گەر لە دوای خۆت میرات گرەکانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بهێڵیت چاکترە بۆت لەوەی بەهەژاری بەجێیان بهێڵیت وە دەست لەخەڵکی پان بکەنەوە] [تۆ گەر هەرشتێك لە پێناوی خودا ببەخشیت پاداشتت دەدرێتەوە هەتا ئەو پاروەی کەبەدەستی خۆت دەیکەیتە دەمی هاوسەرەکەتەوە][١٥٣٠] [وە پارەکەت بۆ بەخشینی ڕۆژانە سەرف بکەیت بۆت دەبێتە بەخشین و چاکە] [وە هاوسەرەکەت لە خواردنەکەت بخوات بۆت دەبێتە بەخشین و چاکە بۆت][١٥٣١] [وە هەموو پارە خەرج کردنێك بۆت دەبێتە بەخشین و چاکە بۆت] وتم: [ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەترسم لە پاداشتی کۆچکردنەکەم][١٥٣٢] لە هاوەڵانم دوا بکەوم؟ فەرمووی: ((إِنَّكَ لَنْ تَتَخَلَّفَ فَتَعْمَلَ عَمَلًا تَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ اللَّهِ، إلا ازْدَدْتَ بِهِ دَرَجَةً وَرِفْعَةً، وَلَعَلَّكَ تُخَلَّفُ حَتَّى يَنْفَعَ اللَّهُ بِكَ أَقْوَامًا، وَيَضُرَّ بِكَ آخَرِينَ، اللَّهُمَّ أَمْضِ لِأَصْحَابِي هِجْرَتَهُمْ، وَلا تَرُدَّهُمْ عَلَى أَعْقَابِهِمْ، لَكِنِ الْبَائِسُ سَعْدُ ابْنُ خَوْلَةَ [يَرْحَمُ اللَّهُ ابن عَفْراء]))[١٥٣٣].

واتە: ئەوە ڕاستە هەر کارتێك تەنها لەبەر خوا ئەنجام بدەیت زیاتر پلەو پایەت پێی بەرز دەبێتەوە، وە بەڵکو تۆ تەمەنێکی زۆر بەریتە سەر کەسانێك بە هۆی تۆوە سودمەند و کەسانێکیش زەرەر مەندبن، خودا پاداشتی کۆچکردنی هاوەڵانم بۆیان بەردەوام بکە و پاشەوپاش مەیان گێڕەوە دواوە، بەڵام داماو سەعدی کوڕی خەولەیە، خودایە ڕەحم و بەزەیت هەبێت بۆ کوڕەکەی عەفراء)) ئەوەش وەك لاوانەوەیەك بۆ ئەو هاوەڵە چونکە لە مەککە وەفاتی کردبوو [پاشان دەستی بەسەر ڕومەت و ڕوخسارمدا هێنا پاشان دەستی بەسەر [سنگم] و سکمدا هێنا و فەرمووی: ((خودایە سەعد شیفابدە و چاکی بکەرەوە و پاداشتی کۆچ کردنەکەی بەتەواوەتی پێ ببەخشە)) [سەعد دەڵێت: تا ئەم کاتەش من هەر هەست بەساردی دەستی دەکەم لەسەر جەرگم][١٥٣٤]. وە لەو کاتەدا کەسانێکی وەفدی بەنی عامر هاتنە خزمەتی: ئەبو جوحەیفە ﷺ دەفەرمویێت: [چوینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ [لەکاتی پێش

(١٥٣٠) أخرجه: مسلم (١٦٤٨) و (٦٢٨)، وأحمد (١٥٢٤).

(١٥٣١) أخرجه: مسلم (١٤٤٠) ورقم (٤١٩).

(١٥٣٢) أخرجه: الترمذي (١١٦)، وابن ماجة (٢٧٠٨).

(١٥٣٣) أخرجه: البخاري (٢٧٤٤)، وأحمد (١٤٨٤) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

(١٥٣٤) أخرجه: البخاري (الادب المفرد) (٤٩٩)، وابوداود (٣١٠٤)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الادب المفرد) (٣٨٤).

نیوەڕۆدا][1535] ئەو لە [ئەبتوح یان ئەلبەتحاء][1536] بوو لە دەوارێکی سوور [لە پێستە دروستکرابوو] ئێمە لەخێڵی بەنو عامر بووین، فەرمووی: (([پێشوازیتان لێبێت ئێوە لە منن وە منیش لە ئێوەم][1537] [ئینجا بیلال ڕۆیشت بانگیدا بۆ نوێژی [نیوەڕۆ] [بینیم لە بانگدانەکەیدا (واتە: لە وتنی: حَيّ عَلى الصَّلاةِ حَيّ عَلى الفَلاحِ دا) ڕووی بەلای ڕاست و چەپیدا دەگێڕا [وە هەردوو پەنجەی شایەتمانی هەردوو دەستی لە ناو گوێیدا بوو][1538] ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ چوو دەستنوێژی گرت و پاشان ئاوی دەست نوێژەکەیان لە تەشتێکدا هێنایە دەرەوە هەموو لێی کۆ بوونەوە [هەبوو بەری کەوت و هەبوو لێی پرژا][1539] [ئەوەی لێی پرژا بەدەستی بڵاوی دەکردەوە بەسەر لاشەیدا و کەسانێك گەر ئەوەشیان بەرنەکەوتایە لە تەڕایی دەستی هاوەڵەکانیان وەریان دەگرت].

[ئیتر بەو جۆرە هەموو پەرۆشی دەست کەوتنی ئاوی دەستنوێژەکەی بوون][1540] [ئەوەی زۆری بەر بکەوتایە یان دەی خواردەوە یان دەست نوێژی پێدەگرت] [تا منداڵم دەبینی گەر بەری نەکەوتایە دەستی درێژ دەکرد لە ژێر باڵی گەورەکان تا تەڕایی بەردەست بکەوێت][1541]... پاشان بیلال هات و ڕمێکی کورتی هێنا لە پێشی قیبلەکەیدا چەقاندی چونکە (مروف) و ئاژەڵ لە پێشیدا دەڕۆیشتن. دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە پۆشاکێکی سووری لەبەردا بوو قاچەکانی سپی و درەوشاوە بوون [پێشکەوت و ئێمەش لە دوایەوە ڕیز بووین] [ئەو ڕمێکی کوڵی لەبەردەم بۆ چەقێنرا بوو][1542] نوێژی نیوەڕۆ و عەسری بۆ کردین بە کورتکراوەیی و کۆکراوەیی دووڕکات بە دوو ڕکات [لەو دیوی ڕمەکەوە ئافرەت و [خەڵکی] [و ئاژەڵ وەك گوێدرێژ] [وسەگ دەڕۆیشتن و ڕێگرییان لێ نەدەکرا][1543] [پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای تەواو بوونی نوێژەکە هەستا و خەڵکی دەستیان دەگرت دەیان هێنا

---

(١٥٣٥) أخرجه: أحمد (١٨٧٦٧) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

(١٥٣٦) أخرجه: أحمد (١٨٧٦٢) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

(١٥٣٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٦٥/٢٢).

(١٥٣٨) أخرجه: أحمد (١٨٧٥٩) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(١٥٣٩) أخرجه: أحمد (١٨٧٦٧) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما والطبراني (الكبير) (٢٩٤/٢٢).

(١٥٤٠) أخرجه: البخاري (١٨٧)، وأحمد (١٨٧٤٤) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

(١٥٤١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٥٠/٢٢).

(١٥٤٢) أخرجه: أحمد (١٨٧٦٢) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما، والطبراني (الكبير) (٣٠٣/٢٢).

(١٥٤٣) أخرجه: أحمد (١٨٧٦٧) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

بە ڕووخسارياندا منيش دەستم گرت و هێنام بە ڕووخسارمدا دەستی ساردتر بوو لە بەفر بۆنخۆش تربوو لە میسك][1544] [وە هەندێ مووی ژێر لێویم بینی سپی ببوو][1545].

## پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو خزمانی هاندا بۆ بەشداری کردن لە حەج کردندا

پێغەمبەری خوا ﷺ جارێکیان چووە سەردانی (زیباعەی کچی ئەلزوبەیر) نەخۆش بوو پێی فەرموو [((ئایا نیازی حەج کردنت هەیە ئەم ساڵ؟))[1546] چی ڕێگریت دەکات حەج بکەیت؟)) وتی: من ئافرەتێکی نەخۆشم دەترسم نەتوانم و لەجێگایەك پەکم بکەوێت. فەرمووی: ((باشە ئیحرام لەبەر بکەو نیەت بهێنە و مەرج بگرە تا ئەو جێگەیەی بچیت کە دەتوانیت و پێی دەگەیت))][1547].

## ڕۆژی دەستپێکردنی حەج

پێش ئەو ڕۆژەش کە پێی دەوترێت (یوم الترویة) (واتە: ئاو لەگەڵ خۆ هەڵگرتن و چوون بۆ مینا) ئا لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ [وتاری بۆ موسوڵمانان داو شێوازی حەج کردنی بۆ باس کردن][1548]. جابر ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین ئیحرامان لەبەرکرد [وە هەر لە ناوچەی ئەبتوحی مەککەوە][1549] ئێمە (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ) بڵێینەوە و بەوتنەوەی ئەو دروشمەوە بەرەو ناوچەی مینا بەڕێبکەوین وە نیازی حەج کردنمان لەدڵدا جێگیر بکەین [ئەوە بوو ئێمە لەو ناوچەیە بەو جۆرە بەڕێکەوتین][1550] [پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای عائیشەی هاوسەری بینی ئەو دەگری پرسیاری لێکرد و فەرمووی: ((ئەوە چی

---

(١٥٤٤) أخرجه: البخاري (١٨٧)، ومسلم (٥٠٣)، وأحمد (١٨٧٦٧)، والطبراني (الكبير) (٢٩٤/٢٢).

(١٥٤٥) أخرجه: أحمد (١٨٧٥٢) وقال محققوه: اسناده صحيح، والطبراني (الكبير) (٣١٤/٢٢).

(١٥٤٦) أخرجه: ابن ماجة (٢٩٣٧)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٣٧٦).

(١٥٤٧) أخرجه: البخاري (٥٠٨٩)، وابن ماجة (٢٩٣٦) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٣٧٥).

(١٥٤٨) أخرجه: البيهقي (الكبرى) (١١١/٥) رقم (٩٢١٩)، وموسى بن عقبة (المغازي) (٣٢٢).

(١٥٤٩) أخرجه: مسلم (١٢١٤).

(١٥٥٠) أخرجه: البخاري (١٦٥٣).

بووە؟)) وتی: من هێشتا لە بێنوێژیدام و نەم توانی وەك خەڵکی عومرە و تەوافی خۆم بکەم و ئێستاش ئەوەتا خەڵکی بەرەو حەج دەچن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((إِنَّ هَذَا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ، فَاغْتَسِلِي، ثُمَّ أَهِلِّي بِالْحَجِّ [ثُمَّ حَجِي وَاصِنَعِي مَا يَصْنَعُ الحاجُ غَيْرَ أَنْ لا تَطُوفِي بِالبَيْتِ وَلا تُصَلي]))[1551] واتە: ئەوە کارێکە خوا بە پێویستی داناوە لەسەر کچانی ئادەم تۆش خۆت بشۆ و نیەتی حەج کردن بهێنە [وەك حاجیەکان بکە تەنها نوێژ و تەوافی کەعبە مەکە]... [ئیتر ئەویش] [بەو جۆرە هەموو مناسیکی حەجی ئەنجامدا بەڵام تەوافی نەکرد].

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ سواری وشترەکەی بوو بەرەو ناوچەی مینا بەڕێکەوت و لەوێ مایەوە و نوێژی نیوەڕو و عەسرو مەغریب و عیشا و بەیانی لێکرد فەرمانی دا دەوارێکی لە ناوچەی (نەمیرەی) بەردەم عەرەفاتی بۆ ئامادە بکرێت.

ئەو شەوە هەموو لە مینا مانەوە [خەڵکی هەندێکیان (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ) یان دووبارە دەکردەوە ڕێگریان لێ نەدەکراو هەندێکی ترمان (الله أكبر) مان دەوتەوە وڕێگریمان لێ نەدەکرا][1552].

ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: [ئێمە لە مزگەوتی (خەیف) لە ناوچەی مینا ئەو شەوە لەوێ بوین کە بەیانیەکەی ڕۆژی عەرەفەیە لەو کاتەدا [سورەتی (والمرسلات عرفا)ی بۆ دابەزی بوو وە منیش بە پاراوی لە دەمی پیرۆزیەوە وەرم دەگرت نازانم ئایا بەکام لەم دوو ئایەتە کۆتای هات ئایا: ﴿ فَبِأَيِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ۝٥٠ ﴾ (المرسلات) یان ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُوا۟ لَا يَرْكَعُونَ ۝٤٨ ﴾ (المرسلات)[1553] ئێمە لەو کاتەدا گوێمان لە دەنگی فیشکەی مار بوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بیکوژن)) [ئێمەش پەلامارمانداو پێش ئەوەی پێی بگەین چووە کونە کەیەوە][1554]. ئێمە پەلە دارخورمایەکمان هێناو ئاگرمان تێ بەردا تا ئەو ناوچەیەمان بۆ ڕووناك بێتەوەوە چەند بەردێکی بەردەم کونەکەیمان لابرد بەڵام هەر نەمان دۆزییەوە [پێغەمبەری

---

(١٥٥١) أخرجه: مسلم (١٢١٨/١٤٧).

(١٥٥٢) أخرجه: البخاري (١٦٥٩).

(١٥٥٣) أخرجه: أحمد (٣٥٧٤،٤٠٦٩) وقال محققوه اسناده صحيح على شرطهما.

(١٥٥٤) أخرجه: البخاري (٣٣١٧)، وأحمد (٤٠٠٤) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

خوایش ﷺ فەرمووی: ((وُقِيَتْ شَرَّكُمْ، كَمَا وُقِيتُمْ شَرَّهَا))[(١٥٥٥)]. واتە: ئەو لە زیانتان پارێزرا وەك چۆن ئێوەشی لە زیانی ئەو پارێزران.

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: ((کۆپان و سەر جلەکەی سەر پشتی وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ چوار درهەمی نەدەهێنا سەرەتا نیەتی هێنا و فەرمووی: ((اللَّهُمَّ حَجَّةٌ لَا رِيَاءَ فِيهَا وَلَا سُمْعَةَ))[(١٥٥٦)] واتە خودایە ئەم حەج کردنەم تەنها بۆ تۆیە بۆ هیچ ڕووپامایی و ناودەرکردنێك نییە.

## ڕۆژی عەرەفە

[لە دوای نوێژی ئەو بەیانییە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوەڕێی کرد تا خۆر هەڵات ئینجا فەرمانیدا هەموو بەرەو ناوچەی (عەرەفات)] بکەونە ڕێ [پێغەمبەری خوا ﷺ بەو جۆرە خۆی و (هاوەڵانی) بەڕێکەوتن، هەموو قورەیشیەکان وایان دەزانی لە ناوچەی موزدەلیفە لادەدات و لەوێ دەمێنێتەوە وەك چۆن قورەیشیەکان حەجیان دەکرد لە زەمانی نەفامیدا، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بەناوچەی موزدەلیفەدا ڕۆیشت نەوەستا تا گەیشتە ناوچەی عەرەفات تەماشای کرد دەوارەکەیان لە ناوچەی (نەمیرە)ی بەردەم عەرەفات بۆ ئامادە کردوە، لەوێدا لایدا و کەمێك پشوویدا][(١٥٥٧)] وە چاوەڕێی کرد تا کاتی نوێژی نیوەڕۆ هات، پاشان سواری وشترەکەی بوو کە ناوی (ئەلقەسواء) بوو بەڕێکەوت تاگەیشتە ناو ئەو شیوەی ئەو ناوچەیە و لەوێدا وتاری بۆ موسوڵمانناندا [سەرەتا سوپاس و ستایشی خودای کردو پاشان فەرمووی]: (( أَيُّهَا النَّاسُ، اسْمَعُوا قَوْلِي، فَإِنِّي لَا أَدْرِي لَعَلِّي لَا أَلْقَاكُمْ بَعْدَ عَامِي هَذَا بِهَذَا الْمَوْقِفِ أَبَدًا، أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ حَرَامٌ عَلَيْكُمْ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا [وَإِنَّكُمْ سَتَلْقَوْنَ رَبَّكُمْ، فَيَسْأَلُكُمْ عَنْ أَعْمَالِكُمْ، وَقَدْ بَلَّغْتُ، فَمَنْ كَانَتْ عِنْدَهُ أَمَانَةٌ فَلْيُؤَدِّهَا إِلَى مَنْ ائْتَمَنَهُ عَلَيْهَ]))[(١٥٥٨)] واتە: [خەڵکینە گوێ بگرن بۆ وتەکانم چونکە من نازانم پێ دەچێت من ساڵێکی

(١٥٥٥) أخرجه: البخاري (١٨٣٠، ٤٩٣٤) ومسلم (٢٢٣٤،٤٠٠٤) وأحمد (٣٦٤٩،٤٠٠٤) وقال محققوه: اسناده صحيح، وابن خزيمة (٢٦٦٨).

(١٥٥٦) أخرجه: ابن ماجة (٢٨٩٠)، وهناد (الزهد) (٨٢)، والبيهقي (الدلائل) (٢١٦٠) قال محققه: اسناده حسن، وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٧٨٠).

(١٥٥٧) انظر: (حجة النبي ﷺ) للشيخ الالباني (ص:٧٠).

(١٥٥٨) أخرجه: ابوداود (١٩١٧،١٩١٨)، وأحمد (٢٠٣٣٦) وقال محققوه: حديث صحيح.

تر لەم شوێنە هەرگیز بە ئێوە نەگەمەوە، ئەی خەڵکینە] خوێن و ماڵتان حەرامە لەسەر یەکتر وەك حەرامی ئەم ڕۆژەتان لەم مانگ و شارەتاندا [ئێوە دەگەنەوە بە پەروەردگارتان و سەبارەت بەکردەوەکانتان پرسیارتان لێ دەکات، ئەوەتا من پێم گەیاندوون، هەرکەسێ سپاردەیەکی لەلایە با بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی] ئاگاداربن هەموو ئەوشتانەی سەردەمی نەفامی ئەوەتا کردوومەتە ژێر هەردوو پێکانمەوە، هەموو خوێنەکانی ئەو سەردەمە لە ژێر پێمدا دادەنێم، یەکەم خوێنیش دەیخەمە ژێرپێم خوێنی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی حاریسی کوڕی عەبدولموتەلیبە کە شیرەخۆرە بوو لە بەنی سەعد دا وە هوزەیل کوشتیان، وە هەموو سووەکانی سەردەمی نەفامی هەمووی لە ژێر پێمدایە[١٥٥٩]. [پاشان خەڵکینە شەیتان بێ هیوا بووە لەوەی بۆ هەتا هەتایە لەم شارەدا بپەرسترێت، بەڵام ڕازیە جگە لە پەرستن گوێڕایەڵی بکرێت لەو گوناهانەی کە ئێوە بەکەمی دەزانن، جا وریابن زیان بە ئاینەکەتان نەگەیەنێت، خەڵکینە دواخستن و گۆڕینی مانگە حەرامەکان ڕۆچوونە لە بێ باوەڕیدا، ئەوانەی پێ گومڕا دەکرا، ساڵێك حەڵاڵیان دەکرد و ساڵێکیش حەرامیان دەکرد بۆ ئەوەی هاوتا بێت لەگەڵ حەرام کراوەکانی خوا و ئەوەی خوا حەرامی کردووە حەڵاڵی بکەن وە ئەویش حەڵاڵی کردووە حەرامی بکەن، وە زەمانیش هەروەك خۆی دەسوڕێتەوە لەو ڕۆژەوە کە ئاسمان و زەویەکان تێیدا دروستکراوە، ژمارەی مانگەکان لای خودا دوانزە مانگە چواریان حەرام کراوە سیانیان بە دوای یەکدان لەگەڵ مانگی ڕەجەبی نێوان جەمادی.... و شەعباندا][١٥٦٠].

لە خوا بترسن سەبارەت بە هاوسەرەکانتان ئەوان خودا بە ئامانەت سپاردوونی بە ئێوە، بە فەرمانی خودا داوێنی ئەوانتان بۆ حەڵاڵکراوە، مافتان لەسەریان ئەوەیە ڕێگە نەدەن هیچ کەسێك بێتە سەر جێگەکانتان، گەر واشیانکرد بۆتان هەیە بە لێدانێکی بێ زیان و هێواش لێیان بدەن، وە ئەوانیش مافیان لەسەرتان ئەوەیە ڕۆزی و جل و بەرگیان بۆ دابین بکەن لە گوێرەی تواناتان، [وەمن] ئەوەم لە نێوانتاندا جێهێشتوە [گەر ئێوە دەستی پێوە بگرن] [هەرگیز] گومڕانابن [ئەوەش کتێبەکەی

(١٥٥٩) انظر: (حجة النبي ﷺ) (ص:٧١)، و أخرجه: أحمد (٢٠٦٩٥) وقال محققوه: صحيح لغيره.

(١٥٦٠) أخرجه: ابوداود (١٧٠٠)، والترمذي (٢١٥٩)، وابن ماجة (٣٠٥٥) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٤٧٩) و (صحيح الترمذي) (١٧٥٣).

خودا و سونەتەکانی منە] [ئەو دوانە لەیەکتر جودا نابنەوە تا دەگەنەوە بە من لە حەوزی کەوسەر][١٥٦١] [خەڵکینە گوێ بۆ وتەکانم بگرن و لێی تێبگەن، هەموو دەزانن کە هەموو موسوڵمانێك برای موسوڵمانە، وە موسوڵمانان برای یەکن جا حەڵاڵ نییە بۆ هیچ کەسێك لە ماڵی براکەی بخوات مەگەر ئەوەی کە لە دڵیەوە دەیبەخشێت بە براکەی، کەواتە ئێوە ستەم لە خۆتان مەکەن، خودایە ئایا من گەیاندم؟][١٥٦٢] ئێوە سەبارەت بە من پرسیارتان لێدەکرێت، جا ئێوە چی دەڵێن؟ هاوەڵانیان وتیان: شایەتیت بۆ ئەدەین کە [تۆ پەیامەکانی پەروەردگارت گەیاند] و ئەرکی سەر شانت بەجێ گەیاند و دڵسۆزی و ئامۆژگاریت بەخشییە [ئومەتەکەت و ئەرکی سەر شانت بەجێ گەیاند. ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ پەنجەی شایەتمانی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە و دواتر دایبەزاندەوە سەرخەڵکەکەو فەرمووی: خودایە شاهیدبە خودایە شاهیدبە][١٥٦٣].

هەروەها لەشوێنی وەستانی عەرەفەدا][١٥٦٤] فەرمووی: خودا مافی هەموو خاوەن مافێکی داوە، وە میرات بەخش هیچ وەسێتێکی بۆ نییە وەنداڵ بۆ خاوەن ژنە، وە داوێن پیسیش بە بەرد ڕەجم دەکرێت و لێپرسینەوەشیان لەسەر خودایە، هەرکەسێکیش جگە لە باوکی ڕاستەقینەی خۆی کەسێکی تر بکاتە باوکی یان جگە لە خاوەنەکەی کەسێکیتر بکاتە خاوەنی، ئەوە نەفرەتی خوای لەسەر دەبێت هەتا ڕۆژی قیامەت، ئافرەتیش بێ مۆڵەتی مێردەکەی بۆی نییە لە ماڵی مێردەکەی هیچ شتێك ببەخشێت)) وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنانەت خواردنیش؟ فەرمووی: ((ذَلِكَ أَفْضَلُ أَمْوَالِنَا ، الْعَارِيَةُ مُؤَدَّاةٌ، وَالْمَنِيحَةُ مَرْدُودَةٌ، وَالدَّيْنُ يُقْضَى، وَالزَّعِيمُ غَارِمٌ))[١٥٦٥] واتە: ((ئەوە چاکترینی سامانمانە، کەلوپەلی خوازراویش دەگێڕدرێتەوە بۆ خاوەنەکەی، ئاژەڵی بەخشراویش (واتە: ئەو ئاژەڵەی دەدرێتە کەسێك کە سوود لە شیرەکەی یان بەچکەکەی وەربگرێت و پاشان دەدرێتەوە دەستی خاوەنی) وە قەرزیش پێویستە

---

(١٥٦١) أخرجه: مسلم (١٢١٨)، والدار قطني (٢٤٥/٤)، والحاكم.

(١٥٦٢) أخرجه: أحمد (٢٠٣٣٦) وقال محققوه: صحيح، وابوداود (١٩١٧)، والطبراني (الكبير) (١٣١٨).

(١٥٦٣) أخرجه: ابوداود (١٩١٧)، وأحمد (٢٠٣٣٦) قال محققوه: صحيح.

(١٥٦٤) أخرجه: ابن هشام (السيرة) رقم (١٥٥).

(١٥٦٥) أخرجه: عبدالرزاق (١٦٣٠٨)، وأحمد (٢٦٧/٥)، والترمذي (٢١٢٢،١٢٦٥،٢١٢٠)، وابن ماجة (٢٧١٢)، وصححه الشيخ الالباني في (الارواء) (٨٨/٦) وفي (صحيح ابن ماجة) (٢١٩٢) و (صح الترمذي) (١٠١٦).

بدرێتەوە خاوەنەکەی، وە کەفیلیش بەرپرسە لەوەی لە ئەستۆی گرتووە [ئەی خەڵکینە لە خوا بترسن و گوێ بگرن و گوێڕایەڵی ئەو کەسەبن کە بۆتە پێشەواتان گەر بەندەیەکی ڕەشی بێ بنەماڵەش بوو، تا ئەو بە کتێبەکەی خودا بتان بات بەڕێوە ئێوە گوێی بۆ بگرن و گوێڕایەڵی ببن](١٥٦٦).

[ئاگاداربن من پێشتان دەکەوم بۆسەر حەوزی کەوسەر وە شانازی بە ژمارە زۆریتانەوە دەکەم لەبەرامبەر ئومەتانی تر، ئێوەش ڕووم ڕەش مەکەن (واتە: لەوێ شەرمەزارم مەکەن)، لەو ڕۆژەدا من هەوڵدەدەم کەسانێك ڕزگار بکەم و کەسانێکیشم لێ دەفرێنرێت دەڵێم: ئەی پەروەردگارم ئەوانە هاوەڵانی منن. ئەویش دەفەرموێت: تۆ نازانیت لە دوای تۆ چییان داهێناوە](١٥٦٧) [ئەی خەڵکینە پێویستە هەموو خانەوادەیەکی [موسوڵمان] هەموو ساڵێك قوربانییەك بکات لەگەڵ عەشرەتەکیدا دەزانن کامەیە، ئەو ئاژەڵەیە کە لەمانگی ڕەجەبدا سەر دەبڕدرێت وە خەڵکی پێی دەڵێن (ڕەجەبیە)](١٥٦٨) [دەرچوون و هێرش بردنێکی ئێوارە یان بەیانی لەڕێی خوادا باشترە لە دونیاو ئەوەی تێیدایە، بڕوادار گیان و خوێن و سامانی حەرام کراوە لەسەر بڕوادار وەك حەرام بوونی ئەم ڕۆژەتان](١٥٦٩) [ئایا پێتان ڕابگەیەنم بڕواداری ڕاستەقینە کێیە؟ ئەو کەسەیە کەخەڵکی متمانەی پێدەکەن، سەروماڵی پێدەسپێرن موسوڵمانی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە موسوڵمانان لە دەست و زمانی پارێزراوبن، تێکۆشەری ڕاستەقینەش ئەو کەسەیە دژ بە خۆی کۆشش دەکات بۆ زیاتر گوێڕایەڵ بوونی خوا، کۆچکاری ڕاستەقینە ئەوەیە کە کۆچی لە تاوان و گوناهەکان کردووە](١٥٧٠).

وادیارە لەو ڕۆژەدا بە بچڕبچڕی پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ موسوڵمانان داوە. لەبەشێکی تری وتارەکەیدا فەرمووی: ((هەر کەسێك دوونەعلی نییە با دوو (خوف)

---

(١٥٦٦) أخرجه: أحمد (٢٧٢٦٢) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، ابن حبان (٤٥٦٤) وقال محققه: حديث صحيح وصححه الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٧١٠).

(١٥٦٧) أخرجه: أحمد (٢٣٤٩٧) وقال محققوه: اسناده صحيح، ابن ماجة (٣٠٥٧) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٤٨١).

(١٥٦٨) أخرجه: أحمد (١٧٨٨٩) وقال محققوه: حسن لغيره، وابن ماجة (٣١٢٥)، وابوداود (٢٧٧١)، والترمذي (١٥٥٥)، والنسائي (١٩٧/٧) وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٢٨٧) و (المشكاة) (١٤٧٨).

(١٥٦٩) أخرجه: أحمد (١٧٢٣٥) وقال محققوه: صحيح لغيره، والطبراني (الكبير) (٦٤٠٤).

(١٥٧٠) أخرجه: أحمد (٢١/٦)، وابن ماجة (٣٩٣٤)، والطبراني (الكبير) (٧٩٦/١٨)، وابن حبان (٤٨٦٢) وقال محققه: اسناده صحيح. وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٣١٧٨).

بکاتە پێی، وە هەرکەسێك پشتەماڵی نییە با (سیروال) (واتە: وەك شەرواڵە) لەبەر بکات))[١٥٧١].

[باشترین دوعاو نزا دوعای ڕۆژی عەرەفەیە وە چاکترین وتەش ئەوەی کە من و سەرجەم پێغەمبەرانی پێش من [لە دوانیوەڕۆ و ئێوارەی عەرەفەدا] وتویانە ئەوەیە کە بڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمَلِكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)][١٥٧٢].

(([هیچ ڕۆژێك نییە تیایدا خودا ژمارەیەکی زۆرتر لە بەندەکانی لە دۆزەخ ڕزگار بکات بە هێندەی ڕۆژی عەرەفە، لەو ڕۆژەدا خودا [دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا] وشانازی بە ئامادەبووانی عەرەفەوە دەکات لای فریشتەکانی دەفەرموێت [بڕوانن بۆبەندەکانم بەقژبژی و تەپوتۆزاویەوە بەرەو لای من هاتوون] [ئەی فریشتەکانم چی بەندەکانی منی گەیاندووەتە ئێرە؟ ئەوانیش دەفەرموون تاڕەزامەندی و بەهەشتی تۆبەدەست بهێنن. خوای گەورەش دەفەرموێت] [ئێوە بەشایەت بن کەمن لەهەموو تاوانەکانیان خۆش بووم گەر هێندەی ژمارەی دڵۆپی باران و ژمارەی لمی بەکۆمەڵیش بێت]))[١٥٧٣].

لەو ڕۆژەی عەرفەدا پێغەمبەر ﷺ زۆر دوعای دەکرد: ئوسامە ﵁ دەفەرموێت: (من لە دوای پێغەمبەرەوە ﷺ سواری پشتی وشترەکەی ببووم لە عەرفات، پێغەمبەر ﷺ هەردوو دەستی بەرزکردبووە وە دوعای دەکرد، وشترەکەی ملی بادا ڕەشمەکەی لەدەست بەربوو... دواتر بەیەك دەستی ڕەشمەکەی گرت بوو بەدەستەکەی تریشی هەر دوعای دەکرد)[١٥٧٤].

ئیبنو عەباسیش ﵄ دەفەرموێت: (بینیم پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفات دوعای دەکرد دەستی لەئاستی سنگی بەرزکردبووەوە وەك هەژارێك داوای خواردن بکات)[١٥٧٥].

لەو شوێنە پیرۆزەدا ئایەتەکانی کۆتایی قورئان دابەزی، عومەری کوڕی خەتاب

---

(١٥٧١) أخرجه: البخاري (١٨٤١)، ومسلم (١١٧٨).

(١٥٧٢) أخرجه: مالك (٩٤٥) وقال محققه: صحيح لغيره، وأحمد (٢١٠/٢)، والترمذي (٣٠٥٥)، والطبراني (الكبير).

(١٥٧٣) أخرجه: مسلم (١٣٤٨) وابن ماجة (٣٠١٤)، وانظر: (صحيح الترغيب) (١١٥٤،١١١٣) و (صح ابن ماجة) (٢٤٤٠).

(١٥٧٤) أخرجه: أحمد (٢٠٩/٥)، والنسائي (٣٠١١).

(١٥٧٥) أخرجه: البيهقي (الكبرى) (٩٢٥٧).

ﷺ دەفەرموێت: [سوێند بە خودا من ئەو ڕۆژ و [وجێگە] [وساتە] دەزانم کە ئەو ئایەتەی تیادا دابەزی ﴿ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا .... ﴾ (المائدة) واتە: (وا لە ئەمڕۆوە پەیام و ئاینەکەتانم بە پایان گەیاند، نیعمەت و بەخشیشی خۆمم بۆ تەواو کردن، ڕێنماییم کردن بۆ ڕێگەی ڕاست، وەئیسلامیشم بە بەرنامەو ئایین بۆ هەڵبژاردن) ئەوە دابەزی بۆ پێغەمبەر ﷺ لە ئێوارەی ڕۆژی عەرەفە کە ڕۆژی جومعە بوو [ئەو لەو کاتەدا لە عەرەفە بوو][1576].

هەر لە عەرەفەدا کەسانێك هاتن و پرسیاری حەجیان لێکرد: عەبولڕەحمانی کوڕی یەعموری دەیلی ﷺ دەفەرموێت: [لە عەرەفە من لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووم، خەڵکێکی ناوچەی نەجد هاتن و پرسیاری حەجیان لێکرد، ئەویش فەرمووی: ((الْحَجُّ عَرَفَةُ فَمَنْ أَدْرَكَ لَيْلَةَ عَرَفَةَ قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ مِنْ لَيْلَةِ جَمْعٍ فَقَدْ تَمَّ حَجُّهُ)) واتە: حەج کردن بریتییە لە ئامادەبوونی عەرەفە، هەرکەسێك شەوی عەرەفەش لەوێ ئامادەبێت پێش ڕۆژ هەڵاتن ئەوە حەجەکەی تەواوە)). لە گێڕانەوەیەکی تردا فەرمووی: ((مَنْ شَهِدَ صَلاتَنا هَذهِ وَوَفَقَ مَعَنا حَتى نَدفعَ وَقَدْ وَقَفَ بَعَرفة قَبلَ ذَلك لَيلاً أَو نَهاراً فَقَدْ تَمَّ حَجُّهُ، وَقَضَى تَفَثَهُ))[1577]. واتە: (هەرکەسێك ئامادەی نوێژی نیوەڕۆ و عەسری عەرەفە بێت و لەعەرەفە لەگەڵمان بێت تا بەجێی دەهێڵین یاخود بەشێکی شەو ڕۆژی عەرەفە لەوێ بێت ئەو کەسە حەج کردنەکەی تەواوە ئەرکەکانی خۆی بەجێ هێناوە).

لەو جێ وەستانەی عەرەفەدا پێغەمبەر ﷺ داوای کرد خەڵکی نزیك لەوەوە بوەستن، یەزیدی کوڕی شەیبان ﷺ دەفەرموێت: [ئێمە لە جێگەیەکی [دوور لە ئیمام] لە ڕوژی عەرەفە وەستابووین لەو کاتەدا ئیبنو مورەبەعی ئەنساری هاتە لامان وتی: پێغەمبەر ﷺ منی ناردۆتە لای ئێوە وە فەرمانتان پێدەکات و دەفەرموێت [وەرنە ئەم جێوەستانەتان] چونکە ئەمە یەکێکە لە پاشماوەکانی ئیبراهمی باوکتان ﷺ][1578].

(١٥٧٦) أخرجه: البخاري (٤٥) ومسلم (٣٠١٧)، والترمذي (٣٠٤٣).

(١٥٧٧) أخرجه: ابوداود (١٩٥٠)، الترمذي (٨٩١)، وابن ماجة (٣٠١٥،٣٠١٦)، والنسائي (٣٠١٦)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٧٠٤)، و (الارواء) (١٠٦٦)، و (صحيح ابن ماجة) (٢٤٤١،٢٤٤٣).

(١٥٧٨) أخرجه: ابوداود (٨١٣،١٩١٩)، والنسائي (٢٥٥/٥)، وابن ماجة (٣٠١١)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة)

خەڵکی لەو ڕۆژەدا بە گومان بوون ئایا پێغەمبەر ﷺ بەڕۆژوو بووە یان نا، مەیمونەی دایکی بڕواداران ﵂ دەفەرموێت: [لە ڕۆژی عەرەفەدا خەڵکی گومانیان هەبوو ئایا پێغەمبەر ﷺ بەڕۆژوو بووە یان نا، منیش جامە شیرێکم بۆ نارد پێغەمبەر ﷺ خواردیەوە و هەموو خەڵکی تەماشایان کرد][١٥٧٩].

ئەنەس ﵁ دەفەرموێت: [ ئێمە لەعەرەفە هەمان بوو دەیوت (اللَّهُ أَكْبَر) وە هەمان بوو دەی وت (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ) وە هیچ کەسێك ڕەخنەی نەبوو لە هیچ کەسێك][١٥٨٠].

لەڕۆژی عەرەفەدا پیاوێك لەوشترەکەی کەوتە خوارەوە و مرد، ئیبنو عەباس ﵁ دەفەرموێت: پیاوێك لە عەرەفە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ وەستابوو، لە وشترەکەی کەوتە خوارەوە و ملی شکاو مرد، ئەوەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد و فەرمووی: ((اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْهِ، ولا تحنّطوه وَلَا وَجْهَهُ، فَإِنَّ اللَّهَ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّيًا))[١٥٨١]. واتە: بەئاو بیشۆن لەگەڵ کەفی گەڵای سیدرداو بەهەر دوو ئیحرامەکەیەوە بینێژن و گوڵاوی بەسەردا مەکەن و سەری دامەپۆشن چونکە خودا ئەو بەوتەی (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْك) وە لە قیامەتدا زیندوی دەکاتەوە.

پێغەمبەر ﷺ جار جار لەوتنەوەی دروشمی حەجدا دەی فەرموو: ((لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْك الْخَيْرَ خَيْرُ الْآخِرَةِ)) یاخود دەیفەرموو: ((إِنَّمَا العَيْشُ عَيْشُ الآخِرة))[١٥٨٢]. واتە: خودایە ئەوە هاتم ئەوا هاتم چاکەی تەواو چاکەی قیامەتە یاخود دەیفەرموو: ((ژیانی ڕاستەقینە تەنها ژیانی قیامەتە)).

ئیبنو عەباس ﵁ دەفەرموێت: [پێغەمبەر ﷺ ئەو ڕۆژە لە عەرەفە بوو هەناریکیان بۆ هێنا خواردی][١٥٨٣].

---

(٢٤٣٨) و (صحيح ابي داود) (١٦٧٥)، و (المشكاة) (٢٥٩٥).

(١٥٧٩) أخرجه: البخاري (١٦٥٨)، وابوداود (٢٤٤١) وانظر: صحيح ابي داود (٢١٣٢).

(١٥٨٠) أخرجه: مسلم (١٢٨٥).

(١٥٨١) أخرجه: البخاري (١٢٦٥)، ومسلم (١٢٠٦).

(١٥٨٢) أخرجه: البيهقي (الكبرى) (٨٨١٦).

(١٥٨٣) أخرجه: الترمذي (٧٥٠)، وابن حبان (٣٦٠٥) وقال محققه: صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٥٩٨)، و (صحيح ابي داود) (٢١٠٩).

ئوسامەی کوڕی شوریك ﷺ دەفەرمویت: چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفات و سەلامم لێکرد، هاوەڵانی ئارام و بێدەنگ لە خزمەتیدا بوون، دەت وت باڵندە بەسەریانەوە وەستاوە، عەرەبە دەشتەکییەکان لەم لاولەولاوە دەهاتن دەیان وت: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئایا دەبێتە کێشە بۆمان گەر ئێمە ئاوها وئاوها بکەین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((عِبَادَ اللهِ، رَفَعَ اللهُ الْحَرَجَ إِلَّا [عَلى رَجُلٍ اقْتَرَضَ عَرْضَ رَجُلٍ مُسْلِمٍ وَهُوَ ظَالِم][١٥٨٤] فَذَلِكَ الَّذِي حَرَجَ وَهَلَكَ)). واتە: بەندەکانی خودا خوای گەورە کێشەی لەسەر موسوڵمانان لابردووە مەگەر یەکێك ستەمی لە پیاوێکی موسوڵمان کردبێت، بەڕاستی ئەوە لەناوچووە و لە کێشەدایە. وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا گوناهبار نابین گەر دەرمان بە کار نەهێنین؟ فەرمووی: ((تَدَاوَوْا عِبَادَ اللَّهِ، فَإِنَّ اللَّهَ، سُبْحَانَهُ، لَمْ يَضَعْ دَاءً، إِلَّا وَضَعَ مَعَهُ شِفَاءً، إِلَّا الْهَرَمَ)) واتە: بەندەکانی خودا دەرمان بەکاربهێنن چونکە خودا هەردەردێکی دانابێت دەرمانیشی بۆ داناوە تەنها پیر بوون نەبێت. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چاکترین شتێك بەخشرابێت بەبەندە چییە؟ فەرمووی: ((ڕەوشتی جوانە))[١٥٨٥].

هەر لەو ڕۆژەدا پێش ڕۆژئاوابوون جارێکی تر پێغەمبەری خوا ﷺ ئاموژگاری موسوڵمانانی کردەوە! ئەنەس ﷺ دەفەرمویت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفات بوو نزیکی ڕۆژ ئاوابوون بوو بە بیلالی فەرموو: ((بیلال خەڵکیم بۆ بێدەنگ بکە)). بیلالیش ﷺ هەستاو گەڕا بەناویاندا وتی: خەڵکینە بێدەنگ بن بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دواجار هەموویان بێدەنگ بوون، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((يا مَعْشَرَ النّاس أَتاني جِبْريلُ آنِفاً، فَأَقْرَنِي مِنْ رَبِّي السَّلام، وَقَالَ: إِنَّ اللّهَ غَفَرَ لِأَهلِ عَرَفاتِ وَأَهلِ المَشْعَرِ، وَضمِن عَنْهُمْ التبِعاتِ)) واتە: ئەی خەڵکینە، کەمێك پێش ئیستا جبرئیل ﷺ هاتەلام و سڵاوی خودامی پێ گەیاندم و فەرمووی: خوای گەورە لە هەموو ئامادە بووانی عەرەفات و مزدەلیفە خۆش بووە و زامنی پرکردنەوەی خەرجییەکانیانە. لەوێدا عومەری کوڕی خەتاب ﷺ هەستا و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە تەنها بۆ ئێمەیە؟ فەرمووی: ((ئەوە بۆ ئێوەیە وە بۆ هەموو ئەوانەشی لە دوای ئێوە دێن

---

(١٥٨٤) أخرجه: ابوداود (٢١٠٥).

(١٥٨٥) أخرجه: أحمد (٢٧٨/٤)، وابوداود (٣٨٥٥)، والترمذي (٢١٠٩)، وابن ماجة (٣٤٣٦)، والحاكم (٣٩٩/٤)، والطبراني (الكبير) (٤٦٣)، والطيالسي (١٧٤٧)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحية) (٤٣٣)، و (غاية المرام) (٢٩٢).

تا ڕۆژی قیامەت)) عومەریش ﷺ فەرمووی: بەڕاستی خێر و چاکەی خودا زۆر و شیرین بووە بەسەرمانەوە][1586].

وەهەر لە نزیکی ڕۆژ ئاوابوونی ئەو ڕۆژەدا فەرمووی: ((أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ دُنْيَاكُمْ فِيمَا مَضَى مِنْهَا إِلَّا كَمَا بَقِيَ مِنْ يَوْمِكُمْ هَذَا فِيمَا مَضَى مِنْهُ))[1587]. واتە: ئەی خەڵکینە ئەوەی لەم دونیایەی ئێوەدا ماوە بەراورد بەوەی لێی ڕۆیشتووە وەك ئەم کاتە کەمەی ئەم ڕۆژەی ماوە بەراورد بەوەی لێی ڕۆیشتووە. [ئەی خەڵکینە خودا تەماشای کردن لەم جێ وەستانەتاندا بەهۆی چاکەکارانتانەوە لە گوناهبارانتان خۆش بووە وە هەموو ئەوانەی چاکەکارانتان داوایان کرد پێی بەخشین][1588]، [وَأَنَّ أَهلُ الشِّرْكِ وَ الأَوْثانِ كَانُوا يَدْفَعونَ مِنْ هَذا المَوضع إِنْ كَانَتْ الشَمسُ عَلى رُؤوسِ الجِبالِ كَأَنَّها عَمائِمُ الرِّجلِ فِي وَجْهِهَا وَأَنا نَدْفَعَ بَعْدَ أَنْ تَغيبَ))][1589]. واتە: موشریك و بتپەرستەکان پێشتر ئێرەیان جێدەهێشت کاتێك ڕۆژ هێشتا لەسەر چیاکان بوو بەوێنەی کڵاو و جامانەی پیاوان لەسەر سەریان بەڵام ئێمە (نزیك) لە ئاوابوونی ڕۆژەوە ئێرە بەجێ دەهێڵین.

لەو جێیەدا: ڕەبیعەی کوڕی ئومەیە ﷺ هاواری دەکرد و وتەکانی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ خەڵکی دووبارە دەکردەوە[1590].

وە عەباسی کوڕی میرداس ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ئێوارەیەی ڕۆژی عەرەفەدا داوای لێخۆشبوون و بەزەیی بۆ هەموو ئومەتەکەی کرد و دوعای زۆری کرد: خوای گەورەش وەڵامی دایەوە: من داواکەتم جێبەجێکردووە لە ئومەتەکەت خۆش بووم تەنها لە ستەمی نێوان خۆیان نەبێت. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خودایە تۆ دەتوانیت لەستەمکارەکە خۆشبیت و ستەملێکراوەکەش پاداشتی چاکەی

---

(١٥٨٦) أخرجه: ابن المبارك كما في (الترغيب والترهيب) (١٢٨/٢)، و (اللالكائي) (٦٩/٢)، وقال الشيخ الالباني في (صحيح الترغيب) (١١٥١): صحيح لغيره، وقال الارناؤوط في تحقيقه لـ(زاد المعاد) (٦٤/١): اسناده صحيح.

(١٥٨٧) أخرجه: أحمد (٦١٧٣) وقال محققوه: صحيح لغيره.

(١٥٨٨) أخرجه: ابن ماجة (٣٠٢٤)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٤٥٠) و (صحيح الجامع) (١٧٣٤)، و (الصحيحة) (١٦٢٤).

(١٥٨٩) أخرجه: الطبراني (٢٢٨/٢٠)، والحاكم (٥٢٤/٣) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وقال الهيثمي (المجمع) (١٥٥/٣): رجاله رجال الصحيح.

(١٥٩٠) أخرجه: الترمذي (٥٩٨).

بدەیتەوە لەجیاتی ئەو ستەمەی لێی کراوە....))[١٥٩١].

عەبدولڕەحمانی دەیلی ﷺ دەفەرموێت: [من لەخزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم لە عەرەفە و کەسانێکی خەڵکی نەجد لە ئامادەبووانی عەرەفە هاتنە خزمەتی یەکێکیان پرسیاری حەج کردنی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکات پێغەمبەری خواش ﷺ وەڵامی دایەوە فەرمووی: ((الْحَجُّ عَرَفَةُ، مَنْ جَاءَ لَيْلَةَ جَمْعٍ قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ فَقَدْ أَدْرَكَ، حَجَّهُ أَيَّامِ مِنًى ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ، مَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ، وَمَنْ تَأَخَّرَ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ)) واتە: حەجکردن بریتییە لە عەرەفە هەرکەسێك لەو شەوەی چوون بۆ موزدەلیفەدا بێت (واتە: بۆ عەرەفە) پێش ڕۆژهەڵاتن ئەو کەسە فریای حەج کردن کەوتووە، ڕۆژەکانی مینا سێ ڕۆژن هەرکەسێ پەلە بکات تەنها دوو ڕۆژ لەوێ بمێنێتەوە گوناهی لەسەر نییە و ئەوەش دوادەکەوێت و سێ ڕۆژ لەوێ دەمێنێتەوە ئەویش گوناهی لەسەر نییە)) پاشان پیاوێکی لەوێدا نارد و هاواری دەکرد وە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ دووبارە دەکردنەوە][١٥٩٢].

## گەیشتن بۆ ناوچەی موزدەلیفە

کەمێك پێش ڕۆژ ئاوابوون، پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی عەرەفاتیان جێهێشت پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: [((بجوڵێن و (بڕۆن) بە ناوی خوداوە))][١٥٩٣]. پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕێکەوت لە [عەرەفەوە] بە ئارامی و [ئوسامە لە دوایەوە لەسەر پشتی وشترەکەی لەگەڵی سواربوو بوو][١٥٩٤]. پێغەمبەری خوا ﷺ لغاوی وشترەکەی (ئەلقەسواء)ی توند گرتبوو، تا نزیك بوو سەری وشترەکەی لە کۆپانەکەی بدات [و گوێی لە دەنگ و هەرایەکی زۆر و دەنگی لێدانی وشتر بوو [وە خەڵکیش بەلای ڕاست و چەپیدا دەڕۆیشتن بەپەلە...][١٥٩٥]. پێغەمبەری خواش ﷺ بەقامچییەکەی کە [بەدەستی ڕاستیەوە بوو] ئیشارەتی بۆ کردن و فەرمووی:

---

(١٥٩١) أخرجه: أحمد (١٦٢٠٧) وقال محققوه: له شواهد يتقوى به ويدل على أنّ له اصلًا.

(١٥٩٢) أخرجه: النسائي (٣٠١٦)، وابن ماجة (٣٠١٥) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابـي داود) (١٧٠٣) و (الارواء) (١٠٦٤) و (المشكاة) (٢٧١٤).

(١٥٩٣) أخرجه: ابن ماجة (٣٠٢٤) وصححه الشيخ الالباني في (صحح ابن ماجة) (٢٤٥٠).

(١٥٩٤) أخرجه: البخاري (١٦٨٥)، ومسلم (١٢٨١).

(١٥٩٥) أخرجه: أحمد (٥٦٢) وقال محققوه: اسناده حسن.

((أَيُّهَا النَّاسُ عَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ فَإِنَّ الْبِرَّ لَيْسَ بِالأَيضاعِ))[١٥٩٦]. واتە: ئەی خەڵکینە لەسەرخۆ و ئارامبن چاکە لە پەلەکردندا نی یە. [پاشان فەرمانیدا جاڕ بدرێت بۆ خەڵکەکە و پێیان بوترێت: ئەی خەڵکینە چاکە کردن لە خێراکردنی ئەسپ و وشترەکاندا نییە][١٥٩٧].

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ڕێ ڕۆیشتنەیدا بەهەر شاخ و بەرزاییەك بگەیشتایە لغاوی وشترەکەی بۆ شلدەکرد تا بەسەریدا سەر بکەوێت [وشترەگەی بە لۆقە دەڕۆیشت گەر بۆشاییەکی ببینیایە بە خێرایی دەڕۆیشت][١٥٩٨] تا گەیشتە [شیوەکەی لای چەپی خوارووی ناوچەی موزدەلیفە][١٥٩٩] ئینجا لەوێدا لایدا... [پاشان هات] [وئاوی دەستنوێژی] بۆ هێنرا [دەستنوێژێکی ئاسایی گرت] و پێی وترا: نوێژ ئەکەیت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((نوێژەکەمان لە پێشتر ئەنجام دەدەین)) پاشان سواری وشترەکەی بوو، تا گەیشتە موزدەلیفەو لەوێدا دابەزی و لایداو دەستنوێژی گرت، پاشان قامەت کراو نوێژی مەغریبی کرد [پاشان خەڵکی ئاگادارکردەوە هەموو لەوێدا لابدەن، تا خەڵکەکە لایاندا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای کرد][١٦٠٠] [وە نوێژی مەغریب و عیشای بە یەك بانگ و دوو قامەت بۆ کردن] [سەرەتا سێ ڕکات نوێژی مەغریبی بۆ کردن پاشان عیشاش بە دوو ڕکات][١٦٠١] وە [بەدوای یەکدا ئەنجامی دان][١٦٠٢] وە هیچ نوێژی سونەتی لە نێوانیاندا نەکرد [ئیتر بەو جۆرە هەموو خەڵکی لەوێ لایانداو ئەو شەوە مانەوە][١٦٠٣].

پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێدا ڕێگەیدا بۆ هاوسەرە بێ تواناکانی هەر بەشەو موزدەلیفە بەجێبهێڵن و بچنە ناوچەی مینا و پێش هاتنی خەڵك شەیتان ڕەجم بکەن، دایکی باوەڕداران عائیشە رضي الله عنها دەفەرموێت: [لەناوچەی موزدەلیفە لاماندا،

---

(١٥٩٦) أخرجه: البخاري (١٦٧١).

(١٥٩٧) أخرجه: أحمد (٢٢٦٤) وقال محققوه: اسناده حسن.

(١٥٩٨) أخرجه: البخاري (١٦٦٦)، ومسلم (١٢٨٦)

(١٥٩٩) أخرجه: البخاري (١٦٦٩)، ومسلم (١٢٨٠).

(١٦٠٠) أخرجه: النسائي (٣٠٣١) و (صحيح ابوداود) (١٦٧٧).

(١٦٠١) أخرجه: مسلم (٢٨٧/١٢٨٨).

(١٦٠٢) أخرجه: البخاري (١٦٧٣).

(١٦٠٣) أخرجه: النسائي (٣٠٣١).

سەودەی هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کرد پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی بدات پێش خەڵکی ناوچەی موزدەلیفە بەجێ بهێڵێت چونکە ئافرەتێکی خاو و بێتوانا بوو، پێغەمبەری خوایش ﷺ ڕێگەیدا هەر بەو شەوە موزدەلیفە بەجێ بهێڵێت پێش بەڕێکەوتنی قەرەباڵغی [و هەر زوو گەیشتنە ناوچەی میناو لەوی نوێژی بەیانیان کرد، وە ڕەجمی شەیتانیشی کرد پێش ئەوەی خەڵکی بگەنە ئەو ناوچەیە][1604] [ئێمەش لە موزدەلیفە ماینەوە تا ڕۆژ بووەوە][1605] [خۆزگە منیش وەکو سەودە داوام لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد و نوێژی بەیانیم لە مینا دەکرد لە پێش هاتنی خەڵکیدا][1606].

ئیبنو عەباسیش ﷺ دەفەرموێت: [منیش یەکێك بووم لەو خزمە بێتواناییانەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ڕێگەی پێدایین پێش خەڵکی بچینە مینا][1607] [و ئێمەش پێش خەڵکەکە چووینە مینا و شەیتانمان ڕەجم کرد][1608] [پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی بەو خزمە بێتواناییانەی دا کە بە تاریکی [پارشێو] موزدەلیفە بەجێ بهێڵن وە فەرمانی پێکردن ڕەجمی شەیتان نەکەن تا ڕۆژ هەڵدێت][1609]. فەزڵی کوڕی عەباس ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەیدا بەهەندێ لە خزمانی کەبێ توانابوون بەشەو ناوچەی موزدەلیفە بەجێ بهێڵن][1610]. ئیبنو عەباسیش ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەیدایین ئێمە و چەند منداڵێکی هۆزی بەنی عبدلموتەلیب بووین سواری گوێدرێژەکانمان بووین، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دەکێشا بەڕانمانداو دەیفەرموو: [کوڕەکانم [بەڕێکەون][1611] بەڵام شەیتان ڕەجم نەکەن تا ڕۆژ هەڵدێت][1612]. [دەیفەرموو: ((برازاکانم ئەی کوڕانی بەنی هاشم پەلە بکەن و موزدەلیفە بەجێ بهێڵن پێش قەرەباڵغی خەڵکی هیچ یەکێك لە ئێوە شەیتانی [گەورە]ی عەقەبە

(١٦٠٤) أخرجه: النسائي (٣٠٤٩).
(١٦٠٥) أخرجه: النسائي (٣٠٤٩).
(١٦٠٦) أخرجه: البخاري (١٦٧٨)، ومسلم (١٢٩٣).
(١٦٠٧) أخرجه: النسائي (٣٠٤٨).
(١٦٠٨) أخرجه: ابوداود (١٩٤١)، والنسائي (٣٠٦٥).
(١٦٠٩) أخرجه: البخاري (١٦٨١،١٦٨٠)، ومسلم (١٢٩٠).
(١٦١٠) أخرجه: النسائي (٣٠٣٤)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٢٨٤٠).
(١٦١١) أخرجه: أحمد (٢٥٠٧) وقال محققوه: صحيح.
(١٦١٢) أخرجه: النسائي (٣٠٣٤)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٢٨٤٠).

ڕەحم نەکات تا ڕۆژهەڵدێت][١٦١٣].

جابر ﷺ دەفەرمویت: [....(بەڵام) پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاکشا لە موزدەلیفە خەوت تا ڕۆژ بووەوە نوێژی بەیانی کرد کاتێك دنیا ڕووناکبووەوە بەیەك بانگ و یەك قامەت، عومەری کوڕی موزەڕ هاتە لای وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من هاتوومەتە لات لەهەردوو چیاکەی ناوچەی هۆزی (تەی) خۆم و وشترەکەم ماندووکردووە، سوێند بە خودا هەر شاخێکم هاتبێتە ڕێ کەمێك لەسەری وەستاوم، ئایا من حەجم بۆ دەنوسرێت؟ فەرمووی: ((مَنْ شَهِدَ مَعَنَا هَذِهِ الصَّلَاةَ - يَعْنِي صَلَاةَ الْفَجْرِ - بِجَمْعٍ، وَوَقَفَ مَعَنَا حَتَّى نُفِيضَ مِنْهُ، وَقَدْ أَفَاضَ قَبْلَ ذَلِكَ مِنْ عَرَفَاتٍ لَيْلًا، أَوْ نَهَارًا، فَقَدْ تَمَّ حَجُّهُ وَقَضَى تَفَثَهُ))[١٦١٤] واتە: هەرکەسێك لەم نوێژی بەیانی موزدەلیفە لەگەڵمان بێت بمێنێتەوە تا ئێمە ئێرە بەجێ دەهێڵین بەمەرجێك پێشتریش بەشەو یان بە ڕۆژ لە عەرەفات وەستابێت ئەو کەسە حەجەکەی تەواوە و ئەرکی خۆی بەجێ گەیاندووە.

[پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سواری وشترەکەی (ئەلقەسواء) بوو تا هاتە لای بەرزایی (مەشعەرولحەرام) وە لەوێدا ڕوویکردە قیبلە و [سوپاسی خوای کرد] و (اللّهُ أَكْبَرُ وَلاَ إِلهَ إِلاَ وَحْدهُ) و دوعای کرد، و بەوجۆرە مایەوە تا دونیا ڕووناك بووەوە (پێش خۆرهەڵاتن) پاشان فەرمووی: ((من لێرەدا وەستاوم و هەموو ناوچەی موزدەلیفە جێی وەستانە] [و لەبەرەبەیاندا دوعایەکی زۆری بۆ ئومەتەکەی کرد و بەردەوام بوو وە ئەوەندەی پێ نەچوو پێغەمبەری خوا ﷺ بزەیەك گرتی، هەندێك لە هاوەڵانی پێیان فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدایك و باوکەوە فیدات بین لەساتەوەختێکدا پێکەنیت کە پێشتر تێیدا پێ نەدەکەنیت ئایا چی تۆی خستە پێکەنین هەردەم (خودا دڵخۆشت بکات و پێ بکەنیت؟) فەرمووی: ((تَبَسَّمْتُ مِنْ عَدُوِّ اللَّهِ إِبْلِيسَ، حِينَ عَلِمَ أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدِ اسْتَجَابَ لِي فِي أُمَّتِي، ... هَوَى يَدْعُو بِالثُّبُورِ وَالْوَيْلِ، وَيَحْثُو التُّرَابَ عَلَى رَأْسِهِ، فَتَبَسَّمْتُ مِمَّا يَصْنَعُ جَزَعُهُ امتي))][١٦١٥] واتە: من بەزەردەخەنەوە پێکەنیم

---

(١٦١٣) أخرجه: أحمد (٢٥٠٧) وقال محققوه: صحيح.

(١٦١٤) أخرجه: أحمد (١٦٢٠٨،١٦٢٠٩) وقال محققوه: اسناده صحيح، وابن خزيمة (٢٨٢٠)، والنسائي (١٢٦٣/٥)، وابن حبان (٣٨٥١) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٣٠٤١) و (الارواء) (١٠٦٦).

(١٦١٥) أخرجه: أحمد (١٦٢٠٧) وقال محققوه: له شواهد يتقوى بهما، وابويعلى (١٥٧٨)، وابن ماجة (٣٠١٣)، والبيهقي (الكبرى) (١١٨/٥) وضعفه الشيخ الالباني في (ضعيف الترغيب) (٧٤٢) و (المشكاة) (٢٦٠٣).

بە ئیبلیس دوژمنی خوا ئەو کاتێك زانی کە خوا وەڵامی داواکەی دامەوە کە بۆ ئومەتەکەمم کرد... ئەو هاوار و باوکە ڕۆی دەکرد و خۆڵی بەسەر خۆیدا دەکرد منیش پێکەنینم بەو سەغڵەتیەی هات.

هەر لەوبەرەبەیانیەشدا لە موزدەلیفە داوای لە بیلال کرد تا خەڵکی بێدەنگ بکات وە مژدەکەی عەرەفەی بۆ دووبارە کردنەوە فەرمووی: ((إِنَّ اللَّهَ تَطَوَّلَ عَلَيْكُمْ فِي جَمْعِكُمْ هَذَا، فَوَهَبَ مُسِيئَكُمْ، لِمُحْسِنِكُمْ، وَأَعْطَى مُحْسِنَكُمْ مَا سَأَلَ، ادْفَعُوا بِاسْمِ اللَّهِ))[١٦١٦]. واتە: خودا تەماشا ئێوەی کرد لەم جێوەستانەداو خراپەکارانتانی بەخشی بەچاکەکارانتان وە چاکەکارانیشتان چیان داواکرد پێی بەخشین، بجوڵێن و بڕۆن بەناوی خواوە.

[بەو جۆرە لە موزدەلیفە پێش خۆر هەڵاتن ئەوێی بەجێهێشت (بە ئارامی) وە فەزلی کوڕی عەباسی ﷺ لەدوای خۆیەوە سوارکرد، فەزڵ پیاوێکی سپی و قۆز و قژ جوان بوو، لەو دەرچوونەدا پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕ بوو بەلای ئافرەتێکدا خێرا دەڕۆیشت، فەزڵ سەیری دەکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی لەسەر دەمو چاوی فەزڵ دانا وە فەزلیش ڕووی کردە ئەولاتر پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی لەولاتری دەموچاوی داو ڕووی وەرگێڕا [پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێدا نەرم و لەسەرخۆ دەڕۆیشت تا گەیشتە ناوچەی شیووی (موحەسەر) [کە هەر لە مینایە][١٦١٧] [لە دوایدا وشترەکەی ترساو ئەو ناوچەیەی تێپەڕاند دواتر پێغەمبەر ﷺ وەستاندی][١٦١٨] و [فەرمووی: ئارام بەرەوە] [فەرمووی: ((لِتَأْخُذْ أُمَّتِي نُسُكَهَا، فَإِنِّي لَا أَدْرِي لَعَلِّي، لَا أَلْقَاهُمْ بَعْدَ عَامِي هَذَا))[١٦١٩] واتە: با ئومەتەکەم شێوازی حەج کردن لە منەوە وەربگرن چونکە من نازانم لە دوای ئەمساڵەوە پێ دەچێت من پێیان نەگەمەوە.

پاشان ڕێگەی ناوەڕاستی گرت و پێیدا تێپەڕ بوو [بەرەو ڕەجمی شەیتانی گەورە] [وفەرمووی: ((عَلَيْكُمْ بِحَصَى الْخَذْفِ الَّذِي يُرْمَى بِهِ الْجَمْرَةُ)) واتە: ئەو وردە بەردانە کۆبکەنەوە کە شەیتانی پێ ڕەجم دەکرێت [ئینجا پێغەمبەر ﷺ بەدەم هەر دەیوت

---

(١٦١٦) أخرجه: ابن ماجة (٣٠٢٤) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٤٥٠) و (الصحيحة) (١٦٢٤).

(١٦١٧) أخرجه: أحمد (٢١٨٦١) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(١٦١٨) أخرجه: أحمد (٥٦٢) وقال محققوه: اسناده حسن.

(١٦١٩) أخرجه: مسلم (٧٩/٤)، وابوداود (١٩٧٠)، والنسائي (٥٠/٢)، وأحمد (٣٠١/٣)، ابن ماجة (٣٠٢٣)، وصححه الشيخ الالباني في (الارواء) (١٠٧٤)، و(صحيح ابن ماجة) (٢٤٤٩).

(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)][١٦٢٠] لەو بەرەبەیانەدا[١٦٢١] بەسواری وشترەکەیەوە وەستابوو، بە ئیبنو عەباسی فەرموو: ((ئادەی هەندێ وردە بەردم بۆ کۆبکەرەوە)) ئەویش بۆی کۆکردەوە کاتێك پێغەمبەر ﷺ بەردەکانی کردە ناو دەستی فەرمووی: ((بەڵێ بەوێنەی ئەم بەردانە [ڕەجمی پێ بکەن] وە ئەوەی سێجار دووبارە کردەوە پاشان فەرمووی: [ئەی خەڵکینە] [خۆتان دووربگرن لە زیادەڕەویی لە ئاینەکەتاندا چونکە خەڵکی پێش ئێوە بەهۆی زیادەڕەوییەوە لە ئاینەکەیاندا لەناوچوون))][١٦٢٢]. [ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت تاگەیشتە ڕەجمی یەکەمی [لای درەختەکە] [لە دواییدا کەعبەی خستە لای چەپیەوە و ناوچەی میناشی خستە لای ڕاستییەوە][١٦٢٣] و [لە کاتی چێشتەنگاودا][١٦٢٤] ڕەجمی کرد بە حەوت بەرد لەگەڵ هەڵدانی هەموو بەردێك (الله أكبر) ێکی دەوت [ئەو بە سواری وشترەکەیەوە بوو] [وە کەسی لێ دوورنەدەخرایەوەوە بە کەس نەدەوترا بڕۆ دواوە] [پاشان لەگەڵ دواهەمین بەردداا دروشمی: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ) ی نەوتەوە و کۆتایی پێهێنا][١٦٢٥] و [ئەو] هەر بە خەڵکەکەی دەفەرموو: ((شێواز و چۆنێتی حەج کردن لەمنەوە فێربن من نازانم پێ دەچێت لەدوای ئەم حەجەوە حەجی تر نەکەم... سوراقە لەو کاتەدا بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: (ئایا ئەوە تەنها هەر بۆ ئێمەیە؟) فەرمووی: ((نا بۆ هەتا هەتایە)).

ئوم حوسەین ﵂ دەفەرموێت: [من ئوسامە و بیلال یان فەزلم بینی ڕەشمەی وشترەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ بەدەستەوە بوو، ئەوی تریان بە پۆشاکێك سێبەری بەسەرەوە دەکرد لەبەر گەرما تا ڕەجمی شەیتانی تەواو کرد][١٦٢٦] [خەڵکی لەوێدا قەرەباڵغیان دروستکرد، پێغەمبەری خوایش ﷺ پێی فەرموون: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ، لَا يَقْتُلْ

---

(١٦٢٠) أخرجه: البخاري (١٦٨٥) ومسلم (١٢٨٦).

(١٦٢١) في رواية (غداه جمعٍ): أخرجه: أحمد (١٨٥١) وقال محققوه: سنده صحيح على شرط مسلم.

(١٦٢٢) أخرجه: النسائي (٢٦٨/٥) رقم (٣٠٥٧،٣٠٥٩)، وابن ماجة (٣٠٢٩)، وابن خزيمة (٢٨٦٧)، والحاكم (٤٦٦/١) وصححه ووافقه الذهبي، والطبراني (الكبير) (١٢٧٤٧)، وابن حبان (٣٨٧١) وقال محققه: اسناده على شرط مسلم، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٢٨٣).

(١٦٢٣) أخرجه: البخاري (١٤٧٤) ومسلم (١٢٩٦).

(١٦٢٤) البخاري (١٧٤٦)، ومسلم (١٢٩٩).

(١٦٢٥) أخرجه: البيهقي (الكبرى) (٩٣٨٥).

(١٦٢٦) أخرجه: مسلم (١٢٩٨)، وابوداود (١٨٣٤) وانظر (صحيح ابي داود) (١٦١٨).

بَعْضُكُمْ بَعْضًا، وَإِذَا رَمَيْتُمُ الْجَمْرَةَ فَارْمُوهَا، بِمِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ))[١٦٢٧] واتە: ئەی خەڵکینە یەکتر نەکوژن با بەردەکانتان بەوێنەی بەردە وردەکان بێت.

[پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوێی بەجێهێشت و بەرەو ناوچەی قوربانی کردنەکەی بەڕێکەوت و لەوێدا شەست و سێ [وشتری] بە پێوە سەر بڕی [و کاتێك وشتریان سەردەبڕی قاچی چەپیان دەنوشتانەوەو دەیان بەست پاشان یان بە ڕم یان بە شمشێر لە گەردنیان دەدا و بەلادا دەکەوت][١٦٢٨] پاشان سی و حەوت وشترەکەی تری دایە دەست عەلی تا سەریان ببڕێت و بەشداربێت لە خێرەکەیدا.

[عەلی ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردم سەرپەرشتی دابەش کردنی وشترەکانی بۆ بکەم وە هەموو گۆشت و پێست و کۆپارەکەی ببەخشن بە هەژاران و داوای لێکردم بەشی قەسابەکان نەدەم، فەرمووی: ئێمە خۆمان کرێی قەسابەکان دەدەین][١٦٢٩] بەوجۆرە تێکڕای ژمارەی وشترەکان سەد وشتر بوو، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا هەر وشترێك پارچە گۆشتێکی لێبهێنرێت و هەمووی کرایە مەنجەڵێکی گەورەوە و کوڵێنراو هەموو لە گۆشت و گۆشتاوەکەیان خوارد [و هەر لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەجیاتی هاوسەرانی مانگایەکی کردە قوربانی] [و هەموو وشترو مانگایەك لەبری حەوت کەس دەکرانە قوربانی] [ئێمە تەنها ئەو سێ ڕۆژەی مینا بۆمان هەبوو گۆشتی قوربانییەکانمان بخۆین، بەڵام دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی داین و فەرمووی: ((لێی بخۆن و لێی هەڵبگرن)) [ئێمەش لێمان خوارد و لێمان هەلگرت] پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نَحَرْتُ هَاهُنَا، وَمِنًى كُلُّهَا مَنْحَرٌ، [وَكُلُّ فِجَاجِ مَكَّةَ طَرِيقٌ وَمَنْحَرٌ] [فَانْحَرُوا فِي رِحَالِكُمْ])) واتە: من لێرەدا قوربانییەکانم سەربڕی و هەموو ڕێگەکانی مەککە جێی سەربڕین و قوربانی کردنە و ئێوەش هەریەکێك لەجێ لادانەکەی خۆیدا ئەنجامی بدات.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆدان و فەرمووی: ((ئایا کام ڕۆژ ڕێزو حورمەتی

---

(١٦٢٧) أخرجه: ابوداود (١٩٦٦) وأحمد (١٦٠٨٧) وقال محققوه: اسناده حسن، وابن ماجة (٣٠١٨) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٤٥٤) و (صحيح ابي داود) (١٧١٥).

(١٦٢٨) أخرجه: ابوداود (١٧٦٧)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٥٥٣).

(١٦٢٩) أخرجه: البخاري (١٧٠٧)، ومسلم (١٣١٧).

زیاترە؟)) وتیان: ئەم ڕۆژەمان. فەرمووی: ((ئایا کام مانگ ڕێز و حورمەتی زیاترە؟)) وتیان: ئەم مانگەمان. فەرمووی: ((ئایا کام وڵات ڕێز و حورمەتی زیاترە؟)) وتیان: ئەم وڵاتەمان.

فەرمووی: ((فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ، وَأَمْوَالَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، قَالُوا: نَعَمْ قَالَ: «اللَّهُمَّ اشْهَدْ))][١٦٣٠] واتە: خوێن و ماڵتان لەسەر یەکتری حەرامە وەك حەرامی ئەم ڕۆژو شارو مانگەتان، ئایا پێم ڕاگەیاندن؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: ((خودایە شاهیدبە)) [لەوێدا کچێکی گەنجی هۆزی خسعوم پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد [وە فەزڵی کوڕی عەباسیش تەماشای ئافرەتەکەی دەکرد وە ئەویش تەماشای دەکردەوە][١٦٣١] و کچەکە دەیوت: باوکم پیاوێکی پیرو بەساڵا چووە [لەسەر پشتی وشتر خۆی ناگرێت] وئێستاش حەجی لەسەر پێویست بووە. ئایا دەبێت من لەجیاتی ئەو حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: ((بەڵێ حەجی بۆ بکە)) لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ ملی فەزلی سوڕاند بەولادا. عەباسی باوکی فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی ملی ئامۆزاکەت سوڕاند؟ فەرمووی: ((رَأَيْتُ [غُلاماً] شاباً وَ[جارِية] شابةً فَلَمْ أَمَنْ الشَّيْطانُ عَلَيْهِما))[١٦٣٢]. واتە: کوڕەگەنجێك و کچەگەنجێکم بینی ترسام شەیتان (فریویان بدات) [پاشان گەڕایەوە جێی دابەزین و پشوودانی لە مینا][١٦٣٣].

[ئینجا دانیشت بۆ وەڵامدانەوەی خەڵکی، لەو ڕۆژەدا هەر پرسیارێکی لێبکرایە سەبارەت بەشتێك [کە پێش شتێکی تر کرابێت] هەر دەیفەرموو: کێشە نییەو نابێتە کێشە، تا پیاوێك هات وتی: سەرم تاشی پێش ئەوەی قوربانی بکەم؟ فەرمووی: کێشە نییە))، پاشان یەکێکی تر هات وتی: سەرم تاشی پێش ڕەجم کردن؟ فەرمووی: ((کێشە نییە)) [پاشان یەکێکی تر هات وتی: من قوربانیم کرد پێش ڕەجم کردن؟ فەرمووی: ((کێشە نییە برۆ ڕەجم بکە)) [(پاشان) پێغەمبەری خوا ﷺ سەری تاشی

---

(١٦٣٠) أخرجه: أحمد (٢٣٤٩٧) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(١٦٣١) أخرجه: البخاري (١٥١٣) ومسلم (١٥١٨).

(١٦٣٢) أخرجه: أحمد (٥٦٢) وقال محققوه: سنده حسن، والترمذي (٨٨٥)، وابوداود (١٨٠٩)، (١٩٠٥) وابن ماجة (٢٩٠٩) والنسائي (١١٩/٥)، وصححه الشيخ ابي داود (١٥٩٤) (١٦٧) و (صحيح الترمذي) (٧٠٤).

(١٦٣٣) أخرجه: مسلم (٣٢٣/١٣٠٥).

سەرەتا لای ڕاستی دایە سەرچاکەرەکە و بۆی تاشی (پاشان) ئەبو تەلحەی ئەنصاری بانگ کرد و قژەکەی خۆی پێدا [و فەرمووی: ((دابەشی بکە لە نێوان خەڵکیدا))] ئەویش [یەك تەڵ و دووتەڵ][١٦٣٤] دابەشی کرد بەسەر خەڵکیدا. پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لای چەپی سەری دایە سەرتاشەکەو فەرمووی: ((بیتاشە)) ئەویش بۆی تاشی و دیسان ئەو موانەشی دایەوە بە ئەبو تەلحە و دابەشی کرد [و بەشی ئوم سولەیمی هاوسەری خۆیشدا] [ئەویش کردیە شوشە عەترەکەیەوە][١٦٣٥] [ئەو کەسەشی کە سەری پێغەمبەری خوا ﷺ تاشی ناوی موعەممەری کوڕی عەبدوڵلا بوو][١٦٣٦].

ئەنەس ﷛ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کە سەرتاشەکە سەری بۆ دەتاشی، و هاوەڵانی هاتبوونە چوار دەوری و نەیان دەهێشت یەك تەڵە مووی بکەوێتە سەر زەوی بەڵکو دەکەوتە ناو دەستی یەکێك لە هاوەڵەکانی][١٦٣٧].

[عەبدوڵڵای کوڕی یەزید ﷛ دەفەرموێت هەندێ مووی پێغەمبەری خوایان ﷺ پێدام و منیش دابەشم کرد بەسەر پیاوانێکدا و نینوکەکانیشی قرتاند و دایە هاوەڵانی][١٦٣٨].

[ئیبنو عومەریش ﷛ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هەندێ: لە هاوەڵانی قژیان تاشی، و هەندێکی تر لە هاوەڵانی تەنها قژیان کورت کردەوە][١٦٣٩] [وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خودایە خۆش ببەو [بە بەزەیی ببە] لەگەڵ ئەوانەی قژیان تاشیوە...)) (ئەوەی سێجار وتەوە) وترا: ئەی ئەوانەی قژیان کورت کردۆتەوە؟ فەرمووی: ((بۆ ئەوانەشی قژیان کورت کردۆتەوە))][١٦٤٠]. [وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی سێجار داوات بۆ ئەوانە کرد کە قژیان تاشیوە تەنها یەکجار داوات کرد بۆ ئەوانەی کە قژیان کورت کردەوە؟ فەرمووی: ((چونکە ئەوان

---

(١٦٣٤) أخرجه: مسلم (١٣٠٥/٣٢٤).

(١٦٣٥) أخرجه: ابن سعد (٧٠/٤) بسند صحيح كما قال الحافظ في (الفتح) (٨٤/١١).

(١٦٣٦) أخرجه: أحمد (٢٧٢٤٩) وقال محققوه: اسناده ضعيف، وموسى بن عقبة (المغازي) (٣٢٥).

(١٦٣٧) أخرجه: مسلم (٢٣٢٥) وأحمد (١٢٣٨٦) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٦٣٨) أخرجه: أحمد (٤٢/٤) وابن خزيمة (٢٩٣١) والحاكم (٦٤٨/١) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (٢١٥٤) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٦٣٩) أخرجه: البخاري (١٧٢٩) ومسلم (١٣٠١).

(١٦٤٠) أخرجه: البخاري (١٧٢٨،١٧٢٧)، ومسلم (١٣٠٢،١٣٠١).

دوو دڵ نەبوون))][١٦٤١]. [وە پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: گەر ڕەجمتان کرد هەموو شتێکتان بۆ حەڵاڵ دەبێت جگە لە ئافرەتان))][١٦٤٢].

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ جلی ئیحرامەکەی لابرد و جلی ئاسایی خۆی لەبەر کرد و خۆی بۆنخۆش کرد [دایکی بڕواداران عائیشە ﵂ دەفەرموێت: هەر من پێغەمبەرم بۆنخۆش دەکرد بە گوڵاوێك میسکی تێدا بوو لە پێش ئیحرام لەبەرکردنی و لەدوای ئیحرام دانانی لە ڕۆژی قوربانی کردن پێش ئەوەی تەوافی کەعبە بکات][١٦٤٣].

[جابر ﵁ دەفەرموێت: پێش نوێژی نیوەڕۆ پێغەمبەری خوا ﷺ سواری وشترەکەی بوو گەڕایەوە ناو شاری مەککە و تەوافی گەڕانەوەی [الافاضة]ی کردو [تەوافی یەکەم و دووەم و سێیەمی بە خێرایی نەدەکرد] [وە هەمووی بە ئاسایی بەجێ گەیاند و تەوافی سەفاو مەروەشی کرد][١٦٤٤] [ئیبنو عەباس ﵄ دەفەرموێت: خەڵکی زۆربەیان دەهاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و دەیان وت: ئەوە موحەممەدە ئەوە موحەممەدە، ئافرەتان ومناڵانیش هاتبوونە دەرەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ کەسی لێ دورنەدەخرایەوە کاتێك خەڵکێکی زۆر چواردەوریاندا ئینجا سواری وشترەکەی بوو][١٦٤٥]. [تا خەڵکی هەموو ببینن وە وتەکانی ببیستن][١٦٤٦] [ئیتر بەو جۆرە بە سواری وشترەکەیەوە تەوافی دەکرد وە هەر کات بگەیشتایەتە بەردە ڕەشەکە بەو شتەی لە بەردەستیدا بوو (واتە: کۆچانەکەی) ئیشارەتی بۆ دەکرد و دەیوت (اللّٰهُ أَكْبَر) و ئەو شوێنەی گۆچانەکەی ماچ دەکرد کە بەر (بەردە ڕەشەکە) کەوتبوو][١٦٤٧] [لە کاتی تەوافدا پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێکی بینی پەتێکی کردبووە دەستی کەسێکی تری ڕادەکێشا، پەتەکەی بۆ پچڕاندو [١٦٤٨] پێی فەرموو: [((بەدەستی ڕای بکێشە))]. [پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ (لەدوای تەواف) چووە لای

---

(١٦٤١) أخرجه: البخاري (١٧٢٧،١٧٢٨)، ومسلم (١٣٠٢،١٣٠١)

(١٦٤٢) أخرجه: ابوداود (صحيح ابي داود) (١٩٧٨) و (صحيح ابن ماجة) (٢٤٦٦) والصحيحة (٢٣٩).

(١٦٤٣) أخرجه: مسلم (١١٩١).

(١٦٤٤) أخرجه: مسلم (٣٠٧٤).

(١٦٤٥) أخرجه: مسلم (٢٣٧/١٢٦٤).

(١٦٤٦) أخرجه: ابوداود (١٧٧٠) وصححه الشيخ الباني في (صحيح ابي داود) (١٨٨٥).

(١٦٤٧) انظر (الامالي) (٢٦٨٨) وقال محققه: سنده حسن.

(١٦٤٨) أخرجه: البخاري (١٦٢٠)، والنسائي (٢٢٢/٥)، وابن حبان (٣٨٣١) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

بیری زمزم] [و بینیان ئەوان ئیشیان تێدا دەکرد و ئاویان دەدایە خەڵك][١٦٤٩] [ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرمویت: ئێمە سەتڵێکمان بۆ هەڵێنجا و لێی خواردەوە و هەندێکی دەمی تێ کردەوە و ئێمەش ڕژاندمانەوە ناو بیری زمزم][١٦٥٠]. پاشان [فەرمووی: ((ئاو بدەنە خەڵکی ئەی کوڕانی بەنی عبدولموتەلیب] و [ئەوکارەتان بکەن چونکە ئێوە کارێکی چاك دەکەن گەر] [لەبەر ئەوە نەبێت خەڵکی کارەکەتن لێ زەوت بکەن] ئەو کات منیش دادەبەزیم و گوریسەکەم دەخستە سەر شانم و بەهەردوو دەستم ئاوم هەڵدەهێنجا] پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ چووە لای (سیقایەکەیان) (واتە: کوپەو شەربەی پڕ لە زمزم) و عەباس کاری تێدا دەکرد پێی فەرموو: ((ئەی عەباس هەندێك ئاوم بدەرێ)) ئەویش وتی: ئەی فەزل بڕۆرەوە [بۆلای دایکت لەماڵەوە خواردنەوەیەك بهێنە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڵکو لەو تەشتە ئاوەم بەرێ)) وتی: ئەوە دەستی تێکەوتووە] [ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان دەستی تێدەکەن][١٦٥١] [و پیسی دەکەن ئەی بۆ لەماڵەوە ماستاو یان هەنگوینت بۆ نەهێنین؟][١٦٥٢]، فەرمووی: ((من پێویستم بەوە نییە لەوەم بدەرێ کە خەڵکی لێی دەخۆنەوە))][١٦٥٣] [ئیتر جامێکیان بۆ هێنا لێی خواردەوە و پاشماوەکەی دایە ئوسامەو فەرمووی: [ ((کارێکی جوان وچاکتان ئەنجامدا ئیتر هەروەها بکەن)))][١٦٥٤].

[پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەیدا بە عەباس لە شەوانی مینادا ئەو لەشاری مەککە بمێنێتەوە لەبەر دەرهێنانی ئاوی زمزم و ئاودان بەخەڵکی][١٦٥٥]. [پێغەمبەری خوا ﷺ لەدوای نیوێژی نیوەڕۆ وە گەڕایەوە مینا و شەوانی جەژن لەوێ مایەوە لە ڕۆژیشدا لە دوای نیوەڕۆوە ڕەجمی هەر سێ شەیتانی دەکرد، هەریەکەیان بە حەوت بەرد، لای یەکەم و دووەم زۆر دەوەستاو دەپاڕایەوە بەڵام لای سێیەمیان نەدەوەستا

---

(١٦٤٩) أخرجه: البخاري (١٦٣٥).

(١٦٥٠) أخرجه: أحمد (٣٥٢٧) وقال ابن كثير (البداية) (٣٦٥/٥): اسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٦٥١) أخرجه: البخاري (١٦٣٥).

(١٦٥٢) أخرجه: أحمد (٢٩٤٤) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(١٦٥٣) أخرجه: البخاري (١٦٠٧)، وأحمد (١٨٤١).

(١٦٥٤) أخرجه: مسلم (١٣١٦).

(١٦٥٥) أخرجه: البخاري (١٧٣٤) ومسلم (١٣١٥).

بەڵکو ڕەجمی دەکرد و دەڕۆیشت][1656] [ئیبنو عومەر ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەجمی ئەو سەریانی (واتە: گەورەکەیان) بەحەوت بەرد کرد و لەدوای هەموو بەردێك دەیفەرموو (الله أكبر) ئینجا دەچووە پێش ڕووبە قیبلە زۆر دەوەستاو دوعای دەکرد (و هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە، پاشان ڕەجمی ناوەنجیانی دەکرد و دەچووە لای ڕاست ڕوو بەقیبلە زۆر دەوەستا و هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە و دوعای دەکرد، پاشان دەچوو ڕەجمی بچوکەکەیانی دەکرد و لەلای نەدەوەستا و دەڕۆیشت][1657] [وە هەرکات ڕەجمی بکردایە بەپێ دەچوو بۆ ڕەجمەکە وە بە پێش دەگەڕایەوە][1658] لەو ڕۆژانەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مینا مایەوە، شوێنی دابەزینی خەڵکی دیاری کرد و فەرمووی: [((با موهاجیرەکان لای ڕاستی قیبلە دابەزن و ئەنصارو پشتیوانەکانیش بالەلای چەپی قیبلە دابەزن، پاشان هەموو خەڵکی با لەچواردەوریان دابەزن))][1659] [ئیتر بەو جۆرە بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ موهاجیرەکان لە پشتی مزگەوتەکەوە دادەبەزن ئەنساریەکانیش لە دوای مزگەوتەکەوەو پاشان خەڵکی لە دوای ئەوانەوە][1660] [لەوێدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ژورێکت لە جێگەیەکی تایبەتدا بۆ دروست بکەین؟ فەرمووی: ((هەرکەسێك لە مینا پێشتر لە جێگەیەك دابەزێ ئیتر ئەو جێگەیە تایبەتە بەوەوە))][1661] [هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ مەناسیك و شێوازی حەجکردنی بۆ ڕوونکردنەوە و فێری کردن، خوای گەورە گوێی هەموو ئامادەبووانی مینای بۆ کردەوە وە هەموو لە جێگای خۆیاندا بە ئاسایی گوێیان لە وتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو][1662].

لەو ماوەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مینا بوو هەموو خەڵکی دەچوونە سەردانی،

(١٦٥٦) أخرجه: ابوداود (صحيح ابي داود) (١٩٧٣): حسن.

(١٦٥٧) أخرجه: البخاري (١٧٥١).

(١٦٥٨) انظر: (الصحيحة) (٢٠٧٢)، و (صحيح الجامع) (٢٣٦٨) (ترتيب).

(١٦٥٩) أخرجه: ابوداود (١٩٥١) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٧١٩).

(١٦٦٠) أخرجه: ابوداود (١٩٥٧) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٧٢٤).

(١٦٦١) أخرجه: الحاكم (٦٣٨/١) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي (٩٣٩) وقال ابن كثير في (البداية) (٣٩٨/٤): سنده لابأس به.

(١٦٦٢) أخرجه: أحمد (٢٣٢٢٥) وقال محققوه: صحيح، وانظر (صحيح ابي داود) (١٩٥١).

حاریسی کوڕی عەمرو ﷺ دەفەرموێت: [لە مینا چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ.... و خەڵکی چواردەوریان دابوو، عەرەبە دەشتەکییەکان دەهاتن و تەماشای ڕووخساریان دەکرد و دەیان وت: بەڕاستی ڕووخساری پڕ خێر و بەرەکەتە][١٦٦٣] [عەدی ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەیدا بەشوانی وشترەکان لای وشترەکان بمێننەوە بەشەو، یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان ڕەجم بکەن پاشان ڕەجمی دوو ڕۆژەکەیتر لە یەك ڕۆژدا بکەن][١٦٦٤] [ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی کەعبەی کرد لە هەموو یەکێك لە شەوەکانی مینادا][١٦٦٥] [وە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بە کورت کراوەیی بە هاوەڵانی دەکرد][١٦٦٦].

یەزیدی کوڕی ئەسوەدە ﷺ دەفەرموێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە حەجی ماڵئاواییدا وە لە مینا نوێژی بەیانی بۆ کردین [لە مزگەوتی خیف، کاتێك نوێژەکەی تەواو کرد][١٦٦٧] ڕووی کردە خەڵکەکە، تەماشای کرد [لەکۆتایی مزگەوتەکەدا] دوو پیاو لە دوای خەڵکەکەوە دانیشتوون لەگەڵ خەڵکەکە نوێژیان نەکردووە، فەرمووی: ((ئەو دوو پیاوەم بۆ بهێننە ئێرە)) هەردوو پیاوەکەیان هێنانە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و لەترساندا دەلەرزین، پێی فەرموون: بۆچی لەگەڵ خەڵکەکە نوێژتان نەکرد؟)) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە لای کەلوپەلەکانمان پێشتر نوێژمان کرد بوو، فەرمووی: ((وامەکەن گەر یەکێکتان لای کەلوپەلەکانی نوێژی کرد پاشان فریای نوێژکردن کەوت لەگەڵ ئیمامدا [یان هەر هاتنە ناومزگەوت نوێژدەکرا ئێوە نوێژیان لەگەڵدا بکەن، وە ئەوەی تریان دەبێتە سونتەت بۆتان])) یەکێکیان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد. ئینجا خەڵکی لە دوای نوێژەکە هەستان وە نزیك بوونەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ [و دەستیان دەگرت و دەیان هێنا

---

(١٦٦٣) أخرجه: البخاري (الادب) (١١٤٨)، وابوداود (١٧٤٢) وحسنه الشيخ الالباني (صحيح الادب المفرد) (١٨٧٦، و (صحيح ابـي داود) (١٥٣٢)).

(١٦٦٤) أخرجه: أحمد (٢٣٢٨٥) وقال محققوه: اسناده صحيح، وابو داود (١٩٧٥) والترمذي (٧٦٣)

(١٦٦٥) انظر: (الصحيحة) (٨٠٤) والطبراني (ألكبير) (١٢٩٠٢) وسنده صح كما في (صحيح المتجر الرابح) (٤٠٧/١).

(١٦٦٦) أخرجه: (١٠٨٣،١٠٨٤)، ومسلم (٦٩٥،٦٩٦).

(١٦٦٧) أخرجه: أحمد (١٧٤٧٤) وقال محققوه: اسناده صحيح.

بە دەموچاوییاندا][١٦٦٨] منیش لەوکاتەدا هەستام و گەنجێکی بەتوانابووم توانیم خۆم بگەیەنمە پێغەمبەری خوا ﷺ و دەستم گرت [وهێنام بەدەمو چاومدا دەستی لە بەفر ساردتر بوو وە لە میسکیش بۆنخۆشتر بوو][١٦٦٩].

[ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین [نزیکەی چل پیاو دەبووین، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ پاڵی دابوو بەدەوارەکەیەوە کە لە پێستە دروستکرابوو][١٦٧٠]. فەرمووی: ((أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟)) واتە: ئایا ڕازی دەبن ئێوە یەك لەسەر چواری خەڵکی بەهەشت بن؟ وتمان: بەڵێ. فەرمووی: ((ئایا ڕازی دەبن ئێوە یەك لە سەرسێی خەڵکی بەهەشتبن؟)) وتمان: بەڵێ. فەرمووی: ((ئایا ڕازی دەبن ئێوە نیوەی خەڵکی بەهەشتبن؟)) وتمان: بەڵێ. فەرمووی: ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا شَطر أَهْلِ الْجَنَّةِ وَذَلِكَ أَنَّ الْجَنَّةَ لَا يَدْخُلُهَا إِلَّا نَفْسٌ مَسْلَمَةٌ وَمَا أَنْتُمْ فِي أَهلِ الشِّرْكِ إِلَّا كَالشَّعْرَةِ الْبَيْضَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الْأَسْوَدِ، أَوْ كَالشَّعْرَةِ السَّوْدَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الْأَحْمَرِ))[١٦٧١]. واتە: سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە من ئومێدەوارم ئێوە نیوەی خەڵکی بەهەشتبن، چونکە بەهەشتیش تەنها موسوڵمان نەبێت ناچێتە ناویەوە، ئێوەش بەراورد بە موشریکەکان وەك تاڵە مویەکی سپین بە پێست و کەوڵی گایەکی ڕەشەوە یاخود وەك تاڵە مویەکی ڕەشن بە پێست و کەوڵی گایەکی سورەوە.

(وە هەر ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەوارێکی سووردا بوو لە پێستە دروست کرابوو چل پیاو لە هاوەڵانی لە خزمەتیدا بوو فەرمووی: ((إِنَّهُ مَفْتُوحٌ لَكُمْ وَإِنَّكُمْ مَنْصُورُونَ وَمَصِيبُونَ فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ مِنْكُمْ فَلْيَتِقِ اللّٰهِ وَلْيأَمُرْ بِالمَعرُوفِ وَلِينهِ عَنْ المُنْكَرِ وَلْيَصلْ رَحمةَ وَمَثَلُ الذي يُعِينُ قَوْمَهُ عَلى غَيْرِ حَقٍ كَمَثَلِ البَعِيرِ يَتَرَدي فَهوَ يَمدّ بِذَنْبِهِ))[١٦٧٢] واتە: وڵاتان بەڕووی ئێوەدا دەکرێتەوە و سەر دەکەون و

---

(١٦٦٨) أخرجه: أحمد (١٧٤٧٨) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(١٦٦٩) أخرجه: أحمد (١٧٤٧٦) وقال محققوه: اسناده صحيح، والترمذي (٣١٩)، والنسائي (١١٢/٢)، وابن خزيمة (١٢٧٩)، وابوداود (٩٧٥)، وابن عباس (١٥٦٤) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني يرحمه الله في (صحيح ابي داود) (٥٣٨).

(١٦٧٠) أخرجه: مسلم (٥٢٩،٣٧٧/٢٢١). وقال الحافظ (الفتح) (٤٧٨/١١): والراجح انه كان بمنى.

(١٦٧١) أخرجه: البخاري (٦٥٢٨،٦٦٤٢)، ومسلم (٢٢١/ ٥٢٨،٥٢٩)، والترمذي (٢٥٤٧) وابن ماجة (٤٢٨٣).

(١٦٧٢) أخرجه: الحاكم (١٥٩/٤) وصحه ووافقه الذهبي وقال محقق (المستدرك) رقم (٧٣٥٧): سنده صحيح.

دەبنە خاوەن دەست کەوت هەر یەکێك لە ئێوە بەو کاتە گەیشت با لەخودا بترسێت و فەرمان بەرداری خودا بێت وە فەرمان بەچاکە بکات وە ڕێگری لە خراپە بکات وە پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێت، ئەوکەسەش پشتگیری قەومەکەی خۆی دەکات لەسەر ناهەق، وەك ئەو وشترە وەهایە کە کەوتۆتە چاڵێك و بە کلکی ڕادەکێشرێت تا ڕزگاری بکرێت.

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((صلَّى في مسجِدِ الخَيْفِ سَبعونَ نبيًّا منهُم موسَى ، كأنِّي أنظرُ إليه وعليهِ عباءتانِ قَطوانِيَّتانِ وهوَ مُحرِمٌ ، على بعيرٍ من إبلِ شَنوءَةَ مَخطومٍ بخطامِ ليفٍ ، لهُ ضَفيرَتانِ))[١٦٧٣] واتە: حەفتا لە پێغەمبەران لە مزگەوتی خیفدا نوێژیان کردووە موسایان ﷺ لە ناودا بوو، ئێستا دەڵێیت شێوەکەیم لە پێش چاوە دوو عەبای قەترانی قورسی کردبوو بە ئیحرام و لەبەریدا بوو سواری یەکێك لە وشترەکانی ناوچەی (شنەوئە بووە) وە لغاوەکەی گوریس بووە و دوو پرچی هەبوو.

موعەمەری کوڕی عەبدوڵڵای عەدەوی ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ منی نارد تا بەناو خەڵکی میناد بانگەواز بکەم و بڵێم: ((بەهەشت تەنها بڕوادار دەچێتە ناویەوە، ڕۆژانی میناش ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەیە))[١٦٧٤].

عوبەیدڵڵای کوڕی عەدی ﷺ دەفەرموێت: [دوو پیاو بۆیان گێڕامەوە وتیان: ئێمە لە کاتی حەجی ماڵئاوایدا چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ خێری دابەش دەکرد، ئێمەش داوامان لێکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ تەماشای کردین بینی هەردووکمان بەتواناین فەرمووی: ((إِنْ شِئْتُما أَعْطَيْتُكُما وَلاحظ فِيهَا لِغَنِيٍّ وَلَا لِقَوِيٍّ مُكْتَسِبٍ))[١٦٧٥] واتە: گەر دەتانەوێت بەشتان دەدەم (بەڵام دڵنیابن) ئەوە ناشێت بەکەسێکی دەوڵەمەند یان کەسێك بەهێزبێت و توانای پارە پەیداکردنی هەبێت].

---

(١٦٧٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٢٢٨٣) (الاوسط) (٥٤٠٣)، وحسنّه الشيخ الالباني يرحمه الله في (صحيح الترغيب) (١١٢٧) و (تحذير الساجد) (ص:١٠٦).

(١٦٧٤) أخرجه: مسلم (١١٤١،١١٤٢).

(١٦٧٥) أخرجه: ابوداود (١٦٣٣) والنسائي (٢٦٠٤) وصححه الشيخ للالباني في (صحيح ابي داود) (١٤٥٣) و (الصحيحة) (٢٢٠٩).

پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام چۆنێتی بەجێگەیاندنی دروشمەکانی حەجی بۆ هاوەڵانی ڕووندەکردەوە: [ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: لەو شەوەی کە نۆبەی من بوو ئێوارە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەلام لەو کاتەدا عەلی کوڕی وەهەبی کوڕی زەمعە پیاوێکی بەنو ئومەیەشی لەگەڵ بوو، هەردووکیان کراسیان لەبەردا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بەوەهەبی فەرموو: ((باوکی عەبدوڵڵا ئایا تەوافی گەڕانەوە (الایفاضة)ت ئەنجام داوە؟)) وتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. فەرمووی: ((کراسەکەت دابنێ)) ئەویش هەردووکیان لەگەڵ هاوەڵەکەی کراسەکەیان لەسەریانەوە دانا، پاشان وتی: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((إِنَّ هَذَا يَوْمٌ رُخِّصَ لَكُمْ إِذَا أَنْتُمْ رَمَيْتُمُ الْجَمْرَةَ أَنْ تَحِلُّوا، (يَعْنِي مِنْ كُلِّ مَا حُرِمْتُمْ مِنْهُ إِلَّا مِنَ النِّسَاءِ)، فَإِذَا أَمْسَيْتُمْ قَبْلَ أَنْ تَطُوفُوا بِهَذَا الْبَيْتِ، عُدْتُمْ حُرُمًا، كَهَيْئَتِكُمْ قَبْلَ أَنْ تَرْمُوا الْجَمْرَةَ حَتَّى تَطُوفُوا بِهِ))[١٦٧٦] واتە: ئەمە ڕۆژێکە گەر ڕەجمتان کردووە ڕێگەی هەموو شتێکتان پێدراوە جگە لە سەرجێی ئافرەتان، بەڵام گەر ئێوارەتان بەسەردا هات و ئێوە تەوافی کەعبەتان نەکردبوو، ئەو شتانەی ڕێگەتان پێدرابوو پێش ڕەجم کردن هەموویان لێتان قەدەغە دەبنەوە هەتا ئەوکاتەی تەوافی کەعبە دەکەن.

## وتارەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەمینا

لەو چوار ڕۆژەی جەژندا لە مینا پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری فەرموو بۆ موسوڵمانان لای جەمەراتی ڕەجمی شەیتان و لەکاتی کۆبوونەوەی خەڵکیدا و ڕێورەسمی حەج کردنی بۆ ڕوون دەکردنەوەوە هەموو ئامۆژگارییەکی بەسوودی پێشکەش دەکردن، هەندیك لە ئاموژگارییەکانی موزدەلیفەو عەرەفەی بۆ دوبارە دەکردنەوەوە چەند ئامۆژگارییەکی زیاتری کردن لە گوێرەی پێویست لێرەدا هەوڵ دەدەین هەموو ئەوانەی لە فەرموودە صەحیحەکاندا هاتوون بیان هێنین و کۆیان بکەینەوە و ڕێکیان بخەین بۆ ئەوەی بەتەواوەتی بەرچاو ڕوون بین لە ڕووداو و ئامۆژگارییە بەنرخەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ:

ئەبو مورەی ڕوقاشی لە مامیەوە گێڕاویەتیەوە ﷺ دەفەرموێت: (لە ناوەڕاستی

(١٦٧٦) أخرجه: ابوداود (١٩٩٩)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٧٤٥).

جەژندا من جلەوی وشترەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ گرتبوو، وە خەڵکیم لێدوور دەخستەوە وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ، هَلْ تَدْرُونَ فِي أَيِّ يَوْمٍ أَنْتُمْ؟ وفِي أَيِّ شَهْرٍ أَنْتُمْ؟ وَفِي أَيِّ بَلَدٍ أَنْتُمْ؟» قَالُوا: فِي يَوْمٍ حَرَامٍ، وَشَهْرٍ حَرَامٍ، وَبَلَدٍ حَرَامٍ، قَالَ: «فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، إِلَى يَوْمِ تَلْقَوْنَهُ» ، ثُمَّ قَالَ: « اسْمَعُوا مِنِّي تَعِيشُوا، أَلَا لَا تَظْلِمُوا، أَلَا لَا تَظْلِمُوا، أَلَا لَا تَظْلِمُوا، إِنَّهُ لَا يَحِلُّ مَالُ امْرِئٍ إِلَّا بِطِيبِ نَفْسٍ مِنْهُ، أَلَا وَإِنَّ كُلَّ دَمٍ، وَمَالٍ وَمَأْثَرَةٍ كَانَتْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ تَحْتَ قَدَمِي هَذِهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَإِنَّ أَوَّلَ دَمٍ يُوضَعُ دَمُ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، كَانَ مُسْتَرْضِعًا فِي بَنِي لَيْثٍ فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ، أَلَا وَإِنَّ كُلَّ رِبًا كَانَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ، وَإِنَّ اللَّهَ قَضَى أَنَّ أَوَّلَ رِبًا يُوضَعُ، رِبَا الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، لَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ، لَا تَظْلِمُونَ، وَلَا تُظْلَمُونَ، أَلَا وَإِنَّ الزَّمَانَ قَدْ اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ خَلَقَ اللَّهُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثۡنَا عَشَرَ شَهۡرٗا فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوۡمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ مِنۡهَآ أَرۡبَعَةٌ حُرُمٌ..... ﴿٣٦﴾ ﴾ (التوبة) ، أَلَا لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ، أَلَا إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ أَيِسَ أَنْ يَعْبُدَهُ الْمُصَلُّونَ، وَلَكِنْ فِي التَّحْرِيشِ بَيْنَكُمْ، فَاتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ، فَإِنَّهُنَّ عِنْدَكُمْ عَوَانٌ، لَا يَمْلِكْنَ لِأَنْفُسِهِنَّ شَيْئًا، وَإِنَّ لَهُنَّ عَلَيْكُمْ، وَلَكُمْ عَلَيْهِنَّ حَقًّا: أَنْ لَا يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَدًا غَيْرَكُمْ، وَلَا يَأْذَنَّ فِي بُيُوتِكُمْ لِأَحَدٍ تَكْرَهُونَهُ، فَإِنْ خِفْتُمْ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ، وَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ (أَيْ: الْمُؤَثِّر)، «وَلَهُنَّ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ، وَإِنَّمَا أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانَةِ اللَّهِ، وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللَّهِ ألا وَمَنْ كَانَتْ عِنْدَهُ أَمَانَةٌ فَلْيُؤَدِّهَا إِلَى مَنْ ائْتَمَنَهُ عَلَيْهَا» ، وَبَسَطَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: « أَلَا هَلْ بَلَّغْتُ؟ أَلَا هَلْ بَلَّغْتُ؟ أَلَا هَلْ بَلَّغْتُ؟ ثُمَّ قَالَ: لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، فَإِنَّهُ رُبَّ مُبَلَّغٍ أَسْعَدُ مِنْ سَامِعٍ))[١٦٧٧].

واتە: ئەی خەڵکینە ئایا دەزانن ئێوە لە چ ڕۆژێکدان، وە لە چ مانگێکدان وە لە چ شارێکدان؟)) وتیان لە ڕۆژێکی حەرام و مانگێکی حەرام و شارێکی حەرامداین. فەرمووی: ((خوێن و سامان و ئابڕوتان لەسەر یەکتری حەرامە بە وێنەی حەرام بوونی ئەم ڕۆژو مانگ و شوێنەتان هەتا دەگەنەوە بە خودا (پاشان فەرمووی): گوێ بۆ وتەکانم بگرن بەشادی دەژین، ئاگاداربن ستەم لەیەکتری مەکەن، سێ جار ئەوەی وتەوە، ماڵی هیچ کەسێك حەڵاڵ نییە مەگەر لە ناخی دڵیەوە پێی ڕازی بێت، ئاگاداربن هەموو خوێن و سامان و تۆڵەیەکی سەردەمی نەفامی لە ژێر پێمدایە تا ڕۆژی دوایی، یەکەم خوێنیش کە وەلا دەنرێت خوێنی ڕەبیعەی کوڕی حارسی کوڕی

(١٦٧٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣٦٠٩)، وأحمد (٢٠٦٩٥) وقال محققوه: صحيح لغيره.

عەبدولموتەلیبە لە ناو بەنی لەیسدا شیرەخۆرە بوو هوزەیلیەکان کوشتیان، ئاگاداربن هەموو سوویەکی سەردەمی نەفامی وەلا نراوە، خوای گەورە بڕیاری داوە یەکەم سوو وەلا بنرێت سووەکەی عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیبە، سەرمایەکانی ماڵەکانتان بۆ خۆتانەو ستەم مەکەن و ستەمیشتان لێ نەکرێت، ئاگاداربن زەمانە دەخولێتەوە وەك ئەو ڕۆژەی خودا ئاسمان و زەمینی تێدا بەدی هێناوە (دواتر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (ژمارەی مانگەکان لا پەروەردگار دوانزە مانگە لە (لەوح مەحفوزدا) لەو ڕۆژەوەی ئاسمان و زەوی فەراهەم هێناوە، کە چواریان حەرام کراوەکانن)، ئاگاداربن لە دوای من بێ باوەڕنەبنەوە و لەگەردنی یەکتر بدەن، شەیتان بێ ئومێد بووە نوێژخوێنان بی بەرستن بەڵام لە هەوڵدایە بۆ ئەوەی شەڕو هەرا لە نێوانتاندا دروست بکات، لە خوا بترسن و گوێڕایەڵ بن لە مامەڵەتان لەگەڵ هاوسەرانتان، ئەوان وەك یەخسیر لاتانن و هیچیان پێ ناکرێت بۆ خۆیان، ئەوانە لەسەر ئێوە مافیان هەیە وە ئێوەش لەسەر ئەوان مافتان هەیە، مافی ئێوە لەسەر ئەوان ئەوەیە کەسێکی تر جگە لە خۆتان نەهێننە سەر جێیەکانتان و ڕێگەی هاتنە ناو ماڵەکانتان نەدەن بۆ ئەوانەی ئێوە پێتان ناخۆشە، گەر ترسان ئەوان گوێڕایەڵ نەبن و ناچیزەبن ئێوەش ئامۆژگارییان بکەن و جێیان لەگەڵدا جیابکەنەوە، وە بە لێدانێکی هێواش و بێ ئازار لێیان بدەن، ئەوانیش مافیان لەسەرتان ئەوەیە خواردن و پۆشاك و کەلوپەلی پێویستیان بۆ دابین بکەن بەگوێرەی تواناتان، ئێوە ئەوانتان بە ئامانەتی خودا لەلایە (واتە: ئامانەتی خودان لای ئێوە) وە بە وشەی خودا داوێنیان بۆتان حەلاڵکراوە، هەرکەسێك سپاردەیەکی لایە بیداتەوە دەستی ئەوەی لێی وەرگرتووە... ئایا من ئەمانەم پێ گەیاندن سێجار ئەمەی فەرمووەوە. ئیتر ئەوەی لێرەیە با ئەم ئامۆژگارییە بگەیەنێتە ئەوەی لێرەنین هەندێ جار ئەوەی ئەم ئامۆژگارییانەی پێدەگات بەختەوەرترە لەوکەسەی پێی گەیاندووە)).

پێغەمبەری خوا ﷺ لەم وتارەیدا کەسانێکی ئامادەکردبوو وتەکانی دووبارە بکەنەوە و بیگەیەننە هەموو خەڵکی، زۆر جاریش وتەکانی بەسەر پشتی وشترەکەیەوە دەفەرموو تا دەنگی باشتر بگاتە خەڵکی و هەموو بە چاو ببیبنن، وە زۆر جاریش لە جێگە فەرەباڵغەکاندا وتاری دەفەرموو بۆ ئەوەی ژمارەیەکی زیاتر ئامۆژگارییەکانی ببیستن، وە زۆر جاریش وتارەکانی دەفەرموو لەکاتی چێشتەنگاودا یاخود ئەو

کاتانەی کە خەڵکی تێیدا چالاکن. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا عەبدولڕەحمانی کوڕی موعاز ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لە مینا وتاری بۆداین، خودا گوێ و بیستنی بەهێز کردبووین، ئێمە هەموو لای کەلوپەلەکانمان بووین وە بەباشی هەمووەمان گوێمان لە ئامۆژگارییەکانی دەبوو وە خەڵکی فێری چۆنێتی ئەرکەکانی حەج کردن دەکرد][١٦٧٨] وە لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لە مینا وتاری بۆ دەداین لەکاتی چێشتەنگاودا][١٦٧٩] [وە پۆشاکێکی سووری لەبەردا بوو][١٦٨٠] وە عەلی کوڕی ئەبوتالیب بۆ خەڵکەکەی دووبارە دەکردەوە. لە گێڕانەوەیەکی تردا [پێغەمبەری خوا ﷺ بەسواری وشترەکەیەوە (ئەلعەزباء) لەمینا وتاری بۆ خەڵکەکە دەدا][١٦٨١].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان جەمەڕاتدا (واتە: ڕەجمی شەیتان)دا لە ڕۆژانی مینادا وتاری بۆ خەڵکەکە دەدا و دەیفەرموو: ((ئەمە ڕۆژی حەجی گەورەیە (واتە: یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان)... وە لە وێدا ماڵئاوایی لەخەڵکەکە دەکرد، خەڵکەکەش وتیان ئەمە حەجی ماڵئاواییە][١٦٨٢].

هەر لەوێ لە بۆنەیەکدا وتاری بۆ داین و فەرمووی: ((أَلَا إِنَّ الزَّمَانَ قَدْ اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ، السَّنَةُ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا، مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ، ثَلَاثٌ مُتَوَالِيَاتٌ: ذُو الْقَعْدَةِ، وَذُو الْحِجَّةِ، وَالْمُحَرَّمُ، وَرَجَبُ مُضَرَ الَّذِي بَيْنَ جُمَادَى وَشَعْبَانَ))[١٦٨٣] واتە: کات و زەمان دەخولێتەوە وەك ئەو ڕۆژەی خودا ئاسمان و زەوییەکانی تێدا دروستکردووە، ساڵ دووانزە مانگە چواریان مانگە حەرامکراوەکانن ئەوانیش سیانیان بە دوای یەکدا دێن و بریتین لە مانگەکانی (زولقەعیدەو زولحەجەو موحەرەم) لەگەڵ مانگی ڕەجەبی نێوان جەماد و شەعباندا]. [خودا خوێن و ماڵ و ئابڕوتانی لەسەر یەکتر حەرام کردووە بەوێنەی حەرام بوونی ئەم مانگ و ڕۆژ وجێگەیەتان. هەتا ئەو ڕۆژەی

(١٦٧٨) أخرجه: ابوداود (١٩٥٧).
(١٦٧٩) أخرجه: ابوداود (١٩٥٦).
(١٦٨٠) أخرجه: أحمد (٤٧٧/٣).
(١٦٨١) أخرجه: ابوداود (١٩٥٤).
(١٦٨٢) أخرجه: البخاري (١٧٤٢).
(١٦٨٣) أخرجه: أحمد (٢٠٣٨٦) وقال محققوه: حديث صحيح، وابوداود (١٩٤٧) والنسائي (١٢٧/٧)، والطحاوي (المشكل) (١٤٥٦).

دەگەنەوە بە خوای خۆتان][١٦٨٤] [ئەوەی زۆر دووبارە دەکردەوە و پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سەری بەرزکردەوە و فەرمووی: خودایە ئەوا پەیامەکەتم گەیاند][١٦٨٥]. وە بە خەڵکەکەشی فەرموو: ئایا پێم ڕاگەیاندن؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: دەخودایە شاهیدبە....

[ئێوە بە پەروەردگارتان دەگەنەوە و لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکات][١٦٨٦] لە دوای من مەبنەوە بە کافر و لەگەردنی یەکتر مەدەن، [پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بەو لاوە و دووبەرانی سپی سەربڕی و مێگەلە مەڕێکی دابەش کرد بەسەر هاوەڵانیدا][١٦٨٧]. جارێکی تر لە بۆنەیەکی تردا ئامۆژگاری کردین و فەرمووی: [ئەی خەڵکینە لە خوا بترسن وە فەرمان بەرداریبن وە گوێڕایەڵی پێشەواکانتان بن هەرچەندە بەندەیەکی حەبەشی دەست و قاچ باریکیش بێت ئێوە گوێی بۆ بگرن و گوێڕایەڵی ببن بەمەرجێك پەیڕەوی کتێبەکەی خودا بکات لەناوتاندا][١٦٨٨].

پاشان فەرمووی: [چاکە بکەن لەگەڵ دایکتان و باوکتان و خۆشکتان و براتان پاشان نزیکەکانتان] لەوێدا کەسانێك هاتنە خزمەتی وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەنو یەربوع دەیانەوێت بمان کوژنەوە؟ فەرمووی: ((کەس بەرپرس نییە لە تاوانی کەس)) ئینجا پیاوێك پرسیاری لێکرد سەبارەت بە ڕەجم کردن... وە دواتر هەر پرسیارێکیان لەو بارەیەوە لێدەکرد هەر دەیفەرموو: ((خودای گەورە کێشەو بارگرانی لەسەر لا بردوون مەگەر مرۆڤێك مافی موسوڵمانێکی لا بێت، ئەو کەسە لە ڕاستیدا تووشی کێشە بووە و لە ناو چووە [دەرمان بە کاربهێنن ئەی بەندەکانی خودا] هەر دەردێك خودا دای بەزاندبێت دەرمانیشی بۆ دابەزاندووە تەنها پیری نەبێت][١٦٨٩] [گرنگەکان چوارن: هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی خودا وە هیچ مرۆڤێك

(١٦٨٤) أخرجه: البخاري (١٧٤٢) وأحمد (٢٠٣٨٦) وقال محققوه: حديث صحيح.

(١٦٨٥) أخرجه: البخاري (١٧٣٩).

(١٦٨٦) أخرجه: أحمد (٢٠٣٨٦) وقال محققوه: حديث صحيح.

(١٦٨٧) أخرجه: مسلم (٣٠/١٦٧٩).

(١٦٨٨) أخرجه: مسلم (١٢٩٨)، وأحمد (٢٧٢٦٨) وقال محققوه: حديث صحيح، وابن حبان (٤٥٦٤) وقال محققه: حديث صحيح.

(١٦٨٩) أخرجه: أحمد (٢٧٨/٤)، وابوداود (٣٨٥٥)، الترمذي (٢٠٣٨)، وابن ماجة (٣٤٣٦) وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٤٣٣).

نەکوژن کەخودا حەرامی کردووە مەگەر بە حەق و مافی خۆی وە داوێن پیسی مەکەن وە دزی مەکەن][١٦٩٠] [ئەی خەڵکینە.... باوك بەر پرس نییە لەو تاوانەی منداڵەکەی دەیکات وە منداڵیش بەر پرس نییە لەو تاوانەی باوکی دەیکات، ئاگاداربن شەیتان بێ ئومێد بووە لەوەی لەم شارەتاندا بپەرسترێت، بەڵام ئەو بەوە ڕازییە کە گوێڕایەڵی بن لە هەندێك لەو کارانەی کە بەکەمی دەزانن، ئاگاداربن هەموو ڕیباو سوویەکی سەردەمی نەفامی وەلا نراوە، سەرمایەکانتان بۆ خۆتانە نابێت ستەم بکەن و یان ستەمتان لێبکرێت][١٦٩١] [خەڵکینە هیچ پێغەمبەرێك لە دوای منەوە نییە و هیچ ئومەتێکیش لە دوای ئێوە وە نییە][١٦٩٢] [خودای خۆتان بپەرستن و پێنج نوێژەکەتان بکەن و مانگەکەتان بەڕۆژوبن و زەکاتی ماڵەکانتان بە خۆشی خۆتان و بە دڵێکی پاکەوە ببەخشن و حەجی ماڵەکەی خودای خۆتان بکەن و گوێڕایەڵی پێشەواکانتان بن ئەو کات دەچنە ناو بەهەشتەکەی خودای خۆتان][١٦٩٣].

[ئەی خەڵکینە: ((أَلَا إِنَّ رَبَّكُمْ وَاحِدٌ، وَإِنَّ أَبَاكُمْ وَاحِدٌ، أَلَا لَا فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى عَجَمِيٍّ، وَلَا لِعَجَمِيٍّ عَلَى عَرَبِيٍّ، وَلَا أَحْمَرَ عَلَى أَسْوَدَ، وَلَا أَسْوَدَ عَلَى أَحْمَرَ، إِلَّا بِالتَّقْوَى أَبَلَّغْتُ؟ قَالُوا: بَلَّغَ رَسُولُ اللَّهِ، ..... قَالَ: «لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ))[١٦٩٤] واتە: ئاگاداربن خوداتان یەکە وە باوکیشتان هەریەکە، ئاگاداربن هیچ گەورەییەك و سەرورەرییەك نییە بۆ مرۆڤێکی عەرەب بەسەر کەسێکی نا عەرەبدا، وە هیچ ناعەرەب و بیانیەك گەورەیی و سەروەری نییە بەسەر عەرەبێکدا یاخود سورپێستیك بەسەر ڕەش پێستێکدا تەنها بە زیاتر گوێڕایەڵی خودایە، بەڕێزترینتان لای خودا گوێڕایەڵ ترینتانە، ئایا من ئەوەم پێ گەیاندوون؟ هەموو وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: دەئەوانەی لێرەن بیگەیەننە ئەوانەی لێرە نین]. حاریسی کوڕی بەرساء ﷺ دەفەرموێت: [گوێم لێبوو

(١٦٩٠) أخرجه: أحمد (٣٣٩/٤) والطبراني (الكبير) (١٣١٦) والنسائي (الكبرى) (١١٣٧٣) وفي (التفسير) (٣٩٣) وقال محققه: حديث صحيح، والحاكم (٣٥١/٤) وصححه ووافقه الذهبي.

(١٦٩١) أخرجه: النسائي (الكبرى) (٣٥٩٧) وابن ماجة (٣٠٥٧)، والترمذي (٢١٥١)، وصححه الشيخ الالباني في: (صحيح الترغيب) (٣٦) و (صحيح الترمذي) (١٧٥٣).

(١٦٩٢) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٧٥٣٥).

(١٦٩٣) أخرجه: الترمذي (٦١٥،١١٩) وأحمد (٥٥،٤٦٢) والنسائي (٥٠٢)، وابن حبان (٧٩٥) وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٨٦٧) الحاكم (٩/١) وصححه ووافقه الذهبي،

(١٦٩٤) أخرجه: أحمد (٢٣٤٨٩) وقال محققوه: سنده صحيح، وصححه ابن تيمية في (الاقتضاء) (ص:٦٩)، وصححه الشيخ الالباني في (الطحاوية) (٥١٠/٢) و (الصحيحة) (٢٧٠٠) و صححه ايضاً الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (١٥٣٦).

پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان دوو جێی بەرد هەڵدانەکەدا دەیفەرموو: ((مَنْ أَخَذَ شِبْرًا مِنْ مَالِ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينٍ فَاجِرَةٍ فَلْيَتَبَوَّأْ بَيْتًا مِنَ النَّارِ))(١٦٩٥) واتە: هەرکەسێك بستێك لە زەوی و سامانی کەسێکی موسوڵمان بە سوێندێکی ناهەق بۆ خۆی زەوت بکات، ئەوە ماڵێکی لە دۆزەخدا بۆ ئامادەکراوە].

ئەبو ئومامە ﷺ دەفەرموێت: [پیاوێك لەلای ڕەجمی یەکەم چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین جیهادو تێکۆشان چییە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی نەدایەوە چوو ڕەجمی دووەمی کرد، دیسان پیاوەکە پرسیارەکەی دووبارەکردەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ هەر وەڵامی نەدایەوە، لەدوای تەواو بوونی ڕەجمی سێهەمەوە و کاتێك ویستی سواری وشترەکەی بێت. فەرمووی: ((ئەو کەسەی پرسیارەکەی کرد لە کوێیە؟)) وتی: ئەوەتام لێرە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئینجا فەرمووی: ((چاکترین تێکۆشان وتنی وتەیەکی حەقە لای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار))](١٦٩٦).

جابر ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بە سواری وشترەکەیەوە ڕەجمی دەکردو دەی فەرموو: ((يَا أَيهَا النَّاس، خُذُوا عني مَنَاسِككُم (فَإِنِّي) لَا أَدْرِي لعَلي لَا أحج بعد عَامي هَذَا)(١٦٩٧) [إِنِّي قَدْ تَرَكْتُ] فِيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُمَا: كِتَابُ اللَّهِ وَسُنَّتِي ، وَلَنْ يَفْتَرِقَا حَتَّى يَرِدَا عَلَيَّ الْحَوْضَ ))](١٦٩٨). واتە: ئەی خەڵکینە چۆنێتی حەج کردن لەمنەوە وەربگرن چونکە من نازانم لەوانەیە لەدوای حەجی ئەمساڵەوە حەجێکی تر نەکەم، من دوو شتم لەناوتاندا بۆ جێهێشتوون لەدوایان هەرگیز گومڕانابن ئەویش کتێبەکەی خوداو سونەتەکانی منە ئەو دوانە لە یەکتر جیانابنەوە تابەمن دەگەنەوە لەسەر حەوزی کەوسەر.

---

(١٦٩٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣٣٣٠)، وابن ماجة (٢٥٤٤)، والحاكم (٢٩٤/٤) وصححه ووافقه الذهبي وابن حبان (٥١٦٥) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٦٩٦) أخرجه: أحمد (٢٥١/٥)، وابن ماجة (٤٠١٢)، وقال الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٨٠٧/١) (٤٩١): سنده حسن و في (صحيح ابن ماجة) (٣٢٤١) و (الروض) (٩٠٩).

(١٦٩٧) أخرجه: النسائي (٢٧٠/٥).

(١٦٩٨) أخرجه: مالك (الموطا) (١٦٦٤) وقال محققه: اسناده صحيح، وموسى بن عقبة (المغازي) (ص:٣٢٦)، والحاكم (٩٣/١) (٣٢٤) وصححه، والبيهقي (الكبرى) (١١٤/١٠)، والدار قطني (٤٥٥٩) وقال محققه: اسناده حسن، وصححه الشيخ الالباني في (المشكاة) (١٨٦) و (الصحيحة) (٣٦١/٤) وكذلك صححه الشيخ سليم الهلالي في (صحيح الموطأ) (١٦٢٥).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ وتارێکی فەرموو تیایدا وباسی دەجالی کرد بە دوورو درێژی پاشان فەرمووی: (مَا بَعَثَ اللَّهُ مِنْ نَبِيٍّ إِلَّا قَدْ أَنْذَرَهُ أُمَّتَهُ، لَقَدْ أَنْذَرَهُ نُوحٌ أُمَّتَهُ، وَالنَّبِيُّونَ مِنْ بَعْدِهِ، أَلَا مَا خَفِيَ عَلَيْكُمْ مِنْ شَأْنِهِ، فَلَا يَخْفَيَنَّ عَلَيْكُمْ أَنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ، [وَأَنَّهُ يَخْرُجُ فِيكُمْ] أَلَا مَا خَفِيَ عَلَيْكُمْ مِنْ شَأْنِهِ، فَلَا يَخْفَيَنَّ عَلَيْكُمْ أَنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَر مَرَّتَيْنِ] [١٦٩٩] [إِلَّا أَنَّ مَسِيحَ الدَّجالِ أَعْوَرُ [الْعَيْنِ الْيُمْنَى] كَأَنَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ]) [١٧٠٠] واتە: خودا هەر پێغەمبەرێکی ناردبێت ئومەتەکەی لێ ئاگادارکردۆتەوە، هەر لە پێغەمبەر نوحەوە عليه السلام تا هەموو ئەوانەی لەدوای ئەوەوە هاتوون [بەڵام لەناو ئێوەدا پەیدا دەبێت] هەر شتێکی ئەوتان لا نادیار و شاراوە بوو ئەوەتان لا شاراوە نەبێت کە خودای ئێوە چاوێکی کوێر نییە. ئەوەی دووجار دووبارەکردەوە. [وریابن مەسیحی دەجال چاوی ڕاستی کوێرە] [وەك مێوژە].

عەمری کوڕی یەسریبی زەمری ﷺ دەفەرموێت: [ئامادەی وتارێکی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لە مینا... فەرمووی: ((وَلَا يَحِلُّ لِامْرِئٍ مِنْ مَالِ أَخِيهِ إِلَّا مَا طَابَتْ بِهِ نَفْسُهُ)) واتە: ماڵی هیچ موسوڵمانێك بۆبراکەی حەڵاڵ نییە مەگەر لە ناخیدا پێی ڕەزامەند بێت)). من کە ئەوەم بیست وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باشە گەر من بەمێگەلە مەڕەکەی ئامۆزاکەم گەیشتم و خوری شەکێکیانم لێکردەوە (یان سەرم بڕی) ئایا من هیچم لەسەرە؟ فەرمووی: ((گەر گەیشتیت بە مەڕەمێینەیەکی و چەقۆیەکی تیژو پێداویستی ئاگرکردنەوەشت پێ بوو تۆ هەرگیز دەستی لێ نەدەیت] [١٧٠١].

سوفیانی کوڕی وەهەبی خەوەلانی ﷺ دەفەرموێت: [لەحەجی ماڵئاواییدا لە خزمەت پێغەمبەری خواد ﷺ بووم وتاری دەدا و فەرمووی: ((....رَوْحَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا، وَغَدْوَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا، وَإِنَّ الْمُؤْمِنَ عَلَى الْمُؤْمِنِ حَرَامٌ: عِرْضُهُ وَمَالُهُ وَنَفْسُهُ، حَرَّمَهُ كَمَا حَرَّمَ هَذَا الْيَوْمِ)) [١٧٠٢] واتە: دەرچوونێکی بەیانیان لە ڕێی خوادا باشترە لە دونیاو ئەوەشی لەسەریەتی، وە دەرچونێکی ئێواران لەڕێی خوادا باشترە لەدونیاو ئەوەشی لەسەریەتی، باوەڕدار لەسەر باوەڕدار ئابڕو و سامان

---

(١٦٩٩) أخرجه: أحمد (٦١٨٥) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما، والبخاري (٤٤٠٢)، ومسلم (١٦٩).

(١٧٠٠) أخرجه: أحمد (٤٩٤٨) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

(١٧٠١) أخرجه: أحمد (١٥٤٤٨، ٢١٠٨٣) وقال محققوه: صحيح لغيره.

(١٧٠٢) أخرجه: أحمد (١٧٥٣٥) وقال محققوه: صحيح لغيره.

و گیانی حەرامە وەك حەرامی ئەمڕۆ [لە دوای من مەگەڕێنەوە بۆ بێباوەڕیی و لەگەردنی یەکتری مەدەن][١٧٠٣] [گەورەترین ڕۆژەکان لای خوای گەورە ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربانە پاشان ڕۆژی دووەمی][١٧٠٤] [ئەم ئاینە بەردەوام زاڵ [وبەهێز و پارێزراوە] دژ بەنەیارانی، هیچ دووڕوو و ناحەزێك ناتوانێت زیانی پێ بگەیەنێت تا لە ئوممەتەکەمدا دوازدە خەلیفە و جێنشینی قورەیشی دەڕۆن][١٧٠٥] .

[ئاگاداربن دۆستانی خوا ئەوانەن کە پێنج نوێژەکە بەجێ دەگەیەنن کە خودا بە پێویستی داناوە لەسەریان. وە ڕۆژووی ڕەمەزان دەگرن و وە ڕۆژوەکانیان دەپارێزن وە بە پێویستیان دەزانن لەسەریان وە زەکاتیماڵەکانیان دەدەن و چاوەڕێی پاداشتەکەی دەبن، وە خۆیان لە نۆ تاوانە گەورەکە دەپارێزن: هاوتا بۆ خودا دانان [وسیحرکردن] و کوشتنی بڕوادارێك بە ناهەق و ڕاکردن لە ڕۆژی غەزاو بەرەنگاربوونەوە، وە خواردنی ماڵی هەتیو و سووخواردن و بوختان کردن بۆ ئافرەتانی داوێنپاك و ئازاردانی دایك و باوکی موسوڵمان و خوێن ڕشتن و ئاژاوە نانەوە لەبەیتولحەرامدا کە قیبلەو ڕوگەتانە بەزیندوویی و بە مردوویی هەرکەسێك بمرێت و ئەو تاوانە گەورانەی ئەنجام نەدابێت و نوێژی کردبێت و زەکاتی دابێت ئەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوایە لە ماڵێکدا کە چوارچێوەی دەرگاکانی لە ئاڵتون و زێڕە][١٧٠٦] [هیچ یەکێك ماڵی براکەی بۆ حەڵاڵ نییە مەگەر ئەوەی بەڕەزامەندی خۆی پێی ببەخشێت ئیتر ستەم لە یەکتری مەکەن][١٧٠٧].

ئەبو ئوسامە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاو لەناو خەڵکەکەدا وتاریدا و فەرمووی: ((خودا حەجی بە پێویست داناوە لەسەرتان)) لەوێدا پیاوێکی دەشتەکی هەستا وتی: لە (هەموو ساڵێکدا؟) ئەو قسەیەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕی، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر وەستاو پاشان فەرمووی: ((کێ بوو پرسیاری کرد؟)) پیاوە دەشتەکییەکە وتی: (من ئەوەتام ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ). فەرمووی: ((وَيْحَكَ،

(١٧٠٣) أخرجه: أحمد (٢٠٣٥) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط البخاري.

(١٧٠٤) أخرجه: ابوداود (١٧٦٥) وصححه الشيخ الالباني في (المشكاة) (٢٦٤٣).

(١٧٠٥) أخرجه: أحمد (٢٠٩٠٦،٢٠٨١٤) وقال محققوه: صحيح.

(١٧٠٦) أخرجه: ابوداود (٢٨٧٥)، والنسائي (١٦٥/٢)، والحاكم (٢٥٩/٤) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (٤٠٨/٣) واللفظ، وقال الشيخ الالباني في (الارواء) (٦٩٠): سنده حسن.

(١٧٠٧) أخرجه: البيهقي (الكبرى) (٤٠٧/٣) وقال الشيخ الالباني في (الارواء) (٢٨١/٥): سنده حسن.

مَاذَا يُؤْمِنُكَ أَنْ أَقُولَ نَعَمْ، وَاللهِ لَوْ قُلْتُ: نَعَمْ، لَوَجَبَتْ، وَلَوْ وَجَبَتْ لَتَرَكْتُمْ، وَلَوْ تَرَكْتُمْ لَكَفَرْتُمْ. أَلَا إِنَّهُ إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ أَئِمَّةُ الْحَرَجِ، وَاللهِ، لَوْ أَنِّي أَحْلَلْتُ لَكُمْ جَمِيعَ مَا فِي الْأَرْضِ مِنْ شَيْءٍ، وَحَرَّمْتُ عَلَيْكُمْ مِثْلَ خُفٍّ بَعِيرٍ لَوَقَعْتُمْ فِيهِ ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ..... ﴿١٠١﴾ ﴾ (المائدة)))[1708]. واتە: ئەی هاوار لە دەست تۆ چ متمانەیەکت هەیە گەر من بڵێم بەڵێ. سوێند بەخوا گەر من بڵێم بەڵێ پێویست دەبێت لەسەرتان، وە گەر پێویست بوو لەسەرتان فەراموشی دەکەن وەگەر فەرامۆشتان کرد بێ باوەڕدەبن، ئەوانەی پێش ئێوە بەو جۆرە لەناوچوون، سوێند بەخودا گەر من هەموو ئەوانەی لەو سەزەوەییەدا هەن بۆتانی حەڵاڵ بکەم و تەنها بە ئەندازەی سمی پێی وشترێکتان لێ قەدەغە بکەم ئێوە تێی دەکەون. ئیتر بەو هۆیەوە خوای گەورە ئایەتی ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ..... ﴿١٠١﴾ ﴾ (المائدة) ی دابەزاند] واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لەوشتانە مەپرسن گەر بۆتان ڕوونبکرێتەوە پێی دڵتەنگ و خەمبار دەبن) (يَا أَيُّهَا النَّاسُ، خُذُوا مِنَ الْعِلْمِ قَبْلَ أَنْ يُقْبَضَ الْعِلْمُ، وَقَبْلَ أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ مِنِ الأَرْضِ أَلَا وَإِنَّ مِنْ ذَهَابِ الْعِلْمِ أَنْ يَذْهَبَ حَمَلَتُهُ))[1709] واتە: ئەی خەڵکینە زانست فێرببن پێش ئەوەی لەزەوی نەمێنێت و هەڵبگیرێت] [پاشان فەرمووی: ((أُوصِيكُمْ بِالجارِ)) واتە: ئامۆژگاریتان دەکەم چاکەکاربن لەگەڵ دراوسێدا. ئەوەی ئەوندە دووبارەکردەوە تا وامان زانیمیراتی لەیەکتریی دەبەن][1710].

ئەبو ئومامە رضي الله عنه دەفەرموێت: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ بە سواری وشترەکەیەوە (عەزباء) لە شوێنی هەردوو قاچ دانانی کۆپانی وشترەکان خۆی بەرزکردبووە وە و هەردوو دەستی لەپێش و لەسەر پاش کۆپانەکە دانا بوو تا خەڵکەکە بە جوانی بیبینن و وتەکانی ببیستن و دەیفەرموو: ((أَلَا تَسْمَعُونَ)) واتە: ((ئایا گوێ دەگرن؟)) ئەم وتەیەی درێژدەکردەو و پاشان فەرمووی: ((إِيَا أَيُّهَا النَّاسُ، أَنْصِتُوا، فَإِنَّكُمْ لَعَلَّكُمْ لَا تَرَوْنِي

---

(١٧٠٨) أخرجه: الطبري (التفسير) (١٢٨٠٧)، والطبراني (الكبير) (٧٦٧١)، وقال الهيثمي (المجمع) (٢٠٤/٣): اسناده حسن جيّد.

(١٧٠٩) أخرجه: أحمد (٢٢٢٩٠) وقال محققوه: اسناده ضعيف بهذه السياقة، والطبراني (الكبير) (٧٨٦٧) وقال الهيثمي في (المجمع) (٢٠/١) واسناده الطبراني أصح، وللحديث شواهد كثيرة.

(١٧١٠) أخرجه: أحمد (٧٥٢٢) وقال محققوه: حديث صحيح، والطبراني (الكبير) (٧٥٢٣) واللفظ له، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٦٥/٨): سنده جيّد، وقال الشيخ الالباني في (الارواء) (٤٠٤/٣): سنده جيّد.

بَعْدَ عَامِكُمْ هَذَا][١٧١١] [أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهُ لَا نَبِيَّ بَعْدِي، وَلَا أُمَّةَ بَعْدَكُمْ][١٧١٢] [أَلَا وَإِنِّي فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ أَنْظُرُكُمْ، وَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الْأُمَمَ، فَلَا تُسَوِّدُوا وَجْهِي، أَلَا وَقَدْ رَأَيْتُمُونِي وَسَمِعْتُمْ مِنِّي وَسَتُسْأَلُونَ عَنِّي، فَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ، أَلَا وَإِنِّي مُسْتَنْقِذٌ رِجَالًا أَوْ نَاسًا، وَمُسْتَنْقَذٌ مِنِّي آخَرُونَ، فَأَقُولُ: يَا رَبِّ أَصْحَابِي فَيُقَالُ: [إِنَّكَ لَا تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ ][١٧١٣] [لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلَّا نَفْسٌ مُؤْمِنَةٌ، وَأَيَّامُ مِنًى أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ][١٧١٤] [نَضَّر اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مَقَالَتِي فَبَلَّغَهَا، فَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ غَيْرِ فَقِيهٍ، وَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ إِلَى مَنْ هُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ: ثَلَاثٌ لَا يُغِلُّ عَلَيْهِنَّ قَلْبُ الْمُؤْمِنِ: إِخْلَاصُ الْعَمَلِ، والنصحية وُلاة المُسلِمينَ، وَلُزُومُ الْجَمَاعَةِ فَإِنَّ دَعْوَتَهُمْ تحيط مِنِ وَرَائِهِمْ]))[١٧١٥] واتە: فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە بۆ دەنگ بن گوێ بگرن چونکە پێدەچێت ئێوە لەدوای ئەم ساڵانەوە من نەبیننەوە] [وە هیچ پێغەمبەرێك لەدوای منەوە نییە وە هیچ ئومەتێکیش لەدوای ئێوەوە نایەت] [ئاگاداربن من پێشەنگتانم بۆ چوونە سەر حەوزی کەوسەر و لەوێ چاوەڕێتان دەبم، من شانازی بە ژمارە زۆریتانەوە دەکەم لای ئومەتەکانیتر، ئێوەش شەرمەزارم مەکەن، ئێوە هەمووتان منتان دیوە وە باسی منتان بیستووە وە سەبارەت بە منیش پرسیارتان لێدەکرێت، هەریەکێك درۆ بەناوی منەوە بڵاوبکاتەوە ئەوە جێی خۆی مسۆگەر کردووە لە دۆزەخ، ئاگاداربن (واتە: پێش حەوزی کەوسەر) من دەمەوێت کەسانێك ڕزگاربکەم وە کەسانێکیش دەیانەوێت ئەوانم لێ دووربخەنەوە من دەڵێم: ئەی پەروەردگارم هاوەڵانم. دەفەرموێت: [تۆ نازانیت ئەوان چیان داهێنا لەدوای تۆ] [بۆیە وریابن تەنها خاوەن دەروونێکی بڕوادار دەچێتە بەهەشتەوە، وە ڕۆژانی مانەوەی مینا ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەیە] [خودا ڕوخساری ئەوکەسە (نورانی) و جوان بکات کە وتەکانم دەبیستێت و دەیگەیەنێتە کەسانیتر هەندێ جار کەسی وەها هەیە تەنها هەڵگری زانیارییە بەڵام لێی تێناگات، وە هەندێ جاریش کەسی وا هەیە هەڵگری زانیارییە بۆلای کەسانێکی لەو زاناتر: سێ شت هەن خاوێنکەرەوەی

---

(١٧١١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٧٦٧٦) واللفظ له، والترمذي (٦١١)، والحاكم (٩/١، ٣٨٩) وصححه ووافقه الذهبي.

(١٧١٢) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٧٥٣٥).

(١٧١٣) أخرجه: أحمد (٢٣٤٩٧) وقال محققوه: اسناده صحيح، وابن ماجة (٣٠٥٧).

(١٧١٤) أخرجه: ابن ماجة (١٧٢٠)، والنسائي (١٠٤/٨)، والطبراني (الكبير) (١٢٠٣)، وصححه الشيخ الالباني (الارواء) (١٢٨/٤) و (صحيح ابن ماجة) (١٣٩٧).

(١٧١٥) أخرجه: الحميدي (٨٨)، والدارمي (٥٣٢)، والترمذي (٢٦٥٦)، وابوداود (٣٦٦٠)، وابن حبان (٦٧) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (صحح ابي داود) (٣١٠٩) و (صحيح ابن ماجة) (١٨٨٧) و (صحيح الترغيب) (٤)، وصححه الشيخ مقبل ايضاً في (الصحيح المسند) (٣٥٨).

دڵی بڕواداره لە ڕق و ناپاکی: ئەویش دڵسۆزی و ئەنجامدانی کارەکانە تەنها لەبەر خودا، پاشان دڵسۆزیی و ئامۆژگاری پێشەوایانی موسوڵمانانە وە هەوڵدان بۆ پاراستنی یەك ڕیزیی موسوڵمانان چونکە نزاو بانگەوازەکەیان شورایەکە بۆ پاراستنیان].

## گەڕانەوە بۆ مەدینە

پێغەمبەری خوا ﷺ ناوچەی مینای لە نزیك نوێژی نیوەڕۆ بەجێهێشت و لەو ڕۆژەدا نەتوانرا بگەنە ناو شاری مەککە و وا پێویستی کرد شەو نزیك شاری مەککە بمێننەوە، لەو ناوەدا گونجاوترین شوێن بۆ لادان ناوچەی (موحەسەب) بوو ئەو جێگەیەی کە قورەیش بڕیاری ئابڵوقەدانی سەپاند بەسەر (بەنو هاشمدا)[١٧١٦].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکرو عومەر لە ناوچەی (ئەبتەح) لایان دەداو دەمانەوە][١٧١٧]. دایکی بڕواداران عائیشە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لەناوچەی (الابطح) لایدا چونکە گونجاو بوو بۆ گەڕانەوەی][١٧١٨]. [بە پێغەمبەری خوا ﷺ وترا: بەیانی لە کوێ لادەدەیت؟ فەرمووی: ((هَلْ تَرَكَ لَنَا عَقِيلٌ مَنْزِلًا؟ ثُمَّ قَالَ: «نَحْنُ نَازِلُونَ غداً إِنَّ شاءَ اللَّهَ بِخَيْفِ بَنِي كِنَانَةَ - يَعْنِي الْمُحَصَّبَ - حَيْثُ قَاسَمَتْ قُرَيْشٌ عَلَى الْكُفْرِ))[١٧١٩]. واتە: جا عەقیل (واتە: کوڕەکەی ئەبوتالیب) هیچ خانویەکی بۆ هێشتوینەتەوە (دیارە: لەدوای کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموویانی فرۆشتووە) دواتر فەرمووی: ئێمە سبەی بە پشتیوانی خودا لە ناوچەی خیفی کوڕی کینانە (واتە: ناوچەی محەصب) لادەدەین ئەوجێگەیەی کە قورەیش تێیدا بڕیاری ئابلوقەی سەپاند]. [ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشای لە (البطحاء) ئەنجامداو پاشان کەمێك خەوت][١٧٢٠]. (کەواتە: ناوچەی بەتحا بەشێکە لە ناوچەی موحسەب).

دایکی بڕواداران عائیشە ﷺ دەفەرموێت: [... لەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ لایداو

(١٧١٦) انظر: (البداية) (٢٨٤/٥).

(١٧١٧) أخرجه: مسلم (١٣١٠).

(١٧١٨) أخرجه: البخاري (١٧٦٥)، ومسلم (١٣١١).

(١٧١٩) أخرجه: أحمد (٢١٨١٤) وقال محققوه: صحيح.

(١٧٢٠) أخرجه: أحمد (٦٠٦٩) وقال محققوه: حديث صحيح.

مایەوە و بەمنی فەرموو: ((حەج و عومرەکەت کۆتایی پێهێنا؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێوە هەموو حەجێك و عەمرەیەکتان ئەنجامدا؟ [فەرمووی: ((تەوافی حەجەکەت بری عەمرەکەت دەکەوێت))] [((وە تۆش وەکو ئەوان پاداشتت هەیە))] [وتم: من لەدڵی خۆمدا پێم ناخۆشە کە من نەچووم و تەوافم نەکرد سەرەتا تا ئەو کاتەی گەڕامەوە لە حەج] [ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاوڕێکانم (واتە: هاوسەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ) هەموو دەگەڕێنەوە و حەج و عومرەیان ئەنجامداوە بەڵام تەنها من عومرەم ئەنجام نەداوە] [پێغەمبەری خوایش ﷺ پیاوێکی دڵنەرم و گونجاو بوو...] [فەرمووی: ((يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ أَرْدِفْ أُخْتَكَ عَائِشَةَ [أَخْرِجْ... مِنَ الحَرَمِ] فَأَعْمِرْهَا مِنَ التَّنْعِيمِ، فَإِذَا هَبَطْتَ بِهَا مِنَ الأَكَمَةِ، فَمُرْهَا فَلْتُحْرِمْ فَإِنَّهَا عُمْرَةٌ مُتَقَبَّلَةٌ] [فَإِنِّي أَنْتَظِرُكُمَا هَاهُنَا...])) واتە: عەبدوڕەحمان عایشەی خوشکت لەدواتەوە سواری وشترەکەتی بکە بیبەرە دەرەوەی حەرەم بۆ ناوچەی (التنعيم) وە کە لە بەرزاییەکەی ئەوێوە هاتنە خوارەوە پێی بڵێ بابڕیار و نیەتی عومرەکردنی بدات چونکە عومرەیەکی قبوڵکراوە، وەمنیش لێرە چاوەڕوانی گەڕانەوەتان دەبم)).

عائیشە رضي الله عنها دەفەرموێت: ڕۆیشتین بۆ ئەوێ بڕیاری عەمرەکردنم داو وتم (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ) وە چوومە تەوافی کەعبەو سەفاو مەروەم کرد و [عومرەکەم بەجێ گەیاند] [پاشان گەڕامەوە [بۆناوچەی (الابطح) چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ چاوەڕوان بوو][١٧٢١] ئەوەش لە شەوی (الحصبة) دابوو] [کاتی پارشێو][١٧٢٢] گەیشتمەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو لە جێگەی حەوانەوەی خۆیدابوو فەرمووی: ((ئایا تەواو بوویت؟)) وتم: بەڵێ. ئینجا هاوەڵانی ئاگادارکردەوە خۆیان و کەلوپەلەکانیان کۆبکەنەوە و بجوڵێن بەرەو کەعبە] [وە لەکاتی پێش نوێژی بەیانیدا گەیشتینە لای کەعبە][١٧٢٣] ئوم سەلەمە رضي الله عنها هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای کرد و وتی: من فریای تەواف کردن نەکەوتم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (([إِذَا أُقِيمَتْ صَلَاةُ الصُّبْحِ

---

(١٧٢١) أخرجه: ابوداود (٢٠٠٥).

(١٧٢٢) أخرجه: ابوداود (٢٠٠٦).

(١٧٢٣) حديث عائشة رضي الله عنها: أخرجه: البخاري (١٥١٨،١٥٦١)، ومسلم (١٢١١/١٢٧،١٢٣)، وابوداود (١٧٨٢) وقد جمع طرق، الحديث والّف بينها الشيخ الالباني في (حجة النبي ﷺ) (ص:٩٤).

فَطُوفِي [مِنْ وراءِ] النّاسِ [وَأَنْتِ رَاكِبَةٌ] عَلَى بَعِيرِكِ وَالنَّاسُ يُصَلُّون]))[١٧٢٤]. واتە: کاتێك نوێژی بەیانی دەستی پێکرد تۆش برۆ بەسواری وشترەکەتەوە لەپشتی خەڵکەکەوە تەواف بکە)) [دەفەرموێت: ئیتر لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەپەنای کەعبەدا نوێژی بۆدەکردن و سورەتی ﴿وَالطُّورِ ۝١ وَكِتَٰبٍ مَّسْطُورٍ ۝٢﴾ (الطور)] ی بۆ دەخوێندن من لەوکاتەدا تەوافم دەکرد][١٧٢٥].

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: [خەڵکی پێشتر لەدوای تەواو بوونی حەجدا بەهەموو لایەکدا بڵاوەیان دەکرد و دەگەڕانەوە وڵاتی خۆیان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لَا يَنْفِرَنَّ أَحَدٌ حَتَّى يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ))[١٧٢٦]. واتە: هیچ کەسێك نەگەڕێتەوە تا دواهەمین کاری با تەوافیماڵئاوایی بێت لە کەعبە)) [بەڵام ڕێگەی بەو ئافرەتانەدا کە نوێژ ناکەن لەسوڕی مانگانەدان پێش تەوافکردن ئەوان بۆیان هەیە بگەڕێنەوە][١٧٢٧].

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی ماڵئاوایی بەسواری وشترەکەیەوە کرد:

جابر ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی ماڵئاوایی بەسواری وشترەکەیەوە ئەنجامدا بۆ ئەوەی خەڵکی هەموو تەماشای بکەن، وە ئەگەر پرسیاریان هەبوو بیکەن چونکە خەڵکی هەمولایەکی لێ کۆبووبوویەوە، ئافرەتێك منداڵە بچوکەکەی بەرزکردەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە حەجی بۆ هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ پاداشتەکەشی بۆ تۆیە))][١٧٢٨].

ئیبنو کەسیر ﷺ دەفەرموێت: [لەدوای ئەنجامدانی نوێژی بەیانی پێغەمبەری خوا ﷺ حەوت جار تەوافی کەعبەی کرد و لای (الملتزم) وەستاو ڕوومەت و سنگ و دەست و مەچەکی بەکەعبەوە نوساند (واتە: وەك باوەش پیاکردن) پاشان هەندێك ئاوی زەمزەمی لەگەڵ خۆی هێناو مەککەی بەجێ هێشت و لەناوچەی (کەدی) چووەدەر

---

(١٧٢٤) أخرجه: البخاري (١٦١٩،١٦٢٦).

(١٧٢٥) أخرجه: البخاري (١٦١٩)، ومسلم (١٢٧٦).

(١٧٢٦) أخرجه: البخاري (١٧٥٥) ومسلم (١٣٢٧)، وابوداود (٢٠٠٢) وابن ماجة (٣٠٧).

(١٧٢٧) انظر: (صحيح ابي داود) (١٧٤٨).

(١٧٢٨) انظر: (حجة النبي ﷺ) للشيخ الالباني (ص:٩٢).

و گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە][1729].

لەو بەرە بەیانەدا بۆ دواهەمین جار شاری مەککەی بەجێهێشت: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەفەرمویت: [پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکات لەغەزا یان لە حەج یان لە عەمرە بگەڕایەتەوە سێ جار دەیفەرموو (اللّٰه أكبرُ) پاشان دەیفەرموو: ((لاَ إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَحْدهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. آيِبُونَ تَائِبُونَ، عَابِدُونَ سَاجِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ صَدَقَ اللَّهُ وَعْدهُ، وَنَصَرَ عَبْدهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدهُ))[1730].

## ئەو ڕووداوانەی لە گەڕانەوەدا ڕوویاندا

ئیبنو کەسیر ﷺ دەفەرمویت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لەجێگەیەکی نێوان شاری مەککەو مەدینەدا لەگەڕانەوەی لەحەجیماڵئاواییدا لەناوچەیەکی نزیك لە (الجحفة) کەپێی دەوترێت (چەمی خوم) و لەوێدا پاکی و پایەبەرزی عەلی ﷺ بۆ ڕوون کردینەوە لەگەڵ دووری لەو تومەتانەی درابووە پاڵی لە یەمەن، کە عەلی ﷺ دادگەریی تێیدا ڕەچاوکردبوو بەڵام هەندێك بەچرووك و نادادپەروەریان دەزانی، بەڵام ڕاستی ودروستی لەگەڵ عەلی بوو، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنیەتی حەجکردنی بۆ موسوڵمانان ڕوونکردەوە و کۆتایی پێ هات وە گەڕایەوە بۆ مەدینە و لەو جێیەدا وتارێکی گرنگی فەرموو لە ڕۆژی هەژدەی مانگی (ذو الحجة) کە ڕۆژی یەك شەممە بوو لە ژێر درەختێکدا و لەو وتارەدا گەورەیی و دادپەروەری و ئەمانەت پارێزی عەلی ﷺ ڕوونکردەوە وە هەموو ئەو گلەیی و ڕەخنانەی لەدڵی خەڵکیدا هەبوو هەمووی ڕەواندەوە][1731].

بەسەرهاتەکەش زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرمویت: [کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجی ماڵئاوایی گەڕایەوە [لە شیوێك لای دا][1732] پێی دەوترا (غدیرخم) کە [لەنێوان مەککە و مەدینەدا] بوو لەوێدا [پێنج درەختی گەورەی

---

(١٧٢٩) انظر: (البداية والنهاية) (٥/٢٨٦).

(١٧٣٠) أخرجه: البخاري (٤١١٦).

(١٧٣١) انظر: (البداية والنهاية) (٥/٢٨٨).

(١٧٣٢) أخرجه: أحمد (فضائل الصحابة) (١٠١٧) وقال محققه: اسناده حسن لغيره.

لێبوو][١٧٣٣] فەرمانی کرد بەپاککردنەوەی ژێر درەختەکان و پاك کرانەوە [ونوێژی نیوەڕۆی ئەنجامدا][١٧٣٤] [زۆر گەرم بوو][١٧٣٥] پۆشاکێك درا بەسەر درەختەکەدا تا ببێتە سێبەر بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ][١٧٣٦] [ئەو ڕۆژە هێندە گەرم بوو ڕۆژی گەرمی بەوجۆرەمان بەسەر نەهاتبوو][١٧٣٧] پاشان [وتاری بۆ داین] [وسوپاس و ستایشی خودای کرد و ئامۆژگاری کردین و بەیادی هێناینەوە و پاشان فەرمووی: ((أَمَّا بَعْدُ، [أَلَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَنِي رَسُولُ رَبِّي فَأُجِيبَهُ، وَإِنِّي تَارِكٌ فِيكُمُ الثَّقَلَيْنِ، أَحَدُهُمَا: كِتَابُ اللَّهِ، فِيهِ الْهُدَى وَالنُّورُ،] أَحَدُهُما أَكبرُ مِنْ الآخرِ [أَوَّلُهُما: كتابَ اللّه فيهِ الهُدى وَالنور [سببه بِيد اللّه وَسببه بِأَيدكُمْ][١٧٣٨] [وَهُوَ حَبْلُ اللهِ مَنْ اتَّبِعَهُ كَانَ عَلى الهُدى وَمَنْ تَرَكَهُ كَانَ فِي ضَلالةِ] فَخُذُوا بِكِتَابِ اللهِ، وَاسْتَمْسِكُوا بِهِ] فَحَثَّ عَلَى كِتَابِ اللهِ وَرَغَّبَ فِيهِ، ثُمَّ قَالَ:][١٧٣٩] وَعترتِي وَأَهْلُ بَيْتِي [أُذَكِّرُكُمُ اللهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي] فَانْظُرُوا كَيْفَ تَخْلُفُونِي فِيهِمَا؟ فَإِنَّهُمَا لَنْ يَتَفَرَّقَا حَتَّى يَرِدَا [عَلَيَّ] الْحَوْضَ » فَقُلْتُ لِزَيْدٍ: سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا كَانَ فِي الدَّوْحَاتِ رَجُلٌ إِلَّا رَآهُ بِعَيْنِهِ وَسَمِعَ بِأُذُنِهِ ، ثم قال: [أَ لَسْتُمْ تَعْلَمُونَ إِنِّي أَولَى النّاسِ بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِم؟ قَالُوا: بَلى يَا رَسُولُ اللهِ قَالَ:][١٧٤٠] إِنَّ اللهَ مَوْلَايَ، وَأَنَا وَلِّي كُلِّ مُؤْمِنٍ)) ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِ عَلِّي فَقَالَ: «مَنْ كُنْتُ وَلِيُّهُ فَهَذَا وَلِيُّهُ، اللهُمَّ وَالِ مَنْ وَالَاهُ، وَعَادِ مَنْ عَادَاهُ [وَانْصُرْ مَنْ نَصرهُ وَاخْذُلْ مَنْ خَذُلَهُ أَحِبَّ مَنْ أَحَبَّهُ، وَأَبْغِضْ مَنْ أَبْغَضَهُ][١٧٤١])[١٧٤٢].

---

(١٧٣٣) أخرجه: الحاكم (١٠٩/٣) وصححه ووافقه الذهبي.

(١٧٣٤) أخرجه: أحمد (٢٨١/٤) وفي (فضائل الصحابة) (٦١٠١) وقال محققه: حديث صحيح.

(١٧٣٥) أخرجه: أحمد (فضائل الصحابة) (١٠١٥) وقال محققه: سنده حسن لغيره، وقال ابن كثير (البداية) (٢٩٤/٥): سنده جيّد.

(١٧٣٦) أخرجه: أحمد (فضائل الصحابة) (١٠١٧) وقال محققه: اسناده حسن.

(١٧٣٧) أخرجه: الحاكم (١٠٩/٣) وصححه على شرطهما.

(١٧٣٨) أخرجه: ابن ابي عاصم (السنة) (١٦٠٢) وقال محققه: اسناده حسن، وقال الحافظ في (المطالب) (٣٩٧٢): سنده صحيح.

(١٧٣٩) أخرجه: مسلم (٦١٧٨/٢٤٠٨).

(١٧٤٠) أخرجه: أحمد (٣٧٠/٤) وفي (فضائل الصحابة) (١١٦٧)، والنسائي (خصائص علي) (٩٣) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن حبان (٦٩٣١) وقال محققه: اسناده حسن، وقال: ابن كثير (البداية) (٢٩١/٥): سنده جيّد.

(١٧٤١) انظر: (الصحيحة) للشيخ الالباني (١٧٥٠).

(١٧٤٢) حديث زيد بن ارقم ﵁: أخرجه: أحمد (٩٥٢)، ومسلم (٢٤٠٨)، والترمذي (٣٧١٣) والنسائي الكبرى (٨٠٩٢) وفي (الخصائص) (٢١،٧٤،٩٣) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن ماجة (١١٦)، وابن حبان (٦٩٣١) وقال محققه: اسناده حسن، وابن ابي عاصم (السنة) (١٣٦٥) والبزاز (٢٥٣٨)، والطبراني (الكبير) (٤٩٦٨)، وصححه الذهبي كما في (البداية) (٢٨٠٩/٥).

واتە: ئاگاداربن ئەی خەڵکینە من مرۆڤێکم نزیکە فریشتەی (مەرگ)ی خودای خۆم بگاتەلام و وەڵامی بدەمەوە و لەگەڵی بڕۆم، من لە دوای خۆم دوو شتی قورسم بۆ جێهێشتوون] یەکێکیان لەوەی تریان گەورەترە [یەکەمیان: کتێبەکەی خودایە پڕە لە ڕووناکی و ڕێنموونی [لایەکی بەدەستی خوداوەیە وەلایەکی تریشی بەدەستی ئێوەوەیە] [ئەو قورئانە گوریسی (حەبلی) خودایە هەرکەسێك شوێنی بکەوێت لەسەر ڕێی ڕاست دەبێت و هەرکەسێکیش فەرامۆشی بکات گومڕا دەبێت] لەبەر ئەوە پابەندبن بە کتێبەکەی خوداوە وە زۆر بەچاکی دەستی پێوە بگرن] وە پاشان (ئەوی تریان)]. نەژادو بنەماڵەو خزمانی من [خوداتان بە بیردێنمەوە (واتە: لەبەر خودا پێتان دەڵێم) ئاگاتان لە بنەماڵەکەم بێت، لەبەر خودا ئاگاتان لە بنەماڵەکەم بێت، لەبەر خودا ئاگاتان لە بنەماڵەکەم بێت، تەماشا بکەن لەدوای من چۆن ئێوە لەجیاتی من ئاگاداریان دەبن (واتە بەباشی ئاگاداری هەردووکیان بن)، ئەو دوانە لەیەکتری جیانابنەوە تا بەمن [دەگەنەوە] لە سەر حەوزی کەوسەر [ئایا ئێوە نازانن کە من لە پێشترم بۆ بڕواداران لە ڕۆح و گیانی خۆیان؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئینجا فەرمووی]: ((پەروەردگارم گەورەمە و منیش گەورەی هەموو بڕوادارێکم)) پاشان دەستی عەلی ﷺ گرت و فەرمووی: ((هەرکەسێك من بە دۆستی خۆی بزانێت پێویستە عەلیش بەدۆستی خۆی بزانێت، خودایە پشتیوانی ئەو کەسە بکە کە پشتیوانی لێدەکات وە دوژمنایەتی ئەو کەسە بکە کە دوژمنایەتی دەکات [خودایە ئەوەی سەری دەخات سەری بخە وە ئەوەی سەری ناخات تۆش سەری نەخەیت، ئەوەی خۆشی دەوێت تۆش خۆشت بوێت، وە ئەوەی ڕقی لێیەتی تۆش ڕقت لێی بێت].

وە لە ڕێگەی گەڕانەوەدا بە شیوی (الازرق)دا گوزەریان کرد، لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ موسوڵمانانی ڕوونکردەوە چۆن پێغەمبەر موسا عليه السلام و یونس عليه السلام بەرەو ماڵی خودا چوون:

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: [لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووین دەگەڕاینەوە لە مەککەوە بۆ مەدینە، کاتێك گەیشتینە ناوچەی شیو و دۆڵی شینایی (الازرق) لەوێدا فەرمووی: ((ئەم شیوە کوێیە؟)) وتیان: شیوی شینایییە. فەرمووی: (([كَأَنِي]

أَنْظُرُ إِلَى مُوسَى عليه السلام يَنْعَتُ مِنْ طُولِهِ وَشَعَرِهِ وَلَوْنِهِ وَاضِعًا أُصْبُعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ [هَابِطٌ مِنَ الثَّنِيَّةِ، وَلَهُ جُؤَارٌ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ بِالتَّلْبِيَةِ] ثُمَّ نَفَذْنَا الْوَادِيَ حَتَّى أَتَيْنَا -ثَنِيَّةَ هَرْشَى، قَالَ: (أَيُّ ثَنِيَّةٍ هَذِهِ؟) فَقُلْنَا: ثَنِيَّةُ هَرْشَى. قَالَ: (([كَأَنِّي] أَنْظُرُ إِلَى يونس بن متى عليه السلام عَلَى نَاقَةٍ حَمْرَاءَ [جَعْدَةٍ]، خِطَامُ نَاقَتِهِ خُلْبَةٌ، عَلَيْهِ جُبَّةٌ مِنْ صُوفٍ يُهِلُّ نَهَارًا [ماراً] بِهَذِهِ الثَّنِيَّةِ مُلَبِّيًا))[١٧٤٣]. واتە: دەڵێیت ئێستا موسام عليه السلام لەبەرچاوە (پاشان باسی ڕەنگی قژی درێژی بۆ کردین) ئەو هەردوو پەنجەی خستۆتە هەردوو گوێی [و لەو بەرزاییەوە بەرەو خواردێت بەوتنەوەی (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ) دەنگی بەرەو لای خودا بەرزدەکاتەوە))]. پاشان ئەو ناوچەیەمان بەجێهێشت تا گەیشتینە بەرزایی هەرەشی. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەم بەرزاییە کوێیە؟)) وتمان: بەرزایی هەرەشیە، فەرمووی: (([دەڵێیت] ئێستا یونس کوڕی متام عليه السلام لەبەرچاوە [ڕوخساری چرچ ببوو لەبەساڵاچووندا] و سواری وشترێك بووە ڕەشمەی لەغاوەکەی گوریسە و جبەیەکی خوری لەبەردایە بەڕۆژی ڕووناك بەوتنەوەی (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ) [بەم] بەرزاییەدا تێپەر دەبێت))].

کاتێك موسوڵمانان گەیشتنە چیایی (جومدان) کە سەد کیلۆمەتر دوورە لەسەروو و شاری مەککەوە لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ گەورەیی یادی خودای بۆ موسوڵمانان ڕوون کردەوە: ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕێی مەککەدا دەگەڕایەوە (واتە: بەرەو مەدینە) گەیشتە لای [چیایەك ناوی جومدان بوو] فەرمووی: ((هَذِهِ جُمدانِ سِيرُوا سَبَقَ الْمُفَرِدونَ)) واتە: ئەوە جومدانە بڕۆن لێوەشاوە کەم وێنەکان پێشی هەمووانیان داوەتەوە)). وتیان: لێوەشاوە کەم وێنەکان کێن؟ فەرمووی: ((ئەوانەن کە زۆر یادی خودا دەکەن...))][١٧٤٤].

وە هەر لە ڕێگەی گەڕانەوەدا گەیشتینەوە ئەو ماڵەی کە ژنەکە منداڵە پەرکەماوییەکەی هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و دوعای بۆ بەسەردا خوێند: یەعلای کوڕی مورە رضي الله عنه دەفەرموێت: [کاتێك لەو سەفەرەدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕاینەوە و گەیشتینەوە ئەو ماڵ و کانییەی ئەو ناوچەیە [تەماشام کرد منداڵەکە لەناو منداڵەکاندا یاری دەکات و دایکەکەش دووبەران [و کەرە و

---

(١٧٤٣) أخرجه: أحمد (١٨٥٤)، ومسلم (١٦٦)، وابن ماجة (٢٨٩١)، وابن خزيمة (٢٦٣٢)، وابن حبان (٣٨٠١) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترغيب) (٨٣٦).

(١٧٤٤) أخرجه: أحمد (٩٣٣٢) وقال محققوه: سنده حسن، ومسلم (٢٦٧٦)، وابن حبان (٨٥٨).

پەنیری] بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەکردووە و هات وتی: [سوێند بەوەی ڕێزی لێناویت لەو کاتەوە ئێمەت بەجێهێشتووە پەرکەممان پێوە نەدیوە] و ئەو دەردەی بۆ نەگەڕاوەتەوە. پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((مَا مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يَعْلَمُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، إِلَّا كَفَرَةَ - أَوْ فَسَقَةَ - الْجِنِّ وَالْإِنْسِ))][1745]. واتە: هەموو شتێك دەزانێت کە من پێغەمبەری خودام جگە لەیاخی و بێ باوەڕەکانی جنۆکەو مرۆڤەکان نەبێت.

کاتێکیش گەیشتنەوە شیوی (ڕەوحا) کە حەفتاو سێ کیلۆ مەتر لە مەدینەوە دوورە، لەوێشدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی بە موسوڵمانان دا کە حەفتا پێغەمبەری خودا لێرەوە بەرەو شاری مەککە چوون بۆ حەج کردن، وە بە موسوڵمانانی فەرموو: [((لَقَدْ مَرَّ بِالصَّخْرَةِ مِنِ الرَّوْحَاءِ سَبْعُونَ نَبِيًّا حُفَاةً عَلَيْهِمُ الْعَبَاءَةُ، يَؤُمُّونَ بَيْتَ اللَّهِ الْعَتِيقَ]))[1746]. واتە: حەفتا لە پێغەمبەرانی خودا کە پێغەمبەر موسایان لەناودابووە، هەموو عەبایان لەبەردا بووە و بە پێی پەتی بەم (شیوی) ئەلرەوحائەدا بەرەو ماڵی خودا ڕۆیشتوون.

## ناردنی ئوسامەی کوڕی زەید

ئیبنو سەعد ﷺ دەفەرموێت: [فەروەی کوڕی عەمری ئەلجوزامی کە کاربەدەستێکی قەیسەری ڕۆمەکان بوو لەناوچەی مەعانی بەلقا (واتە: ئوردون) ئەو موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند... و نامەی موسوڵمان بوونی خۆی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نارد، کاتێك ئەم هەواڵە بە قەیسەر گەیشت بانگیکرد و پێی وت: بگەڕێوە سەر ئاینی گاوری یەکەم جارت تا سامان و دەسەڵاتەکەت بۆ بگەڕێتەوە؟ ئەویش لەوەڵامدا وتی: لە ئاینی موحەممەد پاشگەز نابمەوە و خۆشت دەزانیت کە عیسی ﷺ مژدەی هاتنی داوە بەڵام تۆ لەبەر سامان و دەسەڵاتەکەت بڕوای پێ ناهێنیت. دواتر قەیسەر ماوەیەك زیندانی کرد و پاشان دەری کرد و لەخاچیداو کوشتی][1747].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی

(١٧٤٥) أخرجه: أحمد (١٧٥٤٨،١٧٥٦٥) وقال محققوه: سنده ضعيف، وعبد بن حميد (١٠٥٤) وقال محققه: اسناده ضعيف، والطبراني (الكبير) (٦٧٢،٦٨٠/٢٢)، وقال الحافظ في (المطالب) (٣٨١٦): سنده حسن، وحسنه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٤٨٧، ٢٩١٨).

(١٧٤٦) أخرجه: ابويعلى (٤٢٧٥،٧٢٣١) وقال الشيخ الالباني في (صحيح الترغيب) (١١٢٨) حسن لغيره.

(١٧٤٧) أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٦٢٥/٢).

حاریسەی بەرەو شام نارد و فەرمانی پێکرد سوپاکەی تا ناوچەی بەلقاو دارەرووم لە خاکی فەلەستین پێشرەوی بکەن. ئیتر موسوڵمانان هەموو هەتا گەورە پیاوانی موهاجیرەکان خۆیان بۆ ئەو دەرچوونە ئامادەکرد.

ئیبنو هیشام ﷺ دەفەرموێت: ئەوەش دواهەمین سوپابوو کە پێغەمبەری خودا ﷺ ناردی لە ژیانیدا[١٧٤٨]. بەڵام دوای دوو رۆژ لە دەرچونی ئەم فەرمانە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش کەوت و سوپاکەش لەناوچەی جورف کە شەش کیلۆمەتر لەمەدینەوە دووره مانەوە تا لەتەندروستی پێغەمبەری خوا ﷺ دڵنیابن.

## وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ

وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ و نیشانەکانی خوا حافیزی چەندەها ئایەتی پیرۆز دابەزیی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی سەفەرکردن و کۆچ کردنی پێغەمبەری خوای ﷺ تێدابوو لە دونیادا:

خوای گەورە دە فەرمویێت: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ (الزمر) واتە: (تۆ دەمریت و ئەوانیش دەمرن). وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ الْخُلْدَ ۖ أَفَإِن مِّتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾(الأنبياء) واتە: (مانەوەی هەتا هەتاییمان بە هیچ مرۆڤێك نەبەخشیوە لە پێش تۆدا یا ئایا ئەگەر تۆ مردیت ئەوان بۆ هەتا هەتایی دەمێننەوە)؟

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ ۚ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا ۗ وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ (آل عمران) واتە: (موحەممەد تەنها پێغەمبەرێکە و پێغەمبەرانیش لە پێش ئەو هەبوون، گەر بمرێت یان بکوژرێت ئێوە پاشگەز دەبنەوە؟ وە هەر کەسێکیش بەو جۆرە بکات هیچ زیانێك بە خودا ناگەیەنێت وە خوداش پاداشتی سوپاسکاران دەداتەوە).

کاتێك سورەتی النصر دابەزی کە دەفەرموێت: ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ ﴿١﴾ وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا ﴿٢﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ ۚ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا ﴿٣﴾ ﴾

(١٧٤٨) أخرجه: ابن هيشام (السيرة) (٢١٥/١).

(النصر) ئیبنو عەباس دەفەرموێت: لەم سورەتەدا خودا پێغەمبەرەکەی ئاگادار دەکاتەوە لە نزیکبوونەوەی کۆچ و ماڵئاوایی لە دنیا ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١﴾ واتە: گەر مەککە ئازاد کرا [وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ] ئەوەش نیشانەی وەفاتکردن و مردنە][١٧٤٩].

پێش تریش پێغەمبەری خوا ﷺ لە خواحافیزی کردنی لە موعاز ﵁ پێی فەرموو: ((يَا مُعَاذُ إِنَّكَ عَسَى أَنْ لَا تَلْقَانِي بَعْدَ عَامِي هَذَا (و) لَعَلَّكَ أَنْ تَمُرَّ بِمَسْجِدِي هَذَا، وَقَبْرِي))[١٧٥٠] واتە: ((ئەی موعاز پێدەچێت لەم ساڵ بەدواوە جارێکی تر بە من نەگەیت وە پێ دەچێت بەلای مزگەوتەکەم و گۆڕەکەمدا تێپەری][١٧٥١].

وە هەر لە حەجی ماڵئاواییدا ماڵئاوایی لە موسوڵمانان و هاوەڵانی کرد و فەرمووی: ((أَيُّهَا النَّاسُ، اسْمَعُوا قَوْلِي، فَإِنِّي لَا أَدْرِي لَعَلِّي لَا أَلْقَاكُمْ بَعْدَ عَامِي هَذَا بِهَذَا الْمَوْقِفِ أَبداً.....))[١٧٥٢]. واتە: ئەی خەڵکینە گوێ بگرن بۆ قسەکانم، چونکە من نازانم پێ دەچێت لەم ساڵ بەدواوە من بە ئێوە نەگەمەوە لەم جێ وەستانەدا بۆ هەتا هەتایی...].

وە لە ئێوارەی عەرەفەدا ئەو ئایەتە پیرۆزە دابەزی: ﴿...ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣﴾ (المائدة) واتە: (وا لە ئەمڕۆوە بەرنامەو ئایینەکەتانم بەپایان گەیاند، هەموو شتێکم بۆ تەواوکردن وە نیعمەت و بەخششی خۆمم بۆ تەواوکردن، سەرم خستن بەسەر دوژمنانتانا و ڕێنماییم کردن بۆ ڕێگەی ڕاست، ئیتر نەپێویستتان بە پێغەمبەری تر هەیە و نەقورئانێکی دیکە، ئیسلامیشم بەبەرنامەو ئایین بۆ هەڵبژاردن) کاتێك ئەبو بەکر ﵁ ئەم ئایەتەی بیست گریا. عومەر ﵁ پێی فەرموو: بۆچی دەگریت؟ فەرمووی: لە دوای تەواو بوون هەردەم کەم و کورتی دەبێت][١٧٥٣].

---

(١٧٤٩) أخرجه: أحمد (٣١٢٧) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط اليشيخين.

(١٧٥٠) أخرجه: أحمد (٢١٧/٤)، وصححه الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (١١٢٠)، وفي حديث اخر قال الرسول a: ((والذي نفسي بيده ليأتين على احدكم يومٌ لايراني ثم لأن يراني احب اليه من اهله وماله معهم)) أخرجه: مسلم (٢٣٦٤).

(١٧٥١) أخرجه: أحمد (٢٣٥/٥) والبخاري (٥٩٩٠) ومسلم (٢١٥) وانظر: (الصحيحة) (٢٤٩٧).

(١٧٥٢) أخرجه: مسلم (١٢١٨) وابوداود (١٩٠٥) وابن ماجة (٣٠٧٤) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٦٧٦) و (صحيح ابن ماجة) (٢٤٩٧).

(١٧٥٣) أخرجه: الطبري (التفسير) (١١٠٨٣) وابن كثير (التفسير) (٣١٥/٣) وقال محققه: سنده ضعيف.

هەر لە ڕێگەی گەڕانەوەدا لە ناوچەی (غدير خم) واتە: (جۆگەی خوم) ئامۆژگاری کردن و بەئاگای هێنانەوە وە فەرمووی: ((أَمَّا بَعْدُ، أَلَا أَيُّهَا النَّاسُ فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ رَسُولُ رَبِّي فَأُجِيبَ.....))[1754]. واتە: ئەی خەڵکینە من مرۆڤێکم نزیکە نێردراوی خودا (واتە: فریشتەی گیان کێشان) بگاتە لام و بڕۆم...)).

حافز ئیبنو حەجەر ﷬ دەفەرموێت: [لە نێوان گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاوایی و گەڕانەوەی بۆ مەدینە ماوەی دوو مانگ و بیست ڕۆژ بوو][1755]. وە تێکڕای هاوەڵانی ئاگادارکردەوە کە مەرگی ئەو لە پێش هەمووانەوەیە: و فەرمووی: ((تَزْعُمُونَ أَنِّي مِنْ آخِرِكُمْ وَفَاةً، إِنِّي مِنْ أَوَّلِكُمْ وَفَاةً، وَتَتْبَعُونَ أَفْنَادًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ))[1756]. واتە: ئێوە وا دەزانن کە من لە دوای هەمووتانەوە دەمرم، نا من لە پێش هەمووتانەوە دەمرم وە ئێوەش کۆمەڵ بە کۆمەڵ بەدوامدا دێن. وە ئامۆژگاری کردن و فەرمووی: ((إِنِّي لَا أَرَى بَقَائِي فِيكُمْ إِلَّا قَلِيلًا، فَاقْتَدُوا بِالَّذِينَ مِنْ بَعْدِي - وَأَشَارَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ - وَاهْتَدُوا بِهَدْيِ عَمَّارٍ، وَمَا حَدَّثَكُمُ ابْنُ مَسْعُودٍ فَاقْبَلُوهُ))[1757] واتە: من وادەبینم مانەوەم لە ناوتاندا کەمێکی ماوە، ئێوە لە دوای من با ئەو دوانە ببنە سەرمەشقتان و ڕەفتارتان وەکو ئەوان بێت. پەنجەی ڕاکێشا بۆ ئەبوبەکر و عومەر، وە شوێنی ڕێنماییەکانی عەممار بکەون و ئیبنو مەسعودیش هەرچی بۆ باسکردن لێی وەرگرن)).

ئیمامی عەلی ﷛ دەفەرموێت: [وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای تۆ کێ بکەینە پێشەوامان؟ فەرمووی: ((گەر ئەبوبەکر بکەنە پێشەواتان دەبینن کەسێکی متمانە پێکراو و دونیا نەویست و قیامەت ویستە، وە گەر عومەریش بکەنە پێشەواتان دە بینن متمانە پێکراوێکی بە هێزە وە لە پێناوی فەرمانەکانی خوادا لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێت، وە گەر عەلیش بکەنە پێشەواتان [هەرچەندە کاری وەهاش

(١٧٥٤) أخرجه: مسلم (٢٤٠٨)، والترمذي (٣٧١٣) والنسائي (الكبرى) (٨٠٩٢) وانظر: (الصحيحة) (٣٥٦/٤) و (صحيح الجامع) (١٣٥٣).

(١٧٥٥) انظر: (فتح الباري) (١١٩/١).

(١٧٥٦) أخرجه: أحمد (١٠٦/٤)، وابويعلى (٣٥٠/١) (٢٧٧٩) وابن حبان (٦٦٤٦) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، وصححه البوصيري (الاتحاف) (٢٧٧٩) صححه ايضاً الشيخ الالباني في (صحيح الجامع) (٩٤) والشيخ مقبل في (الصحح المسند) (١٢١١).

(١٧٥٧) أخرجه: أحمد (٣٣٤/٢) والترمذي (٣٦٣٣) وابن حبان (٦٩٠٢) وقال محققه: حديث صحيح.

ناکەن بەڵام ئەو کەسێکی ڕێنموێنی کراوە و ڕێنمونی کارە و بەڕێگەی ڕاستدا دەتان بات][١٧٥٨].

ئیبنو عومەر ﷺ وە جابر ﷺ دەفەرموون: (پێغەمبەری خوا ﷺ [پێش مانگێك] لە کۆتایی ژیانیدا نوێژی عیشای بۆ دەکردین و لە دوای سەلام دانەوە هەستاو فەرمووی: ((أَرَأَيْتَكُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذِهِ، فَإِنَّ رَأْسَ مِائَةِ سَنَةٍ مِنْهَا لَا يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ الْيَوْمَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ أَحَدٌ))[١٧٥٩] واتە: ئەم شەوتان دەبینن، سەری سەد ساڵیتر دێت و هەموو ئەوانەی لەسەر زەویدان هیچیان لە ژیاندا نامێنن.

عیربازی کوڕی ساریە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی بۆ کردین پاشان ڕووی تێکردین][١٧٦٠] و هەستاو... ئامۆژگاریەکی زۆر کاریگەری کردین، بە هۆیەوە دڵمان ترسا و چاومان فرمێسکی ڕژاند، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریەکی ماڵئاوایانەت لێکردین و پەیمانی خۆتمان لێوەرگرە، فەرمووی: ((عَلَيْكُمْ بِتَقْوَى اللَّهِ، وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، [تَأمر عَلَيْكُمْ] وَإِنْ عَبْدًا حَبَشِيًّا، وَسَتَرَوْنَ مِنْ بَعْدِي اخْتِلَافًا شَدِيدًا، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي، وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْأُمُورَ الْمُحْدَثَاتِ، فَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ))[١٧٦١] فەرمووی: ملکەچ و فەرمانبەرداری خودابن و گوێگرو گوێڕایەڵی پێشەواکانتانبن [هەرچەندە کۆیلەیەکی] حەبەشیش بێت، لە دوای من جیاوازییەکی زۆر توند دەبینن، هەموو دەستگرن بە سونەتەکانی من و سونەتەکانی جێنشینە ڕێنمایکرا و هیدایەتدراوەکانی دوای من و بە ددانەکانتان توند ڕێبازەکانیان بگرن و بەری نەدەن و وریابن و خۆتان دوور بگرن لە داهێنراوەکان چونکە هەموو داهێنراوێك گومڕاییە).

---

(١٧٥٨) أخرجه: أحمد (١٠٨/١) وفي (الفضائل) (٢٨٤): وقال محققه: اسناده حسن، وفي (كتاب والسنة) (١٢٥٧) وقال محققه: اسناده حسن، والبزار (١٥٧١) وقال الحافظ في (الاصابة) (٥٦٨٨): سنده جيّد.

(١٧٥٩) أخرجه: البخاري (١١٦) ومسلم (٢٥٣٧).

(١٧٦٠) أخرجه: ابن ماجة (٤٤)، وصححه الشيخ الالباني في (ظلال الجنة) (٣٢).

(١٧٦١) أخرجه: ابوداود (٤٦٠٧) والترمذي (٢٦٧٦) وابن ماجة (٤٢)، والحاكم (٩٥/١) وصححه ووافقه الذهبي وابن حبان (٥) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه البزار (التمهيد) (٢٢٢/١) و (جامع بيان العلم) (٢٢٣/٢)، وصححه كل من: ابن تيمية (الفتاوى) (٣٠٩/٢٠) وابن عساكر (الاربعين البلدانية) (ص:١٢) والبغوي (شرح السنة) (٢٠٥/١) والضياء المقدسي (اتباع السنن) (ص:٣٢)، والشيخ الالباني في (المشكاة) (١٦٥) و (صحيح الجامع) (٢٥٤٩) و (الصحيحة) (٩٣٧) و (صحيح ابن ماجة) (٤٠) و (الارواء) (٢٤٥٥) وصححه ايضاً الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (٩٣٨).

هەروەها پێی فەرموون: ((قَدْ تَرَكْتُكُمْ عَلَى الْبَيْضَاءِ لَيْلُهَا كَنَهَارِهَا لَا يَزِيغُ عَنْهَا بَعْدِي إِلَّا هَالِكٌ، وَمَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ، فَسَيَرَى اخْتِلَافًا كَثِيرًا، فَعَلَيْكُمْ بِمَا عَرَفْتُمْ مِنْ سُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، وَعَلَيْكُمْ بِالطَّاعَةِ، وَإِنْ عَبْدًا حَبَشِيًّا عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، فَإِنَّمَا الْمُؤْمِنُ كَالْجَمَلِ الْأَنِفِ حَيْثُمَا انْقِيدَ انْقَادَ))[١٧٦٢] واتە: ئێوەم جێهێشتووە لە سەر ڕێگەو ڕێبازێکی سپی و ڕووناك شەوی وەك ڕۆژە مەگەر کەسێکی لەناوچوو لێی لابدات، هەر کەسێك لە ئێوە بژی (واتە: لەدوای من) جیاوازییەکی زۆر دەبینێت، ئێوە ئەو ڕێبازە بگرن کە زانیوتانە لە سونەتەکانی من و سونەتەکانی جێنشینە ڕێنموییکراو و هیدایەتدراوەکان لە دوای من وە گوێڕایەڵبن (بۆ پێشەواکانتان) گەر کۆیلەیەکی حەبەشیش بێت، چونکە بڕوادار وەك وشتری دەستەمۆیە بۆ هەر جێگەیەك ببرێت دەچێت].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەردانی گۆڕستانی بەقیع و فەرمووی: ((السَّلَامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَاحِقُونَ ، اللَّهُمَّ وَدِدْتُ أَنَّا قَدْ رَأَيْنَا إِخْوَانَنَا ، قَالُوا: أَوَلَسْنَا إِخْوَانَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ ، قَالَ: بَلْ أَنْتُمْ أَصْحَابِي وَإِخْوَانُنَا الَّذِينَ لَمْ يَأْتُوا بَعْدُ.....))[١٧٦٣] واتە: سەلام و عەلەیکم هەوارگەی کەسانی بڕواداران وە ئێمەش بە ویستی خودا دەگەینەوە پێتان. خۆزگە دەخوازم من برایانم ببینیایە)) وتیان: ئەی ئێمە برای تۆ نین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((ئێوە هاوەڵانی منن، برایانمان ئەوانەن کە هێشتا نەهاتوون...)). دایکی بڕواداران عائیشە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ پێش وەفاتی زۆر جار ئەمەی دووبارە دەکردەوە: ((سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ زۆر ئەم دوعایە دووبارە دەکەیتەوە وە پێشتر ئەمەت نەدەکرد؟ فەرمووی: (إِنَّ رَبِّي جَلَّ وَعَلَا أَخْبَرَنِي أَنَّهُ سَيُرِينِي عِلْمًا فِي أُمَّتِي، فَأَمَرَنِي إِذَا رَأَيْتُ ذَلِكَ الْعِلْمَ أَنْ أُسَبِّحَهُ، وَأَحْمَدَهُ، وَأَسْتَغْفِرَهُ، وَإِنِّي قَدْ رَأَيْتُهُ ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ۝١﴾ ، فَتْحُ مَكَّةَ))[١٧٦٤]. واتە: خودای بەرزو شکۆداری من پێی ڕاگەیاندم ئەو نیشانەیەکم لە ئومەتەکەم پیشان دەدات و پێی ڕاگەیاندم گەر ئەوەم بینی سوپاسی بکەم و ستایشی بکەم وە داوای لێخۆش بوونی لێبکەم منیش ئەو نیشانەیەم دی کە:﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ۝١﴾ (النصر) واتە: ڕزگارکردنی مەککە.

---

(١٧٦٢) أخرجه: ابن ماجة (٤٣) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٤١).

(١٧٦٣) أخرجه: مسلم (٢٤٩).

(١٧٦٤) أخرجه: مسلم (٤٨٤، ٢٤٩) وابن حبان (٦٤٨١).

ئیبنو عەباس ﵁ دەفەرموێت: [کاتێك ئەم سورەتە دابەزی: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١﴾(النصر) پێغەمبەری خوا ﷺ فاتمەی کچی بانگکرد و پێی فەرموو: ((قَدْ نُعِيتُ إلى نَفْسِ)) واتە: (هەواڵی مەرگی خۆمم پێدرا][1765]. ئیبنو عەباس ﵁ دەفەرموێت: [لە دوای دابەزینی سورەتی: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١﴾ (النصر) ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی بە نزیکبوونەوەی وەفاتی کرد وە زۆر زیاتر چالاك بوو بۆ ئەنجامدانی چاکەکان....][1766].

ئەبو هورەیرە ﵁ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ساڵێك دە رۆژ دەمایەوە لە مزگەوت بۆ عیبادەت بەڵام لە ساڵی کۆتایی تەمەنیدا بیست رۆژ مایەوە، وە لە رەمەزانی هەموو ساڵێکدا یەك جار قورئانی پێ دەور دەکرایەوە بەڵام لەو ساڵەدا کە وەفاتی کرد دووجار دەوری کردەوە][1767].

دایکی بڕواداران حەفصە ﵂ دەفەرموێت: [هەرگیز من نەمبینی بوو پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژە سونەتەکانی بە دانیشتنەوە ئەنجام بدات بەڵام یەك ساڵ پێش وەفاتی بە دانیشتنەوە نوێژە سونەتەکانی دەکرد وە قورئانی زۆر بە هێواشی تێدا دەخوێند هەتا سورەتەکە زۆر لەخۆی زیاتر درێژتری دەکردەوە][1768].

وە پێغەمبەری خواش ﷺ دەیفەرموو: ((سَيُعَزِّي النَّاسُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا مِنْ بَعْدِي لِلتَّعْزِيَةِ بِي)). فَكَانَ النَّاسُ يَقُولُونَ: مَا هَذَا؟، فَلَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَقِيَ النَّاسُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا، يُعَزِّي بَعْضُهُمْ بَعْضًا بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ)) [1769] واتە: [خەڵکی لە دوای مردنی من هەندێکیان سەرە خۆشی لە یەکتر دەکەن. خەڵکی وتیان: ئەمە مانای چییە؟ بەڵام کاتێك پێغەمبەری

---

(١٧٦٥) أخرجه: أحمد (١٨٧٣) وقال محققوه: اسناده ضعيف، والدارمي (٨٠) وقال محققه: اسناده صحيح، والطبراني (الكبير) (١١٩٠٧)، و (الاوسط) (٢٨٧،٨٨٧) والبيهقي (الدلائل) (٣١٠٧) وقال محققه: اسناده حسن.

(١٧٦٦) أخرجه: الطبري (٢١٥/٣٠) والطبراني (الكبير) (١١٩٠٣)، والنسائي (التفسير) (٧٣٢) وقال محققه: صحيح اسناده حسن.

(١٧٦٧) أخرجه: البخاري (٤٩٩٨،١٩٠٢)، ومسلم (٢٣٠٧١). و (صحيح ابي داود) (٢١٢٦)، قال انس ﵁ (ان الله تعالى تابع على رسول ﷺ الوحي قبل وفاته حتى توفاه اكثر ماكان الوحي ثم توفي رسول الله ﷺ بعد)): أخرجه: البخاري (٤٩٨٢)

(١٧٦٨) أخرجه: مسلم (١٨/٧٣٣) وأحمد (٢٦٤٤٢) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٧٦٩) أخرجه: ابن ابي شيبة (١٢٥/١٢) واسناده حسن كما قال الحافظ في (المطالب) (٤٣٢٦) والبويصري (الاتحاف) (٢٧١٩).

خوا ﷺ وەفاتی کرد خەڵکی کە بە یەك دەگەیشتن هەندێکیان بە هۆی وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەخۆشیان لە یەکتر دەکرد].

عەباسی مامی پێغەمبەری خوا ﷺ خەوێکی بینی دەفەرموێت: [لە خەومدا بینیم زەوی بە چەندەها گوریسی بەهێز بەرز دەکرایەوە بەرەو ئاسمان، ئەوەم گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ذَاكَ وَفَاةُ ابْنِ أَخِيكَ)))[١٧٧٠]. واتە: ئەوە کاتی نزیك بوونەوەی وەفاتی برازاکەتە.

دایکی بڕواداران عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [خەوێکم بینی و بۆ ئەبوبەکرم ﵁ گێڕایەوە، لە خەومدا بینیم: سێ مانگ لە ئاسمانەوە هاتنە باوەشم. ئەبوبەکر ﵁ فەرمووی: گەر خەوەکەت ڕاست بێت چاکترین سێ کەسی ناو خەڵکی زەوی لە ژوورەکەتدا دەنێژرێت...]. ئەوە بوو دواتر پێغەمبەری خوای ﷺ تێدا نێژرا][١٧٧١].

عەباسی مامی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیارێکی تاقیکردنەوەی کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ تا بزانێ تاچەند ماوەی ماوە لە دونیادا و دەفەرموێت: [وتم: دەبێت بزانم ماوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەناوماندا چەندی ماوە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ [دەبینم موسوڵمانان خۆیان و تەپوتۆزیان ئازاریان داویت، ئەی بۆ کەپرێك ساز ناکەیت] تا [لەوێ وە قسەیان لەگەڵ بکەیت] تا تەپوتۆزیان وە دەمەقاڵەیان لێت دوور بێت؟ فەرمووی:((لا إِزالَ بَيْنَ أَظْهُرِهِمْ وَاللَّهِ لَأَدَعَنَّهُمْ ينازعوني رِدَائِي، وَيَطَئُونَ عَقِبِي، وَيَغْشَانِي غُبَارُهُمْ، حَتَّى يكون الله تعالى هُوَ الَّذِي يُرِيحُنِي مِنْهُمْ). قَالَ: فَعَلِمْتُ أَنَّ بَقَاءهُ فِينَا قَلِيلٌ، .....)[١٧٧٢]. واتە: بەردەوام من لە ناویان دەبم، سوێند بە خوا لێیان دەگەڕێم عەباکەم ڕاکێشن و بەدەورمدا بێن و تەپوتۆزیان بە ڕوومدا بێت تا خوای گەورە دەم حەوێنێتەوە لێیان)). ئیتر منیش ئەو کاتە زانیم مانەوەی لە ناوماندا کەمێکی ماوە....].

---

(١٧٧٠) أخرجه: البزار (٨٤٤) وقال الهيثمي (المجمع) (٢٣/٩): رواه البزار والطبراني ورجالهما ثقات.

(١٧٧١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٢٧/٢٣) والحاكم (٦٢/٣) رقم رقم (٤٤٥٦،٤٤٥٨) وقال محققه: اسناده صحيح. والبيهقي (الدلائل) رقم (٣٢٩٩) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٧٧٢) أخرجه: عبدالرزاق (٩٧٥٤)، وابن ابي شيبة (٢٥٦/١٣) والبزار (٢٤٦٧)، والدارمي (المسند) (٧٦)، وقال صاحب (زوائد عبدالرزاق) (١٠/١٠١): يتقوى بشاهده، وقال محقق (الدارمي) (٢١٤/١٠): أخرجه: البزار باسناد صحيح، وصحح اسناده ايضاً كل من: الحافظ (المطالب) (٤٣٢٢) والبوصيري (الاتحاف) (٢٧٧٠).

پێغەمبەری خوا ﷺ خەوێکی بینی و بەهۆیەوە پێنەکەنی تا وەفاتی کرد، دەفەرموێت: ((إِنِّي أُرِيتُ فِي مَنَامِي كَأَنَّ بَنِي الْحَكَمِ بْنِ أَبِي الْعَاصِ يَنْزُونَ عَلَى مِنْبَرِي كَمَا تَنْزُو الْقِرَدَةُ)) قَالَ كَعب: (فَمَا رُئِيَ النَّبِيُّ ﷺ مُسْتَجْمِعًا ضَاحِكًا حَتَّى تُوُفِّيَ)(١٧٧٣). واتە: (لە خەومدا بینیم تیرەی بەنولحەکەمی کوڕی ئەبو عاص وەك مەیمون باز بازێنیان دەکرد بەسەر مینبەرەکەمەوە] کەعب ﷺ دەفەرموێت: (ئیتر لە دوای ئەوەوە ڕووی نەداوە و هەرگیز نەبینرا پێغەمبەری خوا ﷺ بەتەواوی پێبکەنێت].

ڕۆژێك لەو ماوەیەدا چوو نوێژی لەسەر شەهیدەکانی ئوحود کرد وەك خواحافیزی و ماڵئاوایی، عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ دەفەرموێت: [ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ چوو نوێژی مردووی لەسەر شەهیدەکانی ئوحود کرد وەك ماڵئاواییەك، پاشان هاتە سەر مینبەر وە فەرمووی: ((إِنِّي فَرَطٌ لَكُمْ، وَأَنَا شَهِيدٌ عَلَيْكُمْ، وَإِنِّي وَاللَّهِ لَأَنْظُرُ إِلَى حَوْضِي الآنَ، [وَإِنْ عرضَهُ كَما بَيْنَ إيلةَ إلى الجُحْفَةِ] وَإِنِّي أُعْطِيتُ مَفَاتِيحَ خَزَائِنِ الأَرْضِ، أَوْ مَفَاتِيحَ الأَرْضِ، وَإِنِّي وَاللَّهِ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تُشْرِكُوا بَعْدِي، وَلَكِنْ أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنَافَسُوا فِيهَا [وَتَقْتَتِلُوا فَتُهْلَكُوا كَمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ]))(١٧٧٤). واتە: من پێشتان دەکەوم وە من شایەتم لەسەرتان وە من سوێند بەخودا ئێستا تەماشای حەوزەکەم دەکەم [پانتاییەکەی وەك نێوان ناوچەی ئیلە بۆ ناوچەی جوحفەیە] وە من کلیلی گەنجینەکانی خەزێنەکانی زەویم پێدراوە، وە سوێند بە خوا من ناترسم هاوتا بۆ خودا دابنێن لە دوای من بەڵکو دەترسم ئێوە ململانی لەسەر دونیا بکەن [و یەکتری لەسەر بکوژن وە بە هۆیەوە لە ناوبچن وەك ئەوانەی پێش ئێوە لە ناو چوون].

پێش یەك ڕۆژ لە نەخۆشییەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرا تا بچێت بپاڕێتەوە وە داوای لێخۆشبوون بکات بۆ ئەوانەی لە گۆڕستانی بەقیعدان: ئەبو موەیهبە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لە نیوەی شەودا ناردی بە دوامدا و چوومە خزمەتی و فەرمووی: ((ئەی ئەبو موەیهیبە فەرمانم پێ کراوە بڕۆم داوای لێخۆش بوون بکەم بۆ (مردوانی گۆڕستانی) بەقیع بابەیەکەوە بڕۆین)). منیش لە خزمەتیدا ڕۆیشتم [لە نیوەی شەودا] تا چووە ناوەڕاستی گۆڕستانەکەو فەرمووی:

(١٧٧٣) أخرجه: الحاكم (٤٨٠/٤) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي وايّدهما الشيخ الالباني يرحمه الله في (الصحيحة) (٣٩٤٠).

(١٧٧٤) أخرجه: البخاري (٣٣٤٤،٦٥٩٠) ومسلم (٢٢٩٦).

((السَّلَامُ عَلَيْكُمْ [يَا أَهْلَ الْبَقِيعِ] لِيهنِيءْ لَكُمْ مَا أَصْبَحْتُمْ فِيهِ مِما أَصْبَحَ النّاسُ فِيهِ [لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَنْجَاكُمُ اللَّهُ مِنْهُ] أَقْبَلَتِ الْفِتَنُ كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ يَتْبَعُ أَوَّلُهَا خِرَهَا، الآخرة شرٌّ مِنْ الآولى)).

واتە: سڵاوتان لێبێت ئەی [خەڵکی] بەقیع، پیرۆزتان بێت ئەوەی کە ئێستا تیایدا دەژین (بەراورد بەوەی هێشتا زیندوان تێیدا دەژین) [گەر دەزانن خودا ئێوەی لەچی ڕزگارکردووە] ئاژاوە و [تاقیکردنەوەی گران)ی وا کەدێت وەك پارچە شەوی تاریك دواهەمینیان بە دوای یەکەمیندا دەڕوات وە دواهەمینیان خراپترە لە یەکەمینیان] پاشان ڕووی کردە من و فەرمووی: ((ئەی ئەبو مومیهیبە من سەر پشك کرام لە نێوان کلیلی خەزێنەکانی دونیا و مانەوەی هەتا هەتایم و پاشان بەهەشت وە لە نێوان گەیشتنەوەم بە خودای خۆم و بەهەشت)). منیش وتم: بە باوك و دایکمەوە فیدات بم کلیلی خەزێنەکانی دونیا و مانەوە تێیدا بە هەتا هەتایی و پاشان بەهەشت، تۆ ئەوەیانت هەڵبژاردایە! فەرمووی: ((نا سوێند بە خوا ئەی ئەبومویهیبە من گەیشتنەوەم بە خودا و بە بەهەشتم هەڵبژارد)) پاشان داوای لێخۆش بوونی کرد بۆ خەڵکی بەقیع دواتر ڕۆیشتین [کاتێك ڕۆژ بووەوە] پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو نەخۆشیەی دەستپێکرد کە بە هۆیەوە خودا بردیەوە بۆ لای خۆی][١٧٧٥].

## سەرەتای نەخۆشیەکەی

لە ڕۆژی شەممەی بیست و دووی مانگی سەفەر، یەکەم ڕۆژی نەخۆشییەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستیپێکرد[١٧٧٦]. دایکی بڕواداران عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ پێشتر گەر بە بەردەمی ماڵەکەمدا بڕۆیشتایە وشەیەکی پێ دەوتم [کە جێی دڵخۆشیم دەبوو] وە خودا دەیکردە سوود بۆم، ڕۆژێك بە بەردەم ماڵەکەمدا ڕۆیشت و هیچی نەفەرموو بۆ جاری دووەمیش هەروەها وە بۆ جاری سێیەمیش هەروەها. بە خزمەتکارەکەم وت: نزیك لە دەرگاکە لە ناو ماڵەوە جێگەیەکم بۆ داخەو سەرم پێچا (لە ژانە سەردا) [لەسەر ئەو جێیەم خەوم

(١٧٧٥) أخرجه: أحمد (٤٨٩/٣)، والدارمي (٧٩) وقال محققه: اسناده جيد، والحاكم (٥٦/٣) رقم (٤٣٨٣) وصححه ووافقه الذهبي، والطبراني (الكبير) (٨٧١،٨٧٢/٢٢)، والنسائي (٦٣/٤) والبيهقي (الدلائل) (٣١٥١) وقال محققه: اسناده حسن، وكذا قال ايضاً صاحب (السيرة في مصادرها الاصلية) (ص:٦٨٧).

(١٧٧٦) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣٢٤٤)، وصحح اسناده كلًا من الحافظ في (الفتح) (١٦٣/٨) والسيوطي (تدريب الراوي) (٣٥٢/٢).

لێکەوت][1777].

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای ناشتنی تەرمێك لە بەقیع گەڕایەوە و هاتە ناو ماڵ و تەماشای کردم سەرم دەیەشا و دەم وت: ئای لە ئازاری سەرم [فەرمووی: ((عائیشە گرفتت چییە؟)) وتم: سەرم دێشێ] فەرمووی: [: ((بەڵکو عائیشە سوێند بەخوا من سەرم زۆر دێشێت] بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چ زیانێکت پێ دەگات گەر پێش من بمریت من دەت شۆم و نوێژت لە سەر دەکەم و دەت نێژم [و دوعات بۆ دەکەم و داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم]))[1778]. منیش وتم: [ئەی ڕۆڵەڕۆ سوێند بە خوا گومانم وە هایە کە تۆ مردنی منت پێ خۆشە] ئەڵێی لە بەرچاومە سوێند بە خوا گەڕواش بکەیت دەگەڕێیتەوە ماڵەکەم وە لەگەڵ هەندێك لە هاوسەرەکانت دەبیت. پێغەمبەری خواش ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: [((بەڵام من بەڕاستی سەرم ژان دەکات دەمەوێت بنێرم بە دوای ئەبوبەکر و کوڕەکەیدا و بیکەمە جێ نشینی خۆم نەوەك کەسانێك قسەڵۆکی جیاواز بڵێن و ئاواتخوازەکانیش ئاواتی بۆ بخوازن] ئیتر ئازاری نەخۆشییەکەی دەستیپێکرد][1779]. [و هەر بەنۆبە هەرجارەی لای یەکێك لە هاوسەرەکانی دەمایەوە، نەخۆشیەکەی زۆرگران بوو کاتێك لە ماڵی مەیمونە دابوو بۆیە هاوسەرەکانی بانگ کرد][1780] [و پرسیاری لێدەکردن: ((ئایا بەیانی من لە کوێ دەبم، ئایا بەیانی من لە کوێ دەبم؟)) ئەوانیش مەبەستەکەی تێگەیشتن][1781] [داوای لێکردن ڕێگەی بدەن لە ماوەی نەخۆشییەکەیدا لە ماڵی من بمێنێتەوە] [و ئەوانیش هەموو لەوێ سەردانی بکەن] لە گێڕانەوەیەکی تردا: [...لەوە بە دواوە چەند ڕۆژێکی کەمی نەبرد [چوار کەس] بەدەستە بەرە لە پۆشاکەکەیدا هێنایانە ماڵەکەی من، و ئینجا داوای هاوسەرەکانی کرد [کاتێك هەموویان هاتن] فەرمووی: ((من نەخۆش کەوتووم و ناتوانم بەسەرتاندا بگەڕێم بۆیە هەمووتان ڕێگەم بدەن تا لای عائیشە بمێنمەوە)). [هەموو وتیان بەڵێ باشە][1782].

---

(١٧٧٧) أخرجه: أحمد (٢٥٨٤٠) وقال محققوه: اسناده حسن.

(١٧٧٨) أخرجه: البخاري (٧٢١٧) ومسلم (٣٢٨٧).

(١٧٧٩) أخرجه: البخاري (٥٦٦٦) وأحمد (٥٣/٦)، وابن ماجة (١٣١٠)، وابن هشام (٦٤٢/٢) واسناده صحيح كما في (صحيح السيرة) (٨٦٨)، والنسائي (الكبرى) (٧٠٤٢، ٧٠٤٣).

(١٧٨٠) أخرجه: البخاري (٧٢١٧،٥٦٦٦) ومسلم (٣٢٨٧).

(١٧٨١) أخرجه: البخاري (٤٤٣٩،٤٤٤٢،٦٦٦٤) ومسلم (٩١/٤١٨).

(١٧٨٢) أخرجه: أحمد (٢٥٨٤٠) وقال محققوه: اسناده حسن، وابوداود (٢١٣٧) وابن سعد (٢٣٢/٢) وابويعلى (٤٩٦٢).

زەیدی کوڕی ئەسڵەم ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشیەکەیدا جارێك هاوسەرەکانی لەلای کۆبوونەوە، لە ناویاندا یەکێك لە هاوسەرەکانی سەفیەی کچی حوییەی فەرمووی: ((ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بە خوا من خۆزگە دەخوازم ئەو ئازارەی تۆ بە منەوە بووایە. هاوسەران هەموویان بە تیلەی چاو تەماشای یەکتریان دەکرد. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەموو ئاو لە دەمتان وەر بدەن)) وتیان: بەهۆی چیەوە ئاو لە دەممان وەر بدەین؟ فەرمووی: ((مَنْ تَغامز كُنَّ بِها وَاللّهِ إِنّها لَصَادِقة))[1783]. واتە: بەهۆی تەماشاکردنی یەکتریتان بە تیلەی چاو سوێند بە خوا ئەو ڕاست دەکات)).

دایکی بڕواداران عائیشە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکات ئازارێکی هەبووایە سورەتەکانی ئیخلاص و فەلەق و ناسی دەخوێند بە ناو هەردوو دەسیدا و پاشان فوی پیادەکرد و دەیهێنا بە هەموو لاشەیدا، لەو نەخۆشیەیدا کە تێیدا کۆچی کرد من هەردوو دەستی پێغەمبەری خوام ﷺ کۆدەکردەوە و [ئەو سورەتانەم پیادەخوێند و فووم پیادەکرد] و دەستی خۆیم دەهێنا بەسەر ئازارەکەیدا [بە ئومێدی بەرەکەتەکەی][1784]. دواتر پلەی گەرمی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرزدەبوویەوە و تایەکەی زۆر دەبوو، فاتمەی کچی یەمان ﷺ دەفەرموێت: [من و [هەندێك لە ئافرەتان] چوینە سەردانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشییەکەیدا، تەماشامان کرد لەرزوتایەکەی زۆر پەرەی سەندووە [و هەناسەی دەدا وەك یەکێك مێوژ لە ناو دەمیدا بێت][1785]. بینیمان کونەیەك ئاوی بۆ هەڵواسراوە دڵۆپ دڵۆپ ئاوەکەی بەسەریدا دەتکێت بە هۆی زۆری لەرزوتاکەیەوە. لە گێرانەوەیەکی تردا: [کونەیەك ئاوی بەدارێکەوە بۆ هەڵواسرابوو ئەویش لە ژێریدا پاڵ کەوتبوو ئاوەکەش دڵۆپ دڵۆپ بەسەر دڵیدا دەڕژا] وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەرزو تاکەت زۆر لەسەرت توندبووە گەر داوات کردبایە لە خوا تا لێتی دوور بخاتەوە و چاك بوویتایەتەوە، فەرمووی: ((لە نێوان خەڵکیدا توندترین بەلآ بۆ پێغەمبەرانە پاشان بۆ ئەوانەی کە لە دوای ئەوانن پاشان بۆ ئەوانەی لە دوای ئەوانن))[1786].

---

(١٧٨٣) أخرجه: ابن سعد (٥٧/٤) وقال الحافظ في (الاصابة) (٣٤٧/٤) (٦٥٠): اسناده حسن.

(١٧٨٤) أخرجه: البخاري (٤٤٣٩) ومسلم (٢١٩٢) وانظر: (صحيح ابن ماجة) (٢٨٤٤).

(١٧٨٥) أخرجه: أحمد (٢٤١٠٣) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما، والنسائي (الكبرى) (٧٠٨٨).

(١٧٨٦) أخرجه: أحمد (٢٧٠٧٩) وقال محققوه: اسناده حسن، والنسائي (الكبرى) (٧٤٩٦) والحاكم (٤٠٤/٤) وقال الحافظ (الاصابة) (٣٨٥/٤): اسناده قوي، وقال الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٤٥): اسناده حسن.

## زیادبوونی لەرزووتاکەی

پێش پێنج ڕۆژ لە وەفات کردنی[١٧٨٧] لەرزووتای پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەرز و توند بووەوە و بە هۆیەوە دەبورایەوە: دایکی بڕواداران عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((لە حەوت بیری جیاواز] حەوت گۆزەی سەر نەکراوە ئاوم بۆ بهێنن تا پشووبەم و بحەوێمەوە و بڕیار و وەسیەتم بگەیەنمە خەڵکی)) دەفەرموێت: ئێمەش لە تەشتێکی مسی حەفصەدا دامان نیشاند و ئاوی گۆزەکانمان پێدا دەپرژاند تا ئیشارەتی بۆ کردین بەسە [پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ چووە دەرەوە و.... سەری بەست بوو ئەنصاریەکان بە خۆیان و گەنجەکانیانەوە هاتنە پێشوازی و فەرمووی: ((سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە من خۆشم دەوێن... دوو تا سێ جار دووبارەی کردەوە...][١٧٨٨].

[پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر مینبەرەکەی دانیشت [و سەری بە قوماشێکی ڕەش بەستبوو][١٧٨٩]. هەموو خەڵکی لە چوار دەوری دانیشتن و لێی کۆبوونەوە، سەرەتا پێغەمبەری خوا ﷺ سوپاس و ستایشی خودای کرد و داوای لێخۆشبوونی بۆ شەهیدەکانی ئوحود کرد وە [دوعای بۆ کردن] و پاشان فەرمووی: ((إِنَّ اللَّهَ خَيَّرَ عَبْدًا بَيْنَ أَنْ يُؤْتِيَهُ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا [وَزِيْنَتها] مَا شَاءَ وَبَيْنَ لِقَائِهِ، (و) [وما عنده] فَاخْتَارَ لِقَاءَ رَبِّهِ)) واتە: خودا بەندەیەکی خۆی سەر پشك کردووە لە نێوان ئەوەی جوانی ژیانی دونیا هەڵبژێرێت یان گەیشتنەوە بە خوا هەڵبژێرێت بەڵام ئەو گەیشتنەوەی بە خودا [و ئەوەی لایەتی] هەڵبژارد)) ئەبوبەکر ﵁ گریاو وتی: [هەموومان دەبینە فیدات بە باوك و دایك و خۆمان و سامانمانەوە][١٧٩٠].

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەفەرموێت: ئێمە سەرسام مابووین لەم کارەی ئەبوبەکر ﵁ و خەڵکی دەیان وت: تەماشای ئەو بەساڵاچووە بکەن پێغەمبەری خوا ﷺ باسی یەکێك لە بەندەکانی خودا دەکات سەرپشك کراوە یان ژیانی دونیا

---

(١٧٨٧) انظر: (الرحيق المختوم) (٥٣١).

(١٧٨٨) أخرجه: أحمد (١٥/٣)، وابن حبان (٧٢١/١) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

(١٧٨٩) أخرجه: البخاري (٣٤٢٩).

(١٧٩٠) أخرجه: الدارمي (٧٧) وقال محققه: اسناده حسن.

هەڵبژێریت یان ئەوەی کە لەلای خودایە. بەڵام ئەویش دەڵێت: دەبینە فیدات بە دایك و باوکمانەوە. ئەبوبەکرﷺ لە هەمووومان زاناتربوو، چونکە ئێمە نەماندەزانی ئەو بەندەیە خودی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆیەتی.

لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبوبەکری ﷺ فەرمووی: ((بێ دەنگ بە ئەی ئەبوبەکر [مەگری] متمانە پێکراوترین مرۆڤ لەناو خەڵکیدا لەلای من لە هاوڕێیەتی و سامانیدا ئەبوبەکرە [ئەی خەڵکینە من براو هاوڕێم لە نێوانتاندا هەبووە، وە من خۆم بێبەری دەکەم لەوەی کە هەرە خۆشەویستم لەناوتاندا هەبووبێت جگە لە خودا][1791] وە من [جگە لە خوا] یەکێکم بکردایەتە خۆشەویسترین کەس لەلام ئەو کەسە تەنها ئەبوبەکر دەبوو بەڵام ئەوەی نێوانمان تەنها خۆشەویستی وبرایەتی ئیسلام بووە، نابێت لەمزگەوتدا هیچ یەکێك لە دەرگا تایبەتییەکان بمێنێتەوە بە کراوەیی جگە لە دەرگاکەی ئەبوبەکر][1792].

[ئاگاداربن کەسانی پێش ئێوە گۆڕی پێغەمبەرانیان و پیاوچاکانیان دەکردە مزگەوت، ئاگاداربن ئێوە گۆڕەکان مزگەوتیان (بەسەرەوە دروست نەکەن) من داواتان لێدەکەم کاری وەها نەکەن][1793] [ئامۆژگاریتان دەکەم لەگەڵ ئەنصارییەکان باش ڕەفتار بکەن، ئەوان سفرەی خوانی خواردن و کیفی تیرەکانی منن [کە بۆ لایان هاتووم][1794] ئەوان ئەو ئەرکەی لەسەریان بووە بەجێیان گەیاندووە و تەنها ئەوە ماوە کە مافی خۆیان وەربگرن بە هەموو کارێکی چاکەکارانەیان قایلبن و چاوپۆشی لە کەم و کورتی و خراپەکارانیان بکەن][1795] لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: (([خەڵکی زۆر دەبن و پشتیوانانی ئەنصار کەم دەبنەوە بە وێنەی خوێ لە خواردندا، هەر کەسێك لە ئێوە کارێکی ئەوانی کەوتەلا دەیتوانی سوودو زیان بەیەکێك بگەیەنێت باچاکەی چاکەکارانیان قبوڵ بکات وە چاوپۆشی بکات لە خراپەو کەم و کورتی خراپەکارانیان][1796].

---

(١٧٩١) أخرجه: البخاري (٤٦٦١) ومسلم (٥٣٢).

(١٧٩٢) أخرجه: البخاري (٤٦٦) واللفظ له ومسلم (٢٣٨٢).

(١٧٩٣) أخرجه: مسلم (٥٣٢) وابي عوانة (٤٠/١) واللفظ له، والنسائي (٢٤٢/٢).

(١٧٩٤) أخرجه: الدارمي (٨٢) وقال محققه: رجاله ثقات.

(١٧٩٥) أخرجه: البخاري (٣٧٩٩) و (٣٨٠١).

(١٧٩٦) أخرجه: البخاري (٣٦٨٢،٣٨٠٠) ومسلم (٢٥١٠).

ئیبنو عەباس ﷺ باسی دانیشتنی کۆتایی پێغەمبەری خوامان ﷺ بۆ دەگێڕێتەوە هەرچەندە فەرموودەکەش (لاوازە) دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەرەکەیدا بوو فەرمووی: ((....هەر کەسێك قامچییەکم لە پشتی داوە ئەوەتا پشتم با بێت تۆڵەی خۆیم لێ بکاتەوە وە هەر کەسێك وتەیەکی نەشیاوم بە کەسایەتی وتبێت با بێت تۆڵەی خۆیم لێبکاتەوە، وە هەر کەسێك سامانێکم لێبردبێت با بێت تۆڵەی خۆی بکاتەوە...))][١٧٩٧].

تا دەهات نەخۆشی و ئازارەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر و توندتر دەبوو، دایکی بڕواداران عائیشە ﷺ دەفەرموێت: [نەم بینیوە هیچ کەسێك ئازاری بەسەرەوە توند تر بووبێت بە وێنەی ئازاری پێغەمبەری خوا ﷺ][١٧٩٨].

ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: [چوومە ژوورەوە (بۆ سەردانی) پێغەمبەری خوا ﷺ ئێش و ئازاری نەخۆشییەکەی زۆر لەسەر گرانبوو، دەستم لێدا و وتم: تۆ ئێش و ئازارت زۆر زۆرە فەرمووی: ((ئێش و ئازاری من بە وێنەی ئێش و ئازاری دوو پیاوی ئێوەیە)) وتم: ئەوە لەبەر ئەوەیە کە تۆ دوو پاداشتت هەیە؟ فەرمووی: ((أَجَل وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا عَلَى الْأَرْضِ مُسْلِمٌ يُصِيبُهُ أَذًى مِنْ مَرَضٍ فَمَا سِوَاهُ إِلَّا حَطَّ اللَّهُ عَنْهُ خَطاياهُ كَما تحط الشَّجرة وَرَقَها))[١٧٩٩] واتە: بەڵێ سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هەر موسوڵمانێك لەسەر ئەم زەوییەدا تووشی هەر ئازارێك ببێت بە هۆی نەخۆشی یان هەر شتێکی ترەوە خودا (بە هۆیەوە) تاوانەکانی هەڵدەوەرێنێت وەك چۆن درەخت گەڵاکانی هەڵدەوەرێت)).

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەفەرموێت: [چوومە ژوورەوە بۆ سەردانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستم لێدا لەسەرو پێخەفەکەیەوە هەستم بە گەرمایەکی زۆر دەکرد، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئای چەندە گەرمایی لاشەت زۆرە؟ فەرمووی: ((بەڵێ ئێمە بەوجۆرەین بەڵامان لەسەر گران دەکرێت و پاداشتمان بۆ زیاد دەکرێت))

---

(١٧٩٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٨٠،٧١٨/١٨) و (الاوسط) (١٠٤/٣) وابويعلى (٦٨٢٤) وقال محققه: اسناده ضعيف، والبيهقي (الدلائل) (١٣٧١) وقال محققه: اسناده ضعيف، وقال الحافظ ابن كثير (البداية) (٣٢٣/٥) سنده غريب.

(١٧٩٨) أخرجه: البخاري (٥٦٤٦)، ومسلم (٢٥٧) والترمذي (٢٣٩٩).

(١٧٩٩) أخرجه: البخاري (٥٦٤٧،٥٦٦٠) ومسلم (٢٥٧١) وأحمد (٣٦١٨) وقال محققوه، اسناده صحيح على شرطهما.

وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کێ لەناو خەڵکیدا بەڵای لە هەمووان گەورەترو توندترە؟ فەرمووی: ((پێغەمبەران)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی کێی تر لە دوای ئەوانن؟ فەرمووی: ((پیاوچاکان)) وتم: ئەی کێ لەدوای ئەوانە؟ فەرمووی: ((زانایان))[(١٨٠٠)] ئەوان کەسی وەهایان لە ناودابوو [تووشی ئەسپێ دەبوو تا بە هۆیەوە دەی کوشت] ((إِنْ كَانَ أَحَدُهُمْ لَيُبْتَلَى بِالْفَقْرِ، حَتَّى مَا يَجِدُ أَحَدُهُمْ إِلَّا الْعَبَاءَةَ يَحُوبُهَا، وَإِنْ كَانَ أَحَدُهُمْ لَيَفْرَحُ بِالْبَلَاءِ، كَمَا يَفْرَحُ أَحَدُكُمْ بِالرَّخَاءِ))[(١٨٠١)] واتە: وەکەسی وایان هەبوو تووشی هەژاری هاتبوو بە هۆیەوە عەبایەکی دەست نەدەکەوت تا خۆی پێداپۆشێت، بەڵام هەریەکە لەوان خۆشحاڵتربوو بەو بەڵایە وەك ئێوە خۆشحاڵن بەو سەروەت و سامانەتان].

لە گێڕانەوەیەکی تردا: سەعد ﷺ دەفەرموێت: [وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کێ لەناو خەڵکیدا توند ترین بەڵای دەبێت؟ فەرمووی: ((لْأَنْبِيَاءُ، ثُمَّ الْأَمْثَلُ فَالْأَمْثَلُ، يُبْتَلَى الْعَبْدُ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ، فَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ صُلْبًا، اشْتَدَّ بَلَاؤُهُ، وَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ رِقَّةٌ، ابْتُلِيَ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ، فَمَا يَبْرَحُ الْبَلَاءُ بِالْعَبْدِ، حَتَّى يَتْرُكَهُ يَمْشِي عَلَى الْأَرْضِ، وَمَا عَلَيْهِ مِنْ خَطِيئَةٍ))[(١٨٠٢)] واتە: پێغەمبەران پاشان چاکترینتان ئینجا چاکتر، هەموو بەندەیەك بە ئاستی دینداری خۆی تاقیدەکرێتەوە وە گەر لە دینداریەکەیدا (ڕەق و سەخت) بوو بەڵاکەشی بە هێزو توند دەبێت وە گەر لە دینداریەکەیدا نەرم بێت بەڵاکەشی هەر بەو ئاستە دەبێت بەڵاش لە بەندە جیانابێتەوە تا وای لێدەکات بەسەر زەویدا بڕوات وە هیچ هەڵەو تاوانێکی بەسەرەوە نەمێنێت].

ڕۆژێك هەندێك لە هاوەڵانی هاتنە سەردانی، جابر ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش کەوت [لەو کاتەدا هەندێك لە هاوەڵانی هاتنە خزمەتی] دەفەرموێت: نوێژی دەکرد بە دانیشتنانەوە ئەبوبەکریش ﷺ (اللّٰهُ أَكْبر)ەکانی نوێژەکەی لە دوایەوە بە دەنگی بەرز دەوتەوە تا خەڵکی گوێیان لێ بێت، دواتر...ئاماژەی بۆ کردین بە

(١٨٠٠) أخرجه: البخاري (الأدب المفرد) (٥١٠)، والحاكم (٩١١)، وقال الذهبي (٩١١) على شرط مسلم وله شواهد كثيرة ، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الدب المفرد) (٥٩٣).

(١٨٠١) أخرجه: ابن ماجة (٤٠٢٤) وابن حبان (٢٩٠١) وقال محققه: اسناده حسن والترمذي (٢٣٩٨) وصححه الحافظ في (الاحياء) (٢١٨/٤) والشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٣٢٥٠) والصحيحة (١٤٤) والشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (٤١٤).

(١٨٠٢) أخرجه: ابن ماجة (٤٠٢٥) وابن حبان (٢٩٠١،٢٩٠٠) وقال محققه: اسناده حسن.

دانیشتنەوە نوێژەکەمان کرد لە دوایەوە، کاتێك سەلامی دایەوە فەرمووی: ((إِنْ كِدْتُمْ آنِفًا أَن تَفْعَلُوا فِعْلَ فَارِسَ وَالرُّومِ يَقُومُونَ عَلَى مُلُوكِهِمْ، وَهُمْ قُعُودٌ فَلَا تَفْعَلُوا ائْتَمُّوا بِأَئِمَّتِكُمْ إِنْ صَلَّى قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا وَإِنْ صَلَّى قَاعِدًا فَصَلُّوا [قُعُودًا]))(١٨٠٣). واتە: نزیك بوو کەمێك پێش ئێستا وەکو فارس و ڕۆمەکان ڕەفتار بکەن کە بە پێوە دەوەستان بەسەر پاشاکانیانەوە ئەوانیش دانیشتبوون، ئێوە وامەکەن، وەك پێشنوێژەکانتان بکەن گەر ئەوان بە پێوە نوێژیان کرد ئێوەش بە پێوە نوێژ بکەن وە گەر بە دانیشتنانەوە نوێژیان کرد ئێوەش بە دانیشتنانەوە نوێژ بکەن)).

ئەبو تەلحە ﷺ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی کرد پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((سڵاوی من بگەیەنە قەومەکەت بەڕاستی ئەوان ئارامگرو بێ تەماعن))(١٨٠٤).

سوراقەی کوڕی مالیکیش ﷺ هاتە سەردانی دەفەرموێت: [چوومە خزمەتی وتم: ئاژەڵی ون بوو دێنە سەر ئەو حەوزە ئاوەی بۆ وشترەکانی خۆمم سازکردووە ئایا من پاداشتم دەست دەکەوێت گەر تێر ئاویان بکەم؟ فەرمووی: ((بەڵێ تێر ئاو کردنی هەموو جەرگ گەرمێك دەبێتە پاداشت بۆت))(١٨٠٥).

## پێغەمبەر ﷺ دەیەوێت نوسراوێك لەدوای خۆی بنوسێت

ڕۆژی چوار شەمەو پێنج شەمەی پێش وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کرد تا نوسراوێکی بۆ بنوسرێت: ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ ئازارەکەی زیادی کرد] و فەرمووی: ((وەرن با نوسراوێکتان بۆ بنوسم تا سەرلێ شیواو نەبن لە دوای من)). عومەر ﷺ فەرمووی: [خەڵکینە] پێغەمبەری خوا ﷺ ئازارەکە لەسەری زیادی کردووە و قورئانتان لەلایە وە کتێبەکەی خواتان بەسە. ئەوانەی لەوێ بوون ناکۆکی و دەمەقاڵێ کەوتە نێوانیان هەیان بوو دەی وت: وەرنە

---

(١٨٠٣) أخرجه: البخاري (٥٦٥٨) ومسلم (٨٢/٤١٢) وابن ماجة (١٢٤٠) (١٢٣٧)، وأحمد (٢٤٢٥٠) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما والحاكم (٣٠٧/٤) وابن خزيمة (١٦١٤).

(١٨٠٤) أخرجه: الحاكم (٧٩/٤) وصححه ووافقه الذهبي.

(١٨٠٥) أخرجه: عبدالرزاق (١٩٦٩٢) والنسائي (١٦٤/٥) والطبراني (الكبير) (٦٥٨٧) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترغيب) (٩٤٧) و (حجة النبي ﷺ) (ص:٤٣).

پێش تا پێغەمبەری خوا ﷺ نوسراوەکەتان بۆ بنوسێت، هەشیان بوو قسەکەی عومەری دەوتەوە. کاتێك جیاوازی و دەنگە دەنگەکەیان درێژەی کێشا [کە ئەوەش کارێکی نەشیاوە لە خزمەت پێغەمبەراندا وتیان: پرسیار بکەن ئایا بڕیارەکەی فەرامۆش کرد؟.

دواتر ئەوەیان لێ دووبارە کردەوە لە ئەنجامدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لێم گەڕێن ئەوەی ئێستا منی تێدام باشترە لەوەی ئێوە لە منی داوا دەکەن هەستن بڕۆن)). [بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاری کردن و فەرمووی: ((هاوتا بۆ خوا دانەران لە دورگەی عەرەب وەدەرنێن وە ڕێزو پێشوازی لە وەفدەکان بکەن وەك و من ڕێزیان لێبگرن))][(١٨٠٦)].

چەندەها جار پێغەمبەری خوا ﷺ دەبورایەوە تا وایانزانی ئەوە نەخۆشی (ذات الجنب) یەتی ئەویش لویەکە دروست دەبێت بە هۆیەوە خاوەنەکەی دەمرێت و هەندێکیش دەڵێن پێ دەچێت نەخۆشی شێرپەنجەی ئێستا بێت.

دایکی بڕواداران عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [...پێغەمبەری خوا ﷺ کەلەکەی جاری وەها هەبوو زۆر دەیەشاو دەمان وت: گورچیلەی دەیەشێت... ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە توندی تووشی ئەو ئازارە هات وە بە هۆیەوە بورایەوە، ئێمەش ترساین و خەڵکیش هەموو ترسان... وە وامان زانی تووشی نەخۆشی (ذات الجنب) بووە وە دەرمانێکی ئەو نەخۆشییەمان لە ڕێگەی دەمیەوە دەرخوارد دا[(١٨٠٧)]. [پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئیشارەت داوای لێکردین ئەوە نەکەین. بەڵام ئێمە وتمان: ئەو نەخۆشەو ئارەزووی دەرمانی نییە][(١٨٠٨)].

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئازارەی نەماو چاکبوو... وە زانی کە ئێمە ئەو دەرمانەمان داوەتێ [فەرمووی: کێ ئەمەی ئەنجامدا؟][(١٨٠٩)] [ئەمە کاری ئافرەتانێکە لەم لایەوە گەڕاونەتەوە (ئیشارەتی بۆ حەبەشە کرد) وە ئەسمائیان لە ناودا بوو.

(١٨٠٦) أخرجه: البخاري (٣١٦٨، ٤١٦٨، ٤١٦٩) ومسلم (١٦٣٧).

(١٨٠٧) في رواية: (انهم اذابوا قسطاً بزيت فلدوه) أخرجه: الطبراني كما في (الفتح) (١٨٦/٨).

(١٨٠٨) أخرجه: البخاري (٦٨٩٧).

(١٨٠٩) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣١٦٠) وقال محققه: اسناده حسن.

وتیان: ئێمە وامانزانی تووشی نەخۆشی (ذات الجَنْب) بوویت][1810]. فەرمووی: ((ئێوە گومانتان وابوو خودا ئەوە بەسەر مندا زاڵبکات [ئەوە لە شەیتانەوەیە][1811] وخوا هەرگیز زاڵی ناکات بەسەر مندا و [بەوە سزام نادات] سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە دەبێت هەموو یەکێکی ئەم ماڵە ئەو دەرمانەی دەرخوارد بدرێت [بە بەرچاوی خۆمەوە] جگە لە عەباسی مامی [چونکە ئەو ئامادەی ئەوکارە نەبوو])).

عائیشە ﵂ دەفەرموێت: ئەو ڕۆژە هەموو ئەو پیاوانەی لەوێدا ئامادە بوون یەك بە یەکیان ئەو دەرمانەیان دەرخوارد درا.... هەرچەندە پایەداری زۆریشیان لە نێواندا بوو... دواتر ئەو دەرمانە دەرخواردی هەموو هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ یەك بەیەك درا... تا گەیشتە یەکێکیان [ناوی (مەیمونە) بوو][1812]. ئەو وتی: سوێند بە خوا من بەڕۆژووم! وتمان: گومانت خراپ و ناڕاستە گەر وا بزانیت ئێمە وازت لێدەهێنین لە دوای سوێندەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ. سوێند بە خوا دەرمانەکەشمان دەرخواردی ئەویشدا هەرچەندە بەڕۆژوش بوو][1813].

لەو نەخۆشیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کرد نامەیەکی بۆ بهێنن تا لە نامەکەیدا بڕیار بدات کە ئەبوبەکر ﷺ دەبێت بکرێتە جێنشین لەدوای خۆی:

دایکی بڕواداران عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ....باوك و براکەتم بۆ بانگ بکە تا نوسراوێك بۆ ئەبوبەکر بنوسم، من دەترسم یەکێك ئاواتە خوازبێت و بڵێت من شیاوترو لە پێشترم بۆ ئەو کارە، خواو بڕواداران بە جگە لە ئەبوبەکر بەکەسی تر ڕازی نابن))][1814].

لە گێڕانەوەیەکی دایکی باوەڕدارانداا عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لەو نەخۆشیdەی کە تێیدا وەفاتی کرد فەرمووی: ((عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکرم بۆ بانگ بکە تا نوسراوێك بۆ ئەبوبەکر بنوسم (واتە: ببێتە پێشەوای

---

(١٨١٠) أخرجه: عبدالرزاق (٩٧٥٤) واسناده صحيح كما في (الفتح) (١٨٧/٨).

(١٨١١) أخرجه: الحاكم (٤٠٥/٤) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي.

(١٨١٢) أخرجه: أحمد (٢٤٨٧٠) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(١٨١٣) أخرجه: ابويعلى (٤٩٣٦) وقال محققه: اسناده حسن، والحاكم (٢٠٢/٤) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٦٥٨٧) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما وقال الحافظ (الفتح) (٣٦٣/١٠): اسناده حسن.

(١٨١٤) أخرجه: أحمد (٢٥١١٣) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما، ومسلم (٢٣٨٧)، والنسائي (الكبرى) (٧٠٨١).

موسوڵمانان لە دوای من) تا هیچ یەکێك لە موسوڵمانان ناکۆك نەبن لەو بارەیەوە لە دوای من (پاشان فەرمووی): لێی گەڕێ پەنا بە خوا بڕواداران ناکۆك نابن سەبارەت بە ئەبوبکر))][١٨١٥].

هەروەها لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: [فەرمووی: ((بڕۆن ئەبوبەکر و کوڕەکەیم بۆ بانگ بکەن با نوسراوێکم بۆ بنوسێت بۆ ئەوەی هیچ چاوچنۆك و خۆزگە خوازێك چاو نەبڕنە پێشەوایەتی ئەبوبکر.... پاشان فەرمووی: ((خودا ئەوە قبوڵ ناکات و موسوڵمانانیش هەروەها...))] [١٨١٦].

لەو نەخۆشیەیدا داوای عوسمانی کرد و بەڵێنی لێوەرگرت:

دایکی باوەڕداران عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشیەکەیدا فەرمووی: ((پێم خۆش بوو ئێستا هەندێك لە هاوەڵانم لەلام بوونایە)) وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبەکرت بۆ بانگ بکەین؟ ئەو بێدەنگ بوو. وتمان: عومەرت بۆ بانگ بکەین؟ هەر بێدەنگ بوو. پاشان وتمان: عەلیت بۆ بانگ بکەین؟ بەڵام هەر بێدەنگ بوو. وتمان: عوسمانت بۆ بانگ بکەین؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) ئیتر ئێمەش کەسێکمان نارد بە دوای عوسماندا و... هات پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی لەگەڵ دەکرد [و دەم و چاوی عوسمان زۆر تێکچوو] و پێی فەرموو: ((عوسمان گەر خودا ڕۆژێك تۆی کردە پێشەوای موسوڵمانان و دووڕووەکان ویستیان لەو پێشەوایەتیەی کە خودا پێی بەخشیویت دوورت بخەنەوە تۆ دەستبەرداری ئەو پۆستە نەبیت بۆ ئەوان...

(ئەوەی سێ جار دووبارە کردەوە). قەیس دەڵێت ئەبو سەهلە بۆی باسکردووم عوسمان لەو ڕۆژەدا کە ئەو دووڕووانە ئابڵوقەی ماڵەکەیان دابوو دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵێنی لێوەرگرتووم منیش هەر لەسەر ئەو بڕیارەی دەڕۆم. قەیس دەڵێت: هەموو ئەو بڕیارە بەو ئامۆژگارییەی پێغەمبەری خوا ﷺ تێدەگەیشتین][١٨١٧].

---

(١٨١٥) أخرجه: ابن ابي عاصم (السنة) (١١٦٣) وقال محققه: حديث صحيح، والطيالسي (المسند) (١٥٠٨).

(١٨١٦) أخرجه: أحمد (٢٤٧٥١) وقال محققوه: اسناده ضعيف.

(١٨١٧) أخرجه: أحمد (٢١٤/٦) والترمذي (٣٧١١) وابن ماجة (١١٢) وابن حبان (٦٩١٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، وصححه الشيخ مقبل في (الصحيح المسند محاليس) (١٦٠٨).

پێغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرانی ئاگادارردەکردەوە سەبارەت بە خراپترینی خەڵکی لە لای خودا لە قیامەتدا: دایکی بڕواداران عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [کاتی نەخۆشییەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەندێك لە هاوسەرانی باسی کەنیسەیەکیان دەگێڕایەوە کە لە خاکی حەبەشە بینویانە، لەوانە ئوم سەلەمە و ئوم حەبیبە ئەوان چووبوونە خاکی حەبەشە و باسی ئەو کەنیسەیەیان دەگێڕایەوە کە ناوی (ماریة) بوو وە باسی جوانی وێنەکانیان دەگێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ سەری بەرزکردەوە و فەرمووی: ((إِنَّ أُولَئِكَ، إِذَا مَاتَ فِيهِم الرَّجُلُ الصَّالِحُ، بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا، ثُمَّ صَوَّرُوا فِيهِ تِلْكِ الصُّوَرَ، أُولَئِكِ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللهِ [عَزوجل يَوْمَ الْقِيَامَةِ]))[١٨١٨]. واتە: ئەوانە گەر پیاوچاکێکیان لە ناودا بمرێت مزگەوتێك یان (پەرستگایەکیان) بەسەر گۆڕەکەیەوە دروست دەکردن ئەو وێنەو نیگارانەیان تێدا دەکێشا، ئەوانە خراپترینی دروست کراوانن [لەلای خودا لە ڕۆژی قیامەتدا].

لە تێکڕای ئەو ڕۆژانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ تێیدا نەخۆش بوو هەر خۆی پێش نوێژی بۆ هاوەڵانی دەکرد، تا ئێوارەی ئەو ڕۆژی پێنج شەممەیە کە دوا هەمین پێش نوێژی کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو.

لوبابەی دایکی ئیبنو عەباس ﵄ دەفەرموێت: [گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی مەغریبدا سورەتی: (وَالمرسلاتِ عُرْفا) ی دەخوێند و ئەوەش دواهەمین پێش نوێژی پێغەمبەری خوابوو ﷺ بۆ هاوەڵانی][١٨١٩].

(١٨١٨) أخرجه: البخاري (١٣٤١)، ومسلم (٥٢٨).

(١٨١٩) أخرجه: البخاري (٤٤٢٩) ومسلم (٤٦٢) وابوداود (٨١٠) والترمذي (٣٠٨).

## پێغەمبەر ﷺ دەیەوێت ئەبوکر پێش نوێژی بکات بۆ خەڵکی

لە کاتی نوێژی عیشادا[١٨٢٠]. نەخۆشی و ئازارەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ توندتربوو بە هۆیەوە نەیتوانی بچێت بۆ مزگەوت و پێش نوێژی بۆ هاوەڵانی بکات: دایکی بڕواداران عائیشە رضي الله عنها دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئایا خەڵکی نوێژیان کرد؟)) وتمان نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان چاوەڕوانن. فەرمۆوی: ((ئاوێکم بۆ بکەنە تەشتێکەوە [و ئاوی حەوت گۆزە ئاوم بۆ بهێنن کە سەرەکانیان نەکرابێتەوە بەڵکو بتوانم بچم و (بەڵێنیان لێوەربگرم) وە وسێتیان بۆ بکەم])). ئێمەش لە تەشتە مسەکەی حفصەی خێزانیدا دامان نیشاندو بەردەوام ئاوی ئەو گۆزانەمان پێدا دەکرد تا بە دەستی ئاگاداری کردینەوە بەسە][١٨٢١]. بەو جۆرە خۆی شۆرد و ویستی هەستێتە سەر پێ بەڵام بورایەوە و پاشان هۆشی هاتەوە و فەرمووی: ((ئایا ئەوان نوێژیان کرد؟....))][١٨٢٢]. بەو جۆرە سێ جار دووبارە بووەوە، دواتر داوای کرد ئەبوبەکر رضي الله عنه پێش نوێژییان بۆ بکات.

عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە رضي الله عنه دەفەرموێت: [من و هەندێك لە موسوڵمانان لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، کاتێك نەخۆشییەکەی پەرێشانی کردبوو، بیلال بانگیدا و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەیەکێك بڵێن پێش نوێژییان بۆ بکات)) ئیتر منیش چووم و عومەرم لە ناو خەڵکەکەدا دۆزییەوە، لەوکاتەدا ئەبوبەکر لەوێ نەبوو، بە عومەرم رضي الله عنه وت: عومەر بڕۆ پێش نوێژیی بۆ خەڵکەکە بکە. ئەویش چوو دەستی پێکرد و وتی (اللَّهُ أَكْبَرُ) عومەر پیاوێکی دەنگ بەرز بوو کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەنگی ئەوی بیست فەرمووی: ((ئەبوبەکر لە کوێیە خوداو موسوڵمانان بەوە قایل نابن. دووجار دووبارەی کردەوە پاشان: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەلاقەی ژوورەکەیەوە سەری دەرکرد و فەرمووی: ((نا نا با کوڕەکەی ئیبنو ئەبو قوحافە

(١٨٢٠) أخرجه: البخاري (٦٥٥).
(١٨٢١) أخرجه: البخاري (٤٤٤٢،٤٤٤٥) ومسلم (٤١٨/٩٣،٩١).
(١٨٢٢) أخرجه: البخاري (١٩٨) ومسلم (٤١٨).

(واتە: ئەبوبەکر) پێش نوێژی بۆ خەڵك بکات)) ئەوەی بە توڕەییەوە فەرموو))[١٨٢٣].
ئیتر لە دوای ئەو نوێژەی عومەرەوە ﷺ ناردی بە دوای ئەبوبەکردا و ئەو پێش نوێژیی بۆ خەڵکی دەکرد][١٨٢٤].

عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە ﷺ دەفەرموێت: [...دواتر عومەر بەمنی وت: ئەی هاوار کوڕەکەی زەمعە چیت بەسەر من هێنا. کاتێك تۆ بە منت وت سوێند بە خوا من وامزانی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی ئەوەی پێکردوویت گەر لەبەر ئەوە نەبووایە من هەرگیز پێش نوێژیم بۆ خەڵکەکە نەدەکرد! منیش وتم: سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو فەرمانەی پێ نەکردم بەڵام کاتێك من ئەبوبکرم نەبینی لە ناو خەڵکەکەدا تۆم بە شایستە ترین کەس زانی لە نێوانیاندا بۆ پێش نوێژیی کردن][١٨٢٥].

لە گێڕانەوەیەکی تردا: دایکی باوەڕداران عائیشە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشییە کەیدا فەرمووی: ((بڕۆن ئەبوبەکر بێنن تا پێش نوێژیی بۆ خەڵك بکات)) من وتم: [ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبەکر کەسێکی دڵناسکە [فرمێسکی چاوەکانی پێ ڕاناگیرێت][١٨٢٦] گەر لە شوێنەکەی تۆدا پێش نوێژیی بکات لەبەر گریانی کەس گوێی لە دەنگی نابێت][١٨٢٧] لەبەر ئەوە بە عومەر بڵی تا پێش نوێژییان بۆ بکات [وە بە حەفصەشم وت: دەی تۆش پێی بڵێ: گەر ئەبوبەکر لە شوێن نوێژەکەی تۆدا پێش نوێژیی بکات لەبەر گریانی کەس گوێی لە دەنگی نابێت لەبەر ئەوە فەرمان بکە تا عومەر پێش نوێژیی بۆ خەڵکەکە بکات][١٨٢٨] [حەفصەش ئەوەی گوت] [وە منیش ئەوەم لێ دووبارە کردەوە وە تەنها مەبەستیشم لەو

---

(١٨٢٣) أخرجه: ابوداود (٤٦٦١) وصححه الشيخ الالباني في (الظلال) (١١٥٩).
(١٨٢٤) أخرجه: ابوداود (٤٦٦١) وصححه الشيخ الالباني في (الظلال) (١١٦٠).
(١٨٢٥) أخرجه: أحمد (١٨٩٠٦) وعبدالرزاق (زوائد عبدالرزاق) (٧/١٠١) وقال محققه: مرسل يرتقي الى درجة الحسن لغيره وابن هشام (السيرة) (١٢١٠) وقال محققوه: اسناده حسن، وصحح اسناده صاحب (صحيح سيرة ابن هشام) رقم (٢٠٨٨)، وقال الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٦٩٠): سنده صحيح على شرطهما.
(١٨٢٦) أخرجه: مسلم (٩٤/٤١٨).
(١٨٢٧) البخاري (٦٨٢).
(١٨٢٨) أخرجه: البخاري (٦٧٩).

دووبارەکردنەوەیە ئەوە بوو][١٨٢٩] [من پێم ناخۆش بوو خەڵکی ڕەشبینیان توش بێت بەیەکەم کەسێك کە بەرچاویان بکەوێت کە لە جێگەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێش نوێژیی بکات لەبەر ئەو هۆیە دوو یان سێ جارم لێدووبارە کردەوە][١٨٣٠].

دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەسە دەڵێی ئێوەش هاوڕێی ئەو ژنانەن کە بە یوسفیان وت: (واتە: داویان لێکرد ئەو کارە نەشیاوە قبوڵ بکات) بڕۆن بە ئەبوبەکر بڵێن با پێش نوێژیی بۆ خەڵکەکە بکات[١٨٣١]. [نەبادا کەسێکی تر بڵێت یان ئاوات بە جێگەت بخوازێت خوداو بڕواداران هەرگیز ئەوە قبوڵ ناکەن][١٨٣٢]. [ئیتر ئەبوبەکر ﷺ پێش نوێژیی بۆ موسوڵمانان کرد لە ژیانی پێغەمبەری خوادا ﷺ][١٨٣٣] حەڤدە نوێژی بۆ کردن. پێش سێ ڕۆژ لە وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ موسوڵمانانی ئاگادارکردبووەوە تا گومانی باشیان هەبێت بە خوای گەورە. جابر ﷺ دەفەرموێت: [گوێم لێ بوو سێ ڕۆژ پێش وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لا يَمُوتَنَّ أَحَدَكُمْ إلاّ وَهُوَ يُحِسنُ الظَنَّ بِاللّهِ))[١٨٣٤] واتە: پێش ئەوەی هیچ کەسێك لە ئێوە بمرێت با گومانی باشی هەبێت بە خودا)).

دوو ڕۆژ پێش وەفاتی، سوپای ئوسامەی ڕێکخست: عوروە ﷺ دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ خاوبوونەوەی خەڵکی لە خۆئامادەکردن بۆ سوپاکەی ئوسامەی بە لاوە گران بوو. لەو ئێش و ئازارەی نەخۆشییەکەیدا سەری پێچابوو هات لەسەر مینبەرەکەی دانیشت وتاریدا (چونکە خەڵکی گلەییان هەبوو کە گەنجێکی ئاوها بکرێتە پێشەوای موهاجرین و ئەنصارەکان] لەوێدا سوپاس و ستایشی خودای کرد و پاشان[١٨٣٥] فەرمووی: (([گەر تانەو ڕەخنەتان هەبێت لە پێشەوایەتییەکەی پێشتریش تانەو ڕەخنەتان هەبوو لە پێشەوایەتی باوکی، سوێند بەخوا باوکی شیاوی پێشەوایەتی بوو لە خۆشەویستترینی خەڵکی بوو لەلای من، وە ئەم کوڕەشی لە

(١٨٢٩) البخاري (٤٤٤٥) ومسلم (٩٣/٤١٨).
(١٨٣٠) أخرجه: مسلم (٩٤/٤١٨).
(١٨٣١) أخرجه: البخاري (٦٧٩) والترمذي (٣٦٧٢) والنسائي (الكبرى) (١١٢٥٢).
(١٨٣٢) أخرجه: الدارمي (٨٣) وقال محققه: سنده حسن.
(١٨٣٣) أخرجه: البخاري (٦٧٨،٣٣٨٥) ومسلم (٤٢٠) (١٠١).
(١٨٣٤) أخرجه: مسلم (٢٨٧٧).
(١٨٣٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) رقم (١٢٠٤)، وقال محققاه: اسناده ضعيف.

خۆشەویسترینی خەڵکیە لەلای من]))[١٨٣٦]. و زۆر بە چاکی ڕەفتاری لەگەڵدا بکەن چونکە ئەو لە چاکەکانتانە].

لە گێڕانەوەیەکی تردا: ئەبوبەکر ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ [لە کاتی نەخۆشییەکەیدا پێش وەفاتی] فەرمووی: (([ئەی خەڵکینە داوای سەلامەتی و بێوەیی لە خودا بکەن، چونکە هیچ مرۆڤێك لە دوای دڵنیایی (باوەڕ) هیچ شتێکی باشی پێنەدراوە باشتربێت لە بێوەیی وە هیچ شتێك نییە خراپتربێت لە دوای بێ باوەڕی لە گومان و دوودڵی][١٨٣٧] ئاگاداری ڕاستگۆیی بن چونکە ئەو لەگەڵ چاکەدایەو هەردووکیان لە بەهەشتن، خۆتان دووربگرن لە درۆ چونکە ئەو لەگەڵ هەموو خراپە کاریەکدایە و هەردووکیان لە دۆزەخن.... (پاشان فەرمووی): پەیوەندیتان لەگەڵ یەکدی مەپچڕێنن، وە پشت مەکەنە یەکتر وە ڕق لە یەکتر، هەڵمەگرن، وە ئیرەیی بە یەکتری مەبەن، وە هەموو ببنە بەندەی خوداو برای یەکتر]))[١٨٣٨].

عوروە ﷺ دەفەرموێت: [لە دوای ئەو وتانە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە خوارەوە و خەڵکی هەموو کەوتنە خۆئامادەکردن، ئێش و ئازاری پێغەمبەری خوا ﷺ زیادی کردەوە، و ئوسامە بە خۆیی و سوپاکەیەوە لە شاری مەدینە چوونەدەرەوە لە ناوچەی (جورف) کە شەش کیلومەتر دوور بوو لە شاری مەدینە لەوێدا سەربازگەیان ئامادەکرد ئەوەی دوا کەوتبوو لەوێ بەوان دەگەیشتەوە. بەهۆی نەخۆشییەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ ئوسامەو سوپاکە لەوێ مانەوە تا بزانن خودا چی دەکات سەبارەت بە پێغەمبەری خوا ﷺ][١٨٣٩].

بەردەوام ئەبوبەکر ﷺ پێش نوێژیی بۆ موسوڵمانان دەکرد: سالمی کوڕی عوبەید ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش بوو لە هۆشی خۆی دەچوو پاشان بە ئاگاهاتەوە و دەیفەرموو: ((کاتی نوێژ هاتووە؟)) وتیان: بەڵێ. فەرمووی: ((بە بیلال بڵێن با بانگ بدات و بە ئەبوبەکریش بڵێن با پێش نوێژیی بکات)) لە گێڕانەوەیەکی

(١٨٣٦) أخرجه: البخاري (٦٦٢٧) ومسلم (٣٨١٦).
(١٨٣٧) أخرجه: أحمد (٤٤) وقال محققوه: اسناده حسن.
(١٨٣٨) أخرجه: أحمد (١٧) وقال محققوه: اسناده صحيح.
(١٨٣٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٢٠٤) و قال محققاه: اسناده ضعيف.

تردا: ((بە بیلال بڵێن بانگ بدات وە قامەت بکات وە بە ئەبو بەکریش بڵێن پێش نوێژیان بۆ بکات))[١٨٤٠].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: [پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی نارد بە دوای ئەبو بەکردا ﷺ تا پێش نوێژیی بکات بۆ خەڵکی، ئەو کەسە چووە لای ئەبوبەکر ﷺ و پێی وت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانت پێدەکات پێش نوێژیی بۆ خەڵکەکە بکەیت. ئەبوبەکر ﷺ پیاوێکی هەست ناسك بوو، بە عومەری ﷺ وت: بڕۆ پێش نوێژیی بۆ خەڵکەکە بکە؟ عومەریش ﷺ وتی: تۆ شایستەتریت، ئینجا ئەبوبەکر ﷺ پێش نوێژیی بۆ کردن][١٨٤١].

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لە هۆشی خۆی چوو پاش ماوەیەك بە ئاگاهاتەوە فەرمووی: ((قامەت کرا؟)) وتیان: بەڵێ [ئینجا هەستی کرد کەمێك باش بووە] فەرمووی: ((یەکێك بێتە ژێر باڵم)). بورەیدە و پیاوێکی تر هاتن چوونە ژێر هەردوو باڵی و چووە دەرەوە بۆ مزگەوت و نوێژی جەماعەت][١٨٤٢]. [لەوکاتەدا ئەبوبەکریش ﷺ نوێژی بۆ خەڵکەکە دەکرد، هەستی کرد پێغەمبەری خوا ﷺ واهات، ویستی بچێتە دواوە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداری کردەوە نەیەتە دواوە][١٨٤٣] [وە فەرمووی: ((بمبەن لە تەنیشتی ئەبوبەکر دامنێن)). ئەوانیش لای چەپی ئەبو بەکردا دایان نا][١٨٤٤] [ئەبوبەکر ﷺ ویستی بچێتە دواوە پێغەمبەری خوا ﷺ گرتی و نەیهێشت] [لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە دانیشتنەوە پێش نوێژیەکەی دەکرد و ئەبوبەکریش بە پێوە بە دوایەوە نوێژی دەکرد، وە دەنگی بە (الله أکبر) کانی نوێژ بەرز دەکردەوە][١٨٤٥]. ئەوەش دواهەمین نوێژی بە کۆمەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە بە دانیشتنەوە بۆ خەڵکی بکات: ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: [دواهەمین نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خەڵك [لەوکاتەدا] بوو پۆشاکێکی لۆکەی لەبەردابوو][١٨٤٦]

(١٨٤٠) أخرجه: ابن خزيمة (الصحيح) (١٥٤١) وقال محققه: اسناده صحيح.
(١٨٤١) أخرجه: مسلم (٩٠/٤١٨).
(١٨٤٢) أخرجه: مسلم (١٣٦٣).
(١٨٤٣) البخاري (٦٨٧).
(١٨٤٤) أخرجه: ابن خزيمة (الصحيح) (١٥٤١) وقال محققه: اسناده صحيح.
(١٨٤٥) أخرجه: مسلم (٩٥،٩٦/٤١٨).
(١٨٤٦) أخرجه: البزار (١٣٢٥) واسناده صحيح كما قال الحافظ العراقي في تخريج (الاحياء) (٣٧٤/٢).

[ئەم لاولاکەی بە خۆیدا دابوو لە دوای ئەبوبەکر][١٨٤٧] [لە دوای نوێژەکە فەرمووی: ((برۆن بانگی ئوسامەی کوڕی زەیدم بۆ بکەن)) (لەوێ مایەوە هەتا) ئوسامە لە دواوە بە باوەش هەڵیگرت (چووە وە ماڵەوە) ئەوە کۆتا نوێژ بوو ئەنجامی بدات بە کۆمەڵ][١٨٤٨].

## یەک ڕۆژ پێش وەفاتکردنی

پێغەمبەری خوا ﷺ پێش ڕۆژێك لە وەفاتی [کۆیلەکانی ئازاد کرد وە چەکەکانی بە دیاری بەخشییە موسوڵمانان][١٨٤٩] وە سامانەکەی حەوت دینار یان درهەم بوو هەمووی بەخشییەوە.

دایکی بڕواداران عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەی عائیشە ئایا ئەو نەختە ئاڵتونە چی لێهات؟)) وتم: ئەوەتا لەلای منە. فەرمووی: ((بیبەخشە)) پاشان بوورایەوە، کاتێك بەئاگا هاتەوە دووبارە هەمان وتەی دووبارە کردەوە فەرمووی: ((حەوتەکە چی بەسەرهات؟)) منیش بۆم هێناو کردیە ناو دەستی [و ئەم دیو دیوی پێدەکرد و دەیفەرموو:][١٨٥٠] ((دەبێت موحەممەد گومانی بە خودای خۆی چۆن بێت گەر پێی بگات و ئەمەی هەر لەلامابێتەوە [برۆ بیبەخشە] [ئەی عائیشە ئەو ئاڵتونە ببە بۆ لای عەلی]... دواتر ناردم بۆ لای عەلی و لە ڕێی خوادا بەخشییەوە][١٨٥١].

ئوسامە ﵁ دەفەرموێت: [چوومە سەردانی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای مۆڵەتم کرد بۆ خۆم و چەند هاوەڵێکی خۆی... مۆڵەتی داین و سەردانمان کرد][١٨٥٢]. [ئەو پۆشاکێکی بە خویدا دابوو، گەر بێتاقەت بووایە لای دەبرد و دەیفەرموو: ((نەفرەتی خوا لە جولەکە و گاورەکان بێت گۆڕی پێغەمبەرانیان دەکردە مزگەوت)) دەیویست

---

(١٨٤٧) أخرجه: النسائي (٧٨٥)، وأحمد (٢٣٦٨٩ وابن حبان (٢١٢٥)، والبيهقي (الدلائل) (٣١٨٤) وقال محققه: اسناده صحيح، وقال ابن كثير (البداية) (٢٣٤/٥): سنده جيّد على شرط الصحيح.

(١٨٤٨) أخرجه: أحمد (١٣٥٨٢) والبيهقي (الدلائل) (٣١٨٥) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٨٤٩) أخرجه: ابن سعد (٣١٦/٢) وهو حديث يتقوى بطرقة كما قال صاحب (السيرة في ضوء المصادر الاصلية) (ص:٦٩٠).

(١٨٥٠) أخرجه: أحمد (٢٤٢٢٢) وقال محققوه: اسناده حسن.

(١٨٥١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٩٩٠) وقال الهيثمي في (المجمع) (١٢٤/٣): رجاله رجال الصحيح.

(١٨٥٢) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣٩٣) وقال الشيخ الالباني في (تحذير الساجد) (ص:٤١) : سنده حسن.

ئێمە ئاگادار بکاتەوە لەو کارە (دزێوە))[1853].

لەو شەوەدا کە دواهەمین شەو بوو لە ژیانی پێغەمبەری خوادا ﷺ: دایکی بڕواداران ڕۆنی زەیتی خواست لە دراوسێکانی[1854]، وە پێغەمبەری خواش ﷺ قەڵغانەکەی بە ڕەهن دابووە جولەکەیەك لە بەرامبەر سێ ساع جۆ بۆ خواردنی هاوسەرەکانی[1855].

## لەدواهەمین ڕۆژی ژیانیدا

لە نوێژی بەیانی دا دواهەمین ڕۆژ لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو تەماشای موسوڵمانانی کرد کە لە دوای ئەبوبەکرەوە نوێژ دەکەن و پێیان دڵخۆش بوو.

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: [لە نوێژی بەیانی ڕۆژی دووشەممەدا کاتێك موسوڵمانان لە دوای ئەبوبەکرەوە نوێژی بەیانیان دەکرد، لە ناکاو پێغەمبەری خوا ﷺ پەردەی ژوورەکەی عائیشەی لادا و تەماشای کردن وا بە ڕیز لە دوای ئەبوبەکرەوە نوێژ دەکەن پاشان پێی فەرموون: ((أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلَّا الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ، يَرَاهَا الْمُسْلِمُ، أَوْ تُرَى لَهُ، ثُمَّ قَالَ: أَلَا وَإِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا، فَأَمَّا الرُّكُوعُ فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ عَزَّ وَجَلَّ، وَأَمَّا السُّجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ، فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ))[1856]. واتە: ئەی خەڵکینە لە مژدەدەرەکانی پێغەمبەرایەتی تەنها خەونی چاك ماوە موسوڵمان خۆی ببینێت یان پێوەی ببینرێت. پاشان فەرمووی: من خوێندنەوەی قورئانم لە کاتی سوجود و رکوعدا لێ قەدەغە کراوە (ڕکوع) مەزنی بۆ خودا تێدا نیشان بدەن، وە (سجود)یش نزای زۆری تێدا بکەن شیاوترە وەڵامتان بدرێتەوە].

لە گێڕانەوەیەکی تردا: دایکی بڕواداران عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ دەرگایەکی لە نێوان خۆی و مزگەوتەکەیدا کردەوە یان پەردەکەی لادا لەو کاتەدا ئەبوبەکر ﷺ پێش نوێژیی بۆ دەکردن، سوپاسی خودای کرد بۆ ئەو شێوە باشەی ئەوانی تێدا بینیوە وە ئومێدی خواست خودا بەو جۆرە بیان هێڵێتەوە، دواتر (پێی فەرموون): ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَيُّمَا أَحَدٍ مِنَ النَّاسِ، أَوْ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أُصِيبَ بِمُصِيبَةٍ،

---

(١٨٥٣) أخرجه: البخاري (٤٣٥) ومسلم (٥٢٩).

(١٨٥٤) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٩٩٠) وانظر (السيرة في ضوء المصادر الاصلية) (ص:٦٩١).

(١٨٥٥) أخرجه: البخاري (٤٤٦٧) و (٢٥٠٩).

(١٨٥٦) أخرجه: مسلم (٣٤٨) وابوداود (٨٧٦) والنسائي (١٨٩/٢) وابن ماجة (٣٨٩٩).

فَلْيَتَعَزَّ بِمُصِيبَتِهِ بِي عَنِ الْمُصِيبَةِ الَّتِي تُصِيبُهُ بِغَيْرِي، فَإِنَّ أَحَدًا مِنْ أُمَّتِي لَنْ يُصَابَ بِمُصِيبَةٍ بَعْدِي أَشَدَّ عَلَيْهِ مِنْ مُصِيبَتِي))(١٨٥٧). واتە: ئەی خەڵکینە هەر یەکێك لە ئێوەی بڕواداران گەر خۆشەویستێکی لە دەست دا با دڵنەوایی خۆی بکات بە کارەساتی لەدەستدانی من تا بێتە دڵنەوایی بۆی لەو کارەساتەی تووشی هاتووە، چونکە هەر یەکێك لە ئومەتەکەی من توشی هیچ کارەساتێك نابێت سەختتر بێت لەسەری بە وێنەی کارەساتی لە دەستدانی من. [وە فەرمووی: ((الْحَمْدُ لِلَّهِ أَنَّهُ لَمْ يَمُتْ نَبِيٌّ حَتَّى يَؤُمَّهُ رَجُلٌ مِنْ أُمَّتِهِ))(١٨٥٨). واتە: سوپاس بۆ خوا هیچ پێغەمبەرێك نامرێت تا ئەوکاتەی یەکێك لە ئومەتەکەی پێش نوێژیی بۆ دەکات].

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك لە نوێژی بەیانی ڕۆژی دووشەممەدا بووین ئەبوبەکریش ﷺ پێش نوێژیی بۆ دەکردین، لە ناکاو پێغەمبەری خوا ﷺ پەردەی ژوورەکەی عائیشەی لادا و تەماشای کردن ئەوان وا لەنوێژدان [ڕوخساری لە (خۆشیدا) وەك پەڕەی سپی بوو] پاشان بە زەردەخەنەوە بۆیان پێکەنی، ئەبوبەکر ﷺ ویستی پاژنەکانی بێنێتە دواوە بۆ ناو ڕیزەکە تا شوێنەکەی چۆڵبکات بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو وای دەزانی کە دەیەوێت بێت بۆ نوێژ، وە موسوڵمانان لە خۆشیاندا نزیك بوو نوێژەکەیان ببڕن بەهۆی خۆشحاڵیان بۆ (چاکبوونەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ)]. بەڵام بە دەستی خۆی ئاماژەی بۆ کردن و داوای لێکردن نوێژەکەیان تەواو بکەن، پاشان چووە ژوورەکەی خۆی و پەردەکەی دادایەوە](١٨٥٩).

لە دوای ڕۆژهەڵاتن پێغەمبەری خوا ﷺ فاتیمەی بانگکرد(١٨٦٠). دایکی بڕواداران عائیشە ﷺ دەفەرموێت: [هەموو هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە لای مانەوە تەنها یەکێکیان لەوێ نەبوو، پاشان فاتیمە هات ڕۆیشتنەکەی وەك ڕۆیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ وابوو و پێی فەرموو: ((پێشوازیت لێبێت ئەی کچی خۆم)) لەلای ڕاستی یان چەپی بوو داینیشاند، وتەیەکی بەنهێنی پێوت ئەو گریا، پاشان وتەیەکی

---

(١٨٥٧) أخرجه: ابن ماجة (١٥٩٩) وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١١٠٦) و (صحيح ابن ماجة) (١٣٠٠).

(١٨٥٨) أخرجه: أحمد (الفضائل) (٢١٦٩) وقال محققه: اسناده حسن والحاكم (٢٤٤٩/١) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وابن السني (عمل اليوم والليلة) (ص:٢١٨): اسناده حسن.

(١٨٥٩) أخرجه: البخاري (٦٨٥،٧٥٤،٤٤٤٨)، ومسلم (٤٣٨).

(١٨٦٠) انظر: (السيرة في ضوء المصادر الاصلية) (ص:٦٩١).

تری بەنهێنی پێ وت پێکەنی. پێم وت بۆچی گریایت؟ وتی: نهێنی پێغەمبەری خوایە ﷺ نایدرکێنم (لە دواییدا بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا پێی فەرمووە: ((جبریل هەمووساڵێك یەك جار قورئانی پێ دەور دەکردمەوە، بەڵام لەم ساڵدا دوو جار پێی دەور کردمەوە وادەزانم کۆتایی بە تەمەنم هاتووە وە تۆش یەکەم کەسی لە خزمانمدا کە دەگەیتەوە بە من وە باشترین پێشین بۆ تۆ منم. (فاتیمە) دەڵێت: ئیتر منیش گریام، پاشان بەنهێنی پێی فەرمووم: ((أَلَا تَرْضَيْنَ أَنْ تَكُونِي سَيِّدَةَ نِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ، أَوْ سَيِّدَةَ نِسَاءِ هَذِهِ الْأُمَّةِ فَضَحِكْتُ لِذَلِكَ))[١٨٦١] واتە: ئایا ڕازی نابیت تۆ ببیتە سەروەری ئافرەتانی بڕواداران یاخود سەروەرانی ئافرەتانی هەموو ئەم ئوممەتە. (ئیتر منیش پێ کەنیم).

لەو ساتەدا ئازارەکەی توندتر دەبوو: ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی ئەو ئازارە سەختە دەهات سەری لە باوەشی فاتمەدا بوو ئەو دەیوت: ئای لەو ناڕەحەتییەی تووشم هاتووە بۆ ئەو ناڕەحەتییەی تۆ ئەی باوکە، پێغەمبەری خوا ﷺ سەری بەرزکردووە و فەرمووی: ((ناڕەحەتی لەئەمڕۆ بەدواوە لەسەر باوکت نامێنێت] [ئەی فاتیمە ئەوەی تووشی باوکت هاتووە خودا هیچ کەسێکی لێ بێ بەش ناکات وە توشی دەهێنێت تا دەی باتەوە بۆ ڕۆژی قیامەت][١٨٦٢].

جار جار ئازاری ژەهر خواردنەکەی خەیبەری بۆ دەگەڕایەوە و دەیفەرموو: (([ئەی عائیشە بەردەوام هەست بە ئازاری ئەو خواردنە دەکەم کە لە خەیبەر خواردم ئێستا کاتی پچڕانی شادەمارمە بە هۆی ئەو ژەهرەوە]))[١٨٦٣].

ئوم بەشیر وتی: [بە دایك و باوکمەوە فیداتبم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گومانت لە چییە بەهۆیەوە تووشت هاتبێت؟ فەرمووی: ((منیش هەر ئەو گومانەم هەیە [وادەزانم بە هۆی ئەوە وە (واتە: مەڕە ژەهراویەکە) ئاوها تووش هاتووم]...))][١٨٦٤].

---

(١٨٦١) أخرجه: البخاري (٣٦٢٥،٣٦٢٣) ومسلم (٩٧،٩٩/٢٤٥٠) واللفظ له.

(١٨٦٢) أخرجه: أحمد (١٤١/٣) والترمذي (الشمائل) (٣٣٤) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الجامع) (٢٤٠٠) و (الصحيحة) (١٧٣٨)

(١٨٦٣) أخرجه: البخاري (٤٤٢٨).

(١٨٦٤) أخرجه: أحمد (١٨/٦) وعبدالرزاق (١٩٨١٥) والحاكم (٢٠٩/٣) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي.

جار جار نەخۆشییەکەی بە وێنەیەك لەسەر گران دەبوو بە هۆیەوە لە زمان دەکەوت و قسەی بۆ نەدەکرا.

ئوسامە ﷺ دەفەرمویێت: [لەدوای گران بوونی نەخۆشییەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆم و سوپاکەم هاتینەوە ناو شاری مەدینە، چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا نەی دەتوانی قسە بکات وە دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و پاشان لەسەر من داینا، منیش زانیم کە دوعام بۆ دەکات][١٨٦٥].

بەڵام کەمێك دواتر زۆر باش بوو، عەلی ﷺ چووە دەرەوە مژدەی دا بە خەڵکی ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرمویێت: [عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ لە لای پێغەمبەری خواوە ﷺ [١٨٦٦] چووە دەرەوە لەو نەخۆشییەی کە بەهۆیەوە وەفاتیکرد خەڵکی لێیان پرسی. ئەبو حەسەن ئایا ئەم بەیانییە پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بوو؟ فەرمووی: سوپاس بۆ خوا ئەم بەیانییە باش بوو. لەوێدا عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب ﷺ دەستی عەلی گرت و پێی وت: تۆ دوای سێ ڕۆژی تر دەبیتە داردەستی کەسانی تر، سوێند بە خوا وادەزانم کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم نەخۆشییە وەفات دەکات، چونکە من ڕوخساری بنەماڵەی عەبدولموتەلیب دەناسمەوە کاتێك نزیکی مەرگ دەبنەوە، لەبەر ئەوە وەرە با بڕۆین پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەین ئایا پێشەوایەتی لە دوای ئەو بۆ کێ دەبێت گەر بۆ ئێمە دەبێت با بیزانین، وە گەر بۆ کەسانێکی تر دەبێت با بەڵێنمان بۆ وەربگرێت لێیان. عەلی ﷺ فەرمووی: سوێند بە خوا گەر ئێمە داوای لێ بکەین و نەمانداتێ ئەوا خەڵکیش لە دوای ئەو هەر نامان دەنێ، من سوێند بە خوا داوای ئاوها لە پێغەمبەری خوا ﷺ ناکەم))][١٨٦٧]. عەلی ﷺ دواتر دەیفەرموو: [خۆزگە داواکەی عەباسم جێبەجێ دەکرد، خۆزگە داواکەی عەباسم جێ

---

(١٨٦٥) أخرجه: أحمد (٢٠١/٥) والطبراني (الكبير) (٣٧٧) والترمذي (٣٨١٧) وابن هشام (١٢٠٧) وقال محققه: اسناده حسن، وحسنه الشيخ الالباني في (فقة السيرة) ص٤٩٩، و (صحيح الترمذي) (٣٠٠٠) والشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (١٢٠).

(١٨٦٦) في صبيحة اليوم الذي توفي فيه أخرجه: ابن هشام (٢٠٩٣) وقال محققاه: اسناده صحيح.

(١٨٦٧) أخرجه: عبدالرزاق (٩٧٥٤) والبخاري (٤٤٤٧).

بەجێ دەکرد][١٨٦٨].

لە دوای بیستنی مژدەی چاکبوونەوەی باری تەندروستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیتر خەڵکی بڵاوەیان لێکرد بەلای ئیش و کاریانەوە، و تەنها هەندێکیان لەوێ مانەوە، بەڵام لە پاش کەمێکی تر ئازاری نەخۆشییەکەی گرانترو و بە ئازارتر بوو وە لەو ئاخر ساتەدا چەندەها ئامۆژگاری بە جێ هێشت بۆ موسوڵمانان، ئەوەش لە چەندەها گێڕانەوەی جیاوازدا هاتووە لەوانە:

ئەبو عوبەیدە ﷺ دەفەرموێت: [دواهەمین وشەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەبوو کە فەرمووی: ((قَاتَلَ اللهُ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى؛ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ، لَا يَبْقَيَنَّ دِينَانِ بِأَرْضِ الْعَرَبِ))[١٨٦٩]. واتە: خودا جولەکەو گاورەکان بەکوشتن بەرێت گۆڕی پێغەمبەرانیان کردبووە مزگەوت، نابێت دوو ئاین لەزەوی عەرەبدا بەیەکەوەبن.

وە لە گێڕانەوەیەکی تردا فەرمووی: [((أَخْرِجُوا يَهُودَ أَهْلِ الْحِجَازِ، وَأَهْلِ نَجْرَانَ مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَاعْلَمُوا أَنَّ شِرَارَ النَّاسِ الَّذِينَ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ))[١٨٧٠] واتە: جولەکەکان لە ناوچەی حیجاز و نەجران لە دوورگەی عەرەب دووربخەنەوە، وە بزانن خراپترینی خەڵکی ئەوانەن کە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان دەکەنە مزگەوت.

وە فەرمووی: ((اللَّهُمْ لَا تَجْعَلْ قَبْرِي وَثنا ويَعْبدُ))[١٨٧١] واتە: خودایە ڕێگە مەدە گۆڕەکەم بکرێتە بت و بپەرسترێت. وە فەرمووی: ((تورەبوونی خودا توندتر بووە لە سەر کەسانێك کە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردۆتە مزگەوت] ئەوانەی لە لای بوون: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەتمان بۆ بکە، فەرمووی: ((أُوصِيكُمْ بِالسَّابِقِينَ الْأَوَّلِينَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ، وَأَبْنَائِهِمْ مِنْ بَعْدِهِمْ إِلَّا تَفْعَلُوا لَا يُقْبَلُ مِنْكُمْ صَرْفٌ وَلَا عَدْلٌ))[١٨٧٢] واتە: وەسیەتتان

---

(١٨٦٨) أخرجه: ابن طاهر (الفوائد) واسناده جيّد كما قال الحافظ في (فتح الباري) (١٤٢/٨).

(١٨٦٩) أخرجه: مالك (١٥٨٣) والبيهقي (الكبرى) (١٣٥/٦) وفي (الدلائل) (٣١٩٦) وقال محققه: صحيح لغيره وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الجامع) (٤٦١٧).

(١٨٧٠) أخرجه: أحمد (١٦٩١) وقال محققوه: اسناده صحيح، والدارمي (٢٤٩) والبيهقي (الكبرى) (٢٠٨/٩) وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١١٣٢).

(١٨٧١) أخرجه: مالك (١٧٣/١) وأحمد (٢٤٦/٢) والحميدي (١٠٢٥) وصحح اسناده الشيخ الالباني في (احكام الجنائز) (٢١٦) و (غاية المرام) (٢٥، ١٢٦).

(١٨٧٢) أخرجه: البزار (١٠٣٢) والطبراني (الاوسط) (٨٧٤) وقال محققه: اسناده حسن.

بۆ دەکەم ڕفتارتان باش بێت لەگەڵ ئەوانەی یەکەمین جار کۆچیانکرد لەگەڵ خۆیان و نەوەکانیان لە دوای خۆیان، گەر وانەکەن هیچ چاکەیەکتان لێومرناگیرێت ببێتە هۆکارو سڕینەوەی تاوانەکانتان.

ئەنەس رضي الله عنه دەفەرموێت: [دواهەمین ئامۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی گیان کێشانیدا ئەوە بوو بە ناڕەحەت بە زمان دەری دەبڕی و دەیفەرموو: ((الصَّلاةَ الصَّلاةَ، اتَّقُوا اللَّهَ فِيمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ))[1873] واتە: ئاگاتان لە نوێژەکانتان و بەردەستەکانتان بێت، ئاگاتان لە نوێژەکانتان و بەردەستەکانتان بێت، و دەیفەرموو: ((أَرْحَامَكُمْ أَرْحَامَكُمْ))[1874] ئاگاتان لە خزمەکاتنان بێت، ئاگاتان لە خزمەکانتان بێت.

تاو تاو دڵی دایکی بڕوادارانی دەدایەوە و دەیفەرموو: ((إِنَّهُ لَيُهَوِّنُ عَلَيَّ الْمَوْتَ أَنْ أُرِيتُكِ زَوْجَتِي فِي الْجَنَّةِ))[1875] واتە: ئێستا مردنم لە سەر ئاسانە دوای ئەوەی بینیم تۆ هاوسەرمی لە بەهەشتدا.

بەوجۆرە کات گەیشتە جێشتنگاو ئازارەکەی هێندە گران بوو نەی دەتوانی بچێتە سەر ئاو، دایکی بڕواداران عائیشە رضي الله عنها دەفەرموێت: [...پێغەمبەری خوا ﷺ داوای تەشتێکی کرد منیش بۆم هێنا میزی تێکرد...][1876] [وە لەنیعمەتە گەورەکانی خودا بەسەرمەوە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵەکەی مندا و لە ڕۆژەکەی مندا وە سەری لە باوەشی مندابوو وەفاتی کرد، وە خودا لیکی من و ئەوی لە سیواکێکدا کۆکردەوە، عەبدڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری برام هاتە ژوورەوە و سیواکێکی [تەڕی] بەدەستەوە بوو بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای دەکرد [منیش زانیم کە پێویستی بە سیواکە][1877]. وە دەمزانی ئەو پێشتر چەند سیواکی خۆش دەویست، من وتم: ئەو سیواکەت بۆ بهێنم؟ ئەو بە سەری پیرۆزی ئیشارەتی بۆ کردم: بەڵێ، منیش

---

(١٨٧٣) أخرجه: أحمد (٢٦٧٣٦) وابن ماجة (٢٦٩٧) وابويعلى (٦٩٣٦) وابن حبان (٦٦٠٥) وقال محققه صحيح على شرطهما، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٨٦٨) و (الاواء) (٢١٨٧) و (صحيح ابن ماجة) (٢١٨٣).

(١٨٧٤) أخرجه: ابن حبان (٤٣٦) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

(١٨٧٥) أخرجه: أحمد (٢٥٠٧٦) (١٣٨/٦) والمروزي (زوائد الزهد) (٢٠٧/٢) وحسنّه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٨٦٧)، وقال ابن كثير (البداية) (٣٣٦/٥): اسناده لابأس به.

(١٨٧٦) أخرجه: البخاري (٤٤٥٩) والنسائي (٣١/١) والترمذي (شمائل) (٣٢٣) وابن خزيمة (٦٥) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٨٧٧) أخرجه: أحمد (٢٤٢١٦) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

سیواکەکەم بۆ لێوەرگرت بەڵام نەیتوانی بەکاری بهێنێت. پێم وت: بۆتی نەرم بکەم؟ بەسەری پیرۆزی ئیشارەتی بۆ کردم: بەڵێ. منیش [گازم لێگرت و پاك وخاوێنم کرد] [و پاشان پێم بەخشی ئەویش لێی وەرگرتم و بەکاری هێنا [هەرگیز نەمبینی بوو ناودەمی بەو جۆرە بە سیواك خاوێن بکاتەوە] [پاشان ویستی سیواکەکە بەرز بکاتەوە و بیداتە دەستم بەڵام لە دەستی کەوتە خوارەوە] لەبەردەستی دا جامێك ئاو هەبوو هەردوو دەستی کردە ئەو ئاوە وە دەیهێنا بە دەم و چاویدا و دەیفەرموو: (لَاْ إلهَ إلاّ اللّه) بەڕاستی مردن ئازاری زۆرە][١٨٧٨].

دایکی بڕواداران عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [من ئازارەکانی گیان کێشانم بەلاوە ئاساییە لەسەر هەر کەسێك لە دوای ئەوەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ وەمبینی][١٨٧٩] وە دەیفەرموو: [خۆزگە بۆ هیچ کەسێك ناخوازم کە مردن و گیان کێشانی لەسەر ئاسان بێت لەدوای بینینی ئازاری گیان کێشانی پێغەمبەری خوا ﷺ][١٨٨٠] [پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی لەشساغیدا دەیفەرموو: ((هیچ پێغەمبەرێك نامرێت تا جێگەکەی خۆی پیشان نەدرێت لە بەهەشتدا و پاشان سەرپشك دەکرێت)).

ئالەو کاتی گیان کێشانەدا....زوو زوو دەبورایەوە][١٨٨١] [وە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی پێشتر سورەتی فلق و ناسی دەخوێند فوی پیادەکرد دەیهێنا بەسەر خۆیدا بەڵام ئەم جارەیان نەیتوانی][١٨٨٢] و[وە ئازارەکەی زیاتر بوو، ئینجا من دەم خوێندو] [و فووم بە دەستی خۆیدا دەکرد دەم هێنا بە جەستەیدا][١٨٨٣] و [بە ئومێدی بەرەکەتی دەستی خۆی][١٨٨٤] بووم [وە ئەم دوعایەم بەسەردا دەخوێند: ((اللّهُم رَبَّ النّاسِ أَذْهِبِ الْبَاسَ، رَبَّ النَّاسِ، وَاشْفِ وَأَنْتَ الشَّافِي، لَا شِفَاءَ إِلَّا شِفَاؤُكَ، لَا يُغَادِرُ سَقَمًا))][١٨٨٥]. واتە: ئەی خودای هەموو خەڵکی ئەم ناڕەحەتییە لاببە و خۆت شیفای بدە چونکە

(١٨٧٨) أخرجه: البخاري (٤٤٤٩) وأحمد (٢٤٢١٦).

(١٨٧٩) أخرجه: البخاري (٤٤٤٦) وأحمد (٢٤٣٥٤) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرطهما.

(١٨٨٠) أخرجه: الترمذي و (السنن) (٩٧٩) وصححه الشيخ الالباني في (مختصر الشمائل) (٣٢٥).

(١٨٨١) أخرجه: البخاري (٤٤٣٧).

(١٨٨٢) أخرجه: البخاري (٥٧٥١).

(١٨٨٣) أخرجه: البخاري (٤٤٣٩).

(١٨٨٤) أخرجه: البخاري (٥٠١٦).

(١٨٨٥) أخرجه: ابن ابي شيبة (٤٥/٨) وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٧٧٥).

هەر خۆت شیفا بەخشی هیچ شیفایەك نییە جگە لە شیفای تۆ، شیفایەك ببەخشە شیفادەری هەموو دەردو نەخۆشییەکان تۆیت.

کاتێك بە ئاگا هاتەوە [هەردوو دەستی خۆی لە ناو دەستم ڕاکیشاو فەرمووی: ([بَلْ أَسْأَلُ اللهَ الرَّفِيقَ الْأَعْلَى [مِنَ الجَنَّةِ] مَعَ جِبْرِيلَ، وَمِيكَائِيلَ، وَإِسْرَافِيلَ])[١٨٨٦]. واتە: نا بەڵکو داوا دەکەم ببمە هاوڕێی هاوەڵانی هەرە بەرز لە بەهەشتدا لەگەڵ جبرائیل و مکائیل و اسرافیل. [عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [منیش وتم سوێند بەوەی تۆی ناردوە بەحەق سەرپشك کرایت و خۆت هەڵتبژارد، ئیتر هەستم کرد سەری قورستر بوو لە باوەشم داو تەماشام کرد چاوەکانی ئەبڵەق بوو بەرەو ئاسمان][١٨٨٧] [وە تووشی کۆکەیەك هات][١٨٨٨] وە هەر دەیفەرموو: (([خودایە لێم خۆش ببە و بەزەیت هەبێت بۆم وە بمگەیەنە بە هاوەڵانی هەرە ژوورو (ئەوەی سێجار دووبارە کردەوە) بمگەیەنە بەوانەی نعمەتەکانی خۆتت پێ بەخشیون لە پێغەمبەران و شەهیدان و پیاو چاکان هەر ئەوانیش باشترین هاوڕێن][١٨٨٩] [عائیشە ﵂ دەفەرموێت: وتم: کەواتە ئێمەت هەڵنەبژارد][١٨٩٠] [وە[١٨٩١] بینیم ڕوخساری سور هەڵگەڕا و عارەقی دەکرد، من پێشتر مردنی کەسم نەبینی بوو بە منی فەرموو: ((دام نیشێنە)) منیش سەریم خستە سەر شانم... و سەری هات بە لادا و سەری کەوتە نێوان گەردن و سەر سنگم[١٨٩٢].

وە لە دەمی پیرۆزی یەك دڵۆپ ئاوی سارد هاتە خوارەوە و کەوتە سەر خواری گەردنم و بەهۆیەوە موچوڕکەیەك بە پیستمدا هات [وە لاشەی شل بوو لە باوەشم کەوتە خوارەوە بۆ سەر جێگەکەی] من وامزانی بوراوەتەوە [وە بۆنێکی زۆرخۆش لە ژوورەکەدا بڵاو بووەوە] [ئینجا منیش سەریم خستە سەر پشتیەکەی][١٨٩٣] و دام

---

(١٨٨٦) أخرجه: النسائي (الكبرى) (٧١٠٤) و (عمل اليوم) (١٠٩٧) وابن حبان (٦٥٩١) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم والبيهقي (الدلائل) (٣٢٠٨) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٨٨٧) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٢١٥) وقال محققاه: اسناده حسن، وصححه صاحب (صحيح سيرة ابن هشام) (٢٠٨٦).

(١٨٨٨) أخرجه: البخاري (٤٤٣٥).

(١٨٨٩) أخرجه: البخاري (٤٤٤٠) و (٤٤٤٩) ومسلم (٨٥/٢٤٤٤). و (صحيح ابن ماجة) (١٣١٢).

(١٨٩٠) أخرجه: البخاري (٤٤٣٧،٤٤٣٥).

(١٨٩١)الحديث من هنا: أخرجه: أحمد (٢٥٨٤١) وقال محققوه: اسناده حسن.

(١٨٩٢) أخرجه: البخاري (٤٤٤٩).

(١٨٩٣) أخرجه: أحمد (٢٦٤٠٨) و (٢٦٣٩) وابويهلى (٤٥٨٦) وابن هشام (١٢١٦) وقال محققاه: اسناده حسن والبيهقي

پۆشی [چونکە من مردووم نەبینی بوو پێشتر تا بە هۆیەوە ئاگاداربم لە مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ] [لەوکاتەدا عومەر و موغیرەی کوڕی شوعبە داوای ئیزنیان کرد بێنە ژوورەوە، منیش ئیزنم دان و خۆم بالآپۆش کرد، عومەر هات و تەماشای کرد و [وتی: عائیشە ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ چیەتی بۆ ئاوهایە؟ وتم: ماوەیەکە لە هۆش خۆی چووە و بوراوەتەوە، ئەویش پۆشاکەکەی بەسەر دەمو چاویەوە لابرد و وتی:][١٨٩٤] ئەی هاوار ئەم بورانەوەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ چەند نارەحەتە [بەڕاستی ئەمە خەمێکی گەورەیە پاشان دای پۆشی یەوە بەڵام موغیرە هیچی نەوت].

پاشان هەردووکیان هەستان و کاتێك گەیشتنە بەردەرگای ژوورەکە موغیرە وتی: ئەی عومەر پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتیکردووە. عومەر فەرمووی: درۆ دەکەیت تۆ پیاوێکی بوێری لە ئاژاوەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ نامرێت تا خوای گەورە دووڕووەکان لە ناو دەبات، پیاوانێکی دووڕوو مەگەر بڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ مرد، نا نامرێت بەڵکو ئەوە دەچێتەوە بۆ لای خودا وەك موسای کوڕی عیمران کە بۆ ماوەی چل ڕۆژ لە قەومەکەی دیارنەما و پاشان گەڕایەوە لایان دوای ئەوەی وتبوویان مردووە سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ وەك موسا دەگەڕێتەوە ناومان و دەست و قاچی ئەوانە دەبڕێت کە دەڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ مردووە][١٨٩٥] [سوێند بە خوا گوێم لە هەرکەسێك بێت باسی ئەوە بکات پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردووە من بە شمشێرەکەم لێی دەدەم][١٨٩٦].

[لەوێدا عەباس وتی: ئەی خەڵکینە هیچ کەسێك بەڵێن و پەیمانێکی هەیە لە لایەن پێغەمبەری خوا ﷺ؟ وتیان: نەخێر. وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ [وەفاتی کرد ئەو مرۆڤە.... وە ئەو بەڕێزترە لە لای خودا کە دووجار بمرێت ئایا خودا یەك جار ئێوە دەمرێنێت ئەی چۆن دەبێت ئەو دووجار بیمرێنێت، ئەو لە لای خودا زۆر لەوە بەڕێزترە... گەر وەك ئەوەی [عومەر] دەیڵێت وەها بێت ئەو کات گران نابێت

---

(الدلائل) (٣٢١٥) وحسن اسناده الشيخ الالباني في (الارواء) (٨٦/٧).

(١٨٩٤) أخرجه: أحمد (٢٥٨٤١) وقال محققوه: اسناده حسن، والبيهقي (الدلائل) (٣٢١٦).

(١٨٩٥) أخرجه: البخاري (٤٤٥٣،٤٤٥٤) وأحمد (٢٤٨٦٣). يبدو انهم خرجوا من البيت وجاء بعد ذلك العباس و استبان لهم موت رسول الله ﷺ.

(١٨٩٦) أخرجه: الترمذي (الشمائل) (٣٧٨) وصححه الشيخ الالباني في (مختصر الشمائل) (٣٣٣).

لەسەر خودا لەناو خۆڵدا جارێکی تر بیهێنێتەدەر، سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ نەمرد تا ڕێگەی بۆ ڕووناك و ئاشكرا كردین حەڵاڵی بە حەڵاڵ داناو حەرامیشی قەدەغەکردو ژنی خواست و جیا بووە وە و جەنگ و ئاشتی بەرپاکرد... ئەی خەڵکینە با پێغەمبەری خوا ﷺ بنێژین][1897].

[سالمی کوڕی عوبەید ﷺ دەفەرموێت: ئەوان خەڵکێکی نەخوێندەوار بوون وە پێشتریش پێغەمبەریان لە ناودا نەبوو، لەبەر ئەوە هەموو وەستان و هیچیان نەکرد و بەمنیان وت: سالم برۆ ئەبوبەکری هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگ بکە، منیش چووم بە دوایدا لەو کاتەدا لە مزگەوتەکەی ناوچەی (ئەلسەنەح) بوو، چوومە خزمەتی و دەگریام، کاتێك منی بینی وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد؟ وتم: عومەر ﷺ دەڵێت: ببیستم هەر کەسێك بڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردووە بەم شمشێرەی خۆم لێی دەدەم. ئەبو بەکر ﷺ وتی: بابڕۆین] [ئینجا ئەبوبەکر بە سواری ئەسپەکەی لە ناوچەی سەنحەوە گەڕایەوە و لە بەردەم دەرگای مزگەوت دابەزی][1898] و [پێشتریش خەڵکی چووبوونە ناو ژوورەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەبوبەکر هات و فەرمووی: ئەی خەڵکینە هەموو وەرنە دەرەوە][1899] [چووە ژوورەکەی عائیشە و قسەی لەگەڵ کەس نەکرد] وتی: عائیشە پێغەمبەری خوا ﷺ چیەتی؟ وتم: ماوەیەکە بوراوەتەوە. ئەبوبەکر ﷺ نزیکبووە وە و پۆشاکەکەی لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ لابرد [و تەماشای ڕووخساری کرد] و فەرمووی: [بە باوك و دایکمەوە بە فیدات بین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چەند بۆن خۆشی بە زیندوویی و بە مردویی، سوێند بە خوا دووجار خودا تۆ نامرێنێت و ئەو مردنەی لەسەرت بوو پێی گەیشتیت][1900] وە فەرمووی: (إنا للّهِ وَأَنّا إلهِ راجِعونَ) پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردووە.

---

(١٨٩٧) أخرجه: ابن سعد (٥٣/٢) والدارمي (٧٦،٨٤) والبزار (٢٤٦٧) وعبدالرزاق (٤٣٤/٥)، والبيهقي (الدلائل) (٣٢١٦) صحح اسناده كل من الحافظ العسقلاني في (المطالب) (٤٣٢٢) والبوصيري (الاتحاف) (٢٧٧٠) من رواية الطبراني متصلاً، وقال الخريصي في (زوائد عبدالرزاق) (٦١/٢): قويٌ بشاهده.

(١٨٩٨) أخرجه: البخاري (٤٤٥٣،٤٤٥٤) وأحمد (٢٤٨٦٣) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(١٨٩٩) أخرجه: الترمذي (الشمائل) (٣٧٨) وصححه الشيخ الالباني في (مختصر الشمائل) (٣٣٣).

(١٩٠٠) أخرجه: البخاري (٤٤٥٣).

ئینجا هاتە لای سەری [هەردوو دەستی لەسەر قوڵی پێغەمبەری خوا ﷺ داناو ناوچەوانی ماچکرد و فەرمووی: ئەی هاوار بۆ پێغەمبەرەکەم] پاشان سەری سوڕان و ماچی ڕومەتی لای ڕاستی کرد و فەرمووی: ئەی هاوار بۆ هاوڕێ تایبەتەکەم، پاشان سەری سوڕاندو ماچی ڕومەتی لای چەپی کرد و فەرمووی: ئەی هاوار بۆ خۆشەویستە تایبەتەکەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ][1901]، [پاشان پێغەمبەری خوای ﷺ داپۆشییەوە] چووە دەرەوە بۆ ناو مزگەوت [بۆ لای خەڵکەکە] عومەر لەو کاتەدا هەر قسەی دەکرد وتاری دەداو دەی وت: پێغەمبەری خوا ﷺ نامرێت تا ئەوکاتەی خودا دووڕووەکان لە ناو دەبات. [بەو جۆرە عومەر ﷺ قسەی دەکرد و هەڕەشەی دەکرد و کەف کەوتبووە سەر لێوەکانی] ئەبوبەکر ﷺ فەرمووی: [ئەی پیاوی سوێند خۆر لەسەرخۆبە] [دانیشە عومەر، بەڵام دانەنیشت، [ئینجا ئەبوبەکر چووە سەر منبەرەکە] [خەڵکی ڕوویان تێ کرد و دووركەوتنەوە لە عومەر]، [ئەبوبەکر ﷺ سەرەتا سوپاس و ستایشی خودای کرد [ئینجا عومەریش ئارام بوو]، [پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئایا هەرکەسێك لە ئێوە پەیمانێکی پێدراوە لە لایەن پێغەمبەری خوا ﷺ (واتە: کە نەمرێت؟) وتیان: نەخێر] [فەرمووی: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ (الزمر) واتە: تۆ دەمریت و ئەوانیش دەمرن. پاشان فەرمووی: ﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ أَفَإِين مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾ (الأنبياء) واتە: ژیانی هەتا هەتاییمان پێش تۆ نەبەخشیوەتە هیچ مرۆڤێك ئایا ئەگەر تۆ بمریت ئەوان بە هەتا هەتایی دەمێننەوە. هەروەها دەفەرموێت: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ...... ﴿١٨٥﴾ ﴾ (آل عمران)[1902]. واتە: هەموو نەفسێك دەبێت مردن بچێژێت].

[لەبەر ئەوە هەر کەسێك خوای گەورەی پەرستووە ئەوە دڵنیا بێت خودا زیندووەو و هەرگیز نامرێت، وە هەرکەسێکیش موحەممەدی پەرستووە ئەوە موحەممەد وەفاتی کرد. خودا دەفەرموێت ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ أَفَإِين مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ (آل عمران) واتە:

---

(١٩٠١) أخرجه: أحمد (٢٥٨٤١) وقال محققوه: اسناده حسن.

(١٩٠٢) الحديث من الحاشية رقم (٤٦٥) الى هنا: أخرجه: أحمد (٢٥٨٤١) وقال محققوه: اسناده حسن، الدارمي (٨٤) والبيهقي الدلائل (٣٢١٦) والترمذي (الشمائل) (٣٧٨) ورواية (البزار) (٢٤٦٧)، وقد رتبناها والفنا بينها وقد جاءت منسقةً.

موحەممەدیش تەنها هەرپێغەمبەرێکە، پێش ئەویش گەلێ پەیامبەرانی تر هاتوون و رۆیشتوون گەر ئەو وەفاتیکرد وەیان کوژرا و شەهیدبوو ئێوە پاشگەز دەبنەوەو لەدین وەردەگەڕێن؟ خۆ هەرکەسێکیش پاشگەز بێتەوەو لەدین وەرگەڕێ باچاك بزانێت کە هەرگیز ناتوانێ زیانێ بەخوا بگەیەنێت دڵنیاشبن کەخوا پاداشتی شوکرانە بژێران دەداتەوەو سەریان دەخات).

عومەر ﷺ فەرمووی: بۆ ئەوە لە قورئاندایە [ئەی ئەبوبکر؟] وتی: بەڵێ. [عومەر ﷺ فەرمووی: دەت وت من هەرگیز ئەو ئایەتەم نەخوێندۆتەوە تەنها ئەو رۆژە نەبێت][١٩٠٣] [سوێند بە خوا هەر ئەوە بوو ئەو ئایەتەم لە ئەبو بەکرەوە بیست کە دەیخوێندەوە، ئیتر لە جێی خۆم کەوتم بە زەویداو قاچەکانم توانای هەڵگرتنی منیان نەما، ئەوجار دڵنیابووم کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردووە].

[ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: سوێند بە خوا خەڵکی دەت وت هەرنەیان زانیوە کە ئەو ئایەتە دابەزیوەتە خوارەوە تا ئەبوبەکر ﷺ بۆی خوێندنەوە، ئیتر هەموویان دەم بە دەم دەیان خوێندەوە][١٩٠٤] [دایکی بڕواداران عائیشە ﷺ دەفەرموێت: .... هەردوو وتارەکەی ئەبوبەکر و عومەر خودا کردیە جێی سود بۆ موسوڵمانان، عومەر لە رێگەی وتارەکەیەوە خەڵکی ووریاکردەوە لە دووڕووەکان لەو ساتە ناسکەدا و بەهۆیەوە خودا پشتگیری لە بڕوادارەکان کرد][١٩٠٥] [وە بڕوادارانیش دڵخۆش بوون و گەشانەوە بە وتارەکەی ئەبوبەکر ﷺ و دووڕووەکانیش هێندەی تر تووشی خەمۆکی هاتن، عەبدوڵڵای کوڕی عەمران ﷺ دەفەرموێت: سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە دەت وت ڕووپۆشێکمان بە ڕووخسارەوە بوو لەسەرمان لابرا][١٩٠٦].

---

(١٩٠٣) أخرجه: ابن ماجة (١٦٢٧) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (١٣١٩).

(١٩٠٤) أخرجه: البخاري (٤٤٥٤).

(١٩٠٥) أخرجه: البخاري (٣٦٦٩).

(١٩٠٦) أخرجه: البزار (٢١٥٤) وقال الهيثمي في (المجمع) (٣٨/٩) رجاله رجال الصحيح غير علي بن منذر وهو ثقة.

## دیاریکردنی جێنشینێك بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ

عومەر ﷺ دەفەرموێت: [...کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، برایانی ئەنصارمان بە جیا لە ئێمە لە ناو خۆیاندا کۆبوونەوە لە کەپری جێ دانیشتنی بەنی ساعیدەدا، وە عەلی و زوبەیر و هەندێ کەسی تر لەگەڵیان بوو، ئەوانیش خۆیان جیاکردەوە وە موهاجیرەکانیش هەموو لای ئەبوبەکر کۆ بوونەوە. من بە ئەبوبەکرم ﷺ وت: ئەی ئەبوبەکر وەرە با بڕۆین بۆلای برایانی ئەنصارمان. لەگەڵم هات و هەموو ڕۆیشتین، کاتێك لێیان نزیك بوینەوە دوو پیاوی زۆر چاکیان بە ئێمە گەیشتن و دەنگ و باسی ئەوانیان پێ ڕاگەیاندین و وتیان: ئەی موهاجرەکاَن دەتانەوێت بۆ کوێ بچن؟ وتمان: دەمانەوێت بچینە لای ئەو برا ئەنصاریانەمان. وتیان: پێویست ناکات بچنە لایان ئێوە بڕیاری خۆتان بدەن. من وتم: سوێند بە خوا ئێمە دەچینە لایان بۆ جێگەی دانیشتنەکەیان، لەوێ پیاوێك دانیشتبوو، وتم: ئەوە کێیە؟ وتیان: ئەوە سەعدی کوڕی عوبادەیە وتم: ئەوە چیەتی؟ وتیان: ناساغە، ئینجا لە لایان دانیشتین پاش کەمێك یەکێك بەناوی هەموویانەوە هەستاو سوپاس و ستایشی خودای کرد و پاشان وتی: (ئێمە پشتیوانی خوداین و چەکدارانی ئیسلامین، ئێوەش ئەی کۆمەڵی موهاجیرەکان کەسانێکن لە قەومی خۆتان دوور کەوتونەتەوە و ئەوان دەیانەوێت ئێمە لە بنکەی خۆمان بچوك بکەنەوە و دەسەلاّتمان لێ دوور بخەنەوە).

عومەر ﷺ دەفەرموێت: کاتێك ئەو بێ دەنگ بوو من ویستم قسە بکەم و وتەیەکی باشم ئامادە کردبوو دەم ویست لە بەردەم ئەبوبەکردا بیڵێم، ئەو هەندێك توڕەبوونی تێدابوو من لەگەڵی دەگونجام ویستم قسە بکەم، ئەبوبەکر وتی: بوەستە لەسەرخۆبە. ئیتر منیش پێم ناخۆش بوو توڕەی بکەم. پاشان ئەبوبەکر قسەی کرد ئەو لە من زۆر ئارامترو سەنگینتربوو، سوێند بە خوا تەنها وشەیەکی جێ نەهێشت لەوەی کەمن لە دڵمدا ئامادەم کردبوو، ئەبوبەکر هەموو ئەوانە و لەوانەش چاکتری وت تا بێدەنگی کردن وتی: ئەو چاکانەی ئێوە باسی دەکەن ڕاست دەکەن ئێوە خاوەنین، بەلاّم ئەو پێشەوایەتییە تەنها بۆ قوڕەیش ناسراوە ئەوان جێگەیان

ناو جەرگەی عەرەبە و پێگەیان دیارەوە [لە هەمووان عەرەب ترن][١٩٠٧] [لەبەر ئەوە ئێمە پێشەواکانین و ئێوەش وەزیر و هاو کارەکانن].

حوبابی کوڕی مونزیر وتی: نا سوێند بەخوا کاری وەها ناکەین دەبێت پێشەوایەك لە ئێوە و پێشەوایەك لە ئێمە بێت، ئەبوبەکر ﷛ فەرمووی: نا ئێمە بەرپرسانین وە ئێوەش وەزیر و هاوکارانن][١٩٠٨]. [ئەی کۆمەڵانی ئەنسار ئێمە نکوڵی لە مافتان ناکەین و هیچ بڕوادارێك کاری وەها ناکات، ئێمە سوێند بە خوا هەر خێرو چاکەیەکمان بەدەست هێنابێت ئێوە بەشدارمان بوون، بەڵام عەرەبەکان ڕازی نابن و مل کەچ نابن تەنها بۆ پیاوێکی قوڕەیشی نەبێت، چونکە ئەوان لە هەمووان زمان پاراو ترن، وە لە هەمووان جوانخاسترن، وە جێگەیان لە ناوجەرگەی عەرەبدایە وە خزمایەتیان لەگەڵ هەموو عەرەبدا هەیە][١٩٠٩]. [ئێمەی موهاجیرەکان یەکەمین کەس بووین لە موسوڵمان بووندا وە هەر ئێمە هۆز و نزیك و خزمی پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، عەرەب تەنها بە پیاوێکی قوڕەیشی بەرێوە دەچێت، وە خەڵکی هەموو بەدوای قوڕەیشەوەن، ئێوە برایانی ئێمەن لە کتێبەکەی خودا و بەشداربووانی ئێمەن لە ئاینی خودا وە خۆشەویستترین کەسانی ئێمەن، ئێوە شیاوترین کەسن کە بە فەرمانەکانی خودا ڕازیبن وە دان بە پایە بەرزی براکانتاندا بنێن وە ئیرەییان پێ نەبەن لەسەر هیچ خێرێك][١٩١٠].

[وە من ڕازیم بەوەی کە یەکێك لەو دووپیاوە (هەڵبژێرن) و پەیمانیان بدەنێ، ئینجا دەستی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراحی گرت کە دانیشتبوو لەگەڵ عومەری کوڕی خەتاب][١٩١١] [عومەر ﷛ فەرمووی: (بەڵکو ئێمە هەموو بەڵێن و پەیمان بە تۆ دەدەین، هەر تۆیت سەروەرمان وە چاکترینمان وە خۆشەویست ترینمان لە لای خوداو پێغەمبەر ﷺ][١٩١٢] [ئینجا وتاربێژی ئەنصاریەکان هەستاو وتی: ئایا دەزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە موهاجیرەکانەو دەبێت جێنشینەکەشی لە موهاجیرەکانبێت،

(١٩٠٧) أخرجه: البخاري (٣٩٢٨،٣٤٤٥،٦٨٣٠) ومسلم (١٦٩١) وابوداود (٤٤١٨).

(١٩٠٨) أخرجه: البخاري (٣٩٢٨).

(١٩٠٩) أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٨٢٠٦) وابن سعد (٢١١/٣) مرسلًا من ابن سيرين ومراسيله صحيحة عند اهل العلم.

(١٩١٠) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٣٣٤).

(١٩١١) أخرجه: البخاري(٦٨٣٠) ومسلم (١٦٩١).

(١٩١٢) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٣٣٤).

وە ئێمەش پشتیوانانی پێغەمبەری خوا ﷺ بووین وە پشتیوانی جێ نشینەکەشی دەبین بە وێنەی پشتیوانی کردنمان لە پێغەمبەری خوا ﷺ [ئەبوبەکر ﷛ فەرمووی: خودا پاداشتی خێرتان بداتەوە ئەی کۆمەڵانی ئەنصار وتەبێژەکەشتان جێگر و دامەزراو بکات سوێند بە خوا گەر کارێکی ترتان بکردایە جگە لەمە ئێمە لەگەڵتان پێك نەدەهاتین][١٩١٣] [ئینجا عومەر ﷛ فەرمووی: ئەی کۆمەڵانی ئەنصار نزیکترینتان بە پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەبوبەکرە) هاوڕێی ئەشکەوتەکەیەتی][١٩١٤] [کێ هەیە خاوەنی ئەم سیانە بێت (واتە: یاری ئەشکەوت و خۆشەویست و هاوڕێ)][١٩١٥] [ئەی کۆمەڵانی ئەنصار ئایا دەزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد لە جێی ئەو پێش نوێژیی بۆ خەڵکی بکات؟ ئایا کێ لە ئێوە ڕێگە بە خۆی دەدات پێشی ئەبوبەکر ﷛ بکەوێت؟ وتیان: پەنا بە خوا دەگرین کە پێشی ئەبوبەکر بکەوین][١٩١٦].

[وە عومەر ﷛ فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئەوەتا ئەوە ئەبوبەکرە ڕیش سپی موسوڵمانان پەیمان و بەڵێنی بدەنێ][١٩١٧] [ئینجا دەنگە دەنگ پەیدا بوو و دەنگ بەرز کرایەوە لە دووبەرەکایەتی ترسام بۆیە وتم: ئەبوبەکر هەردوو دەستت بکەرەوە، ئینجا من دەستم خستە ناو دەستی و پەیمانم دایەو پاشان موهاجیرەکانیش یەك بە دوای یەکدا پەیمانیان پێدا، پاشان ئەنسارەکانیش هەموو پەیمانیان پێدا.... ئێمە سوێند بە خوا هیچ کارێکمان نەبینیوە بە هێزتربێت لە پەیماندان بە ئەبوبەکر، چونکە ترساین گەر لەوان جیابووینەوە و بەڵێن بەکەس نەدرا ئەوان بەڵێن و پەیمان بدەنە کەسێکی تر لە دوای ئێمە، ئەو کات ئێمە یان دەبوو پەیمانی بدەینێ هەرچەندە نارازیش بین یان دەبوو ناکۆکیان بین و ئەوکات بەهۆیەوە ئاژاوە دروست دەبوو][١٩١٨] [لەبەر ئەوە هەموو پێکەوە بەڵێن و پەیمانمان دایە ئەبوبەکر وە هەموو

---

(١٩١٣) أخرجه: أحمد (٢١٦١٧) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والطبراني (٤٧٨٥) والحاكم (٧٦/٣)، البيهقي (الكبرى) (١٤٣/٨) وقال ابن كثير (البداية) (٢٤٨/٥): اسناده صحيح.

(١٩١٤) أخرجه: ابن اسحاق في (الزهريات) واسناده صحيح كما قال الحافظ (فتح الباري) (١٨٧/١٢).

(١٩١٥) أخرجه: الترمذي (الشمائل) (٣٥٠) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الشمائل) (٣٣٣).

(١٩١٦) أخرجه: أحمد (٩٥/١) واسناده حسن كما قال الحافظ (الفتح) (١٨٧/١٢) وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند فما ليس في الصحيحين) (٨٥٤): حديث حسن.

(١٩١٧) أخرجه: أحمد (٢٥٨٤١) وقال محققوه: اسناده حسن.

(١٩١٨) أخرجه: البخاري (٦٨٣٠) ومسلم (١٦٩١).

پێی ڕازی بووین][١٩١٩].

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: [بەڵێن و پەیمان درا بە ئەبوبەکر لە سەقیفەی جێ دانیشتنی ئەنصاریەکاندا] [و ڕۆژی دوای ئەوە عومەر ﷺ لەسەر مینبەری مزگەوت پێش ئەبوبەکر ﷺ هەستا و سوپاس و ستایشی خودای کرد و پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکینە من دوێنی قسەیەکم بۆ کردن ئەوە نە لە کتێبەکەی خودایا بینیومە وە بەڵێنی پێغەمبەری خواش ﷺ نەبووە بۆ من][١٩٢٠] بەڵام من بە ئومێدبووم کە پێغەمبەری خوا ﷺ بمێنێت تا کارەکانمان بۆ بەلایەکدا دەخات و جێگیری بکات... [گەر موحەممەد ﷺ وەفاتی کرد بێت] خودای گەورە ئەو کتێبەی کە پێغەمبەری پێ ڕێنمونی دەکرد ئەوەی لە ناوتاندا جێی هێشتووە، گەر ئێوە دەستی پێوە بگرن خودا ڕێنمونیتان دەکات وەك چۆن پێغەمبەری خوای ﷺ پێ ڕێنمونی دەکرد، ئێستا خودای فەرمانڕەوا ئێوەی کۆکردۆتەوە لەلای باشترین هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ و یاری ئەشکەوتی [هەر ئەویش شایستەترە بەوە لە ئێوە، هەموو هەستن و بەڵێن و پەیمانی بدەنێ...

ئینجا عومەر ﷺ بە ئەبوبەکری ﷺ فەرموو: برۆ سەر مینبەرەکە ئەو نەڕۆیشت تا زۆری لێکرد و ناچاری کرد ئینجا ڕۆیشت و هەموو خەڵکی بە گشتی بەڵێن و پەیمانیان پێدا][١٩٢١] [دواتر ئەبوبەکر چووە سەر مینبەر لە پلەی دووەمیدا نزمتر لە پلەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوەستا سوپاس و ستایشی شیاوی خودای کرد پاشان فەرمووی: بزانن ئەی خەڵکینە ژیرترین ژیری جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خودایە وە نازیرترین نازیریی ئەنجامدانی تاوانەکانە][١٩٢٢] [ئەی خەڵکینە من کراومەتە پێشەواتان هەر چەندە چاکترینیشتان نیم گەر چاکەم کرد هاوکارم بن، وەگەر نارێکیم کرد ڕاستم بکەنەوە [منیش شەیتانێکم لەگەڵدایە جار جار پەستم دەکات، گەر منتان بینی تورەبووم خۆتان لێم بەدوور بگرن نەبادا لەش و لارتان بە ئازار بگەیەنم] [بزانن: ڕاستگۆیی متمانەیە و درۆ ناپاکییە، بێ هێز لەناوتاندا

(١٩١٩) أخرجه: أحمد (٢٥٨٤١) وقال محققوه: اسناده حسن.

(١٩٢٠) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٣٣١) وقال محققوه: اسناده حسن، والبخاري (٧٢١٩) بنحوه.

(١٩٢١) أخرجه: البخاري (٧٢٦٩،٧٢١٩).

(١٩٢٢) أخرجه: ابوداود (الزهد) (٣٠) وابن عساكر (٣٠٣/٣٠) والدينوري (المجالسة) (١٢٩٠) وقال محققه: اسناده حسن.

بە هێزە لەلام تا مافەکەی بۆ وەردەگرمەوە بەویستی خودا][١٩٢٣] [من کەسێکی شوێن کەوتووم نەك کەسێکی داهێنەر... لێ پێچینەوە لەگەڵ خۆتاندا بکەن پێش ئەوەی لێپێچینەوەتان لەگەڵدا بکرێت، هەر کەسێك واز لە تێکۆشان بهێنێت لەڕێی خوادا، ئەوانە خوا تووشی سەر لێشێواویی و هەژارییان دەکات، لەوەی من گوێ ڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەیم ئێوەش گوێڕایەڵیم بکەن، گەر سەرپێچی خوداو پێغەمبەرەکەیم کرد من هیچ گوێڕایەڵیەکم نامێنێت لەسەرتان ئەمەش وتەکانمەو داوای لێخۆش بوون بۆ خۆم و ئێوە دەکەم لە خوای گەورە][١٩٢٤]

[هەستن بۆ ئەنجامدانی نوێژەکەتان خودا ڕەحمتان پێ بکات][١٩٢٥]. ئەوەش لە بەرەبەیانی ڕۆژی سێ شەممەدابوو. ئەبوبەکر بە ناچاری ئەو بەرپرسیارێتیەی لە ئەستۆ گرت وەك خۆی دەفەرموێت: نەبادا ئاژاوەیەك سەر هەڵبدات و پاشگەزبوونەوەی بەدوادا بێت][١٩٢٦] هەر لەو ڕۆژەدا لە دوای نوێژی نیوەڕۆ وتارێکی تری داو سەرەتا بەهانەی بۆ هێنانەوە و پێی فەرموون: [سوێند بە خوا من هەرگیز پێشەوایی و بەرپرسیارێتیم نەویستوە لە هیچ شەو ڕۆژێکدا وە هەرگیز ئارەزووم لێ نەبووە لە نهێنی و ئاشکرادا وە هەرگیز ئەوەم لە خودا داوا نەکردووە، بەڵام من لە ئاژاوە ترسام، بەرپرسیارێتی حەوانەوەی تێدا نییە بۆ من، هەرچەندە کارێکی گرانم لە ئەستۆ گرتووە کە نایتوانم بە بێ یارمەتی خودا، من ئەمڕۆ خۆزگە دەخوازم بەهێزترینتان لە جێگەی مندا بێت. (ئەوەبوو) دواتر هەموو موهاجیرەکان وتەکان و عوزرەکانیان قبوڵکرد][١٩٢٧] [لەوێدا ئەبوبەکر تەماشای خەڵکەکەی کرد فەرمووی: ئەوە بۆ عەلی نابینم؟ ئیتر هەندێك لە پیاوانی ئەنصار چوون و ئەویان هێنا، ئەبوبەکر پێی فەرموو: وتت من ئامۆزاو زاوای پێغەمبەری خوام ﷺ [ئایا دەتەوێت

---

(١٩٢٣) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٢٢١) وقال محققاه: اسناده حسن، وصحح اسناده ابن كثير في (البداية) (٢٤٨/٥) والذهبي في (الخلفاء الراشدون) (ص:٧)، وانظر: (صحيح سيرة ابن هشام) (٢١٠٠)، والزيادة: أخرجه: ابوداود (الزهد) (٣٠) وقال محققه: اسناده جيّد.

(١٩٢٤) أخرجه: ابوداود (الزاهد) (٣١) وابن عساكر (٣٠٣/٣٠) والدينوري (المجالسة) (١٢٩٠) وقال محققه: اسناده حسن.

(١٩٢٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٢٢١) وقال محققاه: اسناده حسن.

(١٩٢٦) أخرجه: أحمد (٤٢) وقال محققوه: اسناده جيّد، والطبراني (الكبير) (٤٤٦٩) وقال ابن كثير في (البداية) (٣٤٨/٥): اسناده جيّد قويّ.

(١٩٢٧) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٣٣٥) والحاكم (٦٦/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وقال ابن كثير (البداية) (٢٥٠/٥) اسناده جيد.

موسوڵمانان بکەیت بە دووبەشەوە؟] عەلی ﷺ فەرمووی: هیچ گلەییەکم نییە ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستت بهێنە تا پەیمانت بدەمێ.

ئینجا ئەبوبەکر پەیمانی لێوەرگرت، پاشان فەرمووی: بۆ زوبەیر نابینم؟ ئینجا پیاوانێکی ئەنصار چوون و ئەویشیان هێناو ئەبوبەکر پێی فەرموو: زوبەیر وتووتە من نزیك و پورزای پێغەمبەری خوام ﷺ ئایا دەتەوێت موسوڵمانان بکەیت بە دوو بەشەوە؟ زوبەیر ﷺ فەرمووی: هیچ گلەییەکم نییە ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستت درێژ بکە با پەیمانت بدەمێ ئینجا پەیمانی پێدا][١٩٢٨] [لەوێدا عەلی و زوبەیر فەرموویان: ئێمە تەنها لەوە دڵگران بووین کە لە ڕاوێژکردندا دواخراین وە ئێمە دەزانین کە ئەبوبەکر شایستەترین کەسە بۆ پێشەوایەتی لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو یاری ئەشکەوت بوو وە ئێمە بەرزی و گەورەیی (وچاکی) ئەو دەزانین، وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیاندا بوو فەرمانی کرد ئەبوبەکر ﷺ پێش نوێژیی بۆ موسوڵمانان بکات][١٩٢٩].

(١٩٢٨) أخرجه: عبدالله بن أحمد (السنة) (١٢٩٢) وقال محققه: اسناده صحيح والبيهقي (الكبرى) (١٤٣/٨) وقال ابن كثير في (البداية) (٢٤٨،٢٤٩/٥): اسناده صحيح.

(١٩٢٩) أخرجه: موسى بن عقبة (المغازي) (ص:٣٣٥) والحاكم (٦٦/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وقال ابن كثير (البداية) (٢٥٠/٥) اسناده جيد.

## شۆردن و کفنکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ

لە دوای هەڵبژاردنی ئەبوبەکر ﷺ بەجێنشین لە دوا نیوەڕۆی ڕۆژی سێ شەمە دەستکرا بە شۆردنی تەرمی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ:

دایکی بڕواداران عائیشە ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتیکرد هاوەڵانی کۆبوونەوە و گومانیان بۆ دروست بوو لە شۆردنیدا [و ڕایان جیاواز بوو وتیان: سوێند بە خوا نازانین ئایا [جلەکانی] پێغەمبەری خوا ﷺ دابنێین و ڕووتی بکەینەوە وەك مردووەکان یان بەجل و بەرگەکانیەوە بیشۆین] یان چی بکەین، خوای گەورە هەموویانی توشی [وەنەوز] و خەو کرد، هەموو یەکێکیان سەری لەسەر سنگی بوو، بانگێك لە گۆشەیەکی ماڵەکەوە دەهات، دەنگیان دەبیست بەڵام نەیان دەزانی کێیە دەیوت: [کراس لەبەری پێغەمبەری خوا ﷺ دامەکەنن][(١٩٣٠)] بەجل و بەرگەکەیەوە بیشۆن.

دایکی بڕواداران عائیشە ﷺ دەفەرموێت: گەر ئەو کات ئەوەی ئێستام دەزانی نەم دەهێشت هیچ کەسێك بیشوات جگە لە هاوسەرەکانی][(١٩٣١)] [ئینجا هاوەڵان بەجل و بەرگەکەیەوە شۆردیان و ئاویان پێدا دەکرد لەسەر جلە کانیەوە و دەستیان پێدا دەهێنا][(١٩٣٢)] [وە ئەوانەی ئامادەی شۆردنی پێغەمبەر ﷺ بوون: عەلی کوڕی ئەبو تالیب و عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب وە فەزلی کوڕی عەباس وە قوسمی کوڕی عەباس وە ئوسامەی کوڕی زەید و شەقرانی خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ وە ئەوسی کوڕی خەولی، عەلی لە باوەشی گرتبوو، وە عەباس و فەزڵ و قوسەم ئەم دیو ئەو دیویان پێ دەکرد، وە ئوسامەو شەقران ئاویان پێدا دەکردووە

(١٩٣٠) أخرجه: الحاكم (٥٠٥/١) وصححه على شرطهما، والبيهقي (الدلائل) (٣٢١٦) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٩٣١) أخرجه: ابوداود (٣١٤١) وابن ماجة (١٤٦٤)، وابن سعد (٢٧١/٢)، وابن حبان (٦٦٢٧) وقال محققه: اسناده قوي، وابن هشام (السيرة) (١٢٢٤) وقال محققاه: اسناده حسن، والبيهقي (الدلائل) (٣٢٦٠) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (١١٩٦) و (صحيح ابي داود) (٢٦٩٣) و (المشكاة) (٥٩٤٨) و(احكام الجنائز) (ص:٤٩)، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في السعين) (١٥٥٣): حديث حسن.

(١٩٣٢) أخرجه: أحمد (٢٦٠/١) وابن هشام (السيرة) (١٢٢٤) وقال محققه: اسناده حسن، وابن حبان (٦٦٢٨) وقال محققه: اسناده قوي.

عەلیش دەیشۆرد][١٩٣٣]. [سێ جارشۆردیان بە گەڵای سیدرو ئاوی بیرێك پێیان دەوت: (غرەس)... ئەو بیرە هی سەعدی کوڕی ئەبو خەیسەمە بوو پێشتر پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی لێ دەخواردەوە][١٩٣٤].

[پاشان لە سێ پۆشاکی لۆکەی سپیدا کفنمان کرد و لێیانەوە ئاڵاند وە هیچ جەمەدانە و کراسی تێدا نەبوو][١٩٣٥] [بە ئەبوبەکریان ﷺ وت: ئەی هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا نوێژ دەکەیت لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بەڵێ. وتیان چۆن؟ فەرمووی با کۆمەڵێك بێن نوێژی لەسەر بکەن و دوعای بۆ بکەن ئینجا بچنەدەرەوە وە کۆمەڵێکی تر بەدوایاندا بێن بەوجۆرە نوێژی لەسەر بکەن، ئەوانیش بڕۆن ئینجا خەڵکی تر با بێت][١٩٣٦] [ئیتر بەو جۆرە خەڵکی پۆل پۆل دەچوونە ژوورەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ وە نوێژیان لەسەر دەکرد بەبێ ئەوەی کەس پێش نوێژییان بۆ بکات، [لەو دەرگایەوە دەهاتنە ژوور] وە لە دەرگاکەی ترەوە دەچوونە دەر][١٩٣٧] [یەکەم جار بنەماڵەکەی خۆی نوێژیان لەسەر کرد، پاشان موهاجیرەکان ئینجا ئەنصارەکان پاشان خەڵکی تێکڕا پاشان منداڵەکان پاشان کۆیلەکان][١٩٣٨]. ئینجا بە ئەبوبەکریان ﷺ وت: ئەی هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ بنێژین؟ فەرمووی: بەڵێ. وتیان: لە کوێ؟ فەرمووی: لەو جێگەیەدا کە خودا ڕۆحی لێکێشاوە چونکە خودا ڕۆحی کێشاوە لە جێگەیەکی پاکدا][١٩٣٩] [من گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((مَا قُبِضَ نَبِيٌّ إِلَّا دُفِنَ حَيْثُ قُبِضَ)) واتە: هەر پێغەمبەرێك لە هەر جێگەیەکدا بمرێت دەبێت هەر لەو جێگەیەدا بنێژرێت)) لە

(١٩٣٣) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٢٢٣) وقال محققه: ضعيف، والحاكم (٥٩/٣) وصححه، والبيهقي (الكبرى) (٣٨٨/٣).

(١٩٣٤) أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٧٠٣٢) وعبدالرزاق (٦٠٧٧) والبيهقي (الكبرى) (٦٤٤٩) وفي (الدلائل) (٣٢٦٧) وقال محققه: مرسل جيد وكذا قال الحافظ ايضاً في (التلخيص) (١٠٥/٢).

(١٩٣٥) أخرجه: البخاري (١٢٦٤) ومسلم (٩٤١).

(١٩٣٦) أخرجه: النسائي (الكبرى) (٧١٢٢) والترمذي (الشمائل) (٣٧٨) والبيهقي (الدلائل) (٣٢٩٤) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الشمائل) (٣٣٣).

(١٩٣٧) أخرجه: أحمد (٢٠٧٦٦) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(١٩٣٨) أخرجه: أحمد (٨١/٥) وابن ماجة (١٦٢٨)، والبزار (٨٤٧) والبيهقي (الكبرى) (٣٠/٤).

(١٩٣٩) أخرجه: النسائي (الكبرى) (٧١٢٢) والترمذي (الشمائل) (٣٧٨) والبيهقي (الدلائل) (٣٢٩٤) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الشمائل) (٣٣٣).

گێڕانەوەیەکی تردا ((مَا قَبَضَ الله نَبِيا إلاَّ فِي الْمَوْضِعِ الَّذِي يُحِبُّ أَنْ يُدْفَنَ فِيهِ))[(١٩٤٠)]. واتە: هەر پێغەمبەرێك خودا گیانی بکێشێت ئەوە لەو شوێنەدا دەبێت کە خودا پێی خۆشە تێیدا بنێژرێت))].

[ئینجا ئەبو تەلحە ؓ ئەو ڕاخەرەی لا برد کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری وەفاتیکردبوو وە لە جێی ئەو ڕاخەرەدا گۆڕی هەڵکەند بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ][(١٩٤١)] [هاوەڵان جیاوازی کەوتە نێوانیان ئایا گۆڕەکەی چاڵێك بێت پاشان بە ئەندازەی مردووەکە لە زەویەکەدا هەڵی بکەنن و پاشان سەری بگرن (واتە: وەك گۆڕەکانی کوردستانی ئێمە) یاخود (ئەلحەدی) بۆ بکەن کە هەڵکەندنی چاڵێکە پاشان هەڵکەندنی جێ گۆڕێکە لەلا تەنیشتی دیوارەکەیەوە پاشان گرتنی جێ گۆڕەکەو داپۆشینی چاڵی گۆڕەکەیە. بەو هۆیەوە هاوەڵان کەوتنە گفتوگۆ و دەنگیان لێبەرز بووەوە، عومەر ؓ فەرمووی: دەنگ بەرز مەکەنەوە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ بە زیندوویی و بە مردوویی][(١٩٤٢)]. [ئەنەس ؓ دەفەرموێت: لە شاری مەدینەدا دوو پیاو هەبوون یەکێکیان بە شێوەی (ئەلحەد) گۆڕی هەڵدەکەند ئەوی تریان بە شێوەکەی تریان، ئەوان وتیان: ئێمە نوێژی (ئیستیخارە) (واتە: داوای هەڵبژاردن لە خودا) دەکەین و لەدوایدا بە دوای هەردوو پیاوەکەدا دەنێرین، هەرکامێکیان زووتر هات با ئەوەیان بە شێوەی خۆی هەڵی کەنێت. دواتر ناردیان بە دوایاندا ئەوەی بە شێوەی (ئەلحەد) هەڵی دەکەنێت ئەوەیان هات و بەو جۆرە گۆڕەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵکەندرا][(١٩٤٣)].

دایکی باوەڕداران عائیشە ؓ دەفەرموێت: ئێمە نەماندەزانی کە دەنێژرێت تا گوێمان لە دەنگی خاکەناز بوو لە نیوەی شەوی چوارشەمەمدا][(١٩٤٤)].

---

(١٩٤٠) أخرجه: الترمذي (الشمائل) (٣٨٠) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الشمائل) (٣٢٦).

(١٩٤١) أخرجه: مالك (٢٢٩/١)، وابن هشام (٢١٠٦) وقال محققه: اسناده صحيح، والنسائي (الكبرى) (٢٦٣/٤)، وأحمد (٤٢) وقال محققوه: حديث قوي، ابن سعد (٢٩٢/٢) والاصبهاني (سير السلف) (٧٤/١) وقال محققه: صحيح، وابن ماجة (١٦٢٨) والترمذي (١٠١٨) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٨١٢).

(١٩٤٢) أخرجه: ابن ماجة (١٥٥٨) وحسنه الشيخ الالباني في (المشكاة) (١٧٠٠) و (الاحكام) (١٤٤).

(١٩٤٣) أخرجه: ابن ماجة (١٥٥٧) وصححه الشيخ الالباني في (الاحكام) (١٤٤).

(١٩٤٤) أخرجه: أحمد (١١٠/٦) والترمذي (الشمائل) (ص:١٧٩) وقال: اسناده جيّد. وابن هشام (السيرة) (٢١٠/٤) والبيهقي (الدلائل) (٢٥٦/٧) وهو صحيح كما في (صحيح سيرة ابن هشام) (٢١٠٧).

[ئیبنو عەباس ﵄ دەفەرموێت: بۆ ناشتنەکەی: ئەو پیاوانەی چوونە ناو گۆڕەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ عەباس و عەلی و فەزل و [وقوسم] و ئەوەشی (ئەلحەدەکەی) بۆ چاککرد پیاوێکی ئەنصاری بوو بە ناوی (ئەوسی کوڕی خەولی) هەر ئەویش بوو گۆڕی شەهیدەکانی ئوحودی ڕێکخست و تەختکرد][(١٩٤٥)] [وە لەگەڵ خۆشیان عەبدلوڕەحمانی کوڕی عەوفیان ڕێگەدا بۆ ناو گۆڕەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ. کاتێك نزیکی تەواو بوونی بوو، عەلی ﵁ فەرمووی: ئیتر دەبێت هەرخزمانی لێی نزیك بن و کاری ناشتنەکەی بۆ تەواو بکەن][(١٩٤٦)] [شەقران ڕاخەرێکی سووری لە گۆڕەکەیدا بۆ داخست][(١٩٤٧)] [پێشتر پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری [دادەنیشت].... وە ئەوەش لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەگۆڕەکەیدا مایەوە][(١٩٤٨)] [پاشان عەلی و خزمانی تەرمی پیرۆزی پێغەمبەری خوایان ﷺ هەڵگرت و خستیانە ناو گۆڕەکەی، ئینجا موغیرە ﵁ وتی: لە قاچیەوە تۆزێك چاکردنی دەوێت، ئەوانیش وتیان برۆ چاکی بکە، ئەویش چووە ناو گۆڕەکەی و دەستی لە قاچی پێغەمبەری خوا ﷺ دا، ئینجا وتی: خۆڵەکە بکەنە ناو گۆڕەکە، خۆڵەکە تا نیوەی قاچی موغیرە ﵁ گەیشت ئینجا هاتە دەرەوە و دواتر دەی وت: من لە هەمووتان نزیکتربووم لە پێغەمبەری خوا ﷺ][(١٩٤٩)].

جابر ﵁ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ گۆڕی (ئەلحەدەکەی) بۆ سازکرا وە خشتی لاتەنیشتەکەی بۆ دانرا و گۆڕەکەی پڕکرایەوە و بە ئەندازەی بستێك لە زەوی بەرزکرایەوە[(١٩٥٠)]. [ئەنەس ﵁ دەفەرموێت: [کاتێك لە ناشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بووینەوە تەواو ڕقمان لە خۆمان دەبوویەوە][(١٩٥١)]. وەکاتێك تەواوبووین و

(١٩٤٥) أخرجه: البزار (٥١٩)، والبيهقي (الكبرى) (٦٤١٨) و (الدلائل) (٣٢٨٢) وقال محققه: اسناده حسن، وابوداود (٣٢٠٩) وابن ماجة (١٦٢٨).

(١٩٤٦) أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٨١٨٥) وقال محققه: مرسل صحيح، وعبدالرزاق (٦٤٥٥) وابوداود (٣٢١٠) والبيهقي (الدلائل) (٣٢٨٥) وقال محققه: اسناده صحيح، وقال ابن كثير (البداية) (٢١٩/٥) اسناده جيد قوي.

(١٩٤٧) أخرجه: مسلم (٩٦٧)، والنسائي (٢٦١) وابن حبان (٦٦٣١) وقال محققه اسناده حسن، والترمذي (١٠٤٨).

(١٩٤٨) أخرجه: البيهقي (الكبرى) (٦٥١٣) وفي (الدلائل) (٣٢٨٣).

(١٩٤٩) أخرجه: أحمد (٢٧٠٦٦) وقال محققوه: اسناده صحيح.

(١٩٥٠) أخرجه: ابن حبان (٦٦٣٥) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٩٥١) أخرجه: الترمذي (٨١٦٣) وابن ماجة (١٦٣١) وأحمد (١٣٨٥٧) والبيهقي (الدلائل) (٣٣٠٤) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (المشكاة) (٥٩٦٢) قال انس ﵁: (..... [لما كان اليوم الذي مات فيه رسول الله ﷺ اظلم منها كل شيئ] [فلم أر يوماً كان اقبح منه]. أخرجه: الترمذي (٣٦١٨) وابن ماجة (١٦٣١) وابويعلى (٣٢٩٦)

گەڕاینەوە بەلای ماڵی فاتیمەدا رضي الله عنها وتی: ئەی ئەنەس ئایا دڵتان هات خۆڵ بکەن بەسەر پێغەمبەری خوادا ﷺ؟](١٩٥٢). ئینجا وتی: [ئەی باوکە وەڵامی داوای خودات دایەوە] [ئەی باوکە لە خواوە چەند نزیکیت، ئەی باوکە هەواڵی وەفاتت بە جبریل عليه السلام دەگەیەنین، ئەی باوکە بەهەشت و فیردەوس جێیەتی](١٩٥٣)

پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتیکرد وە هیچی جێ نەهێشت لە دوای خۆی و پێشتر بە موسوڵمانانی دەفەرموو: ((لَا يَقْتَسِمُ وَرَثَتِي دِينَارًا، مَا تَرَكْتُ بَعْدَ نَفَقَةِ نِسَائِي وَمُؤْنَةِ عَامِلِي فَهُوَ صَدَقَةٌ))(١٩٥٤) واتە: میرات گرەکانم نابێت لە دوای من دینارێك بەش بکەن، ئەوەشی لە دوای ئازوقەی هاوسەرەکانم وە خەرجی کاریگەرەکانم دەمێنێتەوە هەمووی دەبەخشرێتە موسوڵمانان.

دایکی بڕواداران جویریە رضي الله عنها دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای وەفاتی هیچ دینار و درهەم و کارەکەر و کەنیزەك [و مەڕو بزن] و هیچ شتێکی تری بەجێ نەهێشت جگە لە هێسترە سپییەکەی وە چەکەکەی وە پارچەزەویەك لە دوای جێما ئەویش بەخشرایە موسوڵمانان [وە وەسێتی بۆ هیچ کەسێك نەکرد](١٩٥٥).

دایکی بڕواداران عائیشە رضي الله عنها دەفەرموێت: [کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتیکرد، هیچ شتێك لە ماڵەکەمدا نەبوو کەسێك بیخوات، تەنها کەمێك جۆمان هەبوو لەسەر ڕەفەیەك دامنابوو، من بەردەوام لێم دەخوارد و نەم دەکێشا تا دواجار کێشام ئیتر ئەویش تەواو بوو خۆزگە نەم دەکێشا](١٩٥٦).

پێغەمبەری خوا ﷺ بە شەهیدی وەفاتیکرد وەك ئیبنو مەسعود رضي الله عنه دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ شەهیدکرا گەر لەسەر ئەوە نۆجار سوێند بخۆم لام خۆشەویستترە لەوەی یەك جار سوێند بخۆم، چونکە خودا خۆی کردویەتیە پێغەمبەر وە هەر

---

والحاكم (٤٣٩٠) والبيهقي (الدلائل) (٣٣٠٦) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٩٥٢) أخرجه: البخاري (٤٤٦٢)، وابن ماجة (١٦٣٠) وابن حبان (٦٦٢٢).

(١٩٥٣) أخرجه: البخاري (٤٤٦٢، ٤١٩٣) والنسائي (١٣/٤) وابن ماجة (١٦٢٩).

(١٩٥٤) أخرجه: البخاري (٦٧٢٩).

(١٩٥٥) أخرجه: البخاري (٢٥٨٨،٣٠٩٨،٢٧٣٩) ومسلم (١٦٣٥) وابن ماجة (٢٦٩٥).

(١٩٥٦) أخرجه: البخاري (٢٩٣٠،٦٤٥١) ومسلم (٢٩٧٣).

خۆشی بە پلەی شەهیدی گەیاندووە][1957].

ئیتر بەو جۆرە پێغەمبەری خوا ﷺ ژیانی بەسوود بوو بۆ موسوڵمانان هەروەها مردنیشی هەر بە سوود بوو بۆ موسوڵمانان وەك خۆی دەفەرموێت: ((إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ إِذَا أَرَادَ رَحْمَةَ أُمَّةٍ مِنْ عِبَادِهِ، قَبَضَ نَبِيَّهَا قَبْلَهَا، فَجَعَلَهُ لَهَا فَرَطًا وَسَلَفًا، وَإِذَا أَرَادَ هَلَكَةَ أُمَّةٍ، عَذَّبَهَا وَنَبِيُّهَا حَيٌّ، فَأَقَرَّ عَيْنَهُ بِهَلَكَتِهَا حِينَ كَذَّبُوهُ وَعَصَوْا أَمْرَهُ))[1958] واتە: گەر خودای گەورە بەزەیی بوێت بۆ ئومەتێك لە بەندەکانی، ئەوە پێغەمبەرەکەیان لە پێشدا دەباتەوە لای خۆی تا ببێتە نموونە و سەرمەشق بۆیان، وە گەر لە ناوچوون و سزای بوێت بۆ ئومەتێك لە بەندەکانی، هەر لە ژیانی پێغەمبەرەکەیاندا گەلەکەی سزا دەدات وە پێغەمبەرەکەی دڵخۆش دەکات بەلەناوچوونیان لە دوای ئەوەی بەدرۆیان زانیوە و سەرپێچی فەرمانەکانیان کردووە].

وە جابر ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتیکرد فریشتەکانی خودا سەرەخۆشیان لەیەك دەکرد، دەنگیان دەبیستراو شێوەیان نەدەبینرا دەیان وت: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ) و برکاتە، ئەی خاوەنی ئەم ماڵە: خودا لە دوای هەموو کارەساتێك سەرەخۆشی داناوە، وە شوێن پڕکردنەوەی داناوە (بۆ هەموو یەکێك کە دونیای بەجێ هێشتووە)، ئێوەش متمانەتان بەخودا هەبێت، وە تەنها ئومێدتان بەو هەبێت، بێ بەش ئەو کەسەیە کە لە پاداشت بێ بەشکراوە، (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ)][1959].

---

(١٩٥٧) أخرجه: عبدالرزاق (٤١٣٩)، والطبراني (الكبير) (١٠١١٩) وأحمد (٣٦١٧) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والحاكم (٥٨/٣) رقم (٤٤٥٠) وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والحاكم (٥٨/٣) رقم (٤٤٥٠) وقال محققه: سنده صحيح، والبيهقي (الدلائل) (٣١٦٢) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٩٥٨) أخرجه: مسلم (٢٢٨٧) وابن حبان (٦٦٤٧) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابويعلى (١٢٠٧).

(١٩٥٩) أخرجه: الحاكم (٥٩/٣) رقم (٤٣٩١) والبيهقي (الدلائل) (٣٣١٣) وقال محققه: اسناده حسن.

# کۆتایی

لەکۆتاییدا ئەم باسە گەورە و پڕخێرە هەرچەندە لە ساڵی (١٩٩٦) دەستی پێکرا سوپاس بۆ خوا لە ساڵی (٢٠١٦) لەدوای ئەو هەموو ساڵانە تەواو بوو.

سوپاس بۆ خوای گەورە و میهرەبان کە ڕێزوشکۆی پێبەخشین و بردینیە ڕیزی ئەوانەی شەرەفی نوسینی ژیانی پێغەمبەرە شکۆدار و خۆشەویستەکەی محمد ﷺ پێبەخشیون بۆ ئەوەی خۆیان و کەسانی تر بەهرەمەندتربن لە ناسینی زیاتری ئەو پێغەمبەرە بەڕێز و سەروەرە.

خوێنەری بەڕێز ئەم نوسینەی بەردەستت کۆکردنەوە و پوختەکردن و ڕێخکستنی سەدەها ڕیوایەتی فەرموودەبوو لەگەڵ گێڕانەوە و ڕیوایەتی (ژیاننامە نوسان). لەبەر ڕۆشنایی نوسراوە گەورە و بە پێزەکانی کۆن و تازەی ئەم بوارە، ئەم ژیاننامەیە هەوڵدانە بۆ خستنەڕووی ڕووداوەکان یەك لە دوای یەك وەك لە پێش چاوتدا نمایش بکرێت و لەناخدا واهەست بکەیت کە تۆش یەکێکیت لە ئامادەبووانی ئەو ڕووداوە وە تام و چێژی تایبەتی لێوەربگریت.

خوێنەری بەڕێزم ئەم نوسراوە وەرگیراوە لە قورئانی پیرۆز هەروەها کەڵك وەرگیراوە لە بۆچوونی زانایانی (تفسیر)ی قورئان. پاشان وەرگیراوە لەو فەرموودانەی کە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕاویانەتەوە لە وتە و هەڵسوکەوتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەرمەی ڕووداوەکاندا، ئەمەش لەدوای کۆکردنەوەی سەرجەم ئەو فەرموودانە. پاشان پوختەکردنیان و دیاری کردنی (صحیح، ضعیف) یان لەبەر ڕۆشنایی حوکمی شارەزاترین زانایانی بەرز و ناوداری کۆن و تازەی ئەم بوارە، لەگەڵ هێنانی هەر حوکمێك هەرچەندە لاوازیش بێت سەبارەت بە یەکلاکردنەوەی پلەی فەرموودەکە. پاشان هەموو بەشەکانی ڕووداوەکان وەرگیراوە لە زۆربەی (طرق+ الفاظ) ە جیاوازەکانی ئەو باسە و ڕێکخراوە تا وەك فەرموودەیەکی تەواوی لێکدانەبڕاو بخرێتە ڕوو.

پاشان ئەم باسە وەرگیراوە لە کۆنترین سەرچاوەکانی شارەزایانی بواری (أهل المغازي و السير) واتە: ژیاننامەنوسان وەك (عروه بن الزبير) و (الشعبي) و (قتادة و (الزُهري) و (موسى بن عقبة) و (ابن اسحاق) و (طبري) و (ابن سعد) و (واقدي) وەنوسراوە پوخت و بە پێزەکانی زانایانی گەورەی ئەم بوارە وەك ابن حزم) و (ابن القيّم) و (ابن

کثیر) و (الذهبي) و (ابن حجر). و هەوڵدراوە ڕووداوەکانی لای ئەمانیش ڕێکبخرێت لەگەڵ یەکدا و پاشان لەگەڵ فەرموودەکاندا وەك یەك باسی تەواو بنوسرێت.

کەواتە دەتوانین بڵێین ئەم نوسراوەی بەردەستت ناوی (ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قورئان و فەرمووده صەحیحەکاندا) هەڵدەگرێت بەڵام ئاشکرایە لای هەمووان کە زۆرێك لە گێڕانەوە هەیە (مرسل)ن یان (ضعیف)ن و زۆربەی زانایانیش هێناویانە تا ئەو باسانە زیاتر بناسرێن و بابەتەکانیان پێ دەوڵەمەندتر بێت و بەلایانەوە ئەو کارە خراپ نەبووە بەمەرجێك ئەو فەرموودانە دووربن لە بواری (العقيدة، احكام الشرعية).

لێرەدا بەپێویستی دەزانم کە زۆر سوپاس و پێ زانین و دەستخۆشی خۆم بکەم لە مامۆستا و برای هەرە خۆشەویست و دڵسۆز و خۆبەکەمزان و ماندوو نەناسم جەنابی مامۆستا ئومێد و هاوسەری بەڕێزی هێرۆ خان  و هەر یەك لەمامۆستا (موحەممەد ئابلاخی و جمال ساڵح و کامیل اسماعیل و ڕۆشنا ئیبراهیم). کە بەڕاستی ڕۆڵێکی باشیان هەبوو لە زووتر بەچاپ گەیاندنی ئەم بەرهەمە داواکارم لە خودا بیکاتە تێشوی قیامەتیان.

لە کۆتاییدا داواکارم لە خوای گەورە نوسینی ئەم باسە پیرۆزەمان لێ وەرگرێت وە بیکاتە جێی سودی سەرجەم برایان و خوشکانی موسوڵمانی بەڕێزم وەلە هەڵە و نەزانین و کەم و کوڕییەکانمان ببورێت و بمان بەخشێت و هەموولایەکمان شاد بکات بەبینین بەیەك گەیشتنی هەموو ناوبراوانی ناو ئەم ژیاننامەیە لە بەهەشتی بەرین و پڕ لە نازونیعمەتدا بەتایبەت لە سەرو هەمووانەوە سەروەری نەوەی ئادەم پێغەمبەری خوا ﷺ پاشان هاوەڵانی بەڕێزی و تابیعیەکان و سەرجەم پێشینە چاکەکانمان و هەموو زانایانمان. آمین.

آمِين وَآخرُ دَعوانا أَنْ الحَمْدُ للّهِ رَبِّ العالمِينَ وَصَلى اللّهُمْ وَسَلِم وَبَارك عَلى نَبِينا وَحَبِيْبِنَا وَقُرَةُ أَعْيُننا وَسَيّدِنا مُحَمد وَعَلى آلهِ  وَصَحْبِهِ وَمَنْ وَلاهُ.

سُبْحَانَكَ اللّهُمّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

محمد ملا فائق شارەزووی

١٤٣٥/٨/١٨ بەرامبەر ٢٠١٦/٦/١٦

# سەرچاوەکان


١- القرآن الكريم.

٢- إتحاف الخيرة المهرة / الإمام أحمد بن أبي بكر بن إسماعيل البوصيري / تح: عادل بن سعد، و السيد بن محمود / مكتبة الرشد/ الرياض/ط١/ ١٤١٩ هـ

٣- الآحاد و المثاني/ابن أبي عاصم/تح: باسم فيصل احمد/دار الراية/ السعودية- الرياض/١٩٩١م.

٤- أحكام الجنائز وبدعها/ الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / المكتب الإسلامي/ دمشق / ط١ / ١٩٦٩.

٥- أحكام أهل الذمة/محمد بن أبي بكر بن أيوب بن سعد شمس الدين ابن قيم الجوزية (المتوفى: ٧٥١هـ)/تح: يوسف بن أحمد البكري - شاكر بن توفيق العاروري/رمادى للنشر – الدمام/ ط١/ ١٤١٨ – ١٩٩٧

٦- أخبار مكة في قديم الدهر وحديثه/ أبو عبد الله محمد بن إسحاق بن العباس المكي الفاكهي (المتوفى: ٢٧٢هـ)/تح:د. عبد الملك عبد الله دهيش/ دار خضر – بيروت/ط١٤١٤/٢.

٧- أخبار مكة وما جاء فيها من الأثار/ أبو الوليد محمد بن عبد الله بن أحمد بن محمد بن الوليد بن عقبة بن الأزرق الغساني المكي المعروف بالأزرقي (المتوفى: ٢٥٠هـ)/ رشدي الصالح ملحس/دار الأندلس للنشر – بيروت.

٨- الأدب المفرد / الإمام محمد بن إسماعيل البخاري / ترتيب: محمد فؤاد عبد الباقي / الطبعة السلفية/ القاهرة.

٩- الأذكار المنتخبة من كلام سيد الأبرار / الأمام يحيى بن شرف النووي / تح: عبد القادر الأرناؤوط/ دار العلوم / بيروت.

١٠- إرواء الغليل / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني/ المكتب الإسلامي / بيروت / ط١/ ١٩٧٩م.

١١- الأستيعاب في معرفة الأصحاب / الأمام ابن عبد البر القرطبي /. دار العلوم الحديثة / الرباط / ط١/ ١٣٢٨هـ

١٢- الأسماء والصفات / الحافظ البيهقي/ تح: عبدالله الحاشري / مكتبة السوادي/ جدة/ ط١٤١٣/١هـ

١٣- الأسراء و المعراج / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / المكتبة الإسلامية /عمان /ط١ / ١٤٢١هـ

١٤- اسباب النزول / أبي الحسن الواحدي النيسابوري/ علم الكتب / بيروت/ ١٣١٦هـ أسباب النزول/

العلامة جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي/دار الغدالجديد-مصر/ط١/١٤٢٣هـ-٢٠٢م.

١٥- اسد الغابة / ابن الأثير / دار احياء التراث العربي / بيروت ــ لبنان.

١٦- الإصابة في تميز الصحابة / الحافظ ابن حجر العسقلاني / دار العلوم الحديثة / الرباط / ط١ / ١٣٢٨هـ

١٧- اعلام السائلين عن كتب المرسلين صلى الله عليه وسلم/صنفه الامام محمد بن طلولون الدمشقي/ راجعه: عبدالقادر الأرناؤوط/حققه: محمود الأرناؤوط/مؤسسة الرسالة.

١٨- امتاع الاسماع / أبو عباس أحمد المقريزي/ تح: محمود شاكر/ مطبعة بيروت/ ط٢/١٣٩٠هـ

١٩- الأموال لابن زنجويه/ أبو أحمد حميد بن مخلد بن قتيبة بن عبد الله الخرساني المعروف بابن زنجويه (المتوفى: ٢٥١هـ)/شاكر ذيب فياض الأستاذ المساعد - بجامعة الملك سعود/مركز الملك فيصل للبحوث والدراسات الإسلامية، السعودية/ط١/١٤٠٦ هـ - ١٩٨٦ م.

٢٠- اللآلىء المصنوعة في الأحاديث الموضوعة/ عبد الرحمن بن أبي بكر، جلال الدين السيوطي (المتوفى: ٩١١هـ)/تح:أبو عبد الرحمن صلاح بن محمد بن عويضة/دار الكتب العلمية - بيروت/ط١/ ١٤١٧ هـ - ١٩٩٦م.

٢١- أنِيسُ السَّاري في تخريج وَتحقيق الأحاديث التي ذكرها الحَافظ ابن حَجر العسقلاني في فَتح البَاري/ أبو حذيفة، نبيل بن منصور بن يعقوب بن سلطان البصارة الكويتي/تح: نبيل بن مَنصور بن يَعقوب البصارة/ مؤسَّسَة السَّماحة، مؤسَّسَة الريَّان، بيروت - لبنان/ط١/١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٥ م.

٢٢- بداية السول في تفصيل الرسول a/ العز بن عبد السلام / تح: الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / مكتبة الاسلامي / بيروت.

٢٣- البداية والنهاية / الحافظ عماد الدين إبن كثير / طبعة دار إبن كثير / بيروت / لبنان.

٢٤- بلوغ المرام من أدلة الأحكام / الحافظ ابن حجر العسقلاني / تح: محمد امين، عبد الواهب عبد اللطيف/ دار الرائد العربي / بيروت /ط٢/ ١٩٨٧م.

٢٥- التأريخ الكبير/ الإمام محمد بن إسماعيل البخاري / طبعة دائرة المعارف / العثمانية / الهند/١٣٨٠ هـ

٢٦- تأريخ الأمم و الملوك / الأمام محمد بن جرير الطبري / تح: محمد ابو الفضل ابراهيم / دار المعارف/ القاهرة / ١٩٧٠م.

٢٧- تأريخ الأسلام / الإمام شمس الدين محمد بن احمد بن عثمان الذهبي / تح: عمر عبد السلام

التدمري / دار الكتاب العربي / بيروت / ط ٢ / ١٤٠٩ هـ

٢٨- تأريخ بغداد / أحمد بن علي الخطيب البغدادي/ تصح: محمد سعيد / مطبعة السعادة / مصر.

٢٩- تاريخ خليفة بن خياط/ أبو عمرو خليفة بن خياط بن خليفة الشيباني العصفري البصري (المتوفى: ٢٤٠هـ)/تح:د. أكرم ضياء العمري/دار القلم ، مؤسسة الرسالة - دمشق ، بيروت/ط٢/١٣٩٧.

٣٠- تأريخ دمشق / إبن عساكر الدمشقي (ت: ٥٧١ هـ) / تح: مجموعة من الباحثين / نشر مجمع اللغة العربية / دمشق.

٣١- تأريخ واسط / اسلم بن سهل الواسطي المعروف بـ(نحشل)/ تح: كوركيس عواد / عالم الكتب / بيروت / ١٤٠٦ هـ

٣٢- تحذير الساجد من اتخاذ القبور مساجد/محمد ناصر الدين الألباني (المتوفى: ١٤٢٠هـ)/المكتب الإسلامي - بيروت/ط٤/

٣٣- تحريم الآت الطرب / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني/ مكتب الدليل /ط١/ ١٤١٥ هـ

٣٤- الترغيب والترهيب / الحافظ عبد العظيم بن عبد القوي المنذري / تح: محمد محي الدين عبد الحميد / المكتبة التجارية / القاهرة / ط١ / ١٩٦٢، مع طبعة: دار إبن كثير / بيروت / تح: محى الدين مستو / يوسف علي بديوي / ط٣ / ١٤١٩ هـ

٣٥- تقريب الحديث/ ابن قتيبة الدينوري/ تح: عبدالله الجبوري/ مطبعة العاني/ بغداد/ ط١/ ١٣٩٧هـ

٣٦- تفسير القرآن العظيم / الحافظ عماد الدين أبو الفداء إبن كثير / دار ومكتبة الهلال.

٣٧- تفسير النسائي / الأمام احمد بن شعيب النسائي / تح: صبري عبدالخالق ـ سيد بن عباس / مؤسسة الكتب الثقافية / بيروت / ط١/ ١٩٩٠م.

٣٨- التلخيص الجبر/ الحافظ ابن حجر العسقلاني / تح: د.شعبان بن محمد اسماعيل / مكتبة الكليات الأزهرية /ط١/١٣٩٩هـ

٣٩- تهذيب الأثار / الإمام محمد إبن جرير الطبري / تح: محمود شاكر / مطبعة المدني/ القاهرة/ط١.

٤٠- تهذيب سنن ابي داود / ابن القيم الجوزية/ تح: احمد شاكر، حامد الفقي/ مطبعة انصار السنة المحمدية / القاهرة/ ط١/١٣٦٨هـ

٤١- الثقات/محمد بن حبان بن أحمد بن حبان بن معاذ بن مَعْبدَ، التميمي، أبو حاتم، الدارمي، البُستي (المتوفى: ٣٥٤هـ)/ وزارة المعارف

٤٢- الثمرة المستطاب في فقه السنة والكتاب/محمد ناصر الدين الألباني/مؤسسة غراس/الكويت/ ط١/١٤٢٢هـ

٤٣- الجامع الأحكام القران / محمد بن احمد القرطبي / تح: احمد عبدالعليم / دار الكتاب العربي / القاهرة / ١٩٦٧م – مع طبعة: دار العروبة / الكويت / ط٢ / ١٩٨٧م.

٤٤- جامع البيان عن تأويل آية القرآن / الإمام محمد إبن جرير الطبري / دار الفكر / بيروت / ١٩٨٨م.

٤٥- الجامع الصغير في أحاديث البشير النذير / الإمام جلال الدين عبد الرحمن السيوطي / تح: محمد محي الدين عبد الحميد / مطبعة حجازي / القاهرة / ط١/ ١٣٥٢هـ

٤٦- الجامع الصحيح مما ليس في الصحيحين/ الشيخ مقبل بن هادي الوداعي/ دار الحرمين للنشر / القاهرة / ١٩٩٥م.

٤٧- الجامع في أسباب النزول/ حسن عبدالمنعم شلبي المحقق / المترجم: موفق منصور الناشر: مؤسسة الرسالة – بيروت الطبعة: الأولى سنة الطبع: ١٤٣٢هـ

٤٨- جوامع السيرة النبوية/أبو محمد علي بن أحمد بن سعيد بن حزم الأندلسي القرطبي الظاهري (المتوفى: ٤٥٦هـ)/ تح: عبد الكريم سامي الجندي/دار الكتب العلمية – بيروت/١٤٢٤ – ٢٠٠٣.

٤٩- حجاب المرأة المسلمة في الكتاب والسنة / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / جامعة القاهرة / مصر/ ط٥ / ١٣٩٨هـ

٥٠- حلية الأولياء وطبقات الأصفياء / الحافظ أبونعيم الأصبهاني / المكتبة السلفية / بيروت / وطبعة القاهرة / دار الكتاب العربي / ١٩٨١م.

٥١- حياة الحيوان الكبرى/ محمد بن موسى بن عيسى بن علي الدميري، أبو البقاء، كمال الدين الشافعي (المتوفى: ٨٠٨هـ)/ دار الكتب العلمية، بيروت/ط٢/١٤٢٤ هـ

٥٢- للحكومة العالية الهندية/تحت مراقبة: الدكتور محمد عبد المعيد خان مدير دائرة المعارف العثمانية/ دائرة المعارف العثمانية بحيدر آباد الدكن الهند/ط١/١٣٩٣ هـ = ١٩٧٣.

٥٣- خصائص الامام علي/لأبي عبدالرحمن أحمد بن شعيب النساني/تح:احمد ميرين البلوشي/مكتبة المعلا-الكويت/ط١/١٩٨٦م.

٥٤- الخصائص الكبرى / الإمام جلال الدين عبد الرحمن السيوطي / تح: محمد خليل هراس / دار الكتب الحديثة / القاهرة

٥٥- خطبة الحاجة / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / المكتب الإسلامي / بيروت / ط٣/ ١٣٩٧هـ

٥٦- خلاصة البدر المُنير/ابن الملقن سراج الدين أبو حفص عمر بن علي بن أحمد الشافعي المصري (المتوفى: ٨٠٤هـ)/مكتبة الرشد للنشر والتوزيع/ط٢/ ١٤١٠هـ-١٩٨٩م.

٥٧- خلق أفعال العباد / الإمام محمد بن إسماعيل البخاري / مؤسسة الرسالة / بيروت / ط١/ ١٩٨٤م.

٥٨- الدر المنثور في التفسير بالمأثور/ الحافظ جلال الدين السيوطي / دار المعرفة / بيروت.

٥٩- الدرر في اختصار المغازي والسير / الحافظ يوسف بن عبد البر النمري / تح: الدكتور شوقي ضيف/ دار الكتب العلمية / بيروت / ط١/ ١٤٠٧هـ

٦٠- الدعاء / سليمان بن احمد الطبراني: تح: محمد سعيد البخاري / دار البشائر الإسلامية / بيروت / ط١ / ١٤٠٧هـ

٦١- دفاع عن الحديث النبوية والسيرة في الرد على جهالات الدكتور البوطي في كتابه (فقه السيرة) / محمد ناصر الدين الألباني (المتوفى: ١٤٢٠هـ(/حققه : أبو مسلم الأثري/ وحيد بن محمد بن أحمد ابو فضل/مكتبة العلوم و الحكم-مصر.

٦٢- دفاع عن الحديث و السيرة / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / المكتب الإسلامي / بيروت.

٦٣- دلائل النبوة / الحافظ أبو نعيم الأصبهاني / تح: محمد رواس القلعجي / دار إبن كثير، مع طبعة: دار النفائس / ط٣ /١٩٩١م / بيروت / لبنان.

٦٤- دلائل النبوة / الحافظ أحمد بن حسين البيهقي / تح: عبد المعطي قلعجى / دار الكتب العلمية / بيروت / ١٤٠٥هـ

٦٥- ذم الكلام واهله / ابي اسماعيل الهروي / تح: عبد الله بن محمد الأنصاري / مكتبة الغرباء الأثرية / المدينة المنورة / ط١ / ١٤١٨هـ الذهب المسبوك في تحقيق روايات غزوة تبوك/ أبو محمد عبد القادر بن حبيب الله بن كورو عبد القادر بن حبيب اللّه بن كورو، بن سجن، بن سبر السندي (المتوفى: ١٤١٨ هـ)/ أطروحة ماجستير للمؤلف/مطابع الرشيد، المدينة المنورة - المملكة العربية السعودية.

٦٦- الرسول القائد صلى الله عليه وسلم/محمود شيت خطاب/دار مكتبة الحياة ومكتبة النهضة - بغداد/ط٢/١٩٦٠.

٦٧- الروض الأنف في شرح السيرة النبوية لابن هشام/ أبو القاسم عبد الرحمن بن عبد الله بن أحمد السهيلي (المتوفى: ٥٨١هـ)/ عمر عبد السلام السلامي/دار إحياء التراث العربي، بيروت/ط١/١٤٢١هـ/ ٢٠٠٠م.

٦٨- رياض الصالحين / الإمام أبي زكريا يحى بن شرف النووي / تح: عبد العزيز رباح وأحمد يوسف الدقاق / مراجعة: الشيخ شعيب الأرناؤوط / دار الثقافة العربية / دمشق / ط٢ / ١٩٩٢م.

٦٩- زاد المعاد في هدي خير العباد / الإمام شمس الدين محمد بن بكر بن قيم الجوزية / تح: الشيخ عبد القادر الأرناؤوط والشيخ شعيب الأرناؤوط / مؤسسة الرسالة / بيروت / ١٣٩٩هـ مع طبعة: دار الأحياء التراث العربي / بيروت / مراجعة: طه عبد الرزاق طه.

٧٠- زوائد مصنف الامام عبدالرزاق الصنعاني على الكتب الستة من الاحاديث المرفوع دراسة و تخريج و تعليق/أعداد: عبدالرحمن بن احمد بن عبدال رحمن الخريصي/١٤١٩هـ

٧١- سبل الهدى والرشاد في سيرة خير العباد صلى الله عليه وسلم/محمد بن يوسف الصالحي الشامي/ تح:مصطفى عبد الواحد - وآخرون/المجلس الأعلى للشئون الإسلامية/١٩٩٧ - ١٤١٨.

٧٢- السرايا والبعوث النبوية حول المدينة ومكة/ بريك بن محمد بريك أبو مايلة العمري/دار ابن الجوزي/ط١/١٤١٧هـ- ١٩٩٦م.

٧٣- سلسلة الأحاديث الصحيحة / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني:

المجلد الأول / المكتب الإسلامي / بيروت / ط٤ / ١٩٨٥م.

المجلد الثاني / المكتب الإسلامي / بيروت / ط٤ / ١٩٨٥م.

المجلد الثالث / الدار السلفية للنشر/ الكويت/ ط١/ ١٩٧٩م.

المجلد الرابع / المكتبة الإسلامية / عمان / ط١ / ١٩٨٣م.

المجلد الخامس / مكتبة المعارف / الرياض / ط١ / ١٩٩١م.

المجلد السادس / مكتبة المعارف / الرياض /ط١ / ١٩٩٥م.

٧٤- سلسة الأحاديث الضعيفة / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني:

المجلد الثاني/المكتب الإسلامي / بيروت / ط١ / ١٣٩٩هـ

المجلد الثالث / مكتبة المعارف / الرياض / ط٢ / ١٩٨٨م.

المجلد الرابع / مكتبة المعارف / الرياض / ط١ / ١٩٨٨م.

٧٥- السنة / الإمام إبن أبي عاصم / تح: الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / المكتب الإسلامي / بيروت/

